بەرگی پێنجەم
ن ـ ي

# ئەلمونجید بە کوردی

فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە



وەرگێرانی
جەلال مەحمود عەلی سوبحانی

# ئەلمونجید

## بە کوردی

### فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە

بەرگی پێنجەم



وەرگێڕانی

جەلال مەحمود عەلی سوبحانی




(ن): (ألنُون): نون: پیتی بیست و پێنجهەمینی پیتـــی ئەلفوبێی عەرەبییە لـــە ژمێرەی كۆی پیتەكاندا (٥٠) پەنجایە.

(ألنُون المُفْرَدَة): نوونی تاك بۆ جەختكردنە. یان سووكەو زەنەدارە/ بێدەنگە یان قورسەو سەردارە واتە گیراوی «شَدَّة»ی بە سەرەوەیە كـــە تایبەتن بـــە كـــردار وەك: (لِيَكونَنْ مِنَ الصَّاغِرِين): با لەوانەبن كە گوێڕایەڵن.

(وَلا تَحْسَـــبَنَّ اللهَ غافِـــلاً): وامەزانـــە خودا ئاگادار نییـــە. (كرداری ڕابـــوردوو بە (نون) جەخـــت ناكرێت، كرداری داخوازی دەشـــێت پێی جەخت بكرێت.

بەڵام ڕانەبوردوو ئەگەر وەڵامی ســـوێندبێت و لە (لام)ی ســـوێندە كـــە جیانەكرابێتەوەو مەبەســـت (مُثبَتْ) جێگرو بـــۆ دوارۆژ بێت دەبێـــت جەختبكرێت، وەك: (تـــالله لأكيدَنَّ أصنامكم): سوێند بەخودا بتەكانتان شەتەك دەدەم، بەڵام ئەو مەرجانەی تێدا نەبێت بەو دوو نوونە جەختی لەسەر ناكرێت.

٢-دەبێتە (نون) ێكـــی بێدەنگی زیاد/ پتر كە لـــە دوای ناوەوە دەبێت بە دەنگ دەبێت نەك بەنووسین وەك (كتابٌ. كِتابُنْ). بەمە ئەڵێن (تنوین) واتە كردنی كۆتای وشـــەكە بە نون، ئەویش لە كاتی بوونی دوو ســـەرو دوو ژێرو دوو بۆردا ئەبێت.

٣-بۆمێ: یان سووك و سەردار دەبێت كە ڕاناو دەبێـــت. دەلكرێنرێت یا گیروســـەردار دەبێت كە ئاماژە دەبێت بۆ كۆی مێ وەك (غُلامُكُنَّ) (ومنهُـــنَّ وضَرَبْهُنَّ): مێـــرد منداڵەكانتان و لەوان و لێیاندان. كە نوونەكە پیت دەبێت.

٤-(نـــون الوقايه): نونی پاراســـتن كە پێش (ی)ی قسەكەردێت و زیاد دەبێت. (ضَرَبَني وإنَني): لێیدام و بەڕاستی من.

٥-نونی زیاد/ پتر كە بـــە كردەكەوە دەلكێت.

کاتێـك بەراناوی دوانیـەوە دەلکێت وەك یَدْ رُسانِ تَدرسـانِ ئەو جوتە دەنووسن، یان بە راناوی کۆی نێرەوە دەنوسێت وەك: (تدرسون - یَدرُسـونَ): ئەوان دەنووسن و (تَدرُسینَ): بۆ مێ، تۆ دەنووسـیت (لێـرەدا نوونەکە بۆ جووت ژێردارەو بۆ ئەوانیتر سـەردار دەبێت. کـە دەدرێتە پاڵ ناوی دوانە ژێـردار دەبێت وەك اَلزَیدانِ و دەدرێتە پاڵ کۆی نێر سەردار دەبێت وەکو: زَیدونَ:

(نا): راناووی کۆی قسەکەرە.

(رَبَّنا. إنّنا سَـمِعنا): ئەی خودای ئێمە ئێمە بیستمان.

نأ:١-(نَأنِأَ-عَنِ الأمرِ. نَأنَأَةً): لەشـی شـلبوو کارەکـەی بـۆ نەکـراو توانـای ئەنجامدانی نەبوو/ کەموکورتی هەبوو.

(-في الرَأيِ): نەیتوانی رادەربرێت و بیری بۆ بچێت.

(نَأْ نَأْ وَنَأناءٌ وَ نُؤنُوءٌ): بێتواناو زیرەکردوو/ زۆر ترسنۆك.

نَأنَأَ-فُلاناً: نەیهێشت ئەوەی دەیویست بیکات جڵەوگیریکرد.

تَنَأنَـأَ - عَـنِ الأمـرِ): لە کردنـی کارەکەدا بێدەسەڵات/ بێتوانا بوو خاوبوو کارەکەی بۆ ئەنجام نەدرا.

(-في الـرأی):توانـای رادەربرینـی نەبـوو. بوودەڵەبوو.

٢-نَأنَأَ-فُلانـاً. نَأنَـأَةً): خوردانـی باشـی بەفیساردا.

نأت: (نَأَتَ. نَأتاً وَنَئِیتاً): ناڵاندی و لە تاواندا نرکاندی و دەنگی بەرزکردەوە.

(-الرَجُلَ): ئیرەیی پێبرد.

نـأث (نَـأَثَ - عَنـهُ نَأثـاً وَمَنأَثـاً): ١-لێیدوورکەوتەوە ٢-خاوەخاویکرد، شێنەییبوو.

(-الرَجُلُ): کۆششیکرد.

(أَنأَثَ -ه إنآثاً): دووریخستەوە.

(سعی سَعیاً نأثی): کۆششێکی سستانەیکرد.

(سَـیرٌ مِنـأَثٌ): رۆیشـتنێکی هێـواش/ لەسەرخۆ.

ناج:١-(نَـأَجَ- فِي الأَرضِ نُؤُوجـاً): بەسـەر زەویدا گەراو رۆیشت.

٢-(نَأَجَ - الأَمرَ. نُؤوجاً): کارەکەی دواخست.

٣-(نَأَجَ- الی اللهِ فِي الدُعاءِ نَئیجاً): لەنزاکەیدا لەخودا پارایەوە/ لاڵایەوە.

(-تِ الریحُ): باکەتووند بوو/ توونديکرد.

(-تِ آلریـحُ المَوضِـعَ): باکـە توندبەسـەر شوێنەکەدا تێپەری.

(-الثَورُ. نَأجاً وَنُؤاجاً): گاکە بۆراندی.

(نُئِـجَ- القَـومُ): خوێشـکەل بایەکـی توند لێیدان.

(اَلنائِجَةُ (ج) نائِجات): بای زۆر توند.

(النَـأَجُ): ١- زۆر بەبـۆرە یـان دەنگبـەرز ٢-خێرا ٣-بەنزاو پارانەوە.

(رَجُلٌ نَأَّ اج ): پیاوێکی دەنگ ناسك و بەرز.
(ريحٌ نَؤُوج (ج) نوائج): بای زۆر توند.
(اَلنَئيج (مص)): بەدەنگ/ وژەدار.
(لِلريح نَئيج): باکە وژەدارەو خێرایە/ باکە گڤە و وژەی هەیەو خێرایە.
(اَلمَــؤوج) (مفــع): بەســەر یەکــدا دراو/ سەریەکخراو/ سەریەکنراو.
(حَديثٌ مَنْؤُوج): ناخاوتنێکی بەدوای یەکدا هاتوو و پێکەوە گرێدراو.
٤-(نَئِجَ. نَأْجاً): خواردنێکی کەمی خوارد.
نَــأَدَ: نَــأَدَ-هُ نَــأْداً: (غیرەیی/ حەســوودیی) پێبرد.
(-تْهُ الداهِيَةُ): تووشی (وەی/ چوورتوم) بوو.
(-تِ الأَرضُ): زەویەکە ناوی دەڵاند.
(اَلنَآد وَالنَآدى وَالنَؤُود): لێقەومانی سەخت/ وەیی گران/ داماویی و گرفتاریی.
(نَأَر: نَأَرَ-تْ نائِرَةٌ فِي الناسِ نَأْراً): خەڵکەکە (ورووژان/ کەوتنە جۆش و خرۆش)
اَلنَوُور: (ايطالية): دووکەڵی پیو.
نأش: ١-(نَأَشَ وَتَناءَشَ-الشيءَ. نَأْشاً): خراپ دەستیدایە شتەکەو پەرێشانیکرد.
(إِنْتَــأَشَ -هُ اللّهُ): خــودا لەبــن و بێخــەوە دەریهێنا/ ریشەکێشیکرد.
(اَلنَؤُوش): بەدەسەڵات و بەهێزی زاڵ.
٢-(نَأَشَ -الأَمرَ نَأْشاً): کارەکەی دواخست.
(-الشيءَ): شتەکەی دوورخستەوە.

(تَناءَشَ): دواکەوت/ پاشکەوت و دوورکەوتەوە.
(-الأَمرَ): کارەکەی دواخست.
(-الشَــيءَ): ١-شــتەکەی دوورخســتەوە ٢-لە دوورەوە شتەکەیبرد، وەرگرت.
(إِنْتَأَشَ): دواکەوت و دوورکەوتەوە.
(-فُلانــاً): داوایلێکرد شــێنەیی بێت و خۆی دوابخات.
(اَلنَئِيش): دوور.
(فَعَلَهُ نَئِيشاً): دوایی/ درەنگ کارەکەیکرد.
(جاءَ نَئِيئاً): درەنگ و هێواش هات.
(إِتَّبَعَهُ نَئِيشاً): دواکەوتبوو خێرا شوێنیکەوت بۆ ئەوەی فریایبکەوێت.
٣-(نَــأَشَ وَتَنــاءَشَ-هُ اللهُ. نَأْشــاً): خــودا بووژاندیەوەو زیندویکردەوو بەرزیکردەوە.
(نَأَشَ-الرَجُــلُ مِــن مَكانِــهِ): پیاوەکــە لە شوێنەکەی هەستاو راستبووەوە.
(إِنتَأَشَ-الشَــيءُ فُلانــاً): شــتەکە پەلەی بە فیسارکرد.
(-بِغَنَمِــهِ): دەنگی لــە مەڕەکانیکرد و دانیە پێش خۆی و بردنی.
نَأْفاً: (نأف: نَأَفَ- فِي الامر): (باش لە کارەکە هەڵچوو/ بۆی لێبڕا).
(نَئِــفَ - مِنَ الشَّــرابِ. نَأْفاً وَنَأَفــاً): تێری شەربەت خواردەوە/ تێر شەرابىبوو.
(-الرَجُــلَ): رقی لەپیاوەکــە بوو/ حەزی لە چارەی نەکرد.

(-الشيءَ): شتەکەیخوارد.

نأل: (نَأَلَ- الفَرَسُ نَــأْلاً وَنَأَلاناً): چارەوێکە بەتەکان ڕۆیشت.

(نَؤُول): چارەویی تەکاندەر.

(-الرَّجُلُ): پیاوەکە لە ڕۆیشتندا سەری بەرز و نزمدەکــردەوەو دەیجوڵانــد وەکــو یەکێك بارێکــی بە کۆڵەوە بێــت و ڕابکات و بیەوێت بیگەیەنێت.

(-فُلاناً): ئیریەیی بە فیسار برد.

نأم: (نَأَمَ. نَئِيماً): بەدەنگی نزم ناڵاندی.

(-تِ القَوسُ): کەوانەکە فنگەی لێوەهات.

(-الأَسَدُ): شێرەکە نەڕەیهات.

(-الظَبيُ): ئاسکەکە باعەیهات.

(اَلنَأْمَةُ): ١-جارێــك دەنگ لێوەهاتن ٢-ئاوازو دەنگ.

(أَسْــكَتَ اللهُ نَأْمَتَــهُ): خــودا دەنگیــبڕی/ مراندی.

نأي:١-(نَــأَى - فُلاناً ونَأَى عَــن فُلانٍ يَنأَى نَأياً): لە فیسار دوورکەوتەوە.

(ناءٍ (م) نائِيَةٌ): دوور/ دوورکەوتوو.

(-النُــؤْيَ لِلخَيمَــةِ): جۆگــەی بەچــوارلای دەوارەکەدا هەڵکەند.

(ناءَى-الرَّجُلَ مُناآةً): لە پیاوەکە دوورکەوتەوە یان پیاوەکەی دوورخستەوە.

(-الشَــرَّ عَــن فُــلان): خراپــەی لەفیســار دوورخستەوە/ بەرگریی لێکرد.

(أَنْأَى - فُلاناً عَنهُ): فیساری لێدوورخستەوە.

(-النُــؤْيَ لِلخَيمَــةِ): جۆگەلــەی بەخــولی دەوارەکەدا هەڵکەند.

(تَناءَى. تَنائِياً): دوورکەوتەوە.

(إنْتَأَى - إنتِئاءً): دوور کەوتەوە.

(-النُؤْيَ لِلخَيمَةِ): جۆگەلەی بەهەرچوار لای ڕەشماڵەکەدا هەڵکەند.

(اَلنائي): دوور.

(اَلنَأْي وَالنُــؤْي والنِئْي والنُؤَى (ج) آناء وَأَنْآ وَنُئْــي ونِئِــيّ): جۆگەلەیەك بــە چوار لای دەوارەکــەدا هەڵدەکەنرێت تا لێشــاوی باران نەچێتە دەوارەکەوە.

المتأى: شوێنی دوور.

(اَلنــاى (ج) نايات) (فارســيه) (مو): نای/ شمشاڵ.

نــبّ: ١-(نَبَّ-اَلتيــسُ خاصَــةً نَبّــاً وَنَبِيباً وَنُبابــاً): ســابرێنەکە یــان کەڵەکێوییەکــە پرمانــدی و مرقانــدی( کاتێك کــەورووژاو هەڵچوو).

اَلنَبَّةُ: جارێك پرماندن.

٢-(نَبَّبَ النَبَاتُ. تَنْبِيباً): ڕووەکەکە لاســکی بۆشی لوولەیی پەیداکرد.

(تَنَبَّبَ -الماءُ): ئاوەکە کشا.

(اَلأُنْبُب = الأُنْبُوب): بۆری/ لوولە.

(اَلأنبوب (ج) أَنابيب): ماوەی نێوان دووگرێی قامیش یــان هی نێزە بەهەمــوو لوولەیەکی

بۆش وەك قامیش وادەوترێت.
(أُنبوب الماء): بۆریی ئاو، گونج.
(الأُنبوب -مِنَ الشَجَرِ): یەك ریزی درەخت.
(أُنبوب الكوز): لوولەی گۆزە.
(أنابيب الرئة): بۆریەكانی سی.
(الأُنْبُوبَة = الأُنْبوب).
٣-(النَبَّة): بۆنی ناخۆش و پیس بۆنی بۆگەن.
(نبأ:١-نَبَأَ. نَبْأً): دەنگێكی هێواشیكرد.
(-الشيءُ. نَبْأً وَنُبوءً): شتەكە بەرزبووەوە.
(-علـى القَـوم): لەخوێشـگەل دەرپـەڕیو پەلاماریدان/ روانی بەسەریاندا.
(-الشيءُ): دووركەوتەوە و لایدا.
(نَبَأَ سَـمعي عَـن كـذا): هەواڵێكی ناخۆش بەرگوێمكەوت/ گوێم بەوە بێزار بوو.
(-مـن أرضٍ إلى أرض): لەخاكێكـەوە چووە خاكێكیترەوە.
(نَبَّأَ-فُلاناً االخَبَرَ وَبِالخَبَرِ).تَبنِئَةً وَ تَنبيئاً): هەواڵەكەی بەفیسار راگەیاند.
نابـأَ-هُ مُنابَـأَةً: هەواڵیـان (بەیەكتریـدا/ بەیەكتری گەیاند)
(-القَومَ): لە خوێشـگەل دووركەوتەوەو نەبوە هاوسێیان.
(أَنْبَأَ-فُلاناً): فیسـاری لەخۆی دوورخستەوە لە خاكێكە دەرپەڕاندە خاكێكیتر.
(-فُلانـاً الخَبَرَ وَ بالخَبَـرِ): هەواڵەكەی بە فیسار گەیاند/ لە هەواڵەكەی ئاگاداركرد.

(تَنَبَّـأَ تَنَبُّؤاً) پێشـبینیكرد، نوقلانەی لێدا فراندی ٢-وای وت كە پێشبینی شت دەزانیت.
(إسْـتَنبأَ - الرَجُـلَ): هەواڵەكەی لەپیاوەكە پرسی.
(-ألنَبَـأَ): بـۆ هەواڵەكـە گـەڕا/ گوێـی بۆ هەڵخست.
(ألنابِئ) (فا): ١-هەواڵدەر ٢-شـوێنی قۆقزی بەرز.
(رَجُـلٌ نابِئٌ) وَسَـيلٌ نابِـئٌ): پیاوێك یان لێشـاوێك كـە بیێـتو نەزانرێت لـە كوێوە هاتووە.
(ألنَبَـأ (ج) أنْبـاء): هـەواڵ (چونكـە لـە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكیتر دەچێت).
(ألنَبْـأَةُ): دەنگێكی دوور و نـزم یان دەنگی سەگوەر.
(ألنُبُـوءَة والنُبُـوَّةُ): ١-پەیـام وەرگرتـن لە غەیبـەوەو هەواڵـی ئاینـدەو دوارۆژزانـین كـە خـودا بیخاتـە دڵـەوەو پێڕابگەیەنێت ٢-پێغەمبەرێتیو لە خوداوەو پەیاموەرگرتن.
(ألنَبِيء): ١-شوێنی بەرزی قۆقز ٢-رێی دیارو روون/ ئاشـكرا ٣-دەرچوو لە شـوێنێكەوە بۆ شوێنێكیتر.
(ألنَبـيء والنَبِيُّ (ج) أنبيـاء وَنَبيُّون وَأنْباء وَنُبـاء (م) نَبيئَة وَنَبيئـات): ١-پەیامبەر/ غەیبگـۆ. ئایندەگـۆ، كە بە خورپـەی دڵەو لەخوداوەیە ٢-پێغەمبەر كە دەربارەی پەیامی

خودای مەزن پەیامبەدات و هەرچی لەلایەن خودای مەزنەوە بێت بیگەیەنێت.
(نَبَوِيّ): پێغەمبەریی/ پێغەمبەرانە.
(نُبَيِّئ): پێغەمبەرە بچکۆلە/ پێغەمبەرۆلکە.
نبت: (نَبَتَ - آلمَكانُ نَبْتاً وَنَباتاً): شوێنەکە گیاداربوو.
(-البَقْلُ): سەوزەکە رووا و سەری دەرهاورد.
(-الإنسانُ نَبتَةً وَنَباتاً): مرۆڤەکە گەیشتە هەرەتی پیاوەتی.
(نَبتَ فُلانٌ في مَنْبَتِ صِدقٍ): فیسار لە رەچەڵەکێکە کە بە راستگۆیی ناسراون.
(نَبَتَ - ثَديُ آلجارِيَةِ نَبوتاً): مەمکی کەنیزەکەکە خڕبوو/ بەرزبووەوە.
(نَبَّتَ - الشَجَرَ): درەختەکەی ناشت.
(-الحَبَّ: تۆوەکەی وەشاند/ چاند.
(-الصَبِيَّ): منداڵەکەی پەروەردەکردو پێگەیاند.
(أَنْبَتَ - الغُلامُ): مێرد منداڵەکە بوو بە پیاو.
(-المَكانُ): شوێنەکە گیای (دەرکرد/ لێڕوا).
(-البَقلُ): سەوزەکە ڕووا.
(اللهُ البَقْلَ): خودا سەوزەکەی ڕواند/ دەرهاورد.
(مَنبوت): ڕوواو/ ڕوێنراو.
(تَنَبَّتَ - الشيءُ): شتەکە دەرکەوت/ هاتە دەرێ.

(أَلنابِت) (فا): ١-ڕوێنەر، چێنەر ٢-هەموو شتێکی تازە دەرهاتووی ناسك/ ڕوواو.
(أَلنابِتَةُ): مێی وشەی (أَلنابِت) زارۆڵەی پێگەیشتوو یان بەچکە ئاژەڵی گەورە بوو.
(إِنَّ بَني فُلان لَنابِتَةُ شَرٍّ): فیسار بەرە پەروەردەی خراپەن.
(أَلنَبْت (مص) (ج) نُبُوت): گیا، ڕووەك.
(نِبْتَة): بنجێك گیا یان ڕووەکێك.
(أَلنَبات (مص) الواحِدَةُ نَباتَةٌ (ج) نَباتات وأَنْبِتَة): ئەوەی کە لە زەویدا دەڕوێت وەك گیاو سەوزە و درەخت/ ڕووەك.
(عِلمُ النَّبات): زانستی ڕووەك/ ڕووەکناسی. زانستێکە لە ڕاستیی و بوونی ڕووەك دەکۆڵێتەوە لە نیشانەکانیو کۆمەڵەکانیو شوێنی ڕوانیو تایبەتمەندییەکانی.
(أَلنَّباتِي): ١-ڕووەکیی/ کەسێکە لەسەر سەوزەو ڕووەك و بەری بژی ٢-ڕووەکناس.
(أَلنَبُّوت (ج) نَبانبيت): ١-پەلی سەرەکیی درەخت ٢-داردەستی ئەستووری ڕاست و ڕێك/ تێلا.
(أَلتَنبيت) (مص) (ج) تَنابيت): ١-ڕواندن و چاندن (چەقاندن/ ناشتن)ی درەخت ٢-هەڵپاچینی درەخت و دار خورماو دڕکلێکردنەوەی بۆ سووککردنی درەختەکە.
(أَلمَنبِت): شوێنی ڕواندن یان چەقاندنی ڕووەك و درەخت.

(اَلمَنْبَـات): جێیـەك کە گیـاو ڕووەکی زۆر بێت.
(اَلیَنْبُـوت (ج) یَنابِیـت) (ن):١-خرنووکی بەراز.
(یَنْبُوتَـة) (ن): درەختێکـی خرنوکی بەراز ٢-خرنوك.
نبـث: (نَبَثَ - البِئـرَ. نَبْثـاً): چاڵاوەکەی هەڵکۆڵی و گڵەکەی دەردا.
(-التُرابَ): گڵەکەی لەبیرەکە یان لە شوێنێتر دەردا.
(-فُلانٌ): فیسار تووڕەبوو.
(-عَنِ السِـرِّ أَو الأَمرِ): بەدوای نهێنیەکە یان کارەکەدا گەڕاو کۆششیکرد کە بیزانێت.
(فُـلان یَنبُثُ عَـن عُیوبِ الناس): فیسـار بـەدوای خـەوش و کەموکوڕیـی خەڵکـدا دەگەڕێت تا دەریبخات.
(تَنابَـثَ - القَومُ): بـەدوای نهێنیی یەکتردا گەڕان.
(لایَزال یَتَنابَثونَ عَنِ الاسـرارِ ویَتباحَثونَ عَـنِ الأَخبارِ): هێشـتا هەر بـۆ نهێنییەکان دەگەڕێن و وێڵی دوای هەواڵەکانن.
(إِنْتَبَثَ- التُرابَ): گڵەکەی لە چاڵاوەکە یان لە شوێنێتر دەردا.
(-الشيءَ): شتەکەی وەرگرت یان دەستکەوت.
(إِسـتَنبَثَ - عَنِ السِرِّ): بەدوای نهێنییەکەدا گەڕاو کۆششیکرد کە بیزانێت.

(اَلنَّبَث (ج) أَنْباث): شوێنکار/ شوێنەوار.
(اَلنَبیث): بەدخواز/ بەدکار/ خراپەکار.
(هُوَ خبیثٌ نَبیث): ئەو پیسەو بەدکارە.
(اَلنَّبیثَةُ (ج) نَبائِث):١-گل و خاکی دەردراوی چـاڵاوو جۆگەو ڕووبارو شـتی لـەو بابەتە ٢-نهێنیی.
(ظَهَـرَت نَبائِثُهُـم ولَم تُخْـفَ خَبائِثُهُم): نهێنیەکانیـان ناشـکرابوو بەداخوازیـی‌و پیسیەکانیان نەشاردرایەوە.
(نَبیثَةُ السَـبعِ): گۆشـتێك کەدڕندە بۆکاتی پێویستیی خۆی دەیشارێتەوە.
(اَلأُنبوثَة): کلاّوکلاّوێن یان شـت شـاردنەوە یارییەکی منداڵانەیە شـتێك دەشـارنەوە کێ دۆزییەوە ئەوە براوەیە.
نبج:١-(نَبَـجَ. نَبیجاً): دەنگگـەورەو بەرزو قسە ڕەقبوو.
نَبّاج: دەنگبەرزی قسەڕەق/ نەزاندوو.
(اَلنابِجَةُ): زۆرزان.
(اَلنُباج): ترکەن/ ترن.
(نُباجُ الكَلْبِ): وەڕینی سەگ.
(كَلْـبٌ نَبّـاج وَنُباجِـيّ): سـەگێك کە زۆر بوەڕێت.
(أَلنَّبّاجَـة):١-مێی وشـەی (نَبّاج): ٢-فنگ/ قوون.
(اَلنَبجان (ج) نِباج: هەرمشەو گورمشە.
٢-(نَبَـجَ-تِ القَبَجَـةُ نَبْجـاً): ماکەوەکـە

لەلانەکەی لە کونەکەی/ هاتەدەرێ.
(أَنْبَجَ): لەسەرگردی بەرز دانیشت.
(تَنَبَّــجَ وآنْتَبَــجَ- آلعَظــمُ): ئێســقانەکە هەویکرد.
(آلنَبْجَة): گرد/ تەپە.
(اَلنُبَاج): کەڵەکەبوو.
أَلنَباج: گردی بەرز.
٣-(أَنْبَــجَ): قســەی هەڵــەق‌و مەلەقیکــرد کەهیچی بەسەر هیچەوە نەبوو.
(أَلنَبَّاج): درۆزن.
(أَلمِنبَج): کەسێکە بەڵێن دەدات‌و نایباتەسەر.
٤-(اَلأَنْبَــج) (ن): درەختێکــە لەکۆمەڵــەی قەزوانە لە وڵاتە گەرمەکاندا دەروێت بۆنێکی خۆشــی هەیــەو بەرێکــی خــۆش دەگرێت. دەخورێت‌و دەکرێت بەشــەربەت‌و بەمرەباو دەخرێتە سرکەوە. لە توێکڵەکەی ئاوێکی ترش دەگیرێت کە چاری شــۆرییەکی/ سکچوونێکی کۆنی پێدەکرێت.
نبح: ١-(نَبَحَ - آلكَلْبُ نَبْحاً وَنُبُوحاً وَنَبيحاً وَنُبَاحاً وَنِباحَاً وَتَنْباحاً): سەگەکە وەری.
(نابِــح (ج) نَوابِــح وَنُبَّح وَنُبُوح): ســەگی وەریو.
(نَبَــحَ - هُ الكَلْــبُ ونَبَحَ عَلَيهِ): ســەگەکە پێیــوەری ئەویش بەســەگەکە وەری ٠دەنگی وەرین بۆ ســەگە بــەکار دەهێنرێت بەڵام بۆ ئاسک‌و سابرێنیش دەوترێت).
(-الشــاعِرُ): شــاعیرەکە شــیعری داشۆرینی نووسی یان وتی.
(نَبَحَتْني كِلابُك): جنێوەکانتم گەیشتێ.
(-الهُدهُدُ. نُباحاً): پەپووســلێمانەکە پیربوو و دەنگی گربوو.
(نابَحَ-هُ الكَلْبُ. مُنابَحَةً): سەگەکە پێیوەری.
(أَنْبَــحَ وَآســتَنبَحَ-هُ): ســەگەکەی لێهێنایە وەرین.
(إِســتَنبَحَ الأَضيــافُ كَلْبَهُــم): میوانــەکان ســەگەکەیان هێنایــە وەرین (رێبــوار ئەگەر رێــی هەڵەبکردایــە وەك ســەگ دەوەری بۆ ئەوەی ســەگی ئاوایی وەڵامی بدەنەوە، بەوە ئاواییەکەی دەدۆزییــەوەو رووی تێدەکرد). بە لەدەرگا دەریان دەوت.
(المُسْتَنبِح): میوانی وەریو.
(أَلنَبَّاح الواحِدَةُ نَبَّاحَةٌ): فرەوەر.
(كَلْبٌ نَباحِيٌّ): سەگی گەورەی فرەوەر.
(أَلنُبُــوح) (مــص): وەرین، دەنگــە دەنگ‌و ژاوەژاوی خوێشــگەڵ‌و سەگوەریان (ئەمەکۆی وشەی (نَبْحٌ): وەرین.
(ظَبيَّةٌ نَبحاء): ئاسکێکی بە بارەبار.
(أَلمَنْبوح): جنێو خواردوو/ جنێو پێدراو.
٢-(نَبَّاحَة (ج) نَبَّاح): وردە ســەدەفی سپییە کە دەخرێتە ملوانکەوەو بۆچاوەزارە.
نبــخ: نَبَخَ - (العَجينُ نُبُوخــاً): هەویرەکە هەڵات.

(أَنْبَخَ- آلعَجّانُ): هەویرشێلەکە هەویرەکەی پێگەیاند/ شێلای و هەڵهێنا.
(-الرَجُــلُ): لەزەوییەکــی بڵنـــدو نەرمـــدا کشتیکرد.
(ألنّابِخَةُ (ج) نَوابِخ): پیاوی قســەکەری بە فیزو دەعیە/ لووتبەرز.
(ألنَبْخ وآلنَبَخ): بڵقی ئاوتێزاوی دەســت کە بەهۆی کارکردنەوە یان ســووتاوییەوە پەیدا دەبێت.
(ألنَبّـــاخ وآلأنبَخان مِـــنَ العَجين): هەویری هەڵاتووی هەستاو.
(ألأَنْبَخ): ١-مرۆڤی وشــکی قســەرەقی دڵرەق ٢-گڵی زۆر.
(ألأرض آلنَبْخَاء (ج) نَباخی): ١-زەویی بەرز ٢-زەویی نەرمان.
٢-(ألنَبْخ والنَبَخ): شوێنسووتاویی بەلەشەوە.
(ألنَبْخَــةُ وَآلنَبَخَــةُ): ١-تەرکــە قــەرەم: کە جۆرێك قامیش‌و زەل بوو، جاران دەیانخستە نێوان تەختەکانی پاپۆڕەوەو پێی کونبڕ دەکرا ٢-شقارتە کە ئاگری پێدەکرێتەوە ٣-قسەیەکی خۆش و پێکەنیناوی.
(ألنابِخَةُ (ج) نَوابِخ): زەویی دوور.
(ألأَنْبَخ): رەنگی زۆر تەڵخ.
نبذ: (نَبَذَ - الشـــيءَ. نَبْذاً): شتەکەی فڕێدا. لەبەربێکەڵکی وازی لێهێنا.
(-آلأَمْرَ): کارەکەی وازلێهێناو پشتگوێیخست.
(-العَهْدَ): بەڵێنەکەی شکاند.
(نَبَــذَ إِلى العَــدُوِّ): بەڵێنەکـــەی بەســـەر دوژمندادایەوەو شکاندی/ نەیبردەسەر.
(-النَبيذَ): مەیەکەی، شەرابەکەی دروستکرد.
(-العِنَبُ أو التَمرُ): ترێکە یان خورماکە بوو بە شەراب.
(نَبَّذَ - آلنَبيذَ): شەرابی دروستکرد.
-آلعِنَـــبُ أو التَمرُ): ترێکە یان خورماکە بوو بە شەراب.
(-الشيءَ): شتەکەی نەویست‌و فڕێیدا.
(نابَذَ‌ەُ. مُنابَـــذَةً وَنِباذاً): لەگەڵیدا تێکچوو ناحەزییکردو لێیجیابووەوەو دژایەتییکرد.
(-ەُ الحَـــربَ): لەگەڵیـــدا جەنگی ئاشـــکراو بەرپاکرد.
(-ەُ في البَيـــعِ): لەپێـــش ئیســـلامدا خاوەن مـــەڕەکان مەڕەکانـــیان دەهێنـــا. کڕیارەکـــە بەردیـــان چـــەوی دەگرتـــە مـــەڕەکان بـــەر هـــەر مەڕێـــك بکەوتایە دەبوت ئـــەو مەڕەی بەریبکەوێـــت بەوەنـــدە دەمەوێـــت. بـــەم کڕینەیان دەوت کڕینی پەڕکردن. یان کڕینی چەو یان بەرد تێگرتن.
(تَنابذوا): تێکچـــوون‌و لەیەکبوون‌و کەوتنە دوژمنایەتی لەگەڵ یەك.
(إِنْتَبَذَ - النَبيذَ): شەرابەکەی دروستکرد.
(-آلعِنَبُ أَو التَمرُ): ترێکە یان خورماکە بوو بە شەراب.

(-عَــنِ القَــوم): لەخوێشــگەل جیابووەوەو تەریكبوو.

(-فُلانٌ): فیسار تەریك‌و گۆشەگیربوو.

(إنْتَبَذَ الى ناحِيَةٍ وَآنتَبَذَ مَكاناً): كەنارگیربوو و چووە گۆشەی/ سوێی شوێنێكەوە.

(اَلنَبْــذ (مــص) (ج) أنْباذ): شــتێكی كەم‌و بێبایەخ.

(ذَهَــبَ مالُــهُ وَبَقــيَ نَبْذٌ مِنــهُ): داراكەی لەدەستچوو شتێكی كەمی بۆ مایەوە.

-(أنباذُ الناس): هەرچی وپەرچی/ گەجەرو گوجەری ناو خەڵك/ سەرسەری و رسوای ناو خەڵك.

(اَلنَبْــذَةُ والنُبْــذَةُ (ج) نُبَــذ): ١-كەنار ٢-بۆ بەشێكیش بەكاردێت.

(نُبذَة مِنَ الكِتاب): بەشــێكی پەرتووكەكە/ كتێبەكە.

(جُلَس نَبْــذَةً): لەلایەكەوە/لە كەنارێكەوە دانیشت.

(اَلنبیــذ (م) نبیــذَة = أَلمَنْبــوذ): پەڕكراو/ ئەفەرۆزكراو، دەركراو، پشتگوێخراو/ بێزراو.

(أَلنَبِیذ (ج) أَنْبِذَة)١-مەی یان شەرابی لەترێ و خورمــا گــیراو (بۆیــە واناونــراوە چونكە بۆڵەترێكە یان خورماكە دەهاونە دەفرێكەوەو ئاوی تێدەكــەن‌و لێیدەگەڕێن تا هەڵدەچێت‌و دەبێتە مەی ٢-بە هەموو بابەتێكی سەرخۆشیی دەوترێت وەك شەراب‌و مەی‌و ئەرەق‌و هتد.

(أَلنَبَّاذ): مەیفرۆش.

(أَلمَنبُوذ) (مفع): منداڵــی زۆڵ یان منداڵێك دایكەكەی لەسەرە ڕێگایەكدا یان لەشوێنێكدا فڕێیدەدات.

(أَلمِنْبَــذَةُ (ج) مَنابِذ: ســەرین/ گۆشــە. یان دۆشەكڵە. كەلەسەری دادەنیشن.

(نَبَذَ - عِرقُهُ نَبْذاً وَنَبَذاناً): دەماری خوێنی لێیدا.

الملحق:

نبذ: (أَلمَنْبُوذون): پەڕكراوەكان/ ئەفەرۆزكراوەكان. لەهندســتاندا بەهەموو ئــەو خەڵكانە دەڵێن كە لــەدەرەوەی چوار چینەكــەن‌و لەكۆمەڵ جیاكراونەتەوە.

---

نبر: (نَبَرَ - الغُلامُ. نَبْــراً): مێرد منداڵەكە پێگەیشت‌و بوو بە هەرزەكار.

(-المُغَنِّــي): گۆرانیبێژەكە كە دەنگی نزمبوو دەنگی لێهەڵبڕی.

(-الرَجُــلَ): بەپیاوەكەدا هەڵشــاخاو تەرزە شكێنیكرد.

(-هُ بِلِســانِهِ): لەپاشــملە قســەی پێــوت‌و سووكیكرد.

(-الشيءَ): شتەكەی (بەرزكردەوە هەڵبڕی).

(-آلحَرْفَ): دانی بە وشەكەدا ناو گرتی.

(-آلرمحَ عَنهُ): نێزەكەی خێرا لێهەڵبڕی.

(أَنْبَرَ - الأَنبارَ): عەمارەكەی دروستكرد.

(إنْتَبَرَ- الجِرحُ): برینەكە هەویكردو هەڵاوسا.

(-آلخَطيــبُ): وتاربێژەکــە چــووە ســەر وتارگەکە.
(-الجَسَدُ): لەشەکە هەڵاوساو هەویکرد.
(-ت يَدُهُ): دەستی بڵقیکرد.
(ألنَبْر) (مص): کەسـێکی بێشەرمووە ئابرو/ چەرداومرووە کە بەزمان خەڵك بشکێنێت.
(طَعَــنَ طَعْناً نَبْراً): بەدزی و لەناکاودا تیغی پێداکرد یان بەدزییەوە بەخراپە ناویبرد.
(ألنِبْــر (ج) نِبــار وَأَنْبَــار) (ح): ١-جــۆرە مێشــێکە یان مێشەســەگانە یان مێشەکەرانە کەشوێنگەســتنەکەی هــەودەکات ٢-عەماری بازرگــان کە دانەوێڵە یان کاڵاو کەلوپەلی تێدا عەماردەکات.
(ألنَبْــرَة): ١-جارێــك پێــدا هەڵشــاخان و قســە پێوتن ٢-چاڵــی ناوەراســتی لێو ٣-دان بەوشــەدانان کاتی خوێندنەوە ٤-هەوکردنو هەڵاوسان لەلەشدا ٥-دەنگهەڵبرین پاش نزمی ٦-هــاواری تۆقین ٧-هەموو بەرزییەکی شــت ٨-هەمزە.
(ألنُبْــرَةُ (ج) نُبَر): بابۆڵە پــاروو/ پارووی گەورە.
(ألنَبَّار)١- دەمبەهــاوار/ هاوارکەر ٢-زمانپاراو زمانرەوان.
(رَجُلٌ نَبَّــارٌ بالكلام): پیاوێکــی زمانپاراوو رەوانبێژە.
(ألنَبير): پەنیر.

(ألأَنبــار (ج) أَنابــر وَأَنابــير وَأَنبــارات): (فارســية): عەمار کەدانەوێڵە یان کەلوپەلی بازرگانی تێدا عەمار دەکرێت.
(ألمِنبَــر (ج) مَنابــر): وتارگە کــە وتاربێژ ســەردەکەوێتە ســەری وتار بۆ خەڵك دەدات (لەبــەر بەرزیــی شــوێنەکەو دەنــگ تێــدا هەڵبرینی واناونراوە).
(قَصَائِدُ مُنَبَّرَة وَمَنْبُورَة): ئەو هەڵبەستانەی کە سەرواکانیان هەمزەیە.
٢-(ألنِــبر (ج) نِبار وَأَنبــار): ١-کورتە بنەی بێحورمەتو رسوا یان ناشیرین ٢-بەدزمان.
(ألنُبَير): پیاوی ناسكو هوشیارو زیرەك.
٣-(ألنِّبْريج) (فارسية): بۆریی نێرگەلە.
(نِربيج) (عامية): مارپێچ (فارسيه).
٤-(ألنِبراس (ج) نَباريس) (سريانية): ١-چرا ٢-نووکی نێزە. ٣-بوێرێکی نەبەرد ٤ (ح) شێر.
(ألنَباريس): چاڵاوی نزیك بەیەك.
(ألنَبْريــس): کارامــەی چاوکــراوەو خاوەن ئەزموون.
٥-(ألنِمْبرِشْتُ): (فارسية): نیوەبرژاو.
(بيضٌ نيمْبرشــتٌ): هێلکەی نیوە برژاو یان نیوەسوورکراوە.
(بيضٌ برشــتٌ) (عامية): هێلکەیەکی نیوە برژاو.
نبــز: (نَبــزَ وَنَبَّــزَ-هُ نَبْــزاً): ١: خەوشــی لێدەرهێنا ٢-بەپەنجەی تێومێژمند یان بەچاو

ئاماژەی بۆ کرد، چرپاندن کە بەلێو ئەبێت.
(-ه بِكَذا): ناوو ناتۆرەی ناشیرینی لێنا.
(تَنابَزوا بِالألْقاب): ناووناتۆرەی ناشـیرینیان لەیەکناو گاڵتەیان بەیەککرد.
(ألنَبَز (ج) أنباز): ١-نازناو ٢-نازناوی سووك و ناشیرین.
(ألنَبِــز): ١-بەدزمــان / ناپــاك/ بەدخــواز ٢-نارەسەن یان بەدرەوشت.
(ألنُبْــزَة): ئەوکەســەی ناووناتــۆرەی زۆر لەخەڵك دەنێت.
نبــس: (نَبَــسَ وَنَبَّــسَ- بِالَمجلِسِ. نَبْســاً وَنُبْسَةً): وتی/ قسەیکرد/ لەئەنجوومەنەکەدا دوا. (بەزۆریــی ئــەم وشــەیە بــۆ نەکــردن بەکاردێت. دەڵێــن: (مانَبَسَ بِكَلِمَةٍ): ورتەی لەدەم دەرنەهات/ قسەیەکی نەکرد.
(-السِرَّ): نهێنییەکەی نەدرکاندو شاردیەوە.
(أنْبَسَ): سەرشــۆڕانە نقەی لێبڕاو قسەیەکی نەکرد.
(النُّبُسُ): قسەکەرەکان.
(ألنُبُس الوَجهِ (م) نَبساء (ج) نُبس): مۆن/ گرژو تاڵ.
٢-(أنبَسُ نَبَسَ - الرَجُلُ . نَبْســاً ونُبْسَــةً): کەوتە جووڵەو پەلە.
(أنْبَسَ): پەلەیکرد/ خێرابوو/ گورجبوو.
(ألنُبُس):کەسانێك بەدوای کاروپێداویستیەکانیاندا بەپەلەن/ گورجن/ بەهەڵپەن.

نبش: ١-(نَبَشَ- الشيءَ المَسْتُورَ. نَبْشاً): شتە شاردراوەکەی دەرخست.
(-آلكَنْــزَ مِــنَ الأرضِ): گەنجەکەی کــە لەژێر زەمینەکەدا بوو دەریخستو دۆزییەوەو دەرهێنا.
(نَبَشَ القَبْرَ): گۆڕەکەی هەڵدایەوە.
(-الحَديثَ): قســەکەی هێنایەوە ســەرباس/ فەرموودەکــەی یەك بــە دوای یەکدا بردەوە ســەر پێغەمبەر، واتە: فلان وتی فیســار وتی ئەڵێت پێغەمبەر وتی.
(-السِرَّ): نهێنییەکەی درکاند.
(-عَنِ الأسرار): نهێنیەکانی دەرخست.
(-لِعِيالِهِ): بۆ خێزانەکەی رەنجیدا و بژێویی پەیداکرد.
(_نَبَّشَ-ه): پشکنی.
(إنْتَبَشَ- الشــيءَ مِــنَ الأرضِ): شــتەکەی لەزەوی دەرهێنا.
(ألنَبَّــاش): ١-کنێوەکــەرو هەڵکــۆڵ بــاش بۆشــت گــەڕاو ٢-کفندز، ئــەوەی گۆڕبۆ کفن هەڵدەداتەوە.
(ألنِباشَة): کفندزییو هەڵدانەوەی گۆڕ.
(ألنَبيشَــة): زەوی یان چــاڵاوی هەڵکۆڵراو/ هەڵدراوە.
(ألأُنْبُوش): ئەوەی هەڵکۆڵرابێتو کنەی تێدا کرابێتو تێداگەڕابن.
(الأُنْبُوش والأُنْبُوشَة (ج) أنابيش): درەختی لەرەگو ریشەوە هەڵکەنراو.

(أَنابيــشُ العُنصُلِ ونَحْـوَهُ): گوڵ و ڕووەکی پیازدار کەپەلوپۆی بەسەرزەویەوە دەبێت.
٢-(أَلنِبْش)(ن): درەختێکە گەڵاکەی وەك هی داری کاژە دارەکەی سوورەو زۆر سەختە.
نبــص: (نَبَصَ- فِي المَجلِس): لەئەنجوومەندا قســەیکرد (بەزۆریی ئەم وشــەیە بۆ نەرێ، واتە: نەبوو. نەکرا. نیە. وانیە بەکاردێت).
(مانَبَصَ بِكَلِمَةٍ): وتەیەك لەدەمی دەرنەهات/ قسەیەکی نەکرد.
(نَبَصَ- الطائِرُ. نَبيصــاً): باڵندەکە هێواش دەنگێکی لێوەهات.
(أَلنَبْصَــةُ): ورتەیــەك/ دەنگێکــی هێــواش لێوەهاتن/ وشەیەك.
(ماسَمِعْتُ لَهُ نَبصَةً): وشەیەکم، ورتەیەکەم لێنەبیست.
(نَبَصَ- الشَعَرَ. نَبْصاً): مووەکەی هەڵکێشا.
٣-(أَلنَبْص)(مص)١-ورتەکردن٢-مووهەڵکێشان ٣-کەمەکە سەوزاییەك کەدەربێت.
نبض:١-(نَبَــضَ- العِرقُ نَبْضــاً وَنَبَضَاناً): دەماری خوێنەکە پڵیدا/ لێیدا.
(تِ الأَمعاءُ): ڕیخۆڵەکان تەکانیانداو جووڵانەوە.
(-البَــرقُ): هــەورە بروســکەکە کەمەکــە چەخماخەیەکیداو درەوشایەوە.
(-الشَعَرَ): مووەکەی دەرکێشا/ هەڵکەند.
(-المــاءُ نُبُوضاً): ئاوەکە کشــا/ ڕۆیشــت یان بەزەویەکەدا ڕۆچوو.

(نَبَّضَ- فِي القَوسِ): ژێی کەوانەکەی بەردا/ لەرانــەوە/ راکێشــا، تــا دەنگــی لێوەبێــت/ درەنگەبێت.
(أَنْبَضَ- القَوسَ وعَنِ القَوسِ وَ فِي القَوسِ): ژێی کەوانەکەی راکێشا تا درەنگەی لێوەبێت.
(-الوَتَرَ وبِالوَتَرِ): ژێکەی راکێشا تا درەنگەی بێت.
(أَلنَّبض (ج) أَنباض): پڵیدانی دەماری خوێن و ترپەی دڵی گیانــەوەر جا یان خێرا دەبێت یان خــاو. وەك یــەك دەبێت یــان جیادەبن بەهێز دەبێت یان کز ئەوانە نیشانەو بەڵگەی تەندروستیی وناتەندروستیی دەبن.
(- فُــؤادٌ نَبْضٌ): دڵێکی وشــیارو ئازاو مەرد وەك لەمەردیدا باش پڵدەدات.
(فُؤادٌ نَبْضٌ وَنَبِضٌ): دڵێکی مەردو زیرەك.
(أَلنَبْضَةُ) پڵێدانێك/ ترپەیەك/ لەرەیەك.
(أَلنابِض)١-(فــا) پڵێــدەر ٢-هاوێژەر ٣-دەمار ٤-زەمبەلەك.
(نَبِضَ نابِضُهُ): ورووژاو توورە بوو/ دەماری هەستاو توورەبوو.
(أَلمَنبِــض (ج) مَنابِــض) (طب): ئەو شــوێنەی پزیشك دەستی دەخاتە سەر بۆ زانینی لێدانی دڵ.
(أَلمِنْبَــض (ج) مَنابِــض): چــەك و کەوانی هەلاج کە لۆکەی پێ شیدەکرێتەوە.
نبط: (نَبَــطَ -الماءُ. نَبْطاً وَ نُبُوطاً): ئاوەکە هەڵقوڵی و بوو بە کانی.

(-البِئرَ): ئاوی چاڵاوەکەی دەرخستو دەرکرد.
(-الشــيءَ): شــتە شــاردراوەکەی دەرخست/ ئاشکراکرد.
(نَبَّــطَ البِئــرَ): ئاوی بیرەکەی دەرخســتو دەرهێنا.
(أَنْبَطَ - البِئرَ): ئاوی چاڵاوەکەی دەرخست/ دەرهێنا.
(-الشيءَ): شتەکەی ئاشکراکرد پاش ونبوون دیار نەبوونی.
(-آلحُكْمَ): بەلێکۆڵینەوەو بیری خۆی بڕیاری یاسایی دۆزییەوە.
(أَنْبَطَ رَأيا حَسَــناً أَومَعنىً صائِباً): رایەکی دروســت وباش یان واتایەکی تەواوو راســتی دۆزییەوەو دەرهێناو دای.
(تَنَبَّطَ): لاســایی ئەنباتەکانیکرد یان خۆی بردەوە سەر ئەوان.
(-البِئرَ): ئاوی بیرەکەی دەرخستو دەرهێنا.
(إِنْتَبَــطَ - الكَلامَ): بەلێکۆڵینەوەو کۆشــش واتای قسەکەی دۆزییەوەو زانی.
(إِسْــتَنبَطَ - البِئــرَ): ئــاوی چاڵاوەکــەی دۆزییەوەو هەڵێنجا/ دەرهێنا.
(- الشــيءَ): شــتە نادیارەکەی دەرخســتو دۆزییەوە/ ئاشکرایکرد.
(-هُ): دایهێنا.
(-مِن فُلان خَيراً): شتی باشی لەفیسارپەیدا کردو وەرگرت.

(-العَرَبُ): عەرەبەکان بوون بەنەبتی.
(-الفَقِيــهُ): زانــا ئاینییەکــە/ مەلاکــە بەتێڕوانــینو کۆششــی خــۆی راوبۆچوونی شاردراوەی شەررعیی دۆزییەوەو دەرهێنا.
(إِســتَنبطَ رَأْيِياً حَسَــناً او معنــىً صائِباً): رایەکی دروســتو باش یــان واتایەکی تەواو راستی دۆزییەوەو دەرهێنا.
(اَلنَبــط): ١: ناخ/ قووڵایی ناوەوەی دەروونی مرۆڤ.
(فُلانٌ لايُــدْرَكُ نَبَطُهُ): کــەس لەدەروونو ناخــی فیســارناگات/ نازانرێت چــی لەدڵیدا هەیەو توانای چەندەو چی دەزانێت ٢-سپێتیی بندەستو ژێر سکی چارەوێ.
(النَبَــط (ج) أَنبــاط ونُبوط): ١-ســەرەتای دەرکەوتنــی ئاوی چاڵاو و بیرو وپەیدابوونی. ٢-ئاوێــك کەلەکێــودا وەکــو ئارەقێــك لــە تاوێرەکانەوە بێتەدەرێ.
(النَبَط): نەبەتەکان.
(نَبَطِي ونَباطِيّ ونِبَطِيّ ونُباطِيّ وَنَباطِ (ج) أَنْباط وَنَبيــط): میللەتێك بوون کەعەرەب نەبوون لەنێــوان عێــراقو ئەردەندا دەژیان میرنشــینیەکیان دامەزرانــد پایەتەختەکەی (بەتــرا ) بوو. بۆیە واناونرا چونکە لەزەویدا بەرهەمیــان دەرهێناو دەســتگیر دەبوو. پاش ئەوە وشــەکە بەســەر کۆمەڵانێکی تێکەڵداو رەشە خەڵکەکەیدا دابرا.

(كَلِمَــةٌ نَبَطِيَّــة): وشــەيەكە هــى رەشــە خەڵەكەكەيە/ خەڵكە گشتييەكەيە.

(اَلنُّبطَةُ)١-ســەرەتاى هەڵقوڵان‌و دەركەوتنى ئاوى چاڵاو ٢-سپێتيەكە لەبندەست‌و ژێرسكى چارەويدايــەو پەڵەيەكى ســپييە (بەناويكى هەڵقوڵاو چوێنراوە).

(اَلأَنْبَط (م) نَبْطاء (ج) نُبْط، - مِنَ الخَيل): چارەوێيەكە كەبندەست‌و ژێرسكى سپييبێت.

٢-(اَنْبَطَ - فيه): كارى تێكرد.

نبع: ١-(نَبَعَ وَنَبِعَ وَنَبُعَ - الماءُ. نَبْعاً وَنُبُوعاً وَنَبَعانــاً): ئاوەكــە هەڵقوڵى/ بــوو بەكانى/ سەرچاوە.

(تَنَبَّعَ - الماءُ): ئاوەكە چۆڕەچۆڕە/ كەمەكەمە هاتە دەرێ.

(اَلنَّبْع) (مص) (سريانيّة): ١-هەڵقوڵينى ئاو ٢-كانى/ سەرچاوەى ئاو/ كانياو.

(اَلنَّابِع) (فا): ١-هەڵقوڵاو ٢-سەرچاوە/ كانى/ كانياو٣-قەڵەمێك/ پێنوسێك كەمەرەكەبەكەى لەخۆيدابێت.

(اَلنابِعَةُ ج) نَوابِع): مێى وشەى (اَلنّابِع).

(نوابِــعُ البَعــيرِ): شــوێنى ئــاودەردان‌و ئەرەقكردنەوەى لەشى حوشتر.

(اَلنَّبَّاعَة): بن/ كۆم.

(اَلنَّبيع): ئەرەق/ خوەى.

(اَلمَنْبَع (ج) مَنابِع): كانياو/ سەرچاوەى ئاو/ سەرچاوە.

(اَليَنْبُــوع (ج) يَنابيــع): ١-كانــى/ كانياو/ سەرچاوەى ئاو ٢-جۆگەى گەورەى ئاو زۆر.

(فَجَّرَ اللهُ يَنابيعَ الحِكْمَةِ على لِسانِهِ): خودا زمانى كردە سەرچاوەى دانايى.

٢-(اَلنَّبْع) (ن): دارى بەلاڵووك كە تيروكەوانى لێ دروستدەكرێت.

(قَرَعــوا اَلنَبْعَ بِالنَّبعِ): بەرەنگارى يەكبوون شەرە تيريانكرد.

(مارَأَيْــتُ أَصْلَبَ مِنْهُ نَبْعاً): لەو ســەختترو توندترم نەديوە.

(اَلنَبَعة) (ن): دارێكى بەلاڵووك كەبۆ كەوان دروستكردن بەكاردێت.

(هُــوَ مِن نَبْعَــةٍ كَريمَةٍ): ئــەو لەنەژادێكى رەسەنە.

(اَلنَبَّاعَــة): مەلاشــووى ســەرى ســاوا پێش رەقبوونى كەرەقبووو پێيدەڵێن (يافوخ).

(اَلنَبعِيَّة): كەوانێك كەلە دارى بەلاڵووكبێت.

نبغ: (نَبَغَ - الشــيءُ. نبغاً وَنُبوغاً): شتەكە دەرهات‌و دەركەوت.

(-الماءُ): ئاوەكە هەڵقولا.

(-الوِعــاءُ بِالدَقيقِ): قاپەكــە لەبەرتەنكيى ئاردەكەى لێرژا.

(-الشَّرُّ): خراپە بلاوبووەوەو دەردەكەوت.

(-رأْسُهُ): كرێش دايە سەرى‌و لێيهەڵوەرى.

(-الرَجُلُ): شيعرى داناو تيايدا سەركەوتبوو بوو شيعرى چاكى دانا.

(-فِي العِلـمِ وغَــيرِهِ): لەزانســتو شــتیتردا هەڵکەوتوو لێزان و دەرکەوتووبوو.

(-فِي الدُّنيا): لە ژیاندا سەرکەوتوو بوو/ تێرو تەســەل بوو/ پڕ نازبوو/ جیهــان بە ڕوویدا کرایەوە.

(نَبَغَ فِيهِمُ النِفَاقُ): دووڕوویی و دووزمانیان تیــادا بــڵاوو ئاشــکرابوو کەلەوەپێــش دەیانشاردەوە.

(أنْبَــغَ - الناخِــلُ): ئاردبێژەکــە کەپەکــی ئاردەکەیگــرتو ئاردەکــەی بێژایــەوە/ لــە کەپەکەکەی جیاکردەوە.

(-البَلَدَ): هاتوچۆی شارەکەی زۆرکرد.

(ألنَبْغ): تەپو تۆزی ئاش.

(نَبغَةُ ألقَومِ): هەڵکەوتوانو ســەرکەوتوانو هەڵبژاردەی نەتەوە.

(ألنُبَــاغ وألنُباغَة وألنُبّــاغ وألنُبَّغَة): ١-ئارد ٢-کرێشی سەر.

(ألنابِغَــة): ١-بلیمــەت ٢-وشــەیەك وتارێك کەڕەوانیی ئاشکراو دیاربێت/ وشەی ڕەوان.

(ألنابِغَــةُ (ج) نوابِغ): ١-ڕەوانبێژ ٢-بلیمەتو هەڵکەوتــوو/ بەهرەمەندی بلیمەت ٣-پیاوی خانەدانی دەرکەوتوووی ناودێر/ ناودار.

(ألنَّوابغ): هەشت هۆزانڤانی بلیمەتن.

(ألنابِغِيّ): بلیمەتیی/ هەڵکەوتوویی.

(ألنَبِيــغ (ج) نُبَغاء): پیــاوی مەزنی ناودارو بەهرەدارم دەرکەوتوو.

نبــق: (نَبَــقَ. نَبْقــاً): لەدۆڵەکــەدا ڕیزێك خورمای درێژی ناشت.

(-الرَجُلُ): نووسی.

(نَبَّقَ - الرَجُلُ): نووسی.

(-الشَجَرَ): درەختی بەریز وا ڕێك ناشت.

(-الكِتابَ): لەسەر هێڵ ڕێکنووسی.

(نَبَّــقَ وأنْبَــقَ): ڕیزێــك خورمــای درێــی لەبەشێکی دۆڵەکەدا ناشت.

٢-(نَبَقَ - الشــيءُ نَبْقاً): شــتەکە دەرچوو/ هاتە دەرەوە دەرکەوت.

(نَبَّــقَ - الشــيءُ): شــتەکە هاتــەدەرێو دەرکەوت.

(-النَخلُ): دارخورماکــە خراپبوو بەرەکەی بچووكو وردبوو وەك گوێژ بوو.

(-إنْتَبَقَ - الكلامَ): لەئاخاوتنەکەی گەیشت و واتای دەرهاورد.

(ألنَبْق) (مص): ١-ئاردێکی شیرینە لەکورۆکی قەدی دارخورما دەردەهێنرێت.

(ألنِبــق وَ ألنَبَــق. الواحِدَةَ نَبِقَــة): بەری درەختی کۆنار/ کینار.

(نَبِقَة): دەنکە کۆنارێك.

(ألنَبيقَــةُ (ج) نَبائِق): گرێیەکە لەشــوێنی دەرچوونی هێشــوە ترێ پەیدا دەبێت کاتێك کە هێشووەکە زلدەبێت.

نبــك: (نَبَــكَ وأنْتَبَــكَ - المَــكانُ. نُبُوكاً): شوێنەکە بەرزبووەوە.

(ألنابك (ج) نَوابَك): جێی بەرز.
(مَكانٌ نابكٌ وَأرضٌ نابِكَةٌ): شوێنێكی هەڵەت/ بەرز زەوییەكی بەرز/ هەڵەت/ بڵند.
(ألنَبكـةُ (ج) نَبَكٌ وَنَبْكٌ وَنِبـاكٌ وَنُبُوكٌ): گردێكی سەرقووچو دیار یان گردۆڵكەیەك.
(ألنَبَكَـةُ (ج) نَبَكٌ وَنَبْـكٌ وَنِباكٌ وَنُبُوكٌ): ١ـگردی قـووچ یان گردۆڵكە ٢ـگڵی سـووری/ خۆڵی بنی درەخت.
نبـل: ١ـ(نَبَـلَ. نَبالَـةٌ): خانـەدان بـوو/ وەجاخزادەبـوو/ رەسـەنزادەبوو و جوامێر بوو.
(نَبيـلٌ وَنَبْـلٌ (م) نَبْلَة وَنَبيلَـة (ج) نِبال وَ نَبائِـل وَ نَبْلات وَنَبيـلات): وەجاخزادە/ خانەدان رەسەنزادە/ جوامێر/ پیاو چاك.
(نَبَـلَ - هُ. نَبْلاً): لەو وەجاخزادەتر بوو لەو جوامێرتر بوو.
(-الرَجُلَ): تیری گرتە پیاوەكە یان تیریدایە.
(-الإبلَ): حوشترەكەی تیژ لێخوڕی.
(-الرَجُلُ): خێراو چابووووكانە ڕۆیشت.
(بالسَّهم): تیرەكەی هاویشت.
(-على القَوم): تیری بۆ خوێشگەل كۆكردەوە پاشان داینی تا بیهاون.
(نَبَّلَ - عَن كذا نَبالَةً): لەوە گەورەتربوو.
(نَبَّلَ - الرَجُلَ): گەلێك تیری بەپیاوەكەدا.
(نابَلَ -هُ مُنابَلَةً): لەو خانەدانترو جوامێرتر بوو.

(أنْبَلَ - هُ): تیری دایە.
(-القِـداحَ): تـیری قومارەكەی ئەسـتوورو زبردروستكرد.
(تَنَبَّلَ): ١ـجوامێرو وەجاخزادەو زیرەكبوو/ زرنگبوو ٢ـلاسـایی خانەدانەكانـی كردەوەو وەك ئەوان خۆی نواند ٣ـمرد.
(-المالَ): (مالَه/ دارا) چاكەكەیبرد/ هەڵیبژاردو بردی.
(-تِ الخطـوُبُ): نەهامەتـی و لێقەومـاوی قورستر بوون.
(تَنابَلَ - القَومُ): خوێشـگەل ناكۆكیی كەوتە نێوانیان لەسـەر ئەوەی كامیـان وەجاخزادە تـرو جوامێرتـرن یـان كامیـان تیر باشـتر دروستدەكەن/ دادەتاشن.
(إنْتَبَلَ): مرد و بۆگەنیكرد.
(-فُلاناً): فیساری كوشت.
(-ألخَطـبُ): نەهامەتیەكـە قورسـتر بوو/ گەورەتربوو.
(-الشيءَ): پریدایە شتەكەو خێرابردی.
(-لِلأمرِ): ئاگادارو ئامادەی كارەكەبوو.
(إسْـتَنبَلَ - الرَجُـلَ): تـیری لەپیاوەكـە خواست.
(-ألمالَ): هەڵبژاردەی دارا كەیبرد.
(ألنابِل(ج)نُبَّلٍوَنَبَل): ١ـخاوەنتیرو تیرهاوێژ/ تیرئەنـداز ٢ـتیر سـاز/ تیرزانو دروسـتكەر ٣ـدەستڕاست لەتیر هاویشتندا.

(إِخْتَلَط الحابِل بالنابل): كارهیچی بەسەر هیچەوە نییەو تێکەڵ و پێکەڵە.
دەڵێن (حابِل): پشتی بەرگە.
(نابِل): بەری بەرگ.
(اَلنُبْل)١-زرنگیی/ زیرەکی و جوامێریی ٢-چاکەو پیاوەتیی ٣-لەشجوانیی و قۆزیی.
(أَخَذَ لِلأَمرِ نُبْلَهُ): بۆ ئەنجامدانی کارەکە ئامادەبوو پێویستییەکانیشی ئامادەکرد.
(اَلنَبْل) (مص)١-تیر ئەندازیی ٢-تیر ٣-خانەدانو خاوەنچاکەو پیاوەتیی.
(اَلنَبْل واحدتها نَبْلَة (ج) نِبال وأنبال وَنُبلان): تیر (وشەکە مێیە).
(نَبلُ الدَهرِ): قەوماوەکانی/ رووداوەکانی رۆژگار.
(رَجُلٌ نَبلٌ (ج) نُبَلاء): پیاوێکی مەزنی خاوەن چاکەو پیاوەتیی.
(اَلنُبْلَة (ج) نُبَل): گاتاوێر یان وردەبەرد.
(اَلنَبَل = ذَوو النُبْل): خاوەن چاکەو پیاوەتییەکان.
(نَبْلَة): گاتاوێر یان بەردی بچووك.
(رَجُلٌ نَبَلٌ (م) نَبلَةٌ): پیاوێکی یان ژنێکی خاوەن چاکەو جوامێری.
(اَلنُبْلَةُ (ج) نُبَلات): ١-بەخشش ٢-پاداشت و سزا.
(نُبلَةُ كَلِّ شيء): ناوێزەو هەڵبژاردەی هەمووشتێك.

(اَلنَبَلَةُ): خاوەن چاکەو پیاوەتی.
(اَلنَبالَة) (مص): ١-زیرەکی و جوامێریو خانەدانیی ٢-چاکەو پیاوەتی.
(اَلنَبالَة): تیرگەریی.
(اَلنُبالَة): کەرەسەی تەواوکردنی شتێك.
(أَخَذَ لِلأَمرِ نُبالَتَهُ): هەرچی پێویستی کارەکە بوو ئامادەیکرد.
(اَلنَبّال (ج) نَبّالَة): ١-خاوەن تیرو تیرهاوێژ ٢-تیرگەر.
(اَلنَبيل (ج) نِبال): ١-خانەدان/ رەسەنو خاوەنچاکە/ چاکەکار/ بەدەستودڵ ٢-کەتەو بەهێز.
(إِنَّهُ نَبيلُ الرأْيِ): رادروستو چاکە.
(اَلنَبيلَةُ (ج) نَبائِل)-مێی وشەی (اَلنَبيل).
(فُلانَة نَبيلَةٌ بالحُسنِ): فیسارە ژن بەروو دیارە خانەدانەو خاوەن چاکەیە ٢-بۆگەن (چونکە فرێدەدرێت).
(اَلأَنْبَل): هوشیارترین خانەدانترن چاکەکارترین/ جوامێرترین ك٢: چاکترین تیر هاوێژو دەستراسترین.
٢-(نَبَل - هُ بالطَعامِ نَبْلاً): کەمکەم خواردنیدایێ/ پێدا.
(- بِهِ): لاواندی و لەگەڵیدا نەرمبوو.
(اَلنُبْلَةُ (ج) نُبُلات): پارووی بچووك.
٣-(أَنْبَل - النخلُ): دارخورماکە فەریکە خورمای گرت.
٤-(اَلتِنْبال والتِنْبالَة) ١-کورتەبنە ٢-تەمەڵ.

نبــه ١-نَبَهَ وَنَبُــهَ. نَباهَــةً: ١-خانەدانبوو/ ناوداربوو/ رەســەنبوو/ نــاوی دەرکرد، ئەمە دژی خاووخلیچکییە.
(نابِه وَنَبَهٌ ونَبِهٌ وَنَبيهٌ): ١-ناودار و خانەدان/ بەنەژاد ٢-زونگ و هوشیار/ وریا.
(نَبِــهَ. نَباهَــةً): ١-نــاودارو خانــەدان بــوو ٢-زرنگو هوشیاربوو.
(-لِلأَمْرِ): بەکارەکەیزانی/ ئاگاداری کارەکەبوو/ هەستی بە کارەکە کرد.
(-مِــن نَومِه نُبْهاً): لەخــەو راپەڕی/ بەئاگا هات.
(نَبَّهَ - بِإسْــمِهِ): نــاوی هێناو وریایکردەوە/ بانگی لێکرد.
(-هُ مِن نَومِهِ): لەخەو راپەڕاند/ هەڵیساند.
(-هُ علــی أَو إلی الأَمرِ): ســەرنجی بۆ کارەکە راکێشاو لێی ئاگادارکردەوە.
(أَنْبَــهَ - هُ مِنَ النَّومِ): لەخەو (هەڵیســاند/ راپەڕاند/ خەبەریکردەوە).
(تَنَبَّهَ - مِن نَومِهِ): لەخەو راپەڕی.
(- علــی أو لِلأَمــرِ): بەکارەکەیزانی و بیری کەوتەوە رووی تێکردو پێوەی خەریکبوو.
(إنْتَبَهَ - الرَّجُلُ): پیاوەکە وەجاخزادەو پایە بڵندبوو، ناوداربوو/ وریا بووەوە.
(-مِنَ النَومِ): لەخەو بەئاگاهات.
(-لِلأَمرِ): پێیزانی.
(إسْتَنْبَهَ - مِنَ النومِ): لە خەو هەستا/ راپەڕی.

(النابِــه والنَبِه (ج) النبَهــاء): ١-وەجاخزادە ٢-زرنگ و وشیار/ بەئاگا.
(أَمرٌ نابِهٌ): کاری مەزن/ گەورە/ گرنگ.
(اَلنُّبْه): زرنگیی‌و هوشیاریی/ بەئاگایی.
(اَلنَّبَه) (مص): ١-ناودار/ بەناوبانگ ٢-دۆزراوەیەك کەبەرێکەوت بدۆزرێتەوە نەك بەدوایدا گەرابن.
(وَجَــدْتُ اَلضالَّــةَ نَبَهــاً): ونبووەکــەم/ پێداویستەکەم بەرێکەوت دەستکەوت بێئەوەی بۆی بگەرێم ٢-شتی بووە/ ئەو شتەی کە هەیە.
(اَلنَّبِــهُ (ج) نُبَهاء): ١-زرنگو وشــیار/ وریا ٢-خانــەدان/ وەجاخزادە/ نــاودار و پایەدار/ شکۆمەند.
(رَجُــلٌ نَبِــهٌ): پیاوێکــی شــکۆمەندەو وەجاخزادەیە/ ناودارە.
(قَومٌ نَبَهٌ): میللەتێکی رەسەنن/ بە ناموسن (ئەم وشەیە بۆتاك و کۆیە چونکە چاوگە).
(اَلنَبــاه): بــەرز/ بڵند کە بروانێت بەســەر دەوروپشتدا.
(النَباهَة): ١-زرنگیی/ وشــیاریی ٢-گەورەیی/ شکۆمەندیی ٢-چابوکیی.
(اَلنَبیه (ج) نُبُهاء): خانەدان/ وەجاخزادە، ناودار پایەدار/ شکۆمەند ٢-زرنگو هوشیار/ وریا/ ئاگا.
(اَلمَنْبَهَــةُ): ئاگــاکار/ هــۆکاری هوشــیاریی/ هۆشیارکەرەوە.
(هذا مَنْبَهَةٌ علی کذا): ئەمە هۆکاری هەستکردنە بەوە/ ئەمە وشیارکەرەوەیە بۆ ئەوە.

(رَجُـلٌ مَنْبُـوهُ آلإِسْـمِ): پیاوێکـە ناودارو ناسراوە/ بەناوبانگە.

٢-(أَنْبَهَ - الحاجَةَ): پێداویستیەکەی (لەیادکرد/ بیرچووەوە/ فەرامۆشکرد).

الملحق

١-نبـە: (ألتَنبیـە): ١-لەخەو یـان بێئاگایی ( بەئاگا هێنان/ خەبەرکردنەوە) راپەراندن/ هەسـتاندن ٢-ترسـاندن‌و بەئاگا هێنانەوە/ وریاکردنەوە.

(أَهْمَلَ تَنْبیهاتِ صَدیقِهِ): وریاکردنەوەکانی هاورێکەی پشتگوێخست.

(اَلتَنْبیه - فِي الإِدارة): وریاکردنەوە لەبەرێوەبەرێتیدا. کەئەوە سـزایەکە بۆ خۆراستکردنەوەی ئەو کەسەی دەیدرێتێ.

(کِتابُ تَنبیه): نوسراوی وریاکردنەوە.

(اَلتَنْبیـه - فِي قانون السَّیر): وریاکردنەوە لەیاسـای هاتوچـۆدا بەهـۆی ئامێرێکـی دەنگەوەیە کەپێی دەڵێن:

(الزَمُّور): بۆری، هۆرن.

(أَحْـرُف آلتَنبیـه عِنـد اُلنحـاة): پیتـە وریاکەرەوەکان لەلای رێزماننناسەکان ئەمانەن:

(أَما. أَلا. ها)

(أَما وأَلا): ئەری (بۆوریاکردنەوەیە). دەچنەسەر رستە.

(ها): دەچێتەسـەر ١-ناوی ئاماژە وەك:(هذا رَجُلٌ): ئا ئەمە پیاوێکە ٢-دەچێتە سەر راناوی جیا وەك:(ها أَنتم): ئا ئێوە ٣-دەچێتە سـەر (أي): بانگکردنەوە وەك.

(أَیُّها الرجُل): تۆ ئەی پیاوەکە.

(اَلمُنَبِّـه): ١-ئاگاکار/ وریاکـەرەوە ٢-هاندەرو جوڵێنەر.

(اَلْمُنَبِّـه الی خطـر): ئاگادارکـەرەوەی مەترسییەك.

(طـب ) چالاککردن‌و وریاکردنـەوەی لەش. وەك قاوە کەوریاکەرەوەیە.

(اَلمُنَبِّـه (ج) مُنَبِّهـات): ١-بەئاگـا هێـن. کاتژمێرێـك کەبەزەنـگ نووسـتوویەك خەبەرکاتەوە(طـب) مادەیەکە کەچالاکیی لـەش زۆرتـر دەکات یان ئەو وزەیـە زۆرتر دەکات کـە لـەش کاریدەکات، قـاوەو کۆلا لە وریاکەرەوەی لەش‌و وزە زیادکەرانەن.

---

نبو: (نَبا - بَصَرُهُ. یَنْبو. نَبْوَةً وَنُبُوّاً وَنُبیّاً): چاوی لێی لاکەوت/ رووی (لێوەرگێرا/ لێلادا) دڵنیانەبوو لێیدوورکەوتەوە.

ناب: چاو لاخەر/ چاو لێـدوورە وەکەوتوو/ چاولادەر.

(-آلشَـيءُ): شـتەکە دوورکەوتـەوەو کەوتە دواوەو جێی خۆی نەگرت.

(-السَّیفُ عَن آلضَریبَة): شمشێرەکە کولبوو هەڵسایەوەو نەیبری.

(-جَنْبُهُ عَن الفراش): نوێنەکەی پێ خۆشنەبوو/ ئارامی لەسەر نەگرت‌و نەحەوایەوە.

(-السَـهْمُ عَنِ الهَدَفِ): تیرەکە کورتی هێناو نەگەیشتە نیشانەکە/ نەپێکا.
(-آلطَبـعُ عَـنِ الشـيءِ): دڵـی نەچـووە سەرشتەکەو نەیوست.
(-تْ صُورَةُ فلان): روخساری فیساری ناشیرین هاتە بەرچاوو حەزینەکرد تەماشایبکات.
(-عَـنِ الشـيءِ): شـتەکەی بەجێهێشـتو لێیدوورکەوتەوە.
(-المَكانُ بِفُلانٍ): شوێنەکە بەفیسار نەکەوتو بۆی نەگونجا.
(-عَلَيـهِ الأمـرُ أَو الصاحِـبُ): کارەکەی بۆ نەرەخساو هاورێکەی لەگەڵیدا نەگونجاو ملی بۆ نەدا.
(-بـيَ فُـلانٌ): فیسـار لێمتـۆراو رووی تێنەکردم.
(نَبَـت بِيَ تِلْـكَ الأَرضُ): ئـەو خاکە بەمن نەکەوتو ستارەم تێدا نەگرت.
(أَنْبی - السَّيفَ): شمشـێرەکەی کۆڵکرد یان ئامانجی پێ نەپێکا.
(اَلنابي): ١-شمشێری کۆڵبوو یان شیرو تیرێك کە مەبەسـت نەپێکێت. ٢-پشـتکردە شـەرو هەڵاتوو ٣-قەڵەو.
(اَلنابِيَةُ): مێی وشەی (اَلنَابي): ٢-کەوانێك کە ئەمسەرو ئەوسەرەکەی زۆر لەیەك دووربن و بڵاوبێت/ ناوەراسـتەکەی لە ژێکەیەوە دوور بێت.
(اَلنَّباءة): خوازیاریـیو عەوداڵبوون بەدوای شکۆییو سەروکییو پێشکەوتندا.
(اَلنَباوَة): زەویی بڵند / بەرز/ هەڵەت.
(اَلنَبْوُ): بەرزیی/ بڵندیی.
(اَلنَبْـوَة) (مـص): هەڵەت/ زەویـی بەرز/ بڵند.
(نَبْـوَةُ الزمـانِ): نەهامەتیـی و نەهاتیی/ سەختییو وەیی رۆژگار.
(اَلنُبُوَّة): پێغەمبەرێتیی. وەرگرتنی وەحیو هەواڵو دەسـتوور لەخوداوە بانگێشتکردنی خەڵکـی بۆ رێگـەی راسـتی خـوداو ژیانی دروستییو پەیرەوکردنی.
(اَلنَّبِي): پێغەمبەر.
(اَلنَبِـي - مِن الأَرض): زەویـی بەرز/ بڵند/ هەڵەت.
نـتّ: (نَتَّ-تِ القِـدْرُ نَتِيتَـاً): مەنجەڵەکە هاتەکوڵ.
(-مِنْخَـرَهُ. نَتَّاً وَنَتِيتَاً): لـەرقو توورەییدا هەڵچوو کونە لووتی فشبوو.
(نَتَّتَ - آلخَبَرَ): هەواڵەکەی لێکدایەوە.
(تَنَتَّـتَ - الرَجُلُ): پیاوە پـاكو تەمیزەکە پۆخلو پیسبوو.
(اَلنُتَـةُ): چاڵێکـی بچـووك کەئـاوی تێـدا کۆببێتەوە.
نتأ: (نَتَأَ - الشيءُ نَتْأً وَنُتُوءً): شتەکە لەشوێنی خۆی دەرپەری بەبێنەوەی جیابێتەوە.

(-الشيءُ): شـــتەکە بەرزبوووەوە هەڵتۆقیی/ دەرپۆقی.
(-تِ القُرحَةُ): برینەکە/ زامەکە هەویکردو هەڵاوسا.
(-الثَديُ): مەمکەکە هەڵتۆقیو بەرزبوووەوە.
(-الجاریَةُ): کەنیزەکەکە پێگەیشت.
(-علی القَومِ): لەخوێشـــان دەرپەڕیو بۆیان هاتە دەرێ.
(إنْتَتَأَ- الشيءُ): شتەکە هەڵتۆقیو بەرزبووەوە.
(ألناتِـــیءُ) (فـــا): دەرکەوتـــوو/ دەرپۆقیو/ دەپەڕیـــو/ بەرزەوەبـــوو/ بـــەرز/ هەمـــوو شـــتێکی بەرز وەك خانووو شـــتیتر. وشـــەکە سوکیشدەکرێت، دەوترێت «الناتي».
(ألنُتُـــوء) (ناتـــي) (مـــص): دەرپەڕیـــوی/ هەڵتۆقیویی هەڵاوســـاویی. شتی دەرکەوتوو/ دەرپەڕیو.
(ألنُتوءِ وَالنَتْأَةُ): گرد/ تەپە.
نتب: (نَتَبَ - الشـــيءُ. نُتوباً = نَتَأَ): شتەکە لەشـــوێنی خـــۆی دەرپـــەڕیەم بەرزبـــووەوە بێئەوەی جیابێتەوە.
نتج: (نَتَجَ - الماخِضَ مِنَ ألبَهائِم نَتْجاً): بەتەنگ چوارپێ ئاوسەکەوە هات کەخەریکبوو بزێت.
(ناتِج): بەتەنگەوە هاتوو. ئاژەڵی ئاوس.
(بهیمَةٌ مَنتوجَةٌ): چوارپێیەکی بەرهەمهێنو بەچکە هێن، کە لە کاتی ئاسوبوونو زانیدا بە تەنگیەوە هاتبن.

(-ألوَلَدَ): بەچکەو ئەنجام/ بەرهەمهاتوو.
(نَتَجَها وَلَداً): بەچکەیەکی لێدەرهێنا.
(نَتـــجَ الرَجُلُ الحامِـــلَ): ســـکپڕەکە لەلای پیاوەکە زا.
(-الشـــيءُ مِنَ الشـــيءِ): شـــتێك لەشتێکیتر دەرهات/ پەیدابوو و پێگەیشت.
(-ألبَهیمَةُ وَلَداً): چوار پێکە/ زا بەچکەیەکی بوو.
(-الوَلَدُ (عند العامَّة)): لای خەڵکە ڕەشۆکەکە کوڕەکە یان زارۆڵەکە پێگەیشتو گەورەبوو.
(ناتِج): پێگەیو/ لاو.
(نَتَجتِ ألریحُ السَّحابَ): باکـــە هەورەکەی هێنایە بارین.
(نُتـــجَ-تِ البَهیمَـــةُ وَلَداً): چـــوار پێکە زاو بەچکەیەکی بوو.
(-الوَلَدُ): بەچکەکە بوو.
(-القَومُ): ئاژەڵی خوێشگەل زانو بەچکەیانبوو.
(نَتَّجَ = نَتَجَ): بەرهەمی زۆری هێنا/ بەچکەی زۆریبوو (گرتنی وشەکە بۆ زۆر بوونە).
(نَتَّـــجَ) (عامیة): لەکارەکەیدا دەســـتکەوتی زۆریبوو.
(أنتَجَ - القَومُ): ئاژەڵو حوشـــتری ئاوس یان زاویان هەبوو.
(-تِ ألبَهیمَـــةُ): چوار پێکە لەســـەر زانبوو/ کاتی ئەوەیبوو بزێت.
(نَتُوج): لەسەرزان، ئاوترێت (مُنتِج).

(أَنْتَجَ آلشيءَ مِنَ الشَيءِ): شتەکەی لەشتەکەیتر پەیداکرد/ بەرهەمهێنا/ دەرهاورد.

(-تِ آلريحُ السحابَ): باکە هەورەکەی هێنایە باران.

(أُنْتِجَ -تِ البَهيمَةُ وَلَداً): چوارپێکە زاو بەچکەیبوو.

(تَنَتَجَ - تِ البَهيمَةُ): چوارپێکە کەوتە سەر ژانی زان/ بەچەکە بوون.

(تناتَجَ - تِ الإبلُ): حوشترەکان زانو بەچکەیان لێکەوتەوە.

(إِنْتَتَجَ -تِ الإبلُ): حوشترەکان بچکەیان خستەوەو زۆر بوون.

(-تِ الناقَةُ): مێحوشترە ئاوسەکە سەری پێوەناو کەس نەیزانی لەکوێ زا.

(إِسْتَنْتَجَ):١-خوازیاری بەرهەمبوو ٢-لەپێشەکیەکان ئەنجامەکەی بۆدەرکەوتو دەریهێنا.

(اَلناتِج) (فا):١-ئەنجام/ ئاکام/ دەستکەوت/ بەرهەم.

(اَلناتِج لِلبَهائِم): یاریدەدەری زانی چوارپێ کە وەك مامانی ژنان وایە.

(اَلنِتاج): ١-بەرهەم ٢-بەچکەی چوارپێیان.

«بالناقَـةِ نِتـاجٌ»: مێحوشترەکە ئاوسەو بەچکەی پێهەیە.

(اَلنَتوج): چوارپێی ئاوس.

(اَلنَتيجَـة (ج) نَتائِج):١-ئەنجـام/ ئـاکام/ کێشەیەك یان کارێك لەپێشەکیەکەی ئەنجام دەردەهێنرێت کۆتایی دەبینرێت ٢-(ع ح) سەلماندنی داوایەکی بیرکاریی‌و دەرهێنانی کۆتاییەکەی ٣-بەچکە یان زارۆلە.

(غَنَـمُ فُـلان نَتائِجُ): مەڕەکانی فیسار بەرهەمی ساڵێکن‌و تەمەنیان وەکیەکە.

(اَلمُنتِج): دەمی/ کاتی زانی چوار پێکان.

(اَلمُنتِجَة): ژنی ئاژەڵ.

الملحق

نتـج: (اَلإنتـاج): بەرهـەم / بەرووبـووم، دەستکەوت ٢-بەروبوومی دەغڵودان ٣-پێکەوەنانی‌و پەیداکردنی سامانێکی ئابووریی.

(إنتاج القمح): بەرهەمهێنانی گەنم.

(إنتـاج أطنـانٌ مِـن الفَحْـم الحجَـري): بەرهەمهێنانی تەنەهای خەڵووزی بەردین.

(اَلإِنْتاج): ١-ئەوەی بەرهەمهاتووە: دەغڵودان‌و دانەوێڵەو بەروبوومی کشتوکاڵی.

(ماتُعْطِيه الصِناعَة): ٢-ئەوەی پیشەسازیی بەرهەمیدەهێنێت.

(كان الإنْتاجُ ضَئِيلاً): بەرهەمەکە کەمبوو/ کزبوو.

(اَلأنتاج - في الإقتصاد): بەرهەمی ئابووریی: هەر بەرهەمێك‌و بەرووبوومێك کەمرۆڤ بەهۆی کشتوکاڵ‌و پیشەسازیی‌و بازرگانیی‌و دەرهێنانی سامانی زەوی‌و شتیترەوە بەئەنجامی بگەیەنێت‌و دەستگیریبێت.

(اَلإنتاج الصناعي): بەرهەمی پیشەسازیی.

(وسائِل الإِنتاج): هۆی بەرهەمهێنان.
(اَلإنتاج في السـينَما): ١-بەرهەمی سـینەما/ پـارە تەرخانکردنو برینەوەی بۆ دەرهێنانی فیلمو سەرپەرشـتیکردنی ئـەو دەرهێنانو بەرهەمانە ٢-فیلمەکە خۆی.
(إنتاج رائِع): بەرهەمێکی ناوێزەو نایاب.
(اَلإنتاج) (الإنتاج الأَدَبي): (بەخوازە): دانانو بەرهەمهێنانی وێژەیی.
(اَلمُنتِج): بەرهەمهێن،بەرهەمهێنو پەیداکوندەو کۆکەرەوەی سامانو کەڵك.
(بَلَـدٌ مُنتِـجٌ لِلقَمـح أَوِللفَحـم): وڵاتێکی بەرهەمهێنی گەنم یان خەڵووز.
(کُبّارُ اَلمُنْتِجين): بەرهەمهێنە گەورەکان.
(-في السينَما): بەرهەمهێنی فیلمی سینەمایی: ئەوکەسـەیە کەبۆ دەرهێنانـی فیلمەکە پارە تەرخانـدەکاتو سەرپەرشـتی دەرکـردنو دەرهێنانی فیلمەکەش دەکات.

---

نتح: (نَتَح - العَرَقَ. نَتْحاً وَنُتُوحاً): ئارەق/ خوەی لەلەشی دەرچوو/ لەش ئاوی دەردا.
(-الدَسَمُ مِنَ الإناءِ): چەورییەکە لەقاپەکەوە دەڵا.
(-هُ الحَرُّ): گەرما ئاوی/ ئەرەقی پێدەدرا.
(إنْتَنَحَ - الشيءُ): شـتەکەی لەبن دەرهێنا/ دەرکێشا.
اَلنَتـح (مـص): ١: دەڵانـدن/ دەرکێشـان، دەرهێنان ٢-ئارەق/ ئاوی لەش/ خوەی.

(زِقٌّ نَتّاحٌ): مەشـکە یان هیـزە یان کوندەی دەڵێن.
(اَلنُتُـوح) (مـص): کەمتـیرە کـە درەخـت دەریدەکات.
(اَلمُنتِح (ج) مَناتِح): ئەو شوێنانەی کەئارەقی لەشی لێوە دەردەچێت.
(اَلمِنْتَحَةُ): بن.
(نتـخ: ٠نَتَـخَ -الشـيءَ نَتْخاً): شـتەکەی دەرکێشاو لەبنی دەرهێنا.
(نَتَخَ القَلاّعُ الضِرسَ): دانکێشەکە خرێکەی دەرکێشا/ دەرهێنا.
(نَتَخَتْـهُ اَلمَنِيَّـةُ مِـن بَينِ قَومِـهِ): مەرگ لەباوەشـی خوێشـگەلەکەیی هەڵپچـڕیو دەریهێنا.
(-البـازي اللَحـمَ): بازەکـە بەدەنووکـی گۆشتەکەیبرد/ فڕاند.
(-إلَيه بِبَصَرِهِ): تەماشایکرد.
(اَلمِنْتاخ): هەڵکێش/ مووکێش.
(نَتَختُ الشَوكَةَ مِن رِجلي بالمِنتاخِ): درکەکەم بەمووکێش لەپیم دەرهێنا/ دەرکێشا.
٢-(نَتَخَ - الثَوبَ بِالذَّهَبِ نَتْخاً): بەرگەکەی زێڕ چنکرد.
٣-(نَتَـخَ - فُلاناً. نَتْخاً): فیسـاری رسـواو سووککرد.
٤-نَتَخَ ونَتَّخَ - بِالمَكانِ. نَتيخاً): لەشوێنەکەدا نیشتەجێبوو.

(-على ملَّة كذا): لەسەر ئەو ڕێرەوە ئایینیە مایەوەو جێگیربوو.

نـتر: (نَتَـرَ- الشـيءَ نَتْـراً): ١-شـتەکەی توندراتەکاندو راکێشـا ٢-خێـراو بەدزییەوە بردی.

(-القَـوسَ): کەوانەکـەی توند راکێشـا یان تیرەکەی هەڵدا.

(-الثوبَ بِالأَصابِعِ أَو الأَضراسِ): ١-بەدەسـت یان بـەدان جلەکەی هەڵتلێشـاند/ لەتیکرد/ پەکالآیکردەوە ٢-دراندی.

(-آلكَلامَ): قسەی ڕەقو ناخۆشیکرد.

(-هُ بالرمـحِ): تونـد نێزەکـەی پێداکردو تێیچەقاند.

(نَتِـرَ - الشـيءُ. نَتَراً): شـتەکە خراپبوو/ گەنبوو و لەدەستچوو.

(إِنْتَتَـرَ): ١-توندراکێشـراو ٢-بەدزییەوە برا ٣-شەقپێبرا.

(نَتَرَهُ فَآنتَتَرَ): رایکێشاو راکێشرا.

(-فِي مَشْيَتِهِ): لەرۆیشتندا پشتی بەشتێکبەست واتـا بەدار دەسـت یان دەسـتی بـە دیوارەوە بەشتەوەگرت.

(اَلناتِـرَةُ (ج) النَّواتـر): کەوانێك کەژێکەی بپچرێت/ بچرابێت.

(اَلنَتْر) (مص): ١-بێتواناییو بێدەسـەڵاتیی لەکاردا ٢-توندوتیژیی/ زەبروزەنگ.

(قابَلْتُهُ بِنَتْرٍ): بەتوندوتیژیی بەرەنگاریبووم.

(أَطْعَنـوا آلنَـتْرَ): بەتوندوتیژیـی نێزەیان وەشاند.

(اَلنَتْـرَةُ (ج) نَتَـرات): ١-جارێـك تونـد راکێشان ٢-جارێك نێزە تێچەقاندێکی قووڵو کاریگەر.

(كَلَّمْتُهُ مُناتَرَةً): بێپەرواو ئاشکرا/ ڕووبەڕوو لەگەڵیدا دوام.

نتش: ١-(نَتَشَ - الشـوْكَةَ ونَحْوَها نَتْشـاً): دڕکەکەی دەرهێنا.

(-الشَعَرَ): تووکەکەی هەڵکێشا.

(-اللَحْـمَ ونَحْوَهُ): گۆشـتەکەیان شـتیتری پچڕیو بەدوو پەنجە ڕایکێشا.

(-الجـرادُ الأَرضَ): کوللە گیـای زەویەکەی قرتەبڕکرد.

(-آلحَجَرَ بِرِجلِهِ): بەردەکەی بە قاچی لادا.

(-الرَجُـلُ لِعيالِهِ): ڕەنجی بۆ خێزانەکەیداو بژێویی بۆ پەیداکردن.

(-هُ بِآلعَصا): بەدار لێیدا.

(ما نَتَشْـتُ مِن فلان شَيْئاً): هیچم لەفیسار دەستنەکەوتو وەرمنەگرت.

(-الرَجُل نَتْشاً وَتَنْتَاشاً): لەژێرەوەو بەنهێنی خەوشی لێگرت.

(أَنْتَشَ - النَباتُ): ڕووەکەکە سـەریدەرهێنا بەبێنەوەی بزانن چییە.

(-الحَبُّ): دانەکە/ دانەوێڵەکە تەربببوو ریشەی بەزەویدا برد/ چەقاند/ چەکەرەیکرد.

(-الثَوبُ): بەرگەکە درا.

(ما أَخَذَ إلاّ نَتْشاً): هەرتۆزێکی وەرگرت/ برد.

(اَلنَتْش): ١-چەکەرەکردنی گیاو رووەك و سەردەرهاتنی ٢-پەڵەی سپێتی کەلەبنی نینۆکدا دەردەکەوێت.

(تَناتیشُ الدِّین): پاشماوەی وام/ قەرز.

(اَلمِنْتَاش): مووکێش.

(نتض: (نَتَضَ آلجِلْدُ. نُتُوضاً): پێستەکە تووشی دەردێکبوو توێژی هەڵدا.

(إِنْتَضَتِ السِنُّ السِنَّ): دانەکە لەژێر دانەکەیتردا دەرهاتو ئەویتری بەرزکردەوە وەك چۆن دوومەلانێك دوومەلانەکەی سەرخۆی دەردەپەڕێنێت.

نتع: (نَتَعَ - الدَمُ مِنَ الجرح أَوِ الماءُ مِنَ العَین. نُتُوعاً): کەمکەم خوێن لەبرینەکە یان ئاو لەچاوەکە هاتەدەرێ.

(ناتِع): ئاو دەرکردوو/ ئاو یان خوێن کەمکەم لەبەر ڕۆیشتوو.

(نَتَعَهُ) (عامیة): توند رایکێشاو شەتەکیدا.

(أَنْتَعَ - الرَجُلُ): پیاوەکە ئارەق و ئاوێکی زۆریکردەوەو دەردا.

(-القَيْءُ): ڕشانەوەکە نەوەستایەوە.

نتغ: (نَتَغَ - الرَجُلَ. نَتغاً): لەپاشملە خەوشی لێگرت و بەخراپە لێیداو/ شتی ناشیرینی دایە پاڵی کەئەو وانەبوو.

(أَنْتَغَ): وەك گاڵتە جارێك پێکەنی.

(-هُ): لەپاشملە لێدووا/ غەیبەتیکرد.

(اَلمِنتَغ): کەسێکە لەپاشملە بە خراپە باسی ئەمو ئەو بکات و ئەریتیبێت غەیبەتبکات.

نتف: (نَتَفَ -آلریشَ أَوالشَعَرَ وَنَحْوَهُ): پەڕەکە یان تووکەکە مووەکەی هەڵکێشا.

(-فِي القَوس): ژێی کەوانەکەی کەمەکێك راکێشا.

(نَتَّفَ - الریشَ أَو الشَعَرَ ونَحْوَهُ): پەڕەکەیان تووکەکە/ مووەکەی دەرکێشا/ هەڵکێشا.

(أَنْتَفَ - الكَلأُ): گیاکە بەئەندازەیەك هاتەدەرێ کەدەسکەنە دەکرا.

(تَنَتَّفَ وَتَناتَفَ - الشَعَرُ أَو الریشُ): مووەکە/ تووکەکە یان پەڕەکە هەڵکێشرا.

(إِنْتَتَفَ - الریشَ أَو الشَعَرَ ونَحْوَهُ): پەڕەکەیان مووەکە/ تووکەکە/ فژەکەو شتی وەهای هەڵکێشا/ دەرکێشا.

(-الشَعَرُ أَوِ الریشُ): تووکەکەیان پەڕەکە هەڵکێشرا.

(اَلنَتِف = اَلمَنْتُوف): هەڵکێشراو دەرکێشراو.

(غُرابٌ نَتِفُ الجَناح): قەلەرەشکەیەکی پەڕی باڵهەلکێشراو.

(اَلنُتْفَةُ (ج) نُتَف): ١-هەرشتێك کەبەدوو پەنجە دەربکێشرێت وەك گیاو شتی وەها ٢-تۆزێك/ کەمەکێك.

(أَعطاهُ نُتْفَةً مِنَ الطعام): کەمەکە خواردنێکی دایە.

(أَفــادُهُ نُتْفَــةً مِــنَ عِلم): ســودی کەمەکە زانستیەکی پێگەیاند.
(أَلنُتَفَــة): کەســێکەکە تەنهــا کەمەکــە زانستییەکی بوێتو بۆی بگەڕێت.
(أَلنُتَــاف والنُتافَــة): ئــەوەی کەلەکاتــی هەڵکێشانو دەرکێشاندا هەڵبووەرێت.
(أَلنَتُوف): کەســێکە کەحەز لەهەڵکێشــانی مووی ریشی بکاتو خووی پێوەبگرێت.
(أَلنَتِیــف = أَلمَنتُــوف): ئاوەڕووتکــراو، پەڕ دەرکێشراو یان موو هەڵکێشراو.
(أَلمِنْتَاف): مووکێش مووهەڵکێش.
نَتَقَ: ١-(نَتَقَ - الجــرابَ نَتْقاً): هەمانەکەی ڕۆکرد/ دایتەکاندا.
(-الشـــيءَ): ١-شـــتەکەی هەڵبڕی ٢-شـــتەکەی لەشوێنی خۆی ترازاند/ شلۆقکرد ٣-شتەکەی ڕاخست/ پانکردەوە.
(-الجلدَ): پێستەکەی داماڵی/ گرو.
(-تِ المَــرْأَةُ أَوِ الناقَــةُ): ژنەکــە منداڵــی زۆربوو مێحوشــترەکە بەچکەی زۆربوو (وەك داتەکێنراین).
(ناتِــق وَمِنتاق): خــاوەن منداڵــی زۆر یان بەچکەی زۆر. (داتەکێنراو).
(-نَتَقَ - نُتُوقاً): قەڵەوو تێکسمراو بوو.
(-تِ الدابَّــةُ راکِبَهــا وبِراکِبِهــا): وڵاخەکە سوارەکەی نارەحەتو ماندووکرد.
(أَنْتَــقَ): ١-هەمانەکــەی ڕۆکــرد/ داتەکاند ٢-ژنێکی هێنا کەخاوەنی منداڵێکی زۆربوو.
(إِنْتَتَقَ - الشيءُ): شتەکە بەکێشبوو ڕاکێشرا.
(-آلجرابُ): هەمانەکە تەکا، ڕۆبوو.
(أَلناتِق) (فا): ١-چەرخی ئاگرکردە ٢-چارەوێیەك کەسوارەکەی نارەحەتو ماندوو بکات.
(أَلنَتْق وآلنِتَاق (في اصطلاح العامَّة)): بەدانانی ڕەشەخەڵکەکە: هێڵنجدانو ڕشانەوەیە.
(نَتَقَ): هێڵنجیداو ڕشایەوە (عامیە).
٢-(أَنْتَــقَ): خانووەکەی بەرامبــەر خانووی کەسێکیتر دوورستکرد.
(بنَى دارَهُ نِتاقَ داري): خانووەکەی بەرامبەر خانووەکەی من دروستکرد.
نتــل: ١-(نَتَــلَ - الشــيءَ. نَتْلاً): شــتەکی ڕاکێشایە پێشەوە.
(-الجرابَ): هەمانەکــەی ڕاتەکاندو هەرچی تێدابوو ڕۆیکرد.
(-مِــن بَين أَصحابهَ نَتْلاً وَنُتُــولاً وَنَتْلاَناً): پێش یارانیکەوت/ پێش هاوڕێکانی کەوت.
(تَناتَــلَ - النَبتُ): گیاکــە بەگژیەکدا چوو هەندێکی لەهەندێکیتر درێژتربوو.
(إِنْتَتَلَ): پێشکەوت.
(إِسْــتَنتَلَ - مِــن بَــين اصحابِــهِ): پێــش هاوڕێکانیکەوت/ پێش دۆستەکانی کەوت.
(-لِلأمر): ئامادەی کارەکەبوو.
(-القَــومُ على المــاءِ): خوێشــگەل/ خەڵکەکە تەکانیاندایە خۆیان بۆسەر ئاوەکە پێشکەوتن.

(ألنَتْل وآلنَتَل): هێلکەی وشتر مرخ لەزستاندا پڕدەکرێت لەناو لەبیابانە دوور ئاوەکاندا دەیخەنە ژێر خاکەوە دەیشارنەوە ئەگەر لەهاویندا بەویدا ڕۆیشتن لەقرچەی گەرمادا هێلکەکان کەناوی تێدایە دەریدەهێنن و ئاوەکەی دەخۆنەوە.

(ألنَتيلَة): هۆ/ ڕێگە.

٢-(نَتَلَ - فُلاناً. نَتْلاً): بەسەر فیساردا هەڵشاخاو قیژاندی و دەریکرد.

نتن: (نَتَنَ وَ نَتِنَ وَ نَتُنَ وَأَنْتَنَ. نَتْناً وَ نَتَانَةً وَنُتُونَةً): بۆگەنبوو/ بۆنی ناخۆشبوو.

(نَتِن وَنَتين وَمُنْتِن وَمِنْتِن): بۆگەن.

(نَتنی): مێی وشە (نَتِن)ە.

(نَتَّنَ - الشيءَ): شتەکەی بۆگەنکرد.

(ألنَيتُون) (ن): درەختە بۆگەنە/ بەدبۆنە.

(ألمِنتِين (ج) مَناتِين): بۆگەن/ بەدبۆن/ پیسبۆن.

(رجالٌ أو آباطٌ مَناتِين): پیاوانێکی بۆگەن یان بۆنناخۆش و بنهەنگڵی بۆنپیس/ بەدبۆن/ بۆگەن.

(ألمَنتَن (ج) ألمَناتِن): شوێنی بۆگەنبوون/ بۆگەن.

نتو: (نَتا - العُضْوُ. يَنْتُو نُتُوّاً): ئەندامەکە هەویکردو هەڵاوسا.

(عضوٌ ناتٍ): ئەندامی هەوکردووی هەڵاوساو.

(أنْتى إنْتاءً): دواکەوت.

(-ەُ): شێوەو ڕەوشتی لەوچوو/ لەویکرد.

(تَنَتَّى - عَلَيهِ): هەڵپەی بۆکردو بازدی بۆدا/ لێراپەڕی.

(-إسْتَنتى - الدُمَّلُ إسْتِنتاءً): دوومەڵەکە گەیشت و خەریکی دەربوونبوو.

نث: (نَثَّ - الخَبَرَ نَثّاً): هەواڵەکەی درکاندو جاریداو بڵاویکردەوە.

(-الجرحَ): برینەکەی چەورکرد.

(-الزِقُّ نَثّاً وَنَثِيثاً): کوندەکە چی تێدابوو دەڵاندی.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە لەقەڵەویدا ئاویدەردا/ ئەرەقیکردەوە.

(-العَظمُ): ئێسقانەکە چەورییەکەی دادا/ چەوروییەکەی ڕۆیشت.

(تَناثَّ - القَومُ الأخبارَ): هەواڵەکانیان بۆیەکتری دەرخست و لەناویەکدا بڵاویانکردەوە.

(ألنَثّ) (مص): بڵاوکردنەوەی هەواڵ و دەرخستنی ٢-چەورکردنی برین ٣-دیواری تەڕ.

(ألنِثاث): چەورییەکە برینی پێ چەور دەکرێت.

(ألنَثّاث وآلمِنَث): نهێنییو قسە لەدەمدا نەوەستاو کەسێکە نهێنی لانەمێنێتەوەو زوو بیدرکێنێت.

(ألنُثّاث): لەپاشملە دووەکان/ غەیبەتکەرەکان.

(ناثّ): غەیبەتکەرێک/ لەپاشملە دوویەک.

(أَلنَثِيثَة): دەلاندنی مەشكەوكوندە.
(أَلمَنثَّة (ج) مَناتّ وَمِنثَّات): پارچە خورییەك كەبرینی پێ چەوردەكرێت.
نشج: (نَشَجَ - بَطْنَهُ بِالسكينِ. نَشْجاً): چەقۆسیەكی بەسكیداكرد.
(-مافي بَطنِهِ): چی لەسكیدا بو دەریهێنا.
(إسْتَنشَجَ أحدُ العِدْلَين): تایەكی بارەكە شلبوووەوە.
(أَلنِشج): زیرەكردووی بێفەر.
(أَلمَنْشَجَةُ): كۆم/ فنگ، بن.
نشد: (نَشِدَ -الرَجُلُ. نُشُوداً): سرەوتو متبوو/ جوولەیبرا.
(-تِ الكَمْأَةُ): دوومەلانەكە رووا و دەرهات.
نشر: ١-(نَشَرَ. نَشراً ونِشاراً): بەپەخشان دوا.
(-الشيءَ): شتەكەی هەلدوا پەرش و بلاویكردەوە.
(-الدرعَ عَنهُ): زریكەی لێكردەوەو داینا.
(نَشَرَتِ المَرأَةُ بَطْنَها): ژنەكە مندالی زۆربوو.
(أَخَذَ فلانٌ دِرعاً فَنَشَرَها على نَفسِهِ): فیسار زرێیەكی وەرگرت و پۆشی.
(-تِ الدابَّةُ): ولاخەكە پژمی و چی لەلووتیدا بوو دەریپەراند.
(أَلنَشِير): پژمێنی چوار پێ.
(نَثَّرَ - الشيءَ): شتەكەی فریداو پەرش و بلاویكردەوە.
(أَنثَرَ): لووتی داكردو چی تێدابوو فرێیدا.
(-هُ): دای بەسەرلووتیدا.
(تَنَثَّرَ - الشيءُ): شتەكە كەوتە خواری و پەرش و بلاوبووەوە.
(تَناثَرَ - الشيءُ): شتەكە پەرش و بلاوبووەوە.
(تَناثَرَ - القَومُ): خوێشگەل نەخۆشكەوتن و مردن.
(إنْتَثَر- الشيءُ): شتەكە هەلوەری و بلاوبووەوە.
(تَناثَرَ وَآسْتَنْثَرَ): ئاوی بە لووت هەلمژی و هەر بەلووتی فمیكردو دایكردەوە.
(أَلناثِر) (فا): پەخشانگۆ یان پەخشاننووس.
(نَخْلَةُ ناثِرَة): دارخورمایەك بەرەكەی بەردەداتەوە/ دەوەرێنێت.
(أَلنَثْر): پەخشان نەك هەلبەست هۆنینەوە.
(أَلنَثْرَة): ١-جارێك پەخشكردن/ وپەررش و بلاوكردنەوە ٢-پارچە پەخشانێك ٣-لووت و ئەوەی پێوەیە ٤-پژمین.
(نَثْرَةُ الأَسَدِ) (فك): دوو هەسارەن كەزۆر لەیەكەوە نزیكن و نێوانیان بستێكەو پەلەیەكی سپییان تێدایە وەك گەوالە هەورێك پێشیدەوترێت (لووتی شێر)و لەهەوارەكانی مانگە.
(أَلنَثَر): ئەوەی كەپەرش و بلاودەبێتەوە كاتێك بەردەبێتەوە.
(أَلنَثِر وآلمِنْثَر والنَیْثُران): زۆر بلێی دەمشر كەهیچ لەدەمیدا ناوەستێت و هەموو نهێنیەك دەدركێنێت.

(اَلنُثَار والنُثارَة): پەخش و بڵاوبووەکانی ئەو شتانەی بڵاودەکرێنەوە.
(اَلنِثار) (مص): ئەوەی لە ئاهەنگ و شـایـیدا بەسـەر خەڵکەهاتووەکـەدا دەبەشـرایەوەو هەڵدەدرا. شاباش.
(رَجُلٌ نَثُورٌ وآمَرأَةٌ نَثُورٌ): پیاوێکی وەچەزۆر. ژنێکی وەچە زۆر.
(اَلنَثیر = اَلمَنثور): پەخشبوو، هەڵوەریو.
(کَأَنَ لَفَظْـهُ نَثیرُ الدُرِّ والـدُرُّ النَثیر): وەکو وتەکانـی گەوهەربێت و لێی هەڵوەرێت. وەکو گەوهەری لێهەڵوەریبێت.
(اَلمِنثـار): دارخورمایـەك کەخورماکـەی هەڵبوەرێت.
(اَلمُنَثَّر) (مفع): ١-بێتواناو لاوازی بێکەڵك.
(وَعِنْدَ العامَّة): چنراوێکە نیگاری ڕەنگاوڕەنگی تێدایە.
(اَلمَنثـور (مفع). الواحِـدَة مَنْثُورَه) (ن): شـەوبۆ گوڵێکە بۆنـی زۆر خۆشـەو ڕەنگی گوڵەکەی جۆراوجۆرەو بەپێی جۆرەکەیەتی.
(اَلمَنثُورُ - مِنَ الکَلام): پەخشـانە (گۆ/ وتە) نەك هەڵبەست.
٢-(اَلنَثْرَةُ): زرێیەکی سـافولووس کەئاسان لەبەربکرێت.
نـــط: ١-(نَثَـــطَ-هُ. نَثْطـــاً): بەدەســـت بەزەویەکەدا چەقاندی تا دڵنیا بێت.
(-فُلاناً): باری فیساری قورسکرد/ گرانکرد.
(-نَثْطــاً وَنُثُوطاً): ســـرەوت و ئۆقرەیگرت و هێمنبوو.
(نَثَّطَ-هُ): سرەوتیدایەو دڵنیایکرد/ دایمرکاند.
٢-(نَثَــطَ -تِ الکَمْأَةُ. نَثطــاً): دوومەڵانەکە هاتەدەرێ/ سەریدەرکرد.
نثـــل: ١-(نَثَلَ - الفَــرَسُ وَ کُلُّ ذي حافر): چارەوێکە یان هەر سمدارێك تەرسیکرد.
(-البِئــرَ نَثْلاً): چاڵاوەکــەی دەردا/ گڵەکەی لێدەرهێنا.
(-الجرابَ): هەمانەکەی ڕۆکرد.
(-الکِنانَـــةَ): تیردانەکەی ڕۆکــردو تیرەکانی بڵاوکردەوە.
(-آلدِرعَ عَنهُ): زرێکەی لێداماڵی و لایدا.
(نُثِلَت حُفْرَتُهُ): گۆڕەکەی بۆ هەڵکەنرا.
(أَنْثَلَ - البِئرَ): گڵی چاڵاوەکەی دەردا.
(إنتَثَلَ- البِئْرَ والجرابَ والکنانَةَ): بیرەکەی دەردا و هەمانەکــەی ڕۆکــردو تیردانەکــەی ڕۆکرد.
(-الدِرعَ عَنهُ): زرێکەی لێداماڵیی و لایخست/ فرێیدایە ئەولاوە.
(إِســتَنثَلَ - الکِنانَــةَ): تیردانەکەی ڕۆکردو تیرەکانی بڵاوکردەوە.
(اَلنَثَل): هەڵکەنراو.
(بِئرُكَ نَثَلٌ): چاڵاوەکەت هەڵکەنراوە.
(اَلنَثْلَــةُ): جارێــك ١-هەڵکەنــدن ٢-ڕۆکردن ٣-تەرسکردن ٤-داکەندنی زرێ.

(أَلنُثَالَة): ١-گڵی دەردراوی ناوچاڵاو ٢-پاشماوە

(أَلنَثِيل): تەرسی وڵاخ.

(أَلنَثِيلَــة = أَلنُثَالَة): گڵــی دەردراوی بیر یان پاشماوە.

(أَلمِنثَلَة): سەبەتە/ زەمیلە.

٢-(نَثَلَ - علی فُــلان درعَهُ نَثلاً): زرێکەی بەبەری فیسارداکرد.

(-اللَّحْمَ فِي القِدرِ): گۆشــتەکوتکوتکراوەکەی خستە مەنجەڵەکەوە.

(تَناثَلَ - القَومُ إِلَيهِ): خوێشــگەل بەسەریدا (داباریین/ رژان).

(إِنْتَثَلَ علی فــلان درعَهُ): زرێکەی بەبەری فساردا کرد.

(-اللَّحْــمَ فِي القِــدر): گۆشــتە پارچەپارچە کراوەکەی خستە/ کردە مەنجەڵەکەوە.

(أَلنَثْلَةُ): زرێی فراوان/ پانوپۆڕ.

(أَلنَثِيلَة): گۆشتی قەڵەو.

٣-(أَلنَثلَةُ): چاڵی نێوان ئەملاولای سمێڵ.

نثم: (نَثَــمَ وأَنْتَثَمَ. نَثماً): قســەی پیس و ناشیرینیکرد.

نثو: (نَثَا- الحَديث. يَنثو نَثواً): قســەکەی گێڕایەوەو بڵاویکردەوە.

(-الشَيءَ): شتەکەی بڵاوکردەوە/ پەخشکرد.

(- فُلانــاً): لەپاشــملە بەخراپە باســیکرد/ غەیبەتیکرد.

(-عَلَيهِ قَولاً): قسەیەکی بەدەم ئەوەوە گێڕایەوە.

(تَناثَــى - القَــومُ آلحَديــث): خوێشــگەل ئاخاوتنەکەیان لەنــاو خۆیاندا بڵاوکردەوەو پەخشیانکرد/ جاڕیاندا.

(-القَومُ الشَــيءَ): خوێشگەل لەشتەکە دوان و گفتوگۆیان لەسەرکرد.

(أَلنَاثي) (فا): لەپاشملە دوو/ غەیبەتکەر.

(أَلنَثَــا): چیت دەربــارەی پیاوەکــە وتبێت بەباش یان بە خراپ.

(أَلنَثْــوَة): خەڵــك لەیەککــردن/ دووزمانی کردن/ لەپاشملە لەخەڵكدوان.

نثي: (نَثى - آلخَبَرَ يَنثي. نَثياً): لەهەواڵەکە دواو بڵاویکردەوە.

(أَنثى - فُلاناً): لەپاشملە بەخراپە لێیدوا.

(-مِنَ الشيءِ): بێزی لەشتەکە هاتەوە.

نَجّ: ١-(نَجَّ- الشَــيءَ مِن فيهِ نَجّاً): شتەکەی ناودەمی فڕێدا.

(-تِ القُرحَةُ نَجّا ونَجيجاً): برینەکە نەوەی تێیدا بوو لەبەری ڕۆیشت.

(-الرَجُلُ): خێرایکرد/ پەلەیکرد.

(نَجُــوج): خێراکردوو/ پەلــەکار/ بەپەلە/ گورج/ جرپن.

٢-(نَجْنَجَ- فِي رَأيهِ نَجْنَجَةً): لەڕاکەیدا ڕاراو شپرزەبوو.

(-الشيءَ): شتەکەی بزواند/ هێنایە جووڵە.

(تَنَجْنَجَ - الرَجُلُ): سەرسامو پەشۆکاو بوو.

(-الشيءُ): شتەکە جووڵا.

(-الأَمـرَ): ویسـتی کارەکـە بـکات بـەڵام سوورخواستی نەبوو.

٢-(نَجْنَجَ-ت عَینُهُ نَجْنَجَةً): چاوی بەقووڵدا چوو.

(-الإبلَ): ١-حوشترەکەی بەندکرد/ نەیکردە لەوەڕگاکە ٢-لەئاوەکەیکرد.

(-فُلاناً عَنهُ): فیساری لێکرد.

نجـا: (نَجَأَ وَتَنَجَّـأَ وآنْتَجَـأَ-هُ نَجْأً): کردی بەچاویەوە.

(رَجُلٌ نَجُؤُ العَین ونَجُووُها ونَجِئُها وَنَجِیْئُها): پیاوێکی چاو پیس کەخەڵك بەچاوەوە دەکات ٢-خراپ بەچاوەوە بووە.

(نَجْأَةُ السـائِلِ): حەزلێکردن‌و چـاو تێبڕینی زۆری دەرۆزەکەرو نەوسی خواردنی بەردەست.

(رُدّوا نَجْأَةَ السائِل بِاللُّقمةِ): حەزو چاوتێبڕینی دەرۆزەکەرەکە بەپارووپەکیشبێت دابمرکێنن.

نجـب: ١-(نَجَبَ وَنَجَّبَ - الشَـجَرَةَ. نَجْبَاً): توێکڵی درەختەی لێکردەوە.

(نَجُبَ - الوَلَدُ نَجابَةً): ١: منداڵەکە رەسەنبوو ٢-کردارو رەفتار گوفتارو خووی رەسـەنانەو رەوشتبەرزانە بوو.

(نَجیب): رەسەن/ خانەدان وەجاخزادە.

(أَنْجَبَ): کـردارو گوفتارو خووی خانەدانانە بوو، بەرەوشتبوو.

(-لرَجُلُ): پیاوەکە منداڵی رەوشتباڵاو کردارو گوفتار چاکیبوو/ رەسەنانە هەڵکەوتوو.

(أَنْجَبَ بِهِ أَبواهُ): دایك‌و باوکی بە رەسـەنی بوویانە.

(إِنْتَجَبَ -الشـيءَ): شـتەکەی بەباشترگرت‌و هەڵیبژارد.

(-الشَـجَرَةَ): توێکڵـی درەختەکەیگـرت/ درەختەی پاککرد.

(إِسْـتَنجَبَ): مرۆڤی رەسەن‌و شـتی نایاب‌و هەڵبژاردەو ناوێزی خواست‌و بەدوایدا گەڕا.

(أَلنَجْب): بەخشندەو جوامێر.

(أَلنَجَب- مِنَ الشَجَرَةِ): (ز) توێکڵی قەدەکەی یان توێکڵی رەگەکانی.

(أَلنُجْبَةُ): دڵفراوان‌و بەخشندەی جوامێر.

(أَلنَجابَة):رەسەنیی/ خانەدانیی/وەجاخزادەیی، رەفتارو گوفتارو کردار جوانبوون.

(أَلنَجیب (ج) أَنجاب وَنُجَباء وَنُجُب (م) نَجیب ونَجیبَـة (ج) نَجائِـب): ١-مرۆڤی رەسـەنی رەوشت‌و رەفتارو سروشتبەرز ٢-ئاژەڵ‌و وڵاخ‌و چوارپێی رەسەن‌و چاك‌و بەبەها.

(نَجائِبُ الشيءِ): ١-ناوێزەو نایاب‌و گرانبەهای شـتەکەو پوختـەو هەڵبـژاردەی ٢-کورۆك‌و پوختەی شت کە بەرگ‌و توێکڵی پێوە نەبێت.

(نَواجِـبُ - الشـيءِ): کـورۆك‌و پوختـەو ناوەرۆکی شت کە توێکڵی پێوە نەبێت.

(أَلمِنجاب (بۆ نێرومێ) (ج) مَناجیب): خاوەن فرزەندی رەسەن‌و خانەدان بەکردارو رەفتارو گرفتار.

(اَلْمُنْجِب (ج) مَناجِــب (م) مُنجِبَة): خاوەن فرزەندی رەسەنو خانەدان بەکردارو رەفتارو گوفتار.

٢-(أَنْجَبَ - الرَجُلُ): کورێکی زۆر ترسنۆکیبوو.

نجــث: ١-(نَجَثَ وَتَنَجَّــثَ الشــيءَ. نَجْثاً): شتەکەی دەرهێنا.

(-عَنِ الأَمرِ): بۆ شتەکە گەرا.

(-القَومَ): هــاواری لەخوێشــگەلکردو هانای بۆبردن.

(تَناجَثَ - اَلقَومُ الأَخبارَ): خوێشگەل هەواڵەکانیان بەیەکتر گەیاند بۆیەکتر ئاشکراکرد.

(- إِنْتَجَثَ - الشيءَ): شتەکەی دەرهێنا.

(إستَنجَثَ- الشــيءَ): شــتەکەی دۆزییەوەو دەرهێنا.

(-لِلشَيءِ): بەرەنگاری شتەکەبووەوە.

(رَجُــلٌ نَجِــثٌ): پیاوێکە شــوێن هەواڵەکان دەکەوێتو دەیاندۆزێتەوەو دەریاندەهێنێت.

(اَلنَجّاث): شوێنکەوتووی کاروبارو هەواڵ.

(اَلنَجيث)١-ئامانج/ نیاز/ ٢: نیشانە ٣-نهێنی شاردراوە.

(بــدا نَجيــثُ القَــومِ): نهێنی خوێشــگەل (ئاشکرابوو/ پێیزانرا).

(نَجيثُ - البِئرِ): گڵو قوڕو بەردی دەردراوی چاڵاوەکە.

(اَلنَجيثَةُ): هەواڵی ناشیرین کەبڵاوبێتەوە.

(نَجيثَةُ البِئرِ): گڵی دەردراوی چاڵاوەکە.

٢-(اَلنَجــث والنُجُث (ج) أَنجاث): ١: پەردەی دڵ ٢-زرێ.

(اَلنَجيث): هێواش لەسەرخۆ/ شێنەیی.

نجح: (نَجَحَ - الأَمرُ نَجحاً وَنُجْحاً وَنَجاحاً): کارەکە ئاسان بوو، زوو بە دەستەوە هات.

(-فُلانٌ بِحاجَتِهِ): فیســار بەئامانج گەیشت پێداویستیەکەی دەستکەوت/ دەستگیربوو.

(-ت حاجَةُ فُلان): پێداویســتیەکەی فیسار دەستگیربوو.

(أَنْجَــحَ الله طَلَبَتَكَ فَنَجَحْتَ): خوا کارەکەت بۆ جێبەجێ کردیتو سەرکەوتیت.

(نَجَّحَ - هُ): سەریخست/ بەئامانجیگەیاند.

(أَنْجَحَ): ســەرکەوت، بەنیاز گەیشت/ بەئاکام گەیشت.

(ما أَفْلَــحَ فُلان ولاأَنجَحَ): فیســار نەئەوەی ویستی دەستگیریبوو ونەسەریشکەوت.

(أَنْجَحَ-اللهُ حاجَتَهُ): خوداوەند پێداویستییەکەی دەستگیرکردو بۆیسازاند.

(مُنْجِح (ج) مَناجِح وَمَناجِيح): دەستگیربوو.

(أَنْجَحَ - الباطِلُ بِفُلان): ناراستییو نارەوایی بەسەر فیساردا زاڵبوو و لەخشتەیبرد.

(-فلانٌ بِالباطِلِ): فیســار بەسەر ناراستییو گومراییدا سەرکەوت.

(تَنَجَّحَ - الحاجَةَ): پێداویســتیی لەوکەســە خواست کەبەڵێنی پێدابوو بیداتێ.

(تَناجَحَــت علیــه أَحْلامُــهُ أَومســاعیه):

ئارەزووەکانو ئەوانەی خەوی پێوە دەبینیو کۆششــی بۆ دەکردو لەسەری هەتەربوو یەك بە دوای یەکدا بەئەنجام گەیشت.

(إِسْتَنْنَجَحَ -فُلاناً حاجَتَهُ): لەفیساریخواست کەپێداویســتییەکەی بۆ بهێنێتــە دی/ بۆی جێبەجێبکات.

(اَلناجح) (فا): سەرکەوتوو، دەرچوو، براوە، دەستگیربوو، پێشکەوتوو.

(سيرٌ ناجِح): رۆیشتنێکی توندو خێرا.

(اَلنُجْح والَنجاح): سەرکەوتن، دەستگیربوون، دەرچوون، بردنەوە، بەدەستهێنان.

(اَلنجاحَةُ): ئـــارام/ خۆگرتـــن/ ئۆقرەگرتن چونکە ئارامگرتن دەبێتە هۆی ســـەرکەوتنو بەئامانج گەیشتن.

(اَلنَجْيح (م) نجيْحَة)١-رای دروســـتو راست ٢-کەســـێکە کەکاروبـــاری ســـەردەکەوێتو پێداویســـتیی جێبەجێدەبێـــت ٣-بەئـــارام/ ئارامگر/ ئۆقرەگر.

(رأيٌ نَجيح): رایەکی دروستو بەجێ.

(نَفسٌ نَجيحَة): دەروونێکی بەئارام.

(سَيرٌ نَجيحٌ): رۆیشتنێکی توندو چابووکانە.

(مكانٌ نَجيحٌ): شوێنێکی نزیك.

نجخ):١-(نَجَـــخَ -النَـــوءُ نَجْخـــاً): بارانەکە لێزمەیکرد.

(-السَيْلُ): لافاوەکە بەگور هات.

(-البئرَ): چاڵاوەکەی هەڵکەند.

تَناجَخَ - المَوجُ: شـــەپۆلەکان هەستانو دایان بەیەکداو هاژەیانهات.

(الناجَخ) (فا): ١-گەرووو ٢-دەریای هاژەکردوو.

(ناجِخُ البَحْرِ): هاژەی دەریا.

(سَـــيْلٌ ناجِخٌ): لافاوێکی تیژی بەتەوژمو بە هاژە کەزەویی (دابدرێت/ دادر دادرپیکات).

(ناجِخَةُ الماءِ): هاژەی/ هارەی ئاو.

(اَلنُجاخ): دەنگی کۆکە.

(نَجَخاتُ الماءِ): تەوژمەکانی ئاو.

(اَلنَجُوخ): دەریای بەهاژەو هارە.

(نَجيخُ الماءِ): هاژەو هارەی ئاو.

٢-(نَجَخَ. نَجْخاً): شانازییکرد.

(تناجَخ - الرجلانِ): دووپیاوەکە شـــانازیان بەسەریەکدا کرد.

٣-(نَجَـــخَ - البَعـــيرُ. نَجْخـــاً): حوشـــترەکە تلخەیکرد/ ئینتە لایکرد/ ورگی تێکچوو.

(بَعـــيرٌ نَجِخٌ): حوشـــتری تڵخەکردو/ ئینتەلا کردوو.

نجد: (نَجَدَ - هُ نَجداً):١- بەسەریدا (زاڵبوو/ سەرکەوت) بۆریدا/ بەزاندی ٢- کۆمەکیکرد/ یارمەتیدا.

(-نُجُوداً): ئاشکرابوو و دەرکەوت.

(ناجِد وَنَجْدُ): دیارو دەرکەوتوو.

(-الأَمرُ): کارەکە روونبووەوەو دەرکەوت.

(-الشــيءُ مِنَ الأَرضِ): شـــتەکە لەزەویەکە هاتەدەرێ.

(-آلبَدَنُ عَرَقاً): لەشـەكە (ئارەق/ خوەی)ی كردەوە/ دەردا.

(نَجِدَ نَجَداً): شەكەتبوو.

(ـ الرَجُـلُ): پیاوەكە لەئەنجامـی كاركردندا یاخەفەتدا لەشـی نیشتە سـەر ئاو/ ئارەقی زۆری كردەوە.

(نَجِدٌ): كەسێكە كە ئارەقی زۆر بكاتەوە.

(نَجُـدَ. نَجْـدَةَ وَنَجـادَةً): ئازایـەك بەهێز سەرو مرپبوو ئەوەی كەدەیكرد كەبەخەڵكیتر نەدەكرا.

(نُجِـدَ - الرَجُـلُ نَجْـداً): خەفەتبارکـرا/ داخیدرایە.

(مَنْجُودٌ وَنَجِيدٌ): خەفەتبارکراو/ دڵشكاو.

(نَجَّدَ - الرَجُلُ): رایكرد.

(-الدَهْرُ فُلاناً): رۆژگار فیساری بەر ئەزموون خست/ تاقیكردەوە وەكو بەوە بەهێزی بكات/ قاڵیبكات/ ئاوەسوویبكات.

(نَجَّدَ - البَيتَ): خانووەكەی رازاندەوە.

(-آلنَجّادُ الفَرشَ): فەرشچنەوە كە قاڵییەكەی/ فەرشەكەی چنییەوەو چاككردەوە.

(ناجَـدَ -هُ مُناجَـدَةً): ١-كۆمەكیكـرد/ یاریدەیدا/ بەفریایكەوت ٢-بۆشەرِ لێراپەڕی ٣-بەرهەڵستیكرد.

(أَنْجَدَ - البِناءُ): خانووەكە بەرزبووەوە.

(-هُ): فریایكەوت/ كۆمەكیكرد.

(-الدَعْوَةَ): بەدەنگ بانگەوازەكەوە چوو.

(-الرَجُلُ): ١-پیاوەكـە ئارەقیكردەوە ٢-هاتە نەجد یان بۆچوونە نەجد هاتە دەرێ.

(-تِ السماءُ): ئاسمان سایەقەیكرد.

(تَنَجَّدَ - الشيءُ): شتەكە بەرزبووەوە.

(إستَنْجَدَ): بوو بە فریاكار، دلێرو ئازابوو.

(-فُلانٌ): فیسار پاش بێتوانایی بەهێزبوو.

(-عَلَيهِ): پێیوێرا كەلەوەپێش لێیدەترسا.

(اَلناجِد (م) ناجِدَة (ج) نَواجِدَ) (فا): ١-دیار/ ئاشـكرا/ روون ٢-دلێر/ ئـازا. ٣-ئارەقكردوو ٤- دەرهاتوو، بەرزەوەبوو.

(اَلنَواجِـد): تۆپەڵە بـەز/ چەوریی (لەبەر بەرزبوونەوەو هەستانی واناونراوە).

(اَلنَجْد) (مص): ١-رێی بەرزەوەبوو/ هەڵەت ٢-مەمـك ٣-دڵتەنگیـی/ خەفـەت/ جەخار ٤-رابەری كارامە/ شارەزا.

(اَلنَجـد (ج) أَنْجُد ونُجُـد ونِجاد وَ نُجُود وَ اَنجاد وَ أَنْجِدَة): هەڵەت/ زەویی بەرز/ بڵند.

(هُـوَ طَلاَّعُ أَنْجُـدِ وَأَنجِدَةٍ وَ نِجـادِ وَطَلاَّعُ النِجـادِ): ئـەو كاردامەزرێنـەرو گیروگرفت نەهێڵە.

(اَلنَجْـد (ج) نِجاد ونُجـود): ئەوەی كەماڵی پێدەرازێنرێتەوە وەك قاڵیی‌و رایەخی چاك‌و پەردەو شتیتر.

(رَجُلٌ نَجدٌ (ج) أَنجاد) ١-دلێرێكە بەفریاكەوتوو، ئـەوەی بەودەكرێت بەكەسـیتر ناكرێت ٢-زوو بەدەنگەوە دەچێت‌و بەفریادەكەوێت.

(نَجْـد): ولآتــى نەجـد كـە لەعەرەبــى سعووديدايە.

(اَلنَجَد (ج) اَنْجاد): ١-(ئارەقى/ خوەيى) لەش ٢-كەلوپەلى مــالٌ وەك رايەخو پەردەو نوێنو قاپو قاجاخو شتيتر.

(رَجُـلٌ نَجْدٌ ونُجُدٌ (ج) أنجــاد): ١-پياوێكى نەبــەرد كەبەفريــا دەكەوێتو ئــەوەى بەو دەكرێت بەكەسيتر ناكرێت ٢-بەفرياكەوتە لە كاتى هانا بۆ بردنو بانگكردنيدا.

(اَلنَجْــدَةُ (مــص) (ج) نَجَــدات): ١-جارێك بەفرياكەوتــن/ بەهاناوە چــوون ٢-دلێريى/ نەبەرديى/ ئازايەتى ٣-جەنگكردن/ شەركردن ٤-بوێريى و نەبەرديى/ كۆ لەهيچ نەكردنەوەو بەهێزيى.

(لاقى فُلانٌ نَجْدَةً): فيســار تووشى تەنگانەو گرفتارييەكــى ســەختبوو ٥-زەندەقچــوونو مەترسييەكى زۆر.

(اَلنِجاد): قايشــى هەلٌگرتنى شمشێر (چونكە سەرمل دەكەوێت).

(هُوَ طَويلُ النِجاد): ئەو قايشى شمشێرەكەى درێژە، واتا بالآى بەرزە (ئيديۆمە).

(اَلنِجادَةُ): پيشەى فەرشچنينەوە.

(اَلنَجَّاد): فەرشچنەوەو دروستكەرى سەرينو لێفەو دۆشەك/ هەلاج/ لێفەو دۆشەكدروو.

(نُجُــودُ البَيــتِ): پــەردەى خانــوو مــالٌ كەديواريشى پێدادەپۆشرێت بۆ رازاندنەوە.

(اَلنَجُود -مِنَ النِّســاء (ج) نُجُد): ١-ئافرەتى خانەدان ٢-ئافرەتى ژير.

(- مِــن الإبِــلِ والأُتُن): ١-حوشــترو ماكەرى ملدرێژ ٢-ئەوەى كە هەميشــە لەرۆيشــتنو كارواندا لەپێشەوەيە.

(اَلنَّجيد (ج) نُجُد وَنُجَداء): ١-جەربەزەيەك ئەوەى كــە بەودەكرێت بەكەســيتر نەكرێت ٢-(ح) شێر لەبەر ئازايەتييەكەى ٣-خەفەتبارو دلٌ پر لە جەخار/ دلٌتەنگ.

(رَجُلٌ مِنجاد): پياوى (فرياكەوتە/ بەهاناوە چوو).

(اَلمِنْجَــد (ج) مَناجِــد): ١-كێوێكــى بچووك ٢-گەردانەيەك بگاتە ژێر مەمك.

(اَلمِنجَــدَةُ (ج) مَناجِــد): ١-داردەســتێكى ســووكەلە كــە ولآخــى پــێ لێبخورێــت. ٢-توولێك يان كەوانەى هەلاجيى كەخوريىو لۆكەو شتى وەهاى پێ شيبكرێتەوە.

(اَلمَنجــود) (مفــع): خەفەتبار/ دلٌشكســت/ دلٌتەنگ، داخلەدلٌ.

٢-(نَجِد. نَجَداً) : كەودەونبوو/ بێمێشكبوو.

٣-(اَنْجَــدَ - الرَجُــلُ): لــە خێزانەكــەى نزيكبووەوە.

٤-(اَلناجُــود (ج) نَواجيــد): ١-جامــى مەى ٢-مەى ٣-(ن): زەعفەران.

(اَلنجْد): شوێنى بێدرەخت.

(اَلنَجُود (ج) نواجيد): خوێن.

(اَلَمنجود): فەوتاو/ مردوو.
نجذ:١-(نَجَـذَ- هُ. نَجْـذاً): ١-بەخرێكانـی/ بەدانەكانـی دواوەی گەسـتی ٢-زۆی لێكرد / پێی لێكردە كەوش.
(نَجَّذَ - هُ): خستیە بەر ئەزموونو ڤاڵیكردو پێیگەیاند.
(-تْهُ التَجـارِبُ): ئەزموونـی زۆر ڤاڵیكرد/ دەرهاتو دانابوو.
(-تْهُ البَلایا): وەی و گرفتاریی دامێنیگرتو تووشیبوو.
(اَلناجِـذ (فـا) (ج) النَواجِـذ): خـرێ كە چوارنو لەدواوەن.
(عَـضَّ علی ناجِذِهِ): گـازی لە خرێی خۆی گرت، واتە ژیر بـوو، چونكە خرێكان درەنگ دەردێـن، لەبەر ئەوە بە چوار خرێكەی دوای دواوە دەڵێن دانی ژیری یان ئاوەزپری.
(ضَحِكَ حتـی بَدَت نواجِـذُهُ): واپێكەنیو دەمیكردەوە تادانەكانی ئاوەزپریی دەركەوت كەلەبنی بنەوەن.
(اَبْدَتِ الحَربُ ناجِذَیها): جەنگەكە گەرمبوو/ سەختبوو.
(عَضَّ الرَجُـل علی ناجذَیه): پیاوەكە دانی بەخۆیدا گرت/ ئارامیگرت/ گازی لە دانەكانی دواوەی گرت.
٢-( اَلمناجِـذ (ج) جُلَـذ = الخُلد): (كۆگەی لەوشەی خۆی نییە): مشكە كوێرە.

نجر: ١-(نَجَرَ - اليَومُ نَجْراً): رۆژ كە گەرمبوو.
(-المـاءَ): ئاوەكـەی بـە بـەردی داخبـوو گەرمكرد.
(نَجِرَ. نَجَراً): تووشی تینوێتییەكی زۆربوو.
(اَنْجَـرَ - فُلاناً): شـیر ئـاردی دەرخواردی فیساردا.
(اَلناجِر): هەموو مانگەكانی هاوین كەتیایدا حوشتر تینوێتیی زۆر دەكێشێت.
(اَلنَجْر) (مص): گەرما.
(اَلنَجَر): تینوێتیی زۆر كەحوشترو هێستریش تووشـی دەبێتو تینوێتییەكەی ناشـكێتو تێرئاو نابێت.
(اِبِـلُ نَجِـرَةٌ): حوشـتر گەلێك كەتووشـی تینوێتیەكی وابووبێت تینوێتی نەشكێت.
(اَلنَجْران): تینوو.
(اِبِـلُ نَجْـری ونَجـاری): حوشـتر گەلێك كەتووشی تینوێتیەكی زۆر بووبێتو هەر تێر ئاو نەبێت.
(اَلنَجِیرَة): ئاوی بە بەردی داخ گەرمكراو.
(اَلِمنْجَرَة): بەردی داخبوو.
اَلنَجـیرَة: خواردنێكە كە بەئاردو شـیرو رۆن دروستدەكرێت.
(اَلِمنْجَـرَة): بـەردی داخبـوو كەئـاوی پـێ گەرمدەكەن.
٢-(نَجَـرَ - الخَشَـبَ. نَجْـراً): تەختەكەی داهێنا/ تاشیو چاكیكرد.

(اَلنَجر): ١-بێخ، رەسەن/ ريشە ٢-رەسەن/ نەژاد/ رەچەڵەك ٣-باوو باپير.
(اَلنِجار والنُجار): ١-بنەرەت ريشە/ بێخ ٢-باووباپير ٣-رەسەن / نەژاد/ رەچەڵەك.
(اَلنِجارَة): دارتاشيی.
اَلنُجارَة: ئاردە دارو تەلاشەدار.
(اَلنِجْران): گرێژەنەی دەرگا.
(اَلنَجَّار): دارتاش.
(اَلنَجيرَة)١- بنميچ كە بە دارو تەختە دەكرێت ٢-سزای تاوانو گوناه.
(اَلأنْجر و اَلأنْجَرَة (ج) أناجِر) (فارسية): لەنگەری پاپۆر.
(اَلمِنْجَر): ئامێری لەنگەرگرتن.
(اَلمَنْجُور) (مفع): بەكـرەی ئاوهەڵێنجانی چاڵاو.
(اَلمِنْجيْرَة: (عامية): جووزەلە كەلەقاميشە.
٣-(نَجَرَ - الرَجُلَ. نَجْراً): بەلێدان پياوەكەی دەركرد.
(-اَلإبلَ): حوشترەكانی دايە پێش خۆیو لێيخورين.
(اَلمِنْجَر): حوشتر رافرێن/ لێخورێكی توندوتيژ.
٤-(نَجَرَ - الشيءَ. نَجراً): ويستی شتەكە ئەنجامبدات.
(اَلمَنْجَر): نيازێك كەلەرێی دوورنەكەوێتەوە.
٥-(اَلنَجْر): رەنگ.
(اَلنِجار والنُجار): رەنگ.

نجز: (نَجَزَ - الحاجَةَ. نَجْزاً): پێداويستييەكەی بەجێهێنا/ ئەنجامدا.
(-بالوَعْدِ): بەڵێنەكەی زوو بردە سەر.
(-الوَعْدُ)١- بەڵێنەكە/: گفتەكە زوو برايە سەرو بەجێهێنرا ٢-تەواو بوو.
(نَجَزَ وَنَجِزَ - الشيءُ نَجَزاً): كۆتايی شتەكە هات/ تەواو بوو ٢-شتەكە فەوتا/ لەناوچوو.
(-الكَلامُ): ئاخاوتنە پچڕا/ بڕا.
(نَجَّزَ - الحاجَةَ): پێداويستيەكەی راپەراند جێبەجێيكرد/ دەستخست.
(-الشيءُ) (عامية): شتەكە خەركی تەواوبوونبوو.
(-فِي عَمَلِهِ) (عامية): خەريكبوو لەكارەكە ببێتەوەو تەواوی بكات.
(ناجَزَ - هُ): بەگژێدا چوو وشەڕی لەگەڵدا كرد.
(اَلمُحاجَزَة قَبلَ المُناجَزَة): رێكەوتنو ئاشتی لەسەر كێشەيەك لەشەڕ باشترەو لە پێشترە.
(أنْجَزَ - الحاجَةَ): پێداويستيەكەی بەجێهێنا.
(-الوَعْدَ): بەڵێنەكەی بردەسەر.
(أنْجَزَ حُرٌّ ما وَعَدَ): ئازاد بەڵێنی بردەسەر.
(أنْجَزَ - على القَتيلِ): كوژراوەكەی تەواو كوشت.
(تَنَجَّزَ - الحاجَةَ أو الوَعْدَ): داوايكرد پێداويستيەكە جێبەجێ بكرێت يان بەڵێنەكە ببرێتە سەر.

(-الشَّـــرابَ): هەرخەریکی شـــەرابخواردنەوە بوو.

(تَناجَزَ - القَوْمُ): خوێشگەل شەرەشیریانکردو لەگەڵ یەکدا جەنگین.

(إسْـــتَنجَزَ - الحاجَـــةَ أو الوَعْـــدَ): داوایکرد پێداویستیەکە جێبەجێ بکرێت یان گفتەکە ببرێتەسەر.

(ألناجِز): ١-جێبەجێکراو ٢-کۆتایی پێهاتوو/ تەواو بوو ٣-ئامادە بوو.

(وَعْـــدٌ ناجِـــز): بەڵێنێك کەبرابێتە ســـەر/ جێبەجێکراو.

(بِعْتُـــهُ ناجِزاً. بِناجِزٍ): دەســـت بەدەســـت پێمفرۆشت.

(لایُبـــاعُ غائِبٌ بِناجِـــز): شـــتێك کەلەبەر دەستدا نەبێت. بەپارەی دەستی نافرۆشرێت.

(ألنَجْز وَالنَّجـــاز = ألإنجاز): جێبەجێکردنی پێداویســـتی و بردنـــە ســـەری بەڵێـــن/ کار ڕاپەڕاندن/ تەواوکردن.

(أنْتَ علی نجزِ حاجتك): تۆ لە تەواو کردنی پێداویستییەکەتدایت.

(ألنَجیز): ئامادە بوو ئەوەی کە ئێستا هەیە.

(وَعْدٌ نَجیزٌ): گفتێکی بەجێهاتوو.

نجـــس: (نَجِسَ وَنَجُسَ نَجَســـاً وَنَجاسَـــةً): ١-گڵاوبوو ٢-زۆر پیسبوو.

(نَجِـــسٌ وَنَجُـــسٌ (ج) أنجـــاس): گڵاو/ زۆر پیس.

(نَجَّسَ - هُ): گڵاویکرد.

(نَجَّـــسَ - الصَبِيُ ولَهُ): مووررووی شـــین یان دۆعاو شتی چاوەزاری کردە ملی/ شتی پیسی پێدا هەڵواسی.

(أنْجَسَ - هُ): گڵاویکرد.

(تَنَجَّسَ): گڵاوبوو.

(-الثَوبُ): جلەکە لەکاویبوو.

(-الرجُـــلُ): گڵاویـــی خۆی دەرکـــرد/ خۆی لەپیســـی پاككـــردەوە/ خۆیـــی پاککردەوە/ لەشپیسی خۆیی دەرکرد.

(داءُ ناجِـــسٌ وَنَجِـــسٌ وَنَجیـــسٌ): دەردێکی پیس کەچاکبوونەوەی نەبێت.

(ألنُجُس): دۆعاو نوشتە نووسانو جادووگەران.

(ألأنجاس): مووررووی شینی چاوەزارو دۆعاو نوشتەو شتیتری چاوەزار.

نجش: ١-(نَجَشَ- الشَيءَ نَجْشاً): ١ بۆشتەکە گەڕا دزۆییەوەو وروژاندی ٢-دەریهێنا. ٣-پاش بڵاوبوونەوەی کۆیکردنەوە.

(-العَیدَ): ڕێچیرەکەی لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکیتر دەرپەڕاندو ڕاونا.

(-النارَ): ئاگرەکەی کردەوە.

(-الحدیـــثَ): باســـەکە یـــان ئاخاوتنەکـــەی بڵاوکردەوەو پەخشکرد.

(-فِي البَیع): بازاری ڕەشـــی دروستکرد بەدرۆ لەگـــەڵ یەکێـــك ڕێککـــەوتو نرخێکی زۆری بەکاڵایەکدا تا کڕیارێك بەو نرخە بیکڕێتو

فرۆشــیارەکە بەهەڵــەدا بەرێــت بەگــران بیفرۆشــێت یان بــە پێچەوانــەوە بۆ ئەوەی کریارەکان لەکڕینی شتەکە بتەکێنێتەوە.

(اَلنَجش): بازارگەرمکردن.

(نَجَش. نَجْشاً وَنَجاشَةً): پەلەیکرد/ خێرایکرد (وەك لەرۆیشتندا تۆز هەڵبسێنێت).

(تَناجَشَ - القَومُ في البَيعِ وغَيرِهِ): لەکڕین و فرۆشتندا لەسەر یەکیان زیاد کرد/ پترکرد.

(إِسْتَنجَشَ - الشيءَ): شتەکەی دەرهێنا.

(-الصَيدَ): نێچیرەکەی هەڵفراند وراونا.

(ناجِش): راوکەر.

(اَلنَاجِــش والنَجَاشِــيُّ): کەســێکە کەنێچیر هەڵبسێنێت و بۆلای راوکەرەکەی راوبنێت.

(اَلنَجَّاش): راوکەر.

(رَجُلٌ نَجُوشٌ): نێچیر هەڵسێن بۆ راوکەر.

(اَلنَّجيش): راوکەر.

(اَلمِنْجاش)١-ئەوکەســەیە کەنێچــیر بــۆلای راوکــەر هەڵدەســێنێت ٢-خــەوش/ عەیــب لەخەڵك دەرهێن و گاڵتە بە خەڵککەر.

(اَلمِنْجَش): کەســێکە کەموکووری لە خەڵکدا بدۆزێتەوەو بەیەکیاندا بدات.

(رَجُلٌ مِنجَش): پیاوێکی هەڵســێنی نێچیرە بۆ لای راوکەر.

(قَولٌ مَنجوش): قسەی هەڵبەستراوو درۆ.

٢-(اَلنجــاش): قایشــێکە دەخرێتــە نێــوان دووچەرمەوەو پێیانەوە دەدورێت.

(اَلنَجَاشي والنِجاشي وَالنَجاشِيُّ وَ النِجاشِيُّ): نازناوی شای حەبەشــە لەوشەی (نیجوشتی) حەبەشییەوە کراوە بە عەرەبی واتا شا.

(نجع:١-(نَجَعَ - الطَعامُ في الأَسنانِ نُجوعاً): خواردنەکەی بەدەم خۆشبوو کەڵکی لێبینرا.

(هذا طَعامٌ يَنجَعُ عَنهُ وبِهِ): ئەمە چێشتێکە/ خواردنێکە خۆشــەو بەمرۆڤەکەوێت و پێی قەڵەو دەبێت.

(نَجَعَ - فيــه الدَواءُ أَو الطَعَــامُ أَو الكُلامُ): دەرمانەکە یان خواردنەکــە یان ئاخاوتنەکە کەڵکی باشی پێ بەخشی.

(-البَلَدَ): هاتە شارەکەوە.

(-القَــومُ الــكَلأَ): خوێشــگەل بۆ لــەوەری ئاژەڵەکانیان گەڕان و روویانکردە لەوەڕگاکان.

(-الإبِــلَ آلــنَجُــوعَ وَبِــالــنَجُــوعِ): ئــاوی بەخوشترەکاندا.

(نُجِــعَ - الصَبِيُّ لبنَ الشــاةِ أَوبِلَبنِ الشــاةِ): شیری مەڕ بەساواکەدراو پێی بەخێوکرا.

(نَجَّــعَ - الطَّعــامُ في الإنســانِ): خواردنەکە بەمرۆڤەکە کەوت و لای خۆشــبوو و سوودی لێبینی.

(-فيهِ آلدواءُ أَو الطَّعامُ أَوالكلامُ): دەرمانەکەیان خواردنەکــەی یان قســەکەی وەرگــرت و بۆی باشبوو پێیکەوت و کەڵکی لێبینی.

(أَنْجَــعَ - الطَعامُ وَغَــيرُهُ): خواردنەکە یان شتیتر کەڵکیدا/ بەسوود بوو.

(-الرَجُلُ): سەرکەوت.

(-الراعــی الفَصیــلَ): شــوانەکە بەچکــە ساواکەی گۆشکرد شیریدایە.

(تَنَجَّــعَ وآنْتَجَعَ- فُلاناً): هاتە لای فیســارو داوای لێکرد شتی پێببەخشێت/ دەستگیرۆیی بکات/ چاکەی لەگەڵدا بکات.

(تَنَجَّــعَ وآنْتَجَعَ وآسْــتَنجَعُ- القَــومُ الكَلأَ): خوێشــگەل بۆ لــەوەڕ گــەڕان و ڕوویانکردە جێڵەوەڕ.

(أسْــتُنجِعَ - بِــهِ وَعَنهُ): پێیکــەوت و پێی قەڵەوبوو.

(ألناجِــعُ (ج) ناجِعَــة وَنَواجع): لە لەوەڕگا بەدوای لەوەڕدا گەڕاو.

(مــاءٌ ناجِــع): ئاوێکی ســازگار/ شــیرین و سووك.

(ألنُجْعَــةُ (ج) نُجَــع): گەڕان لــە لەوەڕگادا بەدوای لەوەڕدا.

(خَرَجوا لِلنُجْعَةِ): بۆ شــوێنی لەوەڕگاکان و شوێنی گیا دەرچوون.

(فُلانٌ نُجْعَتِي): فیسار هیوای منە.

(ألنَجُــوع): پەڵولاو/ ئاردوئاو کەبەحوشــتر دەدرێت/ ئارداو.

(نَجوعُ الصَبِيِّ): شیری ساوا.

(ماءٌ نَجوع): ئاوێکی سازگار/ سووك و خۆش کەبەخەڵك بکەوێت.

(ألنَجِيع): سوودبەخش/ بەکەڵك/ کاریگەر.

(-مِــنَ الطَعــام أَوِ الشَّــراب): خــواردن و خوردانەوەیەك کەبۆ لەش کەڵکدار بێت.

(ماءٌ نَجيعٌ): ئاوێکی سوودبەخش/ کەڵکدار.

(ألمَنجَع وآلمُنتَجع وَالمُسْتَنْجَع): شوێنێك کەبۆ لەوەڕو گیا بۆیبچن/ لەوەڕگا.

٢-(تَنَجَّعَ -بالدَّم): خوێناویبوو.

(ألنَجيــع - مِنَ الدَّم): خوێنی (تۆخ/ مەیلەو ڕەش).

٣-(ألنَجع (ج) نُجُوع): ڕەشماڵ/ دەوار.

(ألنُجاع): سەربەئازا/ شوێنکەوتوانی پیاوێکی ئازا.

(شُــجاعٌ نُجــاعٌ): دلێــرەو ســەربەئازایە/ پشتیوانی ئازایەو حەز بەئازایەتییە.

نجــف: ١-(نَجَــفَ- آلنَجيــفَ نَجْفــاً): تیرە نووکپانەکەی دادا.

(نَجيف وَمَنجُوف): تیری نووکپان.

(نَجَّفَ -تِ آلريْحُ الكَثيبَ، أَو الرَملَ): با گردە لمەکە یان لمەکەی ڕادا.

(ألنَجَــف (ج) نِجاف وَآلنَجَفَة): ١-گرد/ تەپە ٢-شــوێنێکی دۆڵەکــە کەئــاو نەیگرێتــەوەو نەیگاتێ.

(ألنِجاف): سەردەرگا کە دورستدەکرێت.

(نِجافُ الغار): تاوێری سەر ئەشکەوت.

(ألنَجيف (ج) نُجُف): تیری نووکپان.

(ألْمَنجوف) (مفــع): ١-تیری نووکپان ٢-(قاپ/ دەفرێك یان گۆڕێکی ناوو تەنیشت فراوان.

٢-(نَجَـفَ - الشَـجَرَةَ نَجفـاً): درەختەکەی لەبنەوە بڕییەوە.

(-الشـاةَ): مەڕەکەی تەواو دۆشـیو شـیری لەگواندا نەهێشت/ گوانی سیسکرد.

(نَجَّفَ -لِفلانٍ مِنَ اللَّبنِ. نَجْفَةً): جۆرە شیرێکی بۆ فیسار لاخست.

(إِنْتَجَفَ وآسْتَنْجَفَ - الشيءَ): شتەکەی دەرهێنا؛ دەرکرد.

(-الشـاةَ): مەڕەکەی تەواو دۆشـیو شـیری پێنەهێشت.

(-تِ الريحُ السَّحابَ): باکە بارانی بەهەورەکەوە نەهێشت/ چۆڕبڕیکرد.

(اَلنُجْفَـةُ): چکێـك، کەمەکێـك توزێـك، نەختێك.

(اَلمِنْجَفُ): سەبەتە/ زەمیلە.

٣-(المَنجوف): زیرەکردو/ زۆر ترسنۆك.

نجل:١-(نَجَلَ-هُ أبوهُ وَنَجَلَ- بِهِ. نَجلاً): باوکی زارۆڵەکە/ منالەکە زارۆڵەکەی خستەوە.

(-فُلانـاً): بەنووکـی پێ لەفیسـاری هەڵداو خلبۆوە.

(-النَّاسَ): لەگەڵ خەڵکدا نەیارو خراپبوو.

(مَـن نَجَـلَ النـاسَ نَجَلوهُ): هەرکـەس خەوش لەخەڵـك دەربهێنێـت خەوشـی لێدەردەهێنـنو هەرکەس جنێو بەخەڵك بدات جنێوی پێدەدەن.

(نَجَلَ- آلشَـيءَ وَبِالشَـيءِ): شتەکەی فڕێدا/ تووڕدا.

(تَناجَـلَ- القَـومُ): وەچەیـان خسـتەوەو وەچەیان زۆربوو.

(إِنْتَجَلَ - فُلانٌ النَزَّ): ئاوە دەڵیوەکەی گرتو دەرهێنا.

(إستَنجَلَ - المَكانُ): شوێنەکە ئاوی هەڵقوڵیوی زۆربوو.

(اَلناجَل)(فـا) (م) ناجلَـة (ج) ناجـلات وَنَواجِـل): وەچـەی رەسـەنی مـرۆڤ یان بەچکەی زیندەوەری رەسەن.

(اَلنَجْل (مـص) (ج) أَنْجال)١- ئـاوی هەڵقوڵیوو دەڵیوی زەوی ٢-فرزەند وەکو دایکی دەرپەڕاندبێت.

٢-وەچە/ نەوە/ بەرە/ تۆو/ لێوەکەوتوو.

(هُوَ كَريمُ النَجلِ): ئەو نەوەیەکی رەسـەنەو سرووشتچاکە. ٤: باوك.

(اَلنَجـل (ج) نِجَال وأَنْجـال): ١-ئاوی لەبەر ڕۆیشـتوو ٢-ئاوی زەلکاو/ زۆنگاو وهەڵقوڵیو لەزەویـدا/ کـەزەوی دەیدەڵێنێتـە زۆنگو زەلکاوەکەوە.

(اَلمِنْجَل)١- پیاوی فرە فرزەند ٢-داس کەدرووێنەی پێدەکەن. ( لەفرێدانی شتەوە هاتووە).

٢-(نَجَلَ - الشيءَ نَجلاً): شتەکەی (دەرخست/ ئاشکراکرد.

(-الأَرضَ): زەویەکەی کێڵا.

(-آلجلدَ عَنِ المَنبوحِ): لەرەفیچکی سەربڕاوەکەوە پێسـتەکەی هەڵدریو پاشـان لەپشـی ملیەوە گورووی و پێستەکەی لێکردەوە.

(جِلْدٌ مَنْجُولٌ): پێستی گوراوو لێکراوه.
(-هُ بالرمْحِ. نَجلاً): نێزەی پێداکرد.
(نَجِـلَ - الرَجُـلُ. نَجَـلاً): چـاوی گەورەو جوانبوو/ چاومەستبوو.
(أَنْجَل): چاومەست.
((ج) نُجْل وَنجال): (عَينٌ نَجلاء (ج) نُجْل): چاوی مەست/ چاوی گەورەگەورەو جوان.
(تَناجَـلَ - القَومُ): خوێشـگەل لەگەڵ یەك ناکۆکبوونو شەرو هەڵایانبوو.
(إنْتَجَـلَ - الأَمْـرُ): کارەکـە روونبـووەوە/ دەرکەوت.
(أَلنَجْل (ج) نِجال وَأَنْجال): ناوەراستی رێگا.
(أَلأَنْجَـل (ج) نُجُل وَنِجـال (م) نَجلاء (ج) نُجْل): فراوانی درێژی پان.
(طَعَنَـهُ طَعْنَةً نَجـلاء): پێداکردنێکی وای پێداکرد کە برینێکی گەورەو فراوانو قووڵی تێداکرد.
(سَنانٌ مِنْجَلٌ): نووکی نێزەیەك کە برینێکی گەورەو قووڵ بکات.
٢-(نَجَلَ -تِ الأَرضُ نَجلاً): زەویەکە سەوزبوو.
(. أَنْجَـلَ - الدابَـةُ): چوارپێکانـی کـردە هەرێزگاوە.
(أَلنَواجِل): حوشـترگەلێك کەلـە هەرێزگادا دەلەوەرین.
(أَلنَجيل (ج) نُجُل) (ن): ١-هەرێزو هەرێزگا. گیایەکە پەلێکی زۆری لێدەبێتەوەو لەزەویدا خۆی دەچەقێنێتو درێژ دەبێتەوە وادەبێت کە زۆربەگران دەردەهێنرێتو لەناو دەبرێتو زیانێکـی زۆری بۆ کشـتوکاڵ هەیە ٢-گەڵای وەروی هەرێز.
(أَلنَجيليات) (ن): کۆمەڵـە رووەکێکە کەتاکە خەپلـەن لاسـکێکی رێکیان هەیــەو بەزۆری بۆشەدانەوێڵەکان دەگرێتەوە وەکو گونمو جۆ.
(أَلمِنْجَل): کشتی بەیەکدا چووی لەیەکئاڵاو.
٤-(نَجَـلَ - الرَجُل. نَجْـلاً): ( بەگور/ توند) رۆیشت.
(أَلمِنْجَل): حوشترەوانی کارامەو لێزان.
٥-(نَجَـلَ -الصَبِـيُّ اللَّـوحَ): مندالەکـە تەختەرەشەکەی سرییەوە.
٦-(أَلنَجْل (ج) نِجَـال وَأَنْجَال)١- کار/ ئیش/ فرمان ٢-کۆمەڵێکی گەورە.
نجـل: (أَلمِنْجَلَـه (ج) مَناجِـل): مەنگەنە/ گـیرە/ ئامێرێکـە دوو پارچەیــە یەکێکیان ناجووڵێـت ئەویـتر دێـتو دەچێـت بەپێی پێویسـت بـۆ گیرکردنی شـتو گرتنی کاتی برینی ئەوشـتە یان شـێوە پێدانی. جۆرێکی بەبنکـەوە قایمدەکرێت هەیشـە لەشـوێنی کارکردنەکەدا جێگـیر دەکرێتو ناجووڵێت/ بەملاولادا نابرێت.

---

نجم:١-(نَجَـمَ -الشَـيءُ نُجُومـاً): شـتەکە دەرکەوت، پەیدا بوو/ هەڵهات/ هەڵکەوت.
(نَجَمَتِ - الكواكِبُ): هەسارەکان هەڵهاتن.

(نَجَمَ النَبتُ والسنُّ والقَرْنُ): گیاکە سەریدەرکرد. دانەکە دەرهات. شاخەکە دەرهات.

(نَجَمَ في بنى فُلانٍ شاعِرٌ أوفارِسٌ): لەفیسار بەرەو هوزانڤانێک/ شاعیرێك یان سوار چاکێك هەڵکەوت.

(-كذا عَن كذا): ئەوە لەوە پەیدا بوو، هەڵکەوت.

(-السَهْمُ أوالرمحُ): تیرەکە یان نێزەکە چەقی/ پێداچوو.

(-فُلانٌ الدَينَ): فیسار وامەکەی لەکاتی دیاریکراودا دایەوە.

(نَجَّمَ): ئەستێرە گەرییکرد چاودێری ئەستێرەکانیکرد تابزانێت گێتیی باری چۆن دەبێت.

(-الدَينَ): وامەکەی لەکاتی دیاریکراودا دایەوە.

(-عَلَيهِ الدِيَّةَ): خوێنباییەکەی بەچەند جارێك و لەکاتە دیاریکراوەکاندادا.

(أنْجَمَ -الشيءُ): شتەکە هەڵات و دەرکەوت.

(-تِ السَّماءُ): ئەستێرەکانی ئاسمان هەڵاتن/ دەرکەوتن.

(تَنَجَّمَ): ئەستێرەگەرییکرد/ چاودێریی ئەستێرەکانیکرد.

(ألنَّجم)١- هەر رووەکێك کە لەسەر قەد نەوەستێت وەك درەخت نەبێت ٢-بنەرەت/ بنچینە/ سەرچاوە.

(هذا الحَديث لا نَجمَ له): ئەم ئاخاوتنە سەرچاوەی نییە.

(-(ج) نُجُوم وَأنْجُم وأنْجام ونُجُم)(فك): ١-هەسارە. بەزۆریی بەهەسارەی (كۆ) حەوتەوانەی بچووك دەڵێن ٢-ئەو وامەی کەلەکاتی دیاریکراودا دەدرێتەوە.

(جَعلْتُ مالي عليه نُجوماً منجمة يؤدى كُلُّ نَجم منهافي وَقت كذا): ماڵەکەم کەبەسەریەوەیە بەشبەشمکردو هەربەشەی کاتم بۆ دیاریکرد کەبیداتەوە ٣-ئەو کاتەی کەدەبێت وامەکەی تێدا بداتەوە (چونکە کاتەکانیساڵیان دەزانی ئەویش بە چاودێریی ئاوو هەوا.

(نَجمُ البَحرِ) (ح): ئەستێرە دەریا: زیندەوەرێکی دەریاییە لەشێوەی ئەستێرەدایە لەتەنێك وپێج دەست یان پتر پەیدابووە زۆر بەهێواشی دەروات هەندێك زیندەوەری دەریایی دەگرێت و دەیخوات وەك کرمی دەریاو گوێچکە ماسی.

(نُجوم آلسِينَما): نازناوی ئەکتەرە دەرکەوتووو کارامەکانی بواری سینەمایە.

(ألنَجمةَ): ١-ئەستێرە ٢-وشە ٣-(ن) جۆرە رووەکێکە.

(ذو النَجمة): نازناوی کەرە، چونکە حەزی لە گیایە/ رووەکە.

(ألنَجمَتان المُزْدَوِجتان): ئەو دوو ئەستێرەیەی

کـەبـەدەوری تـەوەرە هاوبەشەکەیاندا دەسووڕێنەوە ٤-رووەکێکە بەسەر زەویدا دەخشێت و قەدی نییە دەڵێن هەرێزە یان گیا ئەستێرەیە یان گیایەکیترە کەخشۆکە.

(اَلنَجَّام وَاَلْمُتَنَجُّم): ئەستێرەگەر/ ئەستێرەوان/ ئەستێرەناس. ئـەو کەسەیە کەچاودێریی ئەستێرەکان دەکات و کاتەکانیان دەگرێت و ڕێرەوەکانیان چاودەکات بۆ زانینی باری گێتی.

(اَلنَجیم - مِنَ النَّبات): گیای تەڕوتازە دەرهاتوو.

(اَلمَنجَم): ١-دەرچە/ دەرە ٢-کانزاکان ٣-ڕێی دیار/ ئاشکرا.

(اَلمُنَجم): باهووی ترازوو کە زمانەکەیی پێوەیە.

(اَلمُنَجِّم = اَلنَجَّام)١-ئەستێرەوان ٢-ئەستێرە گرەوەی بەخت کەگوایا چارەنووسی بەختی خەڵك بەپێی شوێنی ئەستێرە دەزانێت و بۆی دەردەکەوێت بەمە دەڵێن زانستیی ئەستێرەی بەختگرتنەوە.

٢-(اَنْجَمَ -الشِتاءُ أَو البَرْدُ): زستان یان سەرما گورێزیکردو ڕۆیشت/ کۆتاییهات.

(-الرَجُلُ عَنِ الأَمـرِ): کابرا وازی لە کارەکە هێنا.

(-تِ الحَرْبُ): جەنگ کۆتاییهات.

(إِنْتَجَمَ -البَردُ أَو الشِّتاءُ): سەرمایان زستان تەواوبوو / گورێزیکرد.

نجە: (نَجَهَ -الرَجُلَ نَجْهاً): ١-بە ناشیرینترین شێوە وەڵامی دایەوە ٢-بەناشیرینی پێشوازیی لە پیاوەکە کرد/ بەرەو رووی چوو.

(-علی القَـوم): لەخوێشگەل هاتەدەرەوە/ لێیان دەرپەڕی.

(-اَلبَلَدُ): چووە شارو وڵاتەکەوەو ڕقی لێیبووەوە.

(إِنْتَجَهَ وَتَنَجَّهَ - الرَجُلَ): ١-بەپیسترین شێوە وەڵامیدایەوە ٢-وا بەرەو ڕوویچوو کە دڵی تەنگبکات/ نادۆستانە بەرەوڕوویچوو.

نجـو: ١-(نَجا-مِن کذا یَنْجُو. نَجاةً وَنَجاءً وَنَجْواً وَنَجایَةً): لەوە ڕزگاربوو.

(-نَجاءَ): خێرایکرد و پێشکەوت.

(-فُلانـاً نَجـواً): فیساری (ڕزگارکـرد/ سەرفرازکرد).

(-الدَواءَ): دەرمانەکەیخواردەوە.

(-الشَجَرَةَ): درەختەکەی بڕییەوە.

(-الصَبِيُّ): ساواکە باوبڕژی لێبەربووەوەو پیساییکرد.

(-النَجْـوُ - مِـنَ البَطنِ): باوبڕژو پیسایی ناوسکە کە چووە دەرەوە.

(اَلجِلدَ عَـنِ الذبیحَةِ نَجْواً وَنجاً): پێستی لەسەربڕراوەکە داماڵی و کەوڵیکرد.

(نَجَّـی - الرجُلَ مِن کذا تَنجیَةً): پیاوەکەی لەوە سەرفرازکرد/ ڕزگارکرد.

(-الرَجُـلَ): پیاوەکـەی لەسـەر بەرزاییەك بەجێهێشت و ڕۆیشت.

(أَنجي - الرَجلَ): پیاوەکەی رزگارکرد.
(شَـرِبَ الـدَّواءَ فَمـا أَنجـاهُ): دەرمانەکەی خواردەوەو راستینەکردەوە/ کەڵکی لێنەبینی.
(-فُلاناً غصْناً): لقێکی بۆ فیسار بری.
(-آلجلدَ): پێستەکەی داماڵی و کەوڵیکرد.
(-تِ النَخْلَةُ): بەرە خورماکە پێگەیشت.
(-الرَجلُ): ١-باوبڕۆ پیسایی دەکرد ٢-ئارەقی کردەوە.
(نَنَجَّی): بۆشوێنێکی بەرز گەرا.
(إستَنجی - من كذا): لەوەرزگاریبوو.
(-الشيءَ مِن فُلان): شتەکەی لە چنگی فیسار دەرهێنا.
(-الرَجُلُ): ١-خێرایکرد ٢-هەڵات.
(-الشَجَرَةَ): درەختەکەی لەبنەوە بڕییەوە.
(آلثَمَرَ): میوەکەی یان بەرەکەی چنی.
(-القَومُ): خوێشـگەل فەریکـە خورماکەیان بەرچنگکەوت/ دەستکەوت یان خواردیان.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە پاش پیسـاییکردن خۆی سری یان شت.
(ألنَجي (م) ناجية (ج) نَواجِ وَناجِيات)(فا): ١-راکردوو ٢-هەڵاتوو ٣-رزگاربوو/ سەرفرازبوو.
(ألناجِيَة): حوشتری غار کردوو کەسوارەکەی رزگار دەکات.
(ألنَجا): ١-داردەسـت ٢-چیلکە ٣-داری کەژاوە ٤-چەرم، پێست.
(ألنَجا وَألنَجاء): رزگاربوون/ سەرفرازبوون.
(ألنَجاءَكَ ألنَجاءَكَ وَألنَجاكَ ألنَجاك): خێراکە خێراکە/ ئازاکە ئازاکە...
(ألنَجاة)(مـص) (ج) نَجـاً): ١-رزگاربـوون/ سەرفرازبوون، رزگاریی، سەرفرازیی ٢-هەڵەت، زەویی بەرز ٣-(لق/ چل/ پەل/ پۆی درەخت).
(ألنَجْـو (مص) (ج) نِجاء)١-باوبڕی ناوسـك یان پیسای/ گوو ٢-هەوری باریو.
(ألنَجاوَةُ): زەویی پانو بەرین/ بەرفراوان.
(ألنَجْـوَةُ (ج) نِجاء)١- جارێك چوونە سـەر پێشاوو خۆتەکاندن ٢-زەویی بەرز.
(إنَّهُ مِنَ الأَمرِ بِنَجوَةٍ): ئەو لەوکارەوە دوورەو پاکەو بێبەرییە.
(ألنَجْوى (ج) نَجاوى): ١-سەرانە ٢-بەرتیل.
(ألنَجيّ (ج) أَنْجِيَه)١- خێرا/ گورج.
(بَعيرٌ نَجِيٌّ): حوشـترێکی (خێرا/ چابووك/ گـورج) ٢-دەنگی کەسـێکە کەبەدەنگو ئاواز حوشترەکانی لێدەخورێت٣-لێخوری دەنگکردوو کەبەدەنگ ئاژەڵەکەی لێدەخورێت.
(ألمَنْجاة (ج) مَناجِ): هۆکاری (سـەرفرازیی/ رزگاربوون).
(الصِدقَ مَنْجاةٌ): راستگۆیی رزگارکەرە.
(ألمَنجی (ج) مَناجِ): ١-رزگارگە/ سـەرفرازگە ٢-زەویی بەرز/ هەڵەت.
٢-(نَجا يَنْجُو وناجی -الرَجُلَ نَجواً وَمُناجاةً وَنِجـاءً): رازی دڵـی خۆیو سـۆزی خۆی بۆ پیاوەکە دەربڕی.

(اَلنَجوى): رازو سـۆزو هەسـت دەربڕین یان لەگەڵ خۆدادوان.
(تَناجـى -القَـومُ. تَناجِيـاً): نهێنیو رازو سوزیان بۆ یەکتری دەربڕی.
(إِنْتَجـى - القَومُ): خوێشـگەل رازو نهێنیو سۆزیان بۆ یەکتر دەربڕی.
(-الرَجُلَ): ١-رازو نهێنی خۆی بەتایبەتی بۆ پیاوەکە درکاند ٢-کردی بەرازگری خۆی.
(اَلنَجْو -(ج) نِجاء): نهێنی نێوان دووکەس.
(اَلنَجـاة (ج) نَجـاً): ١-ئیرەیی/ حەسـوودی ٢-چنگگیرکردن لەشتێكو بەدەستەوە نەدانی ٣-دومەڵان.
(اَلنَجوى (ج) نَجاوى): ١-دوانو رازی دەروونو نهێنی دەربڕین ٢-لەگەڵ خۆدا دوان ٣-نهێنیی ٤-رازو سۆزو نهێنیی دەربڕان (وشەیەکە تاكو كۆ تیایدایەکە).
(هُـم نَجْوى): ئەوانـە رازو نهێنییو سـۆز دەربڕانن.
(اَلنَجِيّ (ج) أَنْجِيَة): ١-نهێنی ٢-ئەوکەسەی نهێنیی خۆتی لا دەدرکێنێت ٢-ئاخاوتگۆ/ قسەکەر.
(باتَـتْ فِي صَـدْرِهِ نَجِيَّـةُ قَـد أَسْـهَرَتْهُ): نهێنیو مەراقێك لەدڵیدایە خەوی (لێبڕیوە/ لێزڕاندووە).
نحّ:١-(نَـحَّ - الرَجُـلُ نَحِيحـاً): پیاوەکـە دەنگەکـەی لە سـنگیدا پەنگی خـواردەوە، دەنگی دەرنەهات.
(-آلجَمَلَ. نَحّاً): حوشـترەکەی هاندا/ دەنگی لێکرد کەبڕوات.
(اَلنُحاحَة): ١-بەخشندەیی/ بەدەستو دڵیی/ دڵفراوانیی ٢-رژدیی/ چرووکیی.
(اَلنَحيح) (مص): چرووك رژد.
(فُلانُ شَـحيح نَحيـح): فیسـار چرووكو رژدە.
٢-(نَحْنَحَ - فُلاناً): بە ناشـیرینترین شـێوە دەستی بەفیسارەوەنا/ وەڵامیدایەوە.
(نَحْنَـحَ وتَنَحْنَحَ الرجُـلُ): پیاوەکە دەنگی براو دەنگی دەرنەهات.
(اَلنَحانِحَة): رژدو بەدفەرەکانو بەدزمانەکان (چونکە ئەگەر شـتێکیان لێ بخوازن بێدەنگ دەبنو وەڵام نادەنەوە.
نحب: ١-(نَحَبَ - الرَجُلُ نَحْباً): ئەنجامدانی شـتێکی، کارێکی لەسـەر خۆی پێویستکردو کردە ئەرك.
(-القَومُ فِي سَيْرِهِم): خوێشگەل خۆیانگوشیو پێیانهەڵگرتو خێرایانکرد.
(-بِکَذا. نَحْباً): گرەوی لەسەر ئەوەکرد.
(نَحَّبَ - الرَجُلُ): ئەنجامدانی کارێکی کردە ئەرك بەسەرخۆیەوەکردیە پێویست.
(-اَلقَومُ - فِي سَـيْرِهِم): خوێشـگەل خۆیان گوشیی پێیانهەڵگرتو خێرا رۆیشتن.
(-علـى الشَـيء): رووپکردە شـتەکەو خۆی پێوەماندوو و خەرککرد.

(ناحَبَ - هُ على كـذا مُناحَبَةً): گرەوی لەسەر ئەوە لەگەڵدا کرد.
(-هُ): شانازییان بەسەریەکداکرد.
(-هُ إلى فُلانٍ): دادی بردە لای فیسار دادوەرییان بکات.
(تَناحَبَ - القَومُ): بۆجەنگ یان کاریتر کاتێکیان/ دەمێکیان دانا.
(ألنَحْب): ١-خێرا یان خاو ڕۆیشتن.
(سار فُلا على نَحْبٍ): ١-فیسار بە خۆماندووکردنەوە ڕۆیشت وەکو شتێکی بەدڵدا هاتبێت یان خستبێتیە دڵیەوەو خۆی بۆبگوشێت ٢-مەترسییەکی گەورە ٣-قومار ٤-تەنگانە ٥-چاك تێهەڵچوون ٦-مردن ٧-دەروون ٨-مەرگ ٩-کات/ دەمو ماوە ١٠-نەزرکردن/ شتێك بکەیتە ئەرك‌و پێویستی کردنی.
(قَضى فُلان نَحبَهُ): مرد (وەکو مردن ئەرکێکبێت‌و خۆی پێوە بەستبێت).
(ألنُحْبَةُ): پشککردن پشك.
(ألمُنَحِّب) (فا): خۆ بەپێویستیەکەوە بەستن/ نەزرکردن، پابەندبوون.
(سَيرٌ مُنَحِّبٌ): ڕۆیشتنێکی خێرا/ گورج.
٢-(نَحَبَ -الرَجُلُ نَحْباً وَنَحيباً): بەدەنگی بەرز گریا/ دایە پرمەی گریان/ شیوەن‌و زارییکرد.
(-البَعيرُ. نَحْباً وَنُحَاباً): حوشترەکە کۆکەگرتی.
(إنْتَحَبَ): ١-شیوەن‌و زارییکرد/ دایە پرمەی گریانێکی بەکوڵ ٢-توند هەنسکی هەڵدا.
(ألَنَّحْب)(مص): گریەو زاریی/ شیوەنی بەکوڵ‌و هەنسکهەڵدان/ شین‌و شەپۆڕ ٢-کۆکە/ کۆکین.
٣-(ألنَحْب): ١-درێژیی ٢-نوستن/ خەوتن ٣-قەڵەویی ٤-حوشتری زۆرگەورە/ مەزن ٥-بەڵگەو سەلماندن ٦-پێداویستیی.
نحت:١-(نَحَتَ ونَحِتَ - العُودَ نَحْتاً): چیلکەکەی دادا/ داتاشی.
(-الحَجَرَ): بەردەکەی داتاشی‌و ڕێکیخست.
(-الخَشَبَةَ): تەختەکەی ڕەنگەکردو داتاشی.
(-السَفَرُ البَعيرَ): کاروان حوشترەکەی داماڵی و لاوازیکرد.
(-الجَبَلَ): کێوەکەی هەڵکەند.
(نُحِتَ فُلانٌ على الكَرَم): فیسار بە بەخشندەیی‌و پیاوەتی گۆشکراوەو سروشتی وایە.
(-الكَلِمَةَ): وشەی لەدوو وشەی یان پتر لێکداو دارشت وەك (البَسْمَلَة) لە (بِسمِ اللهِ الرَحْمنِ الرَحيم): پێکەوە ناودراشت.
(حَوْقَلَة) لە (لاحَولَ وَلاقُوَّةَ إلا بالله) داتاشراوە، دارشت.
(فَذْلَكَة) لە (فذلك كذاوكذا)ی پێکەوە ناو داتاشیوە.
(إنْتَحَتَ -مِنَ الخَشَبَةِ مايجعلهُ في النار): تەختەکەی بەتەشوێ یان ڕەنگە بۆ تەلاشەکەی داتاشی کەبخرێتە ناو ئاگرەکەوە.

(-تِ الخَشَبَةُ): تەختەکە داتاشرا، رەنگەکرا.
(ألنَحْتُ وَالنَحَات): سروشت.
(النُحَاتَة): ١-ئامێری تەختەتاشینو برینەوەو هەڵکۆڵین ٢-تەڵاشو ئاردەدارو وردەی هەموو شتێکی داتاشراو یان رنراو یان هەڵکۆڵراو.
(ألنَحَّـــات): ١-بەردتـــاش یـــان هونەرمەندی پەیکەرتاشو پەیکەر ساز لەدارو بەردو کانزاو شتیتر ٢-ئازا لەتاشینو پەیکەرسازیدا.
(ألنَحيــت (مــص):١= المَنحوت): داتاشــراو وهەڵکۆڵراو ٢-حوشتری نەخۆشو پەککەوتە.
(-مِنَ الحَوافِر): سمی سواوی وڵاغ.
(ألنَحيتَةُ): سروشت.
(هوكريمُ النحيتة): ئەو سروشت باڵاو جوامێرە.
(ألمِنْحَـت (ج) مَناحِـت وَالمِنْحَـات (ج) مَناحيت): ئامێری کۆڵینو داتاشینو داهێنان وەك تەشویو رەنگەو قەڵەمی بەرد داتاشینو ئەسکەنەو سمۆ.
(هُوَ مِن مِنْحَتِ صِدْقٍ): ئەو لەریشەو بنچەی دروستو ساغە/ رەسەنە.
(هُم كرام المَنابِت والمَناحِت): ئەوان سەرچاوە خانەدانو تۆو رەسەنن.
٢-(نَحَتَ وَنَحِتَ - هُ نَحْتاً): دایبەزەویدا.
(-هُ بالعَصا): دارکارییکرد.
(-هُ بِلِســانِهِ): ١-لەپاشملە بەخراپە باسیکرد. ٢-سەرزەنشتیکرد و بەرجنێویدا.
(-عِرضَهُ): ناموسی شکاندو ئابڕوویبرد.

(-أثْلَثَــهُ وفي أثْلَثِهِ): نـــاوی بەخراپە هێناو رەسەنی نابووتکرد/ سووکیکرد.
٣-(نَحِــتَ. نَحيتــاً): تووشـــی ســـکچوونی/ زەحیرییبوو.
(ألنَحيت): ١-ناڵە/ نرکەکردن ٢-زەحیریی.
(ألنَحيتَةُ): زەحیربوون.
٤-(ألنَحِيــت): ١-گەمنــدەی هەمـــوو شـــتێك ٢-بێگانـــە بە نەتەوەو خوێـــش کەخۆی پێوە لکاندبن.
نحـــت: (ألمَنحَـــت (ج) مَناحِـــت): شـــوێنی کارکردنی پەیکەرتاشو وێنەکێش و ئەوانە.

---

نحـــر: (نَحَـــرَ- البَهيمَـــةَ نَحـــراً وَتَنْحاراً): ١-بەرقورگـــی چوارپێکەیخســـت/ کێشـــای بەقورگیدا ٢-لەگەرووییەوە سەرییبڕی.
(نَحَرَ الأُمــورَ عِلماً): لەکارەکانـــدا (قاڵبوو/ زانابوو).
(-فُلاناً): رووبەرووی فیســـاربووەوە/ چاوی پێکەوت.
(نَحَربيتـــي بَيتَـــهُ): خانووەکـــەم بەرامبەر خانووەکەی ئەوبوو.
(-ألصَلاةَ): نوێژەکەی یەکسەر دوای بانگکرد.
(-ألمُصَلّي): نوێژکەرەکـــە لەنوێژەکەدا قیت وەستاو سنگی دەرپەڕاند.
(ناحَـــرَ-هُ مُناحَـــرَةً): بەگژیـــدا چـــوو و قینەبەرایەتیی لەگەڵدا کـــردو دوژمنایەتیی لەگەڵدا کرد.

(تَناحَـــرِ -القَومُ علــى كذا): ١-خويْنشــگەل لەســەر ئەوە بەگژیەكدا چوون خەریكبوون یەكتری بكوژن‌و سەربڕن.
(-القَومُ على الطَّريقِ وَغيرِهِ): خویْنشگەل بە ڕێگەكەدا یان لەشتیتردا شوێن یەككەوتن.
(-القَومُ عَنِ الطريقِ): خویْنشگەل لە ڕێگەكە لایاندا.
(-تِ الــداران): دووخانووەكــە بەرامبــەر یەكبوون.
(إِنْتَحَرَ -الرَجُلُ): پیاوەكە خۆیكوشت.
(-السَّــحابُ): هەورەكــە خــۆی داتەكانــدو بارانێكی زۆری باراند.
(-القَــومُ علــى الأمرِ): خویْنشــگەل لەســەر كارەكە كەوتنە ركەبەرایەتیی‌و دوژمنایەتیی لەگەڵیەك.
(-هُ بالعَصا): بەدار لێیدا.
(اَلنَّاحِر) (فا): ١: ئاژەڵســەربڕ ٢-لەگەرووەوە سەربڕ ٣-كەســێك كەنوێژ یەكســەر لەدوای بانگەوە بكات.
(الناحِران) ع ا): دوو دەمارن لەبەرگەرووودا.
(اَلناحِرَةُ (ج) نَواحِر وناحِرات): مێی وشەی (الناحِر) ٢-یەكەمــین ڕۆژی مانگی تازە یان دوارۆژی یان دوا شەوی/ مانگی تازە.
(اَلناحِرَتــان): دوو دەمــاری خوێنــن لەبەرگەرووودا.
(اَلنَحْــر) (مــص): ١-ســەبڕین (ج) نُحُــور سەرووسنگ و چاڵی بەرگەرو.
(قَعَدَ فِي نَحْرِ فُلان): ڕووبەڕووی دانیشت.
(نَحْرُ النَّهار): سەرەتای ڕۆژ.
(أَتَيتُهُ فِي نَحْرِ الظَهيرَةِ): لەناوەڕاستی ڕۆژدا یان لەقرچەی نیوەڕۆدا هاتمە لای.
(يَومُ النَحْرِ): ڕۆژی دەهەمینی مانگی قوربان كە قوربانیی تێدا دەكرێت.
(اَلنِحْر): كارامەو شارەزاو هوشیارو زرنگ.
(اَلنَحــير (ج) نَحْــرى وَنُحَــراء وَنَحائِـــر): سەربڕراو/ كوژراو.
(اَلمَنحُور): سەربڕراو.
(اَلنَحِــيرَةُ) (ج) (نَحائِـــر): ١-مێــی وشــەی (اَلنَحــير): ٢-یەكەمــین ڕۆژی ســەری مانگ ٣-دوا ڕۆژی مانــگ چونكە داســەمانگی تێدا وندەكرێت.
(اَلنِحْريــر (ج) نَحارير): كارامەو شــارەزا/ لێزان زرنگ‌و ژیر/ لەو شتەدا زاناو قاڵ.
(اَلمَنْحَر):١-بەرگەروو كەشــوێنی ســەربڕینە ٢-شوێنی/ جێگای سەربڕین.
(اَلمِنْحار):١-بەخشندە/ جوامێر ٢-كەسێكە زۆر - سەرببڕێت‌و قوربانیی بكات ٣-میواندۆست.
(إِنَّــهُ لَمِنحــارُ بوائِكِهــا): میواندۆســتێكە كــە حوشــترەكە قەڵەوەكانــی بــۆ میــوان سەردەبڕێت.
(اَلمَنحَــور (ج) مَناحِير): سەرۆیســنگ/ بەر گەروو.

(اَلْمُنتَحَر): بەشی سەرەکیی و دیاری ڕێگە.
٢-(اَلنَحيرَة (ج) نَحائِر): سروشت.
نحــز: ١-(نَحَــزَ -ُه. نَحْــزاً): ١-تێومیژەندو پاڵپێوەنا ٢-بەدەسکەوان کوتای/ وردیکرد.
(-ُه بِرِجلِهِ): بەشەق تێیهەڵدا.
(-ُه فِي صَدرِهِ): دەستی بە سنگییەوە ناو پاڵی پێوەنا.
نَحِزَ - الرَجُلُ. نَحْزاً): کۆکیی.
(-آلبَعــيرُ نَحَــزاً): حوشــترەکە تووشــی دەردەسیبوو کەپێی دەکۆکی.
(نَحِزٌ وَ ناحِزٌ ونَحِيزٌ وَنَحُوزٌ): دەردەسیگرتوو.
(نُحِزَ وَنَحُزَ وَنَحُزَ - البَعيرُ نَحَزاً): حوشترەکە تووشی دەردەسیبوو.
(بَعــيرٌ نَحِــزٌ وناحِــزٌ وَنَحيــزٌ وَمَنْحوزٌ): حوشتری دەردەسیگرتوو.
(أَنْحَزَ -القَومُ): خوێشــگەلی حوشــترەکانیان دەردەسییانگرت.
(اَلنُحَــاز): دەردەســیی کە تووشــی حوشــتر دەبێتو خراپو زۆر پێیدەکۆکێت.
(اَلمِنحاز): دەسکەوان.
٢-(اَلنُحــاز والنِحــاز):١-بنەرەت ٢-ڕەســەن، ڕەچەڵەك.
(هُوَ كَريمُ آلنَحاز): ئەو ڕەســەن و شکۆدارە/ ڕەچەڵەك باڵایە.
(اَلنحيــزَة (ج) نَحائــز):١-سروشــت «هُــوَ كَريمُ النَحيزَة» ئەو سروشت بەرزە ٢-پارچە زەوییەکی زبرانی و بەردەڵانی.
نحس: ١-(نَحَسَ -ُه نَحْســاً): لەگەڵیدا وشکو خراپبوو.
(نَحِــسَ وَنَحُــسَ - طالِعُ الإنســانِ. نَحَســاً ونَحاسَةً ونُحُوسَةً): مرۆڤەکە بەدبەختبوو/ چارەڕەشــبوو/ کوڵۆڵبــوو بــۆی نەهــات/ نەهامەتیبوو.
(هُوَ نَحْسٌ وَنَحِسٌ وَمَنْحُوسٌ): ئەو چارەڕەشە/ بەدبەختە کوڵۆڵە/ نەهامەتییەتی.
(يَومٌ نَحْسٌ وَنَحِسٌ وَناحِسٌ وَنَحِيسٌ): ڕۆژێکی (ڕەشە/ بەدبەختییە/ نەهامەتییە/ نەهاتە).
(أَيامٌ نَواحِسٌ وَنَحْساتٌ وَنَحِساتٌ): ڕۆژانێکی: نەهاتە/ بەدبەختییە.
(نَحَّسَ - الشيءُ): شتەکە وەك مسی لێهات.
(-فُلانٌ الشيءَ): فیســار مسی گرتە شتەکە/ مسپۆشیکرد.
(اَنْحَــسَ -تِ النَّــارُ): ئاگرەکــە دووکەڵــی زۆربوو.
تَناحَسَ وآنتَحَسَ - فُلانٌ): فیســار تێشــکا/ تووشی نەهاتیبوو/ بۆی نەهات.
(عــامٌ ناحِــسٌ (ج) نواحِــس): ســاڵێکی نەهاتییە/ وشکە ساڵە.
(اَلنَحس)(مــص): ڕەنجەڕۆیــی/ نەهاتیــی بەدوومــی ٢-کاری نەنجامتاریــك و بێبــەر ٣-تۆزی چوارکەناری ئاسمان ٤-بای سارد کاتی تێپەڕبوونی.

(اَلنَحس (ج) نُحُوس وَ أَنْحُس): بەدبەختیی/ بەدوومیی. نەهامەتیی/ نەهاتی.
بَـومُ نَحْسٌ وأيـامُ نحس: رۆژێکـی نەهات رۆژانێکـی (بەدبەختیی/ بـەدووم/، نەهات/ نەهامەتیی.
(اَلنَحْسان): جووتە ئەسـتێرەی نەهامەتیی. زُحَل: کـەش و مَريخ: بارام. (والسَـعدان): جووتــە ئەسـتێرەی بەختەوەریـی/ هاتو شـانس. (المُشْـتَرى): پەرچیس و (الزُّهرَة): ناهید.
(اَلنُحَـس): سـێ شـەوەی کۆتایـی مانگـی عەرەبی.
(اَلنُحَـاس والنَحَاس والنِحَـاس)(ك): ١ـمس ٢ـپریشـكو وردەی ئاسـنو مـس کەبەئاگر سووردەکرێنەوەو دەکوترێن و لێیاندەپەرمێت ٣ـدووکەڵێـك کەگری لەگەڵـدا نەبێت ٤ـئاگر ٥ـزەرد یـان شـێوە زەرد کـە ئاوێتەی مس و تۆتیایە کەگەڵێك کەرەسـتەو پێداویسـتیی لێدروسـتدەکرێت وەك دەسـکی دەرگـاو بەلووعەو ئامێری موسیقا.
(اَلنَحَّاس): ١ـمسگەر ٢ـفرۆشیاری مس و شتی مسین.
(اَلمَناحِس): شـتی بەدووم و کاری بەدووم کە بەدو نەهامەتیی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.
(نَحَّسَ- الأَخبارَ): شـوێن هەواڵەکانکەوتو سووسەی بۆ کردن.

(تَنَحَّسَ- الأَخبارَ وعَنها): شـوێن هەواڵەکان کەوتو بۆیانگەڕاو سووسەی بۆ کردن.
(إِسـتَنحَسَ الأَخبـارَ وعَنهـا): عەودالـی هەواڵەکان بوو و سووسەی بۆ کردن.
(-الأَخبارَ): سووسەی هەواڵەکانیکرد..
٣-(تَنَحَّسَ- الرَجُلُ): کابرا برسیبوو.
(-لِشُـربِ الدواءِ): بـۆ دەرمانەکە خواردنی نەخواردو خۆی برسیکرد.
٤-(اَلنَحـاس والنُّحـاس والنِحـاس): ١ـبری بنەڕەتی شتەکە ٢ـسروشت.
(هُوَ كَريمُ النُّحاس): ئەو سرووشتی ڕەسەنە.
(اَنحيسُ مَعدِنٍ): مسی تێبکرێت.
نحص: (نَحَصَ - تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە زۆر قەڵەوبوو یان قەڵەویی نەیهێشت ئاوسبێت.
(نَحُـوص وَنَحِيص (ج) نحُـص وَنَحائِص): مێحوشتری زۆر قەڵەو.
(اَلنُحْص)١- بنکێو ٢ـیان قەدپاڵی کێو/ شاخ.
نحض: (نَحَضَ - اللَّحْمَ نَحْضاً): پێسـتی لە گۆشتەکە گرتەوە/ گۆشتەکەی پاککرد.
(-فُلاناً): فیساری بەپرسیار ماندووکرد.
(-العَظمَ): ئێسقانەکەی داماڵیو گۆشتی پێوە نەهێشت.
(-آلسِنانَ): سەری نێزەکەی تەنککرد.
(-هُ الدَهْرُ): ڕۆژگاری زیانی پێگەیاند.
(نَحَضَ ونُحِضَ وآنْتُحِضَ نُحُوضاً): گۆشـتەکەی داماڵرا/ کەمیکرد/ چرووسا یان گۆشتی پێوەنەما.

(نَحِيضٌ وَمَنحُوضٌ): لاواز/ چرووساو/ لەڕ.
(نَحُضَ - نَحاضَةً): گۆشتی زۆر بوو.
(نَحيــضٌ وَمَنحُوض): قەڵەو گۆشــتگرتوو/ گۆشتن.
(إنْتَحَــضَ - الشــيءَ): ١-شــتەکەی تەنککرد ٢-توێکڵی شتەکەیگرت.
(ألنَحْــض) (مص) (ج) نِحــاض وَنُحُوض): گۆشت یان گۆشتی پتەو/ گۆشتن.
(ألنَحْضَةُ): پارچە گۆشتێکی قەڵەوو پتەو.
نحــط: (نَحَــطَ -الفَرَسُ نَحْطــاً وَنَحيطاً): چارەوێکــە لەتاو نەخۆشــی یان شــەکەتیی کەوتەوردە حیلەو کورکاندن.
(-الرَجُلُ): هەناسیەکی قووڵی هەڵکێشا.
(-الســائِلَ نَحْطــاً): بــە ســواڵکەرەکەدا/ دەرۆزەکەرەکــەدا هەڵشــاخا کە داوای شــتی دەکرد.
(ألناحِــط) (فــا): ١-هەناســە هەڵکێشــێکی هەناســەی قووڵ ٢-کەســێکە تونــدو خراپ بکۆکێت.
(ألنَحْط وَالنُحــاط والنَحِيط): دڵ قوڵپدانی گریان بێنەوەی بگری و دەربیرێت.
(ألنَحْطَــة): ١-جارێــك هەناســەی قــووڵ هەڵکێشــان ٢-دەردەســی کەتووشــی حوشترو چارەوی دەبێت و دەردێکی کوشندەیە.
(ألنَحَّاط): لووتبەرز/ فیزدار/ ترزل (لەرقو تووڕەیی خۆیدا پەرێشاندەبێت).

(ألمُنحَطَة وآلمَنحُوطَة): حوشــتری تووشبووی دەردەسی.
نحف: (نَحِفَ وَنَحُفَ نَحافَةَ): لاوازو باریکبوو یان زگماکیی لەشباریکبوو.
(نَحِــف (ج) نَحفــون ونَحِيــف (ج) نُحَفاء ونِحاف وَمَنْحُوف): لەشــتەنکە/ باریکەلەی زگماکیی ٢-لاواز/ لەڕ/ کەمگۆشت.
(أنْحَفَ - هُ): لەشی باریککرد/ لاوازیکرد.
نحل: (نَحَلَ- جِسْمُهُ نُحُولاً): بەهۆی نەخۆشییەوە یان ماندووبوونەوە لەشی لاوازو تەنکبوو.
(-هُ المَــرَضُ نَحْــلاً): نەخۆشــییەکە لاوازو بێهێزیکرد.
(نَحِلَ وَنَحُلَ جِسْــمُهُ نُحُولاً): لەشــی/ تەنی (لاواز/ لەڕ)و بێهێزبوو.
(أنْحَــلَ -هُ الهَمُّ أو المَرَضُ): مەراق و خەفەت یان دەردو بیماریی لەڕیکرد/ لاوازیکرد.
(ألنَحْل = الناحِل): باریك و لەڕو تەنك.
(ألنُحْــلُ والنُحْلَــةُ): باریکیــی و تەنکیــی و بێهێزیی.
(ألناحِل (فا) (ج) نُحُول): تەنك.
(سَيفٌ ناحِلٌ): شمشێرێکی تەنك.
(جَمَلٌ ناحِلٌ): حوشترێکی لاوازی لەشتەنك.
(هِلالٌ ناحِلٌ): داسەمانگێکی باریك.
(ألناحِلَةُ (ج) نَواحِل): مێی وشەی (الناحِل).
(ألنَّواحِل): شمشــێرە دەمتەنکەکان کەلەبەر بەکارهێنانی زۆریان وادەمتەنکبوون.

(اَلنَحِيل (ج) نَحْلى): لاواز/ باريك وبنێس.
٢-(نَحَــلَ - الرَجُــلَ نُحلاً): شــتێكى دا بە پياوەكە/ شتێكى پێبەخشى.
(-المَرأةَ): مارەيى بەژنەكەدا.
(اِلنِحْلَة): مارەيى بەژندان.
(نَحَلَ وَاَنْحَلَ فُلاناً ماءً): ناوى بە فيساردا.
(-هُ مــالاً): شــتێك (دارا/ مــاڵ)ى تايبەتيى دايە/ پێدا.
(النَحْل): شتى (بەخشراو/ دراو).
(اَلنَحْل): هەنگ.
(اَلنَحْلَة) (ح): هەنگێــك. جۆرە مێروويەكى باڵدارە بەكۆمەڵ دەژين و لەكوورەدا دەبن، ئەو كوورەيە لەشاهەنگ كەتەنها ئەو هێلكە دەكات و لە نێرەكان/ كــە كارناكــەن و لەكاركردەكان كەزۆرن و هێلكەناكەن و پێوەدانيان بەئازارە. گــوڵ بــۆ خــواردن هەڵدەمــژن و هەنگوين دروستدەكەن (دەڵێن بۆيە واناونراوە چونكە خودا هەنگوينێك كەئەوان درووســتيدەكەن بەخەڵكيدەدات).
(اَلنُحْــل والنُحْلى والنُحلان): ١-بەخشــش و خەڵات ٢-مارەييدانى ژن.
٣-(نَحَلَ-القَولَ.نَحْلاً): ئاخاوتنێكىتێهەڵكێشى قسەكەيكردو ناوى خاوەنەكەينەدا.
(نُحِــلَ - الشــاعِرُ قَصيــدَةً): هەڵبەســتى شاعيرێكيان كرد بەهى ئەوكەهى ئەو نەبوو.
(تَنَحَّلَ وَاَنتَحِلَ مَذهَبَ كَــذا اَوقَبيلَةَ كَذا): چووەســەر ئەو رێــرەوە يان بــوو بەيەكێك لەوانــەى ئــەو رێرەوەيان هەيــە، يان خۆى بەيەكێك لەو خێڵەدانا.
(-الشِعرَ اَو القَولَ): هوزانەكە يان ئاخاوتنەكە هى يەكێكيــتر بوو بەهى خــۆى دانا/ كردى بەهى خۆى.
(اَلنِحْلَــةُ وَاَلنُحْلَــةُ (ج) نِحَــل وَ نُحَــل):
١-رێرەوى ئايينى ٢-ئاين ٣-بەخشش و خەڵات كەببەخشرێت ٤-مارەييدان بەژن ٥-داواكردن، سكاڵا.
(مانَحْلَتُك): لەسەر چ ئاين و رێرەوێكيت.
٤-(نَحَلَ - زَيداً نُحْلاً): لەگەڵ زەيدا شــەرە جنێويانكرد.
الملحق:
نحل: (اَلنَحّالة): هەنگ بەخێوكردن.
(اَلنَحّال ـ): هەنگبەخێوكەر.
(مَنحَل): هەنگە ژاڵ/ هەنگدان.

---

نَحَم:١-(نَحَــمَ -الرَجُــلُ نَحْمــاً وَنَحِيمــاً وَنَحَمانــاً): پياوەكە نحە نحەيكردو ســنگى خۆى سافكرد.
(-الأَسَدُ): شێرەكە مراندى.
(رَجُلٌ نَحِمٌ): پياوێكى قرقێنەكەر.
(اَلنَحمَةُ): كۆكەگرتن يان كۆكەيەك.
(اَلنُحّام) (ح): ســوورە قاز/ ســوورە قوڵنگ كــە مل و لاقى درێــژە دەنووكــى قوڵنگييە/ چەماوەيە باڵرەشە ئەويترى لەشى سوورێكى

مەیلەو ئاڵەو زۆر جۆریشـــی هەیەو لەشێوەی قازدان.

(اَلنُحَامیة) (ح): قولنگێك.

(اَلنَحّام)١-كەســێكە قرقێنـــە زۆر بداتـــەوە ٢-پیسكە ئەگەر داوای شتێكی لێبكەیت دەست بە كۆكەو قرقێنە بكاتو خۆی خەریك بكات ٣-(ح) شێر.

(اَلنَحیـــم): قرقێنـــە/ بایەكـــە لەنـــاوەوەو دەردێت.

٢-(إنْتَحَمَ - علی كذا وَ لِكَذا): سوور خواستی ئەو كارەبوو.

نحن: (نَحْنُ): ئێمـــە. راناوێكی بۆ دوانو كۆ كەباسی خۆیان بكەن.

نحـــو: (نَحا- الشـــيءَ. يَنْحُو نَحْـــواً): نیازی ئەوشتەیكرد.

(-نَحْوَ فُلانٍ): ١-نیازی لای فیساری بوو ٢-وەك ئەویكرد ٣-نیـــازی لای ئەویبوو ٤-شـــوێنپێی ئەوی هەڵگرت.

(-الرَجُلُ): خۆی بەلایەكدا لاركردەوە.

(-بَصَرَ-هُ إلَيـــهِ): چاوی بۆلای ئەو وەرگێڕاو تەماشایكرد.

(- فُلاناً عَنهُ): فیساری لێلاداو لێدوورخستەوە.

(-الشيءَ): شتەكەی لادا.

(نَحّـــى- الرَجُـــلَ عَـــن مَوضِعِـــهِ. تَنحِيَةً): پیاوەكەی لەجێی خۆی لابرد/ كەنارگیریكرد/ دەریكرد/ دایبەزاندە خوارەوە.

(ناحی-هُ مُناحاةً): هەردووكیان روو بەڕووی یەك چوون.

(اَنحی - إنْحـــاءً): پاڵی بەلایەكـــەوەداو هەر روویكردە ئەولایە.

(-علی فُلان ضَرْباً): كەوتە لێدانی فیسار.

(-بَصَـــرَ-هُ عَنـــهُ): چـــاوی لـــەو وەرگێـــڕا/ لێوەرگێڕا.

(-عَلَیهِ): پاڵی بەوەوەداو پشتی پێبەست.

(تَنَحّی - الرَجُلُ): بەرێزمان دوا/ قسەیكرد.

(-للشّـــيءِ): پاڵـــی بەشـــتەكەوە داو پشـــتی پێبەست.

(-عَـــن مَوضِعِهِ): وازی لەشـــوێنەكەی خۆی هێنا/ لەشوێنەكەی هاتە خوارێ.

(إنْتَحی -الشَيءَ أَو الرَجُلَ إنْتِحاءً): نیازی لای شتەكە یان پیاوەكەیكرد و بۆلای رۆیشت.

(-لَهُ): پشـــتی بەویبەستو بەلای ئەودا لایدا/ روویكردە ئەو.

(-البَعیرُ علی شِـــقِّهِ الأَیْسَـــرِ): حوشـــترەكە لەرۆیشتندا خۆی خستە سەر لای چەپ.

(اَلنَاحي (فا) (ج) ناحِیات وَ نواحٍ وَأَنْحِیَة): ١-نیازكردو ٢-زانای رێزمان ٢-لا/ تەنیشت.

(اَلنَحْـــو (ج) اَنحاء): ١-لا ٢-تەنیشـــت ٣-ئاقار ٤-رێ/ رێگا ٥-وەكو/ چون ٦-بڕ/ ئەندازە ٧-نیاز (وشەكە ئاوەڵناویش و ناویش دەبێت).

(عِلـــمُ النَحْـــو (ج) اَنحاء وَنُحُوّ): زانســـتیی رێزمـــان بچووككراوەكـــەی وشـــەی (نُحَیَّة)

یە زانستی شیکردنەوەی زمانی عەرەبییە. چونکە ئەوەی قسە بەوزمانەدەکات بە پێی دەستووری زمانەکە دەدوێت.

(اَلنَحْـوِيُّ (ج) نَحْوِيُّـون): زانـای رێزمان/ رێزمانەوان.

نحي:١-(نَحى - الشيءَ يَنحى وَيَنحي. نَحياً): شتەکەی لابردو نەهێشت.

(-بَصَرَهُ إلَيهِ): چاوی (تێکرد/ بۆوەرگێرا).

(-هُ يَنحى. نَحْياً): لایخست خستیە کەنارەوە/ لایدا.

نَحِـيَّ -هُ فَتَنَحَّى تَنحِيَـةً وتنحياً): لایبردو لەشوێنەکەی خۆی نەیهێشت.

(أَنْحى - لَهُ السلاحَ): بەچەك لییدا.

(-عَلَيهِ بِالسَّيفِ): بەشمشێرەوە بەرەو رووی چوو.

(أَنْحـى عليه باللَّوائِم): بەسـەر زەنشـتو تەشەرەوە رووبەرووبووەوە/ تەشەرو توانجی تێگرت.

(إنتَحى - فِي الأَمرِ): بۆکارەکە لێبڕاو کۆششیکرد.

(-فِي الشيءِ): لەشتەکەدا پشتی پێبەست.

(اَلنَّحِيَّة): ١-نیاز ٢-ئامانج، نیشانە.

(فُلان نَحِيَّةُ الشـدائِد): فیسـار نیشـانەی نەهامەتییە.

(اَلمَنْحَـاةُ (ج) مَنَاحِ): ١-ئـاوەڕۆی پێچاوپێچ ٢-جۆگەی ئاوی دۆڵاب (ناعور).

(أَهْلُ المَنحاة): هاونشین کەخزم نەبن.

٢-(نَحـى -اللَّـبَنَ يَنْحـى ويَنحـي. نَحْياً): ماستەکەی ژەند.

(اَلنَحْـي والنحْي واَلنُحْـي (ج) أَنْحاء وِنحاء ونُحِـيّ): ١-هیزەی رۆن ٢-کیتەڵە کە ماسـتی تێدەکەنو تیایدا دەیژەنن.

٣-(اَلنَحْي والنِحْي والنُحْي (ج) أَنحاء وَنِحاء ونُحِيّ): تیرێکی نووکپان.

نَخَّ: ١-(نَخَّ. نَخّاً): توند رۆیشت.

(-الإبِـلَ): حوشـترەکانی تونـد (لێخـوری/ ئاژووت).

(- الإبِلَ وبالإبِلِ): یخەی لەحوشـترەکانکرد پێیوتـن. (إخ إخ) یان(نِخَ نِخ): واتا وتی: یخ یخ بۆ ئەوەی بەچۆکدابێت.

(نَخَّ): عامية: سەری (دانەواند/ شۆڕکردەوە).

(اَلنَخَّـةِ): ١-جارێك بەچۆکدادانی حوشـتر/ یخدانی ٢-گـای جووتو مانگـای کارپێکردن ٣-کۆیلەی ژنو پیاو.

(اَلنُخُّةُ): گاو مانگای کارپێکردو.

٢-(اَلنُخ = اَلمُخ): مێشك یان مۆخی ئێسقان.

(اَلنَخّ (ج) أَنخاخ): فەرشـی/ قالیی لاکێشەی درێژ.

(اَلنَخَّـةَ): ١-رشـنە بـاران/ نەرمـە بـاران ٢-هەواڵێك کەنەزانرێت راستە یان درۆ.

(اَلنُخاخَة): مێشك یا مۆخی ئێسقان.

٣-(نَخْنَخَ -البَعيرَ فَتَنَخْنَخَ): حوشترەکەی یخدا/ خەواند و ئەویش بەچۆکدا هات/ یخبوو.

(-فُلاناً): به فیساردا هەڵشاخاو پەریکرد/ لایدا.
(-الرَجُلَ): پیاوەکە توند رۆیشت.
(-بالإبِـلِ): توند دەنگی لەحوشـترەکانکرد پێیوت «إخ إخ»: یخ یخ تایخبێت و بکەوێت.
نخب:١-(نَخَبَ -الشـيءَ نَخْباً): ١-شـتەکەی هەڵکێشا ٢-هەڵبژاردەی شتەکەیبرد.
(-الصَقرُ الصيـدَ): هەڵۆکە دڵی نێچیرەکەی دەرکێشا/ دەرهێنا.
(نَخِبَ. نَخَباً): لەترساندا زیرەیکرد/ دڵیچوو.
(نَخْبٌ وَنَخِبٌ ونَخَبٌ وَنَخِبٌ وأَنْخَبٌ): دڵچوو/ زیرەکردوو.
(أَنْخَبَ- الرَجُلُ) (ضد):١-کورێکی زیرەکردوویبوو ٢-کورێکی (ئازا/ بەجەرگ)ی بوو.
(إنْتَخَـبَ -الشـيءَ): شـتەکەی ١-هەڵکێشـا ٢-هەڵبژارد.
(أَلنَخْب (مـص): خواردنەوەی شـەراب یان شـتیتر کە پیاوەکـە دەیخواتـەوە دەڵێت بە تەندروستی خۆشەویستەکەی یان هاورێکەی ٢-زۆر ترسنۆکیی/ زیرەکردوویی و بێورەیی‌و بێهێزیی دڵ.
أَلنُخَةُ): زۆر ترسنۆك/ زیرەکردوو.
(أَلنَخْبَةُ) (ج): ١-پیاوانی هەڵبژاردەو نموونەیی ناو خەڵك ٢-گۆزەی گەپ/ گەورە/ مەزن.
(أَلنُخْبَةُ والنُخَبَـةُ (ج) نُخَب): هەڵبژاردە و ناوێزەی هەموو شتێك.
(أَلنُخَباتُ): زیرەکردووەکان/ زۆر ترسنۆکەکان.

(أَلنِخَاب): پێستی دڵ.
(أَلنَخيب (ج) نُخَـب): زیرەکردووی بێورەو دڵچوو (وەکو جڵەوی خۆی لەدەستدابێت).
(أَلمِنخاب (ج) مَناخيب): بوودەڵەی بێفەڕ.
(أَلمَنخوب): گۆشت داماڵراوی لاواز.
(أَلمَنخـوب وَ وَاليَنْخـوب): زیرەکـردووی دڵکەوتوو/ دڵچوو.
٢-(نَخَـبَ -تِ النَمْلَـةُ نَخْبَـاً): مێروولەکە گازیگرت.
٣-(أَلنَخْب والنَخْبَةُ): بن/ کۆم/ قنگ.
(أَليَنْخُوب): درێژ.
الملحق:
نخب: (أَلإنْتِخاب): هەڵبژاردن.
(إنْتِخـاب تَلامِـذَة لِمُبـاراة): هەڵبژاردنی قوتابیان بۆ پێشبرکێی یارییەك.
(إنْتِخـاب رياضِيِّين لِبُطولَـة): هەڵبژاردنی یاریکەران/ وەرزشـەوانەکان بـۆ بردنەوەی پاڵەوانێتییەك لەیارییەکدا.
(إخْتِيار جماعَة مُمَثّليهم بِطَريقِ التَصْويت): هەڵبژاردنی نوێنەرانـی کۆمەڵێك بە رێگەی دەنگدان.
(إنتِخـاب أَعضـاء نَقابَـة): هەڵبژاردنـی ئەندامانی سەندیکایەك.
(أَلإنْتِخاب في السياسَة): هەڵبژاردن لەرامیاریدا: هەڵبژاردنـی نوێنەرانـی گەل یان سـەرۆکی دەوڵەت کە بەپێی یاسای تایبەتی دەبێت.

(عَمَلِيَّة الإنْتِخَاب نَفسَها): كردەوە چۆنیەتیی هەڵبژاردنەکەو رۆیشتنی.
(جـرى آلإنتِخـاب فِي جَـوٍ مِـنَ الحُريَّـة): هەڵبژاردنەکە لەکەش و هەوایەکی ئازاددا کرا.
(آلإنْتِخـاب الطَبيعـى فِي علـم الأَحيـاء): هەڵبژاردنی سروشتیی لەزانستیی زیندەوەراندا،
(نَظَرِيَّة داروين): بـیردۆزی داروێن دەڵێت: جـۆرە زینـدەوەرو رووەکێـك دەمێنێتەوەو نافەوتێـت کـە بەهێزتـرن لـەو جۆرانەی کەلـەوان بێهێزتـرن چونکـە ئەمـان لەوان باشـترو قایمـترو بەرگەگرتـرن ئەوقایمانە خۆیان لەگەڵ هۆکارەکانی ژینگەکەدا رادێنن‌و دەگونجێنن.
(آلإنْتِخاب الصِناعي أَو الإصْطِناعي في الحَيَوان والنَبات): هەڵبژاردنی دەستکردیزیندەوەرو رووەك واتـە: هەڵبژاردن‌و چاککردنی جۆری ئاژەڵ و رووەك. بەهەڵبژاردنی باشترین نێرو مێ و گـەران بۆ چاکتریـن و بەبەرهەمترین تۆو یـان داری رواندن بـۆ زاوزێکردن پێیان یان چاندن‌و رواندنیان تا وەچەیەکی بەسوود پەیدا بکەن‌و بخەنەوەو تۆوێکی باش بەرهەم بهێنن.

نخـت: (نَخَـتَ - الطائِـرُ الشـيءَ. نَخْتاً): باڵندەکە شتەکەی بەدەنووك کونکرد.
(-القَـولَ): زۆر سـۆراغی قسـەکەیکرد/ بەشوێنیدا گەرا.

نخج: (نَخَجَ -السيلُ. في سَنَدِ الوادى نَخجاً): لافاوەکـەدای بەدیواری دۆڵەکـەدا/ قەدپاڵی دۆڵەکەدا.
(-الدَلْـوَ وَبآلدَلْـوِ في البئـرِ): دۆلکەکـەی لەچاڵاوەکەدا راوەشاند تا پڕ بێت.
(إسْتَنْخَجَ -الرَجُلُ): پیاوە رەقەکە نەرمبوو/ شلبوو/ دوای رەقبوون نەرمبوو.
نخر:١-(نَخَرَ آلإنْسانُ أَوآلدابَّةُ نَخْراً وَنَخِيراً): مرۆڤەکـە یان چوارپێکـە مرخەمرخیکرد/ مشەمشیکرد.
(-الحالِـبُ الناقَةَ نَخْراً): حوشـتر دۆشـەکە دەسـتی بەلووتی حوشـترەکەدا کردو لووتی هەڵگلۆفت تا باش شیردابدات.
(نَخِـرَ - العُـودُ أَو العَظمُ وَنَخْـوُهُ نَخَراً): چیلکەکە یان ئێسـقانەکە یان شـتیتر رزی/ پۆرتکا/ رێزاڵ رێزاڵبوو/ کلۆر بوو.
(ناخِر ونَخِر): پۆرتـکاوو رزیو/ هەڵوەریو/ خوراو/ کلۆربوو.
(نَخَّـرَ -هُ): ١-پۆرتکانـدی‌و کونکونیکـرد ٢-دوانـدی/ قسـەی لەگەڵـدا کـرد ٣-لووتی حوشـترەکەی هەڵگلۆفـت و لووتـی خوراند تاشیر دابدات.
(الناخِـر (فـا) (ج) نُخُر): ١-کـۆن و رزیوی رێزال رێزاڵبوو.
(مابالدار ناخِرٌ): ماڵەکە مشەمشـکەری تێدا نییە واتا کەسی تێدا نییە.

(أَلناخِر): ٢-(ح) بەرازی دڕی کێوی ٣-(ح): کەر. یان چارەوێ.

(أَلناخِرَةُ)١: مێی وشەی. (أَلناخِر): ٢-ئێسقانی کۆنو رزیو/ پۆرتکاو ٣-ئەسپ یان کەر.

(أَلنمُخْرَةُ.(ج) نُخَر): پەرەکەی لووتو پێشی لووت.

(-مِنَ الريح): بای توندو تیژ.

(أَلنُخْرَةُ (ج) نُخَرَ): پەرەکەو پێشی لووت.

(أَلنَخّار): لرخن، مشن/ مرخن.

(أَلمَنْخَر والمِنْخَر وَالمَنخِر والمِنْخِر وَأَلمُنْخُر وَالمَنْخُور (ج) مَناخِير وَمَناخِر) (ع إ): لووت/ کەپوو.

٢-(أَلنِخوار (ج) نَخاوِرَة): ١-لووتبەرز/ بەفیزو دەعیە ٢-زیرەکردو ٣-بوودەڵە/ لاواز ٤-خانەدان. نگیندار.

٣-(نَخْرَبَ -الشَجَرَةَ): درەختەکەی کونکرد.

(أَلنُخْروب (ج) نَخاريب): ١-کون ٢-درزی بەرد/ تلیشی بەرد.

(نَخاريبُ النَحل): کونی شانەی هەنگوین کەهەنگوینی تێدا دادەنێت.

نخز: (نَخَزَ - هُ بالحَديدِ): ئاسنی تێوەژەند.

(-هُ بِكَلِمَةٍ): بەقسەیەك ئازاریدا.

نخس:١-(نَخَسَ -الدابَّةَ نَخْساً): چیلکەیان شتیتری لەقەبرغەیان دواوەی ولاخەکەوەژەندو ورووژاندی.

(-آلبَكْرَةَ): شلیی یان کونی بەکرەکەی بەپەڕۆیان شتیتر توندکردو ئاخنی.

(-بِفُلانٍ): تێزە تێزەی فیسارپداو ورووژاندی و بێزارپکرد.

(نُخِسَ - البَعيرُ): حوشترەکە لەکلکیەوە تووشی گەرِیبوو.

(مَنخوس): حوشتری گەر.

(تَناخَسَ - تِ الغَنَمُ): مەڕەکان سەرمایانبوو پاڵیان بەپاڵییەکەوەدا بۆ ئەوەی گەرمببنەوە.

(-الغدرانُ): جۆگەکان رژانە ناویەك.

(أَلناخِس) (فا): گەرییەکە تووشی حوشتر دەبێت.

(أَلنَاخِس والنَخُوس) (ح): کەڵەکێویی گەنج/ تەمەنکەم.

(أَلنِخاس (ج) نُخُس): پواز یان پەڕۆو شتی وەها دەخرێتە درز یان تەوەرەی بەکرەی شلەوە تاتوندبێت.

(نِخاسا آلبَيتِ): دووپایە یان کۆڵەکەی هەیوانی خانوو.

(أَلنِخاسَة = أَلنِخاس): پوازو پەڕۆ کەبەکرەی شلی پێ توند دەکرێت.

(أَلنِخاسَة والنَخاسَة): ١-کۆیلە فرۆشتن ٢-چوارپێفرۆشتن.

(أَلنَخّاس):١-کەسێکە خەڵك زۆر بوروورژێنێت و وەڕس بکات.٢-(کۆیلە/ بەندە) فرۆش ٣-چوار پێفرۆشت ٤-جامبازی ولاخفرۆشتن.

(أَلنَخيس): بەکرەی شلەوەبوو کە بەپوازو پەڕۆ و پاتاڵ کونەکەی دەگیرێت و قایمدەکرێت.

(أَلمِنخَس (ج) مَناخِس): ئەوەی پێی لەولاخەوە دەژەنن/ نەقیزە، چیلکە.
٢-(نُخِسَ لَحْمُهُ): گۆشتەکەی کەمیکرد.
٣-(أَلنَخيسَة): ١-شیری ئاوێتەی بزن و مەڕ ٢-کەرە/ نفیشك.
نخش: ١-(نَخَشَ-هُ نَخْشاً): هانیدا/ تێزیکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی بزواند.
(-الدابَّةَ): چوارپێکەی توند لێخوڕی.
(تَنَخَّشَ - إلى كذا): بۆ لای ئەوە جما/ بزوا/ جوولا.
(أَلنَخش) (مص): برە (پارەیەی/ دارایەك).
٢-(نَخَشَ - العودَ. نَخْشاً): چیلکەی رووتکرد/ توێکڵی چیلکەکەیگرت.
(-هُ): ئازاریدا.
(نَخَشَ وَنُخِشَ نَخْشاً): لاوازکرا/ لەربوو.
(نَخِشَ - الشيءُ نَخَشاً): بنی شتەکە رزیو پەکیکەوت.
نخص: (نَخَصَ - الرَجُلُ نَخْصاً): پیاوەکە لاوازبوو پێستەکەی چرچبوو.
٢-(نَخَصَ وأَنْخَصَ -هُ الكِبَرُ أوالمَرَضَ): پیری یان نەخۆشی لاوازیکردو پێستەکەی چرچکرد.
(نَخِصَ وآنتَخَصَ - لَحْمُهُ. نَخَصاً): گۆشتی پێوەنەما/ گۆشتەکەی داماڵرا.
(عَجوزٌ ناخِصٌ): پیرێکی لاوازی پێست چرچو لۆچتێبوو.

نخط: ١-(نَخَطَ - إلَيْهِم. نَخْطاً): لێیان (دەرپەڕی/ پەیدا بوو).
(أَلنَخْط وآلنُخُط): خەڵکی.
(مــاأدري أَيُّ آلنُخُطِ هُــوَ): نازانم ئەو چۆن کەسێکە، چۆن زەلامێکە!!.
(نَخَطَ - آلمُخاطَ مِن أَنْفِهِ. نَخطاً): چڵمەکەی لووتی رۆکرد.
(-بِفُلانٍ نَخيطاً): جنێوی بە فیساردا و بەگوێیدادا.
(إنْتَخَطَ -هُ): لەو چوو.
(-آلمَخاطَ مِن أَنْفِهِ): چڵمی لووتی رۆکرد/ فمیکرد.
(أَلنُخُط): ناوی پەردەی ساوا کەساواکەی تێدا دەبێت.
(أَلنُخُط): کۆمەڵە یاریکەرێك کەنازایانەو پاڵەوانانە نێزە بازیبیدەکەن.
٣-(نَخَطَ - عَلَيهِ نَخيطاً): فیزی بەسەردا نواند.
٤-(أَلنُخُط): مۆخی ئێسقان.
نخع: ١-(نَخَعَ - الذَبيحَةَ نَخْعاً): ئاژەڵەکەی وا سەربڕی تا دەمی چەقۆکەی گەیاندە مۆخی.
(-الرَجُلُ): بەڵغەمی سنگی یان چڵمی لووتی فڕێدا.
(-هُ الطاعَةَ أو آلنَصيحَةَ): تەواو گوێڕایەڵیی کرد یان ئامۆژگارییەکەی وەرگرت و گرتە گوێ.
(-الأَمرَ عِلْماً): زاناو پسپۆڕی کارەکە بوو.

(نَخِـعَ - آلعُـودُ أَو النَبـاتُ. نَخَعـاً): ئـاو بەتووڵەکـەدا یـان رووەکەکـەدا / گیاکـەدا رۆیشتو سەرکەوت وەکو بگاتە کورۆکی.

(تَنَخَّعَ - الرَجُلُ): بەڵغەم یان چڵمی فڕێدا/ لووتی فمکرد.

(-السَّحابُ): هەورەکـە چـی بـاران پێبوو دایکرد/ رۆیکرد خۆی تەکاند.

(إنْتَخَـعَ - السـحابُ): هەورەکـە بارانەکەی هەموو داکرد، خۆی تەکاند.

(-الرَجُلُ عَن أَرضِـهِ): پیاوەکە لەخاکەکەی دوورکەوتەوە.

(أَلنَخَاع و آلنُخَاع والنِخَاع (ج) نُخُع): مۆخی بربڕاگـەی/ بربڕەی پشـت کەلەناو گرێکانی ملەوە بەبربڕەی پشتدا درێژ دەبێتەوە تادوا گرێی مووڕەغەی پشت.

(دودة الظهـر) (عامیـه): مۆخـی بربڕەی پشت.

(أَلمُـخ = نقـی آلعَظـم = نُخَـاع): مۆخـی ئێسقان.

(أَلنخاعَة): بەڵغەم و چڵمی مرۆڤ.

(أَلأَنْخَع): سەربەخەڵك سۆرکەرترین و خەڵك بەزێنترین و خەڵك لەناوبەرترین.

(أَلمَنْخَع) (ع ا)١-جومگەی نێوان ملو سەر لە ناوەوە ٢-شوێنی برینی مۆخی بربڕەو سەر.

٢-(نَخَعَ -لَهُ بِحَقِّهِ نُخُوعاً): دانی بەمافەکەیدا نا.

(نَخعَهُ) (عامیة): توند رایوەشاند.

(نَخِـعَ - فُلانٌ بِحَقِّـي نَخَعاً): فیسـار پێی لەمافەکەمنا/ دانی بە مافەکەمدا نا.

(أَلنُخُوع) (مص): پێ لەمافنان/ دان بەمافدا نان.

نخـف: (نَخَـفَ. نَخَفـاً وَنَخِيفـاً): پرمەی لووتیهـات کاتێـك لووتـی داتەکانـد (ئەمە بەتایبەتی بە بزن دەوترێت).

(أَنْخَفَ): پرمەی لووتی زۆر هات.

(أَلنَخْفَةُ): چاڵییەکی سەرشاخ.

(أَلنِخـاف (ج) أَنْخِفَـة): پێـڵاو یان سـمی حوشتر.

نخل: (نَخَـلَ - الدَقيقَ. نَخْـلاً): ئاردەکەی بێژایەوەو لەهێڵەکیدا و کەپەکەکەیگرت.

(-الشيءَ): شتەکەی هەڵبژاردو پوختیکرد.

(-النَصيحَـةَ أَو الـوُدَّ لِفُـلان): دڵسـۆزانە ئامۆژگارییکرد یان دڵسـۆزانە دۆسـتایەتیی لەگەڵداگرت.

(نَخَلَ ونَخَّلَ -السحابُ الثَلْجَ. نَخلاً): هەورەکە بەفریداکرد/ بەفریباراند.

(تَنَخَّلَ وآنتَخَلَ - الشيءَ): شتەکەی پوختەو پاککردو باشەکەی هەڵبژاردو وەرگرت.

(أَلناخَل (فا)): دڵسۆز.

(إنَّهُ ناخِلُ الصَدر): ئامۆژگارێکی دڵسۆزە.

(نَصيحَةٌ ناخِلَة): ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانە.

(أَلنَخل واحِدَتُهُ نَخْلَة) (ن): دارخورما.

(نَخْلَـةُ): دار خورمایـەك لەکۆمەڵـەی دار

خورمایە لەولاتـە گەرمەکاندا دەڕێ قەدێکی ڕاسـتو ڕێکـی گرێیاویـی هەیـەو بەرێکی خۆشـی هەیە کەمرەباو جۆرە کهولێکیشـی لێدروسـتدەکرێت کەپێـی دەوترێت نەرمقی خورمـا. ناوەکـەی لەوشـەی هەڵبژاردنەوە هاتووە چونکە لـە هەموو درەختێکی قەددار بالآترە/ بەرزترە.

(اَلنُخالَـة): ١-کەپـەك/ سـۆس ٢-ئـەوەی کە بێژراوەتەوە یان پوختکراوە هەڵدەبژێردرێت.

(اَلنَخّال): ١-زۆر بێـژەرەوە ٢-ئەوەی کە ئارد دەبێژێتەوە.

(اَلنَخلِیّـات): (ن) کۆمەڵـەی یەکخەپلـە، کۆمەڵەیەکە قەدەکەی یەکگرتووەو بێپەلە.

(النَخیـل) الواحِدَةُ نخیلـة (ن) = النّخل): دارخورما.

(النَخیلَة (ج) نَخائِل): ١-ئامۆژگاریی دڵسۆزانە. (لایَقبَـل اللهُ إلاّ نَخائِـلَ القلـوب): خـودا تەنها نیاز پاکەکانو دڵسـۆزەکان وەردەگرێت ٢-سروشت.

(اَلمُنْخُل واَلمُنْخَل (ج) مَناخِل): ئەوەی شـتی پێدەبێژنەوە وەك هێڵەكو بێژنگو کەو.

نخم:١-(نَخَمَ. نَخْمـاً): یاریکردو جوانترینو چاکترین گۆرانیچڕی گۆرانییوت.

(ناخِم): گۆرانیبێژی چاك.

(اَلنَخْمَةُ)١-جوانیی ٢-نازایی/ دلێریی.

٢-(نَخِمَ- الرَجُلُ. نَخَماً): شەکەتبوو.

(نَخِـمَ وَتَنَخَّمَ. نَخماً وَنَخمـاً): بەڵغەم یان چڵمی فرێدا

(اَلنَخْمَـةُ) ١-جارێك چڵمو بەڵغـەم فرێدان. ٢-چڵـمو بەڵغەم ٣-زلله لێدان ٤- لەتەسـكیی لووتەوە دەبێت/ مرخە/ پرخە.

(اَلنَخامَة): چڵم و بەڵغەم.

نخـو: (نَخـا - الرَجُـلَ. يَنْخُـو نَخَـوةً): ستایشیکرد/ هەڵینا.

(نُخِيَ - الرَجُلُ نَخْوَةً): شـانازییکردو خۆی بەگەورە داناو بەگەورەگرت.

(نَخّـی - هُ): فریویـداو هانیـدا. بایتێکـرد (ئیدیۆمە).

(اَنْخی. إنْخاءً): پیاوەتیی و جوامێریی پتر بوو.

(إنْتَخی - عَلَینا إنْتِخاءً): فیزی بەسـەرماندا لێداو خۆی لەمنێمە بەگەورەتر (گرت/ دانا).

(-مِـن کذا): بێزی لەوەهاتەوە سـەربەرزیی بەرامبەری نواند/ خۆی لەو بەزیاتر زانی.

(اَلنَخْوَة) (مص): ١-پەرۆشـیی ٢-جوامێریی و پیاوەتیـی ٣-مەزنیـی ٤-لووتبەرزیی و بەخۆ نازین.

ند: (نَـدَّ- البَعیـرُ. نَـدّاً ونَدِیـداً ونُدوداً وَنِـداداً): حوشـترەکە هەڵیتیزاندو یاخیبوو دایە دەشت.

(نَدَّتِ الکَلِمَةُ): وشەکە لەدەستوور دەرچوو.

(نَـدَّدَ - الإبِـلَ): حوشـترەکانی پـەرش و بلاوکردنەوە.

(-بالشـيءِ): شـتەکەی لەناوخەڵکدا جارداو ئاشکراکرد.
(-بِفُلانٍ): ١-ناوی‌فیساری‌زڕاندو‌کەموکووڕیی‌و خەوشی دەرخست ٢-قسەی ناشیرینی (پێوت و بەگوێدادا).
(-صَوتَهُ): دەنگی (بەرزکردەوە / هەڵبڕی).
(نادَّ - هُ مُنادَّةً): لەگەڵیدا ناکۆکبوو.
(أَنَدَّ - الإبلَ): حوشترەکانی بڵاوکردەوە.
(تَنـادَّ - القَـومُ): خوێشـگەل ١-ناتەبـاو ناکۆکبوون. ٢-لەیەکپچڕان‌و بڵاومیان لێکرد.
(-تِ الابـلُ): حوشـترەکان هەڵیانتیـزان‌و فرتەیانکرد یاخیبوون‌و دایانە دەشت.
(ألنـادُّ (ج) نُـدَّاد) (فـا): ١-ناتەبـا/ ناکۆك ٢-بڵاو.
(لیس لَهُم نادٍ): ڕۆزییان نییە.
(ألنَدّ): ١: گردۆڵکـە/ تەپۆڵکە ٢-گردی بەرز ٣-داری عوود کەبۆ بۆنی خۆشی دەیسووتێنن (فارسیة).
(ألنَديد (ج) نُدَداء (م) نَديدَة (ج) نَدائِد) = النِدّ): هاوتا/ هاوشێوە/ هاوچەشن هاوجۆر/ هاو وێنە.
(مالَهُ نَديدٌ): لەوێنەی ئەوە نییە/ هاوتای نییە.
(ألتَناد) (مص): لەیەکچوون.
(يَومُ التَنادِ ويَـومُ التَناد): ڕۆژی (قیامەت/ زیندو بوونەوە/ حەشر).
(ذَهَبُوا أَناديدَ وَتَناديدَ): هەریەکە بەلایەکدا ڕۆیشتن‌و بڵاومیان لێکرد/ پەرشبوون.
ندأ: ١-(نَدَأَ-هُ. نَدْأً): ترسـاندی و ڕۆحیبرد/ تۆقاندی.
٢-(نَـدَأَ -اللَّحْـمَ. نَدْأً): گۆشـتەکەی بەژێر ئاگرەکەوە کرد.
(-المَلَّة): ئاگریکردەوە یان خۆڵەمێشی گەرمی پەیداکرد.
(ألندِيء): گۆشتێك کەبخرێتە ژێر ئاگرەوە.
٣-(نَدَأَ - عَلَيهِم نَدْأً): لێیاندەرپەڕی/ سەری لێدەرهێنان/ چووە سەریان.
(ألنَدِئُ): ١-سـووریی هەور لەهەڵهاتنی خۆرو ئاوابوونیدا ٢-پەلکە زێرینە.
(ألنَدْأَةُ والنُدْأَةُ): ١-سووریی هەور لەهەڵاتن‌و ئاوابوونی خۆردا ٢-خەپلەی خۆر ٣-خەرمانەی مانگ.
٤-(ألنَـدْأَةُ): دارای زۆر یان ئـاژەڵ و ماڵاتی زۆر.
(ألنُدْأَة (ج) نُدَأ): پەڵەگیای بڵاوبڵاو.
نـدب: (نَـدَبَ - فُلانـاً لِلأمـرِ أو إلى الأمرِ نَدْباً): بۆ ئەنجامدانی کارێك و گرتنی کارێك فیساری پاڵاوت‌و هەڵبژاردو هانیداو ڕایسپارد کەبیکات.
(-هُ إلى الحَـربِ): ئاراسـتەی جەنگیکـردو ڕایسپارد.
(نادِب): ئاراستەکارو ڕاسپێر و ئەویتر ئاراستەکراو ڕاسپێردراو و کارەکەیش: بۆ ئاراستەکراوە.

(النُدبَة): ئاراستەكردن‌و راسپاردن.
(نَدُبَ - الرَجُلُ. نَدابَةً): پیاوەكە خانەدان‌و ناسكبوو، بۆ پیاوەتیی و چاكە چابوكبوو، بەدەنگەوە هاتوو بوو.
(إنْتَدَبَ - هُ لِأَمرٍ): بۆ ئەنجامدانی كارێك بانگێشتیكرد ئەویش بەدەنگیەوە هات.
(-لِفُلانٍ): بەرەنگاری قسەكەی بوومەوە/ بەرهەڵستی قسەكەیكرد.
(تَكَلَّمَ فَأَنْتَدَبَ لَهُ فُلان): قسەیكردو فیسار بەرهەڵستی قسەكەیكرد.
(خُذ ماإنْتَدَبَ): چی دەستگیرتدەبێت بیبە.
(اَلنَدْب (مص) (ج) نُدُوب وَنُدَباء): ١-چابووك لەچاكەكردن‌و پیاوەتیدا ٢-وەجاخزادەی ناسك لەرەفتاردا ٣-چالاك لەبەدەنگەوە چوون‌و دەستگرتن و پێداویستیدا.
(فَرَسٌ نَدْبٌ): جارەوێیەكی چابووك‌و بەگور.
(اَلنَدَب (ج) أنْداب): كەوانی رێك‌و تیرخێراو تیژ.
(رَمَينا نَدَباً): تیری تیژو خێرامان هاویشت.
(اَلنَدْبَة): مێی وشەی (النَدْب): جارێك تیر تیژ هاویشتن/ خێراهاویشتن.
(اَلمِنْدَبي): سووكەڵەی چابووكی كار زوو هەڵسوورێن و زوو بەدەنگەوە هاتوو.
٢-(نَدَبَ - المَيتَ نَدْباً): بۆ مردووەكە گریاو شیوەنیكرد، بۆی لاواندەوەو پێدا هەڵدا.
(اَلنُدْبَةُ): بۆ مردوو لاواندنەوەو پێداهەڵدان‌و چاكەكانی بەرچاوخستن.
(عَرَبيٌّ نُدْبَةٌ): عەرەبێكی زمانپاراو كەبەمردوودا هەڵدەدات.
(اَلمَنْدَب (ج) مَنادِب): گریەو فوغان/ شیوەن و رۆرۆی زۆری مردوو و پێدا هەڵدانی.
٣-(نَدِبَ - الظَهْرُ. نَدْباً و نُدُوْباً و نُدُبَةً): شونبرین لەپشتەكەدا مایەوە یان پەیدا بوو پاش ئەوەی برینەكە سارێژبووبوو.
(نَديب): برینی سارێژبووی پشت.
(نَبِبَ - الجرحُ نَدَباً): شوێن برینەكە رەقبوو.
(أنْدَبَ - الجرحُ): شوێن برینەكە رەقبوو.
أنْدَبَ - الجرحُ فُلاناً: برینەكە كاری كردە سەر فیسارو جێگەكەی دیاربوو.
(- بِظَهرِهِ وفي ظَهرِهِ): برینەكە جێبرینی لەپشتیدا بەجێهێشت.
(اَلنَدَب (مص) (ج) نُدُب): جێبرین.
(اَلنَدْبَةُ وَ النَدَبَةُ (ج) نُدْب و (حج) نُدُوب وَأنْداب): جێبرین كە بەپێسەوە دەمێنێتەوە.
٤-(أنْدَبَ - فُلانٌ نَفسَهُ وبِنَفسِهِ): فیسار گیانی خۆی خستە مەترسییەوە.
(اَلنَدَب (ج) أنداب): مەترسیی گرموو خەبات و تێكۆشان براوەیەو شتەكە بۆ ئەو دەبێت.
الملحق:
ندب: (اَلنادِبَة): ئەو ئافرەتەی بۆ مردوو دەگری‌و دەبارێنێ/ دەلاوێنێتەوەو بە مردووەكەدا هەڵدەدات ٢-ئافرەتێك كەپیشەی لەپرسەدا لاواندنەوەیە.

(اَلإِنْتِــداب): ناردنــی کەســێك یــان پتر بۆ ئەنجامدانی کارێك و دەسەڵاتی پێویستیان بۆ ئەوە بدرێتێ.

(إِنْتِداب مُمَثّل إِلى جَمعِيَّة): ناردنی نوێنەرێك و راسپاردەیەك بۆ کۆمەڵەیەك.

(اَلإِنْتِداب): (سەرپەرشــتیکردن) رژێمێکبوو (عوســبەتولنومەم/ کۆمەڵــەی دەوڵەتــان) دایانهێنا بۆ پیادەکردنی بەسەر ئەو وڵاتانەدا کەلەژێــر جەنگی ئەڵمان و تورکیا دەرهێنران، رژێمەکــە ئەوەبــوو وڵاتێکــی پێشــکەوتوو وڵاتێــك لەوانە بگرێتە دەســتو بەڵێن بدات کەیاریــدەی ئەو وڵاتەبــدات، پێبیگەیەنێتو فێــری بەرێوەبردنــی کاروبــاری بــکات، تا بتوانێت ســەربەخۆیی وەرگرێت. دەســتەی نەتەوەیەکگرتــووەکان لەبــری ئــەو رژێمە رژێمی پێسپاردنی دانا.

(اَلْمَندوب): نوێنەر کەســێکە کەبۆ شــوێنێك بنێردرێتو کاری پێ بسپێردرێت.

(مَندوبٌ يَحْمِلُ رِسالَةً): نوێنەرێکە نامەیەك هەڵبگرێت.

(مَندوب جريدَة): نوێنەری رۆژنامەیەك.

(المَندوب) «مَن يَنوبُ عَن شَــخصٍ أَو هَيئَة أَو دولَة أَو مُؤَسَّســةٍ في عملٍ مِن الأَعمال»: کەسێکە نوێنەری یەکێکبێت یان هی دەستەیەك یــان دەوڵەتێــك یــان دامەزراوەیەکبێــتو راسپاردەی کردنی کارێکبێت.

(عُيِّنَ مَندوبــاً إِلى المؤْتَمَــر): نوێنەرێك بۆ کۆنگرەکە دانرا.

ندح: (نَــدَحَ - الشــيءَ. نَدْحاً): شــتەکەی فراوانکرد.

(نادَحَ -هُ): شــانازیی ئەوەی بەسەردا کرد کە لەو ماڵو کەسوکارو شتی زۆرترە/ خۆیی لەو بە زیاتر دانا.

(تَنَدَّحَ -تِ الغَنَمُ في مَرابِضِها أَو مسارِحِها): مەرەکان لەمۆڵگەکانیاندا یان لەوەرگاکانیاندا بڵاوبوونــەوە و دوورکەوتنــەوە ٢-زۆریــان خواردبوو ورگیان لێهاتبوو.

(إِنْتَدَحَ -تِ الغَنَمُ في مَرابِضِها أَومسارِحِها): مــەرەکان لــە مۆڵگەکەیانــدا یــان لەوەرگاو دەشــتەکەدا پــەرشو بڵاوبوونــەوەو دوور کەوتنەوە.

(اَلنِدْح): شتێك کەدوور بەدوور بیبینیت.

(اَلنَــدْح وَالنُــدْح (ج) أَنْــدَاح): ١-فراوانی/ بەربڵاویی ٢-زۆریی/ فرەیی ٣-ناوقەدی شاخ.

(اَلنَدْح والنُدْح والنَدْحَةُ والنُدْحَةُ): زەمینی پانو بەرین.

(اَلْمَنْدوحَة وَالْمُنْتَدَح): بەری بڵاوو بوارە، رێ.

(لَكَ عَن هــذا الأَمرِ مَنْدوحَــةٌ أَومُنتَدَحٌ): بــوارەت هەیە ئــەم کارە لێگەرێیــت/ وازی لێبهێنیت.

(لَكَ مُنتَدَحٌ في البلاد): شوێن زۆرو زەبەندەیەو بەربڵاوە بۆ خۆت تێیدا بگەرێیت و بچیت.

(أَرضٌ مَندوحَةٌ): زەمینێکی فراوانو بەرینو دوور.

(المَنــادِح): زەویــی فــراوان/ پــانو بەرینو دوور.

٢-(ألنِدْح): فورسایی/ سەنگینی/ قورسیی.

نــدخ: (نَدَخَ - هُ. نَدْخــاً): بەرێکەوت خۆی پێدادا.

(أَنْدَخَنــا المركَب ســاحِلَ كــذا): پاپۆرەکە داینی بەفیسار رۆخدا.

(تَنَدَّخَ - الرَجُلُ): شــانازیی زۆریکردو خۆی هەڵکێشا بەشتی وەهاوە کەنەیبوو.

(ألأَنْــدَخ): گەوجــی کــەودەنو کەم قســە/ کەمدوو.

(أَلمُنَدَّخ): دێوانە سروشتێکی بەرەڵا چی بڵێت یان چی ناشیرینی پێ بڵێن بەدەربەستەوە نەیەت.

ندر:١-(نَدَرَ- الشــيءُ نَدْراً وَنُدوراً): شــتێك لەناوشتێکەوە کەوتە خوارێو دەرکەوت.

(-مِن مَوضِعِهِ): لەشوێنەکەی خۆیدا نەما.

(-فُــلانٌ مِــن قَومِــهِ): فیســار لەنــاو خوێشگەلەکەیەوە هاتەدەرێ.

(-تِ الشَــجَرَةُ): درەختەکە ســەوز هەڵگەرا/ سەوزبوو.

(-النَباتُ): رووەکەکە گەلایدەرکرد.

(-الشَيءُ): شتەکە دەگمەنبوو/ زۆر کەمبوو.

(-الرَجُلُ في فَضلِ أَوعِلم): پیاوەکە لەپیاوەتیو چاکەدا یان لەزانستدا واپێشکەوت وێنەی نەبوو.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە مرد.

(نَــدُرَ - الــكلامُ نَــدارَةً): ١-ئاخاوتنەکــە رەوانبــوو ٢-جــوان و ســفتو ریکوپێکبــوو ٣-سەیرو ئەنتیکەو بێوێنەبوو.

(أَنْدَرَ): کاری سەیرو سەمەرەیکرد یان قسەی ئەنتیکەو سەیرو ناوێزەیکرد.

(-آلعَظمَ): ئێسقانەکەی لەجێبرد.

(-الشيءَ): شتەکەی خستە خوارەوە.

(تَنــادَرَ - عَلَينــا): شــتی ناوێزەو ســەیرو دەگمەنی بۆ گێراینەوە.

(تَنادَروا - الشيءَ): شتەکەیان خستە خوارێ.

(إِســتَندَرَ-هُ): بەدەگمەنــی هاتــە بەرچاو/ بەشتێکی دانسقەو دەگمەنی دانا.

(أَلنــادر) (فا): دەگمەن/ دانســقە. شــتێکی کەمبوو یان کەمرووداو/ نامۆ.

(-مِنَ الكَلِم): قسەی کەمبیستراو/ دەگمەن.

(النادرر - مِنَ الجَبَلِ): لووتی شــاخ کەدێتە دەرەوەو دەردەکەوێت.

(أَلنــادِرَةُ (ج) نَوادِر): مێی وشــەی (النادِر) "هُوَ نادِرَةُ الزمان": ئەو دەگمەنی سەردەمەو تاکی سەدەکەیەتی.

(نوادِرُ الكَلام):١-وتەی ناوێزەو دەگمەن و سەیر ٢-وتە نائاساییەکان وتە رەوان و جوانەکان.

(أَلنَدر = النادِر): دەگمەن/ دانسقە/ ناوێزە.

(شيءٌ نَدْرٌ): شتێکی دەگمەن ناوێزە، دانسقە.

(أَلنُدْرَة): دەگمەن کەمدەسکەوتوو/ کەمبوو.

(ألنَدْرَة = النُدْرَة): دەگمەن/ کەمدەسکەوتوو.
(لایکــونُ ذلك إلاّ نَدْرَةً وفِي الندرَةِ): زۆرکەم ئەوە دەبێت/ کەم هەڵدەکەوێت.
(ألنَدْرَة): پارچــە زێرێك یازیوێــك لەکانزایەکی تردا بێت.
(ألنَدَری): دەگمەنێك کەزۆر کەم دەستکەوێت و ببێت/ چلۆنها دەستکەوێت.
(لَقیتُــهُ نَــدَری وفِي نَــدَری والنَّــدَری وفِي النَدَری): زۆر کەم پێگەیشتووم/ دەمدی.
٢-(نَدَرَ -الشــيءَ. نَدْراً وَنُدوراً): شــتەکەی تاقیکردەوە.
(إسْتَنْدَرَ - القَومُ أثَرَهُ): خوێشکە شوێنپێیان هەڵگرتو دوایکەوتن.
(-اَلمالُ الرُطَبَ): ماڵیاتەکە/ ئاژەڵەکە بەدوای لەوەری تەڕەوەو گیاوەبوون بۆیدەگەڕان.
٣-(الأَنْدَر (ج) أنادِر): ١-مەڵۆی گەنم/ شارای گەنم ٢-خەرمان.
(الأَنْدَرِيُّ): گوریسی ئەستوور.
ندس: ١-(نَدَسَ - هُ بِالرمحِ. نَدْساً): نیزەی پێداکرد.
(-هُ بِكلِمَةٍ): قسەیەکی تێگرت.
(-بِهِ الأرضَ): دایبەزەویدا.
(-هُ عَنِ الطَريقِ): لەرێگەکەی لایدا.
(-الأَرضَ بِرِجلِهِ): پێی بەزەویدا کوتا.
(نادَسَ-هُ): رمیان بەیەکتریدا کرد.
(تَنَدَّسَ): رمی پێداکرا یان قسەی پێوتراو تێگیرا.

(نَدس. به الأرضَ فَتَنَدَّسَ): کێشای بەزەویداو بەزەویدا دراو کەوت.
(تَنادَسَ- القومُ): خوێشــکەل ناوو ناتۆرەیان لەیەکتری داهێنا.
(رِمَاحٌ نَوادِس): نیزەی بەخەڵکدا کراو.
٢-(نَدَسَ - عَلَيهِ الظَنَّ. نَدْســاً): گومانێکی لێکرد کە لێی نەکۆڵیبووەوە.
٣-(نَدِسَ - الغُلامُ. نَدَســاً): مێرد منداڵەکە تێگەیشتوو بەوێڵبوو.
(نَــدِسٌ وَنُــدِسٌ وَنَــدُسٌ): مێــرد منداڵی تێگەیشتوو و بەوێڵ.
(تَنَــدَّسَ - الرَجُلُ الأَخبــارَ وَعَنِ الأَخبارِ): پیاوەکە بــەدوای هەواڵەکاندا گەڕا تا بزانێت کەخەڵك لێی ئاگادارنین.
(ألنَدْس) (مــص): ١-دەنگی زۆر نزمو چرپە ٢-پیاوێك گوێســووك کــە زوو چرپەو دەنگی نزم دەبیستێت.
(ألنَدس): زرنگیی و هوشیاریی و بەوێڵیی.
(ألمِنداسُ - مِن النســاءِ): ئافرەتی چابووکی تێگەیشتوو.
٤-(تَنَــدَّسَ - مــاءُ البِئرِ): ئــاوی چاڵاوەکە سەرکەوتو لێیرژا.
٥-(ألَنْدُوسة) (ح) قالۆنچە رەشە/ خلێنکە.
ندش: (نَدَشَ - عَنِ الشــيءِ. نَدْشاً وَنَدَشاً): بۆشتەکە گەڕا.
(-القُطنَ): لۆکەکەی شیکردەوە.

ندص: ١-(نَدَصَ- الشيءُ مِنَ الشيءِ نَدْصاً وَنُدُوصاً): شتەكە لەشتەكەیترەوە دەرپەڕی.
(-الرَجُلُ): پیاوەكە خێرا دەرپەڕی/ دەرچوو/ فرتەیكرد.
(-ت عَينُهُ نُدوصاً): چاوی دەرپەڕی وەختەبوو لەچاڵەكەی دەرپەڕێتە دەرەوە.
نَدِصَ: (-تِ آلبَثْرَةُ نَدَصاً): زیپكەك شتی پێداكراو كێمو زووخەكەی هاتەدەرێ.
(أَنْدَصَ واسْتَنْدَصَ - حَقَّهُ مِن فُلان): مافەكەی خۆی لەفیسار سەندەوەو دەرهێنا وەرگرتەوە.
٢-(نَدَصَ - على القَوم نَدْصاً ونُدُوصاً): بەشتی ناشیرین لەخوێشكەل راپەڕی.
(-القَومَ): خراپی بەخوێشكەلكرد.
(إمْرَأَةٌ نُدَصَةٌ)١- ئافرەتێكی گەوجی زمانپیس ٢-سووكەڵەی هەڵەشەو جرپن.
(المِنْداص) (ج) مَنادِيص): پیاو خراپێك كە هەر هەڵكوتێتە سەر خوێشكەلو ناپەسندانە و پیاو خراپانە رەفتاریان لەگەڵدا بكاتو وەزندیان پێبگەیەنێت.
(إمْرَأَةٌ مِنْداصٌ)١- ئافرەتی گەوجی زمانپیسو شرودر ٢-جرپنی هەڵەشە.
ندغ:١-(نَدَغَ-هُ نَدغاً): بەپەنجە تێومیژەند/ پەنجەی تێومژەند.
(-هُ بِالرمحِ أو الكَلام): نیزەی پێداكردو تێومژەند یان قسەی پێوت.

(-الرَجُلَ): خراپەی دەربارەی پیاوەكە كرد.
(-تْهُ العَقرَبُ): دووپشكەكە پێوەیدا.
(نُدِغَ الصَبِيُّ): ختووكەی كۆرپەكەدرا.
(نادَغَ - هُ): دەستبازیی و دڵداریی لەگەڵدا كرد.
(أَنْدَغَ - بهِ): خراپەی دەربارەكرد.
(أَلنُدْغَةُ): سپێتی سەری نینۆك (وەكو شتێك كاری تێكردبێت).
(المِنْدَغ): نێزە وەشێن یان تیر و توانجوەشێن/ تەشەر لێدەر.
(المِنْدَغَةُ): سپێتی سەری نینۆك.
٢-(نَدَغَ - آلعَجينَ): ئاردی بەسەر هەویرەكەدا پرژاند.
٣-(إنْتَدَغ): لەژێرەوە پێكەنی/ بە دزییەوە پێكەنی.
٤-(أَلنَدْغ والنِدْغ) (ن): جاترە كێویلە.
ندف: ١-(نَدَفَ - القُطنَ نَدفاً): لۆكەكەی ( هەلاجییكرد/ دایە بەر چەك و كەوانەكەی/ شیكردەوە).
(-آلدابَّةَ): وڵاخەكەی تیژ لێخوڕی.
(-بالعُودِ أوالمِزهَر): لەتارەكەیدا.
(-تِ السَّماءُ بالثَلج): ئاسمان بەفرێباراند.
(-تِ الدابَّةُ. نَدْفاً وَنَدِيفاً وَنَدَفاناً): وڵاخەكە گورج گورج دەستوپێی هەڵگرتو خێرا رۆیشت.
(نَدَّفَ القُطنَ تَنْديفاً = نَدَفَهُ): لۆكەكەی شیكردەوەو هەلاجییكرد.

(أَنْــدَفَ): لەگــەڵ دەنگــی تارەكــەدا خــۆی جووڵاند.
(-الدابَّةَ): تیژ/ توند وڵاخەكەی لێخوڕی.
(أَلنُدْفَــةُ): جــۆرە شــیرێك هەروەكو پارچە لۆكەیەكی شیكراوەبێت.
(أَلنَدّاف)١- هەلاج ٢-تارژەن.
(أَلنِدافَة): هەلاجیی.
(النَّديف - مِنَ القُطنِ): لۆكەی شیكراوە.
(أَلمِنْدَف والمِنْدَفَةُ): چەك و كەوانەی هەلاج.
٢-(نَدَفَ - الطَّعامَ. نَدْفاً): خوردانەكەیخوارد.
(أَنْدَفَ - ألكَلْبُ): سەگەكەی ئاودا.
(أَلنَدّاف)١- زۆر خۆر ٢-هەلاج ٣-تارژەن.
نــدل: ١-(نَــدَلَ - الشَــيءَ نَدْلاً)١-شــتەكەی هەڵپچڕی راكێشاو خێرا فڕاندی ٢-گوێزایەوە.
(-بِسَلْحِهِ): ڕیقنەیكرد/ ڕیقنەكەی فڕێدا.
(ألدَلْــوَ مِنَ البِئــرِ): دۆلكەكــەی لە بیرەكە هەڵكێشا.
(نَدِلَ-ت يَدُهُ. نَدَلاً): دەستی پیسبوو.
(تَنَدَّلَ وتَمَنْدَلَ- بِالمِنديلِ):١: بەدەستەسڕەكە دەســتی خــۆی ســڕی ٢-دەستەســڕەكەی بەسەریەوە بەستو وەك سەروبەستی لێكرد/ پێچای بەسەریەوە.
(إِنْتَــدَلَ - المــالَ): كەلوپەلەكــەی ەڵگــرتو بەكۆڵی خۆیدادا.
(أَلنَدْل) (مص): پیسیی/ پۆخڵیی.
(أَلنَدُل): نۆكەرو كارگوزارانی میواندارىی.
(أَلمَنْدَل (ج) مَنادِل)١- پێڵاو.
٢-(ضَــرْبُ ألمَندَلِ عِنْد أَصحــاب ألتَعْزِيم): بانگكردنی گیانەكان لای ئەفســوونگرەوەكان. ئەویش بەكێشانی بازنەیەكەو لەناوەڕاستیدا دادەنیشــین كاتێــك بیانەوێــت گیانــەكان/ خێوەكان بانگبكەن بۆ كارێك بۆ شتێك بزانن دەبێت یان نا.
(أَلمِنْدَل): دەستپیس/ دز.
(أَلمِنْدَل والمِنديل وَالمَنديل): دەستەسڕ.
٣-(أَلمَنْــدَل (ج) مَنــادِل): داری عــوودی بۆنخۆش.
ندم:١-(نَــدِمَ وَتَنَدَّمَ - على مــا فَعَل. نَدَماً وَنَدامَــةً): لەكردارەكــەی پەشــیمانبووەوە خەفەتیخوارد ئاهی پەشــیمانیی هەڵكێشــاو تۆبەیكرد.
(أَنْدَمَ - هُ): پەشیمانیكردەوە و تۆبەی پێكرد.
(أَلنــادِم (ج) نادِمون ونُــدّام وَالنَدْمان (ج) نَدامــی وَنَدْمــان (م) نَدْمانَــة وَنَدْمــی): پەشیمان/ پاشگەزەوەبوو/ بەخودا چووەوە.
(أَلمَنْدَم = النَدامَة): پەشیمانیی/ پاشگەزبوونەوە.
(أَلمَنْدَمَــة): مایــەی پەشــیمانی/ هــۆكاری پاشگەزبوونەوە.
٢-(نادَمَ - هُ على الشَراب. نِداماً وَمُنادَمَةً): هاودەمیی خواردنەوەی شەرابیكرد.
(تَنادَمَ - القَومُ على الشَرابِ): بۆخواردنەوەی شەراب پێكەوە دانیشتن.

(اَلنَدْمان)١- هاوجامی خواردنەوە هاونشـــینی خواردنەوە ٢-پەشیمان/ پاشگەز.

(اَلنَّدم)١- زورنگو هوشیار ٢-بەوێل و ناسك.

(اَلنَديـــم والنَّديمَـــة (ج) نِـــدام وَنُدَمـــاء وَنُدْمان):١-هاورێـــی خواردنـــەوە ٢-هـــاودەم/ هاورێو دۆست.

٣-(إنْتَدَمَ -الأَمرُ): کارەکە (ئاسانبوو/ لووا).

(خُذما إنْتَدَمَ): ئەوەی لەبەر دەســـتدابێتو بلوێت وەریگرە.

٤-(أَلنَّدَم)١- شـــوێنکار/ شـــوێنپێ/ شوێنەوار ٢-پەشـــیمانیی لەکردارێك کە داخی لەســـەر بخۆیت.

ندە:١-(نَـــدَهَ - الرَجُلُ نَدْهـــاً): هاواریکرد/ قیراندی دەنگی لێوەهات.

(-الرجُلَ)١- بەپیاوەکـــەدا هەڵشـــاخاو دەنگی لێکردو دەریکردو هاواریی لێکرد.

(-الإبلَ): بەرەوەحوشترەکانی لێخوڕی.

(اَلنَدهَةُ): دەنگ/ دەنگە دەنگ/ قرە/ هاوار.

(النَدهَـــةُ والنُدْهَةُ): رانەمـــەڕو بزن/ رەوە ئاژەڵ و حوشترو زیندەوەرپتر/ گەلە.

(اَلنَـــوادِهُ): دەنگلێکـــراوەکانو پەرکراوەکان/ دەرکراوەکان.

٢-(إنْتَدَهَ وآسْـــتَنْدَهَ - الأَمرُ): کارەکە راستو دروست رۆیشت.

ندو:١-(نَدا-الرَجُلُ يَنْدو.نَدواً): بەخشندەییکرد، جوامێربوو.

(نَدِيَ- الشـــيءُ يَنـدی. نَدیً ونَداوةً وَنُدُوَّةً): شتەکە تەڕبوو.

(-تِ الأَرضُ): زەویەکە تەڕبوو یان شـــەونمی لێباری.

(مانَدَيتُ بِشَـــيءٍ مِن فُلان): فیســـار شتێکی نەخســـتۆتە دەســـتمەوە، خێرو بێرێکی بۆم نەبوە/ لە فیسارەوە شتێکم دەستنەکەوتووە.

(رَمَيـــتُ بَصَـــري فَلَم يَنْدَ لِي شـــيءٌ): چاوم گێـــڕا/ هەڵخســـت هیچ نەهاتەبـــەر چاوم کە بجووڵێتەوە.

(مانَدِيَنـــي مِن فُـــلانْ شـــيءٌ أَكْرَهَهُ): هیچ شتێکم لەفیســـارەوە بەرنەکەوتووەو نەدیوە کە پێم ناخۆشبێت.

(لَم يَندَ مُنهُم نادٍ): کەسیان لێنەماوە.

(نَدّی - الشيءَ): شتەکەی تەڕکرد.

(-الفَرَسَ)١- ئەســـپەکەی تێر ئاوکرد ٢-غاری بەچارەویکەکرد تا ئارەقی پێکردەوە/ خوەی پێدەردا.

(نـــادی - النَبـــتُ مُنـــاداةً وَنِـــداءً): گیاکـــە بالآیکردو تەڕو شکۆفەداربوو ئالآیەیەك.

(أَنْدی - الشيءَ إنداءً): شتەکەی تەڕکرد.

(-الرَجُـــلُ): ١-بەخشـــندەو دڵفراوانبـــوو/ جوامێرییکرد ٢-بەخشـــندەیی و چاکەی زۆر بوو.

(-الـــكَلامُ): خاوەن قســـەکە یـــان گوێگرەکە لەترسی ئەنجامی قسەکە ئارەقیکردەوە.

(تَنــدَّى - الرَجُلُ): ١-دڵفراوانو بەخشــندە نیشاندا/ جوامێرییکرد ٢-تینوێتیی شکا.

(شَــرِبَ حَتّــى تَنَــدَّى): هێندەیخــواردەوە تاتینوێتیی شکا.

(-المَكانُ): شوێنەکە ئاورنگی لێباری/ تەربوو.

(إنْتَدى): دەستگیربوو.

(ماآنتَدَيتُ مِنهُ شَــيئاً): هیچ خێرو بێرێکم لێدەستگیر نەبوو.

(اَلنَدى (مص) (ج) أنْــداء وأَندِيَة): ١-باران ٢-بەخشینو چاکەو پیاوەتی و فەرِوبێر ٣-گیا/ لەوەر ٤-شەونەم/ ئاورنگ ٥-بەز ٦-گل.

(اَلنَدْوَةُ)١-جارێــك تەربــوون ٢-ئاودانێــك ٣-دڵفراوانیی/ بەخشندەیی.

(اَلنُدْوَة): شوێنی ئاوخواردنەوەی حوشتر.

(اَلنَــدِي والنَــدِيّ (م) نَدِيَّــة ونَدِيَة): تەڕ/ تەڕبوو.

(فُــلان نَــدِي الكَفِ وَنَــدِيُّ الكَفِ): فیســار جوامێرە/ چاکە خوازە/ بەخشندەیە.

(اَلنَديان): تەڕ.

(الأَندى): ١-بەخشندەتر ٢-تەڕتر.

(فُلانٌ أَندى مِن فُلانٍ): فیســار لەفیسارکەس بەخشندەترو چاکەکارترە/ جوامێرترە.

(هُــوَ أَندى صَوتاً مِنهُ): ئەو دەنگی لەدەنگی ئەویتر بەهێزترو چاکترە.

(اَلتَندِيَــة) (مــص): ئــارەق پێکردنــەوەو لەڕکردن.

(تَندِيَةُ الخَيلِ): غار بەچارەوێکردنو ئارەق پێکردنــەوەی تــا گۆشــتەزۆرەکەی دابنێتو سووکەڵەتربێت.

(اَلُنَدَّى): شوێنی غار پێکردنی زۆری ئەسپو ئارەقپێکردنی تاگۆشتە پتەرەکەی دانێت.

(اَلُندِيَة (ج) مُنْدِيات): قســەیەك کەشــەرم بەخەڵــك بــکاتو تەریقی بکاتــەوە/ ئارەق بەو کەســە دەربدات/ ئــارەق بەناوچەوانیدا بێتەخوارێ.

٢-(نَــدا - القَومُ يَنْــدو نَدْواً): خوێشــگەل کۆبوونەوەو ئامادەی یانە بوون.

(-القَومَ): لەیانەکەدا خوێشگەلی کۆکردەوە.

(مايندوهُمُ آلنادي): یانەکە نایانگرێت.

(نــادى - فُلانــاً مُنــاداةً وَنِــداءً): ١-لەگەڵ فیســاردا لەیانەکە دانشــیت ٢-راوێژی پێکرد ٣-شانازییان بەسەریەکدا کرد.

(تَنادى - القَومُ): لەیانەدا کۆبوونەوە.

(إنْتَدى - القَومُ): لەیانەدا کۆبوونەوە.

(-الرَجُلُ): چووە نادیو لەوێ ئامادەبوو

(اَلنَدوَة = النــادى = المَجلِس): ١-ئەنجوومەن = کۆڕ = کۆبوونــەوە ٢-راوێژکردن ٣-کۆمەڵ/ کۆڕ.

(دار النَدْوَة): خانەی کۆبوونەوە.

(اَلنادي (فا) (ج) أنْدِيَة ونَوادٍ و (جج) أَنديات): ئەنجوومــەن/ یانــە/ شــوێنی کۆبوونــەوەی خوێشگەل/ خەڵك.

(اَلنادِيَــةُ (ج) نادِيــات ونَوادٍ): مێی وشــە (اَلنادي).

اَلنَدِيّ: یانە / ئەنجوومەن/ کۆڕ.

٣-(نَدا - الرَجُلُ يَندو. نَدواً): گۆشەگیربوو/ کەنارکەوت و لاکەوت.

(-الشيءُ): بلاوبووەوە.

(نَــدِيَ - الصَــوتُ. يَنــدی نَدیً وَنَــداوَةً وَ نُداوَةً): دەنگەکە دوورکەوتەوە.

(نــادی الرَجُــلَ وبالرَجُلِ مُنــاداةً ونِداءً): پیاوەکەی بانگکرد/ هاواری لێکرد.

(-بِسِرِّهِ): نهێنیەکەی جاردا/ ئاشکراکرد.

(-الشيءَ): شتەکەیدی وزانی.

(نــادی الطريقُ لِفُلانٍ وَنــاداهُ): ڕێگەکە بۆ فیسار دەرکەوت و چاویکرد.

(تَنــادی - القَــوْمُ): بانگــی یەکتریانکــرد/ هاواریان لەیەکتریکرد.

(نَخــلٌ نادِيَــةُ (ح) نادِيــات وَنــوادٍ): دارخورمایەکی دوورە ئاو.

(نادِياتُ الشيءِ): سەرەتاکانی شتەکە.

(اَلنَدی (ج) أنداء وأَنْدِيَة = أَلْدی): ١-ئەوپەڕی شــت/ ئەوســەری / کۆتایــی ٢-شــتێکە وەك بوغوردە بۆنیخۆشە.

(اَلنِــداء والنُــداء): ١-نزا/ دۆعــا ٢-دەنگێکی ڕووت.

(هُوَنَدِيُّ الصوتِ): ئەو دەنگی بەرزو جوانەو خۆشە.

(اَلتَنادِي) (مص): بانگکردن.

(يَومُ التَنــادی): ڕۆژی زیندوکرنەوە/ ڕۆژی حەشر.

(اَلنَــوادي):: مێحوشــتری پــەرش و بــلاو ٢-ئەملاولاکان/ کەنارەکان.

(نَــوادي الدَهــرِ): قەومــاو و بەســەرهاتی ڕۆژگار.

نــذّ: (نَذَّ. نَذِيذاً): لــەدەم و لووتیەوە چڵم و بەڵغەم دەرچوو یان میزیکرد.

(النَّذِيذ) (مص): ئەوەی لەدەم یان لەلووتەوە دەردەچێت.

نــذر: ١-(نَــذَرَ نَــذْراً ونُــذُوراً): ئاهیکرد/ ئەرکێکی خستە سەر شانی خۆی کە پێویست نەبوو/ نەزریکرد/ کەنەرکنەبوو.

(نَذَرَ مالَــهُ): ئاهیکرد داراکەی ببەخشــێت بیکات بەخێر.

(نَذَرَ على نَفسِــهِ لِلّهِ مِنَ المالِ كذا): ئاهیکرد لەودارایەی کەهەیەتی هێندەی لەڕێی خودادا بدات یان ببەخشێتەوەو بکات بەخێر.

(-الأَبُ الوَلَدَ): باوکەکە ئاهیکرد کەمنداڵەکەی بــکات بەمجێوری کڵێســە یان پەرســتگا یان سەرپەرشــتیاری ئەوانە یان نۆکەری پیاوێکی خودا پەرست.

(إِنْتَذَرَ - على نَفسِهِ كذا): ئەومیکرد بەپێویستو ئەرکی سەرشانی خۆی / ئاهی ئەومیکرد.

(اَلنَــذْر (مــص) (ج) نُذُور)١-ئاه/ ئاهکردن

ئەرك گرتنە ئەستۆ ٢-نەزركردن ٣-ئەوەی لەرێی خودادا دەبەخشرێت و ئەوەی بۆ ئاهەكە دەدرێت.

(نَـذْرُ الرَهْبَنَةِ عِندَ النصارى): ئاهكردنی دیانەكانە كەببنە پارسا. لەخۆشی ژیان دووربكەونەوەو رەبەنبن‌و پاكیی پەیرەو بكەن بەخواستی خۆیان خۆیان وارابگرن‌و ملكەچیی خودا بكەن.

(اَلنَذيرَةُ (ج) نَذائِر): ئەوەی كەبەئاهكردنی دەبەخشرێت و دەدرێت یان بەجێدەهێنرێت.

٢-(نَذَرَ - الجَيشُ فُلاناً. نَذراً وَنُذُوراً): سوپا فیساریكرد بەپێشەنگ.

(نَذِرَ - بِهِ نَذراً): پێیزانی‌و سلّیلێكردەوەو خۆی لێپاراست و خۆی بۆ ئامادەكرد.

(نَذَروا بِالعَدُوّ): بەدوژمنیانزانی‌و سلّیان لێكردو خۆیان بۆ ئامادەكرد.

(أَنْـذَرَ- هُ بِالأَمرِ إنْذاراً وَنَذيراً وَنَذْراً ونُذْراً ونُذُراً): (ئەم چوار وشەیەی دواوە چاوگەو بەپێی پێوەر نییە): وریایكردەوەو لەكێشەو ئەنجامی كارەكەی ئاگاداركرد/ وریایكردەوە.

(تَنـاذَرَ - القَومُ): یەكتریان لەمەترسی ئەو خراپەیەو ئەوشتە وریاو ئاگاداركرد.

(تَنـاذَروا - العَـدُوَّ): یەكتریان لەمەترسی دوژمن ئاگاداركردەوە تا سلّی لێبكەنەوە.

(اَلنـاذِر) (فا)١-هەرەشە كار ٢-وریاكەرەوە ٣-ئاهخواز/ شت لەسەرخۆ پێویستكەر.

(فُلانٌ نـاذِرٌ إلَيَّ بِعَينِهِ): فیسار تیژ چاوی تێبڕیم‌و چاوی لێدەرپەڕاندم.

(اَلنُـذارى والنُـذُر وَاَلنِـذارَة = اَلإنـذار): ١-هەرەشەو گورەشە. ٢-وریاكردنەوە/ ئاگادار كردنەوە.

(اَلنَذيـر (مـص) (ج) نُـذُر): وریاكردنەوەو سلّپێكردن، بەئاگاهێنان ٢-هەرەشە ٣-بەئاگاهێن‌و سلّپێكەرەوە، وریاكەرەوە ٤: هەرەشەكار ٥: پەیامبەر ٦: سەرسپێتیی (چونكە هەرەشەی مەرگە).

(اَلنَذيرَةُ (ج) نَذائِر)١-پێشرەوی/ پێشەنگی سوپا كەسوپاكەی خۆی لەبارەی دوژمنەوە ئاگادار دەكاتەوە ٢-بەئاگاهێنان و هەرەشە.

(اَلمُنـذِر) (فا)١-ترسێنەر/ سلّپێكەرەوە/ بەئاگاهێن ٢: هەرەشەكار.

(فُلان مُنذِرٌ إلَيَّبعَينِهِ): فیسار چاوی تێبڕیوم‌و چاوی لێدەرپەڕاندووم هەرەشەم لێدەكات.

(أبوالمُنْذِر): كەلّەشێر.

(إبنُ اَلمُنذِر): نوعمان كە شای حیرەبوو.

(اَلمَناذِرَة): بەرەی مونزیرو شاكانی حیرە.

(اَلمُتَناذِر) (ح): شێر.

الملحق:

نذر: (اَلإنذار):١-وریاكردنەوەی لە مەترسیەك پێش روودانی، داخوازی سەرگەورەیەكە/ سەرداریكە بانگی كەسێك یان كۆمەلێكی پێدەكرێت، بۆ ملكەچكردن بۆ فەرمانێك، پێش بەكارهێنانی هێز.

(إِنــذارٌ بالأَسْتِسْــلام): ئاگاداركردنــەوە بۆ خۆبەدەستەوەدان/ هەڕەشەلێكردن.
(إنذار الجَمهور بالتَّفَرُّق): ئاگاداركردنەوەی جەماوەر بۆ بلاوەكردن.
(الإِنذار في القانون): وریاكردنەوەو هەڕەشەی یاسـایی/ پێراگەیاندنێكـی میرییــە ئەگەر بەدەنگــەوە هاتنی نەبــوو كاری دادگەرییانە بەرامبەر دەكرێت كە وریاكردنەوەی ئاراستە كراوە.
(إِنــذار المُسْــتَأْجِر بإِخــلاء المأْجــور): ئاگاداركردنــەوەی كرێگرتــە كــە ئــەوەی بەكرێیگرتووە چۆڵیبكات.
(الإِنْذَار آلنِهائِي في السياسة): دوا وریاكردنەوە لە رامیاریدا: دوا ئاگاداركردنەوەی دەوڵەتێكە لەلایــەن دەوڵەتێكیــترەوە پێش ئەوە جەنگ لەنێوانیاندا بقەومێت/ بەرپابێت.
(حَربٌ دونَ سابِق إِنذار): جەنگێكی لەناكاوو پێش ئاگاداركردنەوە.

نذع: (نَذَعَ - الماءُ أَو العَرَقُ. نَذْعاً): ئاوەكەیان ئارەقەكە دەرچوو.
(ألنِذْعَةُ): دڵۆپە ئاوێك یان شیتێتر.
نذل: (نَذُلَ): ١-(ســووك/ رسوا/ پووشت) بوو ٢-ناجسن و نامەردبوو یان لەدین گومڕابوو.
(نَذْل (ج) أَنْذال وَنُــذول وَنَذيل (ج) نُذَلاء وَنِذال): ١-ســووك، رســوا، نامەرد، پووشــت ٢-ناچیزە ٣-گومڕا لەدین.

نرج:١-(النَّربيــج أَو النَرْبيش (فارســية): مارپێچــی نێرگەلە. بۆرییەكە لەپێســتەیە دوو ســەری دارینــەی پێومیــە یەكێكیان بەشووشــەی نێرگەلەكــەدا دەكرێــت ســەرەكەیتری نێرگەلەكێــش بەدەمیەوە دەگرێت كاتێك كە دەیكێشێت.
٢-(أَلنَرْجِس والنِرْجِس) (ن) فارسية: نێرگز.
(نَرجِسَة): نێرگزێك رووەكێكە لەبۆندارەكان پیــازدارەو گەڵاكــەی لەهی كــەوەر دەچێت گوڵێكی خڕی ســپی یــان زەردیەمیەو چاوی پێدەچۆنێرێت.
٣-(أَلنارَ جيل وَالنَأْرَجيل) (فارسية): گوێزی هندی.
(نارَجيلَة): گوێزێكی هندی.
(ألنارَجيلَة): نێرگەلە.
(أَرْكيلَة) (عامية): نێرگەلە.
الملحق:
نرجس: (أَلنَّرجِسِيَّة): زۆر بەخۆوە نازین/ خۆ پەسندكردن/ شەیدای خۆبوون، بەخۆوە بەندبوون.
(أَلنَرجِســيَّة في علــم النفس): لەزانســتیی دەروونــدا: نائاســایی رەگەزیــی و لادانــی رەگەزیی كە تیایدا ئەو كەسە شەیدا و دڵداری خۆی دەبێت.

نرد: (أَلنَرْد): ١-جەوالێكە لەگەلای دارخورما دروســتدەكرێت بنەكەی فراوان و سەرەكەی

تەسـك دەبێـت ٢-بازیـی/ یاریـی تاوڵە کە شایەکی فارس دایهێناوە.
(لَعْبَةُ آلطاولَة) (عامية): یاریی تاوڵە ٣-زاری تاوڵە.
(أَلنَردين وآلناردين (ن) = السُنبُل الرومى) (يونانية): ناردين رووەکێکی بۆنخۆشە گەڵێك جـۆری هەیە بـۆ رازاندنەوەیە هەیشـیەتی دەشـتەکییە لەئەوروپاو ئاسـیای خۆرئاوادا هەیـە جـۆرە بۆنێکـی خـۆش لەرەگەکەی دەردەهێنرێـت هەروەها کەڵکی پزیشکیشـی هەیە.
الملحق:
نـرف: (النِّرْفانـا - في البُوذِيَّـة): لەئاینی بوزیـدا ئەوەیـە ئـاوەزو هەسـت و هۆشـی مرۆڤەکە رەهابێت/ ئازاد بێتو گیانی لەگەڵ گیانی گەردووندا یەکبگرێتو ئاوێتە ببێت و بە کاروباری دنیایەوە خەریکی نەکات.
نـرن: (أَلنَرنج وآلنارَنج) (ن) (فارسـية): نارنـج جـۆرە لیمۆیەکە خەڵکە رەشـۆکەکە پێیدەڵێن (بو صفير).
نزّ: ١-نَزَّ - الظَبيُ. نَزيزاً: ئاسکەکە رایکرد/ غاریدا.
(-الوَتَرُ نَزّاً وَنَزيـزاً): ژێکەوانەکە کاتی تیر هەڵدانەکە لەرییەوە.
(-فُـلانٌ عَنّـي): فیسـار لێمدوورکەوتەوەو تەریکبوو.

(نَزَّزَ- فُلاناً عَن كذا): فیساری لەخراپە لاداو دوورخستەوە.
(النَـزّ وآلنِزّ): ١-بزێوو/ نەسـرەوت جرپن/ کەسێکە جێ بەخۆی ناگرێت ٢-ناسكو بەوێل ٣-دڵۆریا/ زیت.
(أَلنَزَّة): جارێك راکردن و باراندنی ئاسك.
(ناقَةٌ نَزَّه): مێحوشترێکی سووکەڵە.
(أَلنَزّاز): زۆر هوشـیار یان زۆرنەسـرەوتو بزیو یان زۆر ناسكو بەوێل.
(أَلمِنَز): بزێو/ جرپن/ نەسرەوت.
٢-(نَزّ وَأَنَزّ - آلمكانُ. نَزّاً وَنَزيزاً): شوێنەکە ئاودزبوو.
(أَلنِزّ (ج) نُزُوز): ئاوێك کەدەلابێتو هاتبێتە دەرەوە.
(مـكانٌ نَزٌّ): شـوێنێك کەئـاوی دەردابێتو ئاودزبێت/ ئاو بدەڵێنێت.
(أَرضٌ نَزَّةٌ): زەوییەکی ئاودز.
٣-(نَزَّ-الظَبيُ نَزيزاً): ئاسکەکە باراندی.
٤-(نَـزَّزَ - تِ الظَبيَـةُ وَلَدَهـا): دایکـە ئاسکەکە بەچکە ساواکەی لستەوەو لاواندی/ بەخێوکرد/ پەروەردەکرد.
(أَلمِنَزّ): بێشکە/ لانکە.
(الـصَبـيُّ في المِـنَـزّ): سـاواکـە/ کۆرپەکە لەبێشکەکەدایە.
٥-(نـازَّ - هُ. مُنَـازَّةً): بەرهەڵسـتیکرد، بەربەرەکانێیکرد.

(أَنَزَّ- المشيءُ): شتەکە سەختو توندبوو.
(رَجُلٌ نِزٌّ شَرٍّ): پیاوێکە خراپەی پێوە لکاوەو خوویەتی، سروشتیەتی.
(أَلنَّزَة): ئارەزووی رەگەزیی زۆر حەزێکی زۆر.
(أَلنِــزاز): ١-ناکۆکیــی زۆرو بەربەرەکانــێ و ململانێ ٢-دوژمنایەتییەکی سەرسەختانە.
(هُوَ نِزَازُ شَــرٍ): ئەو هەمیشە خراپە خوازە و شەرانییە.
(أَلنَزِيــز): حەزمەنــدی رەگــەز/ حەزباز/ ئارەزووپەرست.
(هُوَ نَزِيزُ شَــرٍّ): ئەو حەزمەندی خراپەیە/ هەمیشە خراپە خوازە.
٦-(نَزْنَزَ -الرَجُلُ): سەری بزواند.
(-تِ الأُمُ صَبِيَّهــا): دایکەکــە کۆرپەکــەی هەڵپەراند.
نزأ: (نَزَأَ- بَينَ القَوم نَزأً وَنُزوءً): خوێشگەلی لەیەکبەرداو نێوانیانی تێکدا.
(-على فُلان نَزْأً): هێرشی کردە سەر فیسار.
(فُلاناً عَلَيهِ. نَزْأً): فیساری تێبەردا.
(-هُ عَن كذا): ئەوی لەوەگێرایەوە.
٢-(نُزِئَ -بِكَــذا): گەردانی ئەوەبوو/ پێوەی لکاو گرفتاربوو/ ئالوودە بوو.
(هُوَ مَنْزُوٌّ بِهِ): ئەو پێوە گەردان پێوە لکاو و گرفتارو ئالوودەیەتی.
(رَجُــلٌ نَزَّاءٌ): پیاوێکی خــوو گرەو گەردانە بەشتەوەو ئالوودەیەتی.

٣-(أَلنَزِيء): ئاوکێشی بچکۆلە/ گوندەی بچووك.
نزب: (نَزَبَ - الظبيُ. نَزْباً ونُزَاباً وَنَزِيباً): ئاسکەکە باراندی.
(تَنازَبوا بِالأَلقاب = تَنابَزوا): ناوو ناتۆرەیان لەیەك داهێنا.
(النَزَب (ج) أَنْزَاب): نازناو.
(أَلنَيزَب) (ح): ١-کەڵە ئاسك ٢-گا/ کەڵەگا.
نزج: (نَزَجَ - الغُلامُ نَزْجاً): مێرد منداڵەکە هەڵپەری/ سەمایکرد.
نزح: (نَزَحَ. نَزْحاً وَنُزُوحاً): دوورکەوتەوە.
(-تِ البئــرُ نَزْحــاً): ئــاوی چاڵاوەکە تەواو داکەوت و کەمیکرد یان هەروشکیکرد.
(بِئــرٌ نــازِحٌ وَنَزُوحٌ وَنُــزُحٌ): چاڵاوێکی ئاو داکەوتووی تەواو کەمبوو یان وشککردوو.
(مــاءٌ لايُنــزَح): ئاوێکــە تــەواو نابێــت کەمناکات.
(نَزَحَ وأَنْزَحَ - البئرَ. نَزْحاً): ئاوی چاڵاوەکەی هەڵێنجا تا تەواو کەمیکرد یان وشکیکرد.
(-القَــومُ): ئــاوی بــیری خوێشــگەل تەواو کەمیکرد یان وشکبوو.
(نُزِحَ - بِفُلانٍ): فیســار لەنیشــتمانەکەی / لەشارەکەی ماوەیەکی زۆر ونبوو.
(إِنْتَزَحَ - عَن دِيارِهِ): لەشارەکەی وولاتەکەی دوورکەوتەوە.
(أَلنــازِح والنَــزُوح والنَزِيــح): دوور یــان دوورکەوتوو.

(أَلنَزَح (ج) أَنْـزَاح): ١-ليَلاو/ قـوراو. ليتاو ٢-چالاويَك ئاوەكەی وشـكيكردبێت يان تەواو كەمبووبێت.

(أَلمُنتَزَح): دووريی.

(هُـوَ بِمُنتَزَحٍ مِن كذا): ئـەو لەوەوە دوورە لەدوورييەكی وەهاوەيە.

(أَلِمنْزَحَـةُ (ج) مَنازِح): سـەتل يان دۆلكەی چـالاو كە چالاوی پێدەردەدەن و ئاوەكەی پێ هەڵدەكێشن.

(قَـومٌ مَنازِيـحٌ): خوێشـگەلێكی ئـاوارە/ دەربەدەر دوور لەنيشتمان پەرەوازە.

نزر:١-(نَـزَرَ-هُ. نَـزْراً): لەسـواڵكردنەكەدا زۆريكردو سەريكردە سەریو زۆر پارايەوە.

(فُـلان لايُعطي حَتـى يُنْزَرَ): فيسـار هيچ نابەخشـێت تا زۆری لێنەكەنو سەر نەكەنە سەریو رسواينەكەن.

(-هُ): پەلەپليێكرد.

(-فُلانـاً): ١-فەرمانـی بەفيسـاردا ٢-ئەوەی هەيبوو كەمكەم لێيكێشايەوە ٣-سووكيكرد و پايەو بايەخی كەمكردەوە.

(نَزَرَ - الشيءَ): شتەكەی بەكەم داناو بەكەم هاتە بەرچاوی.

(نَـزُرَ. نَزْراً ونُزْرَةً وَنَـزاراً ونَزارَةً ونُزُرَةً): كەمبوو، كەميكرد.

(-آلرَجُلُ. نَزارَةً): پياوەكە كەمخێر/ كەمفەر بوو.

(-تِ الناقَةُ): مێحوشـترەكە شيری كەمبوو/ كەميكرد.

(نَـزَّرَ وأَنْـزَرَ- العَطـاءَ): بەخشـينەكەی كەمكردەوە.

(تَنَزَّرَ- الشيءُ): شتەكە كەميكرد.

(-مِنَ الشيءِ): شتەكەی كەمكردەوە.

(أَلنَزْر): شتێكی كەمی كەمبايەخ.

(رَجُلٌ نَزْرٌ): پياوێكی كەمفەر/ كەمچاكە.

(ماجئتَ إلاّ نَزراً): كەم كەم هاتوويت.

(أَلنَـزِرَةُ (ج) نُزُور- مِنَ النَّسـاءِ): ژنانێكی كەموەچە/ كەممنداڵ يان كەمشير.

(أَلنَزُور (ج) نُزُر): ١-كەمدوو ٢-هەموو شتێك كە كەمبێت، كەمبكات.

(-مِنَ النسـاءِ): ژنـی كەموەچە/ كەم منداڵ يان كەمشير.

(أَلنَزِير (ج) نُزُر): كەمی بێبايەخ.

(أَلمَنْزُور): كەمی بێبايەخ.

(أَعطاهُ عِطاءً مُنْزُوراً): شـتێكی كەمی دايە پاش سەركردنە سەری و زۆر لێكردنی.

(أَعطاهُ غَيرَ مَنْزُور): بەبێ زۆر لێكردن هەر لەخۆيەوە شتەكەی پێبەخشی/ دايە.

٢-(نَـزَرَ- الشَـرابُ فُلاناً نَزْراً): شـەرابەكە فيساری سەرخۆشكرد/ مەستكرد.

٣-(أَلنَزْر): لوويەك كە لەگوانی مێحوشتر هاتبێت.

نزع: (نَزَعَ- الشـيءَ مِـن مَكانِـهِ. نَزْعاً): شتەكەی لەشوێنەكەی خۆی هەڵكەند.

(نَـزَعَ الشَـيءَ) (عاميـة): پەكیخسـتو خراپیكرد/ تێكیدا.
(-الأَمـيرُ العامِلَ): مـیر كارگوزارەكەی خۆی لەسەر كارەكە لابرد.
(-بالسَّهْم): تیرەكەی هاویشت.
(-في القَوس): ژێی كەوانەكەی راكێشا.
(-عَن القَوس): بەكەمانەكە تیرەكەیهاویشت.
(-الدَّلْوَ وَبالدَّلو): دۆلكەكەی راكێشـاو ئاوی پێ هەڵێنجا.
(-يَدَهُ): دەستی لەگیرفانی دەرهێنا.
(-تِ الشَـمسُ): خۆرەكـە بـەرەو خۆرئـاوا داپەری.
(-المَريضُ): نەخۆشـەكە خەریكی مردنبوو/ بەرەو مردن دەرۆیشت.
(-عَن كذا نُزوعاً): لەشتەكە دەستیكێشایەوەو وازی لێهێنا.
(-الوَلَدُ أَباهُ وَإلى أَبيه): زارۆڵەكە لەباوكیچوو.
(- مَعْنىً جَيـداً. نَزْعـاً): واتایەكی جوانی دەرهێنا.
(-الى الشيءِ نَزاعاً): رووەو ئەو شتە رۆیشت.
(-بِفُلانٍ إلى كذا): فیساری بۆ ئەوشتە بانگكرد.
(-الى أَهْلِهِ. نِزاعاً وَنُزوعاً): تاسـەی خێزانو كەسوكارەكەیكرد.
(نَـزِعَ. نَزَعـاً): ئەمـلاولای ناوچەوانـی/ لاجانگی رووتایەوە.
(أَنْـزَع (م) نَزْعـاء): یان ناوترێـت نَزعاء، دەوترێـت (زَعـراء): لاجانـگ رووتـاوە/ ئەملاولای سەر رووتاوە.
(نَزَّعَ - الشيءَ مِن مَكانِهِ): شتەكەی لەشوێنی خۆی هەڵكەند.
(نازَعَ - المَريضُ. نِزاعاً): نەخۆشەكە كەوتە گیانەڵا.
(-إلى أَهْلِهِ. نِزاعاً وَمُنازَعَةً): تاسەی خێزانو كەسوكارەكەیكردو بیریكردن.
(-هُ): بوو بەنەیاری/ ناحەزیی لەگەڵدا كرد.
(-هُ الثَوبَ): جلەكەی لەگەڵدا راكێشا هەریەكە بۆلای خۆی.
(أَرضي تُنازِعُ أَرْضَكُم): زەویەكەم پاڵ بەپاڵی زەوویەكەی ئێوەوەیە.
(-الكَأسَ): جامەكەی بەكارهێنا.
(-فُلاناً): تەوقەی لەگەڵدا كرد.
(أَنْـزَعَ - الرَجُـلُ): ئەمـلاولای ناوچەوانی لاجانگی رووتایەوە.
(تَنَزَّعَ -إليهِ): هەڵپەی لای ئەویكرد.
(تَنـازَعَ- القَـوْمُ): خوێشـگەل لەیەكبوون/ ناكۆكیی كەوتە نێوانیانەوە.
(-القَومُ الشَـيءَ): خوێشـگەل هەریەكەیان شتەكەی بۆلای خۆی راكێشا.
(-القَومُ في الشَـيءِ: خوێشگەل لەسەر شتەكە ناكۆكیی‌و نەیاریی كەوتە نێوانیانەوە.
(تَنازَعوا الـكَأسَ): خوێشـگەل جامەكەیان یەك بەیەكدا/ پێكی مەیەكان بە یەكتری دا.

(إِنْتَزَعَ - الشيءَ): شتەکە هەڵکەنرا.
(-الشيءَ)١- شــتەکەی هەڵکەنــد/ دەرهێنــا، هەڵیچڕی ٢-دەســتی لەشــتەکە کێشــایەوەو وازیلێهێنا.
(-بالشِّــعرِ أوالآیَــةِ): بەشــیعر یــان ئایەت ئاخاوتنەکــەی بەهێزکــردو بــۆ نموونــەی دروستیی قسەکەی شیعر یان ئایەتی هێنایەوە. بەیەکێك دەوترێت کەبۆ واتایەکیتری ئایەتێك بهێنێتــەوەو بەبارێکدا لێکیبداتــەوە دەڵێن (قَد إنْتَزَعَ مَعنــیً جدیداً): واتایەکی تازەی دەرهێنا.
(إسْــتَنزَعَ - ە عَــنِ الشــيءِ): داوای لێکــرد کەدەســتبەرداری ئەو شتەبێت/ واز لەو شتە بهێنێت.
(رَآهُ مُکِبّــاً علــی الشَــرِّ فَاَسْــتنزعَهُ): دی خویدابــووە خراپــە، داوایلێکرد کــەواز لەو خراپەکارییە بهێنێت.
(النازِع (فــا) (ج) نَزَعَة ونُــزَّع وَنُزّاع (م) نازِعَة (ج) نَــوازِع وَنازِعــات): ١-هەڵکەنی شتێك لەشوێنی خۆی ٢-تیرهاوێژ ٣-نامۆ.
(اَلنَــزْع وَنَــزْعُ اَلحَیــاة): گیانکەنشــت/ گیاندەرچوون.
(لَه نَزْعَةٌ إِلی کذا): دەیەوێت خۆ بۆ ئەوە بکوتێت و بروات/ ئارەزووی چوونی بۆ ئەوە هەیە.
(اَلنَزعَــةُ): ١-رێــی ناوشــاخ ٢-کۆی وشــەی (النازِع) ٣-تیرهاوێژان ٤-نامۆیان.

(عادَ السَهْمُ إلی النَزَعَة): مافەکە یان کارەکە هاتەوە، گەرایەوە بۆ خاوەنەکەی.
(اَلنَزَعَةُ (ج) نَزَعات): شوێنی رووتبوون و وەرینی قژ لەهەردوولای ناوچەوان X لاجانگەوە.
(نَزعَتان): دوولاجانگی رووتاوە.
(اَلنِزَاع والمُنَاازَعَة): ١-شەروناکۆکی/ نەیاریی/ ناکۆکیــی/ ناحەزیــی ٢-گیانەڵانی نەخۆش/ کەوتنە گیاندان/ سەرەمەرگ.
(اَلنُزاعَة): هەڵکێشانی شتێك و فرێدانی.
(اَلنَزَاعَــة): ناکۆکیــی/ ناتەبایــی/ نەیاریی دوژمنایەتیی/ شەڕو بنار.
(الأَنْزَع (م) نَزْعاء): کەســێکە کە ئەملاولای لاجانگی رووتابێتەوە.
(اَلنَزعاء مِنَ الجباه): کەسێکە کە ئەملاولای سەری رووتابێتەوەو تەوقەسەری تووکی پێوەبێت.
(اَلنَزُوْع (ج) نُزُع وَنِزاع): کەسێکە سوێی بۆ نیشتمانەکەی بووبێتەوەو تاسەی کەسوکاری بکات.
(بِئْــرُ نَــزُوعٌ): چالاوێکی بنزیــك کەقووڵ نەبێت.
(فَلاةٌ نَزوع): وشکە بیابانێکی دوور.
(اَلنَزیع (ج) نُزّاع)١- کەســێکە کەتاسەو بیری نیشتمانەکەی بکات ٢-نامۆ ٣-دوور.
(مَــکانٌ نَزیــعٌ): ١-شــوێنێکی دوور ٢-بیرێکی بنزیك/ قووڵ نییە ٣-خانەدانێك لەنەتەوەکەدا کەبەرەسەن وەجاخزادەبێت.

(فَـرَسٌ نَزِيـعٌ): چارەوێیەکی رەسـەنزادە ٤-کەسێك کەدایکی بەدیلگیرابێت.

(اَلنَزیع (م) نَزیعَة (ج) نَزائِع): لەبنەهەڵکەنراو لەبندەرهاتوو.

(ثَمَرٌ نَزيعٌ): بەرێکی چنراو/ رنراو/ لێکراوە.

(نُزَّاعُ القَبائِل): کەسانێکی نامۆ بەخێلانێك و لەپاڵیاندا بژین.

(اَلنَزیعَـةُ (ج) نَزائِـع): ئافرەتێك تاسـەی نیشتمانی بکاتو بیری بکات.

(-مِنَ النِسـاءِ): ژنێك کەشـووی بە یەکێك کردبێت لەخێڵەکەی خۆی نەبێت.

(_مِـنَ النَجائِـب): ژنـە خانەدانێك کەبۆ ولاتێکیتر برابێت.

(اَلنَزائِع): بای بەدو نەهامەتییهێن.

(-مِنَ الإبِلِ والخَيلِ): حوشـترو چارەوێیەك کەلەجنگی بێگانە دەرهێنرابێت.

(المِنْزَع)١- تیرێك کەزۆر بڕوات ٢-گیاندەرچوونێکی سەخت/ گیانەلایەکی گران.

(اَلمَنْزَع (ج) مَنازِع): بەپەرۆشی بۆ بەئامانج و خواستگەیشتن.

(اَلمِنْزَعَةُ): ١-تەختەیەکی پانە هەنگوێنەکەی لەشانەکە پێدەکرێتەوە ٢-ناحەزیی. نەیاریی دوژمنایەتیی/ بەگژیەکدا چوون/ ناتەبایی.

(اَلمِنْزَعَةُ والمَنْزِعَة): ١-راوبۆچوون و تەگبیرێك و کارێك کـە مرۆڤ بیەوێت و پەنای بۆ بەرێت ٢-هەتەریی و بەتەنگەوە هاتن.

(فُـلان بعيـدُ المَنْزِعَـة): زۆر هەتـەرەو بەتەنگەوە دێت.

(شَرابٌ طَيِّبُ المَنزَعَة): شەربەتێکی تام خۆشە.

(اَلوُلَدُ المَنْزوع) (عامِّية): کوڕێکی خوێڕیی/ بەدڕەوشتو بەد پەروەردە.

الملحق:

نزع: (اَلتَنازُع): ١-یەکترکێشکردن ٢-ناکۆکیی/ ناتەبایی/ مشتومڕ.

(اَلتَنازُع على قِطعَة أَرض): مشتومڕ لەسەر پارچەیەك زەوی.

(التَنــازُع في القانون): مشــتومڕو راجیایی لەنێوان دوو دادگادا لەســەر تایبەتمەندیی و دەسەلاتی یاسایی لەکێشەکاندا لە کێشەدا.

(تنــازُع آلإختصاص): ناکۆکیی و مشــتومڕ لەسەر تایبەتمەندیو پسپۆڕیی.

(اَلتَنــازُع): ناکۆکیی نێــوان دوو دەوڵەت یان زیاتر لەسەرماف یان کەڵك و قازانج.

(تَنازُعُ دَولِي): ململانێی نێو دەوڵەتان (التنازع): (بەخــوازە) زۆرانــە لەنێــوان گەلێك هــۆکاردا و دژیەتی و نەگونجانی سۆزو راو کەڵك و قازانج.

(تَنازُع بَين اللذَّةِ والواجب): زۆران و ناکۆکیی نێــوان چێژوەرگرتــن و بەجێهێنانی ئەرکی سەرشان واتە حەزو ژیری.

(- في النحو): ناکۆکی لــە رێزماندا، ناکۆکیە لە نێوان کاریگــەری دوو کارتێکەر یان زیاتر لەسەر وشەیەك کە لە دوایانەوە هاتووە، وەك:

(قامَ وضربتــه زيدٌ): ليــرەدا (زيدٌ) لەژێر کاریگــەری هەردوو فعلی «قــام، ضَرَبَ» دایە بۆیە بە مرفوع ئەبێتو بە مەنصوب ئەبێت، وە ماف یەکێك لەو دوو فعلە دەفەوتێت.

(تَنــازُع الأَهــواء): زۆرانو ناکۆکیــی نێوان خواستو حەزەکان.

(تَنــازُع البَقــاء): زۆرانو ململانێ لەپێناوی بــوونو مانەوەدا، زورانــە لەنێوان جۆرەهای زیندەوەرو رووەکدا ئەوەیش راســتییەکە کە داروێن دەریخســت و دەبێتە هــۆی زاڵبوونی بــاشو بەتوانــاکانو مانەوەیــانو فەوتانی بێتواناو ناتەواوەکان.

(اَلبقــاءُ لِلأَصلح): ژیانو مانــەوە بۆ باش و بەتواناترەکانە.

---

نــزغ: (نَــزَغَ - ەُ. نَزْغاً): ١- لێیدا بە دەســت یان نێزەی پێداکرد ٢-بەحاڵ/ کەمێك بزواندی ٣-قسەی خراپی پێوتو لەپاشملەش بەخراپە ناویبرد.

( ەُ بِكَلِمَةٍ): شتی ناشیرینی پێوتو تەشەری لێدا.

(-بَــيَنَ - القَــوم): زمانبەدیــی لەنێــوان خوێشگەلدا کردو کردنی بەگژیەکدا.

(نَــزَغَ الشَــيطانُ بَينَهُــم): شــەیتانکردنی بەگژیەکدا/ لەیەکیبەردان/ ئاژاوەی خســتە نێوانیانەوە.

(نَزْغَــةُ الشَــيطانِ إِلى المَعاصِي): هانەهانەی شــەیتان بــۆ گرتنی رێــی خراپــەو لەخودا یاخیبوون.

(اَلنازِغَةُ (ج) نَوازِغ): ١-مێی وشەی (النازِغ) (ج) النَّــوازِغ): تێکــدەران، خراپکــەران، گومراکەران.

(اَلنَزْغُ)(مص): قسە کە خەڵکی پێ هانبدرێت و لەخشتەببرێت/ فریوبدرێت.

(نَزْغُ الشَيطان): وەسوەسەی شەیتان کەخەڵك فریــودەداتو بەرەو خراپە بەکێشــیدەکات/ گومرایدەکات.

(اَلنَزْغَــةُ (ج) نَزَغــات): ١-جارێــك دەســت لێوەشــاندن یــان نێزەپێداکــردن ٢-جارێك بەحــاڵ بزوانــدن ٣-جارێــك تەشــەر لێدان ٤-جارێك فریودان.

(اَلنَزّاغ وَالمِنْزَغ والمِنْزَغَة): کەسێکە کە دوو زمانیــی دەکاتو خەڵك لەیەك بــەردەدات/ زمانبەدی ئاشووبگێری ئاژاوەگێر.

(اَلنَزيغَة): وشەی خراپ/ بەد ئاژاوەگێریی.

نــزف: (نَــزَفَ - مــاءَ البِئرِ. نَزْفــاً): ئاوی چاڵاوەکەی گشت دەردا/ دەرهێناو هیچی تێدا نەهێشت.

(-تِ البِئــرُ): ئاوی چاڵاوەکە دزەیکردو ئاوی تێدانەما.

(-دَمَ فُلان): خوێنی فیساری بە کەڵەشاخ یان رێگەیتر گرتو دەریکرد.

(-عبرَتَه): فرمێسکەکەی وشککردو پێینەهێشت.

(-الدَمُ فُلاناً): فیســار خوێنــی زۆری لەبەر رۆیشتو هێزی لەبەر برا.

(نَـزِفَ - تْ عِبرَتُهُ. نَزَفاً): فرمێسکەکەی وشکیکردو برا.
(نُزِفَ - ماءُ آلبِئر): ئاوی چاڵاوەکە کێشرا و هیچی تێدانەما.
(-الرَّجُلُ): ١-پیاوەکە ئاوەزو هۆشی لەدەستدا ٢-بێهۆشی سەرخۆشییبوو.
(-الرَّجُلُ دَماً): لووتی پـژا/ خوێنی لووتی بەربوو خوێنی تێدا نەما.
(-فِي الخُصومَـةِ): لەدژایەتـی و ململانێـدا بەڵگەی برا، بیانووی نەما.
(أَنْـزَفَ - البِئرَ): هەموو ئـاوی چاڵاوەکەی دەردا/ هەڵییەنجا.
(-الرجُلُ): ١-پیاوەکە هیچی نەما ٢-سەرخۆش بـوو ٣-ئاوەزی لەدەسـتداو هۆشـی لەبەربڕا ٤-بەڵگەو بیانووی پێنەما لەململانێکەدا.
(أَنْزَفَ - العبراتِ): فرمێسکی براو وشکبوو.
(-تِ البِئـرُ): چاڵاوەکـە ئـاوی تێـدا نەما هەمووی دەرهێنرا.
(إسْتَنزَفَ - الدَمعَ أو الماءَ): فرمێسکەکەی هەموو رشت یان ئاوەکەی هەموو دەرهێناو هەڵییەنجا.
(ألنازِف (ج) نُزَّف)(فـا): بکێش و هەڵێنجی هەموو ئاوی بیرەکە.
(عِرقٌ نـازِف): دەمـارە خوێنێك کەخوێنی لەبەر نەڕوات.
(ألنَزْف) (مص): لەبەر ڕۆیشتن.
(نَزفُ الدَم): خوێن لەبەر ڕۆیشتن.

(ألنُزْف): ١-هەڵێنجـان‌و دەردانی ئاوی چاڵاو ٢-بێهێزبـوون‌و پەککەوتنـی خوێـن لەبەر ڕۆیشتنێکی زۆر.
(ألنُزْفَةُ (ج) نُزَف): جۆرە ئاوێك وشتی وەها یان کەمەکە شلەیەك.
(نَزافِ): دەریبهێنە/ هەڵییەنجێنە (کرداری داخوازییە).
(نَزافِ مـاءَ البِئرِ): هەموو ئـاوی چاڵاوەکە دەربهێنە.
(ألنَزوف): چاڵاوێك هەمو ئاوەکەی بەدەست دەرهێنرابێت‌و هیچی تێدا نەمابێت.
(ألنَزيـف): ١-کەسـێکە کـە خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشـتبێت‌و بێهێزبووبێت ٢-تینوێەك لەتینوانـدا ڕەگی لەشی وشکبووبێتەوەو زمانی وشکبووبێت ٣-سەرخۆش ٤-تاگرتوو.
(بِئرٌ نزيفٌ): چاڵاوێکی کەمئاو.
(ألمِنْزَفَة): دۆلکەو سەتڵ‌و هەرشتێك کە ئاوی چاڵاوی پێ دەربهێنرێت.
(ألمَنْـزوف): ١-کەسـێکە کـە خوێنـی زۆری لەبەر ڕۆیشتبێت‌و بێهێزو پەککەوتە بووبێت ٢-تینوێەکی وەها کەلەتینواندا زمان‌و دەماری لەشی وشکبووبێت ٤-ئاوەز لەدەستچوو.
نـزق: ١-(نَـزَقَ- الفَـرَسُ نَزْقـاً وَنُزوقاً): چارەوێکە ڕاپەڕی‌و سووکەڵانە بازدیدا.
(-نَزْقـاً ونُزُوقـاً): چارەوێکـە ڕاپـەڕی و سووکەڵانەبازدیداو پێشکەوت.

(-الرَجُلُ نَزَقاً ونُزُوقاً): پیاوەکە دەمارگیربوو و هەڵەشانەو سووکەڵانە کەوتە گورجوگۆڵیی.
(نَزِقٌ (م) نَزِقَةٌ): هەڵەشەو سووکەڵەو/ جرپن.
(نَزَّقَ - الفَرَسَ): کێشای بەچارەوێکەدا تاراپەڕێت و هەڵپەبکات/ گورجبێت/ خستیە جرپە.
(نازَقَ-هُ نِزاقاً وَمُنازَقَةً): لێیینزیکبووەوەو کەوتە جنێودانی.
(أَنْزَقَ-الفَرَسَ): کێشای بە چارەوێکەداو راپەڕاندو خستیە هەڵپەو جرپە.
(-فُلانٌ): فیساری سەرمەندو هێمن تووشی ئاوەزسووکیو جرپنیبوو.
( - النعیمُ فلاناً): خۆشیی ژیان فیساری جرپنکردو بایکرد.
(-الرَجُلُ في الضَحِكِ): زۆر پێکەنیو خۆی بەردا.
(تَنازَقا): دووانەکە هەردووکیان کەوتنە شەرە جنێو بەیەکتری و لەگەڵ یەکدا.
(أَلنَزَق)(مص): هەڵەشەییو سووکەڵەیی لە هەمووکارو شتێکدا ٢-نەزانانەو گەوجانە پەلەکردن/ جرپنیی.
(مَكانٌ نَزَقٌ): شوێنێکی نزیک.
(أَلنَزْقَةُ): جارێك ئاوەزسووکیی/ هەڵەشەیی/ جرپنیی ٢-راپەڕینو هەڵەمبازی سەرەتای راکردن.

(أَلنَزِقَةُ وَالنِزاق - مِنَ النوق): مێحوشتری چمووش و سەرکێش.
(أَلمُنازِق): چەنەبازو زۆربڵێی هەڵەشە/ جلفر.
٢-(نَزِّقَ- الإِناءَ. نَزْقاً): دەفرەکەی/ قاپەکەی لێوانلێو پڕکرد.
٣-(أَلنَيزَق (ج) نَيازِق): نێزەی کورت/ کورتەرم.
نزك: (نَزَكَ - هُ): ١: کورتە نێزەیەکی پێداکرد ٢-قسەی ناشیرینی پێوتو خەوشباریکرد/ بەنارەوا قسەی پێوت.
النیزکات: خراپەکانی/ چەقاوەسووەکانی خەڵکی.
(أَلنَزَّاك والنُزَك): خەوش لەخەڵکدەرهێن.
(أَلنَيزَك (ج) نَيازِك): کورتە نێزە.
(أَلنَيزَك (ج) نَيازِك) (فك): تەنێکە لەئاسمانەوە بەردەبێتەوە. چینەکانی هەوا دەبڕێتو گڕدەگرێت و شەوقدەداتەوەو کەمجار دەکەوێتە سەر زەوی زۆربەیان کانزایینو کەمەکێکیان بەردینن.
نزل: (نَزَلَ - مِن عُلُوٍ إلی أَسفَل. نُزُولاً): لەشوێنێکی بەرزەوە هاتەخوارەوە دابەزی داپەڕییە خوارەوە بۆ شوێنێکی نزم.
(-فُلانٌ عَنِ الحَقِّ): فیسار لە راستیی لایدا.
(-بِهِ): وایلێکرد بێتەخوارەوە/ هێنایە خوارەوە/ بەریدایەوە.

(-بِـهِ الأمــرُ): کارەکـەی بەســەردا هــات/ تووشیبوو.
(نَزَلَ - نِزالَةً): گوزاریکرد کۆچیکرد.
(مازِلتُ أنْزِل): هێشــتا هەر لە گوزاردام دێم و دەچم.
(-القومَ وبالقومِ وَعلى القومِ. نُزولاً وَ مَنْزَلاً وَمَنــزِلاً): لایدایــە لای خوێشــگەل و لایــان دابەزی.
(نَزِلَ - المَکانُ نَزَلاً): شوێنەکە لەبەر سەختی تــۆزە بارانێکیشــی نەگرتە خۆیو لەســەری ڕۆیشت.
(-الزَرعُ): کشتەکە هەستاو بالأیکرد.
(-الرَجُلُ. نَزْلَةً): پیاوەکە تووشی هەلأمەتبوو.
(نَزَّلَ الشيءَ مَکانَ الشيءِ): شتەکەی لەشوێنی شتەکەیتر دانا.
(-القومَ): خوێشگەلی خستە هەوارگەکانەوە.
(-هُ): دایبەزاند.
(-اللهُ کَلامَهُ علی أنبیائِهِ): خودافەرموودەکانی بە وەحی بۆ پێغەمبەرەکانی ناردە خوارەوە.
(-الشيءَ): شتەکەی ڕێك هەلچنیو دامەزراند.
(-الحاسِــبُ الرَقَمَ): ژمێریارەکە ژمارەکەی لێدا/ نووسی.
(نــازَلَ-هَ في الحَــربِ مُنازَلَــةً): لەجەنگدا ڕووبەڕووی بووەوەو لەگەڵیدا جەنگی.
(حاربوا بالنِزالِ): لەحوشــترەکان دابەزینو سواری ئەسپەکان بوونو کەوتنە جەنگەوە.

(أنْــزَلَ - آلضَیفَ إنزالاً ومُنْزَلاً): میوانەکەی دابەزاندە لای خۆیو میوانداریکرد.
(-الشَيءَ): شتەکەی هێنایە خوارێ.
(-اللهُ الکَلامَ): خــودا فەرموودەکەی بەوەحی ناردە خوارەوە.
(أنْزَلَ حاجَتَهُ علی کَریم): پێداویستییەکەی لە جوامێرێك داواکرد کەبۆی جێبەجێبکات.
(تَنَزَّلَ): هێواش هێواش هاتەخوارێ.
(-عَــنِ الحَــقِّ): وازی (لەمافەکــە هێنا/ لە ڕاستی هێنا).
(-فُلاناً): فیساری هێنایە خوارێ.
(تَنــازَلَ - القَــومُ): ١-لەحوشــترەکانیان بۆ ئەسپەکانیان دابەزین هاتنەخوارێ و کەوتنە لەیەکدادانــی یەکــتری ٢-داپەڕینــە کــۆڕی جەنگەوەو لەگەڵ یەك کەوتنە جەنگ.
(-القومُ في السَفَرِ): لەگوزارەکەیاندا هەرجارەی لەدابەزینێکدا لەشوێنێکدا نانیانخوارد.
(تَنازَلَ- الرَجُــلُ): لەپلەوپایەی خۆی هاتە خوارەوە/ نەرمیی نواند/ شلبوو.
(إسْــتَنْزَلَ-هُ): ١-هێنایە خوارەوە/ دایبەزاند ٢-داوایلێکرد بێتە خوارێ یان نەرمبێت.
(-هُ عَــنْ رأیِـهِ أو حَقِّــهِ): داوای لێکرد واز لەراکەی یان مافەکەی خۆی بهێنێت.
(أُسْــتُنْزِلَ - فلانٌ): فیســار لەپلــەو پایەی دابەزێنرا/ پلەی کەمکرایەوە.
(النازِلَةُ (ج) نازِلات وَ نَوازِل)١- مێی وشــەی

(النازِل) ٢- كۆستى گەورە/ بەسەراتى گران/ چورتومى سەخت.
(اَلنِزْل) (طب) (عامية): هەلاّمەت و كۆكەو تاى سەرمابوون.
(اَلنِزْل (ج) نُزول): كۆومبوو/ كۆمەڵبوو.
(اَلنُـــزل (ج) أنْـــزال): ئـــەوەى بـــۆ ميـــوان ئامادەكرابێت.
(اَلنُـــزْل والنَـــزَال (ج) أنْزال)١- كەڵـــك و بەروبوومى دەغڵودان و كشتوكاڵ ٢-بەخشش و چاكەو پياوەتيى.
(اَلنُزُل): هەوار/ ماڵ/ خانووبەرە ٢-خوێشگەڵ بەميوانـــى دابەزيـــو ٣-خواردنـــى بـــە پيت و بەرەكەت.
(-(ج) أنْـــزال): ئـــەوەى بـــۆ ميـــوان ئامادە كرابێت.
(اَلنَـــزِل): ١-خـــان يـــان ميوانخانـــە/ ئوتێل، كاروانسەرا ٢-زەوييەكى رەقەن كە ئاو نەگرێتە خۆى و بەسەريدا بڕوات.
(اَلنَزَل (ج) أنزال): باران.
(رَجُـــلٌ ذو نَـــزَلٍ): پياوێكـــى بەخشـــندەو خێرخواز/ جوامێرو چاكە خواز.
(أنزالُ القَوم): رۆزيى خوێشگەل.
(اَلنَزلَة (ج) نَزَلات): جارێك دابەزين/ هاتنە خوارەوە.
(لَقَد رآهُ نَزلَـــهً أخرى): هاتنەخوارەوەيەكى تريشى بينى.

(اَلنَزْلَـــة) (طُب): هەلاّمـــەت و كۆكەو تا كە بەهۆى ميكرۆبەوە دەبێت.
(اَلنَزْلَة الصَدرِيَة): ســـنگگيران كەلەسەرماوە دەبێت تاو كۆكەى لەگەڵدا دەبێت.
(أرضٌ نَزْلَةٌ): زەوييەكى كشت بەشكۆفە.
(تَرَكْتُهُم على نَزَلاتِهِم ونَزِلاتِهِم): بەجێمهێشتن كە باريان دروست و رێكبوو.
(اَلنِزَالَة)١- گوزار/ سەفەر/ كۆچ ٢-ميوانداريى.
(كُنا في نِزالَةِ فلان): لەلاى فيسار ميوانبووين/ لە ميواندارى فيسار بووين.
(فُلان مِن نِزالَة سوءٍ): فيسار باوك بەدفەڕو بەدزمانە.
(اَلنَزَالَة): رۆيشـــتنى باراناو بەسەرزەوييەكى رەقەندا هەرچەندە بارانەكەيش كەمبێت.
(اَلنَـــزَّال): ١-كەســـێكە زۆر دابەزێتە خوارێ ٢-كەسێكە زۆران زۆر بگرێت و بەگژدا بچێت.
(اَلنَزيل (ج) نُزَلاء): ١-ميوان.
(فُلان نَزيلى): فيســـار ميوانى ماڵەكەمە يان لەماڵەكەدا لەگەڵمدايـــە ٢-خواردنى بەپيت و بەرەكەت.
(ثَوبٌ نَزيل): بەرگێكى تەواو.
(اَلتَنْزيل) (مص): ١-رێكخستن ٢-داگرتن/ هێنانە خـــوارێ و تلكردنەوە لە بەرزاييـــەوە بۆ نزمايى ٣-داشكان ٤-لێدەركردن ٥-كەمكردنى پلەو پايە.
(اَلمَنـــزِل (ج) مَنازِل): هـــەوار/ ماڵ/ خانە/ خانوو/ شوێنى لێدابەزين ٢-سەرچاوە.

(اَلْمَنْزِلَــه (ج) مَنــازِل): ١-شــوێن دابەزیــن ٢-خانوو ٣-پلەوپایە.
(لَــهُ منزلةٌ عند الامیر): لای میر پلەوپایەی هەیە.
(هُوَ رَفیع المَنزِلَة): ئەو پلەو پایە بەرزە.
(المُنَزَّلَة) (ط): خواردنێکە لەگۆشتو باینجان دەکرێت.
(اَلمَنْزُول): ژووری میوان/ دیوەخان.
نزه: (نَزَهَ -الإبلَ. نَزْهاً): حوشترەکەی لەئاو دوورخستەوە.
(نَزِهَ وَنَــزُهَ. نَزاهَــةً ونَزاهِیَةً)١- لەخراپەو بەدیی بەدوور بوو ٢-دەستپاكو داوێنپاکبوو/ بەناموسبوو.
(-المَــکانُ): شــوێنەکە هەواخــۆش و ئاودارو پوختبوو.
(نَزَهَ - هُ): لەبەدیی و پیســیی و ناشــیرینیی دووریخستەوە.
(-نَفْسَهُ عَنِ القَبیح): خۆی لەکاری ناشیرین‌و لەنەنگیی و خراپیی (دوورە پەرێزگرت/ لادا).
(-هُ اللهَ عَــنِ السُــوءِ): خــودای بەپاکیــی و پیرۆزیی داناو ناوهێنا.
(تَنَــزَّهَ - عَــن کــذا): خــۆی لــەوە دوورە پەرێزگرت و خۆی (لێپاراست/ لێلادا).
(یَتَنَزَّهُ عَــنِ المطامِعِ وَعَن ملائِمِ الأَخلاقِ): خۆی لەچاوچنۆکیی و بەدڕەوشتیی و هەرچی مایەی سەرزەنشتیی بێت دەپارێزێت.
(-فُلانٌ): فیســار چوو بۆ گەشــتو سەیران‌و سەیرانگا.
(إسْــتَنْزَهَ - عَــن کذا): فیســار خــۆی لەوە دوورگرت.
(-فُلانٌ): فیسار بۆ گەشتو سەیران ڕۆیشتو چووە دەرەوە.
(اَلنّــازِه) (فا): خــۆ پاکراگرتــوو خۆپارێز/ بێنیازی خراپە.
(هُوَ نازِهُ النَفسِ): ئەو دەروونپاکە و دەســت و داوێن پاکە.
(اَلنَزْه وَالنَــزِه والنَزیــه (ج) نُزَهاء وَأَنزاه وَنــزاه): پاکی دوور لــە هەموو خراپیەك لە زشتو خراپەو نەنگی.
(مکانٌ نَزْهٌ وَنَزِهٌ ونَزیهٌ): ســەیرانگاو جێی دوور لە خەڵكو شوێنی خۆش ٢-شوێنێك ئاوو هەوای پاكو خۆش کەخەڵك ڕووی تێبکات.
(اَلنَزَه والنَزاهَة): دەست و داوێنپاکیی/ دوور لەبەدیی.
(النُزهَةُ (ج) نُزَه): سەیران/ گەشت/ گەڕان‌و رابواردن.
(المُنْتَزَه)١- ســەیرانگا/ گەشــتگا/ شــوێنی حەوانەوەو رابواردن ٢-باخچەی گشتیی.
نزو:١-(نَــزا. یَنْزو نَــزْواً ونُــزُوّاً وَنَزَواناً): بازدیدا/ خۆی هەڵدا.
( اللذکَــرُ علــی الأُنثی: نێرەکەڵەکە ســواری مێکە بوو/ چاکیکرد/ لاقەیکرد/ لێیپەڕی.

(ألنِــزَاء والنُــزاء): لاقەکــردن لێپەڕیــن/ چاككردن ســواربوون (ئەمە بــۆ نێرەو كەڵی سمدارو درندەكان دەوترێت).
(نَزا - بِهِ قَلْبُهُ إلى كذا):دڵی چووەسەر ئەوەو دڵــی بۆی كوركا/ حەزی لێكــردو هەڵپەی بۆ كرد.
(-تِ الحُمُرُ):گوێدرێژەكان/ كەرەكان لەخۆشیاندا كەوتنە هەڵبەزو دابەز/ جرتو فرت/ هەڵتیزان.
(-الطَعامُ): چێشتەكە خواردنەكە گرانبوو.
(نَزا -عَلَيهِ): سورابوو/ لێپەڕی.
(-عَنهُ. نَزَواناً): لێبەرەڵابوو/ لێدەرچوو/ خۆی نەدا بە دەستیەوە.
(نُــزِيَ - الرَجُلُ نــزواً): پیاوەكــە خوێنی بەربوو و لەبەری ڕۆیشت.
(أَصابَهُ جرحٌ فَنُزِيَ مِنهُ فَماتَ): بریندار‌بوو و خوێنی لەبەر ڕۆیشتو مرد.
(نَزَّى وَأَنْزى - هُ. تَنزِيَةً وَتَنزِّياً):١: وایلێكرد هەوەسی هەستێت لێبپەڕێت ٢-وایلێكرد باز بدات/ قەڵەمبازبدات.
(تَنَزَّى - الى الشَــرّ تَنَزّيــاً): هەڵپەو پەلەی خراپەكردنیكرد.
(إنتَزى. إنْتِزاءً): هەڵپەو پەلەی خراپەیكرد.
(إنْتَزى على أَرضٍ كذا فَأَخَذَها): هەڵپەی بۆ ئەوزەویە كردو بردی.
(أَلنَزْوَة):١-بازدادان، ڕاپەڕینو ئامبازبوونێك ٢-هەوەسهەستانێك.

(أَلنازِيَة):١-مێی وشــەی (النازي)/ جەخاڵ/ بەكەڵ/ بەبا ٢-توندو بەهێزیی و چابووكیی/ دەستپێشخەری/ تەردەستی.
(أكمَةٌ نازِيَة):گردێك كەلەدەورو پشــتەكەی بەرزتربێت.
(أَلنَزَوان) (مص): هەوەسهەستان و لێپەڕین ٢-گرگرتن و توندو تیژبوون.
«بــە نَزَوات»: هەوەســی هەســتاوەو توندو تیژیی هەیە، بەزەبرو زەندە.
(أَلنَزِيّ والنَزّاء والمُنتَزِي): حەزكەرێكی زۆری پەڕیــن یان خراپە یان هەرشــتێكیتر كردن/ پێوە سووتاو.
(أَلنَزِيَّة):١-مێی وشەی (النَزِيّ)/بەكەڵ بەفاڵ/ بەبا ٢-حەز و هەوەســێكی لەپڕ بۆ كەســێك بێت ٣-خراپە كە لەپڕ تێتەوە بئاڵێت.
٢-(أَلنازِيَة): لەگەنی پەل كەقووڵنەبێت.
(أَلنازِيّ): ئەو كەسەی نازیبێت.
(أَلنازِيَّة): نازێتیی بروایەكی نەتەوەخوازیی ئەڵمانیا بوو.
(أَلنَزْوَة)١-هەوەسێكی كورتی كاتیی ٢-هەموو شتێكی كورت/ كورتدەم.
(أَلنَزِيَّة):١-هەور ٢-لەگەنی پەل٣-دەمی تەور.
نسّ:١-(نَسَّ - فُلانٌ نَسّاً وَنَسيساً):فیسار چابووكو بەدەستوبردبوو/ لەهەموو كارێكدا ئازابوو.
(-النافَة): حوشترەكەی دەنگكردو دایە پێشو پیایادا هەڵشاخا.

(-كَانَ يَنُسُّ أصحابَهُ): لەدوای دۆستەکانیەوە/ هاورێکانیەوە دەڕۆیشت.

(نَسَّ - القَومُ نَسّـاً وَتَنْساساً): هاتنە سەر ئاوەکە.

(نَسَّسَ - الماشِيَةَ): ئاژەڵەکەی لێخوڕی/ دایە پێش.

(ألنَّسيس) (مص): گیانە گۆینەیەك لەلەشدا/ دوا ساتەکانی کاتی گیانەلا (بۆیە وا دەڵێن چونکە پاڵ بەگیانەوە دەدرێت دەرچێت).

(بَلَغَ منه نَسِيسَهُ): خەریکی گیاندانبوو/ گیانە گۆینەیەکی تێدا مابوو.

(ألنَسيس (ج) نُسُس): ١-وەپێشدراو ٢-ئەوپەڕی کۆششی مرۆڤ و هێز ٣-سروشت.

(ألنُسُس): ڕەسەنە بەدەکان/ ڕەچەڵەکە بەدەکان.

(ألنَسِيسَة (ج) نَسائِس): سروشت.

(بَلَغَ مِنهُ نسيسَتَهُ): کەوتە گیانەلا.

(ألتَنساس) (مص): ڕافراندن و توند لێخوڕین.

(ألمِنَسَّة والمِنساس): داردەست.

٢-(نَسَّ - الخُبزُ أو اللَّحْمُ. نَسِيساً وَنُسُوساً): نانەکە یان گۆشتەکە وشکبووەوە.

(-ألحَطَبُ نُسُوساً): بنی دارەسووتاوە گرگرتووەکە کەفیدەردا.

(أنَسَّ - الدابَّةَ): چوارپێکەی/ ولاخەکەی تینووکرد.

(ألنَاسّ) (فا): دووز زمانیی و قسە چنیی و بوختانکردن.

«خبزٌ ناسٌ»: نانی وشك.

(النسيس (ج) نُسُس): ١-برسێتییەکی زۆر ٢-کەفی دارو ئەوەی کە دەریدەدات.

«النسيسةُ(ج) نِسائِس»: کەفی دار کە لە کاتی سووتاندنیدا دەریدەدات.

(نَسَّ = نسوساً لَفلان): هەواڵی بۆ فیسار برد.

(تَنَسَّ منه الاخبار): هەواڵەکانی لێوەرگرت، هەوڵی دا بیانزانێت.

(النسيسةُ (ج) نسائِس): دووزمانیو دووڕوویی.

٤-(نَسْنَسَ - الطائِرُ): باڵندەکە پەلەیکرد/ خێرابوو.

(-البَعيرَ): دەنگی لەخوشترەکە کردو ڕایفراند/ لێیخوڕی.

(-تِ الريحُ): باکە هەڵیکرد.

(نَسْناسُ الإنسانِ وَغيرِهِ): ڕەنج و کۆشش و ئارامی مرۆڤو هیتر.

٥-(نَسْنَسَ - الرَجُلُ): پیاوەکە لاوازو بێتوانابوو.

(ألنِسْناس): برسێتیەکی زۆر.

(ألنَسْناس) (ح): ١-چوار پێیەکی خەیاڵییە دەڵێن گوایا لەمرۆڤدەچێت. ٢-لای ڕەشە خەڵکەکە ناوی جۆرە مەیمونێکە/ سەکسار.

نسأ:١-(نَسَــأَ- الشيءَ نَسْــأً وَمَنْسَأَةً):شتەكی خستە دواوە/ دواخست.

(نَسَــأَ اللهُ أَجَلَهُ وفِي أَجَلِهِ): خودا ئاكامەكەی دواخست.

(-فُلاناً): فيساری پاراستو پاسیكرد.

(-هُ البَيعَ وفِي البَيعِ): شــتی لێكڕی و پارەی شتەكەی نەدایەو دوایخست.

(-الدابَّةَ. نَسْــأً):١-دەنگــی لەوڵاخەكە كردو لێخوڕی ٢-لەگۆلەكەی دوورخستەوەو لایدا.

(-عَن فُلان دَينَهُ. نَساءً): دانەوەی وامەكەی فیساری دواخست.

(نَسَّــأَ - الدابةَ. تَنسِئة): وڵاخەكەی لێخوڕی و دەنگی لێكرد.

(أَنْسَــأَ- الشئَ. إنساءً):شتەكەی خستە دواوە، دواخست.

(أَنْسَــأَ اللهُ أَجَلَهُ وَفِي أَجَلِهِ): خودا ئاكامەكەی مەرگی دواخست.

(-هُ البَيــعَ وَ فِي البَيــعِ): شــتەكەی بەقەرز لێكڕیو دانی پارەكەی دواخست.

(-عَنهُ): دواكەوتو لێیدووركەوتەوە.

(إنْتَسَأَ -عَنهُ): لێیدواكەوت.

(-تِ الإبــلُ فِي المَرعــى): حوشــترەكان لەلەوەڕگاكەدا لەیەك دووركەوتنەوە.

(إسْتَنْسَأَ غَرِيمَهُ): لەخاوەنوامەكەی خواست كەدانەوەی وامەكەی بۆ دوابخات ئەویش بۆی دواخست.

(أَلنَساء): تەمەنی درێژ.

(أَلنُسْأَةُ وَالنَسِيئَةُ): دواخستن/ لەدواییدا دانەوە.

(باعَهُ بِنَسِيئَةٍ): بەقەرز/ بەوام پێیفرۆشت كە لەدواییدا پارەكەیی بداتێ.

(أَلنَسِيء): دواخستن.

(إنَّ لي عَنكَ لَمُنْتَسَــأً): من لەتۆوە دوورم و نێوانمان فراوانە.

(أَلمِنسَأَة وَ آلمَنْسَأَة والمِنساة وآلمَنْسَاة وَ المِنْسَاة): گاڵۆك/ گۆچان. داردەستی گەورەی شوان وەكو شتی پێ دووربخرێتەوە و پاڵی پێوە بنرێت.

٢-(نَسَأَ-تِ الماشِيَةُ. نَسْأً): ئاژەڵەكە خەریكی قەڵەوبوونبوو.

(أَلناسِــئُ (فا) (ج) نَسَأَة): مرۆڤ یان ئاژەڵی قەڵەوبوو/ خرت/ قەڵەو.

٣-(نَسَــأَ - آللَبنَ بِالماءِ. نَسْــأً): ئــاوی كردە شیرەكەوە.

(-هُ): شیراویدایە.

(النَسْء) (مص):١-شیراو/ شیرێك ئاوی زۆر تێكرابێت. ٢-مەیو شــەرابی خەست كە زوو سەرخۆش بكات و هۆش ببرێت.

(أَلنَسِيء): شــیرێك ئاوی زۆربێت/ ئاوی زۆر تێكرابێت.

٤-(أَلنَسْئ): قەڵەویی یان سەرەتای قەڵەویی.

نسب:١-(نَسَــبَ- الرَجُلَ نَسَــباً ونِسْــبَةً)١-ناوی بنەو بنەماڵەی هەڵداونیشانەو ماكیشی دەرخست ٢: لێیپرسی چ بنەچەیەكە.

(-هُ إلى فُلانٍ): برديەوە سەر فیسار بنەچە.
(-الشـاعِرُ بِالمَرْأةِ نَسَباً وَنسـيباً وَمَنسَبَةً): هۆزانڤانەکـە بەمـاك‌و جوانیـی ژنەکـەدا هەڵیداو هەڵبەستی دڵداریی‌و ئەوینی بۆ وت/ پێداهەڵدا.
(ناسَـبَ -هُ. مُناسَـبَةً): ١-هاو رەچەڵەکیبوو و خزمیبـوو ٢-لەوچوو لەشـێوەی ئەوبوو و لەگەڵیدا گونجا.
(تَنَسَّـبَ -الرَجُلُ إلَيْكَ): پیاوەکە وتی: گوایا بەرەچەڵەك دەچێتەوە سەرتۆ.
(«القَريبُ مَن تَقَرَّبَ إلَيْكَ لامَن تَنَسَّـب»): نزیکـت ئەو کەسـەیە کە بەخۆشەویسـتیی لێتـەوە نزیکبێـت نـەك بەخزمایەتی‌و بە رەچەڵەك.
(تَناسَـبَ القَومُ إلى أحسـابِهم): خوێشـگەل خۆیانیان بردەوە سەر رەچەڵەکەکانیان.
(تَناسَبا): لەیەکچوون/ بەیەکچوون‌و هاوشێوە بوون.
(إنْتَسَبَ - الرَجُلُ): ١-بنەچەو بنەماڵەی خۆی دەرخست‌و ناوهێنا.
(-إلى أبيه): بەرەچەڵـەك خۆی بەباوکیەوە بەست‌و بردەوەسەرباوکی.
(إسْتَنسَـبَ): رەچەڵـەك و بنەماڵـەی خۆی ناوهێنا.
(-الرَجُلَ): داوای لەپیاوەکە کرد کە رەچەڵەك و بنەماڵەی خۆی هەڵدات‌و بڵێت.

(-الشيءَ): شـتەکەی بە باش‌و گونجاو داناو هاتە بەرچاو.
(ألنَسَـب (مـص) (ج) أنسـاب): ١-رەچەڵەك و بنەماڵە. ٢-خزمایەتیی پەیوەندیی خوێشایەتیی.
(ألنِسْـبَة والنُسْـبَة): ١-خزمایەتیـی/ خوێشـایەتیی / کەسـایەتیی ٢-ریـژەی پەیوەندیـی نێـوان دووشـت ٣-وێکچوونـی پەیوەندیی شـتەکان یان برەکان. بۆ نموونە دەوترێت: رێژەی (٤) بۆ (٨) وەك رێژەی (٥) بۆ (١٠) یە.
(بالنِسـبَة الى کـذا): بەگوێـرەی ئـەوەو بەئەندازەی ئەوە/ لەچاو ئەوەدا.
(ألنِسْبِيَّة): رێژەیی. رێرەوێکی فەلسەفانەیە دەڵێت: زانیاریی بەرێژەیە.
(ألنَسـابَة): خزمایەتیـی/ خوێشـایەتیی/ کەسایەتیی.
(ألنَسَّـاب (ج) نَسَّـابوون وَالنَسَّـابَة (ج) نَسَّابَات): رەچەڵەك و بنەماڵەناسەکان.
(ألنَسـيب (مـص) (ج) أنْسِـباء وَنُسَـباء): ١-گونجـاو / لـواو ٢-خـزم/ خوێـش ٣-زاوا ٤-بەرەچەڵـەك / خاوەنرەسـەن ٥- هۆزانـی ناسـك‌و تەڕو پاراوی دڵدارانە/ شـیعرێك بۆ جوانیی ژن‌و سۆزی دڵ‌و دڵدارانە بوترێت.
(نَسيبٌ ناسِبٌ): خزمێکی زۆر نزیك.
(ألأنْسَـب): گونجاوتـر/ لەبارتر/ شـیاوتر/ لواوتر.

(هذا الشِعْرُ أَنْسَبُ من ذاكَ): ئەم هەڵبەستە لەویتر ناسکترو لەبارترە.

(أَلوَسَطُ التَناسُبي لِعَدَدين (ب ج) و (ع ج): ناوەندی هاوڕێژە بۆ دوژمارەی (ب، ج) ژمارەیەکی سێهەمە (س) کە دوو ناوەندی هاوڕێژەیەکی کەدوولاکەی بریتین لە $\frac{ب}{س} = \frac{س}{ج}$

أَلمُناسب (فا): ١-نزیك ٢-لەوشێوەیە چوو ٣-ژمارەی نزیکراوەی چوارەمینی سێ ژمارە (ب ج د): ژمارەی (س) بەمەرجێ $\frac{ب}{ج} = \frac{د}{س}$

(أَلمَنسوبُ (ج) مَناسیب ( (مفع): دراوەتە پاڵ لایەك بەهی ئەوکراوە.

(شِعرٌ مَنسوبٌ): هۆزانێك/ شیعرێك کرابێت بەهی یەکێك/ درابێتە پاڵ یەکێك.

(خَطٌّ مَنسوبٌ): نووسینێکی بەدەستوور/ لەسەر رێسا نوسرابێت.

٢-(نَیْسَبَ بَینَهُما): دووزمانیی و قسەچنیی لەنێوانیاندا کردو نێوانی تێکدان.

(أَلنَیْسَب): رێچکەی مێرووله کەیەك لەدوای یەك دەرۆن ٢-رێگەی هاتوچۆی مێرووڵەو مار.

(أَلنَیْسَب والنَیسَبان): رێگەی دیار/ ئاشکراو رێك.

**الملحق:**

نسب. (عِلْمُ الأَنساب)رەچەڵەکناسیی/زانستیی رەچەڵەك و خوێشایەتیو چوونەوە سەریەك پشت کەبەهۆیەوە خزمایەتیی خێڵەکان و پەیوەندییان بەیەکەوە دەزانرێت. تیرەکان دەبرێنەوە سەر رەچەڵەکە سەرەکییەکانیان، بەناوبانگترین رەچەڵەکناسەکانی عەرەب: (إبن الكلبيّ و ابن قُتَيبَة الكوفي وأَبو حمزة الأَصْبَهاني وأَبو الفتح الشهرستاني): بوون.

(أَلمُناسَبَة): نیشانەو ماکی شتێکە کەبگونجێت/ بلوێت.

(مُناسَبَة مَسْعى): هەلی هەڵکەوتوو/ گونجاو بۆ هەوڵێت.

(مناسَبَة إجراء): هەلی هەڵکەوتوو/ گونجاو بۆ کردەوەیەك.

(في كُلّ مُناسَبَةٍ): لەهەموو بۆنەیەکی گونجاودا.

(بهذه المُناسَبَة السَعيدَة): بەم بۆنە خۆشەوە.

(حَرَكَةُ المُناسَبَة في النَحو): لەرێزماندا گونجانی سەروبۆرە بۆ وشەکان وەکو (كِتابِي) پیتی (ب) لێرەدا ژێردار دەکرێت لەبری ئەوەی بۆردار بکرێت بۆ ئەوەی لەگەڵ (ی)کەدا بگونجێت.

(أَلمُناسَبات): بۆنەکان وەکو بۆنەی کۆبوونەوەکان و شاییو ژنهێنانو پرسەو شیوەن و ئاهەنگەکان و یادەکان و ئا لەو بابەتانە.

(نُشاهِدُهُ في كُلّ المناسبات): لەهەموو بۆنەیەکدا دەیبینین.

(أَدَبُ المُناسَبات): وێژەی بۆنەکان. ئەو وتارو

هەڵبەستو شیعرانەیە کە بۆ پیرۆزباییو ستایش لەپرسەداو لە بۆنەیتردا دەوترێت.

نست: (أَلنَاسُوت = أَلناس): خەڵك، سروشتی مرۆڤانە («وت» بۆ وشەی ناس پترکراوە) (سریانیە) وەك وشەی مَلَك کە کراوە بە (مَلَكوت).

نَسج:١-(نَسَجَ - آلثَوْبَ نَسْجاً): بەرگەکەی چنی.

(-الكَلامَ): ١-ئاخاوتنەکەی کورتکردەوە ٢-قسەکەی وەرگێڕاو گۆڕی ٣-ڕێکیخست.

(-الشاعِرُ الشِعْرَ): هۆزانڤانەکە هۆزانێکی هۆنییەوە/ دانا.

(-الغَيثُ النَباتَ): بارانە زۆرەکە گیاکەی وا هەستاند تا چنگی دایە یەك/ بەگژیەکدا چوو.

(-تِ الريحُ التُرابَ أَو الماءَ): باکە دای لەخۆڵ یا ئاوەکە هێڵی تێدا پەیداکردنو شەپۆلی شێوە زریی تێدا پەیداکردن.

(إِنْتَسَجَ): ١-چنرا ٢-شیاوی چنینە. بۆ چنین ئەشێ.

(أَلنَسْج) (مص): چنین.

(ثَوبٌ نَسْجُ اليَمَنِ): بەرگێکە لەیەمەندا چنراوە/ چنینی یەمەنە.

(أَلنِساجَةِ): پیشەی چنین و تەونکردن/ پیشەی جۆلایی.

(أَلنَسَّاج): ١-چنەر و تەونەکەر، جۆلا/ بەرگچن. ٢-قسەچن/ قسەهۆن ٣-درۆزن.

(أَلنَسِيج (ج) نُسُج): چنراو، کووتاڵ.

(هُوَ نَسِيجُ وَحْدِهِ): ئەو تاکە چنراوە لەباشی و ڕێکوپێکیدا/ بێوێنەیە.

(أَلنُسَّج): فەرش و ڤاڵییەکان.

(أَلنَسِيجَة (ج) نَسائِج): مێی وشەی (أَلنَسِيج).

(أَلمَنْسَج والمَنْسِج): جێگای جۆلایی و چنین/ کارخانەو کارگای جۆلایی و چنین.

(أَلمِنْسَج والمِنْساج): دەسگای چنن و جۆلایی و تەون.

٢-(نَسَجَ-تِ الناقَةُ في سَيرِها نَسْجاً): مێحوشترەکە لەڕۆیشتندا خێرایکردو خێراخێرا پێی هەڵگرت.

(أَلمِنْسَج والمَنسِج - مِنَ الدابَّةِ): ناوشانی وڵاخەکە/ نێوان هەردوو شانی تابنی ملی چوارپێ.

(وَضَعَ رِمْحَهُ على مَنسَجِ فرسِه): نیزەکەی خستە سەرشانو ملی ئەسپەکەی.

نسح: (نَسَحَ - التُرابَ نَسْحاً): خۆڵەکەی کرد بەتۆزو بە بایدا.

(نَسِحَ نَسَحاً): چاوچنۆکییکرد.

(أَلنَسْح وآلنُساح): توێکل و سەری خورما کەلەخورماکە دەبێتەوە.

(أَلمِنساح): ئەوەی کە خۆڵی پێ بەبادەدرێت.

نسخ: (نَسَخَ - الشيءَ نَسْخاً): ١-شتەکەی

نەهێشت/ سڕییەوە ٢-پووچیکردەوە/ هەڵیوەشاندەوە ٣-شێواندیو تێکیدا.

(-آلكِتابَ): نووسینەکەی شێوە نووسکرد/ لەبەریگرتەوە/ رونووسیکرد.

(ناسَخَ-ەُ مُناسَخَةً): هەریەکەیان ئەوی تری سڕییەوە/ پووچەڵکردەوە.

(تَناسَخَ -تِ الأَزمِنَةُ): چەرخ و سەردەمەکان یەك بەدوای یەکداهاتن.

(-الوَرَثَةُ): میراتگرەکان بەرودوا یەك لەدوای یەك مردنو هیچیان میراتیان وەرنەگرتو میراتەکەمایەوە و بەشنەکرا.

(تَناسَخا): هەریەکەیان ئەویتری فەوتاند/ لەناوبرد/ هەڵوەشاند.

(تَناسَخوا - الشيءَ): ١-دەستاودەستیان بەشتەکە کرد ٢-دوای شتەکە کەوتن.

(إنْتَسَخَ - الشيءَ): شتەکەی لابردو نەیهێشت.

(-الكِتابَ): نووسینەکەی ڕۆنووسکرد/ لەبەری نووسییەوە.

(-الشيءُ الشيءَ): شتەکە جێی شتەکەیتری گرتەوە.

(إسْتَنْسَخَ -الشيءَ): ١-شتەکەی هەڵوەشاندەوە تێکدا، سڕییەوەو نەهێشت ٢-داوایکرد بیسڕێتەوەو نەیهێڵێت یان شتەکە بشێوێنێت و ناشیرینی بکات.

(ألناسِخ) (فا)١- هەڵوەشێن تێکدەرو شێوە شێوێن ٢-لەبەرگرەوەو ڕۆنووسکار.

(ألنَسخ عِندَ آلتَناسُخِيَّة): گیانگۆڕکێ لەلای ئەوانەی کە بڕوایان بەگیانگۆڕکێ هەیە ئەویش ئەوەیە کە گوایا گیانی مردوو دەچێتە جەستەی یەکێکیترەوە یان زیندەوەرێکیترەوە.

(ألنُسخَةُ (ج) نُسَخ): نوسراویان کتێبێك کە لەبەری گیرابێتەوە یان ئەوەی کە لەبەرگیرابێتەوە.

(كَتَبَ القاضي نُسخَتَين بِحُكمِهِ): دادوەر بڕیاری دادوەریەکەی بەدوو دانە ڕوونووس کرد.

(بَلْدَةٌ نَسِيخَة ونُسَخِيَة): شارێکی دوور.

(ألتَناسُخ) (مص): گیانگۆڕکێ/ گیانی مرۆڤێك پاش مردنی بچێتە گیانی یەکێکیترەوە ئەمە پێیدەڵێن (ألتَقَمُص): واتە کراسگۆڕین.

(ألتَناسُخِيَّة): ئەوانەن کەبڕوایان بەگیانگۆڕکێ هەیە.

(تَناسُخ الأَزمِنَة والقُرون): یەك بەدوای یەکداهاتنی چاخەکان و سەردەمەکانو تێپەڕبوونیان وەکو هەریەکە کاری ئەویتر بۆ خۆی بەتاڵکاتەوە.

نسر:١-(نَسَرَ-ەُ عَنهُ. نَسراً): ڕووپۆشەکەی لەسەر لابرد و دەریخست.

(-الجرحُ اللَّحمَ): برینەکە گۆشتەکەی هەڵوەشاند.

(-الرَجُلَ): جنێوی بەپیاوەکەداو خەوشی لێگرد.

(-هُ آلبــازي. نَسْــراً): بازەكــە بەدەنــووك گۆشتەكەی هەڵپچڕی‌و پچڕ پچڕیکرد.

(نَسَّرَ - الحَبلَ): گوریســەكەی خاوكردەوەو هەڵوەشاند.

(تَنَسَّرَ): داڵی ڕاوكرد.

(-الحَبْلُ): گوریسەكە لێكهەڵوەشا.

(-الجرُح): برینەكە هەڵاوساو تەشەنەیكردو كێم و زوخی لەبەر ڕۆیشت.

(-الثَـوْبُ ونَحْـوهُ): بەرگەكــە پۆرتــكا/ شیبووەوەو وردەوردە هەڵوەری.

(-تِ النعمَةُ عَن فُلان): فیسار خۆشی و دارای لەدەستچوو.

(إنْتَسَــرَ -طَــرَفُ الحَبْلِ): ســەری پەتەكە خاوبووەوەو ڕیشاڵڕیشاڵبوو.

(إسْتَنْسَــرَ - الطائِــرُ): باڵندەكــە وەك داڵی لێهات، بەهێزبوو.

(إنَّ البُغــاث بِأَرضِنا يَسْتَنِســرُ): بێتواناكان لەخاكی ئێمەدا دەبنە داڵ واتا بەهێز دەبن.

(أَلنَسْــر والنُسْــر والنِسْر (ج) نُسُــور وأَنْسُر وَنِســار) (ح): داڵ: باڵندەیەكــە لەكۆمەڵــەی داڵە. چاو تیژەو بەهێزترین وتیژترینی باڵندە گۆشــتخۆرەكانە لەهەمــووان بەرزتر دەفڕێت باڵــی لەهی هەموان بەهێزتــرە هەموو باڵندە گۆشتخۆرەكان لێیدەترسن و لەهەڵۆ گەورەترە نووكی دەنووكی خوار بۆتەوە چنگی هەیە بەڵام ناتوانێت كۆیبكاتەوەو نێچیرەكەی پێهەڵگرێت وەك هەڵــۆ چۆن بە چنگی نێچیر هەڵدەگرێت ناوە شاردراوەكەی/ پێناسراوەكەی.

(أَبو الأَبْــرَد) و (أَبو الأَصْبع وأَبو مالِك وأَبو المِنهال وأَبو يَحيى): بە مێكەی پێیدەڵێن: (أُم قَشعَم).

(أَلنَســر (ج) نســور): پارچــە گۆشــتێكە لەسەرووی سمی چارەوێوەیە.

(أَلنَســران) (فك): دوو هەســارەن یەكێكیان پێیدەڵێن: داڵــی فڕیو. بەویتریان دەڵێن داڵی كەوتوو.

(أَلنُسارِيَّة) (ح): هەڵۆ.

(أَلناسُور (ج) نَواسير) (ســريانية مُعَرَّبَة): ناســۆر. دوومەڵێكە بەشــێوەی ڕەگە دەرواتو هەڵدەداتــەوەو هــەو دەكات، لەكۆمدا یان لە پێڵووی چاودا دەبێت.

(نَوْسَرَ الجرحُ أَو العَظمُ) (عامية): برینەكە یان ئێسكەكە بوو بەناسۆر یان ناسۆریگرت.

(أَلمِنْسَــر وآلمَنْسِر (ج) مَناسِــر): ١-دەنووكی باڵندەی گۆشــتخۆر كە شــێوەیەكی تایبەتیی هەیە ٢-(ا ع) دەســتە یان پارچەیەكی سوپایە بە بەردەمی سوپاگەورەكەدا تێدەپەڕێت.

٢-(أَلنِسْرين) (فارسية) (الواحِدَةُ نِسْرينة): نەسرین گوڵێكی سپیی بۆنخۆشە.

نسع:١-(نَســعَ - فُــلانٌ في الأَرض. نَســعاً ونُسُوعاً): فیسار كەوتە گەڕان‌و وێشتن.

(نَســعَ وَنَسَّعَ-تِ الأَســنانُ): پووكەكە شلبوو

داكەوتو دانەكان درێژ دەركەوتن.
(إِنْتَسَعَ - تِ الإبِلُ): حوشترەكان لە لەوەرگاكانیاندا بلاوبوونەوە.
٢-(نَسَعَ -الشيءُ. نُسُوعاً): شتەكە درێژ بووەوە.
(أَنْسَعَ - الرَجُلُ): پیاوەكە كەوتە بەربای باكوور.
(اَلناسِع) (فا): ملی درێژ/ گەردنی درێژ وەكو بادرابێتو درێژكرابێتەوە.
(اَلنسع (ج) نُسْع وَنِسَع وَنُسُوع وَأَنساع):
١-قایشێكی پانە یان گوریسێكی پانو درێژە باروبنەی پێ قایمدەكرێت/ قەیاسە.
(اَلنِسعَة): پارچەیەك لەو قایشە یان گوریسە
٢-جومگەی مەچەك.
(اَلنِسع والريح النِسْعِيَة): بای باكوور ( بەقایشی لوولكراوی باروبنە چوێنراوە).
(أَنسَاعُ الطَّريقِ): شوێنپێی ولاخ لەرێگەدا.
(اَلنُسُوع) (مص): درێژیی.
(اَلمِنْسَع): بای باكوور.
(اَلمِنْسَعَةُ): زەوییەك كەگیاكەی درێژ بێتو زۆر هەستێت.
٣-(أَنْسَعَ - الرَجُلُ): پیاوەكە خراپەی بۆ دراوسێكانی زۆربوو.
نسغ:١-(نَسَغَ-هُ بِالسَوطِ. نَسْغاً): بەقامچی ورووژاندی و وەرسیكرد.
(-الخُبزَةَ): نانەكەی پێش برژاندنی بەشانەدار كونكونكرد.
(-تِ الواشِمَةُ بِالإبْرَةِ): خالكوتەكە دەرزیئاژنیكرد.
(-هُ بِكَلِمَةٍ): بەقسەیەك دڵی تەنگكرد و نارەحەتیكرد.
(-هُ بِكَذا): ئەوەی تێگرت.
(-آللبنَ بالماءِ): ئاوی تێكەڵ شیرەكەكرد.
(نَسَّغَ - هُ): نێزەی پێداكرد یان تیغی پێداكرد.
(-تِ الشَجَرَةُ): درەختەكە بڕراوەكە هەڵیدایەوە.
(أَنسَغَ-هُ): تیغ یان نێزەی پێداكرد/ تێچەقاند.
(-هُ بالسَوطِ): بەقامچی شپرزەو وەرسیكرد.
(-تِ الشَجَرَةُ): درەختە بڕراوەكە هەڵیدایەوە.
(-تِ الفَسيلَةُ): بێچوولە دارخورماكە لەناوەراستیەوە چوزیدەركرد و لقی دەركرد.
(اَلناسِغ (ج) نُسَّغ) (فا): نێزە وەشێنی شارەزا.
(رَجُلٌ ناسِغٌ): پیاوێكە لەنێزە وەشاندندا دەستڕاستەو كارامەیە/ لێزانە.
(اَلنُسْغ) (ز): شلە خۆراكی دار كەلەزەوییەوە رەگ هەڵیدەمژێت بەدەمارەكاندا بۆگەلاو ئەملاولای بلاودەبێتەوە/ ئاوگ.
(اَلمِنْسَغة): ١-كۆمەڵە پەڕ یان شانە ئاسنێكە كەنانەوا نانی پێ كونكون یان نەخشدەكات
٢-كۆمەڵە دەرزییەكە كەخاڵكوت خاڵی پێ لەلەشدا دەكوتێت.

٢-(نَسَــغَ - فِي الأَرضِ نَسْغاً): بەزەویدا گەڕاو ڕۆیشت.
(نَسَــغَ وَنَسَّــغَ - ت أَسْــنانُهُ): بنی دانەکانی شلبوو.
(إِنْتَسَــغَ - تِ الإِبلُ): حوشترەکان لەکێڵگەکانیاندا بڵاوبوونەوە.
(-الرَّجُلُ): پیاوەکە کەوتە پشکنین و گەڕان.
(أَلنَسغ): ئاوی لەش کە دەردەچێت/ ئەرەق/ خوەی.
نسف:١-(نَسَــفَ - البِناءَ نَسْــفاً): خانەکەی لەبن هەڵتەکاندو هەڵوەشاند.
(-الجبالَ): کێوەکانی/ شاخەکانی تەختکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی بێژایەوە.
(-الحَــبَّ بِالمِنْسَــفِ): دانەکــەی بێژایەوە/ لەبێژنگیداو پاشان بەبایدا.
(-تِ الريحُ التُّرابَ): باکە خۆڵەکەی هەڵکەندو بڵاویکردەوە.
(-هُ نَسْفاً وَنُسُوفاً): گەستی / گازی لێگرت.
(أَنسَــفَ-تِ الريحُ التُّــرابَ): باکە خۆڵەکەی هەڵکەندو بڵاویکردەوە.
(تَنَسَّــفَ - فِي الصِراعِ): لەزۆرانەکەدا چنگی لە هاوزۆرانەکەیگــرت بەرزیکردەوە وەك لە زەوی دەربکێشێت و دایبەزەویدا.
(تَناسَفا - الكَلامَ): بەگوێی یەکدا چرپاندیان نهێنیی خۆیان بە یەکتری گوت.
(هما يَتَناسَــفان): ئەو دوانە بەگوێی یەکدا دەچرپێنن. وەکو نهێنی لەیەکتری دەربهێنن.
(إِنْتَسَــفَ - البِنــاءَ): خانوەکــەی لەبنەڕەت هەڵتەکاندو تەختکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی لەبن هەڵکەند.
(-تِ الريــحُ الشــيءَ): باکە شــتەکەی لەبن هەڵکەند و بڵاویکردەوە.
(-الكَلامَ): قسەکەی بەچرپەکردو دەرینەخست.
(إِنْتَسَــفُوا الــكَلامَ بَينَهُــم): قســەکەیان کەمکردەوەو لەناو خۆیاندا شاردیانەوە.
(أُنْتُسِفَ لَونُهُ): ڕەنگی هەڵبزرکاو گۆڕا.
(أَلنُسْــفَةُ وَأَلنَسْفَةُ وَالنِسْــفَةُ وَالنَسَفَةُ (ج) نِسَــف ونُسَــف وَنُسُف وَنِســاف): بەردەپێ. کەبەردێکی ڕەشی کونکونە (بۆیە وایپێدەڵێن چونکە پیسیی لەپێ دەکاتەوە).
(أَلنُسافَة)١-تۆزی هەستاوی زەوی ٢-ئەوەی لە بێژنگ دەدرێت ٣-کەفی شیر (چونکە لەرووی شیرەکە هەڵدەگیرێت).
(أَلنَسّــاف والنُسّــاف (ج) نَسَاســيف) (ج): باڵندەیەکە دەنوکێکی گەورەی هەیە شــتێکی وەك شاخی بەسەرەوەیە/ دەنووکشاخدار.
(أَلنَسَّافَة) (اع): پاپۆڕی هەڵتەکێن/ پاپۆڕێکی خێرای جەنگییە جۆرە تۆپێکی لەسەرەو تۆپ دەگرێتە پاپۆڕی دوژمن و هەڵیدەتەکێنێت.
(الطائرةُ النسّــافَةُ): فڕۆکــە هەڵتەکێن کە فڕۆکەی دوژمن هەڵدەتەکێنێت.
(أَلنَسوف (ج) مَناسيف): ١-حوشترێك کەرووەك

لەبنەوە هەڵدەتەكێنێت.
(عُقْبَةٌ نَسُوف): لوتكەی (درێژو نارەحەت و سەختی شاخ)/ بەرهەڵستێكی درێژخایەنی سەخت.
(ألنَسيف): ١-جێگازی كەر ٢-نهێنیی.
(شَيءُ نَسيفُ): شتێكی لەبێژنگدراو/ بێژراوە.
(كلامٌ نَسيفٌ): ئاخاوتنێكی شاردراوە/ نادیار.
(ألنَسيفَةُ = ألنَسفَةُ): بەردەبێ، بەردێكی زبرە پێی پێدەشۆن.
(ألمِنْسَف (ج) مَناسِف): كەوی بێژانەوە. (كەو) بێژنگی گەورە.
(ألمِنْسَف والمَنسِف (ج) مَناسِف): دەمی كەر.
(ألمِنْسَفَةُ): ١-خانو رمێن/ ئامێرێكە خانووی پێ تێكدەدرێت ٢-بێژنگ.
٢-(نَسَفَ -آلإِناءُ نَسْفاً وَنُسُوفاً): قاپەكە پرو سەررێژ بوو.
(ألنَسفانُ مِن الآنيةِ): قاپی لێوانلێوی سەررێژ.
نسق: (نَسَقَ -الدُرَّ ونَحْوَهُ): دورەكە یان شتی وەهای هۆنییەوە.
(-الكَلامَ): ئاخاوتنەكەی رێكخست و پێكەوە گرێیداو رازاندیەوە.
(نَسَقَ - الشيءَ): شتەكەی رێكوپێك دامەزراند.
(ناسَقَ - بَينَهما): پێكیەوە گونجاندن و رێكیخستن.
(أنْسَقَ - الرَجُلُ): پیاوەكە شێوە شیعردوا.
(تَنَسَّقَ وَتَناسَقَ وآنتَسَقَ -تِ الأَشياءُ): شتەكان پێكەوە رێكبوون/ گونجان و بەسەر و بەربوون.
(تَناسَقَ كَلامُهُ): قسەكەی رێكوپێك و بەسەروبەربوو.
(كلامٌ مُتناسِق): ئاخاوتنێكی رێكوپێك وا باش دامەزراو.
(ألنَسْق) (مص): دامەزراندن/ بەیەك پەیوەستكردن/ بەشیرازەبوون.
(حُروف النَسْق): پیتی پەیوەست.
(هذا نَسْقُ على هذا): ئەمە بەوەوە پەیوەستە.
(ألنَسَق): ئەوەی لەهەموو شتێكدا لەسەر شیرازەیەكبن و رێك دامەزرابن.
(جاءَ القَومُ وجاءَتِ الخَيلُ نَسَقاً): مرۆڤەكان و سوارەكان رێكوپێك/ لەسەر شیرازەیەك/ بەریزهاتن.
(غَرَستُ النَخلَ نَسَقاً): دارخورماكانم رێك و بەریز رواند.
(هذا دُرٌّ نَسَقٌ): ئەمە دورێكی رێك هۆنراوەیە.
(كَلامٌ نَسَقٌ): ئاخاوتنی بەسەر و بەرو رێك و باش دامەزراو.

(ثُغْرٌ نَسَقٌ): دەمو دانێکی رێکوپێك‌و سفت.
(حُروفُ النَسَـقِ = حُـروف العَطف): پیتە پەیوەستەکان.
(ألنَسِيق): رێکوپێك دامەزراو.
الملحق:
نَسق: (ألتنسيق): رێکوپێکردن‌و پەیوەستکردنی پارچەکانی هەرشتێك‌و دامەزراندنیان بۆ یەکخستن‌و سازاندنیان و گەیشتن بەئەنجامێکی باش ودیار/ لەبار کردنیان.
(تَنسيقُ أبحاث): رێکخستن‌و یەکخستن‌و پێکەو گرێدانی توێژینەوەکان.
(تَنسيق جُهود): رێکخستن و یەکسختن و پێکەوە گرێدانی کۆشش‌و رەنجەکان.
(تَنسيق العَلاقات بَينَ صاحِب العَمَل والعَمال): لەبارکردن و رێکخستن‌و شیرازەکردنی پەیوەندیی نێوان خاوەنکارەکەو کرێکارەکان.
(-تَنظيم الأعمال في مؤسَسَـةٍ أومَشروعٍ أو إدارَةٍ على نحو يَكفُلُ حُسْـنَ سَيرِها ويُحَقِّق الإنْسِـجامَ بَينَ مُخْتَلَـفِ المَصالِح والعاملين فيها): رێکخستنی کارەکان لەدامەزراوەیەك یان پرۆژەیەك یان بەرێوەبردنێکدا بەشێوەو بارێکی وا گونجاو کەببێتە هۆی باش بەرێوەچوون‌و کارتێداکردن و گونجاندن‌و یەکسختنی کەڵکە جیاجیاوکارکردنەکان تیایدا.
(ألتَنسيق في آلبديع): رێکخستن و سەروبەرکردن لەجوانکاریی رەوانبێژیدا ئەوەیە چەند نیشانەو ماکێك یەك لەدوای یەك بوترێت بێئەوەی پیتی پەیوەستیان لەنێواندا هەبێت. لەهەڵاندا یان لە داشۆریندا وەکو: (الغَفورُ الوَدُود ذو العَـرشِ المجيد فَعالٌ لِما يريد): خودا لێبوردوویەکی بەسۆزو خاوەن تەختی شکۆدار دەستداری هەموو شتێکە کە بیەوێت دەیکات. یان بۆ خراپ ناوهێنان وەکو (الفاجِر الفاسق اللَعِين السارِق): داوێنپیسی بەد رەفتار نەفرەتلێکراوی دز.

نسك: ١-(نَسَكَ - الرَجُلُ. نَسْكاً وَنِسْكاً وَنُسكاً وَنُسُوكاً وَنَسْكَةً وَمَنَسكاً): بۆخودا لێبڕا وازی لەخۆشیی دنیا هێناو خوداپەرستیکرد.
(-لِلّهِ): خۆی لەقایلبوونی خودا نزیککردەوە بەملکەچی و قوربانیدان و لەخۆشیی دنیا بڕان و خۆ پارێزیی.
(-الثَوبَ. نَسكاً): جلەکەیشت‌و پاکیکردەوە.
(-الى طَريقَـةٍ جَميلَـة): لەسەر رێبازێکی جوان‌و پوخت سەرومڕ بوو.
(-آلبَيتَ): هاتە خانووەکەوە.
(نَسُـكَ نَسـاكَةً): بوو بەلێبڕاوی خودا پەرستیی.
(تَنَسَّـكَ) خودا پەرستییکرد، بۆی لێبڕاو لەخۆشی دنیا دوورکەوتەوە/ خۆیکرد بەسۆفی.
(ألناسِـك) (فا) ج) نُسّـاك): لێبڕاوی خودا

پەرستیی و خۆپارێز و لەخۆشیی دنیابڕاو. (خـۆی بـۆ قایلبوونـی خـودا پاکڕاگـرت و لەهەمـوو گوناهێـك خـۆی پاراسـت وەك دارشتەیەك کە لەهەموو خەوش و پیسییەك پاکژ دەکرێتەوە).

(اَلنُسُك والنَسُك والنِسك): ١-خودا پەرستیی و گۆشەگیریی/ سۆفێتیی/ خۆ لەگوناهپارێزیی ٢-هەموو راست و مافێك بۆ خودای مەزن.

(اَلنَسْك): شوێنی پێراهاتوو و ناسراو.

(اَلنُسْك): ١-هەر خودا پەرستیەك و کارێك کە بۆخودابێت. ٢-قوربانیی لەرێی خودادا.

(اَلنُسُك): ١-خودا پەرستیی ٢-هەموو راستیەك و مافێك بۆ خوداو هـی خودایە ٣-ئەوەی کە بۆ خودا پەرسـتیی بێت و لەرێی خودادا بێت و لەدنیا گۆشەگیریی بێت ٤-قوربانیدان لەرێی خودادا ٥-دارشتەی زیو ٦-خوێن.

(مَن فَعَلَ کذا وکذا فَعَلَيهِ نُسُكٌ): هەرکەسێك ئەوەو ئەوە بکات دەبێت قوربانیی بکات.

(اَلنَسِيك): ١-زێڕ ٢-زیو.

(اَلنَسيكَة (ج) نَسـائِك): ١-دارشتەی زێڕ یان زیوو هیتر ٢-قوربانیی.

(اَلمَنْسَك (ج) مَناسِك): پەرستگا/ خەڵوەتگا/ شوێنی پێراهاتن ستارە تێدا گرتن.

(اَلمَنْسَـك والمَنسِك (ج) مَناسِـك): ١-رێڕەوو دەستووری خوداپەرستیی و بۆخودا لێبران.

٢-(النُسُـك نَفْسُـهُ): بۆخـودا لێبرانەکـەو خوداپەرستییەکە/ سۆفێتیەکەو لەدنیا بڕان ٣-شوێنی سەربڕینی قوربانیی ٤-خەڵوەتگا.

(مَناسِكُ الحَجّ): دەستوورەکانی حەجکردن و خودا پەرستیەکەی.

---

(اَلمَنسوك): (مفع) پاك و پاکژکراو.

(ثَوبٌ مَنسوك): بەرگێکی شۆراوی پاککراوە.

٢-(عُشْـبٌ ناسِـكٌ): گیایەکـی زۆر سـەوز کەلەسەوزیدا رەش بنوێنێت.

(أَرضٌ ناسِكَة): زەوییەکی سەوزی باران تازە لێباریو.

(فَـرَسٌ مَنسـوكَة): چارەوێیەکـی رووتـی لەشلووس.

نَسَـلَ: (نَسَـلَ - الصُوفَ أَوآلرِيش. نَسْلاً): خوریەکەی شیکردەوە یان پەڕەکەی وەراند.

(-الوَالَدَ وَبالوَلد): زارۆڵەیبوو/ فرزەندیخستەوە.

(-الرَجُلُ): منداڵی زۆری خستەوە.

(-الرِيـشُ أَوالصـوفُ نُسـولاً): پەڕەکە یان خوریەکە شیبووەوەو هەڵوەری.

(فِي مَشـيِهِ. نَسْـلاً وَنَسَلاً وَنَسَـلاناً): خێرا رۆیشت.

(أَنْسَـلَ الصُـوفَ أَوالرِيـشَ): خوریەکە یان پەڕەکەی هەڵوەراند.

(-آلصُـوفُ): خوریەکـە هەڵـوەری و پارچە پارچەبوو/ ڕێزال ڕێزاڵبوو.

(-الوَالِدُ الوُلَدَ): باوکەکە زارۆڵەی خسـتەوە/ کوڕی بوو.

(-تِ الدابَّـةُ): دەمی برینـــەوەی خوریی یان تووکی چواپێکە هات.
(_في عَـدْوِهِ): لەغارکردنەکـەدا یـان راکردنەکەدا گوڕیدایە خۆی.
(-القَومَ): پێش خوێشگەل کەوت.
(تَناسَلَ القَومُ): خوێشگەل وەچەیانخستەوە.
(-بَنوفُلان): فیسار بەرەوەچەیان زۆربوو.
(الناسِــل (فا) (ج) نُسَّــل): پەلەکار/ خێرا/ گورج چابووك/ ئازا.
(ألنَسْــل (مص) (ج) أنْسال): ١-بەدیهێنان ٢-خەلْك ٣-وەچە/ زارۆڵە / فرزەند و نەوە.
(ألنَسَل) (مص): ١-شیر کە لەخۆیەوە لەگوان بێتە دەرێ ٢-شیرەکە لە هەنجیری سەوز بێتە دەرێ.
(ألنُسال): خوری یان تووك لە کاتی برینەوەیدا هەڵوەرێت.
(ألنُســالَة): تاڵێــك خــوری یــان تــووك کە بوەرێت.
(ألنَسّال والنَسُول): لەراکردندا گورج/ خێرا.
(ألنَسُــولَة مِنَ المَواشــي): ١-چوارپێ کە بۆ زاوزێ تەرخاندەکرێــت/ بــۆ بەرهەمی بــاش ٢-ئاژەڵی بەبەر/ بەوەچە/ ئاژەڵێك بەر زۆربخاتەوەو بزێ.
(ألنَســيل): ١-خوریــی یــان پەڕ یــان مووی هەڵوەریــو کاتــی برینــەوەی ئاژەڵەکــە یان شــیکردنەوەی خوری و پەڕەکە ٢-هەنگوینی تەواوی لە شانە مێو دەرچوو.

(ألنَســيلَة)١- فرزەند/ زارۆڵە ٢-تاڵێك خوریی یان موو یــان پەڕ کە هەڵبوەرێــت ٣-پڵیتەی چــراو شــتیتر ٤-هەنگوینی تەواوی لە شــانە دەرچوو.
نسم: ١-(نَسَــمَ - تِ الريحُ. نَسْــماً ونَسِيماً وَنَسَماناً): شنەی باهەڵیکرد.
(نَسَمَ وَنَسِمَ- الشيءُ. نَسْماً وَنَسَماً)١- شتەکە گۆڕا.
(نَسُــمَ المَكانُ. نَسامَةً): شوێنەکە ئاو دزبوو/ بوو بە زۆنگ.
(نَسَّمَ النَسَمَةَ): زیندەوەرەکەی ژیاندەوە یان ئازادیکرد.
(-آلأَسيرَ): دیلەکەی بەرەڵاکرد/ بەردا.
(تَنَسَّــمَ- الرَجُــلُ): هەناســەی هەڵکێشــا/ هەناسەیدا/ هەوای هەڵمژی.
(-تِ الريحُ): باکە سرومیهات.
(-تِ المَــكانُ بِالطيــبِ): شــوێنەکە (لەبۆنی خۆش پربوو/ بۆنی خۆشبوو).
(-فُــلانٌ العِلــمَ أَو الخَبَرَ): فیســار کەمکەم زانست یان هەواڵی وەرگرت و دەستگیربوو.
(تَنَسَّــمتُ مِنــهُ عِلمــاً): زانســتم لــەوەوە وەرگرت.
(-آلريــحَ): خۆیدایــە بــەر شــنەی باکــەو هەڵیمژی.
(-آلوَلَدُ): کۆرپەلەکە لەشــی تەواو پێکهاتو گیانی بەبەرداکرا/ بوو بە مرۆڤ.

(اَلناسِــم) (فــا): نەخۆشــێك كەخەریكــی مردبێت.
(اَلنَسَــم) (مــص) (ج) أنســام): ١ـهەناســە وەرگرتن ٢ـهەناســەدان ٣ـ(سروە/ شنە)ی با ٤ـلووت ٥ـكۆی مرۆڤان ٦ـبۆنی شــیرو ماستو رۆن.
(اَلنَسْــمَة): ئەرەقكردنەوە لــە حەمامدا یان لەشوێنانیتردا/ ئاودەردان.
(اَلنَسَــمَةُ (طــب) = الرَبــو): ســنگەبڕێ/ هەناسەسواری.
(أصابَتْهُ نَسَــمَةٌ): تووشــی ســنگە بڕێبوو/ هەناسەسوار بوو.
(اَلنَسَــمَةُ (ج) نَسَــم وَنَسَــمات): ١ـهەناسە ٢ـمــرۆڤ و هەمــوو گیانلەبەرێــك ٣ـكۆیلە نێربێت یان مێ.
(اَلنَسِیم (مص) نِسام): ١ـئارەق/ خوەی ٢ـگیان ٣ـ(شنە/ سروە)ی با كە نەدار بجووڵێنێتەوەو نەكاریگەری هەبێت.
(هُــوَ ثَقیــل الظِــلّ بــارد النَســیم): ئەو سێبەرەكەی بەســەرەوە گرانەو سروەكەیشی ساردو سڕە، واتا ئێسك قورسە.
(اَلنَیسَم): هەناسە.
(اَلأناسِم): خەڵكی (ئەمە كۆی وشەی (أنسام) وكۆی (النَسَم).
(ما في الأناسِم مِثْلُهُ): لەناو خەڵكانا لەوێنەی نییە.

٢ـ(نَسَــمَ - البَعــيرُ الأَرضَ بِخُفِّهِ. نَسْــماً): حوشــترەكە ســمی كێشــا بــە زەویەكــەداو چاڵیكرد/ كاری تێكرد.
(نَسِمَ - البَعيرُ. نَسَماً): كەناری نووكی/ سمی حوشترەكە كونبوو.
(اَلنَسَم): ڕێی كۆن و كوژاوە.
(اَلنَیسَم): ڕیگەی كوژاوە.
(اَلمَنسِم (ج) مَناسِــم لِلإِبلِ): ١ـنووكی سمی حوشــترو وشــتر مرخ كەوەكو نینۆكی مرۆڤە ٢ـنیشــانە ٣ـڕێگە ٤ـڕێڕەو رووی نیاز/ رووی بۆچوون.
(إلى أَیــنَ مَنسِــمُكَ): روو دەكەیتە كوێ/ بۆ كوێ دەچیت.
٣ـ(نَسَّمَ - فِي الأَمرِ): دەستی بە كارەكەكرد.
(ناسَــمَ - هُ. مُناسَمَةً ونِســاماً): ١ـلێیچــووە پێشــەوە/ لێینزیكبــووەوە ٢ـلەگەڵیــدا دواو نهێنیان بەیەك گۆڕییەوە.
٤ـ(تَنَسَّــمَ - الجَمــرُ): پشــكۆ كــە گــڕی لێبەرزبووەوە.
نسو: (نَسا - الرَجُلُ یَنسو. نَسْوَةً): كارەكەی بەجێهێشت.
(أَنْســی - هُ الشيءَ إِنْسَــاءً): فەرمانیدایە كە شتەكە بەجێبهێڵێت.
(اَلنَسا (ج) أَنساء) (اع): دەمارێكە لەكوڵۆتەوە بۆ پاژنەی پێ.
نَسَوان وَنَسَیان: دوان لەودەمارە.

(اَلنَسْوَةُ) (مص): قومه شيريك.
(اَلنِسْوَةُ والنُسْوَةُ وَالنِساءُ والنِسوان والنِسُون والنِسْـنِين): ژنان/ ئافرەتان (کۆکەی لەگەڵ لفظ = بێژەکەی نییە).
(نِسْـوِيُّ وَنُسْـوِيُّ): ژنانـه/ خانمانـه/ ئافرەتانه.
(نُسَـيَةُ): بچووککردنەوەی ژنان دەیشوتریّت
(نُسَيَّات): خانمۆکه.
(اَلْنَسو): ئەوەی دەماری کوڵۆتی تووشبووبێت.
نسي:١-(نَسِيَ. يَنسى نسىً): هاواری دەماری کۆڵۆتیکـرد کەلەکوڵۆتیەوە بـۆ پاژنەی پێی درێژ دەبێتەوە.
(نَس وأنسى (م) نَسِيَة وَنَسياء): تووشبووی دەردە لاق/ دەماری کلۆت.
(نَسى - الرَجُلَ. يَنْسِي نَسياً): کێشای بەرەگی کەژۆکەکەیدا/ دەماری کلۆتیا.
(اَلأَنسـى) (ع ا): دەمارێکـه لەخـوارەوەی لاقدایه.
(اَلْمَنْسِيّ): ئەوەی دەماری لاقی ئازاریهەبێت و دەردیگرتبێت.
٢-(نَسِـيَ - الشيءَ. يَنْسـى. نَسْـياً وَنِسْاناً وَنِسَـايَةً وَنَسْوَةً): شـتەکەی لەبیرچووەوە/ فەرامۆشکرد/ لەیادچوو.
(النسيان): لەبیرچوونەوه.
(نَسَّـى وأنسـى- الرَجُلَ الشـيءَ): شتەکەی لەبیر پیاوەکه بردەوە/ لەیادیبردەوه.

(تَناسـى - الشـيءَ): خـۆی واپیشـاندا کە شتەکەی لەبیرچۆتەوه.
(اَلنَسْـي والنِسْي (ج) أنْساء): ١-شتە لەبیرەوە چووەکه ٢-ئەو شرکەوپرکەیەی کۆچەریەکان لەپاش خۆیان بەجێیدەهێڵن.
(اَلنَسْيان والنَسَّـاء): بیرکۆڵ/ بیر خراپ/ کە شتی زۆر لەبیر دەچێتەوه.
(اَلنَسِـي): ١-بیرکۆڵ/ بیرخراپ ٢-کەسێکە کە لەلایەن خوێشگەلەکەیەوە فەرامۆشکرابێت و بەلەخۆیانی دانەنێن.
(اَلْمَنْسِيّ) (مفع): فەرامۆشکراو/ لەبیرەوەچوو.
٣-(اَلْمَنْساة): داردەست (لەبنچینەدا (اَلْمِنْسَأَة) بووه).
نشّ:١-(نَشَّ - النبيذُ نَشّاً وَنَشيشاً): مەیەکە هاتەکوڵ/ جۆشیسەند.
(-المـاءُ في الكـوزِ الجديد): ئاوەکـه لەگۆزە تازەکەدا کزە کزیهات.
(-اللَّحْـمُ): گۆشـتەکە لەمەنجەڵەکـەدا یان تاوەکەدا چزە چزیهات.
(اَلنَشـيش) (مص): قوڵپە قوڵپی ئاوی کوڵاو یان شتیتری کوڵاو.
٢-(نَشَّ- المِسْـكَ ونَحْوَهُ نَشّـاً): مسکەکەیان شتیتری وەهای کوتا/ وردکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی تێکهەڵدا/ تێکەڵکرد.
٣-(نَشَّ- الدابَّةَ. نَشّـا): چوارپێکانی هێواش لێخوری.

(اَلمَنَشَّــةَ): مێشــپێدەرکەر، ئەوەی مێشــکی پێدەردەکرێت.

٤-(نَــشَّ- الغَديــرُ. نَشّــاً. وَنَشيشــاً):ئاوی جۆگەکە روو لە وشکبوونبوو.

(-الرطبُ): فەریکە خورماکە وشکبووەوە.

(-اللَحْمَةُ): گۆشتەکە ئاوی چکاند/ تکاند.

(نَشّــی الإناءُ) (عاميــة): دەفرەکە ئاوەکەی دەلآند یان شتەکەی دەلآند.

(النَــشُّ) (عند العامــة): تەربوونــی دیوار بەهۆی بارانەوە.

(اَلنَشّــاش):١-زۆر ئــاودز، چاکدەڵێن ٢-کاغەزی مەرەکەب هەڵچن کە نووسینەکە وشکدەکاتەوە.

(أَرضٌ نَشّاشَــةٌ): زەوییەکی هەمیشە تەڕ کە هیچی تێدا ناروێت/ زۆنگ.

(أَرضٌ نَشيشَــةٌ): زەویی شۆرەکات کە هیچی تێدا ناروێت.

٥-(اَلنَشُّ): نیوەی هەموو شتێك.

٦-(نَشنَشَ-تِ القِدرُ): مەنجەڵەکە قوڵپەقوڵپیکرد.

(-آلشَيءَ): شتەکەی پاڵ پێوەنا و توند هێنای و بردی/ جووڵاندی.

(-الثَــورَ): گاکــەی دایە پێــش و دەریکرد/ راوینا.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە لەکارەکەیدا دەستوبردی کرد/ خێرایکرد.

(تَنَشنَشَ):١-هاتە قوڵپ ٢-پاڵپێوەنرا ٣-لێخوڕراو راونرا. ٤-ژیایەوە/ بەخۆیدا هاتەوە/ بووژایەوە.

(-المَريضُ (عامية): نەخۆشــەکە ســەرەتای خۆشبوونەوەی بوو (عاميە).

(اَلنَشنَشَــةُ) (مص): خشــەی زرێو کاغەزو ورشەی جلی تازەو جیڕەی پێڵاو دەنگی شتیتر کەتازەبێت.

(اَلنَشناش والنَشْنَش و النَشنَشِيّ):سووکەڵەو چابووك لەکارو هەڵسوکەوتدا.

٧-(نَشنَشَ-الجلدَ نَشنَشَةً): پێستەکەی خێرا داماڵی.

(-الثوبَ): جلەکەی داکەند.

(-الوعاءَ): قاپەکەی رۆکردو شــتەکەی ناوی بڵاوکردەوە.

(-آللَحْمَ): خێرا گۆشتەکەیخوارد.

(السَلْبَ): تالآنییەکەی برد.

(تَنَشــنَش- الشَــجَرَ): توێکڵــی لــە دارەکە کردەوەو بردی.

(أَرضٌ نَشْنَاشَــةُ): زەوییەکــی شــۆرەکات کەهیچی تێدا ناروێت.

(نَشأ: نَشأً وَنَشُوَ- الطِفلُ نَشْأً ونُشُوءاً وَنَشْأَةً ونَشــاءاً وَنَشــاءَةً): منداڵەکــە پێگەیشــت/ گەورەبوو وایلێهات بیربکاتەوە.

(نَشَــأْتُ فِي بَنی فلان): لەناو فیســار بەرەدا پــەروەردە بــووەو بــووم بــە هــەرزەکار/ پێگەیشتم.

(اَلنُشئ): پەروەردە بوون/ پێگەیشتن.

(نَشَأَتِ السَحابَةُ): هەورەکە بەرزبووەوە.

(-الشـــيءُ): شـــتەكە پەيدابـــوو تازەبووەوەو گەشەيكرد.
(نَشَّأَ-ەُ تَنشِأَةً): پەروەردەيكرد/ بەخێويكرد و پێيگەياند.
(-اللهُ السَحابَةَ): خودا هەورەكەی بەرزكردەوە.
(أَنْشَأَ-ەُ إِنشاءً): پەروەردەيكردو پێيگەياند.
(-الشيءَ): شـــتەكەی بەديهێنا/ پەيدايكرد/ دروستيكرد.
(-اللهُ الشيءَ): خودا شتەكەی بەديیهێنا.
(-اللهُ الخَلْـقَ): خودا بوونـــەوەری يەكەمجار بەديیهێناو دروستيكرد.
(-الحَديثَ أَوالـــكَلامَ): ئاخاوتنەكەی داهێنا/ داناو دارشت.
(عِلم الأَنشاء): زانستيی نووسينی دارشتن.
(-اللهُ السحابَةَ): خودا هەورەكەی بەرزكردەوە/ هەڵبڕی.
(-زَيْدٌ): زەيد هۆنـــراوەی دانا يان وتارێكيدا تيايانا سەركەوتوو بوو.
(-فُلانٌ داراً): فيســـار دەســـتی بەدروستكردنی خانوويەك كرد.
(-فُلانٌ يَضرِبُ): فيسار دەستی بەلێدانكرد.
(-مِنَ المَكان): لەشوێنەكە دەرچوو.
(مِن أَينَ أَنْشَأْتَ): لەكوێوە دەرچوويت.
(تَنَشَّـــأَ- إِلى حاجَتِهِ. تَنَشُّؤاً): بۆئەنجامدانی كارەكەی راپەری و رۆيشت.
(إِسْتَنْشَـــأَ- فُلاناً قَصيـــدَةً أَوخُطْبَةً): داوای لە فيســـاركرد كـــە هۆنراوەيەك يـــان وتارێك دانێت/ دارێژێت.
(-العَلَـــمَ فِي المَفـــازَةِ): بەيداخـــی لەبيابانـــە وشكەكەدا هەڵكردو چەقاند.
(-الأَخبـــارَ): شـــوێن هەواڵـــەكان كـــەوت و بۆيانگەڕا/ عەوداڵبوو.
(أَلناشِئ (فا) (ج) نَشْئٌ وَنَشَأٌ وناشِئَةٌ): (لەسەر دەســـتوور نييە) مێرد منداڵ يان كەنيزەك/ كچ)ی هەرزەكار/ گەنج/ نەوجوان.
(-(ج) نَواشِـــئ): ١-هەرچـــی بەشـــەو رووبدا بێت ودەســـتی پێكردبێت ٢-ســـەرەتای رۆژ ٣-سەرەتای شەو.
(أَلناشِئَةُ (ج) نَواشِئ): ١-مێی وشەی (الناشِئ) ١-كەنيـــی/ كـــچ كەتـــازە هەڵبـــدات/ گەنـــج ٢-بەئاگاهاتن پاش نوستنێك.
(النـــشْء (مص)) (ج) نَشَـــأٌ): نەوە/ وەجاخ وەچە. وەچە خستنەوە.
(هُوَ نَشْءُ ســـوءٍ - أَوَمَن نشـــيءِ سوءٍ): ئەو وەچەيەكـــی خراپە يـــان لەنەوەيەكی خراپ كەوتۆتەوە.
(أَلناشِـــئ (ج) النَشْء): ١-حوشـــتری بچووك ٢-هـــەوری بەرز يـــان هەوری تـــازە پەيدابوو وسەركەوتوو.
(أَلنَشْأَةُ): گيای تازە دەرهاتوو كە هێشتا خۆی نەگرتێت و ئەستوور نەبووبێت.
(أَلنَشيء): هەوری تازە پەيدابوو.

(اَلنَشيئَةُ): ١-كچى هەرزەكار ٢-گيايەك كە تازە دەرهاتبێت وسـەركەوتبێت بەڵام لاسكەكەى ئەستوور نەبووبێتو خۆى باش نەگرتبێت.

(اَلمَنْشَأ)١-شـوێنى بەديهاتن و پەروەردەبوون ٢-سەرچاوەو جێى گەشەكردن.

(مولِدى وَمَنشـئي في بنى فلان): شـوێنى لەدايكبوون و پـەروەردەو گەورەبوونم لەناو فيسار بەرەدابوو.

(اَلمُنْشَـأُ وَالمُسْتَنْشَـأُ): بەيـداخ و بـەردى دياريكردنى رێگا.

الملحق:

نشـأ: (اَلنُشُـوء): سـەرەتاى پەيدابـوونو دەركەوتن/ رووداو.

(نشـوء الأُمَـم): پەيدابـوونو دەركەوتنى نەتەوەكان.

(نَشَـأَ نُشُـوءً ذاتِيّـاً): خـۆى لەخۆيـەوە پەيدابووە.

(نَظَرِيَّـة النُشـوء والإرتقـاء أَو التَرَقّـى): بـيردۆزى بەديهاتـن/ پەيدابـوونو پلە پلە گـۆڕانو گەشـەكردن/ سـەركەوتن و چاكتر بوون.

(الانْشاء): ١-داهێنان/ پێكهێنان/ دامەزراندن.

(إِنشـاء وظيفَـة): داهێنانـى كارێك ٢-التَأْسـيس والايجاد): دامەزراندن، بنچينە دانان و پێكەوەنان.

(إِنْشَـاء جيش): پێكەوەنـان و دامەزراندنى سوپايەك.

(إِنْشـاء جَريدَه): پێكەوەنان‌و دامەزراندنى رۆژنامەيەك.

(اَلإنشـاء): دارِشـتن. (طريقه تَأْدِيَة المعانى بِألفـاظِ فيها صَنعَةُ فَـن الكتابَة): هونەرى دارِشـتنى نووسـينێك داهێنانى رێگايەكە بۆ ئەوەى وشـەكان واتايەكى وەها بەدەسـتەوە بدەن كەجوانكاريى تێدابێت.

(فَن الكِتابَة): هونەرى نووسين.

(فُنون الإنشاء): هونەرى دارِشتن.

(إِنْشاءٌ مُسَـجَّع): دارِشتنێكى شـێوە شيعر/ سەروادار.

(الإنشاء): مادة في التَعليم بِأَن يكتب التلميذَ مقالَـةً في موضوعٍ مِنَ المَواضيع): دارِشـتن بابەتێكـى فێركارييـە تيايـدا فێركارەكـە/ قوتابييەكـە وتارێـك دەربـارەى بابەتێـك بنووسێت.

(مسابَقَة في الإنشاء): پێشبڕكێ لە دارِشتندا.

(عِلْـمُ الإنشـاء): زانسـتيى دارِشـتن. زانسـتێكە بەهۆيەوە دەزانيت چۆن وشەكان هەڵدەبژێريـتو بەكاريـان دەهێنيـت و وبەرستەو دەربڕەيەكى وەها دايانددەمەزرێنيت كە بگونجێت لەگەڵ پێويستيى بارەكەدا.

(الإنشـاء في عِلم الأَدب): دارِشتن لە زانستيى وێـژەدا ئـەو وتارەيـە كە نەدرۆو نەراسـت هەڵناگرێت پێچەوانەكەيشى هەواڵدانە وەكو بڵێيت: خودا لێى خۆشبێت.

(اَلإِنْشَــاءات): دامەزراوەکان. ناوێکی گشتییە بــۆ هەمــوو ســازکراوەکان‌و دامــەزراوەکان و ئامادەکــراوەکان بــۆ هــەر ئامانجێــك کە کەپێویستبێت.

(إِنْشَاءات عَسكَرِيَّة): دامەزراوە سەربازییەکان.

(إِنْشَاءات كَهْرُبائِيَّة): دامەزراوە کارەباییەکان/ دەستگا کارەباییەکان.

(اَلْمُنْشِئ): ١-دامەزرێنەر، پەیداکەر ٢-نووسەر کــە دەزانێــت چــۆن واتــاکان هەڵچنێــت و یەکیانبخات بەئاخاوتنێکی رەوان دەریانببرێت بەبێژەیەك داهێنانی تێدابێت.

(اَلْمُنْشَأَة (ج) مُنْشَآت): کارگە، شوێنی کارکردن یان پیشەســازیی یان کارگەکە مەکینەی تێدا دادەمەزرێنرێت‌و کرێکاری تێدا کاردەکات.

---

نشب:١-(نَشِــبَ- الشَّــيءُ فِي الشَّــيءِ. نَشَــباً ونُشُوباً وَنُشْــبَةً): شتەکە بەشــتەکەیترەوە ئالا/ پێوەنووسا/ پێدا هەڵزنا/ چنگی لەویتر گیر کرد.

(-العَظمُ فِي حَلقِهِ): ئێســقانەکە لەگەرووی گیرا.

(نَشِبَ فُلانٌ مَنْشَب سوءٍ): فیسار بەشێوەیەك گرفتاربووە کە دەربازبونی نەبێت.

(مانَشِــبْتُ أَفْعَلُ كذا): تووشــی ئەوەنەبووم ئەو کارەبکەم/ ناچاری کردنی نەبووم.

(لَــم يَنشَــبْ أَن مــات): زۆری نەخایانــد کەمرد.

(-تِ الحَربُ بَين القَومِ نُشُوباً): شەڕ لەنێوان خوێشگەلدا (بەرپابوو/ قەوما).

(-الأَمرُ فُلاناً): کارەکە لەفیسارەوە گلا.

(-فيه): شتەکەیگرى.

(نَشَّــبَ -ه فِي كَــذا): بــەوەوە گرفتــارو دووچاریکرد.

(ناشَبَ-هُ الحَربَ. مُناشَبَةً): جەنگی لەروودا بەرپاکردو ئاشکراکرد.

(أَنْشَبَ- هُ فِي كذا): لەوەوەی گلاندو ئالاند.

(أَنْشَــبَ البازى مَخالِبَهُ فِي الأَخيذَةِ): بازەکە چنگی لەنێچیرەکە گیرکرد.

(-الصائِدُ): راوکەرەکە نێچیرەکەی بە داوەوە کرد.

(تَنَشَّبَ - فيه): پێوەیبوو/ تێیچەقی.

(تَنَشَّــبَ فِي قَلْبِهِ حُبُّ فُلان): خۆشەویستی فیسار ئالایە دڵی/ چەقیە دڵیەوە.

(تَناشَبوا): بەیەکەوە بەستران‌و یەکتریانگرت‌و هاوکاریی یەکتریانکرد.

(تَناشَــبوا حــولَ الرَّســولِ): دەوروپشــتی پێغەمبەریانگرت و پشتیانگرت.

(إِنْتَشَــبَ - فيــه): تێیچەقــی/ پێــوەی (پەیوەندبوو/ بەندبوو).

(-الحَطَبَ): داری کۆکردەوە.

(اَلناشِب) (فا):١-پێوەی لکاو ٢-چنگلێگیرکەری شتێك ٣-تیردارو تیرهاوێژ.

(الناشِــبَة): ١-مێی وشــەی (الناشِب): ٢-تیر هاوێژەکان.

(ألنَشَــب) (ن): درەختێکــە کــە لەلقەکانی کەوان دروستدەکەن.

(النشِب) پێوەبەند/ پێوەهەڵواسراو.

(ألأنَشِــب): ١-ئاوێتــە بــوو ٢-پەیوەندیــدار ٣-چنگگیرکەر ٤-پێوەلکاو و گرفتار.

(ألنُشْــبَة (مص) والنُشَــبَة): کەســێکە کە بەکارێکەوە ئالاو رزگاربوونی لێنەبێت.

(نُشبَة): گورگ.

(ألنَشَّاب): ١-چنگهاوێژی چاك ٢-چاك خۆلکێن ٣-خــاوەن تیرێکی زۆر ٤-تیرهاوێژێکی چاك ٥-زۆر تووشبوو و گرفتار.

(رَجُلٌ نَشَّاب): پیاوێکی تیر هاوێژی دەستڕاست.

(قَــومٌ نَشّــابَة): خوێنشــگەلێکی تیرهاوێژی دەستڕاست.

(ألنُشَّاب): تیر.

(ألنُشَّابَة): تیرێك (ج) نَشاشیب): تیرەکان.

(ألمَنْشَب): تیرگە.

(بُرْدٌ مُنَشَّــبٌ): ســەر بەرگێك کــە نیگاری لەشێوەی تیری تێدابێت.

٢-(ألنَشَبَ والنَشَــبَةُ): ١-خانوو بەرە ٢-ماڵ و ســامانی بێگیان و گیانــدار واتا ئاژەڵ و ولاخ و حوشتر.

نشــج: (نَشَــجَ - الباكي نَشْــجاً وَنَشِــيجاً): گریاوەکە بەبێدەنگ گریاو هەنسکی هەڵدا.

(تِ القِدرُ): مەنجەڵەکــە هاتە کوڵ و کەوتە قوڵپە قوڵپ.

(-آلضِفدَعُ): بۆقەکە کەوتە قیڕە قیڕ.

(-المُطربُ): گۆرانیبێژەکە دوو دەنگی جیای دەرکردو دەنگی لێهەڵبڕی.

(ألنَشَج (ج) أَنشاج): ئاوەڕۆ.

(عَبْــرَةٌ نُشُــجٌ): فرمێســکێك و گریانێکــی بەدەنگ و سۆزەوە/ پڕمەی گریان.

(ألنَشيج) (مص): ١-پڕمەی گریان و هەنسك ٢-ئاوازو دەنگ.

نشــح: (نَشَــحَ- الرَجُلُ نَشْــحاً وَنُشــوحاً): ١-ئاوی خواردەوەوە تینوێتیی نەشکا ٢-هێندەی خواردەوە تاسکی هەڵاوساو پڕ بوو.

(ألنَشّاح - مِنَ الآنِيَة): قاپی پڕی لێوانلێو.

(ألنَشُوح): کەمەکە ئاوێك/ جۆرە ئاوێك.

(نَشُوح (ج) نُشُح): سەرخۆش.

(نَشَــدَ - الضالَّةَ نَشْــداً وَنِشْــداناً وَنِشدَةً): هەواڵــی لێونبووەکەی پرســی و بــۆی گەڕا، سۆراغی لەم و لەوکرد.

(-الضالَّةَ): ناوونیشانی ونبووەکەی هەڵدا.

(-فُلاناً): فیساری باش ناسی و ناسییەوە.

(-هُ اللّهَ وَباللّهِ): بەخودا سوێندیدا و پرسیاری لێکرد.

(-الرَجُــلَ نَشْــداً): بەپیاوەکــەی وت بەخوا سوێندت دەدەم.

(نَشَدْتُكَ اللّهَ إلاّ فَعَلْت): بەخودا سوێندتدەدەم کە ئەنجامی کارەکە بدەیت.

(نَشَدَهُ عَهْدَهُ أَو وَعْدَهُ): پەیمان و بەڵێنەکەی

(اَلنَّعائِــم) (فك): هەوارێکــە لە هەوارەکانی مانــگو وێنــەی وەك وێنەی وشــتر مرخەو هەشت ئەستێرەیە.

(اَلإنْعــام): ( چاوگــی وشــەی (أَنْعَــمَ) یــە ((ج) إِنْعَامَــات): چاکەکــردن و خێرکــردن ٢-بەخشش/ خەلات/ ئەوەی کە دەیبەخشیت.

(اَلإنعامَة): ئەوەی دەبەخشــرێت/ بەخشش خەلات.

(اَلنُعُومَة) (مص): نەرم و نۆڵیی/ نیاینی.

(اَلنَعِیم)١- خۆشــگوزەرانیی ٢-ئاســوودەیی دڵ/ دڵنیایی و ئارامی/ خۆشیی ٣-دارا/ سامان/ ماڵ.

(رَجلٌ نَعیــمُ آلبَال): پیاوێکی دڵئاســوودەو سەر رەحەت/ بێمەراق.

(سَــأفْعَلُه نَعیمَ العَین): لەبەر خاترو چاوی ئەو ئەوکارە دەکەم.

(نَعیمُ الله): خەلات و بەخششی خودا.

(اَلمِنْعَام): خاوەت چاکەو بەخشش/ جوامێر/ دڵفراوان.

(اَلمِنْعَم): کەسك.

(اَلمَناعِــم. وَالمُتَناعِــم- مِنَ النَبــات): گیاو رووەکی راستو رێکهەڵچوو.

(اَلمُناعَم وَالمُتَناعِم وآلمُتَنَعّم): ١-خۆشگوزەران ٢-تێــرو تەســەل و بەناز ٣-ســاماندار/ دارا/ دەوڵەمەند/ بووە.

(اَلمُنعَّم = اَلمُتَنَعّم): خودا پێداو/ کەســێکە لە ناو خۆشیو بووندا بێت/ دارا/ بووە.

(کَلامٌ مُنَعَّــم): قســەی (نــەرم و خــۆش/ هێمنانەو دۆستانە).

٢-(نَعَمْ. نَعِــمْ وَنِعِمْ وَنَعَام وَنَحَمْ): وشــەی وەلامە: بەڵێ: ئا/ ئەرێ/ بەڵێ وایە.

(قامَ زیدٌ): بەڵێ/ ئەرێ وایە هەستا ٢-ئەگەر پاش فەرمانو یان ئەهێشــتنی کردنی کارێك بوو ئەوە واتای بەڵێنە.

(إِضْــرِبْ زَیْداً): لەزەید بــدە: بەڵێ بەڵێنت دەدەمێ لێیدەدەم ٣-ئەگەر لەپاش پرسیاربوو ئەوە (بەڵێ) بۆ ئاگاداری و هەواڵدانە.

(أَقامَ زَیْدٌ): زەید هەستاوە؟. بەڵێ/ ئەرێ/ ئا هەستاوە ٤-ئەگەر (نَعَم): کەوتە پێش رستەو پێش قسەکەوە ئەوە بۆجەختکردنە.

(نَعَــمْ إنَّ رَبّــي قــادِرٌ): بەڵێ خــودای من بەتوانایە/ بەدەسەڵاتە.

(اَلنَعَامَة): ١-تاریکی ٢-تاوێری سەختی نالەبار و دەرپەڕیو لەچاڵاودا.

نعو: (نَعا - السِــنَّورُ یَنعُو نُعاءً): پشــیلەکە گوربەکە میاواندی.

(اَلنَعو)١- چاڵــی ژێــر لــووت ٢-قلێشــی لچی ســەرەوەی حوشــتر ٣-قلێشی پشــتەوەی سم ٤-فەریکە خورما.

نعــي: (نَعِی - لَنا وإلَینا فُلانــاً یَنعی. نَعْیاً وَنَعِیَّــاً وَنُعْیاناً): هەواڵی مردنی فیســاری پێراگەیاندین.

(نَعاهُ بِمَوتِ فُلان): مردنی فیساری پێراگەیاند.

(-القَومَ): خوێشگەل بانگکرد کە مردووەکەی بۆ بشارنەوە.
(نَعيتُهُ- الشيءَ) هەواڵی شتەکەم پێگەیاند.
(-على القوم شَهَواتهم): سەرزەنشتی ئارەزووە بەرەڵاکانی خوێشگەلیکرد.
(هُــوَ يُنعى علــى فــلانٍ ذُ نوبَــهُ): گوناه و بەدرەفتارییەکانــی فیســار (دەردەخــات و جاردەدات/ بڵاودەکاتەوەوە).
(فُلان يَنعى فُلاناً): فیســار بــەدوای تۆڵەدا دەگەرێت کە لە فیسارکەسی بکاتەوە.
(فلانٌ يَنعى على نَفسِهِ بالفَواحِش): فیسار بەدرەوشتیی و شەرواڵپیسیی خۆی دەردەخات و بلاویدەکاتەوە.
(أنعى عليه شــيئاً قَبيحاً): سەرزەنشــتێکی ناشیرینیکرد/ قسەیەکی ناشیرینی پێووت.
(أنْعَيْتُــهُ- الشــيءَ): شــتەکەم پێراگەیاند/ شتەکەم پێووت.
(تَناعــى - القَــومُ): خوێشــگەل بۆهانــدان و تۆڵەســەندنی کوژراوەکانیــان گریــەو هاواریانکــرد/ بــۆ تیژکردنی یەکــترو تۆڵە سەندنەوە ئەومیانکرد.
(إسْــتَنعى - القَــومُ): ١-بــۆ تۆڵەســەندنی کوژراوەکانیان کەوتنە شین و هاواری هاندانی یەکتری ٢-بلاوەیان لێکردو جیابوونەوە.
(إسْــتَنعى ذِكرُ فلانٍ): ناوی فیسار لەهەموو لایەك بڵاوبووەوە.

(-الشَــرُّ بِفُلانٍ): خراپەو بــەدکاری یەك لە دوای یەك لە فیسارەوە ئالا.
(-الراعــي الغَنَمَ): شــوانەکە پێش مەرەکان کەوت و بانگی لێکردن کە دوایکەون.
(-حُبُّ الخَمرِ بِــهِ): حەزی مەی خواردنەوە تێومیگلاو کردی بە پیشە.
(ألناعــي (فا) (ج) ناعُون وَنُعــاة وَنُعيان): ١-کەســێکە هەواڵــی مــردوو بگەیەنێــت ٢-سەرزەنشتکارو تەشەرلێدەر تیرو توانجهاوێژ.
(نَعاءِ فُلاناً): هەواڵی مردنی فیسار بگەیەنە/ بدەو ئاشکرایکە.
(ألنُعْيَةُ): (ج) نَعَيات): جارێك هەواڵی مردن گەیاندن.
(نَعْــوَة) (عامية): هەواڵــی مردن گەیاندن و بڵاوکردنەوەی.
(ألنَعِيّ (مص) = الناعي)١- هەواڵی مردنگەیەن و بڵاوکەرەوەی هەواڵەکە ٢-سەرزەنشــتکەرو تیرو توانج هاوێژ.
(ألمَنعى والمَنعاة (ج) مَناعٍ): هەواڵی مردن.
نغب: (نَغَبَ الريقَ. نَغْباً): تفەکەی قووتدا.
(-الرَجُلُ في الشُرب): بەقومە قوم خواردیەوە.
(-الطائــرُ): باڵندەکــە بەدەنــووك ئاوەکەی خواردەوە.
(النَغبَة (ج) نُغَبَ): قوم، قومێك.
(ألنُغْبَةُ): کاری زشت/ بەدکاریی.
(-(ج) نُغَب)= النَغبَة: قوم/ قومێك.

(نغــت: نَغَــتَ - الشَــعَرَ. نَغْتــاً): قژەکەی ڕاکێشا.
(نغث: (ألنَغَث): خراپەی هەمیشەیی سەخت.
نغر:١-(نَغَــرَ-تِ القِــدرُ. نَغــيراً ونَغَراناً): مەنجەڵەکــە قوڵپەقوڵپی کــردو هاتە کوڵ/ هاتە جۆش.
(-الرَجُلُ على فُلان. نَغَراً وَنَغَراناً): پیاوەکە ڕقی لە فیسار هەستاو دڵی لێپڕبوو.
(نَغَرَ عليهِ جَوفُهُ): دڵی لێپڕبوو.
(نَغر (م) نَغِرَة): دڵ پڕ لە ڕق.
(نَغَرَ- الناقَةَ): دەنگی لە هوشترەکە کرد.
(نَغِرَ-تِ القِدرُ. نَغِيراً وَنَغَراناً): مەنجەڵەکە هاتە کوڵ/ هاتە جۆش/ قوڵپەقوڵپ.
(-الرَجُلُ على فُلان. نَغَراً وَنَغَراناً): ڕقی لە فیسار هەستاو دڵی لێپڕبوو.
(-الناقَةَ): دەنگی لەهێحوشترەکە کرد.
(-الرَجُلُ. نَغَراً): پیاوەکە قینلەدڵبوو.
(نَغَّرَ- بالناقَةِ): دەنگی لە حوشترەکە کرد.
(-الصَبِيَّ): ختولکەی منداڵەکەیدا.
(تَنَغَّر- الرَجُلُ): پیاوەکە ڕقیی زۆر هەستاو دڵی پڕ لە قینبوو.
(-علــى فُــلان): لەفیســار هەڵگەڕایەوە یان بێزاریــی بەرامبــەر دەربــڕی/ بۆڵەبۆڵــی بەسەرداکرد و ناقایلیی پیشاندا.
(تَناغَــرَ- الرَجُلُ): پیاوەکــە هەڵگەڕایەوەو دوژمنکارییکرد.

(ألنَغَر) (مص): ١-ڕقهەســتان ٢-هاتنە جۆش ٣-سەرچاوەی/ کانی ئاوی سوێر.
(ألنُغَــر (ج) نِغران) (ح): ١-بولبول ٢-بەچکە چۆلەکە.
(ألنَغَّار): زۆر جۆشسەندوو/ گەرمەکوڵ/ زۆر قینلەدڵ.
(جَرحٌ نَغَّار): برینێك کە خوێنی زۆر لەبەر بڕوات.
٢-(نَغِــرَ- مِنَ الماءِ. نَغَــراً. نَغَــراً): ئاوی زۆر گرت/ زۆرکرد/ ئاوەکەی زۆرکرد.
٣-(أنْغَرَ-تِ البَيضَةُ): هێلکەکە پیسبوو.
نغــز: (نَغَــزَ- الصَبِــيَّ. نَغْــزاً): ختووکەی منداڵەکەیدا.
(-بَــينَ القَومِ): خوێشــکەلی لەیــەك بەرداو لەیەکی هاندان.
(ألنَغَّاز): زۆر ئاشوبگێڕ/ مایەی لێکپچڕان.
نغش:١-(نَغَشَ. نَغْشــاً وَنَغَشاناً): شپرزەبوو. بزوا.
(هُــوَ يَنغَش إلى فلان): لایدایە لای فیســار/ دڵی لەلای ئەوە/ لایەنی ئەو دەگرێت.
(سُــقِيَ فُلانٌ فَنَغَشَ): فیســار بووژابووەوە ئاویان پێداکرد کەوتە جووڵە.
(ناغَشَ-هُ. مُناغَشَةً) (عامية): پێکەوە دوان.
(تَنَغَّشَ وآنتَغَشَ- الشــيءُ): شــتەکە کەوتە جووڵەو لەقەلەقی پێکەوت.
(تَنَغَّــشَ وآنتَغَــشَ المــكانُ بِأهلِــهِ والرأسُ

بالقملِ): شوێنەکە جمەیهات و لەخەڵکەکەی پڕبوو، سەرەکەیش لە ئەسپێ پڕبوو.
(ألنَغْشَةُ): جارێـك بـزوەو شـپرزەبوون/ لەقەلەقکردن.
٢-(ألنُغاش): ١-رسـواکان/ پووشـتەکان ٢-گەرۆکە بێکارەکان.
(ألنُغاش والنَغَّاش والنُغاشِيّ): بستە باڵا/ زۆر کورت.
(نغص: نَغَصَ-ەُ): بەشـە ئاوەکەی لێبڕی یان نەیهێشت ئاو بخواتەوە.
(نَغِصَ - البَعيرُ. نَغَصاً): حوشـترەکە تێر ئاو نەبوو.
(-الرَجُـلُ): پیاوەکە بەئامانج نەگەیشـت/ نامرادبوو.
(نَغَّصَ-اللهُ عَلَيهِ العَيشَ ونَغَّصَ- عَيشَـه): خودا ژیانی لێتاڵکردو ژیانی تاڵبوو.
(-فُلاناً): ژیانی لەفیسار تاڵکرد.
(نُغَـصَ. تَنغيصاً): بەنیازو شـادیی تەواوی خۆی نەگەیشت.
(أنْغَـصَ - اللهُ عَلَيهِ العَيـشَ): خودا ژیانی لێتاڵکرد.
(-فُلاناً رُعْيَهُ): نەیهێشت فیسار حوشترەکانی لەلەوەڕگاکەدا بلەوەڕێنێت. بەشە لەوەڕگاکەی لێبڕی.
(تَنَغَّصَ-العَيشُ): ژیانەکە تاڵ و ناخۆشبوو.
(تَناغَـصَ-تِ آلإبِلُ): حوشـترەکان یەکتریان تەنگە جێکرد/ جێیان بەیەکتری لێژکرد.
(ألنُغْصَـةُ (ج) نُغَـص): ١-مایـەی مەراق و پەژارە ٢-رێگری ئامانجو ئاوات ٣-گرێی دڵ.
نغض: (نَغَـضَ: نَغضاً وَنُغُوضـاً وَنَغَضاناً): تەکانیدا و شپرزەبوو لەرزی.
(-القَـومُ الى العَـدُوّ): خوێشـگەل لەدوژمن ڕاپەڕین.
(-الشيءُ نَغَضاً): شتەکە زۆر بوو.
-الشيءَ وبالشَيءِ: شتەکەی جووڵاند.
(-السَّحابُ): هەورەکە چڕبوو.
(نَغَّضَ- الشيءَ): شتەکەی جووڵاند/ تەکاندا/ لەقاند.
(أنْغَضَ-الشَـيءُ): شـتەکە جـووڵاو کەوتە لەقەلەق و لەرزین.
(-رَأسَـهُ): سـەری بادا وەك حەپەسـاوێك/ سەرسورمانێك یان بۆ گاڵتەپێکردن.
(تَنَغَّضَ- الشَـيءُ): شـتەکە جـووڵاو کەوتە لەقەلەق و لەرزین.
(ألناغِض: (فا) )(ج) نُغَّض - مِنَ الإنسان): بنی سەری مرۆڤ کە لەوێوە سەر دەجووڵێتەوە.
(-مِـنَ الكَتفِ): سـەرەوە کرکڕاگەی دەفەی شان کە دەفەکە لە سەری دێتو دەچێت.
(غَيـمٌ ناغِـض): هـەوری بەشـوێن یەکدا ڕۆیشتوو.
(ألنَغض): کەسێکە لەرزۆك و سەری و لەشی لەرۆیشتندا دەلەرزێت و دەلەرێتەوە.

(اَلنُغْض - مِنَ الكَتِف): ئێسکی دەفەی شان.
(اَلنَغّاض مِنَ السَّحاب): هەوری شوێنکەوتووی یەك لەدوای یەك.
(رَجُـلٌ نَغّــاضُ البَطنِ): پیـاوی ورگزل کە ورگی چین چین لەسەر یەك نیشتبێت.
(اَلنَغُوض): مێحوشتری کۆپارە زل.
نغـف: (نَغِفَ - البَعيرُ نَغَفـاً): کرمی لووتی زۆر بوو.
(اَلنَغَف (ح): کرمە لەلووتی حوشــترو مەردا دەبێت.
(نَغَفَـةٌ): ١-کرمێکــی لووتــی حوشــترو مەڕ ٢-کەمێڵ و پیسیی لووت.
نغق: (نَغَــقَ- الغُرابُ نُغاقــاً وَنَغيقاً): قەلە رەشکەکە قراندی.
(اَلنُغّاق): قەلەرەشکەی بەقرەقر.
نغـل: (نَغِـلَ- آلجِلْـدُ. نَغَلاً): پێســتکە لە خۆشکردندا بۆگەنیکرد.
(-الجِرحُ): ١-برینەکە بۆگەنیکرد ٢-برینەکە ساڕێژبوو بەڵام شتێك پیسیی هەرمابوو.
(-نِيَتُهُ): نیازی (خراپبوو/ بۆگەنبوو).
(-قَلْبُهُ عَلَيّ): دڵی لێم خراپ و پڕبوو/ ڕقی لێهەڵگرتم.
(-بَينَهُــم): لەیەکیکــردن و دووزمانیــی لەنێوانیاندا کرد.
(-وَجْهُ الأَرضِ): ڕووی زەویەکە لەبێبارانیدا شەقار شەقار بوو.

(نَغَلَ- المَوْلُودُ: نُغولَةً) : منداڵەکە بەزۆڵیبوو/ کەس نەیزانی کوری کێیە.
(نُغُولَة): زۆڵیی.
(اَلنِغْلَة): زۆڵیی.
(أَنْغَلَ- آلجِلدَ): پێســتەکەی لەخۆشەکردندا بۆگەنیکرد.
(اَلنُغلَة): بۆگەنکردنی پێست.
(اَلنَغْل) (ح): ئێســتر کە لە ئەســپ و ماکەر دەبێت.
((ح) نَغْلَة): ئێسترە ماچەکی.
(اَلنَغَل) (مص): ١-دووبەرەکینانەوە/ لەیەکبەردانی خوێشگەل/ ئاشووبگێڕیی ٢-دووزمانیی.
(اَلنَغِل (ح) نَغِلَة والنَغيل): ١-بۆگەن/ خراپ ٢-زۆڵــی ژنی زیناکەر چونکە نازانرێت باوکی کێیە.
(اَلنَغَلَة): دووزمانیی/ ئاشوبگێڕیی/ قسەچنیی.
(اَلنَغيلَة (ح)): کرمی پێستی بۆگەنکردوو.
نغم:١-(نَغَــمَ ونَغِمَ وَنَغُــمَ وَتَنَغَمَ- الرَجُلُ نَغْماً): گۆرانییەکەی بە کەیفهەستانەوە وت.
(سَــکَتَ فَما نَغِمَ بِحَرفٍ): بێدەنگبوو ورتەی لە دەم نەهاتەدەرەوە.
(ناغَمَ-ە مُناغَمَةً): قسەی نەرمو ناسك و هێواشی لەگەڵدا کردو دواندی/ قسەی خۆشی بۆ کرد.
(اَلنَغَم والنَغْم): قسەی چرپەو نهێنی.
(-(ج) أَنغام و (جج) أَناغيم): ئاوازی گۆرانی.
(أَنغام الموسيقى): ئاوازی مۆسیقا.

(اَلنَغْمَة والنَغَمَــة (ج) نَغَمات واحدة النَغْم والنَغَم)١-ئاواز ٢-دەنگخۆشیی لەخوێندنەوەدا و گۆرانیوتندا.

(اَلنَغّام):کەسێکە ئاوازی زۆر بزانێت.

(رَجُــلٌ نَغُــومٌ): پیاوێکــی دەنگخــۆش و ئاوازخۆش/ ئاواز زان.

٢-(نَغَــمَ وَنَغِمَ- في الشَــرابِ. نَغماً):کەمێك شەرابی خواردەوە/ نۆشیی.

(نغو: (نَغا وَنَغی وَأَنْغــی - إلَيهِ. يَنغو نَغْواً ويَنْغي نَغْياً):قســەیەکی بۆ کرد کە ڕوونبوو تێیگەیشت.

(سَكَتَ فُلانٌ فَما نَغی بِحَرفٍ):فیسار متبوو/ بێدەنگبوو ورتەی لەدەم نەهاتە دەرێ.

(ناغی- الصَبيَّ):منداڵەکەی لاواندو بەزمانی خۆی دواندی کە پێیخۆشبێت.

(-المَرأةَ):ئەشقبازیی/ دڵداری لەگەڵ ژنەکەدا کرد.

(-الرَجُلَ)١-پێشبڕکێیی لەگەڵداکرد ٢-بەسەریدا زاڵبوو/ بەزاندی ٣-لێینزیکبووەوە.

(-المَوجُ السَحابَ): شەپۆلەکە ڕووەو هەورەکە بەرزبووەوە.

(هــذا الجَبَلُ يُناغی السَّــماءَ): ئــەو چیایە هێندە بەرزە خەریکە بگاتە ئاسمان.

(تَناغی - القَومُ): خوێشگەل پێشبڕکێیان لەگەڵ یەککردو هەوڵی زاڵبوونیان بەسەر یەکتردا دا.

(اَلناغِيَةُ): وشەیەك/ وشە.

(اَلنَغْوَة)١ئــاوازی (خــۆش/ جــوان/ چاك) ٢-ئاخاوتنی چاك و قسەی خۆش.

(اَلنَغْيَــة = اَلنَغْوَة):١-ئــاوازی چاك و خۆش ٢-قسەی چاك و خۆش ٣-یەکەمجار کە هەواڵێکت پێدەگات پێش ئەوەی بۆت ساغبێتەوە.

(سَــمِعتُ نَغيَةً مِن كذا):سەری هەواڵی ئەو شتەم بیست/ کەمەکێکیم بەرگوێکەوت.

نف:١-(نَفَّ-الأرضَ نَفّاً):تۆوی بەزەوییەکەوە کرد/ وەشاند.

(-السُوَيْقَ. نَفّاً):ئاردەکەی خراپکرد.

(اَلنُفْيَــةُ وَ النُفــی):خوانێکی خڕە لەگەڵای دارخورما دروستدەکرێت و دەچنرێت.

(اَلنَفیف):چنراو لەگەڵای دارخورما.

(اَلنَفّ (ج) نَفافِيُّ):کەوڵ کە ئاردی لەســەر دەبێژرێتەوە.

(اَلنَفِيَّةُ = اَلنُفْيَةُ):سفرەیەکی خڕە لەگەڵای دارخورما دەچنرێت.

٢-(اَلنَفْنَــف (ج) نَفانِــف):١-هــەوا ٢-نێوان زەوی و ئاســمان ٣-نێوان ســەری دیوارو بنی دیــوار ٤-نێــوان لێــواری چــاڵاوو بنەکەی ٥-قەدپاڵی کووری شــاخ کە وەك دیوارێك دێتە بەرچاو ڕێك و ڕاســت/ ماهیزەرد ٦-بیابانێکی وشك و چۆڵ و فراوان ٧-هەموو نێوانێکی دوو کێو ٨-دوور.

(نَفانِفُ الدار): ئەمــلاو لاکانی/ کەنارەکانی خانوو.

(اَلنَفْنــاف): ١-هەمــوو نێوانێکــی دو شــاخ ٢-دوور.
(اَلنَفْنــاف) (عنــد العامَّة): کولــوو بەفری تەنك.
نفأ (اَلنُفَأ): ١-پەڵەگیای بلاوبلاوی جیاجیا.
(نُفأَة): پەڵەیەکی گیای جیا ٢-باخچەی بچووك یان پەڵە درەخت کەگیای لەبندا برویێت.
نفــت: ١-(نَفَــتَ-تِ القِــدرُ. نَفْتــاً وَنَفَتاتاً ونَفیتــاً): مەنجەڵەکــە چــاك هاتە جۆش‌و کولان/ قوڵپە قوڵپ کوڵا.
(قِــدرٌ نَفُــوت): مەنجەڵێکــی جۆشســێن/ کوڵهاتوو.
(-الرَجُــلُ): زۆر تووڕە بوو یان لە تووڕەییدا دەماری ملی هەستا.
(-الدَقیقُ. نَفْتاً): ئاردەکە ناویتێکراو هەڵسا.
(نافَــتَ-تِ القِدرُ): مەنجەڵەکــە تەواو هاتە جۆش‌و قوڵپە قوڵپ.
(-الرَجُلُ): تووڕەبوو یان دەمارگیربوو.
(اَلنَفیتَةُ): ئارد ئاو یان شیری لێدەپرژێنرێت/ بەسەرد دەکرێت تا هەڵبێت یان هەڵسێت.
٢-(اَلنَفْتالین) (ك): ئەسفەنیك تەنێکی سپیە بریسکەداری بلوورینە بۆنێکی تیژی هەیە لە دروســتکردنی مادە ڕەنگینەکانــدا بەکاردێت هەروەها بۆ لەناوبردنی مۆرانە بەکاردەهێنرێت لەکاربۆن‌و هایدرۆجین پێکهاتووە.
نفــث: (نَفَــثَ - البصــاقَ مِن فیــهِ. نَفْثاً وَنَفَثاناً): تفەکەی یــان بەڵغەمەکەی بەدەم فرێدا.
(-الجرحُ الدَمَ): برینەکــە خوێنی دەرپەڕاند/ دەرکرد.
(-الرَجُلُ): بەڵغەمی/ یان تفی فرێدا.
(-تِ الحَیَّــةُ السُــمَّ): مارەکــە ژەهرەکــەی تێهاویشت.
(-المَصدورُ): ســیلاوییەکە بەڵغەم‌و پیســی سنگی فرێدا.
(-القَلَمُ): پێنووسەکە نووسی.
(-فُلاناً): جادوو و ئەفسوونی لەفیسارکرد.
(نَفَثَ اللهُ الشــيءَ في قَلْبِهِ): خودا شــتەکەی خستە دڵیەوە.
(نُفِثَ في رَوعي أَو قَلْبي كذا): ئەوە ترساندمی یان ئەوەم لەدڵ چەسپی/ بەدڵمدا هات.
(فُــلانٌ يَنْفُثُ عَلــيَّ غَضَباً): فیســار داخی خۆی بەمن دەرێژێت/ تووڕەیی بەســەر مندا تەختدەکات.
(نافَــثَ-هُ. مُنافَثَــةً): قســەی لەگەڵدا کردو نیازی دڵیان بەیەك گوت.
(اَلنَافِــث والنَفَّــاث (م) نافِثَــة ونَفَّاثَــة): جادووگەر/ سیحرباز.
(اَلنَفْث) (مص): بەڵغەم/ تف.
(نَفْثُ الشَیطان): (هۆزانی/ شیعری) دڵداریی.
(اَلنَفْثَةُ (ج) نَفَثات): جارێك بەڵغەمهاویشتن/ تفهەڵدان.

(ما أَحسن نَفَثاتِ فُلان)ئای كه هۆزانەكانی/ شیعرەكانی جوانن.

(أَلنُفاثَــةُ):بەڵغــەم و پیسـیی كەسـیلدار فرێیدەدات.

(دَمٌ نَفیــثٌ = مَنفــوث):خوێنێك كه برین دەریبكات.

(أَلمَنفُــوث) (مفــع):١ـهاوێــژراو ٢ـدەركراو ئەفسوونلێكراو.

(رَجُلٌ مَنفوث):پیاوێكی ئەفسـوونلێكراو/ سیحر لێكراو/ جادوو لێكراو

الملحق:

نفث: (أَلنَفَّاث):هاوێژەر.

(مُحَرِّكٌ نَفَّاث)بزوێنیكه دووكەڵ بۆ پشتەوە بەخێراییەكـی زۆر دەهاوێـت سـوارگەكه (مَرْكَبَــة):بـۆ پێشــەوە پاڵپێــوە دەنێتو دەیبات.

(طائِرَةٌ نَفَّاثَــة): فرۆكەیەكــە بزوێنەكەی دووكەڵ بۆ دواوە دەهاوێتو تیژ دەفرێت.

---

نفج:١-(نَفَجَ-الأَرنَــبُ أَو اليَرْبــوعُ نَفْجــاً وَنَفَجانــاً وَنُفُوجاً):كەروێشــكەكه یان گۆڕ هەڵكەنەكه سڵەمییەوەو راپەڕی و رایكرد.

(-تِ الريــحُ):باكه تیــژ هەڵیكرد/ وورووژاو توند هات.

(-الطَريقُ بِالقَوم)لەناكاو رێگەكه گەیاندنیه شوێنێك كه بۆی نەدەچوون.

(-الإِنســانُ نَفْجــاً): مرۆڤەكه شــانازیی به شــتێكەوە دەكــرد كــە نەیبوو كــە هی ئەو نەبوو.

(-تِ الفَرّوجَــةُ):جوجكەكه لــە هێلكەكەی دەرهات.

(-الأَرنَبَ وغَيرَها):كەروێشــكەكه یان هیتری وروورژاندو وەهای راپەڕاند خستیه راكردن.

(-الشَــيءَ):شــتەكەی بەرز نواندو گەورەی پیشاندا.

(نَفَشَهُ مأنتَفَشَ) (عامية):شتەكەی زلكرد و زلبوو، فشبوو.

(-السَقاءَ):كوندەكەی پڕكرد.

(أَنْفَجَ (-الحالِبُ):شیردۆشــەكه لەدۆشــیندا جامەكەی لەگوانەكه دوور خستەوە.

(-الأَرنَــبَ): كەروێشــكەكەی لەلانەكــەی دەرپەڕاند.

(تَنَفَّجَ):بەرزبووەوە/ هەستا.

(-الرَجُلُ):خۆی فشــهەڵداو شــانازی بەوەوە كرد كه نەیبوو.

(-تِ الريــحُ على القَوم):زریانی با لەناكاودا بەسەر خوێشگەله بێئاگاكاندا هەڵیكرد.

(إِنْتَفَجَ):بەرزبووەوە.

(-الرَجُلُ)١كابرا شانازیی به شتێكەوە دەكرد كه نەیبوو.

(-الأَرنَبُ):١ـكەروێشكەكه رایكرد ٢ـفەڵەمبازیدا.

(إِنْتَفَجَــت مِنهُ الأَرنَبُ):كەروێشــكەكه لێی سڵەمییەوەو بازیداو دەرپەڕی.

(-الأرنـــبَ وَغيرَاها): کەروێشــکەکەو هیتری راپەراند.
(إسْــتَنفَجَ - الشــيءَ): شــتەکەی دەرهێناو ورووژاندی و دەریخست.
(مــا الــذي إسْــتَنْفَجَ غَضَبَكَ): چــی رقی هەستاندیت/ توورەیکردیت.
(ألنافِج)(فــا): ١-خــۆ هەڵکێشــی فشــەکەر ٢-راپەڕیوو راکردوو.
(صَوتٌ نافِجٌ): دەنگێکی گڕی بەرز.
(ألنافِجَةُ (ج) نوافِج): ١-مێی وشەی (النافِج). ٢ هەوری پڕ بــاران/ بەبارنێکی زۆر ٣-بایەك تونــد هەڵکــردوو ٤-کچ/ کەنیشــك (چونکە بەمارەییەکەی سامانو ماڵی باوکی زۆردەکات ٥-کۆتایی دانەپەراسووەکان.
(هُــوَ نُفُــجُ «الحَقیبَــةِ»): ئــەو قنگپانە/ کەفەڵپانە.
(إمْرأةٌ نُفُجُ الحَقیبَة): ژنێکی سمتپان/ کەفەڵپان.
(ألنَفّاج): لووتبەرزی فشەکەری خۆ هەڵکێش و شانازیکەر بەشتێکەوە کەنییەتی.
(ألنَفیجَة (ج) نَفائِج): کەوان.
(ألأنْفَجانِــيّ): لاف و گەزافلێــدەر کــە زۆر بەقسەکانیەوە دەنێت/ فشەکەر.
(ألمَنافِــج): ئــەوەی ســمتی ژنی پێکــەوە دەبێتو دەریدەخــات، پەڕۆو پاتاڵێکە ژنان لەژێر کراســەوە لەسەر سمتیانی دائەنێن بۆ ئەوەی گەورە بنوێنێت.
(بَعیرٌ مُنتَفِجٌ): حوشتری کەمەر دەرپەڕیوو.
(ألمَنْفوج): حوشتری کەمەردەرپەڕیو.
٢-(ألنافِجَــةُ (ج) نَوافِج): ١-شووشــەو قاپی بۆنی خــۆش/ بۆنی مســك ٢-ئەوپێســتەیە کەمســکەکەی تێداکۆدەبێتــەوە کــە ناوکــی ئاسکی مسکە (فارسیە).
(ألنِفاجَــة): تیرۆژو بنهەنگڵــل (پارچەیەکی چوارگۆشەە لەبنباخەڵی کراس دەدرێت).
(ألنِفیج (ج) نُفُج): بێگانەیەك بەخوێشگەل یان ئەتــەوە هاتبێتــە ناویانەوە نــە زیانو ئەکەڵکی بۆیان نەبێت.
(ألنُفُــج): رەزاتاڵــەکان/ چارەگرانــەکان کە خەڵك حەز بە هاودەمییان ناکات.
نفح: (نَفَحَ- الطیبُ) نَفْحاً وَنَفَحاناً وَنُفُوحاً وَنُفاحاً): بۆن و بەرامە خۆشەکە بڵاوبووەوە.
(-تِ آلریحُ): ١-باکە هەڵیکرد یان شــنەیهات ٢-سرومیهات کە سەرەتای هەڵکردنیەتی.
(-العِرْقُ): دەمارەکە خوێنی لەبەر رۆیشت.
(-تِ الدابَّــةُ الرِّجُــلَ): چوارپێکــە لەقــەی لەپیاوەکەدا.
(-فُلاناً بالسَّــیفِ): سووکە شمشــێرێکی بە [illegible]یساردادا.
(-هُ بِکَذا): شتێکی دایە.
(-الشيءَ): شتەکەی لێلادا/ لێیدوورخستەوە.
(-لَمَّتُهُ): (قژی رووی گوێچکەی/ ئەگریجەی) داهێنا.
(نافَحَ-هُ): چوو بەگژیدا/ بوو بە ناحەزی.

(-عَـن فُـلان): لەسـەر فیسـاری كـردەوە بەرگریلێكرد.
(إنْتَفَـحَ - بِفُـلان): بەرمنگاری فیسـار بوو ڕێیپێگرت.
(-إلى مَوضِعِ كذا): ڕۆیشـت و ڕوویكردە ئەو شوێنە.
(ألنَفْـح (مص) - مِنَ الرياح): هەڵكردنی با لەسەرمادا.
(أللَّفح): هەڵكردنی با لەگەرمادا).
(نِيَّةٌ نَفَحٌ): نیازێكی دوور.
(ألنَفْحَـةُ (ج) نَفَحات): ١-جارێك باهەڵكردن ٢-جارێك بڵاوبوونەوەی بۆنو بەرامەی خۆش ٣-خەڵات/ بەخشش.
(لايَزالُ لِفُلان نَفَحاتُ مِنَ المَعْرُوف): هێشـتا فیسار دەستی بەخشش و چاكەی لەكاردایە.
(-نَفحَةٌ-مِن الألْبانِ): شـیری ساغ كە هیچی تێنەكرابێت.
(نَفحَةُ الطيبِ): بۆنی خۆش.
(نَفحَةُ الريحِ): هەڵكردنێكی با.
(نَفْحَةُ الـدَمِ): فیچقەیەكـی خوێن/ یەكەم دەرپەرینی خوێن.
(ألنَفَّاح): فرە بەخشش.
(طَعْنَةٌ نَفَّاحَة): تیغ یان نێزە پێداكردنێك كە خوێن لە شوێنەكەیەوە تیژ هورووژم بكات.
(ألنَفُـوح - مِنَ النـوق): مێحوشـترێك كە بێدۆشیی شیری لێبچۆرێت.

(-مِنَ القِسِـيّ): كەوانێـك كە تیرەكەی دوور دەهاوێت.
(ريحٌ نَفُوحٌ): بایەكی تیژی زۆر بەهێز.
(ألنِفّيـح وألمِنْفَـح): پیاوێكـی بێگانــە بە خوێشگەل و هاتبێتە ناویانەوە.
(ألإنْفَحَـةُ والإنْفِحَةُ والإنْفَحَّـةُ والمِنْفَحَةُ): هەوێنی پەنیر شـتێكە لەناوسـكی كارژۆڵەدا دەردەهێنرێـت پێـش ئەوەی كەلەشـیر پتر هیچیتری پێنەدرابێت دەگوشـرێتە شـیرەوە شیرەكە دەكات بەپەنیر.
نفخ: (نَفَخَ- بِفَمِهِ نَفْخاً): بەدەم فوویكرد.
(نَفَـخَ في النـارِ وَنَفَـخَ النـارَ): فـووی لەناگرەكەكرد/ فووی بە ناگرەكەدا كرد.
(-الضُحى): چێشتەنگاو (تێپەری/ سەركەوت).
(-تِ الريحُ): لەناكاودا باهەڵیكرد.
(-هُ الطَعامُ): خواردنەكە گەدەی (هەڵاوساند/ پركرد).
(نَفَخ شَدَ قَيهِ): فیزینواند/ لووتبەرزییكرد.
(نَفَخَ الشَـيطانُ في أنْفِهِ): شەیتان بایتێكرد و لووتی پێهەڵبری تا دەسـتدرێژیی بۆ شتێك بكات كە هی خۆی نەبێت.
(نَفَّخَ- بِفَمِهِ): بەدەم فوویكرد.
(تَنَفَّخَ): بایكرد، بای پێداچوو/ فوویكرد.
(إنْتَفَخَ): هەڵاوسان بایكرد، كفیكرد، بایتێچوو.
(-الرَجُلُ): بای فیزی تێچوو/ لووتبەرزییكرد، خۆی بەزلزانیی.

(-الشيءُ): شتەکە بەرزبووەوە.
(-النَهارُ): رۆژ کشاو نزیکی نیوەرۆ بوو.
(ألنافِخ) (فا): فووکەر، فووتێکەر.
(مابالدّارِ نافِخُ ضَرَمَةٍ): ماڵەکە کەســی تێدا نییە/ ئاگر کەرەوەیەکی تێدا نییە.
(ألنَفخ) (مص): ١-شــانازیی ٢-لووتبەرزیی/ فیز/ دەعیە.
(فُــلان ذو نَفَخ): فیســار بەدەعیــەو فیزە/ لووتبەرزە/ تڕ زلە.
(ألنَفَخ): ئاوساوییەکە لەمەچەکی چوارپێدا لەرۆیشتندا دەنیشێتەوە.
(ألنُفُخ): هەرەتی (لاویی/ گەنجێتی).
(شابٌ نُفُخٌ وجارِيَةٌ نُفُخٌ): لاوێکە لە هەرەتی گەنجێتیدایە/ کەنییەکە/ کچێکە لە هەرەتی جوانیی و لاویدایە/ هەرزەکارییە.
(ألنَفْخَــةُ): ١-جارێك هەڵاوســان ٢-جاریچك پڕبوونی گەدەو بەخواردن هەستانی.
(نَفْخَــةُ الشَّــباب): هەرەتــی گەنجێتیــی و گوروگەرمیی.
(نَفْخَــةُ الرَبیع): تەری بەهارو ســەوزیی و شکۆفەی دارو درەخت خۆشیی هەوای.
(ألنُفّاخ): هەڵاوسانی لوو بەهۆی دەردێکەوە.
(ألنُفّاخَــة (ج) نُفّاخات): ١-بلقی ســەر ئاو ٢ توورەکــە پێســتێکە پڕ بایەو لەناوســکی ماسیدایە ٣-میزڵدان.
(ألنّافُــوخ): لەبنچینــەدا لــە (یأفُــوخ)ەوە وەرگێڕراوە ١-مەڵاشــووی کۆرپــە کە نەرمە ٢-بەشی زۆری شەو.
(ألنَفیخ) (مص): ئاگردەمێنەر/ ئاگر گەشین.
(رَجُلٌ أُنْفُخانٌ وَإِنْفِخانٌ وَأُنْفُخانِيٌّ وَإِنْفِخانِيٌّ): پیاوێکە زۆر قەڵەو (وەك فوو درابێت).
(م) (أُنْفُخانَة وإِنفِخانَة وأُنْفُخانِيّة وإِنفِخانِيَّة): ژنی زۆر قەڵەو و تێکسمڕاو.
(ألمِنْفــاخ والمِنْفَــخ (ج) مَنافِيــخ ومَنافِخ): ١-پەمپــی هەوا ٢-مووشــەدەمە کە ئاســنگەر ئاگرەکەی پێخۆشدەکات.
(مَنافِخُ الشَــيطان): واسواســیی کە شەیتان دەیخاتە دڵەوە.
(ألمَنْفــوخ (مفــع): ١-باتێکــراو/ فــوودراو ٢-ورگن ٣-قەڵەو و تێکســمڕاو ٤-زیرەکردوو/ زۆر ترسنۆك.
نفد:١-(نَفَدَ-القَومَ. نَفْداً): گەیشتە خوێشگەل و لێیشیان تێپەری/ ڕەتبوو.
(نَفَّدَ- الحســابَ) (ت): ژمێرەکەی بەدوورو درێژیی خستە بەر چاوو بەدەم وتی.
(أَنْفَــدَ- القَــومَ): دری بــە خوێشــگەلداو بەناوەراستیاندا رۆیشت.
٢-(نَفِدَ-الشيءُ. نَفَداً وَنَفاداً): شتەکە تەواو بوو براو نەما.
(نَفِدَ زادُ القَوم): خواردنی خوێشــگەل تەواو بوو/ برا.
(أَنْفَدَ-القَومُ): سامان و ماڵیان لەناوچوو یان

خواردنیان براو تەواوبوو.
(- تِ البئرُ): چاڵاوەکــە ئاوەکەی برا/ ئاوی تێدا نەما.
(-الشيءَ): شتەکەی لەناوبرد.
(نافَدَ-هُ مُنافَــدَةً): دادگەرییکردو ناحەزیی پیشـاندا شــەرە بەڵگــەی لەگەڵــدا کــرد تابیانووەکەی ببڕێت و پووچەڵی بکاتەوە.
(تَنافَدَ الخَصْمان الى القاضي): دووناحەزەکە ســکاڵایان بردە بەردادوەرو هەریەکە بەڵگەو بیانووی خۆی خستە بەرچاو.
(-القَومُ): خوێشــگەل بوون بەناحەزییەك و بەگژیەکدا چوون/ بونە نەیاری یەکتری.
(إنْتَفَدَ-الشيءَ): شتەکەی (فەوتاند/ لەناوبرد) بەکاریبرد، تەواویکرد.
(-الحَقَّ): مافەکەی وەرگرتەوە/ بەرچنگکەوتەوە.
(إنْتَفَدَ-مِــن عَــدُوِه): هەمــوو مافەکەی لە دوژمنەکەی سەندەوە.
(-اللبنَ): شیرەکەی دۆشی.
(إسْــتَنفَدَ- الشــيءَ): شــتەکەی ١-کارکــرد، لەناوبرد/ تەواوکرد، فەوتاند.
(-وسْعَهُ): هەرچی لەتوانایدا بوو بەختیکرد.
(اَلْمُنَافِد) فا): بەکاربردە، لەناوبەر، فەوتێنەرو بەختکار.
(خَصْمٌ مُنافِد): نەیارێکە ناحەزێکە/ دووژمنێکە. هەرچی توانایەکی هەبێــت لە دوژمنکارییەکەدا بەختیدەکات/ نەیارێکی سەرسەختە.

(قَعَدَ مُنتَفِداً): دانیشتووەو وازیهێناوە.
(اَلْمُنتَفَد) (مفع): لاکەوتەو جیا.
(في هذا الشــيءَ مُنْتَفَدٌ عَن غَيرِهِ): ئەم شتە لە تواناو وزەدا لەهیتر جیاترە.
(فُلانٌ مُنتَفَدُ فُلان): ئەگەر ئەم کەمدەستبوو/ نەدارابوو ئەو بژێوی دەداتێ/ فیسار پەناگای فیسارە.
نفذ: (نَفَذَ- الشــيءُ الشــيءَ نَفْــذاً وَنُفوذاً وَنَفــاذاً): شــتەکە بەشــتەکەیتردا چــوو، کونەوادەریکردو لێیتێپەڕی.
(نَفَذَ السَــهْمُ الرَمْيَــةَ وَفيها وَمِنها): تیرەکە تێگیراوەکەی سمی و لێیدەرچوو.
(-فُــلانٌ القَــومَ): فیســار لێیانتێپــەڕی و خوێشگەلی خستە پشت خۆیەوە.
(-الأمرُ أَوِ القَــولُ نُفُوذاً وَنَفَاذاً): کارەکەیان قسەکە راپەڕێنرا و جێبەجێبوو.
(-المَنــزِلُ إلى الطريــقِ): خانووەکە لەســەر رێگەکە بوو.
(-الطَريــقُ): رێگەکــە بوو بەرێی (گشــتی/ هەمووان).
(طَريقٌ نافِذٌ): رێی (گشتیی/ هەمووان).
(-الكِتــابُ إلى فُــلان): کتێبەکــە/ نامەکە/ گەیشتە دەست فیسار.
(-الرَجُــلُ في الأَمــرِ): ١-پیاوەکــە چووە ناو کارەکــەوەو جێبەجێیکــرد ٢-تیایــدا قاڵ و کارامەبوو.

(-لِوَجهِهِ): بەرێ و کاری خۆیەوە ڕۆیشت.
(نَفَذَ - السَـهْمَ الرَميَةَ): تیرەکەی واتێگرت تێگیراوەکەی سمیو لێیدەرچوو.
(-الِكتـابَ الى فُـلان): نووسـراوەکە یـان کتێبەکەی بۆ فسیار نارد.
(-الرَجُـلُ القَـومَ):١-پیاوەکە لەخوێشـگەل تێپـەری و بەجێیهێشـتن ٢-دری پێدانو لە ناوەڕاستیانەوە تێپەری.
(-الحاكِـمُ الأَمرَ): کاربەدەسـتەکە کارەکەی بریارداو جێبەجێیکرد.
(ناَفَـذَ-هُ): دادوەرییکـرد/ لێپرسـینەوەی لەگەڵدا کرد.
(أَنْفَذَ- آلسَهمَ الرَمِيَّةَ): تیرەکەی لە نیشاکەدا داو لێیدەرچوو.
(-الِكتابَ الى فـلان): نامەکە یان کتێبەکەی بۆ فیسار نارد.
(-الرَجُلُ القَومَ):١-پیاوەکە لە خوێشگەل تێپەری و بەجێیهێشتن ٢-بەناوەڕاستیاندا ڕۆیشت.
(-الحاكِـمُ الأمـرَ):١-دادوەرەکـە کارەکـەی جێبەجێکـرد ٢-دادوەرەکـە. بریارەکەیـداو جێبەجێیکرد.
(-عَهْدَهُ): بەڵێنەکەی بردە سەر.
(تَنافَذَ القَومُ الى الحاكِم): خوێشگەل چوونە لای دادوەرو دادبینیانکرا.
(أَلنافِذ) (فا):جێبەجێکەرو لەسەر ڕۆیشتووی هەموو کارێك.

(أَلنافِـذ (ج) أَلنَوافِذ مِنَ الإنسـان): هەموو کـون/ دەلاقـە/ تلیش لەمرۆڤـدا وەك دەمو لووت.
(طريقٌ نافِذ): ڕێی گشتیی.
(أَمرٌ نافِذ):فەرمانێکیپیادەکراو/پەیرەوکراو/ فەرمانێك کە دەبێت بەجێبهێنرێت.
(أَلنَّافِذَةُ (ج) نَوافِذ):مێی وشەی (النافِذ):١-پەنجەرە ٢-دەلاقە لەدیواردا کەڕووناکیی لێوە بێتە ژوورەوە.
(هـذِهِ طَعْنَـةُ نافِـذَة): ئەمە شـوێنی تیغ تێچەقاندنێکـی تـەواوەو لەوسـەرەوە دەرهاتووە.
(أَلنَفذ (ج) أَنْفـاذ = أَلإنفاذ):١-پێداکردنێك کە لەوسـەرەوە دەربێت ٢-جێبەجێکردنێکی تەواو.
(أَمَـرَ بِنَفَذِ الِكتـاب):فەرمانیدا کەهەرچی لەنامەکەدا هەیە جێبەجێ بکرێت ٣-کەلەبەر/ شتی کوناودەر.
(هـذه طَعْنَةٌ لَها نَفَذٌ): ئەمە شـوێنتیغێکە، تیرێکە/ نێزەیەکە کوناودەرە ٤-دەرە، ڕزگارگەر، دەروو.
(أَلنُفْذَةُ (ج) نَفَذ): موورووو.
(أَلنَفَّاذ والنَفوذ):١ مرۆڤی خاوەن دەسەڵاتو قسـە ڕۆیـو ٢-مرۆڤـی کاربەسـەربردە/ بە دەسەڵات.
(أَلنَفيذ = النافِذ):١: تێچەقیو ٢-پیادەکراو.

(أَمـرٌ نَفيـذٌ): فەرمانێکـی جێبەجێبـوو/ فەرمانێکە دەبێت راپەڕێنرێت.
(أَلتَنفيـذ): راپەڕانـدن/ جێبەجێکـردن/ پیادەکردن.
(أَلسُلطَة التَنْفيذِيَّة): دەسەلاتی بەجێهێنان/ میریی.
(أَلمَنفَـذ (ج) مَنافِـذ): دەرچـە/ دەربازگە/ گوزەرگا/ ڕێڕەو/ ڕاڕەو/ دالان.
(أَلمَنفذ): شوێنی لێوە تێچوونی شت.
(مَنافِذُ الإنسان): کون/ شوێنی لێوە دەرچوون لەلەشی مرۆڤدا.
(أَلمُنْتَفَذ): فراوانیی/ کراوەیی ٢-دەوڵەمەندیی و دەستداریی.
الملحق:
نفذ: (النُّفوذ): پێداچوون/ بەناوشتدا چوون ٢-پێدا تێپەڕین.
(نُفوذ الماء في الأرض): چوونی ئاو بەزەویدا.
(أَلنُّفُوذ): کارکردنە سـەر خەڵك و دەسەلات بەسـەر خەڵکدا بوون/ توانای ئەو کەسە کە خەڵـك والێبکات راکانی ئەو وەربگرن و دوای هەڵوێستی ئەو بکەون.
(يَتَمَتَّـع بِنُفوذٍ كبير): دەسـەلاتێکی زۆری بەسەر خەڵکدا هەیەو قسەرەوایە.
(مَناطِـق النُفـوذ): ناوچەی دەسـەلات بەو وڵاتانە دەڵێن کە وڵاتە زلهێزەکان دەسەلات و هێزیان بەسەریاندا هەیە.

نفر:١-(نَفَـرَ-تِ الدابَّةُ مِن كذا): چوارپێکە لەوە سڵەمییەوەو ترساو تەرەبوو.
(نافِـر وَنَفُـور): سـڵکردوو و تەرەبـوو/ رەوکردوو.
(-القَـوْمُ للقِتـالِ أو الأَمـر. نُفُـوراً وَنِفاراً وَنَفيراً): خوێشگەلەکە/ خەڵکەکە بۆ جەنگ یان کارێك ڕۆیشتن/ ملیاندا.
(-الظبـيُ وَغَـيرُهُ نَفْـراً وَنُفُـوراً وَنِفـاراً وَنَفَراناً): ئاسکەکە یان هیتر تەرەبوو/ ترساو رەویکردو دوورکەوتەوە.
(-مِن كذا نَفْراً): ١-سـڵی لەوەکردەوە ٢-رقی لێبووەوە.
(نَفِرتُ مِن صُحْبَةِ فُلان): بێزم لە دۆستایەتی و هاوەڵیی فیساربووەوەو رقم لێیبووەوە.
(-عَن كذا): خۆی لەوە دوورخستەوەو رووی لێوەرگێرا/ خۆی لێلادا.
(-القَومُ): خوێشگەل/ خەڵکی بلاوەیان لێکرد.
(-فُلاناً): بەسەر فیساردا زاڵبوو و بەزاندی.
(-الى الشيءِ): خێرا خۆی بۆ شتەکە کوتا.
(-الحاج مِن مُنى. نَفَـراً وَنُفُوراً): لەموناوە حاجییەکان بەپەلە خۆیان بۆ مەککە کوتا.
(-تِ العَينُ وَغَيرُها نُفوراً): چاوەکە ورووژاو هاتە خـوروو هەلاوسـا (لەدوورکەوتنەوەی شـتێك لـە شـتێکیترەوە هاتـووە. چونکـە بەهـۆی دەردێکەوە پێسـتەکە لەگۆشـتەکە دووردەکەوێتەوە).

(نَفَّــرَ-هُ): هەڵیسـڵەماندەوەو تەرەیکــرد/ رەویپێکرد/ ترساندی.
(-هُ علی فُلان): بڕیاری ســەرکەوتنی ئەوی بەسەر فیساردا بۆدا.
(-هُ الشيءَ وعلی الشيءِ وَبِالشيءِ): دەسەڵاتی بەسەر شتەکەدا دا زاڵیکرد/ سەریخست.
(-عَن فُلان): نازناوێکی ناشیرینی لێنا.
(نافَــرَ-هُ. نِفــاراً وَمُنافَــرَةً): ١-دادگاییکرد. ٢-شــانازیی دەربــارەی پشــتو رەچەڵەك و رەسەنی خۆیی بەسەردا کرد.
(نافَــرتُ إلی القاضــي فَنَفَّرَنــي عَلَيــهِ): دامبەدادگاو بردمــەلای قازی ئەویش بڕیاری بۆ من داو سەریخستم.
(أَنْفَرَ-هُ): تەرەیکرد، راوینا.
(-القَــومُ): حوشــترەکانیان تەرەبــوونو بڵاوبوونەوە.
(-القَــومُ فُلاناً): خوێشــگەل لایەنو پشــتی فیساریانگرتو کۆمەکیانکرد سەریانخست.
(-الحاكِم فُلاناً علی فُلانٍ): دادوەر بڕیاری بۆ فیسارداو بەسەر ئەویتردا سەریخست/ زاڵیکرد.
(تَنَفَّرَ= نَفَرَ): تەرەبوو/ ســڵیکردو رەویکرد.
(تَنافَرَ - القَومُ لِلأمرِ): خوێشگەل/ خەڵکەکە بۆ کارەکەو بەدوای کارەکەدا رۆیشتن.
(-الرَجُــلانِ): یەکتریــان بــە دادگاکردنداو شانازییان بەسەریەکدا کرد.
(إِســتَنفَرَ- الظَبيُ): ئاســکەکە هەڵات/ تەرەبوو/ رەویکرد/ رایکرد.
(-هُ): تۆقاندیو رەویپێکرد.
(-القَــومَ): هانای بــۆ خوێشــگەلبردو داوای پشتگیریی و کۆمەکی لێکردن.
(-فُلانٌ بِثَوبی): فیسار بەرگەکەمی پەرێشانو شرووڕ کرد.
(ألنافِــر (فــا) (ج) نَفْــر وَنُفَّــر): ١-زاڵ/ ســەرکەوتوو ٢-تــەرەو رەوکــردوو ٣-لێبێزار ٤-هەڵتۆقیوو و هەڵاوساو ٥-دەرکەوتوو.
(ألنافِرَةُ): مێی وشەی (النافِر).
(نافِرَةُ الرَجُل): خێزانو فامیلیای پیاوەکە و ئەوانەی سەربەونو پشتگیریدەکەن.
(الطائِرة النافورية): فڕۆکەی خێراو تیژڕەو کە بەهێزی تەکانەخۆ دەڕوات.
(ألنَفَــر) (مــص): کــۆی وشــەی (النافر): ١-دەســتەیەك پیاو لەسێکەســەوە تا دەکەس بێت ٢-کەســوکارو خوێشــی نزیکی پیاو یان ئەوانــەی بۆ جەنگ دەچــنو هەڵپەیانە. یان کۆمەڵێك کە پێشمنگی کارن.
(يَوْمُ النَفْر): رۆژی ســێهەمین قوربانیی کە ئــەو رۆژە حاجییــەکان لەمیناوە بۆ مەککە دەگەرێنەوە.
(عِفْرٌ نِفرٌ وعِفِرٌ نِفِرٌ): یەکانەیەکی پیس و بۆگەنو دڕ.
(عِفريَة نِفرِيَةٌ وعِفريتٌ نِفريتٌ وَعِفريتَةُ نِفريتَةٌ): دەڵەدێوێکی رەزاتاڵ و ناجسن.

(اَلنَفَر (ج) أنفــار): ١-هەموو خەڵك/ خەڵك بەگشــتی ٢-كۆمەڵە خەڵكێك لەسێكەسەوە تا سیازدە.
(نَفَرُ الرَجُلِ): خوێشگەل و خێڵی پیاوەكە.
(یَومُ النَفَر): رۆژی سێهەمینی قوربانیی رۆژی گەرانەوەی حاجیان لەمیناوە بۆ مەككە.
(اَلنَفْرَة): ١-جارێك لەشتێك رەوكردن و هەڵاتن ٢-جارێــك قێزلێكردنــەوەو لێدووركەوتنەوە خۆ لێلادان ٣-جارێك زاڵبوون ٤-جارێك بەرەو روو رۆیشــتن ٥-كۆمەڵە پیاوێك لەسێوە هەتا ســیازدە ٦-خوێشــگەل لەگەڵ تۆدا رەودەكەن یان لەشەردا دەست دەكەنە شانازیكردن‌و خۆ دەرخستن یان پێشەنگی كاردەبن.
(نَفْــرَةُ الرَجُلِ): خێزان‌و فامیلیای پیاوەكەو ئەوانەی پشتگیرییدەكەن.
(اَلنُفْرَةُ): بریاری دادگا.
(النُفْــرَةُ والنَفَــرَةُ): شــتێك بــۆ چــاوەزار بەمنداڵەوە دەكرێت.
(اَلنِفَار) (مص): رەوكردن/ تەرەبوون.
(فِي الدابَّةِ نِفَارٌ): چوارپێك مانگرە/ مانگرتنی لەگەڵدایە.
(اَلنُفارَة): ١: بریاری دادگــا ٢-بەبریاری دادگا سەركەوتوو ماف لەژێركەوتووی وەردەگرێت.
(اَلنَفارِیر): چۆلەكەكان.
(نُفرور): چۆلەكەیەك.
(اَلنَفُــور = النافِــر): ١-ســرك‌و رەوكــردو/ تەرەبــوو ٢-بێــزار ٣-زۆر ســرك، زۆر بێزارو دووركەوتوو.
(یَــوم النُفُــور): رۆژی ســێهەمینی جەژنی قوربان ئــەو رۆژەی كە حاجییەكان لەمێناوە دەگەرێنەوە بۆ مەككە.
(نُفُورَةُ الرجُل): خێزان كەســوكاری نزیكی پیاوەكەو ئەوانەی پاڵپشتین.
(اَلنَفــیر (مــص) (ج) أَنْفَــار): ١-لەدەكەس كەمــتر ٢-ئەو خوێشــگەلەی كــە كەلەگەڵتدا دێــن‌و دەرۆن، یــان بۆ جەنــگ خۆدەكوتن‌و تەكانــدەدەن ٣-كەرەنــا/ بۆرییەكە كە فووی پێدادەكەن (فارسیە).
(اَلنَفــیر العــام): هەســتانی هەمــوو خەڵك بەگشتیی بۆ بەرەنگاربوونی دوژمن.
(ماهُوَ بِنَفیرِ فُــلان): لەبەرەنگاربووندا ئەو هاوكوف‌و هاوشانی فیسار نییە.
(یَــومُ النَفــیرِ): رۆژی ســێهەمی جەژنــی قوربانــە كە حاجییەكان لە موناوە بۆ مەككە دەگەرێنەوە و بلاوەی لێدەكەن.
(اَلمُسْتَنفِر = النافِر): سەركەوتوو/ زاڵ.
اَلمُســتَنفَر: رەوپێكراوو تۆقێنراو / تەرەكراو ٢-هەنا بۆ بەر.
(اَلمَنفُور (مفع)): بەزیو/ ژێركەوتوو/ دۆراو.
(اَلیَنفُــور): ١-رەوكــردوو/ تەرەبــوو ٢-زۆر تەرەبوو/ تۆراو.
٢-(اَلنَّافُــور - عنــد النَصــاری): ١-لــەلای

دیانــەکان نهێنیــی قوربانییــە پیرۆزەکــە
٢-دۆعایەکە پێش قوربانییەکەو بەسەر قاپە پیرۆزەکاندا دەخوێنرێت (یونانیە).
نفز: (نَفَزَ- الظَبيُ نَفَــزاً وَنُفُوزاً وَنَفَزاناً): ئاسکەکە قەڵەمبازیبرد.
(-الرَجُلُ): مرد.
(نَفَّزَ-هُ): قەڵەمبازی پێبرد.
(-تِ المَــرْأةُ وَلَدَهــا): ژنەکــە منداڵەکــەی هەڵپەراند.
(نَفَّزَ وَ أنفَزَ- السَهْمَ): تیرەکەی لەسەر نینۆکی سووڕاندەوە تا بزانێت راستە یان خوارە.
(تَنافَزوا): بەسەر یەکدا قەڵەمبازیانبرد.
(ألنَفيز والنَيزَة): وردەکەرەکە لەمەشکەکەدایە و یەکناگرێت.
(ألنيفُوز مِن الظباء): ئاسکی قەڵەمبازدەر.
نفس: (نَفَسَ-هُ بِنَفسٍ نَفســاً): بەچاویەوە کرد/ بەنەفەسیەوەکرد.
(نَفِسَ-بالشــيءَ نَفَساً وَنَفاسِــيَةً): درێخیی لەشتەکەدا کرد/ چرووکییکرد.
(-علــى فُلانٍ بِخَــيرٍ): بەخیلی بــە چاکەی فیسار برد.
(- الشــيءَ على فُلانٍ): شــتەکەی پــێ ڕەوا نەبینی.
(-تِ المَرْأةُ غُلاماً نَفَساً وَنَفاسَةً وَنِفاساً): ژنەکە ژانی کورێکیگرت و زەیستانبوو/ کورێکیبوو.
(نَفُسَ نَفاسَــةً وَنِفاســاً وَنُفُوســاً وَنَفَساً): بەبەهابوو/ گرانبەهابوو بەنرخبوو.
(نُفِــسَ-تِ المَــرأةُ غُلاماً. نَفَســاً وَنَفاسَــةً وَنِفاساً): ژنەکە منداڵیبوو بوو بەزەیستان.
(-فُلانٌ): فیسار لەدایکبوو.
(مَنْفُوس): ئەو لەدایکبوو.
(وَرَثَ فُــلان هــذا قَبلَ أن يَنفَسَ): فیســار پێش ئــەوەی لەدایکبێــت میراتی بەرکەوت/ میراتی بۆ بەجێما.
(نَفَّــسَ-هُ في الأمــرِ تَنفيســاً): کارەکەی لا شیرین و خۆشەویستکرد.
(-عَنــهُ الكُربَــةً): پەژارەی لــەدڵ دەرکرد/ خەمەکەی ڕەواندەوە.
(نَفَسَّ-فُلانــاً): دڵــی فیســاری دایــەوە یاخەمەکەی لەدڵ دەرکرد و دڵی کردەوە.
(نافَسَ- فُلاناً في الأمرِ. نِفاســاً وَمُنافَسَةً): لەکارەکــەدا ململانــێ و پێشــبڕکێی لەگــەڵ فیســاردا کــردو خۆیــان بەســەریەکدا بادا/ شانازییان بەسەر یەکداکرد.
(-في الشــيءِ): لەشــتەکەدا زیادڕەوییکــرد زۆربۆیچوو ٢-لەرووی پێشکەوتن و بەرزبوونەوە زۆرتر حەزی لەشتەکەکرد.
(أنْفَسَ-الشيءُ): شتەکە گرانبەهابوو.
(-الشيءُ فُلاناً): شــتەکە لای فیسار بەنرخ و بەهابوو حەزی لەشتەکەکرد/ دڵی تێچوو.
(-فُلانــاً في الشــيءِ): دڵــی فیســاری چوانــدە شتەکەوە/ حەزی بۆ شتەکە بەفیسار پەیداکرد.

(تَنَفَّسَ): هەناسەیدا/ پەتۆیبرد.

(-الصُبْحُ): بەیانیدا رۆژ بووەوە.

(-تِ القَوسُ): کەوانەکە هەڵقڵیشا.

(-آلنَهرُ) رووبارەکە ئاوی زۆربوو.

(-النَّهارُ): رۆژ نیوەبوو/ بوو بەنیوەرۆ.

(-الرَجُلُ): درێژەی بە قسەکەیدا.

(-الرَجُلُ فِي الإنـــاءِ): دەمی بە قاپەکەوە ناو یەکبین ئاویخواردەوە.

(تَنَفُّس الصُعَّداءَ): هەناســەی قووڵی ستارەی دڵو پشــووی هەڵکێشــا حەوایــەوەو خەمی نەما.

(تنافَــسَ - القَــومُ فِي آلأمــرِ): لەکارەکــەدا بەربەرەکانێی یەکتریانکرد/ پێشبڕکێیانکرد و لەسەریەك زیادیانکرد وەکو هەناسە درێژیی یەکتر تاقیبکەنەوە ٢-لەجوامێریدا پێشبڕکێی یەکتریانکرد.

(ألنافِــس) (فــا): ١-حەســوود/ ئێرەییکەر ٢-چاوپیــس (بەپێــی بیروبڕوایــان) خەڵك بەنەفەســەوەکەر ٣-شــتی بــاڵاو بەنــرخ کە خوازیاریبن ٤-پێنجەمین یان چوارەمین تیری قومار.

(ألنَفَــس) (مــص) (ج) أنْفُــس ونُفوس): ١-گیان ٢-چاو.

(أصابَتْهُ نَفْسٌ): بەچاوەوەبوو/ بە نەفەسەوە بوو ٣-خوێن (چونکە ئەگەر خوێن لەلەشــدا گیان نامێنێت).

(دَفَقَ نَفْسَهُ): خوێنی لەبەر رۆیشت ٤-لەش/ تەن/ جەستە/ لەش.

(هُــوَ عَظیــمُ النَفــس): ئــەو لەشــگەورەیە/ کەتەیە٥-کەســەکە خــۆی ٦-العَظَمَــةُ: مەزنیی ٧-(ألهِمَّةُ): پەرۆشیی/ بەتوانایی و هەتەرمەندیی. ٨-(العِــزُ): ســەربەرزیی/ نگینیــی (ألأنَفَــةُ): دەروونبەرزیی و خۆپارێز لەنەنگیی ٩-(الإرادَةُ): خواســت ١٠-(الراعي الرأي): بــیر/ بۆچوون/ را ١١ (العیب): خەوش/ کەموکووریی ١٢- (العقوبە): سزا ١٣- ألماءُ: ئاو.

(نَفْسُ الأمرِ): کارەکە خۆی/ خودی کارەکە/ خودی شتەکە/ هەر ئەو کارەیەو راستییەکەیەتی.

(نَفْسُ الشيءِ): هەر ئەو شتە/ شتەکە خۆی.

(جاءَني هُوَ نَفْسُــهُ وَبِنَفسِــهِ): خودی خۆی هات بۆ لام/ خۆی هاتە لام.

(نَفْس): ئەگەر بەواتای گیان بێت مێیە.

(خَرَجَت نَفْسُهُ): گیانی درەچوو.

(نَفْس): ئەگەر بەواتای کەسەکە بێت نێرە.

(عِندی خَمْسَــةَ عَشَرَ نَفْســاً): پازدە کەسم لەلایە.

(فِي نَفســي أن أفْعَلَ کذا): بەنیازم و ئامانجم ئەوەیە ئەو کارەبکەم/ ئەوەبکەم.

(فُلانٌ یُؤا مِرُ نَفْسَــیْهِ ویُشاوِرُ هُما): فیسار لەدەروونیدا لەگەڵ خۆیدا بۆ کارێك کەوتۆتە راوێژ رارایە کارەکە بکات یان نەکات.

(خَرَجَت نَفْسُهُ): گیانی دەرچوو.

(جادَ بنَفسِهِ): خۆی کرده قوربانی.
(ألنَفَسْ (مـص) (ج) أنفاس): ١-شـنەی با ٢-ئـەو بایـەی/ هەوایـەی زیندووی سـیدار هەڵیدەمژێت و لـەدەم ولووتەوە دەریدەکاتە دەرەوە/ هەناسـە وەرگرتن و هەناسـەدانەوە ٣-فراوانیی و بوار، میانە.
(إعْمَلو الخَير وأنتُم في نَفَسِ البَقاء): تا ماون و بوارە تان هەیەو لەدەسەلاّتدان چاکەو خێر بکەن ٤-قسەی دوورو درێژ.
(كَتَبَ كِتاباً نَفَساً): نامەیەکی دوورو درێژی نووسی ٥-(لنَفس) بەقومێك/ یەکبین.
(أكـرَعَ مـافي الإنـاءِ نَفَسـاً واحـداً): چی لەقاپەکەدا بوو یەکبین خواردیەوە/ بەقومێك هەڵیقوراند/ خواردیەوە.
(ألنَفَـس - مِـنَ التنبـك): هەڵمژینێکـی نێرگەلە. کەتوتنی تنباکی لەسەرە.
(هذا شرابٌ ذو نَفَسٍ): ئەم شەربەتە شیرین و خۆشە بەقومێك دەخورێتەوە.
(نَفَسُ الساعَة): ئەو دەمە.
(نَفَسُ الشـاعِر): ڕێگـەو چۆنیەتیی دانانی هۆنراوەی/ شیعری هۆزانڤانەکە.
(نَفَسُ الكاتِبِ أوالمُؤَلـف): ڕێکەو چۆنیەتی، شێوازی نووسینی نووسەرەکە.
(ألنِفـاس) (مـص): ١-منداڵبوونـی، ژان/ زەیستانیی ژن ٢-خوێنی پاش منداڵبوونی ژن.
(ألنُفَسَةُ): بوار/ پشوو/ ماوەدان.

(لَكَ في الأمر نُفْسَةٌ): لەکارەکەدا بوارت هەیە.
(ألنُفَسـاء وَألنَفْسَـاء والنَفَسـاء (ج) نِفاس ونُفَـس ونُفُس ونُفَّـس وَنُفَّـاس وَنوافِس وَنُفَساوات): ژنی منداڵبوو/ زاو/ زەیستان.
(نُفَساوان): دووزەیستان/ دووژنی منداڵبوو.
(النَفُـوس): چاوپیس، بەماڵـی خەڵکدا چاو هەڵهێن کەهەمیشـە چاودەبرێتە شتی ئەم و ئەو تا بەچاویەوە بکات.
(ألنَفيس): ١-گـران/ گرانبەها/ زۆر بەبایەخ ٢-دارای زۆر.
(رَجُلٌ نَفيـس): پیاوێکی لەچـەرە/ چاوی بەسەری کەس هەڵنایەت و ئیرەییە.
(شيءٌ نَفيس): شتێکی ناوێزەی گرانبەها کە خەڵك بـە دوایدا بگەرێت ململانێی لەسـەر بـکات، پێچەوانەکەی (الخَسـيس): بێبەها/ بێنرخ).
(مالٌ نَفيس): دارایەکی زۆر.
(الأنْفَس): گرانبەهاتر/ نایابتر و بەنرختر.
(هذا الثـوبُ أنْفَسُ من ذاك): ئەم کراسـە، لەوەدرێژترە یان لەوە نایابترە.
(هـذا المكانُ أنْفَـسُ مِن هذا): ئەم شـوێنە لەویتر دوورترەو فراوانترە.
(هذا أنْفَس مالي): ئەمە خۆشەویسـترین و باشترینی ئەومیە کە من هەمە.
(ألمُنْفِس) (فا): هەموو شتێکی نایاب و بەنرخ و گرنگ.

(مالٌ مُنْفَسٌ): دارایەکی زۆر.
(اَلْمَنفوس): تازەبوو/ تازە لەدایکبوو.
(شيءٌ مَنْفُوس): شتێکی باڵا، نایاب و دەگمەن و ویستراو.
(اَلْمُتَنَفَّس): هەناسەگا/ شوێنی هەناسەدان و پشوودان و حەوانەوە.
نفش: ١-(نَفَش وَنَفَّش-القُطنَ أوالصُوفَ نَفشاً): لۆکەکە یان خوریەکەی شیکردەوەو لێکی جیاکردەوە.
(نَفَش فُلانٌ فُلاناً) (عامية): فیسار فیسار کەسی هەڵنا لووتیکردو فیزی پەیداکرد.
(نَفَش وَنَفِش ونَفَّش-تِ الإبلُ أو الغَنَمُ. نَفْشاً): حوشترەکان یان مەڕەکان بەشەو بێخاوەن/ شوان لەوەڕان.
(نافِشةٌ وَنُفَّاشٌ وَنَوافِش وَنُفَّش): حوشترو مەڕی بێشوان و بەشەو لەوەڕاو.
(اَلنَّفَش): لەوەڕانی ئاژەڵ و حوشتر بێشوان و بەشەو.
(أَنْفَش- الراعي الإبِلَ): حوشترەوانەکە بەشەو حوشترەکانی کردە لەوەڕگاکەوەو بەجێهێشتن.
(تَنَفَّش-الطائِرُ): باڵندەکە خۆی فشکردەوە.
(-تِ الهِرَّةُ): گوربەکە/ پشیلەکە خۆی گیفکردەوەو تووکی لەشی ڕاستکردەوە.
(-تِ الإبلُ): حوشترەکان بەشەو بێشوان لەوەڕان.
(إنْتَفَش-تِ الهِرَّةُ): پشیلەکە خۆی گیفکردەوەو تووکی لەشی ڕەپکرد.
(إنْتَفَش-الصُوفُ): خوریەکە شیبووەوە.
(اَلنَفَش): ١-خوریی شیکراوە ٢-کەلوپەلی پەرش و بڵاو ٣-قسەی زۆرو وتەوتی ئەم و ئەو.
(إبِلٌ أو غَنَمٌ نَفَشٌ): حوشتریان مەڕی بەشەو لەوەڕاو (وشەی (نَفَش) تەنها بۆ شەو دەبێت). بەڵام (اَلهَمَل) بۆ شەوو ڕۆژ دەبێت.
(بَقَرٌ أو غَنمٌ نَفَشٌ وَنَوافِشٌ نُفَّاشٌ): مانگاو مەڕی بێشوان بەشەو لەوەڕاو.
(اَلنَّفَّاش): ١-لوتبەرز/ ترزل/ بەدەعیەو فیز ٢-باکردوو، هەڵاوساو ٣- (ن): جۆرە لیمۆیەکی زۆر گەورەیە.
(اَلنَفِيش): کەلوپەلی هەمەڕەنگ و جۆری ناو دەفرێك.
اَلْمُتَنَفِّش والْمُنتَفِش: شتی فشوفۆڵ ناو بۆش.
(أنفٌ مُتَنَفِشٌ وَمُنتَفِشٌ): لووتێکی کون فش و پانەوە بوو/ کەنۆش.
٢-(نَفَش- القَومُ نُفُوشاً): خوێشگەل/ خەڵکەکە تووشی نازو فەرو بیری زۆر بوون.
(بَلَدٌ ذو نَفَش): وڵاتێکی پڕ خێرو بێر.
٣-(نَفَش-فُلانٌ على الشيءِ. نُفُوشاً): فیسار ڕوویکردە شتەکە بیخوات.
نفص:١-(نَفَص-بِبَولِهِ نَفْصاً): میزەکەی هەڵدا.

(-بالكِلمَةِ): قسەکەی خێراکرد/ زوو دەرپەڕاند.
(أَنْفَصَ ببَولِهِ): میزەکەی هەڵدا.
(-بالكِلمةِ): قسەکەی خێراکرد.
(-تِ الشَـاةُ ببَولهـا): مەرەکـە میزەکـەی پچڕپچڕ کرد.
(-فِي الضَحِكِ): زۆر پێکەنی.
(اَلنُفْصَةُ (ج) نُفَص): فیچقەکردنێکی خوێن.
(اَلنُفَاص): دەردێکەتووشـی مەڕ دەبێت میز پچڕپچـڕ دەکاتو نەوە دەیکوژێت/ تووشـی میزە چوڕکێ دەبێت. پێی مرداردەبێتەوە.
(اَلمنفاص): کەسێکە زۆر پێدەکەنێت.
٢-(أَنْفَص-الرَجُـلُ بِشَـفَتَيهِ): بەلچ و لێوی ئاماژەیکرد.
٣-(اَلنَفِيص): ئاوی شیرین.
نفض:١-(نَفَـضَ- الثَـوبَ. نَفْضاً): جلەکەی تەکاند تا خۆڵ و گەردی لێببێتەوە.
(-الشَجَرَةَ): درەختەکەی راوەشاند تا ئەوەی پێوەیە بەربێتەوە.
(-الوَرَقَ - مِنَ الشَـجَرِ): گەڵای درەختەکەی وەراند.
(-الزَرعُ): کشتەکە دواگوڵیگرت.
(-آلكَرْمُ): مێوەکە هێشوەکانی بەردایەوە.
(-تِ الإِبلُ): حوشترەکان زان/ بەچکەیانبوو.
(-تِ المَرأَةُ): ژنەکە منداڵی زۆری بوو.
(-تْهُ الحُمّى): ١ـتاکەگرتی ٢ـلەرزی لێهێنا.
(-القَـومُ حَلائِبَهُـم): خوێشـگەل ئاژەڵـە شـیردەرەکانیان تـەواو دۆشـیو شـیریان لەگوانیاندا نەهێشت.
(-القَومُ): خوێشـگەل خۆراکو دارایان نەما دەفرەکانیان تەکاند.
(-الثَـوبُ أَو الصَبغُ): بەرگەکەیان رەنگەکە/ بۆیەکە کاڵبووەوە/ چووەوە.
(-المَرِيضُ مِن مَرَضِهِ نُفُوضاً): نەخۆشـەکە لەنەخۆشییەکەی رزگاریبوو/ چاکبووەوە.
(نَفَّضَ-الثَـوبَ أَوالشَـجَرَةَ): بەرگەکەی یان درەختەکەی تەکاند/ راوەشاند.
(أَنْفَضَ- فُلاناً عَنهُ): فیساری لەوکردو لێیی دوورخستەوە/ لە دۆستایەتیی ئەویکرد.
(-القَومُ زادَهُم): خوێشـگەل خواردنەکەیان تەواوکرد/ براندەوە.
(-القَومُ): خۆراکیان نەماو دارایشیان فەوتاو نابوتبوون.
(-تِ الإِبِـلُ): حوشـترەکان هەموویان زانو بەچکەیانبوو.
(إِنْتَفَـضَ - الكَرمُ): مێوەکان گەڵایان جوانو بەشەوقبوو.
(-الثَوبُ أَوالشَجَرُ): بەرگەکە یان درەختەکە تەکێنرا/ راوەشێنراون هیچی پێوەنەما.
(-الفَصيلُ مافِي الضَرعِ): بەچکەکە گوانەکەی چەکوچڕدا/ شیری تێدا نەهێشت.
(إِسْتَنْفَضَ- الشيءَ): شتەکەی دەرهێنا.
(اَلنافِضُ) (فا): ١ـتەکێن/ راوەشێن ٢ـلەرزو تا.

(أَخَذَتْهُ حُمَّى نافِضٌ وحُمَّى نافِضٍ وحُمَّى بنافِضٍ): تاو لەرز گرتی.
(ثَوْبٌ نافِضٌ): جلێکی کەم کاڵەوەبوو.
(اَلنِفض): پیسایی هەنگ.
(اَلنَفَض) ئەوەی لەتەکێنراوەکە بەردەبێتەوە/ هەڵدەوەرێت.
(اَلنَفَض (ج) نُفُض): گەڵاو خورمایەك کە بەردەبێتەوەو دەوەرێت.
(اَلنُفْضَةُ): بەختەباران کە لەپارچە زەویەك دەباریێتو لەیەکێکیتر ناباریێت.
(اَلنُفْضَةُ والنَفَاض والنُفَضاء): موچرك و لەرزی تا.
(اَلنُفَاض (ج) نُفُض): تەواوبوونی خۆراکی خوێشگەل.
(اَلنُفاض والنِفاض (ج) نُفُض): ئەوەی لە تەکێنراوەکە بەردەبێتەوە/ هەڵدەوەرێت.
(اَلنُفاضَة (ج) نُفُض): ١-پاشماوەی خۆراکی فرێدراو ٢-ئەوەی لەتەکێنراوەکە بەردەبێتەوە.
(اَلنَفَضی والنِفِضّی والنِفّیضی): لەرزین و مووچرك.
(اَلنَفُوض - مَنَ النّساء): ژنێك کەمنداڵی زۆری ببێت.
(اَلنُفائِض): حوشترگەلی لاواز.
(اَلإنْفَاض) (مص): برسێتیی و گرانی و نەبوونیی/ قاتوقڕیی.
(اَلأنافِض، مفردهُ أُنفوضَة): ئەو بەرانەی دەکەونە بنی دارەکانیان.
(أُنْفُوضَة): دەنکە بەرێك کەدەکەوێتە/ دەوەرێتە بن دارەکەیەوە.
(اَلمِنْفَض): کەو/ بێژنگی گەورەوشاش.
(اَلمِنفَض والمِنْفَاض): ڕاخەرێکە لە بن درەختدا ڕادەخرێت بۆ ئەوەی بەرو گەڵاوچی لەدرەختەکە دەوەرێنرێت بکەوێتە سەری.
(اَلمِنفَضَة - عند شَرّاب التبغ): تەپڵەکی جگەرە کە سووتووی جگەرەی دەکرێتە ناو.
(اَلمُنفِض مَنَ الدجاج): مریشکێك کە لەهێلکە چووبێتەوە.
(اَلمَنفُوض): کەسێکە تایەکی سەخت گرتبێتیو لەرزی لێهێنابێت.
٢-(نَفَضَ- المَكان نَفْضاً): سەرنجی لەشوێنەکەدا تاچی تێدایە بیانناسێت و بیانزانێت/ بەسەریکردەوە.
(-الطَريقَ) ١-بەسەر ڕێگەکەدا ڕۆیشت و سەرنجیدا ٢-ڕێگەکەی لەدزو پیاو خراپ پاککردەوە.
(-فُلانٌ): بەهەموو لایەکدا ڕوانی و سەرنجیدا.
(تَنَفَّضَ-المَكانَ): سەرنجی لەشوێنەکەداو لەوەی کە تیایدایە تا بیانناسێت.
(إسْتَنفَضَ- المَكانَ): تەماشای هەموو ئەوەیکرد کە لە شوێنەکەدایە تا بیانناسێت.
(-القَومَ): سەرنجی لە خوێشگەلدا.
(-الأميرُ): میر سیخورو سووسەکەرەکانی نارد تا بزانن دوژمن مەترسیی لەشوێنەکەدا هەیە یان نا.

(اَلنَفَضَــةُ): تاقمی سـیخورو سووسـەکەران کەمــیر بەزەویــدا/ بەمــلاولادا دەیاننێرێت بزانن دوژمن و مەترسی تێدا هەیە؟

(النفيضة (ج) نفائض): دەســتە خەڵکێك کە بۆ سـیخوری و سووسەکردن دەنێردرێن بزانن دوژمن و مەترسی هەیە لەو شوێنانەدا یان نا.

(اَلنَفائِــض): ئەوانــەن کە بــەرد بەملاولادا دەهاوێن تا بزانن لەرێگەی چوونە کلێســەدا کەس و مەترسیی و دوژمن هەیە.

٢-(اَلنِفاض (ج) نُفُض): بەرکۆشــی منداڵی بچووك.

(ماعليه نِفاض): جلی هیچ پێوە نییە/ رووتە.

الملحق:

نفــض: (اَلإنْتِفاضَة): راچڵەکین، مووچڕك و لەرز/ راپەڕین.

(إنْتِفاضَة برد): مووچڕك و لەرزی سەرما.

(إنْتِفاضَة حُمّی): مووچڕك و لەرزی تا.

(اَلإنْتِفاضَة): راپەڕینی/ راچڵەکینی میللەت و جەماوەر. بزاوتنێکی رامیاریی یان کۆمەڵایەتیە کە گورجیی و هێز و پشێویی تێدایە.

(إنْتِفاضَة الشّعب): راپەڕین و راچڵەکینی گەل.

نفط:١-(نَفَطَ. نَفطاً): تووڕەبوو یان رقی وا هەستا گڕیگرت.

(-تِ العَنْزَةُ. نَفْطاً ونَفِيطاً): بزنەکە پژمی.

(-تِ القِدرُ): مەنجەڵەکە هاتە کوڵ.

(-الظَبيُ): ئاسکەکە باڕاندی.

(-الرَجُلُ): واقسەیکرد کە لێی تێنەدەگەیشتن.

(تَنَفَّطَ): تووڕەبو وا دەمارگیربوو ئاگریگرت.

(تَنافَــطَ-تِ القِدرُ): مەنجەڵەکە هەڵچوو کە فەکەی فرێدا.

(اَلنافِطَةُ)١-بــزن ٢-رَغْــوَةٌ نافِطَة: کەفێکی بڵقداری هەڵچوو.

(اَلنَفْــط الواحِــدَةُ نَفْطَة): شــقارتە دەنکە شقارتە کە چیلکەیەکە مادەیەکی فۆسفۆریی پێوەدەکەن و کە بە لێخشــاندن ئاگر دەگرێت.

(شُــخَيْطَة أو كبرِيْتَة) (عامية): شقارتە یان دەنکە شقارتەیەك.

(اَلنَفْــط والنِفْــط): (ك): نــەوت رۆنێکــی کانزاییە زوو گڕ دەگرێت و دەســووتێت وەك دەرمانیش بەکاردێت.

(اَلنُفطَة): مرۆڤی قوشقی/ کە هەر لەخۆیەوە تووڕە دەبێت/ تووڕەو تڕۆ.

(اَلنَفّاط (ج)نَفّاطَة وَنَفّاطون): ١-نەوتدەرهێن ٢-نەوتهاوێژ ٣-نەوتفرۆش.

(اَلنَفّاطــة والنَفاطَــة): ١-کانگــای نــەوت ٢-کانزای نــەوت ٣-جــۆرە چرایەکە بەنەوت رووناکیــدەدات ٤-ئامێرێکــی مســە نەوتــی تێدەکرێت و دەگرێنرێت.

(اَلنَفَطــان): خیــزەو هەناســەتوندیی کاتی تووڕە بوون.

٢-(نَفِــطَ- ت يَدُهُ نَفْطاً ونَفَطــاً وَنَفيطاً): دەســتی هەڵزڵەپی یان بڵقیکــرد و ئاوی تێزا

بەهۆی کارکردنەوە.
(تَنَفَّطَ -تِ اليَدُ): بەهۆی کارکردنەوە دەستی هەڵزڵەپی یان دەستی بڵقیکردو ئاوی تێزا.
(يَدٌ نافِطَةٌ): دەستی بڵقاوی و هەڵزڵەپیو
(ألنَفْط): ١-ئاوڵە، ٢-پیکە و بڵق کە لە دەست دەردێـت و ئـاوی تێدەزێت ئەویـش بەهۆی کارکردنەوە.
(ألنَفْطَةُ والنِفْطَةُ وَألنَفِطَةُ): ١-زیپکەو بڵق/ تلۆقی دەسـت کە بەهـۆی کارکردنەوە پەیدا دەبێتو ئاوی تێدەزێت ٢-ئاوڵە.
(ألنَفَّاطَة): زیپکە.
(ألنَفيط وألمَنفُوط (م) نَفيطَة ومَنْفُوطَة): کەسێك کە دەستی زیپکەو بڵقی بەهۆی کارەوە تێدا پەیدابووبێت. دەستبڵقاوی/ تلۆقاوی.
نفع:١-(نَفَـعَ-هُ بِكَذا نَفعـاً): بەوە (کەڵکی/ سوودی/ قازانجی) پێگەیاند.
(أنْفَـعَ - الرَجُـلُ): پیاوەکـە بازرگانیـی داردەستیکرد/ داردەستی فرۆشت.
(إنْتَفَـعَ - بِـهِ ومِنهُ): سـوودی لێوەرگرت/ قازانجی لێکرد.
(إسْـتَنفَعَ-هُ)١-کەڵك و قازانجی لەو خواست ٢-کەڵکی لێوەرگرت.
(ألنافِع): ١-کەڵکبەخش/ بەسوود/ قازانجدەر/ بەفەر/ کەڵکدار ٢-یەکێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خـودا. ئـەوە کە سـوودو فـەر بەو کەسـە دەگەیەنێت کە خۆی بیەوێت.

(ألنَّافِعَة): ئەوەی کە کەڵكو فەر بگەیەنێتو لێیوەربگیرێت.
(مانَفَعَنـی فُلان بنافِعَـةٍ): فیسـار کەڵکێکی پێنەگەیاندم/ شتێکی نەدامێ سوود بەخشبێت.
(ألنَفْـع): ١-قازانـج/ کەڵك/ سـوود / فەر/ چاکە/ دەستکەوت/ ئەوەی کە مرۆڤ بەئاوات دەگەیەنێت.
(ألنَفعِـيّ): سـوود پەرسـت کەڵکپەرسـت/ کەسـێکە رێـرەوی کەڵـك و قازانجی خۆیی گرتووە.
(ألنَفعِيَّة): خۆسوودی، رێرەوێکە هی ئەوانەیە کە تەنهـا کەڵـكو قازانج و سـوودی خۆیان بوێت.
(ألنَفْعَـةُ (ج) نَفَعات): جارێك قازانجکردن/ سـوود وەرگرتن/ فەر بەدەست هێنان/ کەڵك وەرگرتن ٢-داردەسـت کە پێی قازانـج و سوود وەرگرێت بەوەی بیوەشێنێت.
(ألنِفعَـةُ (ج) نِفَع وَنِفَع): جۆرە سـوودێك/ قازانجێك.
(ألنَفاع وَ النَفيعَة = ألنَفْفَعَة): کەڵك/ سوود/ قازانج/ فەر.
(هُـوَ حاضِـرُ النَفيعَـة): ئەو سـوودەکەی لەبەردەستدایە ئامادەیە.
(ألنُفاعَة): شتی بەکەڵك / بەقازانج/ بەسوود.
(ألنَفَّـاع): زۆر بەقازانـج/ بەکەڵك/ بەفەر/ بەسوود.

(اَلنَفــوع (ج) نُفــع): زۆر بەقازانــج/ کەڵکبەخش/ زۆر بەسوود.

(اَلمَنفَعَــة (ج) مَنافِع): ١-هەر شــتێك قازانج ببەخشــێت/ بەکەڵکبێت ســوود بەخشبێت ٢-کەڵك / فەر/ قازانج/ ســوود ٣-شــتە سوود بەخشــەکانی خانوو وەك بیرو شوێنی شتن و ئاودەست... و هتد.

٢-(اَلنِفعَةُ (ج) نِفَع ونِفْع): پارچە چەرم کە لەملاولای توێشە بەرە دەدرێت.

نفــغ: (نَفَــغَ وَنَفِــغَ وَتَنَفَّغَ-ت يَــدُهُ. نَفْغاً ونَفَغاً وَنُفُوغاً): دەســتی بەهۆی کارکردنەوە هەڵاوساو بلقیکرد و ئاوی تێزا.

نفق:١-(نَفَقَ-الشــيءُ نَفَاقــاً): ١-شــتەکە تەواوبوو ٢-لەناوچوو ٣-کەمیکرد.

(-البَيــعُ): کڕیــن و فرۆخــت زۆربــوو/ بازارگەرمبوو.

(-تِ السُوقُ): بازار چاك جووڵایەوەو گەرمبوو.

(-الرَجُــلُ أَو الدابَّةُ نُفُوقــاً): پیاوەکە مرد وڵاخەکە تۆپی.

(-الجرحُ): برینەکە توێژیگرت.

(نَفِقَ-الشــيءُ نَفَقاً): شــتەکە ١-تــەواو بوو ٢-فەوتاو لەناوچوو ٣-کەمبوو/ کەمیکرد.

(نَفَّــقَ -البضاعَــة): بــازاڕی کەلوپەلەکەی گەرمکرد فرۆختی بۆ پەیداکرد.

(أَنْفَقَ)١-هەژارکــەوت و هچی نەما ٢-خۆراکی نەما تەواو بوو.

(-المالَ): دارا و پارەکەی بەختکرد/ لەدەستیداو هیچی نەهێشت.

(-آلسَــلعَة)): بازاڕی کەلوپەلەکەی/ کاڵاکەی گەرمکرد و فرۆختی بۆ پەیداکرد.

(-القَــومُ): خوێشــگەل بازاڕیــان گەرمبوو/ فرۆختیان زۆر و زۆر باشبوو.

(-الرَجُلُ): بازاڕی کاڵاکەی گەرمدی/ کاڵاکەی فرۆشرا، تەواوبوو.

(إسْــتَنفَقَ-المالَ): داراکــەی بەختکــردو تەواوکرد/ لەدەستدا.

(اَلنافِق) (فا):١-کەمبوو ٢-تەواو بوو لەبنهاتوو ٣-فەوتاو.

(اَلنافِق - مِنَ البَضائِــع): کاڵای بازارگەرم و بەفرۆخت.

(اَلنافِقَةُ): مێی وشەی (النافِق).

(اَلنفِق): هەموو شــتێك کــەزوو ببڕێتەوەو تەواوببێت.

(فَــرُسٌ نَفِقُ الجَــري): چارەوێیەکە کەمێك غاردەکات و پاشان لە غارکردن دەوەستێت.

(اَلنَفَقَةُ (ج) نَفَقَات ونِفاق وَأنفاق):١-ئەو پول و پارەیەی کە بەختدەکرێت/ خەرجدەکرێت ٢-پێبژێــی ٣-ئەو پارەیــەی بەژنی تەڵاقدراو یان لەمێرد جیابوو دەدرێت.

(اَلمنفــاق): دەســتبڵاو/ زۆر دســەتبەقرپ/ بەفیڕۆدەر.

(اَلمَنفَقَة): هۆی فەوتان/ لەناوچوون و نەمان.

(أَليَمـينُ الكاذِبَـة مَنْفَقَةٌ للسـلعَة مَمْحَقَةٌ لِلبَرَكـة): سـوێندی درۆ کاڵا فرۆشـه، بەڵام فەڕوبێربڕە.

٢-(نَفَـقَ وَنَفِـقَ- اليَربُوعُ نَفْقـاً) (ضد): ١-گۆڕ هەڵکەنەکە لەقومووشەکەی/ کونەکەی هاتەدەرێ ٢-چووەوە کونەکەیەوە.

(نَفَّقَ - اليَربُوعُ) (ضد)١- چووە کونەکەیەوە ٢-هاتەدەرێ.

(نافَـقَ- اليَربـوعُ مُنافَقَـةً وَنِفاقاً): چووە کونەکەیەوە.

(-فِي دينِهِ): بەدڵ کافربوو بەزمان دینداریی و بڕوای دەردەخست.

(هُوَ مُنافِق): دووڕوو/ درۆزن و ریاکار/ ناڕاست.

(تَنَفَّـقَ- اليَربـوع): گـۆڕ هەڵکەنەکـەی لەکونەکەی دەرهێنا.

(أَليَربوعُ)(ضد):١-لەکونەکەی/قومووشەکەی هاتەدەرێ ٢-چووە کونەکەیەوە.

(-إنْتَفَقَ- الرَجُلُ): پیاوەکە چووەتوونێڵەکەوە/ چووخمەکەوە.

(-اليَربُـوعُ) (ضـد): ١-چـووە کونەکەیەوە ٢-لەکونەکەی هاتەدەرێ.

(-اليَربـوعَ): گۆڕهەڵکەنەکـەی لەکونەکەی دەرهێنا.

(أَلنافِقَةُ): ئەو پێستەی مسکی تیا کۆدەبێتەوە.

(أَلنافِقـاء (ج) نَوافِق وَالنُفَقَـةُ والنُفَقاء): کونێـک لەکونەکانـی گۆڕهەڵکەنەیـە کـە دەیشـارێتەوەو لەشـوێنیترەوە/ کونێکیترەوە خۆی پیشاندەدات.

(أَلنَفَـق (ج) أَنْفـاق): قومـووش کەلەژێـر زەویدایە/ تونێل/ چوخم.

(نَفَقُ السِكَّة الحَديدِيَّة): توونێڵی هێڵی ئاسن (شەمەنەفەر).

(أَلنِفاق) (مص): دوو رووییی (لەقومووشـی/ کونیگۆڕهەڵکەنەوەهاتووەچونکەخاوەنەکەی پێچەوانەی ئەوەیە کە دەریدەخات).

(المُنافِـق): دوو ڕوی درۆزن/ بێبڕواییەکـەی دەشارێتەوەو بڕوا درۆزنیەکەی دەردەخات.

(أَلمُنافَقَـة) (مـص): دووڕوویـی، ئاوەژووی دەروون دەربڕین.

٣-نَيفَقُ السروالِ: (ناوگەڵی نافەکی) شەرواڵ (فارسیه).

الملحق:

نفق: (أَلإنفاق): بەختکردنی پارە/ دراوو دارا لە هەر ڕوویەکەوە بێت.

(إنفاق مبلغ لِشـراءِ الأَثاث): ١-خەرجکردنی پارە بۆ کڕینی کەلوپەلی ناو ماڵ.

(أَلإنفـاق): کـردەو چۆنیەتـی بەختکردنی پارەو دارایی دەوڵەت.

(سِياسَـةُ الإنْفَاق): رامیاریـی بەختکردنی پارەی دەوڵەت.

(طُرُق الإنفاق): ڕێگـەی بەختکردنی داراو پارەی دەوڵەت/ چۆنیەتیی بەختکردنی.

نفل: ١-(نَفَلَ- الرَجُلَ نَفْلاً): چاكەو پیاوەتیی بێپاداشت لەگەڵ پیاوەكەدا كرد.
(-هُ النَفَلَ): شـتێكی لەتالانی و دەسـتكەوت دایە یان شتێكی پێبەخشی.
(-القائِدُ الجنْدَ): ئەو تالانیو دەستكەوتانەی سەربازەكان دەستیانكەوتبوو دای بە خۆیان و لێی بەشكردن.
(نَفَّلَ-هُ): لەبەشی خۆی زۆرتری دایە.
(-هُ النَفَلَ): لەتالانیی و دەسكەوتیدایە.
(أنْفَلَ - هُ النَفلَ): تالانیی دایە.
(تَنَفَّلَ): نوێژی سونەتیكرد.
(-علـى أصحابـهِ): لەهاوڕێكانـی تالانی و دەستكەوتی زۆر تر وەرگرت.
(-مِنهُ الشيءَ): داوای شتەكەی لێكرد.
(إنْتَفَلَ): نوێژە سوننەتەكانیكرد.
(-الشيءَ مِن فُلان): داوای شتەكەی لە فیسار كرد/ لێی خواست.
(ألنَافِلَـةُ (ج) نَوافِـل): ١-ئـەوەی كەدەیكەیتو بەسەرتەوە ئەرك نییەو پێویست نییە، سوننەت ٢-كچە زاو كوڕەزا ٣-دەسكەوتی تالانی ٤-بەخشش.
(هُوَ كثـيرُ ألنَوَافِل): ئەو پیاوەتیی و چاكەو بەخششی زۆرە.
(ألنَفْـل): ١-ئەوەی كە دەیكەیت و لەسـەرت ئـەرك و پێویسـت نییە، سـوننەت ٢-ئەوەی لە مـرۆڤ داواكـراوە كە بیكاتو سـەرباری پێویستكراو فەرزی سەری/ سوننەت.

(ألنَفَل (ج) نِفَـال وأنْفَال): ١-دەسـتكەوتی تالانی ٢-خەڵات/ بەخشش ٣-پتر/ زیاتر.
(لِهذا نَفَلٌ على ذلـك): ئەمە لەوە پتر ترە/ زیاترە.
(ألنَفَل الواحِـدَة نَفَلَة)(ن): سـێپەرە/ وێنجە: گیایەكی سـالانەیە یان تەمەندرێـژە، گەڵاكەی سـێپەرەیە، گوڵەكەی سـپییە یان پەمەییە یان زەردەو بۆنی خۆشە، وڵاخ و ئاژەڵ باش پێی قەڵەو دەبێت، گوڵەكەی شـیلەیەكی شیرین دەردەكات و هەنگ حەزی لێدەكات و بەدوایدا دەگەڕێت.
(ألنُفَل): سێ شەوی دوای سێشەوەی سەرەتای مانگ (الغُرَر): سێ شەوی سەرەتای مانگ.
(ألنَوفَـل) (ج) نَوفَلُـون): ١-پیاوی جوامێر/ بەخشندە ٢-بەخشش ٣-دەریا.
٢-(نَفَلَ. نَفلاً): سوێندیخوارد.
(-الرَجُلَ عَن نَسَـبِهِ): رەچەڵەكی پیاوەكەی بەدرۆخستەوە.
(أنفُل عَن نَفسِـكَ إن كُنـتَ صادِقاً): ئەگەر راسـتدەكەیت ئـەوە بـەدرۆ بخـەرەوە كـە پێیانەوە ناویت/ داویانەتە پاڵت.
(نَفَّلَ-هُ): سوێندیدا.
(-عَن فُلان): بەرگری لێكرد/ لەسەریكردەوە.
أنْفَلَ- لَهُ: سوێندی بۆ خوارد.
(إنْتَفَـلَ): ١-سـوێندیخوارد ٢-پاكانەی كرد/ دڵی دایەوە، داوای لێخۆشبوونی كرد/ پۆزشی هێنایەوە.

(-مِنَ الأَمرِ أَو الكَلام): حاشای لەکارەکە یان قسەکەکرد/ خۆی لێبێگوناح کرد.
(قـالَ لي قـولاً فانتفَلْتُ مِنْهُ): قسـەیەکی (پێوتم/ بەڕوومدادا، حاشـام لێکرد وتم هی من نییە.
(-مِنَ القَوم): خۆی لەیاریدەدان و پشتگیریی خوێشگەل کێشاوەو بەلایاندا نەچوو.
٣-(ألنَوْفَـل) (ج) نَوفَلـون): ١-گەنجی جوان ٢-(ح) نێرە کەمتیار.
(ألنَوفَلَةُ): ١-کانە خوێ/ خوێگا ٢-خوێدان.
نفه: (نَفَهَ - الرَجُـلُ نُفوهاً): کابرا بێورەو زیرەکردوو بوو.
(-الجَمَـلُ): حوشـترە سەرکێشـەکە ملیداو رامبوو.
(نَفِهَ - ت نَفْسُهُ نَفَهاً): پەکیکەوتو شەکەتبوو.
(نَفَّـهَ وأَنْفَـهَ- الناقَـةَ): مێحوشـترەکەی شەکەتکردو پەکخست.
(إِسْـتَنفَهَ- الرَجُـلُ): پیاوەکە پشـوویدا و حەسایەوە.
(ألنَافِه (ج) نُفَّهٌ): شەکەتی پەککەوتە.
(ألنَافِه والمَنْفُوه): بێورە و بێدڵی زیرەکردوو/ زۆر ترسنۆك.
(جَمَـلٌ مُنَفَّـهٌ): حوشـترێکی پەککەوتـەو شەکەت/ لاکەوتە.
نفو: (نَفـا-هُ يَنْفُو. نَفْواً): حاشـای لێکرد/ نکووڵیی لێکرد/ دانی پێدانەنا.

(نُفَاوَةُ الشيءِ): پاشماوەی شتەکەو گەندەکەی.
(ألنَفوَةُ): دەرچوون لەشارێکەوە بۆ شارێکیتر.
(نَفْوَةُ الشيءِ): پاشماوەو گەندەی شتێك.
نفي: (نَفَى - عَنهُ يَنفي. نَفياً): خۆی لێلاداو لێی دووركەوتەوە.
(-هُ عَنْهُ): لێیلاداو پاڵیپێوەناو لێیلایبرد.
(-الشَعَرُ): قژەکە هەڵوەری.
(-هُ): دەریکرد/ دەریپەڕاند.
(-الرَجُلَ): بەندیکرد لەبەندیخانەدا.
(-الرَجُلَ مِن بَلَـدِه): پیاوەکەی لەوڵاتەکەی خۆی بۆ وڵاتێکیـتر دەریکـردو ئاوارەیکرد/ دەربەدەریکرد.
(-السَيلُ الغُثاءَ): لافاوەکە/ لێشاوەکە پیسیی و پووش و پەڵاشەکەی هەڵگرتو برد.
(-الشـيءَ): حاشای لەشتەکە کردو دانی پێدا نەنا/ نکووڵییکرد.
(-تِ السَّـحابَةُ ماءَهـا) هەورەکـە ئاوەکەی رشتو داکرد.
(-الصَيْرَفِـيُّ الدُراهِمَ. نَفيـاً وَنَفَيانـاً): پارە گۆڕەرەوەکە بۆ بژارکردنـی/ جیاکردنەوەی خراپەکانی لە باشەکانی.
(-تِ الريحُ التُرابَ): باکە گڵەکەی هەستاندو رافراند.
(نَفَّى - هُ): تەواو دووریخستەوەو دەربەدەریکرد یان باکە خۆڵەکەی تەواو ورووژاندو هەستاند.
(نافى - هُ. مُنافاةً): راویناو شوێنیکەوت.

(هــذا بنَافــي ذاكَ): ئەمــە لەگــەڵ ئەومدا جيايەو پێچەوانەى ئەوميە يان دژى ئەوميە.

(تَنافى - الرجــالُ تَنافِياً): پياومكان لەيەك جيابوون/ ناكۆكبوونو پاڵيان بەيەكەوە نا.

(-تِ الأشــياءُ): شــتەكان لەيەك جيابوونو لەيەك نەچوون/ جياواز بوون.

(إنْتَفــى): ١-دمربەدمربــوو/ رمهەنــدە بــوو ٢-نەويستراو بوو/ دمركراوبوو.

(-عَنهُ): لێيدووركەوتەوە/ لێيلاچوو/ وازيليهێنا.

(-الشَعَرُ): مووەكە/ قژەكە هەڵومرى.

(-الشيءُ): شتەكە بنجبەست نەبوو/ لەقبوو/ شلۆقبوو.

(-مِن وَلَدِهِ): حاشــاى لە منداڵەكەيكردو بە زارۆڵەى خۆى دانەنا.

(-فُــلانٌ مِــن فُــلانٍ): فيســار پەيوەندى و چارەى فيسارکەسى نەويســت/ خۆى لێلاداو بێزى لێيهاتەوە.

(ألنافِي) (فا): ١-حاشــا لێكەر ٢-دوور خەرەوە ٣-وازلێهێنەر.

(نَفــاءُ الشــيءِ وَنَفاتُــهُ وَنَفِيَتُــهُ وَنُفايَتُهُ وَنَفايَتُــهُ): ١-گەندەى شــت كەفرێدەدرێت و وازى لێدەهێنن ٢-خڵتەو پاشماوەى شت.

(ألنَفِيَة (ج) نَفَيات): ١-جارێك رەهەندەكردن/ دەركــردن/ دەربەدەركــردن ٢-ســفرەيەكە لەگەڵاى خورما دەكرێت گۆشــت يان پەنيرى لەبەر هەتاو لەسەر هەڵدەخەن تا وشكبێت.

(نَفْيَــةُ الشــيءِ): ١-گەنــدەى شــت كــە توورێدەدرێــت/ وازيلێدەهێنێــت ٢-خڵتــەو پاشماوەى شتەكە.

(ألنَفيان) (مص): ١-گلو خۆڵێك كە با لەبن درەختەدا كۆيدەكاتەوە ٢-دەستەيەكى سوپاكە لــە ســوپاكە جيادەبێتەوەو زيــادرەو دەبێت (ئەمە بە لێچواندنە).

(ألنَفِيّ=ألمَنْفِيّ):١-دەربەدەركراو/رەهەندەكراو ٢-نەويستراو / پەركراو/ دوورخراوە ٣-فرێدراو ٤-دەســتەيەك كەلەســوپا جيــا دەبێتــەوەو زيادرەودەبێــت ٥-ئــاو كــە مەنجەڵــى كولاو دەيرێژێــت ٦-ئەو ئاردەى بــەرداش لەهاريندا فرێيدەدات و لايدەخات ٧-قەڵغانێك كە لەگەڵاى دارخورما دروســتدەكرێت ٨-بەردوچەو شتێك كە سمى ولاخ فرێيدەدات ٩-گلو خۆڵێك كە لە بنى درەختەكە داكويدەكاتەوە.

(هــذا إبــنُ نَفِــيٌ): ئەمــە باوكى حاشــاى لێكردووەو دەڵێت زارۆڵەى من نييە.

(نَفيُ الشيءِ): ١-گەندەى شت كە فرێدەدرێت ٢-خڵتەو پاشماوەى ئەو شتە.

(ألنَفِيَّةُ): ١-مێى وشەى (النَفي). ٢-سفرەيەكە كەلە گــەڵاى دارخورما دەچنرێت گۆشــت و پەنــيرى لەســەر هەڵدەخــەن، دەيخەنە بەر هەتاو تا وشكبێت.

(ألمَنفى (ج) مَنافٍ): رەهەندەگا/ دەربەدەرگا/ ئاوارەشوێن/ ئاوارەگا.

(اَلْمُنِفِــيّ): ١-ئاواره/ دەربــەدەر/ دوورخراوه ٢-دەرکراو ٣-لابــراو پاڵپێوه نــراو/ پەرکراو ٤-لێخراو.

(-فِي الكَلام): نەرێ لەقسەدا: (نهٔ / نا/ نەخێر) که (ئامرازی نەرێن).

نقّ:١-(نَقَّ-الضِفدَعُ نَقيقاً): بۆقەکه قیراندی.

(-الدجاجَةَ): مریشکەکه گاراندی.

(-الحجلةُ): کەوەکه خوێندی.

(-الرَخمهَ): داڵەکەرخۆرەکه قڕاندی.

(-العَقرَب): دووپشکەکه زیکەیهات.

(-الظَليم): وشتر مرخەکه خوێندی.

(-الهِرُّ): پشیلەکه میاواندی.

(نَقَّــت ضَفادِعُ بَطنِهِ): ســکی له برســاندا قۆرەقۆریبوو.

(نَقِّ الوَلَدُ): منداڵەکه کورووزایەوه (عامیه).

(اَنَقَّ): کەوته جقەجق و نقەنق.

(دَخَلَ فِي النَقيق): کەوته نقەنقو جقەجق.

(اَلنَقّاق): ١-نقەنقکەرێکی زۆر ٢-(ح) بۆق.

(اَلنَقّاقَــة): میــی وشــەی (اَلنَقّاقــة) -(ح) بۆقەمێ.

(اَلنَقُــوق (ج) نُقُــق وَ نُــقّ): دەنگــەوەره/ دەنگدەرهاتوو.

(ضِفدِعٌ نَقــوق): بۆقێکی دەنگــەوەر/ قیره قیرکەر.

(اَلنَقيقِيّــات)(ح): زینــدەوەری بچووکه که یەك خانەی هەیه لەشــیان تووکێکی زۆر ورد دایدەپۆشــێت یاریدەی بزواندنیاندەدات یان هی خواردنیان دەدات لەناوی شیرینی وەستاو یان رۆیشــتوودا هەروەها لەناوی دەریادا زۆر دەبێت.

٢-(نَقنَــقَ- الضِفــدَعُ): بۆقەکــه ناوبەنــاو قیراندی و درێژەی بەقیڕەیدا.

(تِ العَينُ): چاوەکه به قووڵدا چوو.

(اَلنِقْنِــق (ج) نَقانِــق (ح)): نێرەی وشــتر مرخ.

٣-(النَقّانِق = اَلَقانِق) (ط): گۆشــتی بەرازو هێڕی سوورەوەکراو.

نقب: (نَقَــبَ- الحائِطَ. نَقبــاً): دیوارەکەی کونکرد/ سمی.

(-الخُفَّ): پێڵاوەکەی پینەکرد.

(نَقَبَتِ النَكبَــةُ فُلاناً): نەهامەتی تووشــی فیسار بوو.

(-فُــلانٌ فِي الأَرضِ): فیســار بەســەرزەویدا رۆیشت، گەڕا/ گوزاریکرد.

(-عَــنِ الأَخبــارِ): بــۆ هــەواڵ و بــەدوای هەواڵەکاندا گەڕا/ شوێنیکەوت یان گەیاندی.

(نَقَبَ وَنَقُبَ على القوم. نِقابَةً وَنقابَةً): بوو به سەرۆکی جڤات و سەرپەرشتیار.

(اَلنِقابَة): جڤات/ سەندیکا.

(اَلنَقابَة): جڤاتیکردن/ کاری سەندیکاکردنه.

(نَقِــبَ - علــى القَــوم): بوو بەســەرۆك و سەرپەرشتیاری خوێشگەل.

(-الخُفُّ المَلْبوسُ): پێڵاوە لەپێکراوەکە درا/ کونبوو.
(-البَعِيرُ): بنپێیی حوشترەکە تەنکبوو/ سووا.
(-الرَجُلُ): ڕێی کێوەکانی گرتەبەر.
(-فِي البلاد): بەوڵاتدا گەڕا/ ڕۆیشت.
(نَقَّبَ عَنِ الشَيءِ): زۆر بەدوای شتەکەدا گەڕاو پشکنی و ئەملاولایکرد.
(-فِي الأرضَ): بۆ شوێنێك گەڕا تا خۆی تێدا بشارێتەوەو ونبكات/ هەڵبێت.
(ناقَبَ-ەنِقاباًوَمُناقَبَةً): شانازیی‌ڕەوشتبەرزیی و چاکییەکانی خۆی بەسەرداکرد.
(أَنْقَبَ البَعِيرُ): بنسمی حوشترەکە تەنکبوو.
(-الرَجُلُ): بوو بە سەرۆك و سەرپەرشتیاری جڤات/ خوێشگەل/ کۆمەڵ/ خەڵك.
(-فُلانٌ): بنی پێی/ بنسمی حوشتری فیسار تەنکبوو.
(-فِي الأَرضِ): بەسەر زەویدا ڕۆیشت/ گەڕا.
(تَنَقَّبَ- عَنِ الشَيءِ): زۆر بۆشتەکە گەڕا/ پشکنی/ کنەیکرد.
(اَلنَاقِبُ) (فا): ١-سۆراغکەر/ گەڕۆك بەدوای شتدا/ لێکۆڵەرەوە ٢-(طب): دەردێکە مرۆڤ لەزۆر ڕاکشانەوە دەیگرێت یان دوومەڵە لەلای تەنشتەوە دەردەچێت و سەرەکەی لەناوەوەیە.
(الناقِبَةُ): ١-مێی وشەی (الناقب)ە ٢-(طب) ئەو دوومەڵەیە کە لە سەرەوە باسمانکرد.
(اَلنَقْبُ) (مص): ١-ڕێی ناوشاخان ٢-(طب) دوومەڵی تەنشت، کەمەر ٣-گەڕیی.
(اَلنَقْبُ (ج) نِقَاب وأَنْقاب): کون.
(نَقْبُ العَينِ = القَدح): چارەسەری ئاوی ڕەش کە لە چاودا دەبێت (لە بنچینەدا لەهەڵکۆڵینی سمی وڵاخەوە هاتووە کە بەیتاڵە کە شتی تێچووی (لێدەردەهێنێت).
(اَلنُقْبُ): گەڕیی.
(-(ج) نِقاب وَأَنقاب): ڕێی ناو شاخ.
(اَلنُقَبُ): گەڕیی.
(اَلنِقْبَةُ): ١-چۆنیەتیی چارشێوگرتنەوە/ سەرپۆش بەسەردادان.
(إمْرَأَةٌ حَسَنَةُ آلنِقْبَة): ژنێکە جوان چار شێوی گرتۆتەوە/ سەرپۆشی بەسەرداداوە/ لێی هاتووە ٢-شوێنکارو پاشماوە.
(إنَّ عَلَيهِ نِقْبَةً مِن كذا): شوێنی ئەوەی/ شوێنکاری ئەوەی پێوەیە.
(اَلنُقْبَةُ (ج) نُقَب): ١-ڕوو/ دەموچاو/ ڕوخسار ٢-سەرەتای گەڕیی ٣-ژەنگ ٤-کون.
(اَلنِقاب (مص) (ج) نُقُب): ١-پیاوی زۆر زانا ٢-ڕێگەی سەخت و دژوار ٣-سك.
(فَرخانِ فِي نِقابٍ): دوو بەچکە لەسکێکدا (بۆ لێچواندنی ئەو دوانەیە)/ دووانەی سکێکن، بە دوو کەس دەوترێت کە لە یەك دەچن.
(النِقابَة): نەقابە/ جڤات: کۆمەڵە خەڵکێکن. هونەرمەندن یان خاوەنپیشەن بۆ پارێزگاریی مافە هاوبەشییان ئەو جڤاتەیان پێکەوە ناوە.

(ألنَقّــاب): ١-كاركــردەو دەســتڕۆیو لەکاردا ٢-کەســێکە کــە زۆر دەکۆڵێتەوەو بــە دوادا دەگەڕێت و سەرنجدەدات.
(ألنَقیب): ١-کونکراو/ ســمراو ٢-(مو) بلوێر ٣-زمانەی (ترازوو/ شــایەن) ٤-(-(ج) نُقَباء): پێشــەواو سەرپەرشــتیارو ســەردارو راگری کاروبــاری نەتــەوەو خوێشــگەل (بۆیە وای پێدەڵێــن چونکە لەکاروباریــان دەکۆڵێتەوە سەرپەرشــتیان دەکات) ٥-(ا ع): پلەیەکــی ئەفسەرە لەسوپادا، پلەی (رَئیس): سەرۆك.
(نَقیبُ الأشراف عِندَ المُسْلِمین): کەسێکە کە سەید بێت کە سەرپەرشتیی ئەوانە دەکات کە سەیدنو لەگوزەرانو باری ژیانیان دەکۆڵێتەوە ٦-ســەرۆك (جڤــات/ نەقابــە/ ســەندیکا): کەهەڵدەبژێردرێــت بــۆ ئــەوە جڤاتەکــە/ نەقابەکە بەڕێوەببات و سەرپەرشتی بکات.
(کَلْبٌ نَقیبٌ): سەگێکە بنی زمانی هەڵکۆڵراوە تا دەنگی کز بێت (پیاوی بەدخواز ئەوە دەکات بــۆ ئەوەی بەماڵەکەی نەزانــن و میواندارییی کەس نەکات).
(ألنَقیبَة): ١-مێی وشەی (ألنَقیب): ٢-دەروون ٣-ئاوەز/ ئەقل ٤-سروشــت ٥-راوێژکردن ٦-راو قسە رۆیشتو و دروست.
(فُلان مَیمونُ النَقیبَة): فیسار ئەزموونەکانی ئەنجامچاکەو پیرۆزە.
(ألأنقاب): گوێکان (ئەم وشەیە تاکی نییە).

(ألنُقْب): شــوێنی پشــکنین. ئەو شــوێنەی کەبەیتــاڵ لەســمی ولاخــدا دەگەڕێــت و دەیکۆڵێتــەوە بــۆ دەرهێنانــی ئەو شــتە لە سمەکەدا چەقیوە.
(ألنَقِــب (ج) مَناقِــب): ڕێبــازو ڕێگاکانــی ناوشاخ.
(ألمِنْقَب): زانای گەورە کە لەشت دەکۆڵێتەوەو بۆی دەگەڕێت و ســۆراغیدەکات ٢-کونکەرە/ سمۆ/ قەڵەم/ مەکتەبە ٣-ڕێگەی ناو شاخ.
(ألمِنْقَب والمِنقَبَة): ئامێرێکی ئاسنە بنی پێی ولاخی پێ پاکدەکرێتەوە.
(ألمَنقَبَــة (ج) مَناقِب): ١-چاکەو کاری مەزن کەشایستەی پێدا هەڵدانە ٢-پێوەنازین ٣-دیوار ٤-ڕێی ناو شاخ ٥-تەسکەڕێی نێوان دووخانوو/ کۆڵانی تەنگەبەر.
(مَناقِبُ الإنْســان): ڕەوشــتی بەرزو جوانو جوامێریی مرۆڤ کەپێیناسراوە.
٢-(نَقَــبَ- الثَوبَ نَقباً): جلەکــەی والێکرد وەك شەرواڵ لەناوقەددا ببەسترێت.
(-الفَرَسُ): چارەوێکە لەغاردا هەرچوارپەلی هەڵبری و کۆکردەوە.
(تَنَقَّــبَ وَ انْتَقَــبَ -تِ المَــرأةُ): ژنەکــە پەچەیگرتەوە/ پەچەیپۆشی.
(ألنِقــاب (ج) نُقُــب): ســەرپۆش/ پەچە/ چارشــێو کە ژن دەیپۆشێت و ڕووی خۆی پێ دادەپۆشێت.

(ألنُقْبَـةُ (ج) نُقَب): بەرگێكە وەك بەركۆش وەك شەرواڵ لەكەمەر دەبەسترێت.
٣-(ناقَبَ-ەُ نِقاباً): روو بەروو پێیگەیشـتو دی بێئەوەی كاتی یەكتر بینینان هەبێت دی.
(وَرَدتُ المـاءَ نِقابـاً): بە رێكـەوت ئاوەكەم دەسـتكەوتو دۆزیمـەوە/ بەبێ ئـەوەی بە شوێنیا بگەرێم.
٤-(ألنُقبَة (ج) نُقَب): رەنگ.
الملحق:
نقــب: (ألتَنْقِيب): هەڵكەنـدنو هەڵكۆڵینو بەدوادا گەرانێكی هەتەرانەو سەرومر.
(بالَـغَ فِي التَنْقِيــب): زۆر بە دوای شـتێكدا گەرا/ پشكنینی زۆریكرد.
(ألتَنْقيب): گەرانو سۆراغكردن و هەڵكەندنو هەڵكۆڵینی زەوی بەدوای پاشـماوەی دێریندا یان كانزاكانداو كانزا شلەكاندا.
(التَنقيب عَنِ النفط): لە زەویدا بۆ نەوت گەران، هەڵكەندنو هەڵكۆڵینی زەویو بیرلێدان بۆی.

---

نقــت: (نَقَـتَ - العَظْـمَ نَقْتـاً): مۆخـی ئێسقانەكەی دەرهێنا.
نقث:١-(نَقَـثَ- العَظـمَ. نَقْثـاً): مۆخـی ئێسقانەكەی دەرهێنا.
(-الشـيءَ ألمَنْفُـونَ): زەویەكـەی بۆشـتە شاردراوەكە هەڵكۆڵی تادەری بهێنێت.
(-الرَجُلُ فِي الأمرِ أو ألسَيرِ): پیاوەكە پەلەی لەكارەكەدا یان رۆیشتنەكەدا كرد.
(-الحَديـثَ): قسـەكانی بەسـەریەكدا داو تێكەڵوپێكەڵیكرد.
(-فُلاناً بالكلام): بەقسە ژانی بردە دڵیەوە.
(-الأرضَ بِيَـدِهِ): بەپاچەكۆڵـەو خاكەنازو بەدەست زەویەكەی شیكردەوە.
(-عَنِ الشيءِ): بۆ شتەكە زەویەكەی هەڵكەندو بۆی گەرا.
(نَقَثَ- الرَجُل): پەلەیكرد.
(تَنَقَّثَ-ەُ): لاواندی و داوای لێكرد سۆزی بۆی بجووڵێت.
(-ضَيْعَتَـهُ): دەسـتەبەری موڵـكو زەویو زارەكەیبوو.
(إنْتَقَثَ- العَظمَ): مەغزی/ مۆخی ئێسقانەكەی دەرهێنا.
(-الشـيءَ المَدفـونَ): بۆ شـتەكە زەویەكەی هەڵكۆڵی تا دەریبهێنێت.
(ألنَقْث) (مص): دووزمانیی/ بەدیی.
(نَقّاث): ناوی كەمتیارە.
٢-(نَفْثَلَ- الشَيخُ نَفْثَلَةً): پیرەكە بەرۆیشتنەكەی تۆزیهەستاند.
نقــح: (نَقَحَ - العَظْـمَ نَقْحـاً): (مەغزی/ مۆخی) ئێسقانەكەی دەرهێنا.
(-الجِـذعَ): قەدی درەختەكـەی هەڵپاچی و پاكیكردەوەو گرێ و گۆڵی پێوە نەهێشت.
(-الشيءَ): شتەكەی پوختكردو توێكڵی پێوە نەهێشتو چاك و خراپی لێكجیاكردەوە.

(نَقَّحَ- العَظمَ): مۆخی ئێسکەکەی دەرهێنا.
(-الجَـذعَ): قەدی دارەکەی هەڵپاچی و گرێی پێوە نەهێشت و پاکیکرد.
(-الشَـيءَ): توێکڵـی لـە شـتەکە کـردەوە پوختیکرد/ بژاریکردو پیسیی پێوە نەهێشت.
(-الـکلامَ): ئاخاوتنەکـەی جوان دارشـت و ڕێکیخست/ بژاریکرد.
(-السُّنونُ الرَجُلَ): سـالأنی تەمەن کاری لە پیاوەکە کرد.
(أَنْقَحَ - الكَلامَ): قسـەکەی ڕێکخست و جوان دارشت/ بژاریکرد.
(-الرَجُلُ): نیگارو خشـڵی شمشێرەکەی لە ساڵی قات و قڕی و (نە دارایی و نەبوونیدا) لێکردەوە.
(تَنَقَّحَ - شَحْمُهُ): چەوریی لەشی کەمیکرد.
(إنْتَقَـحَ - العَظْـمَ): مەغزی ئێسـقانەکەی دەرهێنا.
(اَلنقْــح) (مــص): ١-دەرهێنانــی مەغزی / مۆخی ئێسقان ٢-هەڵپاچینی قەدی دارو گرێ لێکردنەوەی و پوختکردنی ٣-گەواڵە هەورێکی سپیی هاوینە.
(اَلنِقْح): زانای ئەزموووندار.
(اَلنَقَح): لی پاك، نیان، هەرشتێکی پاککراو.
(التَنْقِيح): ١-پوختەکردنو بژاردنی هەرشتێك و پاك و پیس لێکجیاکردنەوەی ٢-کورتکردنەوەو چڕکردنی (واتە) لەگەڵ ڕوونیی واتاکەی.
(نَقَخَ: نَقَخَ-هُ): لێیدا.

(-دَماغَــهُ): مۆخــی شــکاند/ کاسەیســەری شکاند.
(إنْتَقَــخَ - المُخَّ مِنَ العَظِــم): مۆخەکەی لە ئێسقانەکە دەرهێنا.
(اَلنُقاخ): ١-ئاوی ساردی ڕوون ٢-تەندروستیی ٣-ئاسایش ٤-نووستن.
(نُقاخُ کُلِّ شيءٍ): پوختەی هەموو شتێك.
(هذا نُقاخُ العرَبيَّة): ئەمە کورۆك و پوختەی زمانی عەرەبییە.
نقد: (نَقَدَ - الدَراهِمَ وَ غَيرَها): پارەکان یان شتەکانی سەرنجدا/ تێبڕوانین تا ساغو ناساغ/ چاكو خراپیان جیابکاتەوە.
(-الـكَلامَ): ڕەخنەی لــە ئاخاوتنەکە گرت و باش و خراپی دەرخست.
(-فُلانــاً وَلِفُلانٍ الثَمَنَ): نرخی شــتەکەی/ پارەکەی دەست بەدەست دا بە فیسار.
(-هُ دِرَهماً): درهەمێکی دایە.
(نَقِــدَ - الضِــرسُ أَو القَــرْنُ): خرێکە یان شاخەکە کولۆر بوو و شکا.
(نَقِدٌ): کولۆر/ خوراوو شکاو.
(-الحافِرُ): سمی وڵاخەکە توێژی هەڵدا.
(-الجِــذعُ): مۆرانــە دایــە قــەدی دارەکەو خواردیو بۆشیکرد.
(ناقَدَ-هُ مُناقَدَةً): وتووێژی لەســەر کارەکە لەگەڵدا کرد.
(أَنْقَدَ - الشَجَرُ): درەختەکە گەڵایگرت.

(تَنَقَّدَ - الدراهِمَ وَغَيرَها): سەرنجی لە پارەکە یان شتەکەدا، تا باش و خراپیان لەیەك جیابکاتەوە ساغ و ناساغیان بزانێت.
(تَناقَدَ - الدراهِمَ): پارەکانی جیاکردەوە قەڵب و ساغەکانی هەڵبوارد و قەڵبەکانی دەرهێنا.
(إنْتَقَدَ - الدراهِمَ): ١-پارە قەڵبەکانی لەوانی تر جیاکردەوە ٢-بەدەستیی پارەکەی وەرگرت.
(-تِ الأَرضَةُ الجِذعَ): مۆرانە قەدی درەختەکەی خواردو بۆشیکرد.
(-الوُلْدُ): کورەکە بوو بە هەرزەکار.
(-الشِعْرَ علی قائِلِهِ): کەمووکوریی هەڵبەستەکەی بە هۆنەرەوەکەی وت و بۆی دەرخست.
(-الـكَلامَ): باشـی و خراپیی/ جوانیی و ناڕێکیی ناخاوتنەکەی دەرخست.
(اَلناقِـد (ج) نَقَـدَة وَنُقَّـاد): ١-رەخنەگـر ٢-کەسێکە شت بە پارەی دەستی بکرێت نەك بە قەرز.
(اَلنَقْـد) (مص) (ج) نُقود): ١-شـتکرین بە پارەی دەستی ٢-پارە/ دراو.
(اَلنَقدان): ١-زێرو زیو.
(نَقْدُ العَرُوس) (عامیە): مارەیی بووك.
(اَلنِقْد والنُقْد): ١-کەمگۆشـت/ لەر ٢-یەکێك دەرمنگ بگاتە هەرزەکاریی و دەرمنگ باڵقبێت.
(اَلنَقَد): سووك و ڕسواو پوشتانی ناوخەڵك.
(اَلنَقَّـاد): نەوکەسـەی پـارەی قەڵبو باش لێکجیا دەکاتەوە یان شـارەزایانە شتی باش و خراپ لەیەك جیادەکاتەوە.
(اَلمُنتَقَد): ڕەخنەگرتن. لێکۆڵینەوەو تووێژکردن.
٢-(نَقَـدَ - الطائِـرُ الفَـخَّ أَو الحَـبَّ. نَقْداً وَتَنقـاداً): مەلەکـە/ باڵندەکـە دەنووکـی بەداوەکەدا یان دانەکەدا دا.
(-تْهُ الحَيَّةُ): مارەکە پێوەیدا.
(-الرَجُلُ الشيءَ وإلی الشيءِ بِنَظَرِه): پیاوەکە بە دزییەوە/ لەژێرەوە تیلەی لەشـتەکە گرت یـان خۆش خۆش و بەدزیەوە تەماشـایکرد/ سەرنجیدا بۆ نەوەی پێینەزانن.
(مِنقادُ الطائِر (ج) مَناقِيد): دەنووکی مەل/ باڵندە.
٣-(اَلنَقَـد (ج) نِقادٌ وَنِقـادَةٌ (ح) الواحِدَةُ نَقَدَةٌ): رەگەزە مەڕێکە قاچکورتەو بچووك.
(نَقْدَة): مەڕێکە لـەو قاچکورتانە (بۆ نێرو مێ دەوترێت).
(-مِـن آلصِبْيـان): منداڵی سیسـەمارە کە زگماکەو هەر گەورە نابێت.
(اَلنَقَـد و النُقْد الواحِدَةُ نَقَدَة ونُقُدَة) (ن): جۆرە درەختێکە.
(اَلنَقَّاد): شوانی مەرە پێکورتو بچووکەکان.
(اَنْقَدُ (ح) = اَلقُنْفُذ): ژیشك.
(بـات بِلَيلِ أَنْقَـدَ): وەك ژیشـك بێدار بوو ( چونکە ژیشك بە شەو ناخەوێت).
(اَلأَنْقَدُ): ١-(ح) کیسەڵ ٢-ژیشك.

(اَلإِنقِدان) (ح): كيسەڵ.

نقذ: ١-(نَقَـذَ وَنَقَّذَ وَأَنْقَـذَ فُلاناً مِن كذا. نَقْذاً): فيسارى لەوە (رزگاركرد/ سەرفرازكرد/ قوتاركرد).

(نَقِـذَ. نَقَـذاً): سـەرفرازبوو/ رزگاربـوو/ قوتاربوو.

(تَنَقَّذَ وآسْتَنقَذَ-هُ مِن كذا): لەوە رزگاريكرد سەرفرازيكرد.

(اَلنَقْذ) (مص): ١-رزگاربوون/ سەرفرازبوون ٢-خۆش و ساغبوون/ بێوەيبوون.

(نَقْذاً لَـكَ): خـۆش و سـاغبيت/ بێوەيبيت (بەيەكێك دەڵێن كە هەڵنووتێت) لەبنچينەدا.

(نَقَذك اللهُ نَقْذاً): خودا بێوەيتكاتو بتپارێزێت.

(اَلنَقَذ) (مص): ئەوەى رزگارتكردووە.

(اَلنَقِيـذ): ئـەوەى لـە دەسـتى دوژمنـت دەرهێناوەو رزگارتكردووە.

(اَلنَقِيذَةُ (ج) نَقائِـذ): ئەوەى لە ژێرچنگى دوژمنـت دەرهێناوە، لە چارەوێ يان زرێ يان هەرشتێك بوو بێت.

(هُوَ نَقيذَةُ بُؤسٍ): ئەو رزگاربووى (كوڵۆڵيى و داماوييە/ هەژارييە).

٢-(اَلأَنْقَذُ) (ح): ژيشك.

نَقَرَ-ه نقراً): لێيدا.

نقر:١-(نَقَرَ - الشـيءَ نَقراً): شـتەكەى بە دەنووك كونكرد.

(-الطائِـرُ البَيضَـةَ عَنِ الفَـرخِ): باڵندەكە هێلكـەى بەچكەكەى (ئـەوەى كە بەچكەكى تێدايە) بە دەنووك شكاندو كونكرد.

(-الطائِرُ الحَبَّ): باڵندەكە دانەكەى بەدەنووك لەملاولەولاوە هەڵچنى.

(-آلحَجَرَ أَو الخَشَبَ): بەردەكەى يان دارەكەى هەڵكەند/ هەڵكۆڵى/ چاڵكرد.

(-تِ الخَيلُ بِحَوافِرِها): ئەسـپەكان بەسـم زەويەكەيان چاڵكرد.

(-السَـهْمُ الهَدَفَ): تيرەكە نيشانەكەى پێكاو لێيدەرنەچوو.

(رمى الرامي الغَرَضَ فَنَقَرَهُ): نێزە هاوێژەكە نێزەكەى هاويشـتو ئامانجەكەى پێكا/ بەر نيشانەكە كەوت.

(-العُـودَ أَو الدَفَّ): عوودەكەيـان دەفەكەى لێداو دەنگى لێوەهێنا.

(-فِي الحَجَرِ): بەردەكەى هەڵكۆڵى و لێينووسى.

(-فِي النَّاقُورِ): فووى لەبۆرييەكەدا كرد.

(-فُـلانٌ): ١-چەقەنـەى لێـدا، ٢: تەقەى لە زمانى هێنا (زمانى بەمەلاشـوويەوە ناو لەپڕ بەريداو تەقەى لێوەهات).

(-عَنِ الأَمرِ): لەكارەكەيكۆڵييەوە.

(-فُلاناً): تەشەرى لەفيساردا.

(نَقَرْتُ بِالرَّجُلِ): لەنێوان خوێشگەلدا بانگى پياوەكەمكرد.

(نَقِرَ -على فُلان. نَقَراً): لەفيسارتووڕەبوو/ بەسەريدا گرماندى.

(- تِ الشـاةُ): مەڕەكـە تووشـی لوولبوونی دەماری پشتی پێ بوو/ تووشی شەلكەبوو.
(-فُلانٌ): تووشی هەژارییەكی زۆربوو.
(نَقَّـرَ -الطائِـرُ في المَوضِـعِ): باڵندەكـە شوێنەكەی بۆهێلكەدانان خۆشكردو چاڵكرد.
(-الطائِـرُ آلحَـبَّ): باڵندەكـە دەنكە دەنكە دانەكـەی هەڵچنـی (ئـەو وشـەگرتنە بـۆ زیادڕەوییە).
(-الشَـيءَ وعَـنِ الشَـيءِ): بۆشـتەكەگەڕا/ سوراغیكرد لێكۆڵییەوە.
(-على فُلانٍ): تەشـەری لە فیسارداو گاڵتەی پێكرد/ بەدگۆیی بەرامەبركرد/ ئەوەی پێوت كە دڵی ئازاربدات.
(-فُـلانٌ بإسـمِ فلان): ناوی فیسـاری لەناو كۆمەڵەكەدا هێناو ناویبرد.
ناقَـرَ-هُ. مُناقَـرَةً ونِقـاراً): ١-لەگەڵیـدا كەوتە شـەڕە قسە/ شـەڕە دەنووك/ كەوتنە چەلەحانێ ٢-لەگەڵ یەك تێكچوون.
(بَينَهُـم مُناقَرَةٌ): لەگەڵ یەكـدا ناكۆكی و شەڕە قسە و شەڕە دەنوكیان هەیە.
(مُناقَرَةُ الديوك): شەڕە دەنووكی كەڵەشێر.
(أَنْقَرَ- الرَجُلُ): ١-بەسەری زمان تەقەتەقیكرد ٢-بە پەنجەی چەقەنەیلێدا.
(تَنَقَّرَ -الشيءَ): بۆ شتەكە گەڕاو لەشتەكەی كۆڵییەوە.
(-عَلـى الأَهْـلِ أَوالمـالِ): دۆعـای لەمـاڵ و منداڵیكردو وتی: خودا لە دەستتان ڕزگارم بكات خودا بەماڵ و سامانتانەوە بۆخۆیتان بباتەوە.
(إِنْتَقَرَ -تِ الخَيلُ بِحُوافِرِها نُقَراً): ئەسپەكان بەسمیان زەویەكەیان چاڵكرد/ هەڵكۆڵی.
(- تِ السُـيولُ نَقراً): لافاوەكـە زەویەكەی چاڵچاڵكردو ئاویان تێدا وەستا.
(-الشَـيءَ): ١-شتەكەینووسـی ٢-بۆیگـەڕاو لێیكۆڵییەوە.
(-هُ وآنْتَقَـرَ بِـهِ): لەنـاو خەڵكەكەدا ئەوی بانگكرد.
(-القَومَ وبِالقَـومِ): تاقمێكی بەتایبەتی لەناو خوێشگەلدا بانگكردو ئەوانیتری بانگ نەكرد.
(ألناقِـر (فا) (ج) نَواقِـر): ١: تیرێك كە بەر نیشـانەكە بكەوێت ٢-لێـدەر ٣-هەڵكۆڵەرەوە ٤-چەقەنە لێدەر ٥-گەڕاوبەدواداو لێكۆڵەرەوە ٦-زەوی هەڵدرو چاڵكەر.
(الناقِرَةُ (ج) نَواقِر): ١-مێی وشـەی (الناقِر): ٢-وەی/ لێقەوماون ٣-بەڵگەو بیانووی دروست.
(أَتتني عَنهُ نواقِرُ): قسـەی بە ئازام لەوەوە پێگەیشتووە.
(بَيْنَهُم ناقِرَةٌ): (مشتومڕو ناكۆكیان لەنێواندا هەیە).
(ألنَّاقُور (ج) نَواقير): ١-عوود یان بۆری كەڕەنا. كەلێبدرێت یان فووی پێدا بكرێت ٢-دڵ.
(ألنِقْـر): ١-چاڵێكـی بچووكی پشـتی ناوكە خورما ٢-كون.

(اَلنَقْــر) (مص): ١-چەقەنە لێــدان/ چەقەنە بەپەنچە ٢-نووسین بە هەڵکەندن لەسەر بەرد.
(اَلنَقِر): ١-تووڕە ٢-تووڕەبوو.
(هُــوَ نَقِــرٌ عَلَيكَ): ئــەو لێــت تووڕەبووە ٢-تووشبووی دەردی ژانە جومگە.
(مالَهُ بِمَوضِــعِ كذا نَقِرٌ): لەوشــوێنەدا نە ئاوی هەیەو نەچاڵاو/ بیر.
(اَلنَقَر) (مص): هەژارکەوتن و نابووتبوون، پەککەوتن.
(أعُــوذ باللهِ مِنَ العَقَــرِ والنَقَرِ): پەنادەگرم بەخــودا لەبــەر کەنەفتیــی و بارکەوتنــی هەژاریی/ نەداریی.
(اَلنَقْرَة): جارێك بەرکەوتن.
(ما أثابَهُ نَقْرَةً): هیچی بەرنەکەوت/ جارێك پاداشــتێکی بەرنەکەوت (ئەم بەکارهێنانی) (نَقْره یه): بۆ نەریێ دەبێت.
(اَلنُقْــرَة (ج) نُقَرٌ ونِقــارٌ): ١-چاڵێکی خڕی بچووك لەزەویدا ٢ پارچە زێڕێك یان زیوێکی تــواوە ٣-چاڵی چــاو ٤-کونێك لەناوەراســتی کولۆتدا ٥-کونی پشتی مل ٦-هێلانەی باڵندەکە هێلکــەی تێدا دادەنێت ٧-چاڵی پشــتی ناوکە خورما (وەکو ئەو شوێنە هەڵکەنرابێت).
(اَلنِقْرَة): مشــتو مڕو بەدوای قسەداچوون/ دوژمنایەتی/ تێهەڵچوونەومو شەرە قسە.
(بَينَهُم نِقْرَةٌ): قسەو مشتومڕو ناکۆکییان لە نێواندا هەیە.

(اَلنَقِرَة): ١-شــوێنو زەوی نەرم و چاڵ ٢-مێی وشەی (اَلنَقِر).
(اَلنُقَــرَة): دەردێکە تووشــی ســم و ئەژنۆی مەڕو بزن و مانگا دەبێت وەك ئاوســاوییەك بۆ چاکبوونەوە داخیدەکەن.
(اَلنُقــارَة): ١-هێندەی کــە باڵندە بە دەنووك هەڵیدەکەنێت ٢-بەدری خشــتکراو ســافکراو پاش کوتان و خشتکردنی.
(ماترك عنــدی نُقــارَةً إلاّ إنْتَقَرَها): هیچ شــتێکی لــەلام نەهێشــتەوە کــە لەســەری نەنووسیبێت.
(اَلنَقَرى): خەوش/ کەموکووڕی.
(دَعَوتُهُــم آلنَقَــرى): بەتایبەتی بانگمکردن بانگکردنێکی تایبەتی (بەرامبەرەکەی وشەی (اَلجفَلى) واتا بانگکردنێکی گشتی.
(بَناتُ آلنَقَرى): ژنانێك کە هەرچی بەلایاندا تێپەڕێــت خەوشــێکی لێدەردەهێنن و تێزو توانجێکی تێدەگرن.
(اَلنَقّار): ١-کەسێکە کە تیژڕەوبێت لەو کارەدا ٢-بــەرد چاککــەرو خشــتکەر و دار هەڵکۆڵ ٣-کەســێکە نیگارکێشی لغاوو زین و کورتان و شتی لەو بابەتانە بێت.
(اَلنِقارَة): نیگارکێشــی/ لغاوو زین و کورتان و شتیتر بێت.
(اَلنَقّارَ): ١-کەسێکە زۆر بە دوای کارو هەواڵدا بگەڕێت و لێی بکۆڵێتەوە ٢-(ح) دارکونکەرە.

مەلێکە بەداردا هەڵدەزنێت و دارەکە کوندەکات و کرمی ناوی دەردەهێنێت.
(اَلنَقّارَة): مێی وشەی (النَقّار) (ج) نَقّارات): دەفۆڵکە کە لە پێستە درووستدەکرێت و لێدەدرێت (پێشیدەڵێن (نُقَّيرَة):دەف بچکۆلە.
(اَلنَقِر (ج) أنْقِرَة): ١-چاڵی سەرناوکە خورما ٢- بەردی رێکخراو خشتکراو و لووسکراو یان تەختەی خشتکراو یان هەڵکۆڵراو. ٣-قەدی درەختێك کە هەڵبکۆڵرێت و بکرێت بەپێپیلکەو پیایدا سەربکەونە سەر ژوور ٤-بنی دارێك هەڵبکۆڵرێت و شەرابی تێدا بگیرێتەوەو شەرابەکەی تیژ دەبێت ٥-رەچەڵەك و رەسەنی پیاو.
(فُلان کریمُ النَقِیر): فیسار رەسەنخانەدانە/ بە رەچەڵەك گەورەیە ٦-دەنگ ٧-هەژاری لاکەوتەو رەجاڵ/ پەککەوتە ٨(ح) میشەرەشە.
(اَلنَقِیرَة): پاپۆرێکی بچووك.
(اَلأنقور): چاڵی سەرناوکە خورما.
(التَنقِير) (مص): شێوە فیکەی دەم.
(اَلمِنْقَر (ج) مَناقِر): پاچ.
(-ج مَناقیر): ١-دارێك کەبۆ شەراب هەڵدەکۆڵرێت ٢ چاڵاوێکی بچووکی دەمتەسك یان فرە ناوی بنقووڵ ٣-گۆل/ حەوز.
(اَلمُنْقِر): شیری یان ماستی زۆر ترش.
(اَلمِنقار): ١ قوڵنگ کە زەویی پێهەڵدەکەنن ٢-(ع ا) دەنووکی چەماوەی باڵندەی گۆشتخۆر ٣-لووتی پێلاو ٤-دەنووکی مریشك (فك): هەسارەیەکە ٥-(مِنقارُ الغُراب): دەنووکی قەلەرەش ٦-(ع ا) نێسقانی دەفەی شان کە (اَلأخْرَم)یشی پێدەڵێن. ٧-(فك) هەسارەیەکە
(هُوَ مُنَقَّرُ العَینِ وَمُنْتَقِرُها): ئەو چاو بەقوڵدا چووە/ چاوی لەچاڵاییدایە.
٢-(أنْقَرَ - عَنهُ) وازی لێهێنا/ دەستی لێهەڵگرت.
(ضَرَبَهُ فَما أنْقَرَ عَنهُ حتی قَتَلَهُ): کەوتە لێدانی وازی لێنەهێنا هەتا کوشتی.
٣-(نَقْرَدَ - فِي المَکانِ): لەشوێنەکەدا مایەوەو نیشتەجێبوو.
(مالَكَ مُنقَرِداً): چیتەوا دانیشتوویت/ قنگت داگرتووە.
٤-(اَلنِقْرِس (ج) نَقارِس) (طب): ١- جومگەژان: دەردێکە دەداتە قاچ و جومگەی قاچ و پەنجەکانی و دەیانئاوسێنێت بەتایبەتی پەنجە گەورەیە ٢-فەوتان / مردن ٣-چورتومی گەورە/ وەیی سەخت و گران ٤-رانوماو رێبەری شارەزا ٥ پزیشکی کارامەو بەسەرنج و ورد ٦-گوڵی قژە سەر کەژن بەقژەکەیدا دەکات.
(اَلنِقْرِیس)١-رابەری کارامەو شارەزا ٢-پزیشکی شارەزاو کارامە/ وردو سەنجدەر.
نقز:١-(نَقَزَ- الظَبيُ. نَقْزاً وَنَقَزاناً وَنِقازاً): ئاسکەکە قەلەمبازی بەرزیدا.
(ناقِز): ئاسکی قەڵەمبازدەری بەرز.

(-هُ عَنْهُم): ئەوی لێدوورخستنەوە.

(نَقَــزَ - تِ الصَبِيَ أُمُهُ): دایکەکە کۆرپەکەی هەڵپەڕاند.

(-فُلاناً): بازدی پێدا/ هەڵیبەزاندەوە.

(أَنْقَــزَ - عَدُوَّهُ): دوژمنەکەی خۆیی بە پەلە کوشت.

(-الرَجُلُ): دەردی شێوە تاعونی ئاژەڵیی دایە ئاژەڵی پیاوەکە/ دەردیان تێکەوت.

(إنْتَقَــزَ-تِ الشــاةُ): مەڕەکە تووشــی شــێوە تاعوونبوو.

(اَلناقِزَةُ (ج) نَواقِز): مێی وشەی (اَلنَاقِز).

(نَواقِزُ الدابَّة): چوارپەلی چوارپێ.

(اَلنُقاز): دەردێکە وەکو تاعونی ئاژەڵ دێتو دەرواتو نامێنێتەوە.

(اَلنُقَّاز وَاَلنَقَّــاز (ج) نَقَاقِيز) (ح): ١-جۆرە باڵندەیەکە دەنووکی چەماوەیە رەنگی قاوەییە بەشێوەی پۆل دەژی ٢-بەچکە چۆلەکە.

(اَلمَنْقوز (م) مَنْقوزَة): ئاژەڵی دەردی شــێوە تاعوونگرتوو.

٢-(أَنْقَزَ - الرَجُل): شــتی گەنــدەو خراپی کڕیو پەیداکرد.

(إنْتَقَــزَ - فُلانٌ لِفُلانٍ مِن مالِهِ): فیســار لە ماڵیاتــە گەندەکانی یان شــتەگەندەکانی بە فیسارکەسدا.

(-لِفُلانٍ شَرَّ الإبل): خراپترینی حوشترەکانی بۆ فیسار هەڵبژارد.

(عطاءُ ناقِزٌ وذو ناقِز):بەخشینە خراپەکانو گەندەکان.

أَلنِقْــز: ١-ماڵیاتی خراپ و گەنــدە ٢-مرۆڤی بوودەڵەو بچووك.

النَقْزَةُ (ج) اَلنَقَز: ماڵیاتی خراپ و خەڵکانی بوودەڵەو سووك.

٣-(أَنْقَــزَ - الرَجُــلُ):ســەرومڕ/ هەر ئاوی روون و پاك و شیرینی خواردەوە.

(اَلنُقز): چاڵاو/ بیر.

(اَلنِقز): ئاوی پاكو روون و شیرین.

٤-(أَنْقَزَ - عَنِ الشيءِ): وازی لەشتەکە هێناو دەستی لێهەڵگرت.

٥-(اَلنَقِز والنَقَز): ناسناو.

نقس: ١-(نَقَسَ - آلنَّاقُوسَ بالخَشَبَة نَقْسَاً): بەدار لەزەنگەکەیدا.

(-الناقُــوسُ): زەنگەکە دەنگیدایەوە/ دەنگی لێوەهات.

(نَقَّــسَ - القَــومَ بِناقوسِــهِ): بەزەنگەکەی بانگی خوێشگەلیکرد.

(إنْتَقَسَ): لەزەنگەکەیدا.

(اَلنَقْس (ج) نُقُس): جۆرە زەنگێکە.

(اَلنَاقُوس (ج) نَواقيس): پارچە ئاسنێکە درێژ یان تەختەیەکە بۆ کاتی نوێژ لێیدەدەن (لەوانەیە وشەی ناقوسیان بۆ زەنگ بەکارهێنابێت).

٢-(نَقَــسَ بَــينَ القَــوم نُقُوســاً): نێوانــی خوێشگەلی تێکداو لەیەکی بەردان.

(-الشَرابُ): شەربەتەکە ترشا.

(نَقِـسَ-ـَ. نَقْسـاً): خەوشـی لێدەرهێنــاو گاڵتەپێکرد/ تیرو توانجی تێگرت.

(نَقَّسَ - فلاناً): ناسناوی بۆ فیسار دانا.

(-آلدَّواةَ): مەرەکەبی کردە مەرەکەبدانەکەوە.

(ناقَـسَ- ـُ): خەوشــی لێدەرهێنــاو گاڵتەی پێکرد.

(بَیْنَهُما مُنافَسَةٌ وَمَناقَسَةٌ): ململانێ و گاڵتەو خەوش لەیەکگرتنیان لەنێواندا هەیە.

(ألناقِس) (فا): ترش.

(لـَـبَنٌ ناقِـسٌ وَشَـرابٌ ناقِسٌ): ماسـت و شەربەتێکی ترش.

(ألنَقْس (ج) نُقُس): گەڕیی.

(ألنِقْــس (ج) أنْقــاس وَأنْقُــس): مەرەکەب کەپێیدەنووسن.

(رَجُــلٌ نَقِــسٌ): گاڵتەبــاز/ پیاوێکــە گاڵتە بەخەڵــك دەکاتو نــاوو ناتــۆرە لەخەڵــك دەنێت.

(ألنِقاسة): ناوو ناتۆرە لەخەڵکنان.

(ألأنْقَس): ١-گەڕتر ٢-وەچەی کۆیلە.

٣-(النَقُوس) (ن): دارخورمای مۆمیی/ جۆرە دارخورمایەکە. مۆمی لێدەردەهێنرێت.

نقش: (نَقَشَ - الشــيءَ. نَقْشــاً): شــتەکەی نیگارکێشــکرد/ بەچەند رەنگێك رەنگیکردو رازاندیــەوە (وەکــو بیەوێــت جوانیبکات و خەوشی نەهێڵێت).

(-آلعِذْقَ): دڕکی بەهێشووی خورماکەدا کێشا بۆئەوەی پێبگات و زەرد بێت.

(-فَــصَّ الخاتــم): ڕووی ئەموســتیلەکەی نیگارکێشا یان لەسەری نووسی.

(-الرَحى): بەرداشەکەی بیرازکرد.

(-الشَوكَةَ مِن رِجلِهِ): دڕکەکەی لەپێی خۆی دەرهێنا.

(-مَرْبِــضَ الغَنَــم): مۆڵگــەی مەڕەکانــی پاککردەوە بەردو چەوو دڕکی تێدا نەهێشت.

(-عَنِ الشــيءِ): بۆ دۆزینەوەو دەرخســتنی شتەکە زۆر گەڕا/ وێڵبوو.

(-الشَعَرَ بِالمِنقاشِ): بەمووکێشەکە موومەکەی دەرهێنا.

(مانَقَشَ مِنهُ شَيئاً): هیچی لێدەسنەکەوت.

(نَقَّشَ - الشــيءَ): شــتەکەی نیگارکێشکرد/ بەدوو ڕەنگ یان زۆرتر ڕەنگیکرد.

(ناقَشَ - ـُ الحســابَ وَفي الحســاب): ژمێرەکەی لەگەڵدا تاووتوێکرد/ لێپرسییەوەو لێکۆڵییەوە.

(-فُلاناً): مشــتوموڕی لەگەڵ فیســاردا کردو چەند و چوونیی لەگەڵداکرد.

(-قَضِيَّه رِياضِيَّة): لەشیتەڵکردنی کێشەیەکی ماتماتیکیــی کۆڵییەوەو هەمــوو بارە جیاکانی لێکدایەوە ئەوبارەی کە هەر نابێت و دیاریکردنی پێچەوانەکەی.

(أنْقَشَ): هەر خەریکی خواردنی خورمای ناو هەمانەکە بوو.

(-علــى غَريمِهِ): لەگــەڵ واموەرگرەکەیدا/ قەرزارەکەیدا سەختیینواند/ زۆری کۆڵییەوە لەگەڵدا.

(تَنَقَّــش - جَميعَ حَقّــهِ من فلان): هەموو مافەکــەی لــە فیســاروەرگرتەوە و هیچــی لەلانەهێشتەوە.

(إنْتَقَشَ فُلانٌ): لەنیگارکێشەکەی خواست کەرووی ئەموستیلەکەی بۆ نیگاربکات/ بۆ بنەخشێنێت.

(-على فَصِهِ كــذا): داوایلێکرد کەئەونیگارە لەسەررووی ئەموستیەکەی بکێشێت.

(-الشَوكَةَ): چقڵەکەی / دڕکەکەی لەپێی دەرهێنا. وشــەی (إنْتِقاش) بــۆ ســزاو تۆبەکردنیش بەکاردەهێنرێت.

(إنْتَقَشَ - الشيءَ): شتەکەی دەرهێنا.

(-مِن زَيدٍ جَميعَ حَقّــهِ): هەموو مافەکەی لەزەید سەندەوەو هیچی لا نەهێشتەوە.

(-فُلاناً): فیساری هەڵبژارد.

(إنْتَقَشْتُكَ لِكَذا): تۆم بۆ ئەوە هەڵبژارد.

(إنْتَقَشَ لِنَفسِهِ خادِماً أو غيرَهُ): نۆکەرێکی یان هیتری بۆ خۆی راگرتو هەڵبژارد.

(ألنَقش) (مص): خورمای وشــك دەخرێتە هەمانەوەو ئاوی بەسەردا دەکرێت.

(دامَ على أكلِ النَقش): هەر خەریکی خورمای خووساوەی ناو هەمانەکە بوو.

(ألنَقش (ج) نُقُوش):١-جێکار لەســەر زەوی ٢-نیگاری وێنەو رەنگی سەرشت.

(ألنِقاشَة): پیشەی نیگارکێشان/ نیگارکێشیی.

(ألنَقّاش): نیگارکێش.

(ألنَقِيش):١-وردکە و پرتکەی کەلو پەلی ناو قاپ ٢-هاوچەشن/ هاوشێوە/ هاو وێنە.

(مالَهُ نَقِيشٌ): هاو وێنەی نییە/ لە چەشنەی ئەو نییە/ بێوێنەیە.

(ألمِنْقَش وَألمِنْقاش (ج) مَناقِش وَمَناقِيش)١-مووکێش ٢-قەڵەمی هەڵکۆڵین/ سمۆو قەڵەم/ کەرەسەیتر.

(إسْتَخرُجت مِنهُ حَقّي بالمَناقِيش): مافەکەی خۆمم بەزۆرو ماندوێتیی لێسەندەوە.

(ألمَناقِش الواحِدَة مَنقُوشَــة): جۆرە ئێشێکی هەویرە نیگاری تێدا دەکرێتو چەور دەکرێت.

(ألمَنقُــوش (مفــع):١-دینــار و پــارەی زێر هێشووی فەریکە خورما درکی پێدادەکەن بۆ ئەوەی بگات ٣-هەڵکۆڵراو ٤-نیگارکێشراو.

(ألشَجَّة المُنَقَّشَة والمَنقُوشة): ئەو شکاوییەیە کە پارچە ئێسکی لێوە دەردەهێنرێت.

نقص:١-(نَقــصَ- الشَــيءُ نقْصــاً وتَنْقاصاً وَنُقْصاناً): شتە تەواوەکە کەمیکرد.

(-تُ الشيءَ): شتەکەم کەمکرد.

(-تُ زَيْــداً حَقَّــهُ): مافی زەیــدم کەمکرد/ ناتەواوەکرد.

(نَقَّصَ وَأنْقَصَ- الشيءَ): شتەکەی کەمکرد.

(تَنَقَّصَ - فُلاناً): بەخراپە باسی فیساری کردو شکاندی، پایەی هێنایە خوارێ/ سووکیکرد.

(-الشــيءَ): کەمەکێکــی لەشــتەکە برد یان کەمکەمە لەشتەکەیبردو کەمیکردەوە.
(تناقَصَ - الشيءُ): شتەکە وردە وردە کەمبووەوە.
(إنْتَقَصَ - الشيءُ): شتەکە کەمیکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی کەمکرد/ لێبڕی/ لێیبرد.
(-تُــهُ حَقَّــهُ): لەمافەکەیمــبڕی/ مافەکەیم کەمکرد/ بە تەواویی نەمدایە.
(-الرَجُــلَ): پیاوەکــەی شــکاند/ خەوشــی لێگرت/ گاڵتەی پێکرد.
(إسْــتَنقَصَ الثَمَــنَ): ١-داوای کەمکردنەوەی نرخی شــتەکەیکرد ٢-نرخەکەی بەکەم دانا/ بەکەمیزانی.
(-الرَجُلَ): پیاوەکەی بەکەم داناو لای ناتەواو بوو.
(ألناقِص (ج) نُقَّص (فا)): ناتەواو/ کەمبوو/ سووك، کەمو کووڕ.
(دِرهَمٌ ناقِص): درهەمێکی سووك لەکێشەدا.
(ألنَّقص (مص)): کەمیی سووکیی سووکبوون: کەمبوون (وەکو وشــەی (ألنُقصــان)ە بەڵام (نُقصان) بۆ دینو ئاوەز/ ئەقڵ ناوترێت).
(دَخَلَ عَلَيــه نَقصٌ في دينِهِ أوَ عَقلِهِ): ئاین یان ئاوەزی کەمیکردو ناتەواوی پەیداکرد.
(ألنُقصــان) (مــص): هێنــدە (کەمبــوون/ کەمکردنی) شتێك/ بڕی کەمبوون/ کەمیی.
(نُقصانُــهُ کــذا وکــذا): ناتەواوییەکــەی کەمبوونەکەی/ کەمییەکەی هێندەو هێندەیە/ ئەوەو ئەوەیە.

(ألنَقيصَة (ج) نَقائِص): ١-بەیەکدادانو شەڕە جنێوو، بەخراپە ناوهێنانی خەڵك ٢-نیشانەو نەنگیی و ماکی ســووکی مــرۆڤ ٣-خەوش/ کەموکووڕیی.
(ألمَنقَصَة (ج) مَناقِص)١- ناتەواویی/ کەموکووڕی ٢-کەمبوون ناتەواوبوون.
(ألمُناقَصه في اصطلاح أصحاب الأعمال): لەلای خاوەن کارەکان/ بەڵێندەرەکان کەمکردنەوەی پارەی گرتنی کارێکە پڕۆژەیەکە.
پــڕۆژەی کارێــك جاڕ دەدرێــت کێ کەمترین پــارەی بــۆ دروســتکردنی پڕۆژەکە خســتە بەردەم ئەو کەســە کارەکەی بــۆ دەردەچێت و بۆی دەبێت) بە پێچەوانەی ئەوەوە وشــەی (مُزايَدَة) یە واتا زیادکردن/ پتر کردن.
(نَقَــصَ - المــاءُ نَقاصَــةً): ئاوەکە شــیرینو خۆشبوو.
(ألنَقِيص): ١-ئاوی شــیرین و خــۆش ٢-هەموو خواردنێکی خۆش کەبۆنو بەرامەی خۆشبێت.
نقض:١-(نَقَــضَ - ألبِنــاءَ نَقْضاً): خانەکە/ خانووەکــەی رووخانــد/ تێکــدا/ رمانــد. هەڵوەشاند.
(-ألحَبلَ): گوریسەکەی/ پەتەکەی شیکردەوە/ هەڵوەشاندەوە.
(-ألعَهْدَ أو الأمــرَ): بەڵێنەکەی پەیمانەکەی نەبردە سەرو شــکاندی/ لێی پەشیمانبووەوە کارەکەی تێکدا کە لەوەپێش دامەزرابوو.

(نَقَضَ فُلانٌ وِترَهُ): تۆڵەی خۆی کردەوە.
(نَقَّضَ - ٱلأرضَ): زەویەکەی هەڵدری.
(-ٱلكَمْءُ): دوو مەلاّنەکە گڵەکەی سەری شەق پێبرد و لابرد تا بێتە دەرێ.
(ناقَضَ - قَولُهُ الثانی قَولَهُ الأَوَّل. مُناقَضَةً ونِقاضاً): قسەی دووەمجاری پێچەوانەی هی یەکەمجاری بوو، نەویتری هەڵوەشاندەوە.
(أَنْقَـضَ - الكَـمْءُ): دوومەلاّنەکـە گڵەکەی سەری قڵیشکرد بۆ ئەوەی بێتە دەرێ.
(-الحَمْلُ الظَهْرَ): کۆڵەکە بەپشتەکەگرانبوو/ قورسایی خستە سەری.
(-الْكَمْـأَةَ وَعَن الكَمْـأَة): دوومەلانەکەی لە زەویەکە دەرهێنا.
(تَنَقَّـضَ - الحَبـلُ): گوریسـەکە/ پەتەکە خاوبووەو لێکهەڵوەشا.
(-ٱلـدَمُ): خوێنەکـە تـکا/ دڵۆپـە دڵۆپـە رۆیشت.
(-الجرحُ): برینەکە خوێنی لەبەر رۆیشت.
(-تِ الأَرضُ عَـنِ الكَمْأَةِ): زەویەکە/ گڵەکەی لەحاستی دوومەلاّنەکەدا قڵیشیبرد.
(تَناقَضَ - البِناءُ أَو الحَبلُ): خانەکە لێکترازا یان پەتەکە لێکهەڵوەشایەوە.
(-القَـولانِ): دوو قسـەکە لەیەکجیابوون و پێچەوانەی یەکبوون.
(تَناقَضا - البَيعَ): کرین و فرۆشـتنەکەیان هەڵوەشاندەوە.
(إِنْتَقَضَ - البِناءُ أَو الحَبلُ): خانەکە دارووخا/ داتەپی گوریسەکە هەڵوەشایەوە / لێکهەڵوەشا.
(-الجـرحُ بَعـد بَرئِـهِ): برینەچاکبووەکە هەڵیدایەوە.
(-الأَمرُ بَعد إِلْتِئامِهِ): کارەکە پاش باشبوون و یەکگرتنەوەی سەر لەنوێ تێکچووەوە.
(-تِ الطَهارَةُ): خۆپاککردنەوەکە/ تارەتگرتنەکە نادروستبوو.
(إِنْتَقَـضَ عَلَيـهِ البَلَـدُ): خەڵکـی وڵاتەکە لێیهەڵگەرانەوەو لێیهەستان/ یاخیبوون.
(أَلنَقْض) (مص)١- دارمان و رووخانی خانە/ بینا ٢-لابردنی پیتی حەوتەمینی (مُفاعِلَتُن) و بێدەنگکردنـی/ زەنەدارکردنـی لامەکەی کەدەبێتە (مَفَاعِيل).
(أَلنَقَـض): چـادرو بەرگـی هەڵوەشـاو کە دەیرێسنەوە سەرلەنوێ یان بایدەدەنەوە.
(أَلنِقْـض (ج) أَنقَاض وَنُقُـوض): ١-خانەی لێکهەڵوەشـاو/ کەلاوە ٢-حوشـترو مێحوشترو ئەسـپی چرووسـاوو لاوازبـووی کاروان و رۆیشـتنی زۆر ٣-گڵی هەڵسـاوی سەر قارچك و دوومـەلاّن ٤-دەوارو جلـی هەڵوەشـێنراوو دووبارە رێسراو.
(أَلنُقْض (ج) أَنْقَاض ونُقُوض): دارو پەردووی خانووی رووخاو.
(أَلنُقَض): شێوە زۆرانێك.
(أَلنَقْضَةُ): جارێك هەڵوەشان یان رووخان.

(-عِنــدَ النَّجّاريــن): لای دارتاشــەکان داری دارمڕای خانوو.

(اَلنِقْضَة(ج)اَنْقَاض)١-جۆرەهەڵوەشانەوەیەکی جلو دەوارو بادانەوەی ٢-حوشــتری چرووساو لاوازبووی کاروان و ڕۆیشتنی زۆر.

(ناقَةٌ نِقْضَة):مێحوشترێکی لاوازو پەککەوتەی ڕۆیشتنی زۆر.

(اَلنُقَاضَة): گوریســی هەڵوەشــاوی دەوار یان شتیتری هەڵوەشاوو لەیەکترازاو.

(اَلنَقیــض (م) نَقیضَــة): ١-دژ/ نەســاز، پێچەوانە/ جیا/ جیاواز.

(فُــلان هُــوَ نَقیضُــكَ): فیســار دژ تــۆدا/ پێچەوانەی تۆیە/ جیاوازە/ لەگەڵتانەســازە. ٢-ڕێی ناوشاخ.

(نَقیضُ کُلّ شــيءِ): لەوبالاترو جیاترو دژی هەمووشتێك/ پێچەوانەی هەموو شتێك.

(اَلنَقیضان): دوو دژ بەیــەك، دووکاری جیا بەیــەك، پێچەوانــەی یەکــتر لەگــەڵ یەکدا نەگونجێــن و یــەك نەگرن/ نەســازبن وەك (اَلسَلْب وآلإیجاب):نەرێ و نەرێ/ زەوتکردنو پێبەخشین.

(اَلنَقیضَــة (ج) نَقائِــض): دژو پێچەوانەی یەکبوون/ نەسازبوون.

(-في الشّعرِ): لەشیعردا شیعرێك پێچەوانەی شــیعرێکیتر بێــتو ئــەوەی کەخاوەنەکەی وتویەتــی ئــەم بەرمنگاریبێــت و پووچەڵی بکاتــەوە دژیبێــت وەك دژە هۆزانی جەریرو فەرەزدەق کە بەرمنگاری یەکن.

(اَلتَناقُــض) (مــص): پێچەوانــە بــوون/ دژبەیەك بوون/ جیاوازیی/ دژ/ نەسازبوون.

(في کَلامِهِ تَناقُضٌ): قســەکانی دژ بەیەکن/ جیاوازیان تێــدا هەیــە/ پێچەوانەی یەکن/ نەسازن.

٢-(نَقَــضَ- العَظــمَ نَقْضاً): ئێســقانەکەی شکاند.

(-آلمَفْصَــلُ وَالأَدیــمُ ونَحْوُهُمــا نَقْضــاً): جومگەکــە تەقەی لێوەهــات. چەرمەکە یان شتیتر دەنگی لێوەهات.

(أَنْقَــضَ - بالعَنْزِ): بزنەکــەی بانگکرد وتی گدی گدی.

(-تِ العُقابُ):شا هەڵۆکە/ کۆلارەکە زریکاندی.

(-أَصابِعَــهُ): وای لەپەنجەکانیکــرد تەقەی لێوەبێت.

(تَنَقَّضَ- البَیتُ):خانووەکە تەقی/ شەقیبردو دەنگی شەقبردنەکەی بیسترا.

(-ت عِظامُــهُ): ئێســقانەکانی تەقەتەقیان لێوەهات.

(النَقیــض مِن الرحْل وَمِــنَ الأَدَم): جیڕەی زینو چەرم.

(-مِن الوتَرِ): گفەی ژێ.

(-مِن الأَصابع والأَضْلاع والمَفاصِل): تەقەی پەنجەو پەراسوو جومگەکان.

(ألنَقِيض)١-(صـوتُ الفَراريـج): جووكـه جووكى جووجك
٢-(صوت العَقْرَب): زيكەی دووشك
٣-(صوت الضِفْدَع): قيرەی بۆق.
(صـوت العُقـاب والنُعام وغيرهـا): دەنگى شاهەلۆو وشتر مرخ‌و شتيترى لەوانە.
(نَقيضُ السَـقْفِ): جوولاندنى دارى دارەڕاى بنميچ.
الملحق:
نقـض: (ألمُتَناقِضان): دووشـتى دژ بەيەك/ دووشـتى جيـاواز بەيـەك‌و لەيەكنەچوو/ بەيەكەوە نەسازاو.

نقط:١-(نَقَـطَ- الحَـرفَ نَقطـاً): پنتى بۆ پيتەكە دانا.
(نَقّاط): پنتدانەرى پيتەكان.
(ألحَرفُ المَنقُوط): پيتى پنتدار.
(نَقَّطَ-الحَرفَ): پنتى بۆ پيتەكە دانا.
(-ثَوبَـهُ بالمِـدادِ أو الزَعْفَـران): جلەكەى بـە مەركـەب يـان زەعفـەران خاڵخاڵكرد/ خالاّويكرد.
(نَقَّطَ الإناءُ): عاميە قاپەكە خاڵخالاّويبوو.
(نَقَّـطَ- العَـروسَ): خەلاّتـى شـووكردنى بووكێدا/ پۆيلانەى بووكەكەى كرد.
(تَنَقَّطَ- المَكانُ): شوێنەكە پەڵە پەڵە گياى لێڕوا.
(-فُلانٌ الخَبَرَ): فيسار تۆزە تۆزە هەواڵەكەى وەرگرت.
(تَنَقَّطْتُ - الخُبزَ): تۆزە تۆزە نانەكەمخوارد.
(ألنُقْطَـةُ (ج) نُقَط ونِقـاط): پنت/ خاڵ/ نيشـانەيەكە ١-دەخرێتە سـەر پيتەكان‌و بۆ لەيـەك جياكردنەوەيـان وەك (ب. ج. خ.. هتد) ٢-دەخرێتە نێوان رسـتەى قسەكەوە بۆ جياكردنەوەيان.
٣-(النقطه - في ألهَنْدَسَـة): شـوێنى بەيەك گەيشتنى دوو خێڵ يان زياترە پانى‌و درێژى‌و بەرزى‌و قەبارەى نييە.
٤-(نِقـاط أو نُقَط مِنَ الـكَلأ): پەڵەى گياى بلاّوبلاّو
٥-((ما اخْتَلَفُو في نُقطَة): لەهيچ كارێك يان كێشـەيەكدا جياوازييان نەبوو/ تەبابوون و زۆر رێكبوون
٦-(نقطة الدائِرة): چەقى بازنە.
٧-(النُقطَة (ب): بەردێك يان شتێك دەخرێتە ژێر سەرى نوێڵەوە يان شتيترەوە بۆ هەڵبڕينى شتەكە ٨-ئاسنێكە كە گرێژەنەى دەرگاى تێدا دەخولێتەوە (عامية).
٩-(ألنُقطَة): دڵۆپە ئاوێك يان دڵۆپە خوێنێك (عامية).
١٠-(داءُ النُقْطَةِ) (طب): دەڵێن نەخۆشييەكە لەدڵۆپە خوێنێكەوە تووشى دڵ دەبێت.
(ألنَقَطَةُ): جارێك خاڵدانانى پيتەكە.
(النُقُوط) (عامية): شاباشى شايى.
(ألمَنقُـوط) (مفـع): ١-پنـت بـۆ دانـراو

خاڵبەندکراو ٢-پەڵاویی، خاڵخاڵاویی.
(-مِنَ الشِعْر): ئەو هەڵبەستەی کە هەموو پیتەکانی خاڵبەندکرابێت/ پنتی پێویستی بۆ دانرابێت.
(كِتابٌ مَنقوطٌ): نووسراوو پەرتووکێك/ کتێبێك کە خاڵبەندکرابێت.
(نَقَطَ وَنَقَّطَ- بِهِ الزَمانُ): چەرخ بۆی لەباربوو تیایدا دەستدارو دارایکرد.
٣-(ألناقِط والنَقيط): کۆیلەی کۆیلە.
نقع: ١-(نَقَعَ - رِيقَهُ نَقْعاً): تفی لەدەمیدا کۆکردەوە.
(-الدَّواءَ وَغَيرَهُ في الماء): دەرمانەکە یان شتێتری لەئاوەکەدا خووساندو تواندەوە.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە مەڕەکە یان هیتری بۆ میوان سەربڕی.
(-فُلاناً): فسیاری کوشت.
(-ألمَوتُ): مردن زۆربوو.
(-بِالشَّرابِ): شەراب یان شەربەتی تێرخواردەوە.
(-السُمُّ في أَنيابِ الحَيَّةِ. نُقُوعاً): ژەهرەکە لەبن دانی مارەکەدا کۆبووەوە
(-مِنَ الماءِ وَ بِهِ): تێری ئاو خواردەوە/ تێر ئاوبوو.
(مانَقَعْتُ بِخَبَرِهِ): بڕوام بە هەواڵەکەی نەکرد، دڵم بە هەواڵەکەی ئاوی نەخواردەوە.
(-الماءُ في بَطنِ الوادي. نَقْعاً وَنُقُوعاً): ئاو لەناو دۆڵەکەدا پەنگی خواردەوە/ کۆبووەوەو زۆرمایەوە.
(-الماءُ العطشَ): ئاوەکە تینوێتییەکەی شکاندو لایبرد/ دایمرکاند.
(أَنْقَعَ- الدَواءَ وَغَيرَهُ في الماءِ): دەرمانەکە یان شتێتری لەئاوەکەدا خووساند.
(-تِ الحَيَّةُ السُمَّ في أَنْيابِها): مارەکە ژەهرەکەی لەبن دانیدا کۆکردەوە.
(-المَيتَ): مردووەکەی ناشت.
(-لِفُلانٍ شَرّاً): کاری بەدی دژی فیسار پەنهاندا/ خراپەی بۆ نایەوە/ بۆ شاردەوە/ بۆ گێرا.
(-الرَجُلُ): مەڕ یان هیتری وای بۆ میوانەکە سەربڕی.
(-الماءُ فُلاناً): ئاوەکە تینوێتیی فیساری شکاند.
(-العَطْشُ): تینوێتیەکە دامرکا/ شکا.
(إنتَقَعَ - النَقيعَةَ): مەڕەکەی/ ئاژەڵەکەی بۆ میوان سەربڕی.
(-القَومُ نَقيعَةً): پێش بەشکردنی تاڵانییەکە ئاژەڵیان بۆ میوان سەربڕی.
(إسْتَنقَعَ - فلانٌ في النَهرِ) بۆ خۆفێنککردنەوە چووە ناو رووبارەکەوەو تیایدامایەوە.
(-الماءُ في الغَديرِ): ئاوەکە لەگۆمەکەدا کۆبووەوە.
(ألناقِع) (فا): کەسێکە شت بخاتە ئاوەوەو بیخوسێنێت.

(سمٌ ناقِع): ژەهری کوشندە.

(دَمٌ ناقِع): خوێنی تەرو تازەی نەمەیو.

(دَواءٌ ناقِــع): دەرمانێکــی کەڵکبەخــش و دەردپەڕێن.

(ألنَقع (مــص) (ج) أنْقُع): ئــاوی کۆبووەوە زەلکاو.

(-(ج) نِقــاع وَأنقُع)١-زەوییەکــی پتــەو کە ئاوی تێدا دەوەســتێت و دەبێتە زەلکاو ٢-بنی ئاو ٣-ئاوراگرە/ ئەستێلی ئاو/ ئەستێرك.

(نَقْعُ البِئر)١-ئــاوی کۆبووەوەی ناو چاڵاو ٢-ئاوی پڕی چاڵاو.

(ألنَقــاع): قاپێکــە/ دەفرێکە مێوژو شــتی وەهای تێدا دەخوسێنرێت.

(النُقاعَــةَ): شــتی لەئــاو یان لەشــتی وەها هەڵکێشــراو، خوســێنراو، تەرکــراو/ شــتی تەرکراو یان خوسێنراو.

(ألنَقْعــاء (ج) نِقاع: ١-بنی ئاو ٢-زەویی نزم و پتەو کە ئاوی تێدا دەوەســتێت و کۆدەبێتەوە ٣-ئەستێل.

(ألنَقُوع)١-ئــەوەی لەئاودا دەخوســێنرێت ٢-خۆشــاوی میوەی وشــك. دەخرێتــە ئاوەوە ئاوەکەی دەخورێتەوە ٣-ئاوی شیرینی سارد ٤-قەیسی وشــکەوەبوو (رەنگە بۆیە وایپێدەڵێن چونکە لەئاو دەنرێت تا نەرمبێتەوەو بخورێت، خۆشــاوی میوە ٥-رەنگێك بۆندەدرێت/ بۆنی خۆشی تێدەکرێت.

(فُــلان نَقُــوعُ أُذُن): فیســار خۆشــبڕوایە/ هەموو شتێکی بەگوێدا دەچێت، گوێ لەمشتە (ئیدیۆمە).

(ألنَقِيــع (ج) أنْقِعَــة): ١-خۆشــاوی میــوەو شەربەتی مێوژ کە مێوژەکە دەخرێتە ئاوەوەو ئاوەکەی دەگیرێــت و دەخورێتەوە ٢-هەرچی خورمای تێدا بخوســێنرێت وەك ئاوو شیر ٣-ئاوی ساردو شیرین ٤-چاڵاوی فرە ئاو.

(دَواءٌ نَقِيع): دەرمانێکی بەسوود/ سەرکەوتوو/ دەردپەڕێن.

(ألنَقِيعَة (ج) نَقائِع): ١-خواردنێك بۆ یەکێك بکرێــت کە لە گــوزارەوە هاتبێــت ٢-هەموو ئاژەڵێکی سەربڕاو بۆ میوانداریی.

(النــاسُ نَقائِــعُ المَــوت): خەڵــك هەمووی توێشــووی مەرگن/ مەرگ هەمــوان دەگرێتە باوەش.

(ألأنْقَعُ): باشترین خوساوی بەکەڵك/ خۆشاوی بەکەڵك.

(الرَشــفُ أنْقَــعُ): شــەربەتێك کــە بە قوم قوم بیخۆیتەوە باشــتر تینوێتی دەشــکێنێت (هاندانە بۆ پەلە نەکردن و شێنەییبوون).

(ألأُنقوعَــة): شــوێنێك لەمــلاولاوە ئــاوی تێبرژێت/ بچێتە سەر.

(أُنْقُوعَة الميزاب): شوێنێك کە پلووسك ئاوی دەکاتە سەر.

(ألمُسْتَنْقَع): ١-گەڕاوە/ زەلکاو/ شوێنێکە ئاوی

تێـدا کۆدەبێتەوە/ ٢-گـۆلاو و گۆم کە مرۆڤ تیایدا مەلەدەکاتو خۆی تێدا دەشوات.

(اَلْمَنقَــع (ج) مَناقِع): ١-دەریا ٢-شـوێنێك کە ئـاوی تێدا کۆبێتــەوەو رابگیرێت/ ئەســتێل، ٣-ئاو داشتنی کشتوکاڵ بەئاو نەك بە باران.

(اَلْمَنقَــع): دەفــری تێــدا خووســاندن، تێدا تەرکردن.

(اَلْمُنْقَــع): ١-کووپەی گــەورە ٢-قاپی بچووکی بەردیــن ٣-هەرچی خورما یــان مێوژی تێدا بخوســێنرێت وەك شــیرو ئــاو کــە تیایــدا دەیخوسێنن ٤-شیری ساغی سارد.

(فُــلانٌ مُنقَــعٌ): فیســار ســاغەو راوێــژی پێدەکرێتو رادروستە.

(سُمٌّ مُنْقَعٌ): ژەهرێکی پەرومردەو ئامادەکراو/ گیراوەو کوشندە.

(اَلْمُنْقُع): قاپولکەیەکە ماســت یان شــیر یان خورمای بۆ منــداڵ تێدەکرێت کە بیخواتەوە یان بیخوات.

(اَلْمِنْقَعَــة): دەفرێ کە مێوژو شــتیتری تێدا دەخوسێنرێت.

(اَلْمِنْقَعَــة والمَنقَعَة): قاپولکە یان شووشــەی شیری منداڵی بچووك/ کۆرپە.

٢-(نَقَعَ. نَقْعاً): دەنگی (هەڵبڕی/ بەرزکردەوە).

(-فُلانــاً بِالشَّــتم): جنێــوی ناشــیرینی بە فیساردا.

(-الصَّوتُ نُقُوعاً): دەنگەکە بەرزبووەوە.

(-الصارِخُ بِصَوتِهِ): هاوارکەرەکە،قیژەکەرەکە هەر هاوارو قیژە قییژیبو.

(أَنْقَعَ- الصــارِخُ بِصَوتِهِ): هاوارکەرەکە هەر هاوارو قیژە قیژیبوو.

(إسْــتَنقَعَ - الصَــوتُ): دەنــگو هاوارەکــە بەرزبووەوە.

(اَلنَقعــاء (ج) نِقَاع): هــاوار/ دەنگە دەنگ/ قیژە قیژ.

(اَلنَقّاع)١-هاوارکەرو شیرەشــیر کەر/ شــاتە شاتکەر ٢-لافو گەزاف لێدەر/ خۆی بەشتێك هەڵکێشێت کە نەیبێت.

(اَلنَقيع): هاوارهاوار/ شــاتە شات/ شیرەشیر/ قیژە قیژ.

٣-(-نَقَعَ- الجيبَ نَقْعاً): گیرفانەکەی هەڵدڕی.

٤-(أَنْقَــعَ - الماءُ): ئاوەکە گــۆڕاو رەنگی زەرد هەڵگەرا/ ئاوکەە گەرایەوە.

(اَنْتُقِــعَ - لَونُهُ): مرۆڤەکــە لەخەفەتدا یان بەهۆی تۆقینو ترســەوە رەنگی پەڕیو زەرد هەڵگەرا (اُنْتُقِعَ = اُمْتُقِعَ)

((إسْــتَنقَعَ - المــاءُ): ئاوەکــە رەنگــی گۆڕاو زەردبوو/ بوو بە زەلکاو.

٥-(اَلنَّقع): شوێنێکە نزیك مەککە.

(اَلنَّقْع (ج) نِقاع وَنُقُوع): تۆز/ گەرد.

(اَلنَقْعاء (ج) نِقَاع): گەرد/ تۆز.

(اَلنَقِيــع): پیاوێکــە دایکی لــە خێڵی خۆی نەبێت.

نقف:١-(نَقَفَ- هامَةَ الرَجُلِ. نَقْفاً): تەوقە سەری کابرای واشکاند نەگەیشتە مێشکی.
(-فُلاناً): سووك بە فیساریدا کێشا/ لێیدا.
(-الفَرخُ البَیضَــةَ): جووچکەکە هێلکەکەی کونکردو هاتە دەرێ.
(-عَن الشيءِ): بۆ شتەکە گەڕا.
(-الرُمَّانَةَ): هەنارەکەی پاککرد تا دەنکەکەی دەربهێنێت.
(-الشَرابَ): شــەربەتەکەی پالاوت. دەیشلێن تێکیهەڵداو شتیتری تێکەڵکرد.
(-الحنَظَلَ وَ نَحْوَهُ): گوژاڵکەکە یان شتیوەهای بۆ ناوکەکەی قلیشاند تا ناوکەکەی دەربهێنێت.
(ناقِف): هەڵقلیشێن.
(حَنْظَلٌ نَقیف وَمَنْقُوف): گوژاڵکی هەڵقلیشاو.
(نَقَفَ-هُ بِظِفْــرِه): بەنینۆك لێیدا/ نینۆکی پێدادا.
(-هُ بحصاةٍ): بەپەلەپیتکە و بەپەنجە بەردی تێگرت (عامیه).
(ناقَــفَ-هُ. مُناقَفَــةً وَنِقافاً): شمشــێریان بەسەری یەکتردا کێشا.
(أنْقَفَ-فُــلانٌ العَظمَ): ئێســقانەکەی دا بە فیسار تا مۆخەکەی لێدەربهێنێت.
(-الجَرادُ الــوادِيَ): کوللەکە هێلکەی/ گەرای زۆری لەدۆڵەکەدا دانا.
(-الحَنْظَــلَ): گوژاڵکەکــەی بــۆ تۆومکــەی هەڵقلیشاند/ لەتکرد.

(تَنَقَّفَ- الحَنظَلَ): بۆ تۆومکەی گوشاڵکەکەی لەتکرد.
(إنْتَقَفَ- الحَنظَلَ): گوژاڵکەکەی بۆ تۆومکەی شکاند.
(-الشَيءَ): شتەکەی دەرهێنا.
(النِقْف وَالنَقْف): جووچــك کاتێك لەهێلکە دێتە دەرەوە.
(النُقَفَةُ): چاڵێکی بچووك کە لەســەر پۆپەی شاخاکەدا یان لوتکەی گردەکەدا دەبێت.
(النِقَاف) (مص): دووربین و بەتەگبیر.
(رَجُلٌ نِقافٌ): پیاوێکە دووربینەو بەڕاو تەگبیرە.
(جاءا في نِقافٍ واحِدٍ): دووانەکە شان بەشانی یــەك هاتن پێــش‌و پاشــی یــەك نەکەوتن یەکســانبوون (لەبنچینــەدا لــەوەوە هاتووە کــە دوو جووچکەکــە لەهێلکەیەکدا بوون‌و دەرهاتوون.
(اَلیَــومَ قِحافٌ وغَــداً نقافٌ)=(الیَــومَ خَمْرٌ وغَداً أمْرٌ): ئەمڕۆ دەخوێنەوەو رادەبوێرین سبەیش لەکاردادەبین.
(اَلنَقّاف)١-نیگار کێشــی ســەر تەختــەودار/ کە هەڵیدەکۆڵێت‌و نیگاری تێدا دەکات. ٢-دەرۆزەکەری بێنابڕو کە ٣-هەتەر لەسەر سواڵکردن.
(رَجُلٌ نَقّاف): پیاوی دووربین/ دانیشمەند/ بەتەگبیروڕا.
(اَلنَقّافَة): ژنی دەرۆزەکەری هەتەرو لەســەر داواکردن سوور.

(اَلنَقِيْف (ج) نُقُفٌ): قەدێکی دار کە مۆرانە خواردبێتی.

(اَلمِنْقـاف): دەنووکـی (مـەل/ پەلـەوەر/ باڵندە).

(اَلمَنْقوف) (مفع): ١-کەمگۆشتی روو تێقوپاوی زەرد هەڵگەو ٢-لاواز/ لەر.

(جذعٌ مُنْقُوف): قەدی درەختی مۆرانەخواردوو/ بۆشبوو.

(عَينانِ مَنقوفَتان): دووچاوی سوور هەڵگەراو.

٢-(اَلمِنْقاف): مووررووی سپیی دەریاکەقەبارەیان جیا جیایە و لەدەریا دەردەهێنرێت.

نقل:١-(نَقَلَ-الشـيءَ نَقْـلاً): شـتەکەی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر گوێزایەوە.

(-الـكَلامَ عَن قائِلِـهِ): قسـەکەی لەزمانی خاوەنەکەیەوە گێڕایەوە/ گەیاندی.

(-الكِتــابَ): لەبەر/ کتێبەکە نووسـییەوە/ لەبەریگرتەوە/ روونووسیکرد.

(-الكِتابَ الى لُغَةٍ أَخرى): نووسـینەکەی بان پەرتووکەکەی بۆ زمانێکیتر وەرگێڕا.

(-خُـفَّ البَعـيرِ أَو الثَوبَ أَوالنَعْلَ): سـمی/ پێی حوشـترەکەی چاککرد یـان بەرگەکەیان پێڵاوەکەی پینەکردو چاککردەوە.

(نَقَّلَ-الشيءَ): شتەکەی زۆر گوێزایەوە/ ئەم شوێن ئەو شوێنی زۆر پێکرد.

(-فُلانٌ ضَيفَهُ): مەزەی بەرخواردنەوەی بۆ میوانەکەی داناو دەرخواردیدا.

(-الثَوبَ أَو الخُـفَّ): بەرگەکەی باش پینەو چاککرد یان پێڵاوەکەی پینەو چاککرد.

(-الشَـجَّةُ العَظمَ): لێدانەکە ئێسـقانەکەی شکاند.

(ناقَـلَ- الفَرَسُ): ١-ئەسـپەکە باش و خێرا پێـی گوێزایـەوە ٢-لەغارکردنەکـەدا خۆی لەبەرد پاراست.

(-تُ فُلاناً): لەسـەر خواردنەوەی شەرابەکە لەگەڵ فیساردا تێکچووم.

(-الشاعِرُ الشـاعِرَ): هۆزانڤانەکە بەهۆنراوە بەرپەرچی هۆزانڤانەکەیتری دایەوە.

(-هُ الأَقداحَ): پەرداخیان بەیەکداو لەیەکتریان وەرگرت/ پەرداخیان لەگەڵیەك گۆڕییەوە.

(ناقَلْتُهُ الحَديثَ): قسـەو باسـمان بۆ یەکتر گێڕایەوە.

(أَنْقَلَ- الخُفَّ أَوالنَعْلَ): پێی/ سمی حوشترەکەی چاککرد یان پێڵاوەکەی پینەو چاککرد.

(تَنَقَّلَ): هاتووچۆی زۆرکرد.

(-مِن مَـكانٍ إلى آخَــر): لەشـوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر گوێزایەوەو چوو.

(-الرَجُلُ): مەزەی لەگەڵ شەرابەکەدا خوارد کە چەرەس و سێوو فستق وشتیتر بوو.

(تَناقَلـوا -الحَديث فيمـا بينَهُم): ئاخاوتنیان لەیەکترەوە گێڕایەوە و لەسەری مشتومڕیانبوو.

(إنْتَقَـلَ- من مَـكانٍ إلى آخَر): شـوێنەکەی گواستەوەو چووە شوێنێکیتر.

(-فُلانٌ إلى رَحْمَةِ اللهِ أو الى رِضوانِهِ): فيسار بەر رەحمەتی خودا کەوت/ خودا بردیەوە بۆ خۆی/ مرد.

(-الفَرَسُ): لەرۆیشتندا چارەوێکە/ ئەسپەکە پێی هاویشتە شوێن دەستی.

(اَلناقِل (ج) ناقِلون وَنَقَلَة (فا) الناقِلَة (ج) نَواقِل): مێی وشـەی (اَلناقل): ١-گوێزەرەوە ٢-هاتوچۆکـەر شوێنشـوێنکەر ٣-وەرگێـڕی کتێب و نامە بۆ زمانێکیتر ٤-ڕۆنووسـکەر ٥-ئاخاوتنگێڕەوە.

(اَلناقِـل - مِنَ النـاسِ): خەڵکانێك کە هەر خەریکی جێگۆڕکێن وەك خێڵەکییەکان.

(نواقِـلُ الدَّهـرِ): گرفتارییەکانـی ڕۆژگار/ چورتـووم و وەیەکانـی چـەرخ کـە مرۆڤ لەبارێکەوە دەبەنە بارێکیتر.

(نَواقِـلُ العَـرَبِ): ئـەو عەرەبانـەی کە لە خێڵێکەوە چوونەتە ناو خێڵێکیترو سـەر بەو خێڵە تازەیە یانبوون.

(اَلنَقْل) (مص)١-پێڵاو و سۆلی دراو/ کۆن.

(نَعْلٌ نَقلٌ وخُفٌ نَقْلٌ): سۆل و پێڵاوی دراو/ کۆن ٢-کورتە ڕێ ٣-مەزەی خواردنەوەی شەراب و شـتی وەها (کە چەرەس و فسـتق و شتیترە دەیشوترێت نُقل (ج) نُقُول وَنقُولات).

٤-(-عند أهل العَرَبيَّة): وشـەیەك واتایەکی خۆی هەبێـت عەرەب واتاکەی بۆ شـتێکیتر دەگوێزێنەوە/ بەکاریدەهێنن.

(اَلنِقَل): سۆل یان پێڵاوی دراو.

(رَجُلٌ نَقِلٌ): پیاوێکی گوسـتاغەو بۆ قسـەو وەڵام دانامێنێت لەمشتومڕدا بەتوانایە.

(مَـکانٌ نَقِـلٌ = ذو نَقَلٌ): شـوێنێکە وردە بەردی زۆرە.

(اَلنَقَل): پەڕی تیر کە لە تیرێکەوە بۆ تیرێکیتر دەگوێزرێتەوە ٢-بەقسەدا چوونەوەو بەدەنگە دەنگ و هاتوهاورەوە/ بەشاتەشاتەوە ٣-گەچ و داروبەردو پەردووی خانووی رووخاو ٤-وردە بـەرد چونکە دەگوێزرێتەوەو بەپێوە دەڕوات ٥-کورتە ڕێگا.

(اَلنَقَـل (ج) أنقال وَنِقَال): سـۆل و پێڵاوی دراو/ کۆن.

(اَلنَقَلَة)١-جارێك گوێزانەوە ٢-جێگۆرکێکردن.

(اَلنُقْلَةُ (ج) نُقَلٌ)١-گوێزانەوە/ شـوێنگۆڕین ٢-دوو زمانیی (کە قسەچنێك دەیکات).

(اَلنِقْلَـةُ (ج) نِقَـل): جـۆرو چۆنیەتـی گوێزانەوەو جێگۆڕین.

(اَلنِقَال)١-ئاخاوتنگۆڕینەوە٢-پەرداخگۆڕینەوە ٣-خێرا هەڵگرتنی قاچی ئەسپ ٤-دەمیی تیغی پانی کورت.

(نَقْلَة): دەمی تیغێکی پانی کورت.

(اَلنِقال): چوونی حوشتر خۆی لەخۆیەوە بۆ سەر ئاو خواردنەوەو کەسی لەگەڵدا نەبێت.

(شَرِبَتِ الإبِلُ نِقالاً): حوشترەکان بەبێ کەس خۆیان چوون ئاویان خواردەوە.

(اَلنَقّــال): ١-جێگۆڕکێکەرێکــی زۆر ٢-ئــەو کەســەی شــت لەجێیەکــەوە بــۆ جێیەکیتر دەگوێزێتەوە.
(فَرَسٌ نَقّالٌ): چارەوێیەکە خێرا پێهەڵدەبرێت دەگوێزێتەوە.
(اَلنَقِیل)١- لێشاوێك لە شــوێنێکەوە بێت کە بارانی لێبارییبێت بۆ شوێنێکیتر بچێت ٢-پێڵاو دروو ٣-کورتە ڕێگا ٤-نەناس بێگانە/ نامۆ.
(رَجُلٌ نَقِیلٌ): پیاوێکە نەناس نامۆ/ بێگانە.
(هذا فَــرَسٌ ذو نَقِیل): ئەمــە چارەوێیەکە خێرا پێکانی دەگوێزێتەوە/ تیژڕەوە.
(اَلنَقِیلَة (ج) نَقائِل ونَقِیل): ١-ژنی نەناس/ ژنێکــی نەناســراو/ نامۆ/ بێگانــە ٢-پینەی سۆڵو پێڵاو.
(اَلمَنْقَل)١- پێــڵاو یان ســۆڵی دڕاو ٢-کورتە ڕێگە ٣-ڕێی ناوشاخان ٤-ئاگردان/ مەقەڵیی کوورەی ئاگر.
(فَــرَسٌ مُناقِــلٌ وَمِنْقَلٌ): ئەســپی تیژڕەو کەزوو پێدەگوێزێتەوە.
(اَلمَنْقَلَة)١- قۆناغێکی گوزار ٢-پارچە پەڕۆیەك کە لە پێی حوشترو ئاژەڵیتر دەدرێت ٣-گۆشە پێو.
(أَرضٌ مَنْقَلَــة): زەوییەك کــە بەردی وردی زۆربێت/ زەوییەکی بەردەورداوی.
(اَلمِنْقَلَة (ج) مَناقِل): ١-ئامێری گواستنەوەی شــت و هەڵگرتنــی ٢-یارییەکــە لەســەر تەختەیەکی لاکێشەیی دەکرێت چوارده چاڵی تێدایە لە دووڕیزی بەرامبەردا لە هەر چاڵێکدا حەوت چــەوی تێدایە چەوەکان بەرێکەیەکی دیار دەهێنرێن و دەبرێن.
اَلمُناقَلَة١- ئاڵوگۆڕ پێکردن ٢-وتنەوەی ئاخاوتنو دووبارەکردنەوەو سەندنەوەی گۆرانیو سروود بۆ یەکتر (وەك بۆ یەکتریتان گێرابێتەوە).
٢اَلنِقْلَــة (ج) نِقَــلٌ: کچی قەیــرە کە لەبەر تەمەنی زۆری شووناکات/ کەس نایخوازێت.
الملحق:
نقــل: (اَلنَقالَــة): پێگوێــز/ دەســتە بەرە/ داربەســت. نوێنشــێوەیەکە بــۆ گوێزانەوەی نەخۆش یان برینداد.
(اَلإنتِقالِي): گوێزانەوە.
(حَرَکَةٌ إنْتِقالِیَّة): جووڵانەوەیەکی گوێزانەوەیە/ ڕاگوێزییە(یطلق علی ماهُوَ غَیرَ دائِم): بەبارێك دەوترێــت کــە هەمیشــەیی نەبێــت کاتیبێت/ قۆناغیبێــت کــە ڕێ خۆشــبکات بــۆ قۆناغێکی داهاتوو.
(عَهْدٌ إنْتِقالِي): سەردەمی/ قۆناغی گوێزانەوە.
(فَتْرَة إنتِقالِیة): ماوەی قۆناغی گوێزانەوە.
(حکومة إنتقالِیَّة): دامودەزگایەکی/ میرییەکی کاتیی/ میرییەکە کاروبار بۆ ماوەیەك دەگرێتە دەستو هەڵیدەسووڕێنێت تا ڕژێمێکی چەسپاو دێتە کایەوەو کاردەگرێتە دەست.
(أَحکام إنتِقالِیَّة): یاســایەکی کاتییە بەپێی بــارو ڕەوش دادەنرێــت و دەبێــت تــا یاســا هەمیشەییەکە پەیڕەو دەکرێت.

(-ألنَخْلُ): دارخورماكه شكۆفەيكردو بەريگرت.

(ألنَــوْض (مص) (ج) أنْــواض وَ أناويض):

١-دەمــى دەرچوونى ئاو/ دەرچەى ئاو ٢-دۆڵ/ دەرە.

(-مِــنَ البَعيرِ): نێــوان دوا برِبرِەى پشــتى حوشترەكەو تەختى پشتى.

(ألأنْواض والأناويض): شوێنى بەرز.

٣-(نــاضَ. يَنُــوضُ نَوضــاً): دواكــەوتو پاشەكشەيكرد/ گەرايەوە.

٤-(نَوَّضَ- الثُوبَ بالصِبغِ. تَنويضاً): جلەكەى رەنگكرد/ لە رەنك هەڵكێشا.

٥-(ألنَوْض (ج) أنْواض وأناويض): كلێنچكە/ جووچكە.

نــوط: (نــاطُ-هُ. يَنُــوطُ نَوطــاً وَنِياطاً): هەڵيواسى.

(نِيطَ عليه الشيءُ): شتەكەى پێوە هەڵواسرا.

(-تِ الدارُ): خانوەكە. دووركەوتەوە دوور بوو.

(-تِ الشــيءَ): بەراى خــۆى بێراوێژى كەس شتەكەى برِييەوەو كۆتايى پێهێنا.

(نِيطَ بِهِ الشــيءُ): شــتەكەى پێوە بەستراو پێوە گەيەنرا.

(نَوَّطَ-هُ): هەڵيواسى.

(-القِربَةَ): كوندەكەى يان مەشــكەكەى پرِو قورسكرد تا چەوريبكات.

(أبْطَــأ حتــى نَوَّطَ الــروحَ): هێنــدە خاوە خاويكرد تا دڵى سستكردو وەرِسيكرد.

(أنــاطَ-هُ بكَذا إناطَةً): بەوەوە بەســتيەوەو پەيوەندى ئەوەيكرد.

(-البَعيرُ): حوشــترەكە تووشى دەردەلوو بوو. (دەردێكە لوو لە ســنگى يان ملى يان ناوەوەى رانى دێت).

(إنْتاطَ- بهِ.إنْتِياطاً): پێوەى هەڵواسرا.

(-الشيءُ): شتەكە دووركەوتەوە.

(-الشيءَ): بێراوێژ شتەكەى برِييەوەو كۆتايى پێهێنا.

(إسْتَناطَ- فُلاناً بَعيرَهُ فَأنْتاطَ هُوَ لَهُ): فيسار حوشترەكەيدايە ئازوخەو خواردنى لێباربكات، ئەويش باريكردو بۆ خۆى هەڵگرت.

(ألنائط) (فا): رەگێكە شــاردراوە لە برِبرِەى پشتدايە لەژێر كەمەردا يان بەبرِبرِەى پشتدا درێژ بۆتەوە.

(ألنائط والنائطَة): چيكڵدان.

(ألنَــوْط (ج) أنْــواط وَ نِيــاط): ١-ئــەوەى هەڵواســرابێت بــە بارەكــەوە ٢-ســەربار كە دەخرێتە نێوان دوو تاكەوە.

(أثْقَــلَ- النَــوطُ الدابَّةَ) ســەربارەكە بارى وڵاخەكەى گرانكــرد ٣-ئەوەى كە بەبارەكەوە هەڵدەواســرێت وەك توێشــوو بــەرە يــان سەبەتولكە كە خورماو شتيترى تێدەكرێت.

(ألنَوْطَة): ١-جارێك هەڵواســين ٢-شــوێنێك كە لەرووى ئاوەكــەوە بەرزتر بێت ٣-لوويەك هەڵاوســاوييەك لەژێر گەروويان لە ناوەوەى

ئەژنــۆی دەربێــت (ئەمە لە دەمــاری دڵەوە وەرگیراوە وەکــو ئازارەکە لە دەمــاری دڵەوە بێــت) ٤-لوویەکی کوشــندەیە کــە لە ورگی حوشتر دەردێت ٥-چیکڵدانە ٦-ڤین ٧-شوێنێك ناوەراستەکەی درەختی تێدایەو ئەملاولاکەی بێدرەختــەو لــە لافــاو ســێلاو بەرزتــرە نایگرێتەوە.

(ألنِیاط (مــص) (ج) أنْوِطَة و نُوط): ١-دڵ ٢-هەمــوو شــتێکی هەڵواســراو ٣-(ع ١) شــادەمارێکە/ رەگێکە بەدڵەوە بەندە ئەگەر پســا/ پچــڕا خاوەنەکــەی دەمرێــت (ئەوە بەندی دڵە) ٤-(ع ١) دەمارێکە شــاردراوەیە لە برِبڕەدایەو لەژێر کەمەردایە.

(-مِنَ المَفازَةِ): دووریی رێگای بیابانی وشــکو بێئاو وەکو ئەوسەری نەبێت.

(مَفــازَةٌ بَعیدَةُ النِیــاطِ): بیابانێکە دوور و بێسنوور.

(قَطَعْتُ نِیاطَ البَلَدِ): بەولاتەکەدا تێپەڕیمو بڕیم.

(النَیّط): ناوەندی نێوان دوو شت.

(لا كثیرٌ ولا قَلیلٌ ولكن نَیّطٌ بینَ الأمْرَینِ): ئەزۆرەو نەکەم، بەڵام مامناوەندییە.

(ألنَیِّــط): چاڵاوێکە ئاو لە تەنشــتەکانیەوە دەردەچێت نەك لە بنیەوە.

(ألنَیِّطَةُ): حوشــترێکە لەگەڵ کاروانییەکاندا دەهێنرێت تا باری خۆتی لێبنێن.

(ألنَوْط (ج) ألأنواط): ئاوێزان/ هەڵواســراو/ داهێڵراو/ شۆڕکراوە.

(عِنَدهُ أنواطٌ مِــن التَّمرِ والعِنَب): خورماو تریی جۆرەهای هەڵواسراوی هەیە.

(ألتَنواط): گوڵەنکەو شتی رازاوەی کەژاوە کە پێوەیدەکەن پێی جواندەکەن.

(ألتَنَــوُّط وَ التُنَــوِّط. الواحِــدَةُ تَنَوُّطَة وَ تُنَوِّطَة) (ح): باڵندەی هێلانەچن کە بەچڵی درەختەوە هێلانەکــەی دەچنێتو هێلانەکە بەدارەکەوە هەڵدەواسێت.

(ألمَناط): شوێنی هەڵواسین/ ئاوێزانبوون.

(هُوَ مِنّي مَناطَ الثُرَیَّا): ئەو هێندەی دووریی ئەستێرەی کۆ لە منەوە دوورە.

(بَنو فُلان مَناطُ الثُرَیا): فیسار بەرە بڵندو شکۆدارن وەك بڵندیی ئەستێرەی کۆ.

(غایَةٌ مُنْتَاطَةٌ): ئامانجێکە دوور.

(ألمَنُوط (مفع): پێوەبەند/ پێوە هەڵواسراو/ بەوەوە بەستراو.

(هذا مَنــوطٌ بِــهِ): ئەمە بــەوەوە بەندە/ بەوەوە بەستراوە.

(هُوَ مَنُوطٌ بِالقَومِ): ئەو بەخوێشان بێگانەیە خۆی پێوە هەڵواسیوە.

(بَعــیرٌ مَنوطٌ): حوشــترێکە ملیو چوارپەلی لوویدەرداوەو هەڵاوساوە.

نوع: ١-(ناعَ- الغُصن- یَنُوعُ نَوْعاً): چڵەکە/ لقەکە لەریەوە.

(-الشيءُ): شتەكە لەرییەوە.
(-تِ العُقابُ): شــا هەڵۆكە/ كۆلارەكە. خۆیی لارو ســەرەو خــوار كردەوەو خــۆی ئامادەی داپەڕینكرد.
(-الرَجُلُ): ١-پیاوەكە برسییبوو ٢-تینووبوو.
نائِع (ج) نیاع: ١-برسی ٢-تینوو.
(نَوَّعَ- تِ الریحُ الشــيءَ. تَنویعــاً): باكە لە شتەكەیداو بزواندی.
(-زَیدٌ الشــيءَ): زەید شــتەكەی هەڵواسیو لێیگەڕا بلەرێتەوە.
(تَنَوَّعَ- الشيءُ): شتەكە لەرییەوە/ لەرەلەریكرد.
(-الغُصْنُ): لقەكە جووڵایەوە/ بزوا/ لەرییەوە.
(-فِي السَیرِ): لە ڕۆیشتندا پێشكەوت.
(إسْــتَناعَ الغُصْنُ. إسْتناعَةً) چڵەكە، پەلەكە جووڵایەوە/ لەرییەوە.
(-الرَجُلُ فِي السَــیرِ): پیاوەكە لە ڕۆیشــتندا پێشكەوت.
(- الشيءُ): شتەكە بەردەوامبوو/ سەرومڕ بوو.
(ألنائِع) (فا): ١-تینوو.
(جائِعٌ نائِعٌ): برســییەكە لە برساندا لارەوە لارەومیەتی/ بەملاولادا ئەكەوێت.
(قَومٌ جیاعٌ نِیاعٌ): خوێشــگەلێك لە برساندا لارەوە لارەومیانە/ بەملاولا دەكەون.
(ألنُوْع): تینوێتیی.
(رَمــاهُ اللهُ بالجوعِ وَ النوعِ): خودا برســیو تینوویكرد (ئەگەر دوعایان لێكرد دەڵێن:

(جُوعاً و نُوعاً): یاخوا برسیو تینوتبێت.
(ألنَوعَةُ): جارێك تینووبوون.
(ألنَوَعان): شەكانەوەو جوڵەی لقی درەخت.
٢-(ناعَ- فُلانٌ الشــيءَ یَنُــوعُ نَوْعاً): داوای شتەكەیكرد.
٣-(نَوَّعَ- الشيءَ. تَنویعاً) شتەكەی هەمەجۆر كرد.
(تَنَوَّعَ- الشيءُ): شتەكە هەمە (جۆر/ چەشن/ بابەت) بوو.
(ألنَوْع (ج) أنواع): ١-توخم ٢-جۆر/ چەشــن بابەت ٣-رەنگ.
(ألمِنْواع): ١-شێوە ٢-رێگە ٣-چەشن ٤-شێواز.
٤-(ألنَوْعَةُ): میوەی تەڕو تازە.
(مَكانٌ مُتَنَوِّع): شوێنێكی دوور.
مُتَنَوِّع: جۆراوجۆر/ چەشناوچەشن.
نوف: ١-(نافَ- الشيءُ. یَنوفُ. نَوفاً): شتەكە بەرزبووەوە/ بڵند بوو.
(-على الشيءِ): بەسەر شتەكەدا ڕوانیو لەو بەرزتر بوو.
(-البَعیرُ): حوشترەكە درێژو بەرزبوو.
(نَیَّفَ- على كذا تَنییفاً): لەوە پتر بوو.
(نَیَّف العَدَدُ على مــا تَقُول): ژمارەكە لەوە پتر بوو كە تۆ دەیڵێیت.
(أنــافَ- علــى الشــيءِ. إنافَةً): لە شــتەكە بەرزترو درێژتر بوو ڕوانی بەسەر شتەكەدا.
(أنافَ الجَبَلُ وَ أنافَ البِناءُ): كێوەكە بەرزبوو

روانــی بەمــلاو لایــدا. خانەکــە لەملاو لای بەرزتر بوو روانی بەسەر ئەملاولادا.
(أنافَ- على كذا): لەوە زۆرتر بوو.
(أنافَــتِ الدراهِــمُ على المئــة): درهەمەكان لەسەد زۆرتر بوون.
(ألنَوْف (مص) (ج) أنواف): ١-كۆپارەی بەرزی حوشــتر ٢-دەنگ ٣-دامێنی كلك (لەبەرئەوەی زۆرتر درێژە.
(ألنِيــاف مِنَ الجمــال و النُوق): حوشــترو مێحوشتری درێژو بەرز.
(جَمَلٌ نياف وناقَةٌ نَيافٌ): حوشــتری بەرزو درێژو مێحوشتری بەرزو درێژ.
(إمْرَأةٌ نياف) ژنێكی زۆر بالا بەرزی شــۆخو شەنگو قەشەنگ.
(فَلاةٌ نيافٌ): بیابانێكی درێژو پانو بەرین.
(ألنَيِّف): چاكەو پیاوەتی/ بەخشش.
(هُوَ نَيِّفٌ عليه): ئەو لەو زیاترە/ پترە.
(ألنَيِّف والنيف): پتر/ زیاتر.
(عَشــرَة وَ نَيِّف و نَيْــف): دەو (پتر/ زیاتر/ زۆرتر).
(ألنَيْــف): پتر لە ئەوەنــدەو هەرچی لە دەو چەندانەی دە پتربێت دەڵێن:
(نیف): تا دەگاتە چەندانەكەیتری دە.
(نیــف): هەر لەگــەڵ دەو چەندانــەی دەدا دەوترێت.
(عَشرَة و نيف): دەو ئەوەندە/ دەو پتر.
(مِئَة ونيف): سەدو پتر/ سەدو ئەوەندە
(الف ونيف): هەزارو پتر هەزارو ئەوەندە. دەوترێــت دەوپتر بیســتو پتر ســەدو پتر/ هــەزارو پــتر/ هــەزارو ئەوەنــدە ناوترێت (پازدەو پتر/ پازدەو ئەوەندە).
(جَبَلٌ عالِي آلمَناف): كێویی زۆر بڵند/ قووچ
(ألمُنيف) (فا): زیادە/ پتر/ بالاتر/ زۆرتر.
(جَبَــلٌ مُنيــف): كێوێكــی بالا كە بەســەر ئەملاولادا بروانێت/ بەرزتربێت.
(لَهُ عِــزٌ مُنِيف): نگینێكی بــالای هەیە (بۆ بێچواندنە).
(إمْرَأةٌ مُنيفَةٌ): ژنێكی شۆخی قەشەنگ/ بالا بەرزی جوان.
٢-(نــافَ- الصَبيُ مِنَ الثَدي نَوْفاً): ســاواكە مەمكەكەیمژی.
نــوق: (نــاقَ. يَنُــوقُ. نَوقــاً): بەزەكەی لە گۆشتەكە كردەوە.
(نَوَّقَ- الجَمَلَ. تَنْويقاً): حوشــترەكەی باش رامكردو راهێنا.
(-آلنَخْلَ): تۆوی داخورما نێرەكەی بەدارخورما مێكەدا كردو پرژاند/ تۆو پرژێنیكرد.
(الشــيءَ): شــتەكەی ریزكردو رێكخســتنو دامەزراند.
(آنَقَ- الشــيءُ فُلاناً. إيْناقاً وَ نَيْقاً): شتەكە چــووە دڵــی فیســارەوەو لای پەســند بــوو. وشــەی (آنَقَ) هەڵگێراوەی وشەی (أنَاقَ)يەو

چاوگەکەی (نِیقاً)ەو لەسەر پێوەر نییە).
(تَنَوَّقَ-بـە تَنَوُّقـاً): دڵڕاگـرتو لەگەڵیدا نەرمبوو.
(تَنَوَّقَ و تَنَيَّقَ- فِي مَلْبَسِهِ أَو مطعَمِهِ أَو أُمورِهِ تَنَوُّقـاً وَ تَنَيّقاً): لە پۆشـینی جلوبەرگداو خواردنو کاروباریدا بەسـەلیقەو ڕێکپۆشو کارزانو کار پەسـەند بوو/ تیایاندا چاکبوو.
(وەك لـە (ناقة)وە وەرگیرابێت کە باشـترین سامان بووە کە هەیانبووە).
(إِنْتـاقَ- الشـيءَ. إِنْتِياقـاً): شـتەکەی (گوڵچنکرد/ هەڵبژارد).
(-فِي مَلْبَسِهِ أَو مَطعَمِهِ أَو أُمورِهِ): لە بەرگدا بەسـەلیقەو ڕێکپۆشـبوو یان پەسەند خورد بـوو لە کاروبـاردا لێزانو کار پەسـند بوو/ چاکتێهەڵچوو بوو.
(إِسْتَنوَقَ- الجَمَلُ إِسْتِنواقاً): نێرە حوشترەکە وەك مێحوشترەکەیکرد ملیداو رامبوو.
(اَلناقَـةُ): ١-(فـك) کۆمەڵـە هەسـارەیەکن لـە شـێوەی ڕیزبوونـی حوشـتردا ڕیزبوون ٢-زیپکەیەکە کە بەدەست دەربێت.
(اَلنَاقَـةُ (ج) ناقٌ وَ نُوقٌ وَ أَنْـوُقٌ وَ أَنْؤُقٌ وَ أَوْنُـقٌ و أَيْنُـقٌ وَ نِياقٌ وَ نافَـاتٌ وَ أَنواقٌ و (جج) أَيانِقٌ وَ نِياقاتٌ (ح): مێحوشتر (بۆیە وا ناونراوە لەبەر دروستکردنی باڵاکەی کەشتی وای هەیەو وا دروسـتکراوە لە زیندەوەریتردا نییە).
(اَلنـاوَق (ج) ناوَقـات) (فارسـیە): داری هەڵکۆڵـراو کـە وەك پلووسـك ئـاوی پێدا دەڕوات.
(اَلنُوَق): ڕەنگێکی سپی کە کەمە ئاڵێکی تێدا بێت/ پەمەیی کاڵ.
(اَلنُوَقَةُ) کارامەییو دەسترەنگینی لە هەموو شتێکدا.
(اَلنَوَّاق): کەسێکە کارامانەو لێزانانە چاکسازی هەمـوو شـتێکە/ ڕاسـتکەرەوەی هەمـوو کاروبارێکە.
(اَلنيِّق (ج) نِياق وَ أَنياق وَ نُيُوق): پووپەی شاخ.
(اَلنِيْقَةُ): بەتەنگەوە هاتنی جل لەبەرکردنو خواردنو کاروبار چاکبوونو بەسەلیقەبوون تیایاندا.
(خرقـاءُ ذاتُ نيقَـةٍ): بەیەکێـك دەڵێن کە نەزانو خۆ هەڵکێشـبێت کە بەو نەزانییەی خۆی بە بەسەلیقە بنوێنێت
(اَلنَيّق): ڕێكو پێكو بەسـەلیقە لە پۆشینی بـەرگو خـواردنو کاروباریـداو بەتەنگەوە هاتوویان.
(اَلُمنَوَّق): نێرە حوشـتر کە وەکو مێحوشـتر رامو ملپێشور کراوە.
(-مِن النَّخلِ): دارخورمای هەڵاڵە پرژێنکراو/ تۆوپیاداکراو.
(ناقَـةٌ مُنَوَّقَـةٌ): مێحوشـترێك فێـری

رۆیشتنکرابێت کە باش بڕوات.

نوك: (نَوِكَ. يَنْـوكُ نَوَكاً وَ نُواكاً وَ نَواكاً وَ نُواكَةً): خۆی گەوجکرد/ گەوجبوو.

(أَنْوَكَ-ه إِنواكاً): بەگەوج هاتە بەرچاوی یان بەگەوجیدانا.

(إِسْـتَنْوَك. إِسْـتِنواكاً): گەوجبـوو/ خـۆی گەوجکرد.

(-فُلاناً): فیساری گەوجکرد، بەگەوجیدانا.

(ما أَنْوَكَهُ): ئای کە گەوجە!

(اَلأَنْـوَك (ج) نَوْكَـى وَ نُـوْك (م) نَـوْكاء (ج) نُـوْكٌ): ١-گـەوج ٢-زۆر گـەوج ٣-گێلو بێدەسـەلاتو تێنەگەیشـتوو ٤-لالەپەتـە/ یەکێکە قسەی بۆنەیەت.

(اَلْمُسْتَنْوِك) : گەوج.

نـول: (نالَ- فُلاناً العَطِيَّةَ و بالعَطِيّةِ وَ نالَ لَـهُ العَطِيَّةَ وَ بالعَطِيَّةِ. يَنُولُ. نَوالاً وَ نَوْلاً) بەخششەکەیدا بە فیسار.

(نالَني بالخَير): خێرو بێری دەستگیرکردم

(نالَ لَهُ بالشَيءِ): شتی دەستگیرخستو دایە.

(نالَ لَـهُ أَن يَفعَلَ كذا): دەمـی/ کاتی ئەوە هاتووە ئەو کارە (بکات/ ئەنجامبدات).

(نـالَ. يَنـالُ. نَيـلاً وَ نائلاً) : دلفـراوانو بەخشندە بوو/ جوامێر بوو.

(نَوَّلَ-هُ تَنويلاً): بەخششیدایە/ پێی بەخشی.

(-هُ مَعروفَـهُ): خێـرو بێـرو چاکەی خۆی پێگەیاند.

(-عَلَيهِ بِشَيءٍ): شتێکی پێبەخشی.

(ناوَلَ-هُ الشيءَ مُناوَلَةً): شتەکەیدایە یان دەستی بۆ درێژ کردو شتەکەیدایە/ گەیاندیە دەستی.

(أَنالَ-هُ الشـيءَ وبالشَيءِ): شـتەکەی دایە/ دایە دەستی.

(أَنالَني بخَيرٍ): خێرو بێری دەستگیرکردم

(ما أَنْوَلَهُ): ئای کە بەخشندەیەو چاکەکارە!

(تَنَوَّلَ- الشيءَ): شتەکەی وەرگرت/ برد.

(-عَلَينا فُلانٌ بِشَـيءٍ يَسـيرٍ): فیسار شتێکی کەمی داینێ.

(تَنـاوَلَ- الشـيءَ): شـتەکەی گـرت/ برد/ وەرگرت.

(-المسـيحيُّ): فەلەکە/ دیانەکە بەشـداریی دەسـتووری ئێوارە نانی پـیرۆزی خواییکرد/ نانی پیرۆزی خوایی خوارد.

(-مِنَ يَدِهِ شَـيْئاً): شـتێکی لە دەسـت ئەو وەرگرت

(تَناوَلَـت بِنا الركابُ مَـكانَ كذا) کاروانەکە گەیاندنیە ئەو شوێنە.

(اَلنائل) (مص و(فا) ١-بەخشینو چاکەکردن/ پیاوەتی/ ٢-جوامێریی بەخشندە، چاکەکەر/ جوامێر.

(اَلنائِلَة): مێی وشەی (اَلنائل).

(اَلنال): ١-بەخشـین/ پیاوەتی ٢:بەخشـندە/ چاکەکار خێرخواز/ جوامێر.

(رَجُـلٌ نـالٌ): پیاوێکـی جوامێـر/ زۆر

بەخشندە/ خێرخواز.
(رَجُلانِ نـالانِ وَرِجالُ أَنوالٌ): دوو پیاوی جوامێرو بەخشندە پیاوانی جوامێرو بەخشندە.
(أَلنَوال): ١-بەخشین ٢-بەش/ بەرکەوت/ بەهرە ٣-دروستیی‌و راستیی.
(نَوالَكَ أَنْ تَفْعَلَ كذا): بەشی تۆ ئەوەیەو ئەرکە لەسەرت کە دەبێت ئەوە بکەیت.
(أَلنَول (مص) (ج) أَنْوال): دۆڵی ئاودار کە هەمیشە ئاودارەو ئاوی پێدا دەڕوات.
(نَوْلَكَ أَن تَفعَلَ كذا): مافی خۆتەو لەسەرت پێویستە کە دەبێت ئەو کارە ئەنجام بدەیت.
(ما نَوْلُكَ أَن تَفعَلَ كذا): ئەوەهی تۆ نییە نابێت وەربگریت یان تۆ نابێت ئەو کارە بکەیت.
(أَلنَولَةُ) ١-جارێك وەرگرتن‌و دەستگیربوون/ دەستکەوتن ٢-ئەوەی مرۆڤ دەستیدەکەوێت.
(ما أَصَبتُ مِنْهُ نَوْلَةً): هیچ بەخشینێکم لێدەست نەکەوتووە.
(أَلمُناوَلَة عند المسيحين): لەلای دیانەکان بەشداریکردنە لەڕێو ڕەسمی ئێوارە نانی پیرۆزیی خوداییدا.
(٢-(أَنالَ- فُلانٌ باللّهِ): فیسار سوێندی بەخواد خوارد.
٣-(النائِلَةُ): بتێکی قورەیشەکانبوو.
(أَلنَاوِلون): ١-کرێی سواربوونی پاپۆڕ ٢-ڤالۆنجەی پاپۆڕ (یونانیە).

(أَلنَوْل (ج) أَنوال) تەون یان دەسگای جۆلایی/ دەستگای چنین‌و چنراو لەسەر هەڵکردن.
(أَلمِنْوَل (ج) مَناويل): ١-دەستگای چنین‌و چنراو ٢-تەون/ لەسەر هەڵکردن/ خەرەك.
(أَلمِنْوال): جۆلا.
(أَلمِنوال (ج) مَناويل): ١دەستگای جۆلایی ٢-شێواز/ شێوە ٣-دەستوور ٤-ڕوو ٥-ڕێباز ٦-جۆر ٧-چەشن ٨-پێودان.
(هُم على منوال واحد): ئەوان لەسەر یەك شێوە ڕەوشتن/ یەك چەشن هەڵسوکەوتیان هەیە/ خوویان یەکە.
(لا أَدری علی أَيِّ منوالٍ هُوَ): نازانم ئەو ج جۆرێکە/ لەسەر ج ڕێبازێکە.
(إِفْعَل على هذا المِنوال): لەسەر ئەم دەستوورە برۆ/ ئابەم پێیە، بەم شێوازە ئە ئاوا، لەسەر ئەم ڕێبازە بۆ ئەنجامدانی کارەکەت برۆ
(مِنوالُكَ أَلا تَفعَل كذا): دەستوورت ئەوەیە کە ئەو کارە نەکەیت/ لەسەرت پێویستە کە ئەو کارە نەکەیت.
نوم: ١-(نـامَ-ەُ. يَنومُ. نَوماً): لە خەوتندا نوستندا بۆری ئەویداو زووتر یان پێش ئەو نووست.
(نَاوَمَنی فَنُمتُهُ): لەگەڵمدا نوست من پێش ئەو خەوتم.
(نامَ. يَنامُ. نَوماً وَ نياماً): ١-وەمنەوزیدا یان ڕاکشا/ خەو بردیەوەو نوست ٢-مرد.

(أَلنيمَة): ١-خەوتن/ نوستن ٢-مردن.
(نام-تِ السوقُ): بازارەکە وەستا/ بێبازاریی بوو/ بازار کەوت.
(-اَلثَوبُ): جلەکە درا (بەشێوەی خواستنی وشەکەیە).
(-تِ الريحُ): باکە کەوت/ وەستا/ کپبوو.
(-تِ النارُ): ئاگرەکە کوژایەوە/ دامرکایەوە.
(-البَحْرُ): دەریاکە نیشتەوە هێمن و هێواشبووەوە.
(-العِرقُ): دەماری خوێنەکە لێینەدا.
(-الرَجُلُ): سوجدەی بەندەیی بۆ خودا بردو بچووکی خۆی پیشاندا.
(-إلَيهِ): لای ئەو سرەوت و دڵنیابوو.
(-عَن حاجَتِهِ): پێداویستیەکەی پشتگوێخست و (بەدەربەسیەوە/ بەتەنگیەوە نەهات).
(نامَ هَمُّهُ): بێمەراقبوو.
(فُلانُ لايَنامُ ولا يُنيمُ): نەخۆی دەخەوێت و نەدەهێڵێت کەس بنوێت.
(نَوَّم-هُ تَنويماً): خەواندی/ نواندی.
(-الرَجُلُ) زۆر نوست.
(-تِ الإبِلُ): حوشترەکە مرداربووەوە.
(نـاوَمَ-هُ مُناوَمَـةً): لەو زیاترنووست یان پێشتر نوست.
(أَنامَ-هَ): ١-رایکشاندو خەواندی ٢:کوشتی.
(أَنامَ زَيداً): زەیدی بەنووستوویی دی.
(تَنـاوَمَ. تَناوُماً): ١-خۆی کرد بەنووستوو ٢-ویستی بنوێت.
(-إلَيهِ): دڵنیایی و ستارەی دڵی لای ئەو بوو/ لای ئەو دڵی سرەوت و دڵنیابوو/ لێی دڵنیابوو.
(إسْتَنامَ- الرَجُلُ. إسْتِنامَةً): ١-پیاوەکە نوست ٢-ویستی بنوێت ٣-بەدرۆ خەوی لەخۆی خست.
(-إلَيهِ): لای ئەو ستارەیگرت و بێدەنگبوو وەك نوستبێت.
(-إلى الشيءَ): دڵی بەشتەکە کرایەوەو پێیخۆشبوو.
(أَلنائِم (فا) (ج) نِيام وَ نُوَّم وَنُيَّم وَ نُوَّام وَ نُيَّام وَ نَوم): (دەڵێن وشەی (نَوْم) کۆیە): نوستوو/ خەوتوو/ راکشاو بۆ نوستن.
(لَيلُ نائِمُ): شەوێکی بەخەو، ئەمە وەکو (يومُ عاصِفُ)ە واتا رۆژێکە بەباو بڕ.
(أَلنائِمَةُ (ج) نُوَّم): ١-مێی وشەی (النائم): ئافرەتی خەوتوو ٢-مێی وشەی مردوو.
(أَلنَؤُوم): خەو خۆش خەو قورس کەسێکە زۆر بنوێت.
(رَجُلُ نَؤُومُ او آمـرَأَةٌ نَؤُومُ): پیاوێکی خەو خۆش یان ژنێکی خەو خۆش کە زۆر حەز لە خەو بکەن/ خەو قورس.
(أَلنَـوْم (مـص): خـەو/ نوسـتن خەوتن/ بارێکە وەك بێهۆشـی دەداتە دڵ، هەستەکان دەوەستێنێت.
(أَلنَوْم): کۆی وشـەی (النائم) خەوتوو. یان خەوتن.

(رَجُلٌ نُوَمٌ وَ نَوَّام): پیاوی خەوخۆش کە زۆر حەز لە خەو دەکات/ خەو قورس/ خەوگران
(أَلنَومَــةُ (ج) نَومــات): جارێــك نوســتن/ خەولێکەوتن.
(أَلنُوْمَــة): کەســێکە خەڵك گوێــی ناداتیو بێبایەخە.
(أَلنُوَمَةُ): ١-خەوخۆش ٢-گەمژە/ گێل/ بێئاگا ٣-گەلۆرو خوێڕیی.
(أَلنُوَام= النَوم): نوستن.
(-طب): نەخۆشیی خەوتن.
(یــا نَومانُ): هــەی خەوخۆش (وشــەکە بۆ تەنها بانگکردنە).
(أَلنِیم):١-نازو بوونی‌تەواو/ نازو خۆشگوزەرانیی تەواو ٢-بەرگی خەو/ بیجامە ٣-کەســێکە خەڵك لای دڵنیانەبن/ هەست بە ئارامی ئەکەن.
(أَلنِیمَة): خەوتن/ نوستن.
(المَنــام (ج) مَنامــات): ١-خەوتن/ نوســتن ٢-جێنوستن/ نوێن ٣-خەون.
(أَلمَنَام وَ المُسْتَنام): چاڵو شوێن کە ناو تیایدا گیر دەخواتو تیایدا دەمێنێتەوە.
(أَلمَنامَــة): ١-جێنوســتن/ خەوتنگە ٢-بەرگی خەوتن/ بیجامەو شــتی لەو بابەتەی خەوتن ٣-گۆڕ.
(طَعامٌ مَنومَة): خواردنی بەخەو/ خواردنی خەوهێن.
٢-(أَلنیم): ١-فەروو، دەیشڵێن: فەرووی کورت تا سنگ ٢-(ن): درەختێکە درکی نەرمی هەیە. گەڵاکەی وردە. بەرێکی زۆر دەگرێتو بڵاوبڵاو وەك دەنکە نۆکەو ترشە کە پێگەیشت رەشو خۆشدەبێتو دەخورێت.
الملحق:
نوم: (أَلتَنْویم): نواندن/ خەواندن
(أَلتنویم المغناطیسی): خەواندنی موگناتیسی: کارکردنە سەر کەسێکە بەقسە کە خەولێخەرەکە بەگوێیدا دەداتو دەیخاتە دڵیەوە نیمچە خەوێکی پێلێدەخــات بەڵام هەســتی لێنابرێــتو ئاگای نابرێتو بەدەنــگ داواکانی خەولێخەرەکەیەوە دێتو وەڵامیدەداتــەوە فەرمانەکانی جێبەجێ دەکات ئەو کەســەی کە دەخەوێنرێت پێیدەڵێن ناوەندیکار.
(أَلمُنَــوِّم): خەولێخــەری موگناتیســیو ئەو کەسەی کە پێشەی ئەوەیە.
(دَواءُ مُنَــوِّم): ئــەو دەرمانەیە، شــتەیە کە دەبێتە هۆی خەولێخستنو بێهۆشکردن
(جُرْعَــةُ مُنَوِّمَــة): قومێکــی خەولێخەرو بێهۆشکەر
(أَلمُنَوِّم (ج) مُنَوِّمات): مادەیەکە. دەرمانێکە دەبێتە هۆی خەولێخستن
(تَناوَلَ مَنَوِّمــاً): دەرمانێکــی خەولێخەری خوارد.

---

نون: ١-(نَوَّن. نُوناً): پیتی نوونی نووسی
(-الكلِمَــةَ): دەنگــی نوونێکــی زیــادەی

بەوشــە ســەرو بــۆر دراوەکەوە نــا بەدەنگ نــەك بەنووســین ئەویــش بەدووبــارە کردنــەوەی ســەرو بۆرەکەی وشــەکە وەکو کِتــابٌ. مُفیــدٌ (اَلنُــون): ١-دەمی شمشــێر ٢-شمشێر.

(النــون (ج) نُونَاتٌ وَ أَنــوانٌ): لە پیتەکانی زمانی عەرەبییە.

(اَلنُون (ج) نینان وَ أَنْوان): مەرەکەب.

(ذو النون): ناوی شمشــێرێکی عەرەبییە کە بەنوون چوێنراوە.

(ذو النُونَــین: شمشــێری(معقــل کــوری خُوَیلِد) ە.

٢-(اَلنُون (ج) نینان و أَنوان (ح): نەهەنگ

(ذو النــون): نازنــاوی حەزرەتــی یونســی پێغەمبەرە.

(اَلنونە (ج) نُونات) (ح): ١-ماسی ٢-وتەیەکی راست ٣-چاڵی چەناگەی منداڵێکی بچووك.

الملحق:

نون:(اَلتَنوین-عندالنُحاة) لای رێزمانەوانەکان ئەوەیــە نونێکی زیادەیە بێدەنگــە/ زەنەدارە بەدوایــی وشــەکەوە دەلکێنرێــت بەدەنــگ نــەك بەنووســین بەدووپاتکردنــەوەی بزوێنەکە دەردەخرێت ئەویش تەنها لە وشــە ئیعرابکراوەکاندا دەبێت.

---

نوە: ١-(ناهَ- النَباتُ وغیرُهُ. یَنوهُ. نوهاً): گیاکە، رووەکەکەیان شتیتر بەرزبووەوە/ بالآیکرد.

(-تِ الهامَةُ): کوندە بەبووەکە سەریهەڵبڕیو زریکاندی/ بە دەنگیبەرز خوێندی.

(-فُــلانٌ بالشــيءِ): شــتەکەی (هەڵــبڕی/ بەرزکردەوە).

(-تْ نَفْسُهُ عَنِ الشيءِ یَنُوهُ وَیَناهُ نَوْهاً): دڵی لەسەر شــتەکە لاچوو نەیویستو وازیلێهێنا/ بەجێیهێشت.

(نَوَّهَ- الشيءَ تَنویهاً): شتەکەی بەرزکردەوە.

(-بِفُــلانٍ): ١-بەدەنگیبەرز فیســاری بانگکرد ٢-ناوی (باش هێنا/ بەرزکردەوە) ٣-ستایشیکرد/ هەڵیناو بەگەورەیگرت.

(نَوَّهتُ بالحَدیثِ): ئاخاوتنەکەیانفەرمایشتەکەی پێغەمبەرم باسکردو دەرمخستو بەرز رامگرت.

(-بِاَسْمِهِ): بەدەنگی بەرز ناویهێنا، بانگیکرد.

(تَنَوَّهَ. تَنَوُّهاً): بەرزبووەوە.

(اَلنَــوْه والنُــوْه): کۆتایــی بەشــت هێنان/ وازلێهێنان.

(اَلنَوهَةُ): جارێك وازلێهێنان.

(اَلنُوْهَةُ): هێزی لەش.

(اَلنَوَّاهَةُ): شینو لاواندنەوەو گریان/ ئافرەتی شیوەنگێر.

(اَلنُوَّه= اَلنُوَّح= النائحات): ژنە شیوەنکەرەکان کە بەدەنگیبەرز شیوەندەکەنو دەلاوێننەوە

(هُوَ أَنْوَهُ مِن فُلان): ئەو لە فیسار خانەدانترو بەرزترە.

٢-(اَلنَوْهَةُ): ژەمەخواردنێك.

نوي: ١-(نَوى- الشـيءَ يَنوي. نَواةً وَ نِيَّةً و نِيَةً): نیازی شتەکەیکردو سوورخواستیبوو
(-القَـوْمُ مَنْزِلاً بِكَـذا): خوێشـگەل رووپانکردە هەوارێك لە فلان شوێن، نیازی ئەو هەوارەیانکرد.
(-اللهُ فُلانـاً): خـودا فیسـاری پاراسـت. بەگوزارکـەر دەڵێـن: (نَـواكَ اللهُ) خـودات لەگەڵبێتو بتپارێزێت.
(نَـواكَ اللهُ بِالخَـيرِ): خـودا خێـرو بـیرت بێنێتەرێو تووشبکات.
(نَوى- فُلانٌ مِن مَكانٍ إلى آخَر نَوىً): فیسار لە شوێنێکەوە نیازی شوێنێکیتریکردو چوو.
(-المُسـافِرُ نيَّـةً وَ نَـوىً): گوزارکەرەکـە دوورکەوتەوە/ بۆ شوێنی دوور رۆیشت.
(نَوَّى فُلاناً. تَنْوِيَةً): نیازەکەی خۆی پێسپارد کە بۆی بکاتو کردی بەنوێنەری خۆی.
(-حاجَتَهُ): پێداویستیەکەی جێبەجێکرد
(أنْـوى- آلرجُل. إنْـواءً): دوورکەوتەوە یان گوزارێکی زۆریکردو بۆ شوێنی دوور چوو.
(-حاجَتَهُ): پێداویسـتیەکەی جێبەجێکرد یان دەستگیریبوو.
(تَنَوَّى- الشـيءَ. تَنَوّياً) نیازی شتەکەیکردو بۆیچوو.
(إنْتَـوى-هُ إنْتِـواءً): نیـازی ئەوەیکـردو بۆیچوو.
(إنْتَواهُ بِنَداتِهِ): بەدەنگ نیازەکەیەوە چووو پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێکرد.
(-آلقَوْمُ): خوێشـگەل لە ولاتێکـەوە یان لە شارێکەوە بۆ ولات یان شـارێکیتر باریانکرد/ گوێزایانەوە.
(-القَومُ بِمَوضِعِ كَذا): خوێشگەل لەو شوێنەدا نیشتەنیبوون.
(-القَـومُ مَنْـزِلاً بِمَـكانِ كَذا): خوێشـگەل رووپانکردە نشینگەیەك لەو شوێنەدا.
(اَلناوي) (فا) نیازخواز/ خوازیار ٢-کەسـێکە نیازی شوێنگوێزانەوە بێت.
(فُلانٌ ناوي القَومِ وَ مُنتَواهُم): فیسار رابەرو کاربەسەربەری خوێشگەلە.
(اَلنَوى) (مص): ١-دووریی ٢-ئەو شوێنەی کە نیازبێـت رووی تێبکـەن‌و گوزارەکە بیەوێت بۆی بچێت دوور بێت یان نزیك ٣-خانوو.
(إسْـتَقَرَّت نَوى القَومِ بِمَوضِـعِ كذا وكذا): خوێشـگەل لە فیسـار جێگەو فـلان جێگەدا نیشتەنیبوون/ جێگیربوون.
(اَلنَّوِيُّ): دۆستی هاونیازت.
(اَلنِيَّةُ): ١-نیاز ٢-خواسـتو بریاریدڵ ٣-سوور خواسـتی کردنـی کارێـك ٤-کاروبـار ٥-ئەو شـوێنەی کـە گوزارکارێـك نیازیەتی‌و رووی تێدەکات جا دوور بێت یان نزیك.
(نَـووا نِيَـةً قُذُفـاً): نیـازی شـوێنێکی (دووریانبوو/ دووریانکرد) (دەشـێت وشـەی (نِيَّـة) سـووکبکرێت ببێـت بـە(نِيَة (ج) نِيات). نِيَّة: ٣-پێداویستی/ نیاز.

(لــي فی بَيتِ فُــلان نِيَّةٌ): له ماڵی فیسـار پێداویستیەکم هەیە/ نیازێکم هەیە.

٢-(نــوی- النَــواةَ. يَنــوي نَــوىً): ناوکــە خورماکەی یان هیتری دەرهێناو فرێیدا.

(نَوّی-تِ البسْــرَةُ تَنوِيَةً): خورما سەوزەکە ناوکیکرد.

(-فُلانٌ): فیسار ناوکە خورماکەی فرێدا/ تووردا.

(إسْــتَنَوی- الرَجُلُ إسْــتِنواءً): فیسار ناوکە خورماکەی فرێدا.

(اَلنَوّاء): ناوکەخورما فرۆش.

(اَلنَواة (ج) النَوی): ناوکە خورمایەك (دەکرێ بەمێ وە بەنێریش.

(اَلنَواة (ج) نَــوی وَ نَوَيات و (جج) أنْوَاءٌ وَ نِويٌّ وَ نَوِيٌّ): ناوك/ دەنك.

٣-(نَــوی-تِ الناقَةُ يَنــوي نَيّــاً وَ نَوايَةً وَ نِوايَةً): مێحوشترەکە قەڵەو بوو.

(ناقَةٌ ناوِيَةٌ ونــاوٍ (ج) نِواءٌ): مێحوشــتری قەڵەو.

(اَلناوی): کۆپارەی مێحوشتر.

(اَلنَيُّ) (مص) بەز.

(اَلنِيُّ): قەڵەویی.

٤-(نَوّی- السَنُّورُ تَنوِيَةً): (عاميه سريانِيَّة) پشیلەکە میواندی.

٥-(ناوی-هُ. مُناواةً): دوژمنایەتیی لەگەڵدا کرد.

الملحق:

نوي: (النَوَوِيّ): ئۆتۆمیی.

(طاقَة نَوَوِيَّة): وزەی ئۆتۆمیی.

(حَشْوَة نَوَوِيَّة): ئۆتۆمتێناخنراو. بەوە دەڵێن کە لە بۆمبای ئۆتۆمیدا بەکاردەهێنرێت.

(حَــربٌ نَوَوِيَّة): جەنگــی ئۆتۆمیی کە وزەو چەکی ئۆتۆمیی تێدا بەکاردەهێنرێت.

(سلاحٌ نَوَوِي): چەکی ئۆتۆمیی

---

نِيء (ناءَ يَينیءُ- اللَّحم وغَيرُهُ. نَيْئاً وَ نُيُوءَ وَ نُيُوءَةً): گۆشــتەکە یاشــتیتر نەکوڵاوبوو/ کاڵو کرچبوو/ پێنەگەیبوو.

(نَيَّــأَ- الأمــرَ تَنييئــاً): کارەکــەی بــاش دانەمەزراندبوو.

(أَنْيَأ- اللَّحْم. إنياءً): گۆشتەکەی پێنەگەیاند، نەکوڵاند.

(اَلنَیءُ ١-- مِنَ اللَّحم): گۆشتی کاڵ کە ئاگری نەدیبێت یان نەبرژاوو نەکوڵاو/ کاڵو کرچ.

(نِيُّ): گۆشــتی نەکوڵاو یــان نەبرژاو/ نەبوو ٢-شیری ساغو رووت.

نَیبَ: (نابَ-هُ يَنيبُ نَيباً): بەکەڵبەیدادا

(نَيَّبَ-تِ الناقَةُ تَنبيباً): مێحوشــترەکە پیر بوو.

(-النَبــتُ): گیاکە، رووەکەکە رەگو ریشــەی دەرکرد.

(-فُلانٌ السَهْمَ): دانی بەتیرەکەدا نا تا بزانێت رەقە یان نەرمە.

(-زَيدٌ): بەدانــە کەڵبەکانی گازیگرتو دانی سەرەوەی نایە سەر دانی خوارەوەی.

(-فُلاناً): بەکەڵبەی گازیگرت.
(ظَفَّر فيهِ السَبعُ وَ نَيَّبَ): درندەکە چنگی لە نێچیرەکە گرتو کەڵبەی تێچەقاند.
(تَنَيَّـبَ- النَبـتُ): رووەکەکـە یـان گیاکە رەگیدەرکرد.
(-الشيبُ): سپێتیی لەسەریدا دەرکەوت (وەکو ریشەی رووەك).
(اَلناب) (ج) أَنْيُب وَ أَنياب وَ نُيوب وَ أَنابِيب): ١-دانی کەڵبە (مێیە) ٢-مێحوشتری پیر/ بەتەمەن.
(نُيَّـب (ج) أَنياب وَ نُيُوب ونيب): کەڵبەی بچووك/ کەڵبۆکە.
(نابُ القَوم (ج) أَنَياب) سەرداری نەتەوە یان خوێشگەل.
(اَلنَيُوب): مێحوشتری بەتەمەن/ پیر
(اَلأَنْيَب (م) نَيْبَاء (ج) نيْبٌ): کەڵبە گەورەو ئەستور خاوەنکەڵبەی ئەستوور.
نیـت: (نَاتَ. يَنيتُ. نَيْتَـاً): لەبەر بێهێزیی بـەلادا هـات/ ئەمـلاولای کـرد/ لارەوە لارەوەیبوو.
نیح: ١-(نَاحَ. العَظمُ. يَنيحُ. نَيْحاً): ئێسقانە ناسكو نەرمەکە رەقو پتەو بوو.
(نَيَّحَ- اللهُ عَظْمَهُ): خودا ئێسقانەکەی پتەوو قایمکرد ٢-وردیکرد/ پواندی.
(ما نَيَّحْتُهُ بخَير): شتێکم نەدایە.
(لا نَيَّـحَ اللهُ عِظامَهُ): خودا ئێسـقانەکانی قایمو پتەو رەق نەکات.

(نَيَّحَـهُ فَتَنَيَّـحَ) حەسـاندیە/ حەواندیەوەو حەوایەوە/ حەسایەوە.
(اَلنَيِّح): رەقو پتەو.
(عَظْمٌ نَيِّح): ئێسقانێکی پتەوو رەق.
٢-(نـاحَ- الغُصـنُ. يَنيحُ نَيْحـاً وَ نَيَحاناً): چلی/ لقی درەختەکە شەکایەوە.
٣-(تَنَيَّحَ- فُلانٌ) (سریانیە): مرد.
نیر: ١-(نَارَ وَ نَيَّرَ وَ أَنـارَ الثَوبَ. يَنيرُ نَيْراً وَ تَنْيِـيراً وَ إِنارَةً): تاڵـی جوانی لە بەرگەکە هەڵکێشـاو نیشـانەو نیگاری جوانی بۆ کرد.
(اَلنَيَّار): نیگارو تال تێهەڵکێشو رازێنەرەوەی جلو بەرگ.
(اَلنِيْـر): ١-نیشـانەو نیگـاری رازێنەرەوەی سـەر بەرگ (لەبـەر دەرکەوتوویـیو دیاری وایپێدەڵێـن) ٢-تاڵـی دەزوو کە تاڵـی زێڕ یا زیوی تێوە دەئاڵێنرێت بۆ جوانییو بەنرخیی لە پۆشاك هەڵدەکێشرێت ٣-پەرەکەو ریشووی چنراوی سەر بەرگ. بەرگ ئەگەر بەدوو تاڵ بچنرێت تانو پۆکەی قایمتر دەبێت ٤-تەنشتی/ قەراغی رێ ٥-نیگارو تاڵ تێهەڵکێشیی بەرگ. ٦-دادرێکی دیاری رێگا.
(رَجُـلٌ ذو نِيْرَيْن): پیاوێکـی دووبایە. واتا: هێزو توانـاو قایمیی دوو قاتی هاورێکەیەتی و ناوشان پانە.
(حَرْبٌ ذات نِيْرَيْن): جەنگێکی دوو جەنگە. واتا: زۆر سەختەو گەرمە.

(ناقَةٌ ذاتِ نِيْرَيْن أَو ذاتُ أَنْيار): مێحوشترێكی بەتەمەنە بەڵام هێشتا توانای ماوە (دەشێت) بۆ ژنیش هەروا بوترێت.

(اَلنیْر (ج) اَنْیَارُ ونیرانٌ): نیری سەر ملی گاو وڵاخی جووتپێكراو.

(اَلنیْــرَة): ١ـتیەهەڵكێشــانی لــە راســتەی تاڵی دەزووی زێرو زیوی تێناڵاو لە بەرگ بۆ جوانییو نیگاركردیی بەرگەكە ٢ـمەكۆی جولا.

(مــا اَنْــتَ بِســتاةٍ و لا لُحْمــهِ و لا نِــيرةٍ): تــۆ نەتانــیو نەپــۆیو نــە مەكــۆی واتــا: نەزیانبەخشیتو نەكەڵكبەخش.

(هــذا اَنْیَرُ مِــن ذاك): ئەمە لــەو دیارترە/ دەركەوتووە.

(ثَوبٌ مُنیَّر): بەرگێكە دوو رایەڵەو دوو توێ چنراوە.

٢-(اَلنائِر): خراپە چن لە ناو خەڵكدا/ بەدیی بەرپاكەرو ئاشووبنێرەوە.

(بَینَهُم مُنايَــرَة): ناحەزیو خراپە/ بەدیی لەنێوانیاندا هەیە.

(اَلْمُنَیِّر): چەرمی ئەستوور/ پێستی ئەستوور.

٣-(نَیْرَبَ- الرَجُلُ): ١ـدووزمانییكردو خەڵكی بەگژیەكدا كرد.

٢ـقســەی بەســەر یەكدا داو هەڵیگێڕایەوەو بەبەدیی رازاندیەوە/ بەدزمانیكرد.

(-تِ الريحُ التُرابَ فَوقَ الشيءِ): باكە خۆڵی بەسەر شتەكەدا كرد.

(اَلنَــيرَب): ١ـپیاوی خۆراگــرو قایمو بەئارام ٢ـبەدزمانییو قسەچنیی ٣ـخراپە/ بەدیی.

(رَجُــلٌ نَيرَبٌ وَ ذو نَــيرَب): پیاوێكی بەدە/ بەدخوازە.

٤-(نَــيرَجَ- الرَجُــلُ نَيرَجَــةً): پیاوەكــە مدزمانییكرد/ دووزمانییكرد.

النَّــيرَج: ١ـقســەچن/ بەدزمــان ٢ـنیشــانەی رازاندنەوەی بەرگ٣ـگاسنی جووتكردن.

اَلنَوْرَج: النَیْرَج: ئامێری دەغڵكوتان/ جەنجەر یان داركە پێیدەكوتن.

(ريحٌ نَيرَجٌ) باهۆز/ زریانەبا.

(إمْرَأَةٌ نَیْرَجٌ): ژنێكی زۆرزانو خراپ.

(عــدا عَدواً نَیْرَجاً): تیــژ رایكردو بەپێچو پەنا رایكرد.

(نَیرَج): هەموو خێرایەك.

٥-(النَيروز- عنــد الفُرس): ١ـیەكەمین رۆژی ساڵی خۆرییە لەلای فارسەكان ٢ـجەژنی نەورۆز بەگشتی بۆ فارسو كوردو گەلێك نەتەوەیترە.

نیز: (اَلنَیَزَك (ج) نَیــازِك: ١ـكورتە (نێزە/ رم) ٢ـفــك (فارســیة) گــرو روناكییەكــە بەئاسماندا دەكشێت وەك نێزەیە پارچەیەكە لە هەسارەی كشاوەكە لێیدەبێتەوە.

نیس: ١-(نَیْسَــبَ وَ النَیْسَــبُ وآلنَیْسَــبَانُ): رێگای راستو دیار.

٢ـ(نَیسان): (سریانیة): مانگی بانەمەر/ مانگی گوڵان كە مانگێكی ساڵیی خۆرییە سی رۆژە.

نیـص: (أَلنَیْـص): ١-جوولـەی (لەسـەرخۆ/ شینەیی/ هێواش). کز ٢-(ح) ژیشکی گەورە/ زل.

نیـض: (نـاضَ- العِـرْقُ یَنیـضُ. نَیْضـاً): رەگی خوێنەکە، دەمارەکە شپرزە لێیدا/ خێرا خێرا لێیدا.

نیط: (ناطَ و آنْتاطَ. یَنیطُ نَیطاً وآنتِیاطاً): دوورکەوتەوە.

(أَلنَیْـط): (مـص): ١-دوورکەوتنەوە ٢-تەرم ٣-مردن ٤-مەرگ.

(أَتاهُ. نَیطُهُ): مەرگی بۆ هات.

(رَماهُ اللهُ بِالنَیْطِ): خودا مەرگی بۆ نارد.

(طَعَنَ فُلانٌ فِی نَیطِهِ): مرد.

نیـع: (ناعَ- الغُصنُ. یَنیـعُ. نَیْعاً): چڵەکە/ پەلەکە: چەمایەوە/ لاربووەوە/ خواربووەوە.

(نائِع): چەماو/ لارەوەبوو/ خوارەوە بوو.

(أَلنَوائـع): چڵـە چەمیـوەکان/ چەماوەکان لاربووەکان/ لارەوە بووەکان.

نیـل: ١-(نالَ- المَطْلُوبَ یَنیـلُ وَ ینالُ. نَیلاً ونالاً ونالَةً): خواسـتەکەی (دەسـتگیر بوو/ دەستکەوت پێیگەیشت).

(نائِل): بەخواستگەیشتوو/ بەمەرامگەیشتوو/ شتدەستگیربوو.

(مَنِیل): خواست دەستگیر بوو شتی چنگکەوتوو.

(أَلأَمرُ: نِـل ونَلْ): کارەکە بکـە/ کارەکە بە ئەنجام بگەیەنە.

(نـالَ- مِن فُلان): سـزایدا/ ماڤی لێسـەند/ ستەمی لێکرد.

(نالَ مِن عَدُوِّهِ مَطْلُوبَهُ): ئەوەی کە خواستی لە دوژمنەکەیسەندو دەستگیربوو.

(نالَهُ مَطْلُوبَهُ): وای لەو کرد کە خواستەکەی خۆی دەستگیر بێت.

(نالَنـي مِن فُـلان مَعروفٌ): لە فیسـارەوە چاکەم/ بەخششم پێگەیشت.

(نالَ مِن عِرْض فُلان): نامووسـی فیسـاری شکاندو ئابرووبرد/ جنێوی پیسی پێدا.

(نالَ الرحیلُ): کاتی کۆچکردن نزیکبووەوەو هات.

(أَما نالَ لَهُـم أَن یَفقَهوا): ئیـتر کاتی ئەوە نەهاتووە کە تێبگەن و چاوبکەنەوە.

(أَنالَ- فُلاناً الشـيءَ وَ لِفُلانٍ الشـيءَ إنالَةً): کاریکیکـرد/ وایکـرد کە فیسـار شـتەکەی دەستبکەوێت.

(إسْتَـنـالَ-ەُ.إسْتِـنـالَـةً): داوایـکـرد ئـەوەی دەستگیربێت/ دەستکەوێت.

(أَلنائِل) (فا): ١-ئەوەی کە دەسـتگیر دەبێت. ٢-ئەو کەسـەی کە شـتی دەسـتگیر دەبێت/ پێیدەگات/ بەخواستی خۆی دەگات.

(أَصَبـتُ مِنـهُ. نائِـلاً): لـەوەوە بەخششـێکم (پێگەیشت/ دەستکەوت)، چاکەیەکم دەستگیر بوو.

(أَلنُوْلَة): ئەوەی دەستگیر دەبێت/ دەدرێت.

(أَلنَیْـل) (مص): ١-دەسـتکەوتن/ دەسـتگیر بوون ٢-دەستگیر بوو/ دەستکەوتوو.

(أَصابَ مِنْهُ نَیلاً): شـتێکی/ دەستکەوتێکی

لێدەستگیر بوو.
(ألنیل): هەور.
(ألنَیْلَة): دەستکەوت/ ئەو شتەی دەستگیر دەبێت/ چنگدەکەوێت/ دەدرێت/ دەسەندرێت.
٢-(النالَة): هۆڵی خانوو.
(ألنیـل) (ن) (فارسیة): لیلەنگ/ چویت/ خومی شین/ هەش، رەنگێکی شینە لە ترشاندنی رووەکی چویت دەستدەکەوێت و بۆ رەنگکردن بەکاردێت.
(-(ن) ألنیـل): رووەکی چویت رووەکێکە قەدێکی رەقی هەیە. پەلی باریکی لێدەبێتەوە گەڵاکەی وردەو ریزە، بە هەدوو بەری پەلەکەدایە. دەترشێنرێت/ خۆشە دەکرێت رەنگی چویتی لێدەردەهێنرێت.
٣-(ألنیلج): شتێکە لە رووەکی چویتە کێویلە وەردەگرێت. گەڵای رووەکەکە دەخرێتە ئاوەوە دەشۆرێتەوە سەوزی پێوە نامێنێت ئاوەکە واز لێدەهێنن ئەوەی لێیبۆتەوە وەك قوڕ دەنیشێت ئاوەکەی دەرێژرێت و خەستەوە بووە کە وشکدەکرێتەوە.
(ألنیلج و النیلَنْج): دووکەڵی چەوری پیوو بەز کە بۆ خاڵکوتاندن بەکاردێت و خاڵەکە سەوز دەنوێنێت بەعەرەبی پێیدەڵێن: (ألنَؤور).
٤-(ألنَیْلَوْفَر) (ن): شلێری ئاوی رووەکێکی ئاوییە گەڵاکەی گەورەو خڕە سەر ئاو دەکەوێت گوڵەکانی جوانن و سەر ئاو دەکەوون هەیانە لە زەلکاوەکانداو دەریاچەکانی کیشوەرە کونەکەدا دەڕێ. جۆرێکیان هەیە میسریە هەرە کۆنەکان کردویانە بەباسێکی هونەریی (فارسیە).
(ألنَیْلَوْفَریات) (ن): شلێرە ئاوییەکان جۆرە رووەکێکی ئاویی جوانن کە لە کۆمەڵەی دوو خەپلەیین بەناوبانگترینیان ئەوانەن کە لە شوێنە فێنکەکاندا دەڕێن جۆرێکیان هەیە کۆن زوو لە میسردا دەکرا بەئارد لاسکەکەی و تۆوەکەی بۆ ئەوە بەکار دەهێنرا. هەیشیانە بۆ جوانیی رازاندنەوە دەروێنرێت لەوانەیە تیرەی گەڵاکەی دوو مەتر بێت.
٥-(ألنَیْلُون، نایلون) (إنكلیزیە) مادەیەکە جەلاتینی جل و شتیتری لێدروسدەکرێت.
نیە: (ناهَ- الشيءُ یَناهُ. نَیْهاً): ١-بەرزبووەوە ٢-سەریسورماندو دڵخۆشکەرە بوو.
(ألنانَه): سەرومرێکی دەسەڵاتدار.
(نَفسٌ ناهَةٌ): دەروونی مرۆڤ کە خۆی لە شت دووربگرێت و جڵەوگیریی خۆی بکات.
(نیم): نازو بوونی تەواو یان بەرگی خەوتن.
نیو: (ألنُیون) (ف): تەنێکی سادەیە، گازێکە زۆر بەگمەنە نەرمنگی هەیەو نەبۆن. لە گوڵۆپی کارەبادا بەکاردەهێنرێت بۆ گوڵۆپی پرۆپاگەندە. بۆ بەدەستهێنانی رووناکییەکی سووری پرتەقاڵی بەکاردێت.
نیی: (ألنای (ج) نایات): (مو) (فارسیە) نای. نامێرێکی مۆسیقایە/ فووی پێدا دەکرێت.




ه-: (الهاء): هێ پیتی بیست و شەش هەمینی پیتـی عەرەبییە لە پیتـە گەرووییەکانە لە ژمێرەی کـۆی پیتەکانـدا (ه) پێنجە. أبْجَد هَوَز...

ئـەم پیتە بە چەند واتایەك دێت: ١-ڕاناوە بۆ ون/ نادیار بە واتای (ئەو)

(قالَ لَهُ صاحِبُهُ وهُوَ يحـاوِرُهُ): هاوڕێکەی کاتێك دەیدواند پێیوت

٢-پیتیکـە بـۆ (ون)و بۆ (ڕانـاو) دێت وەکو (إياهُ) ئەو (هێ یەیە لە (إياهُ) دا

٣-بۆ ڕاگرتنـی ئاخاوتنێکەو کۆتایی پێهێنانی لەپاش وشـەکەوە دێت بۆ دەرخستنی بزوێن یان پیت وەك:

(مـا هِيَه وَها هُناه وَ وازيـداه): ئەوە چیە وئەوەیە لەوێو هۆ زەید.

ها: (ها): بگرە.

(هـا الكِتابَ) هـا کتێبەکـە/ کتێبەکە بگرە

دەشێت هەمزەی لەپاشەوە دابنرێت دوترێت (هـاءَ) بۆ نێرە (وَهاءِ) بۆ مـێ وَ (هاؤما) بۆ دوان و (هاؤم) و (هاؤنَّ) بۆ کۆی نێرو مێ

٢-دەبێتە ڕاناوی (مێ)

وەکو: (ضَرَبَها) لێیدا

(كِتابُهـا) کتێبەکـەی ئەو بۆ (مـێ) (ه) کە ڕاناوە و (ئەلف)ە کە نیشانەی مێیە.

٣-بـۆ وریا کردنەوە/ ئاگادارکردنەوە بە چوار باردێت.

١ ئامارژەیـەك کـە دوور نەبێـت وەك (هذا وَهذاك): ئەمە.

ئەوە ٢-(وَها أنتم أُلاءِ ٣-ویاأَيُّهاالرَجُلُ) (کە بۆ وریاکردنەوەیە): تـۆ هۆ/ ئەرێ پیاوەکە:

٤ بۆ ناوی خودا لە سـوێند دا کە هەمزەکەی فرێدەدرێت وەك: (ها للهِ): بەخودا.

هێ (هِێ هِێ): کوڕڕ کوڕڕ دەنگی بانگکردنی حوشترە بۆسەر ئالیك.

هأ: (هَأْ هَأْ. هِنْهَاءً وَهَأْ هَاءً): بە قاقا پێکەنی.
(هَأْهَأُ وَهَأْهاءُ): کەسێکە بەقاقا پێبکەنێت.
(بالإبلِ): حوشترەکانی بۆ سەر ئالیك بانگرد و کورکـوری بۆ کردن یان پیایاندا هەڵشـاخا وتـی: (هَأْهَا): یـخ یـخ. (ألهيءُ)یخ/ یخە کردن لە حوشتر.
(جارِيَةٌ هَأْها ءَةٌ): کچێکی یان کەنیزە کێکی هەمیشەدەم بە قاقا.
(هؤلاءِ): ئەوانە (ها) بۆ ئاگادارکردنەوەیە.
(ألاءِ): ئەوان (راناوی ئاماژەیە بۆ کۆ).
هب:(هَـبْ): وایدابنـێ/ وابزانـە- فرمانـی داخوازییە هی فرمانی (وَهَبَ)یە.
(هَبْنـي فَعَلْـتُ): وایدابنـێ کە ئـەو کارەم کردووە.
هبّ:١- هَبَّ-تِ الريـحُ. هُبُوباًوَهَبيباًوَهَبَّاً): باکە توند (هەڵیکرد/ هەڵبوو).
(الرَجُلُ مِن النَّومِ) پیاوەکە لە خەو ڕاپەڕیو راستبووەوە.
(-النَجمُ): ئەستێرەکە هەڵهات.
(هَـبَّ - هَبَّـاً وَهُبُوبـاً وَهَبيبـاً وَهِبابـاً): گورجبووەوە خێرایکرد
(- يَفعَلُ كذا): دەستی بەوە کرد/ دەستیدایە ئەوە بیکات.
(مِن أينَ هَبَبْتَ): لە کوێوە پەیدا بوویت/ هاتیت.
(- السَّـيفُ الشـيءَ. هَبّـاً وهَبَّـةً وهِبَّـةً): شمشێرەکە شتەکەی بڕی/ لەتیکرد.

(- السَيفُ هَبّاً وَهُبوباً):شمشێرەکە لەرییەوەو پێداچوو و بڕی.
(- في الحَربِ): لە جەنگدا بەزی و هەڵات.
(- الرُجُلِ هِباباً)ماوەیەك پیاوەکەدیارنەماو ونبوو.
(هَبَّ فُلانٌ حيناً ثم قَدِمَ) فيسـار ماوەیەك ونبوو پاشان هاتەوە و دەرکەوتەوە.
(أيـنَ هَبَبْتَ عَنا): ئەوە لەکوێ بوویت لێمان ونبوویت.
(هَبَّـبَ الثـوبَ تَهْبيباً): جلەکـەی دڕاند/ شرکرد.
(أَهَبَّ - السَّيفَ): شمشێرەکەی ڕاوەشاند.
(- الريحَ): باکەی هەڵکردو هەڵکردنی باکەی خواست.
(-هُ مِـن نومِـهِ): لەخـەو ڕاپەڕانـد/ بە ئاگایهێنا/ هەڵیساند).
(إهْتَبَّ - الشيءَ): شتەکەی (بڕی/ لەتکرد).
(إسْـتَهَبَّ الريحَ): باکەی هەڵکردو هەڵکردنی باکەی خواست
(ألهَبَّـةُ):١-یەکجـار هەڵکردنی بـا ٢-یەکجار لەخەو ڕاپەڕین
(رَأَيتُهُ هَبَّةً): جارێك دیم.
(ألهَبَّةُ):١-بەرەبەیان کات ژمێرێکی بەرەبەیان مابێت ٢-دەمێکی ڕۆژگار
(أَحْذِر هَبَّةَ السَّـيفِ): خۆت لە پێدا کێشانی شمشێر بپارێزە.

(أَلِهبَّــةُ): بريســكەی شمشــێرو لەرینەوەی لەوەشاندندا.

(أَلِهبَّــة (ج) هِبَــب)- جۆر/ چەشــن٢-بار/ رەوش. (أَلَهَبــاب= الهَباءُ): گەردێكی زۆر ورد كە بەچاو نابینرێت تەنها لە تیشـكی خۆردا نەبێت

(أَلَهَبَّاب = أَلهَبَّاءُ) زۆر هەڵكردوو

(أَلهَبــوب و الهَبوبَةُ والهَبیب - مِنَ الریاح): بای تۆز هەڵسێن

(أَلْمَهَبُّ(ج) مَهابّ): هەڵگەی با

٢-(تَهَبَّبَ - الثَوبُ): جلەكەكۆنبوو.

(أَلهِبَّةُ (ج) هِبَب): پارچە كالآیەك/ بەرگێك جلێك.

(ثَــوبٌ هَبائب وهِبَبٌ وَأَهبــابٌ): بەرگێكی/ جلێكــی (لەتوكوتبــوو پارچــە پارچە بوو/ شڕووربوو)

٣-(هَبْهَــبَ - الرَجُــلُ): ١-پیاوەكە پەلەیكرد ٢-لەخەو راپەڕی/ بەئاگا هات.

(- السَــرابُ): تراویلكەكــە شــەوقیدایەوە/ دەركەوت و خۆی نواند

(- هُ): پێدا هەڵشاخاو تەرزە شكێنیكرد.

(- الكَبشَ): بەرانەكەی سەربڕی

(تَهَبْهَبَ - الشَيءُ): شتەكە جووڵاو شلۆقبوو/ بنكەندبوو.

(أَلهَبْهَب): چابوك ١-خێرا/ گورج ٢-(ح) گورگی سووكەڵە

(أَلهَبْهَاب): ١-خێرا/ چابوك ٢-شــیرە شیركەر/ هاوار كەر ٣-تراویلكە.

(أَلهَبْهَبِــيُّ (م) هَبَهبيَّةُ): ١-گۆرانیی خۆشــی حوشترەوان كاتێك حوشــترەكان لێدەخوڕێت ٢-كارگوزاری چاك ٣-چێشــتكەر ٤-شوانی مەڕ ٥-گۆشتبرژێن ٦-قەســاب ٧-هەموو كارامەیەك لەپیشەكەیدا ٨-خێرا/ چابوك/ ئازا ٩-حوشتری سووكوڵەو ئازا.

هبت:١-(هَبَتَ-هُ هَبْتاً):لێیدا/دایپڵۆست/كوتای ٢-سەری پێشۆركردو زەبونیكرد/ ملی پێدانەواند ٣-سووكیكرد/ شكاندی و كەمبایەخیكرد

(- هُ بالسَیفِ): بەر شمشێریدا.

(هُبِتَ - الرَجلُ): زیــرە كردوو كەودەنبوو/ مێشكپوتبوو/ حۆل بوو.

(هَبیتٌ وَمَهْبُوتٌ): زۆر ترسنۆكوبێمێشــك/ كەودەن/ گێلۆكە.

(أَلهَبْتَةُ):١-جارێك لێدان ٢-جارێك سووككردنو سەرپێشــۆركردن ٣-جارێك ترســانو بوودەڵە بوون/ بێمێشكی/ گێلیی.

(أَلهَبَتَةُ): بێهێزیی/ بێتوانایی بێبڕشتیی.

(في عَقلــه هَبتَةٌ): بێمێشــكە/ ئاوەز كەمە/ ئاوەز سووكە.

٢-(أَلهَبْتَر): كورت.

(هَبَــجَ - هُ بالعَصا:هَبْجــاً): داركاریكــرد/ بەداردەست دایپڵۆست.

(هَبَــجَ وَجْهُ الرَجُــلِ. هَبَجــاً): دەموچاوی

هەلاوساو کیفیکرد.

(هَبَّجَ): دەموچاو هەلاوساوو کیفکردوو.

(هَبَّجَ - هُ): هەلێئاوساند.

(تَهَبَّجَ): هەلاوسا.

أَلمُهَبَّج: لەش و دەروونگران.

أَلمِهْبَاج: (عامية) مێکوتی گەورە.

هبد: (هَبَدَ - ألهَبِيدَ. هَبْداً): کاڵەکە مارانەکەی شـکاند و لێنـا (فُلاناً): کاڵەکـە مارانەکەی دەرخواردد ا.

(تَهَبَّدَ و اهْتَبَدَ - الهَبِيدَ): کاڵەکە مارانەکەی چنی و شکاندی و لێینا کردی بە چێشت.

(أَلهَبْد)(ن): کاڵەکە مارانەیان تۆوەکەی

(الهَبِيد): کاڵەکە مارانە یان تۆوەکەی.

(هَبِيدَة): کاڵەکە مارانەیەك.

(ألهَوابِـد): ئـەو ژنانـەی کاڵەکـە مارانەکە (دەچنن/ لێدەکەنەوە).

هبذ: (هَبَذَوهابَـذَ وَأَهْبَذَ واهتَبَذَ- الفَرسُ أو الطائرُ.هَبْـذاً): چارموێکە یـان باڵندەکە خێرایانکرد. ئەسـپەکە تونـد غاریکرد یان باڵندەکە گوریدایە خۆی و خێرافری

(ألهابِـذَة (ج) هَوابِـذ): مێحوشـتری خێرا/ چابوك

هبر:١- (هَبَرَ-اللَّحْمَ.هَبْراً): گۆشتەکەی کوتکوتی گەورەگەورە کرد پلی گەورەگەورەیکرد.

(هَبَرَ لَهُ مِـن اللَّحْم. هَبْرَةً): پلێکی گەورەی لە گۆشتەکە بۆ لێکردەوە

(هَبَرناهُم بالسُيوفِ): بە شمشێر لەت وکوتمان کردن.

(هَبِرَ- البَعيرُ هَبَراً): حوشـترەکە گۆشتێکی زۆریگرت.

(أَهْبَرَ- الرَجُلُ): گۆشتێکی جوانی گرت

(إهْتَبَرَ فُلاناً بالسَّـيفِ): فیسـاری بەشمشێر بری/ لەتکرد.

(- البَعيرُ): حوشترەکە گۆشتەکەی پووکایە.

(أَلهَبْر) (مص): گۆشـت یان پلە گۆشـتی بێ ئیسقان.

(هَبْـرَة): پلێك گۆشـتی بێئیسـقان/ نەرمە گۆشت

(-فِي القِـراءَة): لە خوێندنـەوەی قورئاندا وەستانەلە سـەری ئایەتەکەدا (کەئەوە باش نییە)

(ضَرْبٌ هَبْرٌ وَهَبِيرٌ): لێدانێك کە گۆشـتەکە لەت لەت بکات.

(هابر):کوتکوتکەری گۆشت.

(ألهُبْـر): ١-بۆڵـە تـرێ ٢-ئـەوەی لەکەتـان هەڵدەوەرێت کاتی شانەکردنی و شیکردنەوەی.

(ألهَبِر(م) هَبِرَة - مِنَ الجمال): حوشتری زۆر (قەڵەو/ گۆشتن)

(بَعِـيرٌ هَبِرٌ وَبِرٌ): حوشـترێکی زۆر قەڵەوی تووکن

(ألهِبِرّ): پچراو/ پساو

(ألهُبارِيَـة): ١-پـەڕی (بـە ئاسـماندا فڕیو/

بەهەوادا ڕۆیشتوو)٢-كرێشی سەر.
(ریحٌ هُباریَّةٌ): بایەكی تۆزاوی/ گێژەڵووكەی تۆزاوی.
(الَهبْریَّـــة): (الِهبْرِیَّـــة): ١-تاڵـــی لۆكـــەی بە هـــەوادا فڕیو٢-قامیـــش‌و زەلی پەرش‌وبـــڵاو كـــە پەكدەگرێـــت و پاندەبێتەوە٣-پـــەڕی بە هەواداچوو٤-كرێشـــی ســـەر (بۆیە واناونراوە چونكە پارچە پارچەی وردە).
(الُهبَیْرَة) (ح): كەمتیار.
(أبوهُبَیْرَة) (ح): نێرە بۆق.
(أمُّ هُبَیْرَة) (ح): مێبۆق
(الأَهْبَـــر (م) هَـــبراء (ج) هُبْـــرٌ): گۆشـــتن/ قەڵەو/ تێكسمراو.
(الَهبَّار): مەیموونی تووكن.
(سَیفٌ هَبَّارٌ): شمشێری تیژی بڕەر.
(الَهبُور) (ح): جاڵجاڵۆكە.
(الَهبُّـــور) ١-كاو پـــووش‌و گـــەڵای وەریـــوی دەغڵودان‌و كشـــت‌وكاڵ ٢-گـــەردی زۆر وردكە بەچاو نابینرێت یان مێروولەی زۆر ورد.
٢-(الَهبْـــر (ج) هُبُور وَهُبْرٌ): شـــوێنی نزم‌و تەختانی یان زەویی لێنی نزم.
٣-(هَبْـــرَجَ - الرَّجُـــلُ): بـــەلارەوە لارەوە ڕۆیشت.
(الُهبْرَج): ١-كەسێكە بەلارەوە لارەوە بڕوات و شپرزە بێت ٢-بەكەش‌وفش‌وكلكی بەرگەكەی درێـــژە ٣-كەتـــەی قەڵەو ٤-(ح) گـــا یان مانگا ٥-ئاسكی پیر.
(الُهبْرج): كەتەی گۆشتن/ قەڵەو.
(الُمُهْرج مِنَ الأوتار): ژێی (خراپبوو تێكچوو/ دەنگ منگن).
٤-(هَبْـــرَجَ - الثَّوبَ): بەرگەكەی نیگار كێش كردو سیمی تێهەڵكێشكرد.
(الَهبْرَج - مِنَ الثیـــاب): بەرگی نیگار كێش كراو بەسیم و شتیتر ڕازێنراوە
٥-(الَهبْرَج): خێرا ڕویشتن‌و پێسووكیی.
٦-(الِهبْرِزِيّ): ١-ســـەرۆكێكی/ سوپاسالارێكی فارسەكان ٢-دیناری نویٔ/ پارەی تازە ٣-هەموو شتێكی جوانی قەشەنگ ٤-(ح) شێر ٥-پێڵاوی چاك٦-زێڕی پوخت‌و ساغ.
٧-(تَهَبْـــرس): خـــۆی بـــاداو بەكـــەش‌و فش ڕۆیشت.
هبـــز: (هَبَزَ. هَبْزاً وَ هُبُـــوزاً وَهَبَزاناً): مرد یان لەناكاودا مرد.
هبـــش (هَبَشَ وَهَبِـــش - الرجُلُ هَبْشـــاً): بەهەردوو دەستی ئاژەڵەكەی دۆشی.
(- الشيءَ): ١-شـــتەكەی كۆكردەوە ٢-شتەكەی بەرچنككەوت/ دەستكەوت
(- فُلانـــاً): لێدانێكـــی توندلێیـــداو ئـــازاری پێگەیاند
(- لِعیالِهِ): رەنجی بۆ خێزانەكەیدا
(هَبَّش - المالَ. تَهْبیشاً): دارایكوكردەوە
(- هُ): رووشاندی.

(تَهَبَّشَ - القَومُ): خویْشگەل كۆبوونەوە.

(- الشيءَ): شتەكەی كۆكردەوە

(خَــرَج يَتَهَبَّشُ لِعيالِــهِ): دەرچوو رەنج بۆ خێزانەكەی بدات و بژێوییان بۆ كۆبكاتەوە

(إهْتَبَشَ - المالُ): سامان و دارای كەڵەكە بوو/ كۆبووەوە

(- الشيءَ): شتەكەی كۆكردەوە.

(- مِنــهُ عَطــاءً): بەخششـێكی لێـوە (دەستگیربوو/ دەستكەوت).

(ألهابِشَةُ): دەستە/ كۆمەڵ/ گرۆ.

(ألهابِشَة و الهُباشَة (ج) هَوابِش وَهُبَاشات): كۆمەڵە خەڵكێك كەلە خێڵێك نەبن.

(ألهُباشــات): دارایو ســامانی كۆكــراوەو دەستگیربوو.

(ألهَبَّــاش): مرۆڤی بە هەڵپــەو رەنجدەر كە دەســتكەوتی زۆر كۆبكاتــەوە/ پەیاكونــدەو خڕكەرەوەی سامان بێت.

هبص:

(هَبَــصَ وَهَبِصَ.هَبْصــاً وَهَبَصــاً): ئــازاو چابوكبوو/ پەلەیكرد.

(- الكَلْبُ): سەگە كە مێملێ راوو نێچیر بوو.

(- على الشــيءِ): بەتەنگ شــتەكەوە هاتو مەراقی شتەكەیبوو/ دڵخوردیبوو.

(هَبِص): بەتەنگەوەهاتوو مەراقاوی بۆ شت.

(إهتَبــصَ - في العَمَــلِ): لــە كارەكــەدا گورجوگۆڵیی نواند.

(- في المَشــي): لــە رۆیشــتندا (پەلەیكــرد/ ئازابوو).

(إهْتَبَــصَ وانْهَبَصَ - للضحك): زۆر پێكەنی (لەتامی كردە دەرەوە هێندە پێكەنی).

(ألهَبَصــی): خێرا رۆیشــتن/ لەرۆیشــتندا پێهەڵگرتن.

(مَشى الهَبَصى): گورجانە/ خێرا رۆیشت.

هبــط: (هَبَــطَ - هُ مِــنَ الجَبَــلِ هَبْطــاً): لەشاخەكە هێنایە خوارەوە

(- بَلَدَ كذا): چووە ئەو شارەوە

(- السوقَ): هاتە بازارەكەوە

(- الوادِيَ): دابەزییە دۆڵەكەوە.

(هَبَّاط): داپەریو/ دابە زیو/ تێچوو.

(-فلاناً البَلَدَ): فیساری بردە شارەكەوە.

(-المَــرَضُ لَحْمَــهُ): نەخۆشــیەكە لەریكرد/ لاوازیكرد.

(- ثَمَنَ السلعةِ وَمِن ثَمَنِها): نرخی كاڵاكەی (كەمكرد/ داشكاند) كاڵاكەی هەرزان كرد.

(- فُلاناً): لە فیساریدا.

(- فُلانٌ مِــنَ الجَبَلِ هُبُوطاً): لە شــاخەكە (هاتە خوارێ/ داپەرییە خوارێ).

(- الثَمَــنُ): نرخەكــە (شــكا/ كەمیكــرد/ دابەزی).

(- فُلانٌ): زەبوونبوو، پایەی هاتە خوارێ

(- مِــن مَوضِعٍ إلى أخَــر): لە شــوێنێكەوە گوێزرایەوە شوێنێكیتر.

(- الحائطُ) (عاميه): دیوارەکە کەوت/ رما.
(هَبَط مِنَ ألخَشَبَةِ): زەبوونو سەرشۆڕبوو/ شکستی هێنا.
(هَبَــطَ - هُ الزمــانُ): چــاخ نزمیکردەوە/ داراو خــاوەن پیاوەتیی‌وچاکە بوو هەمووی لەدەستدا.
(هَبَّطَ - العِدلَ) نیوە بارەکەی لە سەر پشتی حوشترەکە دامەزراند
(أَهْبَــطَ - هُ): دایبەزانــد/ دایگرت/ هێنایە خوارێ
(- الثمَنَ): نرخەکەی (کەمکردەوە/ داشکاند).
(تَهَبَّطَ - مِن كذا): لەوەوە داپەڕییە خوارێ/ هێواش سەرەو خوار بووەوە.
(- الشيءُ): شتەکە (ئامادەبوو/ دامەزرا).
(إنْهَبَطَ - الرَجُلُ): پیاوەکە رسواو سووکبوو/ شکا
(الهابِط) (فــا): ١-داپەڕیو ٢-رســواونزمبوو ٣-چرووساو/ لاوازبوو.
(الهَبْط)(مــص): ١-کەمبوونەوە/ داشــکان ٢-کەوتنــە گونــاه و خراپەوە ٣-سەرشــۆڕیی‌و زەبوونیی، رسوابوون ٤-بارکەوتن
(اَللّهُمَّ غَبْطاً ولا هَبْطاً): خودا دڵخۆشمانبکەو داماومان مەکەو بارمان مەخە.
(الهَبْطَةُ): ١-جارێك نزمبوونەوە و بارکەوتن ٢-دابەزین و ســەرەو خــوار بوونەوە ٣-زەوی نەویو/ نزمایی/ چالآیی:

«هُــم في طَبَطــةِ مِــنَ الارض»: ئــەوان لە زەوییەکی نزماییدان.
(الهَبُوط): لێژگە/ سەرەو خوارە
(الَهَبيط): لاوازی تێقوپاو
(المَهَبط): شوینی هاتنەخوارەوە/ نشینگە
٢-(ف): تەلێکــی گەیەنــەری کارەبایــە کــە تەوژمەکارەبایــی پێیــدا دەردەچێت لە قاپی شــیتەلکردنەوەی کارەباوە یان لەبۆریی گازی - ســوککراوەوە ســەرەکەیتری بەجەمســەری سالبی کارەباپەیدا گەرەوەیە
(اَلمَهْبُوط): لاواز بوو/ کزبوو/ کەوتوو.
رجُلُ مَهبُوطٌ: پیاوی پەککەوتەی بێگوزەران/ هەژار کەوتوو.
هبــع. (هَبَــعَ – الحِمــارُ هَبْعــاً وَ هُبُوعاً): کەرەکە گێژو وێژ/ بێهۆشانەرۆیشت (ئەمەبۆ هەمووشتێکی - نائاساییە).
(هَبَعٌ): نائاسایی وناتەواو
(هَبَعَ – البَعيرُ): حوشترەکە لە رۆیشتندا ملی درێژ کرد
(-بعُنقِهِ): پەلەیکرد لــەوەدا ملی درێژ کرد بۆ ئەوەی باش تەکانی بۆ بدرێت
(هابــعٌ وَ هُبــوعٌ): حوشــتری پەلەکردووی ملدرێژ کردوو بۆ تەکاندان.
(إسْتَهْبَعَ – البَعيرَ): لۆقەی بەحوشترەکی کرد ملی پێدرێژ کرد تا تەکان بداتە خۆی.
(اَلْهُبَــع(ج) هُبَعات وَ هِبــاع (م) هُبَعَة (ج)

هُبَعــات) (ح) : ١ـكەر/ گوێدرێژ (م) ماكەر ٢ـبەچكــە حوشــترێك یــان گوێرەكەیــەك/ گۆلكێك كەلەهاویندا لەدایك ببێت.
(إبــلٌ هُبَّعٌ): حوشــترێكی خێــرا كە بە مل درێژكردن تەكان بەخۆی بدات.
(اَلْمُهبِع): خاوەن حوشــترێكی خێرا كەمل بۆ تەكاندان درێژ دەكات.
هبغ. (هَبَغَ - الرَجُلُ هُبُوغاً وَ هَبغاً): پیاوەكە (نوست/ خەوت).
(الهَبْغَةُ): خەوتن/ نوستن.
(اَلهِبْیغ): خەولێخەر/ بەخەو
(هبك:(إنْهَبــكَ - ت بــهِ الأرضُ): زویەكــە قاچی (چەقاند/ گیركرد).
(اَلْهُبْكــةُ (ج) هُبَــكات وهُبَــك): ١ـگــەوج ٢ـزەوییەكی زۆنگ كە قاچ تێیدا دەچەقێت
هبل: ١(هَبِلَ - تْ فُلانــاً أُمُّهُ: هَبَلاً): دایكی جەرگی بۆی ســووتا دایكی كۆستی پێكەوت و لەدەستیچوو.
(هابِل): دایكی جگەر سووتاو/ كۆستكەوتوو.
«هَبَلَتْــهُ أُمُّــهُ»: دایكی ڕۆڵــە ڕۆی بۆ بكات/ جەرگی بۆی بسووتێت (ئەمە دوعا لێكردنە. زۆر جاریش بۆ هەڵنان و لێسەرســامبوون و سەیرلێهاتنی وا بەو كەسە دەوترێت) واتا ئای كەشــارەزاوزانایە یان ئازایەو چاوقایمە، یان ڕادروستە.
(هَبَّلَ فُلاناً): پێیوت «هَبَّلَتْكَ أُمُكَ»: دایكت ڕۆڵەرۆت بۆ بكات/ جەرگی بۆت بسووتێت.
(أهْبَــلَ الرَجُــلُ): پیاوەكــە كۆســتیكەوت/ فرزەندی لەدەستچوو/ جەرگی سووتا.
(إهْتَبَلَ - علی وَلَدِهِ): زارۆڵەكەی لەدەستچوو/ كۆستیكەوت.
(الهَبُول): ژنی جەرگسووتاو/ كۆستكەوتوو.
(اَلْمُهَبَّل): كەسێكە كەپێی بڵێن (هَبلَتْكَ أُمُّكَ): دایكت ڕۆڵەرۆت بۆ بكات.
(اَلَمُهْبُول)(مفع): كەســێكە كەدایكی جەرگی بۆی سووتابێت و لەدەستی چووبێت.
٢-(هَبَّلَ - الرجُــلُ لِعیالِهِ): پیاوەكە ڕەنجی بۆ خێزانەكەیدا/ بژێویی بۆ پەیداكردن.
(تَهَبَّلَ - لعِیالِه): ڕەنجی بۆ خێزانەكەیدا.
(إهْتَبَلَ): ڕەنجیدا/ بژێویی پەیدا كرد
(إهْتَبَــلَ - فُلانٌ): فیســار درۆو دەلەســەی زۆریكردو ساختە بازیپێكرد/ كەڵەكیلێدا
(الصَّیدَ): فێڵی لە نێچیرەكە كردو فریویدا
(- الشَــيءَ): شتەكەی دەستگیری خۆی كرد و كەڵكی لێوەرگرت
(إهْتَبَــلَ كلمــةَ حِكمَةٍ): وشــەیەكی دانایی وەرگرتو كەڵكی لێبینی
(إهْتَبِــلْ هَبَلَــكَ): هەقــی كاروبــاری خۆت هەبێتو دەست مەخەرە هی خەڵكەوە
(اَلهابِــل): ٢ـڕەنجــدەر/ بژێویــی پەیداكەر ٢ـكەڵەكبازو فێڵباز.
(الهَبَل): (مص): كاروبار یان سروشت.

(أَلهَبِل): ١-فێڵباز/ بە پێچوپەنا ٢-(ح) گورگ/ فریودەر (چونکە فێڵ لە نێچیرەکەی دەکات

(الهِبلُّ والهِبَلُّ): فێڵباز/ فێڵاویی.

(أَلهَبــال) (ن): درەختەتــیر درەختێکــە لە پەلەکانی تیر دروستدەکرێت.

(هَبالة): درەختە تیرێك

(أَلهَبالَة): خواست.

(نالهُ بِهَبالةٍ): خواستێکی دەستگیر کرد.

(أَلهُبالة): تالآنیی.

(الهَبَّــال): ١-ڕەنجدەری تەڵەکە باز/ ســاختە باز/ کەڵەکباز ٢-ڕاوکەری فێڵبازی فریو دەری نێچیرەکەی

(أَلمُهتَبِل): درۆزن

٣-(هَبَّلَ وَأَهْبَلَ - اللَّحْمُ فُلاناً): فیسار گۆشتی لەشی زۆر بوو چین چین نیشتە سەر یەك

(أَلهابِــل): زۆر قەڵــەو گۆشــتن‌و لەش غەمزو بەز.

(أَلهِبلُّ وَالهِبَلُّ): پیاوی کەتەولەش گەورە یان بالآبەرز

(أَلمُهَبَّل): زۆر قەڵەوی گوپن/ خێپش

٤-(هَبَّلَ الشــيء)- (عند العامَّة): شــتەکەی دایە بەر گڕو هەڵم.

(أَلهَبَلة) -(عند العامَّة): گڕ و هەڵم.

(أَلتَهْبيلَــة) (ســريانية): شــت دانــە بــەر گروهەڵم.

(لَحْمُ مُهَبَّلٌ) (عامية): گۆشتی بەر ئاگرو گڕدراو.

٥-(أَهْبَلَ - الرَجُلُ): ئاوەزو هۆشی لەبەر بڕا/ گێلو حەپۆلبوو

(أَلهَبَــل) - عنــد العامَّة): گێــل/ حەپۆل/ گەمژە.

(أَلهَبيل) (عامية): گێل/ گەمژە/ بێمێشك.

(أَلأَهْبَل): ئاوەزو هۆش لەدەســتچوو/ گێل/ حەپۆل.

(أَلمُهَبَّل): مێشکپووت/ شێتۆکە.

(أَلمَهبول) - عِند العامَّة: گێل.

٦-(هُبَل): بتێکی عەرەببوو لەکابەدابوو

(أَلهُبْلَة): قیبلە.

(الهِبلُّ) (ن): درەختێکە.

(أَلهِبِلَّــى): گەنجەفــەو فیزوخۆبــادان لــە ڕۆیشتندا.

(هُــوَ يَمشــي الهِبِلَّى): بەفیــزو گەنجەفەوە دەڕوات‌و خۆی ڕادەوەشێنێت.

(أَلمِهْبَل): سووك.

أَلمُلحَقُ

هبل: (أَلمَهْبِل): ناولەشی ئافرەت/ بۆریچکەیەکە لە (دەرگی لەشەوە/ کوزەوە) تا سەری منداڵدان.

هبن: ١- (أَلهَبَنَّق): گەوج ٢-کورتەبنە/ کورت

١-(أَلهَبَنَّكَــةُ): ١-گەوجــی لاواز، زۆر گەوج٢-کەســێکە پیشــەی دووزمانیــی‌و بوختــان‌و لەیەکبەردانی خەڵکە.

(أَلهَبَنَّك): ١-مێی وشــەی (أَلهَبَنَّك) ٢-تەمەڵ/ تەوەزەل/ بلح.

هبۆ (هَبـا - الغُبارُ.يَهْبُو هُبُوّاً): (تەپوتۆز/ گەرد) هەستاو بڵاوبووەوە
(- الرَمادُ): خۆڵەمێشـەکە تێکەڵی خۆڵەکە بوو
(- الفَرَسُ): چارەوێکە هەڵات.
(- فُلانٌ): فیسارکەس مرد.
(أَهْبـى - الفَرَسُ إِهْبـاءً): چارەوێکە تۆزی هەستاند
(تَهَبّـى تَهَبّياً): دەسـتی تەکاندو گەردەکەی لێکردەوە.
(الهابي): گڵی گۆڕ.
(الهَابي (ج) هُبًّى) (فا): ١-بەپێ تۆز هەڵسێن ٢-هێواش ڕۆیشتوو
(نجومٌ هُبّى): ئەستێرە گەلێك کە بەتۆزوگەرد شاردراوە و بەچاو نەبینراو.
«هذا موضِعٌ هابِيَ التُراب»: ئەمە شوێنێکە گڵەکەی وەك گەردی نەبینراوە زۆروردە.
«تُرابٌ أو رِمادٌ هابٍ»: خۆڵ یان خۆڵەمێشێکی زۆر وردوبە ئاسماندا/ بەهەوادا چووبڵاوەبوو.
(الْهَبـاء (ج) أَهْباء): تۆز/ گەرد٢-ئاسـتەمی خـۆڵ و گەردەکـە زۆر وردە بەسـەرزەوی وبەهەـوادا بڵاووبەهەـوادا چوو٣-خەڵکـە کەمئاوەزو کە ودەنەکان.
(الهَباءَة): دەنکە گەردێکی زۆر ورد
(هُبَايَةُ الشَجَر): توێکڵی درەخت.
(الْهَبْـوَةُ(ج) هَبَوات وَأَهباء): (کۆکەی بەپێی پێوەر نییە) گەرد تۆز
(أَهبـاءُ) الزَوبَعَـةُ): گەردو تۆز شـێوە، کە گێژەڵووکە بە ئاسماندا دەیبات.
٢-(هَبا - الرَجُلُ. يَهَبو.هُبُوّاً): پیاوەکە (هێواش هێواش/ نەرم نەرم/ بەشێنەیی) ڕۆیشت.
(الْهَبِيُّ(م)هَبِيَّة): منداڵی کۆرپە/ ساوا
(المُتَهَبّي): چاوکز.
هـتّ: ١-(هَـتَّ - الـكَلامَ هَتـاً): قسـەکەی ڕێکوپێك گێڕایەوە جوان داپڕشت
(- الماءَ): ئاوەکەی ڕۆکرد.
(- تِ المَرأةُ غَزْلَها): ژنەکە ریسەکەی تاڵ پاش تاڵ ڕست.
(- فُلان في كَلامِهِ): فیسار بەپەلە قسەیکرد
(- البَكْـرُ هَتِيتـاً): جوانـووە حوشـترەکە دەنگیکرد.
(الْهَتّـات): ١-سـووك ٢-زۆر بلـێ/ چەنەباز/ قەرەچەن.
(الْمِهَتُّ = الْهَتّات): زۆر بلێ
٢-(هَتَّ الثَوبَ أو العِرضَ) جلەکەی دڕی یان ناموسەکەی شکاندو پایەماڵیکرد.
«هَتَّةُ بكَذا» عامِية: بـەوە (گاڵتەی پێکرد/ تیزی پێوە کرد) شکاندی
(- فُلاناً): ڕێزوپایەی فیساری هێنایە خواریْ/ سووکیکرد.
(- ورقَ الشَجَر): گەڵای درەختەکەی وەراند
(- الشيءَ): شتەکەی شکاندو وردوخاشیکرد.

(ألهَتّ) (مص): شــكاندن يان لەتوپەتكردنو لێكەران.
٣-(هَتهَتَ - الشيءَ): شتەكەی شكاند.
(- البَعيرَ): لــە كاتی ئاو خواردنەوەدا دەنگی لە حوشترەكە كردو يخەی لێكرد. پێيوت (هَتْ هَــتْ): (يخ يــخ) (- في الــكلام): لە قسەكردندا پەلەيكرد.
(ألهَتْهــات): ١-ســووك ٢-لــە قســەكردندا پەلەپەلكەر/ هەڵەهەڵكەر
هتأ(هَتَأَ - هُ بِالعَصَاوَ نَحْوها): بەدار دەســت يان شتێتر لێيدا
(- الطَعامَ): چێشتەكەیخوارد
(-الرَجُلُ): پياوەكە چەميــەوە/ چەوتايەوە./ نوشتايەوە
تَهَتَّأَ - الثَوبُ -(تَهَتُّؤاً): جلەكە پارچە پارچە بو/ شيتڕ شيتڕ بوو/ دڕا.
(الهَتْءُوالهِــتْءُ و الهَتِيءُ وَ الهِتــاءُ والهِتِيءُ والهِتَاءُوالهُتَاةُ): كات/ دەم
(مَضى مِن اللَيلِ هَتْءٌ): دەمێكی شەو تێپەڕی
(-ألهَتأُ وَ الهُتوءُ): قلێش/ درز/ كەلەبەر.
(الأَهْتأُ): قەموور.
هــتر: ١- (هَتَــرَ - عَــرضَ فُــلان. هَتْراً): ناموسيبر/ ئابڕوويبرد
(- الكِبَرُ فُلاناً): پيرێتی فيســاری خەڵەفاند ژيريی نەهێشت/ ئاوەزی سوككرد.
(هَتَّر- عِرضَ فُلان): ناموسی فيساری تەواو شكاندو برد/ سووكيكرد.
هاتَرَ - هُ مُهاتَرَةً): بە جنێوی پيسوقســەی ناشيرينی ناڕەوا شكاندیو شتی.
(أهْتَــرَ - الرَجُلُ): پياوەكە بەهۆی پيرييەوە يــان نەخۆشــييەوە يــان داخوخەفەتــەوە خەڵەفا/ تێكچوو هۆشی لەبەر برا.
(مُهْتَرٌ): خەڵەفاو ئاوەز تێكچوو.
(أُهْتِرَ- فُلانٌ): فيســار زۆر بەشتەكەوە لكاو زۆری لەسەر وت.
(أُهْتِــروا في ذكرِ اللّهِ): بەخەڵەفاويی زيكری خواوەنديان كرد.
(تَهاتَــرَ - الرجــلانِ): دوو پياوەكە شــەڕە قســەی ناڕەوايان لەگەڵ يەككــردو گێچەڵيان بەيەك كرد.
«تَهاتَرَتِ الشَــهاداتُ»: شــايەتيەكان هەريەكەيان ئەويتری بەدرۆ خستەوەو پووچەڵكردەوە.
(إسْــتَهْتَرَ - فُلانٌ): ١-فيســار بێپەروا شوێن ئــارەزوو و هەوەس كــەوت بەتەنگ هيچەوە نەهــات/ بــەرەڵاو بێئابــڕوو بوو٢-لەپيريدا خەڵەفاو ژيرنەبو.
(أُسْــتُهتِرَ - الرَجُلُ): پياوەكە قسەی فيشالو هەلەقو مەلەقی درۆی زۆر بوو.
(- الرَجُــلُ بِكَذا): شــەيداو بەندو ئالوودەی ئەو شــتە بوو/ هۆشو گۆشی هەر لەسەر ئەو شتە بوو باسی هيچتری نەدەكرد.
(- بِالشيءِ) (عامية): بەدەربەست شتەكەوە

نەهاتو گوێی پێنەدا

(ألهاتِر (ج) هاتِرون وَهَتَرَة)(فا): ١-کەسێکە کە بە دەربەست هیچەوە نەیەت و ئابرووو نامووسی خەڵکی ببات.

(ألهِتْــر(ج) أَهْتَــار): ١-درۆوفیشــاڵ ٢-وەی/ ئاپۆرە/ چورتوم ٣-زۆر زانی ٤-قەوماوی سەخت و سەرسورمێن ٥-قسەی قۆڕو بێئابڕوانە و پڕ لە هەڵە.

«فــلان هِتْــرُ أَهتــار»: فیســار قوماربازە/ کەڵەکبازو فیشاڵکەرو بێئابڕووە.

(ألهُتْر): ئاوەزتێکچوون بەهۆی پیرییەوە یان نەخۆشیەوە یان داخ و مەراقەوە.

(ألتَهاتِر): (گەواهی/ شایەتیی)کەیەك یەکتر بەدرۆ بخاتەوە وپووچی بکاتەوە

(ألتَهْتَاروألتَهْتُر): گەوجیی‌و گێلی/ بێئاگایی/ تێنەگەیشتن.

(ألمُهْتَر): ١-کەسێکە کەهەمر لەسەر شتێك بدوێت و مێشــکی پێوە بەند بێت/ ورێنەبەشتێکەوە بــکات ٢ کەســێکە بەهــۆی پیرییــەوە یان نەخۆشــییەوە یان پەژارەومەراقەوە مێشکی تێکچووبێت.

(رجُلٌ مُهْتَرٌ): پیاوێکی لەقسەکردندا بێئاگاو هەڵەکار بێت

(ألمُستَهتَر): فشەکەرو درۆزن

(بالشــيءِ): شــەیداو پێوە لکاوی‌و ئالوودەی شتێك.

٢-(ألهِتر (ج) أهْتار): نیوەی یەکەمی شەو

٣-(ألهَتْرَك) (ح): ١-شێر ٢-سەردەمی سەخت‌و ناهەموار وتووش.

هتش: (هَتَش - الكَلبَ. هُتْشــاً): سەگەکەی هاندا/ حەلەلەی لێکرد

«هُتِــشَ الكَلْبُ»: ســەگەکە حەلەلەی لێکرا/ هاندرا.

(أهْتُتِــشَ): ســەگەکە نــەدەی لێکــرا کــە پەلاماربدات (ئەمە بۆ سەگ و درندەیە).

(هَتْــش): حەلەلــە لێکردنی ســەگ/ ئەدەی لێکردنی/ هاندانی.

هتع (هَتَعَ - إلى قَومِهِ هَتْعاً): بە پەلە/ گورج بۆ لای خوێشگەلەکەی هات.

هتــف: (هَتَفَ - تِ الحَمامَــةُ هَتْفاًوهُتَافاً): کۆترەکــە گماندی یــان هاقوویەکــی قووڵ‌و درێژیکرد/ خوێندی‌و بینیگرت.

(- فُــلانٌ بِفُــلانٍ): ١- فیســار بانگی فیســار کەسیکرد/ هاواری لێکرد٢-فیسارکەسی هەڵنا.

(هَتَّــفَ - تِ الحَمامَــةُ تَهْتِيفــاً): کۆترەکە ناڵاندی/ بەسۆزەوە گماندی/ هاقوویکرد.

(ألهاتِف) (فــا): بانگکەرێك کــە بانگبکات‌و نەبینرێت.

(سَــمِعتُ هاتِفاً يَهتِفُ): گوێــم لەیەکێکبوو بانگیدەکــردو کەسیشــم نــەدەدی. لــەوەوە تازەگــەرەکان نــاوی(الهاتــف): تەلەفۆنیان وەرگرت‌و دانا.

(أَلهَتْــف والهُتــاف): بانگەوازێکــی بــەرز/ دەنگێکی قەبەی بەرز؟

(قَوسٌ هَتَّافَة وَهَتَفى): کەوانێکی دەنگەوەری دەنگدار.

«قَوسٌ هَتُوفٌ»: کەوانێکی جیڕی دەنگەوەر

(حَمامَةٌ هَتُوفٌ): کۆتری زۆر گمێن.

(رِيحٌ هَتُوفٌ): بای بە وژەوژ.

(سَحابَةٌ هَتُوفٌ): هەورێکی بەگرمەونالە

(أَلهَتَفــى): ١-گرمــە گرمی هــەور ٢-هاوارو بانگەبانگ.

هتك (هَتَكَ - السَّتْرَ وَنَحْوَهُ): ١-پەردەکە یان شــتی وەهای دڕی ٢-ڕایکێشاو لە شوێنی خۆی دەرکردو لادا ٣-بەشێکی لێ دڕاندو ئەودیوەوەی دەرکەوت.

(- الثَّوبَ): جلەکەی ڕاستە دادڕکرد.

(هَتَــكَ اللهُ ســتَرَ الفاجِرِ): خودا پەردەی لەســەر بێحورمەتەکە/ داوێنپیسەکە هەڵماڵیو ئابڕویبرد.

(هُتِكَ عَرْشُــهُ): شــکۆیی و تەختو بەختی نەما، دەستداریی‌و نگینیی نەما.

(هَتَّكَ - السِــتْرَ): تەواو پەردەکەی دادڕی یان لایدا (گرتنەکە بۆ زیادە ڕەوییە).

(تَهَتَّكَ - السترُ): پەردەکە هەڵماڵرا لاچوو

(- فُلانٌ): پاشــڵی فیســار هەڵماڵراو نهێنیی دەرکەوتو ئابڕوویچوو.

(- فِي البَطالَــةِ): خۆی بێکار هێشــتەوەو بە تەنگ خۆیەوە نەهات.

(إِنْهَتَكَ - السِــتْرُ): پەردەکە یان هی وەها دڕا یان هەڵماڵراو ئەودیوی دەرکەوت

(أَلهُتْكُ): نیوەشەو.

(ثَوبٌ هَتِكٌ): بەرگێکی شڕو وڕ/ دڕاو.

(أَلهُتْكَةُ): ١-دڕانی پەردە/ یان پەردە هەڵماڵین، پەردەلادان ٢-کاتژمێرێکی شەو.

(أَلهَتيکــة): ئابــڕوو چــوون/ ڕســوا بوون/ ناوبانگزڕان

(رَجــلٌ مُتَهَتِّــكٌ ومُسْــتَهْتِكٌ ومُنْهَتِــكٌ): پیاوێکــی (بێئابڕوو شــەرم/ نەنگ‌وڕســواو چەرداوەرووکــە بەتەنــگ ئابــڕوو چوون و سووکیی خۆیەوە نەیەت)

هتل: (هَتَلَ - تِ السماءُ هَتْلاً وَهُتُولاً وتَهْتالاً وهَتَلاناً): لێزمەیکرد/ (ســەرومڕ/ بێپشوو) باران باری.

(سَحائِبُ هُتَّلٌ): هەورانێکی بەلێزمە.

(أَلهَتَــلان): بارانێکــی نەرمــی ســەرومڕ/ بێپشوو.

٢-(هَتْلَــمَ - الرجلانِ. هَتْلَمَةً): دوو پیاوەکە بە نهێنــی/ بە دزییەوە لەگــەڵ یەك دوان‌و قسەکانیان لەخەڵك شاردەوە

(أَلهَتْلَمَة) (مص): قسەی نهێنی.

هتــم:١- (هَتَــمَ - فــاهُ. هَتْمــاً) دانەکانــی پێشەوەی دەرکێشا.

(- آلثَنِيَّــةَ): دانەکانــی پێشــەوەی لەبنەوە شکاند.

(هَتِـمَ. هَتَماً): دانەكانی پێشـەوەی لەبنەوە شكا.
(أَهْتَـمُ (م) هَتْمـاءُ(ج) هُتْـمٌ): كەسـێكە دانەكانی پێشەوەی لەبنەوە شكابێت.
(هَتَـمَ - ەُ بِالضَّرب): بەلێـدان بێهێزیكرد/ لاوازیكرد.
(أَهْتَمَ - ەُ): دانەكانی شكاند.
(تَهَتَّمَ - الشيءُ): شتەكە شكا/ وردوخاش بوو.
(تَهَتَّمَت أَسنانُهُ): دانەكانی پێشەوەی شكا.
(تَهاتَما = تَهاتَرا) شەرەقسـەیانكردو شـتی نارەواو درۆیان دایە پاڵیەك.
(أَلْهُتامَــةُ): ئـەوەی لە شـتێك شـكابێت و لێیبووبێتەوە.
٢-(هَتْمَرَ- الرَجُلُ): پیاوەكە قسەی زۆر كرد/ زۆر بلێییكرد.
٣-(هَتْمَلَ - الرَجُلُ): قسەی نهێنییكرد
(- الرَجُـلانِ): بـە نهێنیی قسـەیان لەگەڵ یەككرد واكە خەڵك نەیبیسیت.
(أَلهتَمَلَةُ) (مص) (ج) هَتامِل): قسەی نهێنیی.
(أَلْمُهَتَمِل): دووزمان/ قسە (چن/ هەڵبەست)
هتــن: (هَتَنَ وَتَهاتَــنَ - تِ السَــماءُ. هَتْناًوَ هُتُوناًوَهَتَنانــاًو تَهْتاناً): بەخورو بێپشــوو دایكردەباران/ دایرشت/ لێزمەیكرد.
(- آلدَمعُ): (فرمێسك/ ئەسرین)دڵۆپەیكرد/ دڵۆپ دڵۆپ هاتەخوارێ.
(سَــحابٌ هاتِــن (ج) هُتُن وَهَتَّــنٌ): هەوری بەلێزمــە بــاران/ شەســتەباران/ بارانی بە خورو بێپشوو.
(أَلهَتن): بارانی بەخورو سەرومر/ بێپشوو.
(سَــحابٌ هَتُونٌ)(ج) هُتُــنٌ وَهُتَّنٌ): هەوری بەلێزمە باران/ هەوری شەستەباران/ هەوری بارانی بەخوروبێپشوو.
(عَــيْنٌ هَتُونُ الدَمعِ): چاوێك كە فرمێســك برێژێت.
(أَلتَهْتان): بارانێكی (پچرپچر/ تاوتاو)
هتــو (هَتا - ەُ. يَهتُو هَتْواً): شـكاندیو پێی پێدانا.
(هاتی - ەُ. مُهاتاةً): دایە/ پێیبەخشی.
(هــاتِ یارَجُــلُ): پیاوەكــە بێنــە/ بیدەرە دەستم/ بمدەرێ.
(هاتِي يا إِمرأَة): بێنەژنەكە/ بیدەرەدەستم
(ماأُهاتِيكَ): من ناتدەمێ پێتنابەخشم.
هث(هَثَّ. هَثّاً): درۆیكرد.
(هَثّاث): درۆزن.
٢-(هَثْهَثَ - الشيءُ. هَثْهَثَةً): شتەكە بەیەكدا چوو/ تێكەڵبوو/ ئاوێتە بوو.
(- آلوالي الناسَ): والییەكە ستەمی لەخەڵككرد/ زۆر داریی بەرامبەر خەڵككرد.
(- الشيءَ): توند پێی بەشتەكەدا نا.
(- تِ السَحابَةُ بِقَطرِها): هەورەكە بارانی بە خورباراند.
(أَلْهَثْهَثَةُ)(مــص): هاتو هاوارو دەنگە دەنگ

لە جەنگداو ژاوەژاوو غەڵبەغەڵبی قەڵباڵغیی بەیەکداچوو.
(اَلهَنْهاتْ): مرۆڤ یان زیندەوەری خێرا/ گورج.
(شيءٌ هَتْهاتٌ): شتی تێکەڵو پێکەڵ/ بەسەریەکدا چوو.
(رجلٌ هَثهاتٌ): پیاوی درۆزن.
هثم: (هَثَمَ - هُ. هَثْماً): کوتای تاتەواو ورد بوو.
(- لَهُ مِن مالِهِ): جارێك شتێکی لەداراییەکەی خۆی دایە.
(اَلهَيثَم) (ن): ١-دارێکە لەوانەی مزرەبەرن ٢-هەڵۆ (دەیشوترێت بەچکە داڵو بەچکە شاهەڵۆ/ کۆلارە) ٣-لە سوورە.
هثي. (هَثَى - التُرابَ يَهْثِي. هَثَياناً): چنگی بە خۆڵەکەدا کردو فرێیدا.
(هاثَى - هُ مُهاثاةً): گەمەی لەگەڵدا کردو لاواندی
هجج:١- (هَجَّ - البَيتَ. هَجّاً وَهَجيجاً): خانووەکەی (تێکدا/ رووخاند)
(- تِ العَينُ هَجيجاً): چاوەکە بەقووڵداچوو
«هَجَّ فُلانٌ مِنَ الظُلْمِ وَغَيرِهِ»(عامية): فیسار لە زۆرداریی وستەمیی بەدوور بوو زۆرداریی نەکردو پایەی چاکیی خۆی راگرت.
(هَجَّجَ - ت عَينُهُ): چاوی بە قوڵدا چوو.
(إهْتَجَّ - في الأمرِ): لەکارەکەدا سەرسەختیی کردو گوێی بە راوێژی و ئامۆژگاریی کەس نەدا.
(إسْتَهَجَّ فُلان): بەرای خۆی کارەکەی کرد/ گوێی بە قسەی کەس نەدا.
(- السَّيَّارَةَ أو القافِلَةَ): ئۆتۆمبێلەکەی یان کاروانەکەی خێرا لێخوری/ پەلەی لێکرد.
(عَيْنٌ هاجَّةٌ): چاوێکی بە قوڵدا چوو.
(اَلهَجاج): بەگورو خێرا رۆیشتن.
(رَكِبَ هَجَاج): کەللە رەقییکرد و بەقسەی کەسینەکرد. ئەگەر بیانەوێت خەڵك لە شتێك وازبهێنن دەڵێن: «هَجاجَيكَ وهذاذَيكَ»: وامەکە و وازبهێنە.
(اَلهجاجَةُ): گەوجێك کەئەقڵی بە هیچ شتێك نەشکێت/ سەرلە هیچ کارێك دەرنەکات وەك کوێر وابێت.
«رَجُلٌ هَجَّاجَةٌ»: پیاوێکی گەوج٢-خۆڵبارانێك کەهەموو شتێك بەخۆڵ و گەرد داپۆشێت.
(اَلهَجيجُ(مص) (ج) هُجَّان): ١-دۆڵی قووڵ ٢-زەوییەکی دوورو درێژی وا کە پەلە بە کاروانی بکات زوو ببڕێت.
(تَسْتَهِجُّ): پەلە پێدەکات٢-هێڵی فاڵچی کە بۆ لێدانی نوقلانەی باش و خراپ دەیکێشێت
(اَلإهْجيج): دۆڵی قووڵ
(اَلمُهَجَّج) (فا): چاو بەقووڵدا چوو.
(عَينٌ مُهَجَّجَة): چاوێکی بەقوڵدا چوو
(اَلمُسْتَهِجُّ): کەسێکە لە هەموو شتێك بە هەق

و ناهەق/ ڕاست‌وناراست دەدوێت
٢-(هَجَّ - تِ النارُ هَجيجاً): ئاگرەکە(کڵپەی/ بڵێسەی)سەندودەنگی پەیدا کرد.
(هَجَّجَ - النارَ): ئاگرەکەی خۆشکرد و کڵپەی پێسەندو دەنگی پێپەیدا کرد/ ئاگرەکە کەوتە نێڵە نێل.
(اَلهُجَج): گۆمەکان.
٣-(اَلهُجُّ): نێری سەرملی گاجووت
٤-(هَجْهَجَ - الفَحْلُ في هَديرِهِ): کەلەکە/ نێرەکە توندوبەدەنگەوە مرقاندی یان بۆڕاندی یا حیلاندی یان کەوتە مرەمر.
(- الرَّجُلَ): پیاوەکەی لە شتەکە گێڕایەوە
(- اَلجَمَلَ أو بالجَمَل): دەنگی لە حوشترەکە کرد بیگێڕێتەوە وواز بهێنێت پێیوت (هیج هیج): هۆش هۆش.
(اَلهَجْهاج): ١-گەوج ٢-بەدخواز/ خراپە خواز/ شەڕخواز ٣-کەمئاوەز/ نەقلسووك ٤-حوشتری بۆرە زل ٥-مرۆڤی باڵا بەرزو حوشتری درێژ ٦-زۆر زان وفێڵباز ٧-بەتەمەن/ پیر.
(يَومٌ هَجْهاج): ڕۆژێکی بە باوبڕی توند
(اَلهَجاهِجَة (ج) هَجاهِج) ١-(اَلهَجْهاج) ٢-زەوییەکی وشك وبێئاو بێڕووەك‌و گیا.
(ماءٌ هُجاهِج): ئاوێکە نەسوێرە ونەشیرین
هجأ:(هَجَأَ - جوعُهُ يَهْجَأ. هَجْأَوهُجوءً): برسێتیەکەی برا/ نەماوتێربوو.
(- الطَعامَ. هَجْأً): خواردنەکەی خوارد.
(- بَطْنَهُ): گەدەی پڕکرد.
(- هُ الطَعامُ): خواردنەکە گەدەی پڕکرد.
(هَجِئَ يَهْجَأُ هَجَأً): برسێتیەکەی ورووژاو زۆر برسیبوو.
(أَهْجَأَ- جوعَهُ. إهجاءً): برسێتیەکەی نەهێشت/ بڕی.
(- فُلاناً الشيءَ): شتەکەی دەرخواردی فیساردا.
(- فُلاناًحَقَّهُ): مافەکەی بە فیسار دایەوە.
(أَلهَجأ) (مـص): لەهەرچیدا بووبێت و لێت ببرێت.
(أَلهُجَأَةُ): پیاوو ژنی گەوج.
٢-(تَهَجَّأ، الحَرفَ): ناوی پیتەکەی بردو وشەکەی حونجە کرد.
هجد)هَجَدَ. هُجوداً)(ضد): ١-بەشەو نووست ٢-شەو بێدار بوو/ نەنوست. وتویانە
(أَلهُجود): بەڕۆژ نوستن
(أَلهُجوع): بەشەو نوستن.
(هَجَّدَ- الرَّجُلُ. تَهجيداً): لەخەو (ڕاپەڕی/ هەستا)٢-بەشەو نوست٣-شەو نوێژی کرد
(- فُلاناً) (ضد): خەبەریکردەوە/ بەئاگایهێنا ٢-نواندی
(أَهْجَدَ- الرجُلُ): پیاوەکە نوست.
(- فُلاناً): ١-نواندی/ خەواندی ٢-بینی/ دی کە خەوتووە.
(تَهَجَّدَ - الرَّجُلُ) (ضد): ١-پیاوەکە شەو نوست

٢-بێدار بوو/ ئێشکیگرت شەونەنوست.

(اَلهاجـد(ج) هُجُـود و هُجَّدٌ): ١-نوسـتوو/ خەوتوو ٢-شەونوێژکردوو.

(الهَجـود (ج) هُجُـود وهُجَّـد): کەسـێکە شەونوێژ بکات.

(اَلتَّهَجُدُ) (مص): شەو نوێژیی

(اَلمُتهَجّد) (فا): کەسێکە نەنوێت و شەو نوێژ بکات.

هجـر:١- (هجَـرَ - هُ. هَجْـراً وَهِجرانـاً): پەیوەندیی لەگەڵدا پچڕیو لێدوورکەوتەوە/ وازی لێهێنا.

(- الشَـيءَ): وازی لەشـتەکە هێناو، دەستی لێهەڵگرت/ بەجێیهێشت.

(- زَوجَهُ): کەنار گیری ژنەکەیبوو لە ژنەکە جیابووەوە بەڵام تەڵاقی نەدا

(- فِي نَومِـهِ أَومَرَضِـهِ. هَجْـراً وهِجّيـرى وإهْجيَرى): بەدەم خەوەوە یان لە نەخۆشیدا بزرکاندیو ورێنەی کرد

(- بِهِ فِي النَـومِ هَجْراً): لە خەوتندا خەونی پێوەدی.

(هَجَّـرَ- القَـومُ): بەقرچـەی گەرمـای نیوەرورۆیشتن

(- النهارُ): گەرمای رۆژ تاویسەند.

(هاجَرَ مِنَ البَلَدِ وَعَنهُ مُهاجَرَةً): لەشارەکەوە بۆ شارێکی تر کۆچیکرد.

(أَهْجَرَ - هُ إِهْجاراً): بەجێیهێشت

(- القَـومُ): لەقرچـەی گەرمـای نیـوەرۆدا کۆچیانکرد.

(- فِي مَنطِقِـهِ): قسـەی هەڵەقومەڵەقیکرد وەك ورێنەبکات.

(- بِفلان): گاڵتەی پێکردو قسـەی ناشیرینی پێووت.

(تَهَجَّـرَ- فُـلانٌ): خـۆی وەك نـاوارەو کۆچکردوەکان نواند.

(- القَـومُ): بـە قرچـەی گەرمـای نیوەرۆ رۆیشتن.

(تَهاجَرَ- القَومُ): خۆیشـگەل لەیەك پچڕانو لەیەك جیابوونەوە/ وازیان لەیەك هێنا.

(اِهْتَجَرَ القَومُ): لەیەك بوون/ لەیەك پچڕان/ وازیان لەیەك هێنـاو پەیوەندیان بە یەکەوە نەما (- هُ): لێیجیابووەوە/ وازی لێهێنا.

(الهاجر)(فا): وازلێهێن/ پەیوەندیپچڕێن.

(شـيءُ هاجـرٌ): شـتێکی ناوێـزە/ نایابی بێوێنە.

(الهاجِـرَةُ (ج) هاجِـرات وَهَواجِر): ١-مێی وشەی (الهاجر) ٢-قرچەی گەرمای نیوەرۆ یان لە خۆر ئاوابوونەوە تاعەسـر (چونکە خەڵك لەو کاتـەدا لەماڵەوەن وەك کۆچیانکردبێت و لەماڵـەوە نەبـن ٣-تیژیو تینی وسـەختی گەرما.

(رَماهُ بِهاجِراتٍ)شتی ناشیرینو داوێنپیسی دایە پاڵو پێوت.

(ناقَةُ هاجِرَة): مێحوشترێکی زۆر قەڵەووناياب
(الهاجِرِيّ): ١-شارنشين،ئاوايينشين ٢-جوانی رەسەنی چاك.
(أَلهَجْر)مـص): ١-كۆچكـردن/ رەوكـردن ٢-وازهێنـان لـەوەی دەسـتەبەريبوويت، بەجێهێشـتنی ٣-نيـوەڕۆ ٤-قرچـەو تيژيی گەرما ٥-جوانی رەسەنی چاك
(لَقيتُهُ عن هَجرٍ): پاش ساڵێك يان شەش رۆژو بـەرەو ژوورتر يان پاش ونبـونو لێبرانێكی زۆر چاوم پێكەوتەوە/ پێيگەيشتمەوە
(ذَهَبَـتِ الشَـجَرَةُ هَجـراً): درەختەكـە (بەرزبـووە/ بالآيكرد)ونەسـتوور بوو/ پەلی بەملاوبەولادا هاويشت.
(أَلهُجْـر): ١-قسـەی بيرعـەتو ناشـرين ٢-قسـەو جنێوی ئابڕوبەرانەو ناموسشكاندن ٣-وازلێهێنان، جيابوونەوە٤-لەقرچەی گەرمای نيوەڕۆدا رۆيشتن.
(أَلهِجْـرُ): حوشـتری نێرو مێـی زۆر ناياب و قەڵەو.
الهَجرُ: بالآوترو باشتر لەهيتر.
(أَلهَجْـرَةُ): ١-جارێك جيابوونـەوە، وازهێنان ٢-جارێك بەجێهێشتن ٣-جارێك لەخەودا يان لەنەخۆشيدا بزركانو ورێنەكردن.
(أَلهِجـرة): ١-جۆری كۆچكـردن، رەو كردن، رەهەند بوون/ دەربەدەربوون: كۆچكردن.
(أَلهِجْرةو الهُجْرَةُ)دەربەدەربوون لەخاكێكەوە، ئاوارە بوون لە شـوێنێكەوە بۆ شوێنێكيتر و خاكێكيتر، كۆچكردن
(أَلهُجْرُ): قسەی (پيس/ بيرعەتوناشرين).
(أَلهَجْرُ): كۆچكردنو روو كردنە لادێ.
(أَلهَجُورِيُّ): خواردنی نيوەڕۆژە
(أَلهَجـير(ج) هُجُـر): ١-قرچـەی نيـوەڕۆ ٢-سـەختیو تيژيی گەرما٣-ماسـت٤-گۆلێكی فراوانی گەورە (بۆيە واناونراوە چونكە ئاوێكی زۆر گلدەداتەوە ٥: كاسەی گەپ/ گەورە
(الهَجيرَة): ١-كاتـی قرچەی گەرمای نيوەڕۆو ٢-ئەوپەڕی سەختيی گەرما.
(أَلهِجِّيْرى): ورێنەكردنو بزركاندن لە خەودا يان لەنەخۆشيدا.
(أَلأَهْجَر): لەبارتريان گەورەتر يان درێژ يان قەبەتر.
(هـذا أَهْجَرُمِن ذاكَ): ئەمە لـەوە درێژترو زلترە يان كەتەو قەبەترە.
(أَلمُهْجر): ١-رەسـەنو جوانوچاك ٢-هەموو شتێكی بـاش/ چاكـی هەمـوو شـتێك ٣-بالآترونايابتر لەهيتر.
(المَهْجَر(ج) المَهاجِر): جێكۆچ/ رەوگە شـوێن لێگيرسانەوە و كۆچ بۆ كردن.
(تَكَلَّـمَ بالمَهاجِرِ): قسـەی پيسوبێشـەرمو بێئابڕوانەيكرد.
(رَماهُ بِمُهْجِرات): شتی شەرمەزاريی و ئابڕوو جوانەی دايە پاڵ.

(المَهْجُور)(مفـــع): ١-قســـەی ورێنەو بزرکانی خەوتوو یان نەخۆش٢-وتەو وشەی وازلێهێنراو کە بەکار ناهێنرێت.

(الغَلَط المَشهُور ولا الصحيح المهجور): وشەو قسەیەك كە هەڵەبێت و باو بێت باشترە لەهی راست كە كەس بەكارینەهێنێت.

٢-(هَجَرَ - البَعيرَ.هَجْراً وهُجُوراً): بە پەتی پێبەست قولەپێی حوشـــترەكەی بەستەوە و سەرمكەیتری پەتەكەی بەناوقەدیەوە بەست.

(ألهاجِرِيُّ): خانەساز/ بەنا.

(أَلهَجْر: رەشمەی حوشترو وڵاخ.

(أَلهَجر): پێگران/ كەســێكە لەبەر بێهێزیو نەتوانین خاو بڕوات

(- أَلهَجْـــرَة): ئافرەتـــی قەڵـــەوی تـــەواو تێكسمراو.

(أَلهِجار):١-پەتی پێبەستنی حوشتر كەسەرێكی بەقولەپییەوە دەبەســترێتو ســەرەكەیتری بەناوقەدیـــەوە دەبەســـترێت ٢-ژێـــی كـــەوان ٣-كۆتێگەردن/ تەوق ٤-تاجی سەر.

(أَلهَجير(ج)هُجُر): حوشتری بەپەتی پێبەستە بەستراو.

(أَلهِجْرِيَّاء): خوو و نەریتوسروشت

(أَلهِجيِّرو الهِجِّيرَة): خوو نەریت.

(أَلهِجِّيرى): نەریتوخوو

هـــذا هِجِّيْــراهُ: ئەمـــە نەریتوخۆیەتـــیو سروشتیەتی.

(أَلأُهْجُورَة)والإِهْجيرىوالإِهْجُيْراء):خووسروشتو كاروبار.

٣-(هَجَّرَ - الى الشيءِ): بەیانی زوو و بەپەلە بەرەوشتەكە رۆیشتودەستی پێكرد.

(تَهاجَرَ- القَومُ الماءَ): ئاوەكەیان دەســـتگیری خۆیانخست

٤-(أَلهَجْراء): بەسبوون.

(ماعِندَهُ غَناءُ ذلِكَ ولا هَجْراؤُهُ): نەنەوەیان زۆر هەیـــە نـــە ئەوەندەیـــش بەشـــبكاتو بەسبێت.

(أَلهَجير): نێوان كوفەو بەسرە

(أَلهَجير (ج) هُجُر): كەرەكێوی قەبە/ زلە

(عددٌ مُهْجِرٌ): ژمارەیەكی زۆر.

٥-أَلهِجـــرِس(ج) هَجَـــارِس)(ح): ١-مەیمـــون ٢-(ح)رێوی. دەیشوترێت: بەچكە رێوی٣-(ح) ورچ٤-بەدزمان/ قسەچن/ دووزمان.

(أَلهَجـــارِس): رۆژانـــی ناهەموارو ســـەخت، رۆژانی تەنگانە.

٦-(أَلهِجْـــرَع وأَلهَجْـــرَعْ): ١-گەوجـــی شـــێت ٢-درێژی شەل ٣-(ح) تانجیی سووكەڵە.

أَلملحق:

هجر (أَلُهاجِر): كۆچكردوو/ ئاوارە/ كۆچەر/ كەســێكە نیشـــتمان بەجێبهێڵێت ولە وڵاتی ئاوارەیی/ غەریبی بژی.

(أَلمُغْتَـــرِب): رەهەنـــد/ لانـــەواز/ ئـــاوارە/ دەربەدەری وڵاتانو شاران.

(عَـودَةُ المُهاجِر إلى بَلَدِهِ بَعدَ غِياب طَويل): كەسـێکە کـە بۆماوەیەکی زۆرلە نیشـتمان برابێـت و ئـاوارە بێت بۆ شـارو وڵاتەکەی بگەڕێتەوە.

(اَلمُهاجِـرون): بـەو موسـوڵمانانە دەڵێن کە لەگەڵ پێغەمبەردا لـە مەککەوە کۆچیان بۆ مەدینە کرد.

---

هجز: (هاجَزَ- هُ مُهاجِرَةً): نهێنیەکەی خۆی لا درکاندودەمی بەگوێیەوە ناوچرپاندی.

(هَجس:١- هَجَسَ الشـيءُ. هَجْساً في صَدْرِه): شتەکەی بەدڵدا/ بەمێشکداهات.

(هاجَسَ- هُ): نهێنیەکەی خۆی لادرکاندودەمی بەگوێیەوەناو چرپاندی.

(الهاجِـسُ (فـا)(ج) هَواجِس): ئـەوەی کە بەدڵ یان مێشکتدا دێت.

(ألهَجْس) (مص): ١-سـرپە/ چرپە/ دەنگێك دەبیسیتوتێناگەیت ٢-ئەوەی بەدڵتدا یان بە مێشکتدا دێت.

(ألهَجّاس)(ج): شێرێك کە گوێ هەڵبخات.

(ألمَهْجوس) (مفع): شپرزە بوو/ سەرلێتێکچوو بەهۆی شتێکەوە کە چووبێتە دڵیەوە

(«وَقَعـوا في مَهجوسٍ مِن الأمـرِ»): بەهۆی کارەکەوە یان بۆ کارەکە شپرزە بوون کەوتنە مەراقەوە.

٢-(هَجَسَ- فُلاناً. هَجْساً): لەکارەکەیگێڕایەوە/ پەشیمانیکردەوە.

(إنْهَجَـسَ - عَـنِ الاَمـرِ): خـۆی لەکارەکە کێشایەوە و نەیکرد/ لەکارەکە هاتە دواوە

٣-(الهَجیسَة): شـیری گۆڕراویتێکچووی ناو مەشکە.

(خُبْزٌ مُتَهَجِّس): نانێکی هەویر هەڵنەهاتوو/ فەتیر

هجش (هَجَش.هَجْشاً): وروژا/ ڕاپەڕی.

(- الدابَّـةَ): (نـەرم/ لەسـەرخۆ/ هێواش) وڵاخەکەی لێخوڕی.

(- بَینَ القَوم): خوێشگەلی لەیەك وروژاندو نێوانی تێکدان.

(- لَه نَفسـي): تاسەیمکرد/ دڵم بۆی وبۆلای کورکاندی.

(ألهاجِشَةُ (ج) هَواجِش): کۆمەڵە خەڵکێك/ دەستە خەڵکێك

(جاءَت هاجِشَةٌ مِنَ الناسِ): (کۆمەڵەخەڵکێك/ کۆمەڵێك خەڵك) هاتن.

(ألهَجْشَـةُ): ١-جارێـك وروژان٢-ڕاپەڕیـن، ڕاچڵەکین.

هجع:(هَجَـعَ. هُجُوعاً وَتَهْجاعاً): ١-بەشـەو نوست٢-خەوت (لەهەرکاتێکدا بێت).

(هَجَعَ جوعَهُ. هَجْعاً): برسێتیەکەی خەفاند/ دامرکاندەوە.

(هَجَـعَ جوعُـهُ هُجُوعـاً): برسـێتیەکەی دامرکایەوە/ خەفەبوو/ برا.

(هَجَعـتُ إلَیهِ فَخَدَعَني): خۆم دایە دەسـت

نەوو فێڵیلێکردم.
(هَجَّعَ - القَومُ. تَهْجِيعاً): خوێشگەل نوستن.
(أَهْجَعَ - جوعَهُ): برسێتیەکەی بڕی/ دامرکاندەوە.
(الهاجِع (ج) هُجُوعُ وهُجَّعٌ) (فا): خەوتوو یان بەشەو نوستوو.
(الهاجِعَةُ(ج) هُجَّع وَهُجُوع وَهَواجِع(جج) هَواجِعات): ئافرەت یان مێی بەشەو خەوتوو/ نوستوو.
(الهِجْع و الهُجَعُ والهَجِعُ): گەوجی بێئاگا/ بێهۆش.
(الهِجْعَةُ): جۆری بێئاگابوون.
(رَجلٌ هِجْعَةٌ): پیاوێکی گەوجی بێهۆش.
(الهَجْعَةُ): نوستنێکی کەم/ سەرخەو شکاندنێك.
(أتَيتُ فُلاناً بَعد هَجْعَةٍ): پاش سەرخەو شکاندنێکی سەرەتای شەو هاتمە لای فیسار.
(الهُجْعَةُ): ١-خەو خۆش/ کەسێکە کە زۆر بنوێت ٢-بێهۆشی گەوج.
(الهَجِيعُ - مِنَ اللَّيلِ): بەشێکی شەو.
(مَضى هَجِيعٌ مِنَ اللَّيلِ): بەشێکی شەو رابورد/ تێپەری/ رۆیشت
(التَهْجاع): سەرخەوێك/ سوکە خەوێك.
(المِهْجَع): ١-بێهۆشی گەوج ٢-ناوریایەك کە زوو خۆی بەدەستەوە بدات/ مل بۆ هەموو کەسێك بدات/ جڵەوی خۆی بداتە دەست هەموو کەسێك.

الملحق
هجع (المَهْجَع (ج) مَهاجِع): شوێنی نوستن/ خەوتنگە یان ژووری نوستن

هجف: ١-(هَجَفَ. هَجْفاً): برسیبو لەبرساندا سکی شلبوو ٢-سکی تێقوپاو کەلەکەکانی بەناودا چوو.
(إنْهَجَفَ): لەلاوازیدا ئێسکەکانی دەرکەوت
(الهَجفان): تینو.
(الأَهْجَف (م) هَجفاء): لاوازی تێقوپاو.
٢-(الهِجَفُّ): ١-مالیاتی قەبەو قورسو مرۆڤی قەبەو نەزاندوو وشك٢-کەتەو درێژ ٣-ورگدەرپەریو/ ورگن.
هجل: ١-(هَجَلَ - تِ المَرْأَةَ بِعَينِها هَجْلاً): ژنەکە چاوی گێراو چاوی دڵداریی داگرت.
(هاجَلَ.مُهاجَلَةً): بە شوێنێکی نزمدا رۆی (فُلاناً): کەوتە پێشبرکێو پێشکەوتن لەگەڵ فیساردا.
(أَهْجَلَ - القَومُ): هاتنە نزماییەکەوە
(- الإبلَ): حوشترەکانی پشتگوێخستو رۆیشتنیان نارێکوو تێکەڵو پێکەڵبوو.
(- المالَ): داراییەکەی لەدەستدا.
(الهاجل)(فا): ١-خەوتوو، بێئاگا ٢-گەرۆك/ فرەگوزار.
(الهَجْل (مص)(ج) أَهْجال وَهِجال وهُجُول): زەویی نزم و تەخت/ نزمانی.
(الهَجْلَة: هَجَلات): زەویی نزم وتەخت.

(الهَجُول): ژنی سۆزانی/ ژنی خراپە/ قەحبە.

(أَلهَجيل): ١-زەویی نزم وتەخت٢-گولێك باش دروستنەكرابێت.

٢-(هَجَلَ - بالقَصَبَة وغيرها هَجْلاً): قامیش یان شتیتری فریدا.

(هَجَّلَ - عِرضَهُ): دەستدرێژی كردە نامووسی.

(- بفُلان): پیسترین جنێوی پێداو ناشیرینترین شتی بەگوێدا دا.

(أَلهَجْلَة (ج) هَجَلات): جارێك شت فرێدان

(دُموعٌ هُجولٌ): فرمێسكانی رژاو

(دَمعٌ هاجِل): فرمێسكێكی رژاو

٣-(أَهْجَلَ - الشيء) شتەكەی فراوانكرد

٤-(اِهْتَجَلَ - الشيءَ): شتەكەی داهێنا

هجم: (هَجَمَ - عَلَيه. هُجوماً): ١-هێرشی بردەسەر/ لەناكاودا گەیشتە سەریو پەلارماریدا ٢-بێپرس هەڵیكوتایە سەری/ بێپرس چووە سەری/ چووەلای

(هُجوم الجَيوش بَعْضُها على بعَض): هێرشبردنەسەر یەكتریی سوپاكان بەگژیەكدا چوونی سوپاكان.

(هَجَمَ - البَردُ أَو الشِتاءُ): زوو سەرما یان زستان هات/ گەیشت.

(- البَيتُ): خانووەكە رما/ رووخا/ تەپی

(- فُلاناً على القَوم. هَجْماً): وای لە فیسار كرد كە پەلاماری خوێشكەل بدات

(- البَيتَ): خانووەكەی رووخاند/ رماند/ تەپاند.

(- الهَواجِرُ فُلاناً): گەرما ئاوو ئارەقی زۆری بە فیسار دەردا.

(- ماقي الضَرع):چی لەگوانەكەدا بوو دۆشی

(- الدابَّةَ): ولاخەكەی توند لێخوڕی.

(- فُلاناً): فیساری دەركرد.

(- ت عَينُهُ. هَجْماً وَهُجوماً):چاوی بەقوڵدا چوو.

(- الشيءُ): شتەكە دامركا.

(- المَرَضُ): نەخۆشییەكە سووكبوو/ هێمنبووەوەو لاچوو.

(- فَلانٌ): كروبێدەنگبوو سەریداخست.

(هَجَّمَ - هُ): وایلێكرد پەلاماربدات/ پەلاماری پێدا.

(هاجَمَ - هُ مُهاجَمَةً): دوانەكە پەلاماری یەكتریانداو بەگژیەكدا چوون.

(.أَهْجَمَ - هُ عَلَيهِم): وایلێكرد پەلاماریان بدات.

(- الابِلَ): حوشترەكانی پشوداو حەواندنیەوە

(- اللهُ المَرضَ عَنهُ): خودا نەخۆشیەكەی لەكۆڵخست/لەسەرلابردونەخۆشیەكەلەسەری لاچوو.

(- ماقي الضَرْع): هەموو شیری گوانەكەی دۆشی.

(تَهَجَّـمَ - على الشـيْ): بەزەحمـەتو زۆر لەخۆكردنەوە پەلامارى شـتەكەى داو چووە سەرى.

(تَهاجَما): دوانەكە هێرشـيانكردە سەريەك/ پەلامارى يەكتريياندا.

(إنْهَجَمَ - البَيتُ): خانووەكە رما/ رووخا.

(- الدمعُ أَو العَرَقُ): فرمێسـك بەچاودا يان ئارەق/ خوەى بەلەشدا هاتەخوارێ ورژا.

(- تِ العَينُ): چاوەكە فرمێسكيرشت.

(إهْتَجَـمَ ماڧِ الضَرعِ): چى لەگوانەكەدا بوو دۆشى.

(أُهتُجِمَ - الرَجُلُ): پياوەكە لاواز و بێهێزبوو.

(اَلهَجِم (مص) (ج) أَهْجَام): ١-كاسـەى گەورە (چونكـە تينوێتـى تينووەكە دەشـكێنێت) ٢-ئارەقى لەش.

اَلهَجِم: كاسەى گەورە.

(اَلهَجْمَةُ)١- پەلامارێك/ هێرشێك ٢-سەرەتاى تاريكيى شەو.

(جِئتُـهُ بَعد هَجَمةٍ مِنَ اللَّيلِ): پاش ئەوەى تاريكداهات هاتمەلاى ٣-مەرە پيرە.

(اَلهَجمَهُ - مِن الشّـتاءِ): وەيشومەى زستان/ سۆڵەى زستان.

(- مِنَ الصَّيفِ): ئەو پەرى گەرماى هاوين

(- مِـنَ الإبـلِ): ژمارەى حوشـترى چل يان حەفتا تا سەد سەر بێت.

(اَلهَجَّام): ١-هێرشبەرێكى سەرسەختو ئازاكە زۆر هێرشـبەرێت٢-دلێر/ ئازا/ نەبەرد ٣-(ح) شێر.

(اَلهُجُومُ): ١-هێرشـبەرێكى چابوك/ خێرا لە پەلاماردا ٢-ئارەقپێكەرەوە.

(إسْـتَحَمَّ فَـإنَّ الحَمّـامَ هَجُـوم): چـووە گەرماوەكەو خۆيشت گەرماو ئارەق بەو كەسە دەرێژێت كە خۆى دەشوات.

(اَلهَجـومُ - مِـنَ الريـاحِ): بـاى توندكە كە هەڵدەكات خۆڵ بەسـەر ئەو شوێنەدا دەكات كە لێيهەڵدەكات.

(اَلهَجيمَةُ): ماستى خەست.

(اَلهَيجُمانَة): ١-شيرى زۆر يان دادانى شيرێكى زۆر ٢-(ح) نێرە جاڵجاڵۆكە.

(اَلإهْتِجام): دوا دواى شەو/ كۆتايى شەو.

(اَلمَهْجوم): خانووى تەپيو/ رووخاو.

(بَيـتٌ مَهْجُـوم): دەوارێـك تەنافەكانـى (بەربووبێـت/ كـرا بێتـەوە)/ دەوارەكـە گردبووبێتەوەو تەپيبێت.

هجـن: (هَجُنَ. هُجْنَةً وَ هَجَانَـةً وَهُجُونَةً): دوو توخمبوو/ دوورەگبوو.

(- الكَلامُ): ئاخاوتنەكە (خەوشـى تێكەوت/ ناتەواو بوو)

(هَجَّنَ - هُ'. تَهجيناً): دوو توخميكرد. دوورەگيكرد.

(- الأمـرَ): كارەكەى بەناشيرينوخەوشـدار دانا.

(إسْتَهْجَنَ فِعلَهُ): كردەوەكەى بەناشيرين دانا

و بەخراپی زانی/ پەسەندینەکرد.
(هـذا مما يُسْتَهْجَنُ ذِكْرُهُ): ئەمە شـتێکە بە ناشـیرین و ناپەسـەند دادەنرێت و ناوی ناهێنرێت.
(- ألهاجِـن فـا) (ج) هَواجِن): خەوشـدار/ ناتەواو/ لەکەدار ٢-چەخماخێك کە بەجارێك هەڵکردنی ئاگرنەدات.
(ألهُجْنَـةُ (مـص) (ج) هُجَن مِـن الكلام): قسـەی ناشـیرین یـان قسـەیەك نەنگیی‌و بێشەرمیی تێدا بێت.
(- في العِلم): لەدەستدانی زانستی‌وزانست.
(الهَجين(ج) هُجُنٌ وَهُجَناءوَهُجْنان وَمُهاجين وَمُهاجِنَـة (:م) هَجِينَة (ج) هُجُـنٌ وَهِجَانٌ وَهَجَائِـنٌ): ١-قسـە چـن/ دووزمان٢-مرۆڤی دوورەگ (باوکـی عـەرەب بێـت‌و دایکی کە نیزەکە کۆیلە بێت یان عەرەب نەبێت).
(فَرَسٌ و بَرْذُونَة): ئەسـپێك یا بارگیرێك کە دوورەگبێت.
(ألهَجـين - مِنَ الخَيل (ج) هُجُن وَهَواجِن): ئەسپێك باوکەکەی عەرەبی بێت ومایەنەکەی نا عەرەبی بێت
(لَبَنٌ هَجِينٌ): شـیرێك نە ژەکبێت ونەشیری تەواو بێت.
(ألمَهْجَنَـة و ألمَهْجَنى وَالمَهْجُنـی و المَهْجُناءُ): خوێشکەلێك بێکەڵك‌و بێخێروبێر بن.
٢-(هَجَـنَ۔ هَجْنَـاً): پێنەگەیشـتوو بـوو/ تەمەنی بەری نەهاتبـوو/ کچێك بە منداڵی بەشوو درابوو.
(أهْجَـنَ - الرَجُـلُ): پیاوەکـە حوشـتری رەسەن‌وچاکی زۆر بوو/ حوشتری سپی‌و باشی زۆر بوو.
(- الجارِيَـةَ): کچەکـەی/ کەنیزەکەکـەی بەمنداڵی بەشوودا.
(أُهْتُجِنَ - تِ الشاةُ): ئاوسی مەرەکە دەرکەوت.
(ألهاجِـن (ج) هَواجِـن): ١-کچێکـە پێـش باڵقبوونـی شـوو بـکات ٢-دارخورمایەك بە بچووکیی (بەر بگرێت/ بێتەبەر)
(ألهاجِنَـة): ١-مێی وشـەی (الهاجـن) ٢-دار خورمایەك بە بچووکیی بەریگرتبێت.
(ألهِجان - مِن كُلِّ شَـيءٍ): ناوێزەو باشترینی هەموو شتێك، پووختەی هەموو شتێك
(- مِنَ الإبِلِ): حوشـتری رەسـەنی سپی (بۆ نێرو مێ وکۆ دەوترێت).
(بَعيرٌ هِجانٌ وناقَةٌ هِجانٌ وإبِلٌ هِجانٌ): نێرە حوشترێك ومێحوشترێکی رەسەن‌و سپی‌وگەلە حوشـترێکی رەسەن‌و سپی رەنگە بیشوترێت: (هَجائِن) (رجلٌ هِجانٌ): پیاوێکی خانەدان‌و رەسەنزادە.
(إمْـرَأةٌ هِجـانٌ): ژنێکـی وەچاخـزادەی رەسەنزادە.
(نِسْـوَةٌ هَجائِـن): ژنانێکـی وەچاخـزادەی رەسەنزادە.

(أَرضٌ هِجانٌ): خاكێكی/ زەوییەكی سپیی نەرم.
(ألهجانَةُ): ١-رەسەنییو وەچاخزادەیی/ خانەدانیی ٢-سپێتیی.
(غِلمَةٌ أُهَیجِنَةٌ): كەسوكاری منداڵەكان، بچووك بە بچوكیان پێكردوون، واتا كورو كچی منداڵیان لەیەك مارەكردووە.
(أَلمُهْتَجِنَةُ): ١-دارخورمایەك كەیەكەمجار تۆوی نێرەكەی پێوە دەكرێت ٢-دارخورمایەك كە بەبچووكی بەردەگرێت ٢-كچۆڵەیەك
(أَلمُتَهَجَنَةَ- مِن النوق): ١-مێحوشترێكی سپی رەسەن ناهێڵن لەگەڵ نێرە حوشتری بێگانەدا جووتبگرێت لەگەڵ نێرەی وڵاتەكەیدا نەبێت ٢-دار خورمایەك كەیەكەمجار تۆوی بەسەردا برژێنن ٢-مێحوشترێك كە یەكەمجار ئاوسبێت.
٣-(أَلهَجَنَّف (ج) هَجانیف): درێژی پان الملحق
هجن. (أَلهَجّان (ج) هَجّانَة): سوارەی وڵاخی دوورەگ.
(أَلهَجّانَة): تیپێكی بارگیر سوارە/ سوارەی وڵاخی دوورەگ/ لە هەندێك وڵاتی عەرەبیدا هەیە.

هجو: ١-(هَجا - هُ یَهْجو هَجْواً وهِجاءً وَتَهَجّاء): دایشت/ كەمو كوورییەكانی دەرخست وبە خراپە ناویبرد/ شكاندی و رسوایكرد/ جنێوی پێدا.
(هاجٍ): داشۆر/ رسواكەرو خەوشدەرخەرو جنێودەر.
(مَهْجُوّ): داشۆراو/ سووككراو/ جنێو پێدراو خەوشدەرخراو.
(هَجا - الیَومُ هَجاوَةً): گەرمای ئیمرۆ تاویسەند.
(هاجَیتُ - هُ مهاجاةً): من ئەوم داشۆردو ئەویش منی داشۆرد.
(أَهجی - القَولَ.إهْجاءً): قسەكەی بەسووككردنو جنێودان دانا.
(تَهاجَیا واهْتَجیا. تَهاجیاً. إهتجاءً): خراپەی یەكتریان وتو یەكتریان سووككردو جنویان بەیەكتردا.
(الهَجاة) (ح): بۆق.
(أَلهَجّاء): جنێو فرۆشێكی خراپەكەرو سووككەری خەڵك/ زۆر داشۆری خەڵك.
(أَلأُهْجُوَّة وَالأُهجِیَّة (ج) أَهاجِیُّ): شیعرو هەڵبەستو نووسینو قسە/ هەرهۆیەك كەپێی خەڵك سووكبكاتو خراپی بڵێتو جنێوفرۆشی بەرامبەر بكات/ دایبشوات.
(بَینَهُم أُهْجُوَّةٌ أَو أُهْجِیَّةٌ یَتهاجون بِها): لە نێوانیاندا بەهەڵبەست یان شەرەقسە بەسەرو پۆتەڵاكی یەكتریدا دێنو پێی یەكتری سووكدەكەن/ یەكتری دادەشۆن.
٢-(هَجا - الحُروفَ. یَهجو هَجْواً وهِجاءً): خونجەیكرد.

(- هَجاءً): بەحونجە خوێندیەوە.
(هَجَّـى - الحـرُوُف تَهْجِيَـةً): حونجـەی کردوناوی پیتەکانی هێنا.
(هَجَّـى اللفظـة): وتەکـەی حونجەکـرد/ پیتەکەی ژمارد.
(هَجَّـى - الصَبِـيَّ الكِتـابَ): بەحونجـە منداڵەکەی فێری پەرتووکەکە کرد.
(تَهَجَّـى - الحروفَ. تَهَجِّيـاً): حونجەیکردو ناوی پیتەکانی هێنا.
(ألهِجاء): حونجەکردن/ هێنانی ناوی پیتەکان بەسەرو بۆریانەوە.
(حُـروف الهِجاء): پیتـە عەرەبیەکان. کەلە نێوان ئەلفو (یێ)دایە پێشـیدەڵێن(حروف التَهَجّي و التَهْجِيَة).
(هـذا علـى هِجاءِ هـذا): ئەمە لە شـێوەی ئەوەیە.
(هُـوَ على هِجـاءِ فـلانٍ): ئـەو لەدرێژیی وشێوەدا وەك فیسار وایە.
هدّ (هَدَّ- البِناءَ. هَدّاً وَهُدوداً): خانووەکەی کاولکـرد/ وێرانکـرد/ تـەواو رووخانـد/ رماندیو تەپەیهات.
(هَدَّتْـهُ المصيبَـةُ): کۆسـتەکە/ قەومـاوە سەختەکە هێزی لەبەربڕیو رووخاندی.
(هَدَّنـي هـذا الأمـرُ أو هَـدَّ رکنـي): ئەم کارە هێـزی لەبـەر بڕیـم و پەکیخسـتم و تێکیشکاندم.
(هَدَّ - الرَجُلُ): پیرو پەککەوتەبوو.
(- البَعيرُ هَدّاً): حوشترەکە کەوتە بۆرەکردن.
(-الحائــط ونحــوه هديــدا): دیوارەکە یان شتێکی وەها کەوتو تەپەیهات/ گرمەیهات.
(هذا رَجُـلٌ هَدَّكَ مِن رَجُلٍ): ئەمە پیاوێکە چەند قایەمو بەرگە گرو بەزەبرو زەنگە واتا بەسەرتدا زاڵ بوو شکاندتی (ئەم وبەدوو جۆر بــەکار دەهێنرێت بەشـێکی زۆر وەك چاوگ بەکاریدەهێنێت ئەدەیکات بەمێ ئەبەجووت ئەبە کۆ هەیشە وەك فرمان بەکاری دەهێنێت بۆمێ وجـووت بۆ کۆ دەڵێت (مررت بِرَجُلٍ هَـدَّكَ مِن رَجُلٍ و بِامـرأةٍ هَدَّتْكَ مِن امرأةٍ وبِرَجُلَين هَدَّاكَ وبِرجالٍ هَدّوكَ وبِامرأتَين هَدَّتاكَ ونسـاء هَدَّنك... الـخ ويقال أيضاً أنَّـهُ لَهَـدُّ الرَجُـلُ) ئـای چ پیاوێکی باشـە (ئەگەر توندو بەبڕشـتو بەهێز بێت)بەڵام لە هەموو رسـتەکاندا بە جۆرێکی گشـتی بۆ سەرلێسورمان دێت.
(فُـلانٌ يُهَدُّ): ئای فیسـار چەنـد بەتواناو بەرگە گرە کێ دەیگاتێ.
(هَدَّدَ وَ تَهَدَّدَ - هُ): ترسـاندیو هەڕەشــەی سزادانی لێکرد
(تَهادُّ - القَومُ تَهادّاً): خوێشگەل بەدوای یەکدا رۆیشتنو لەسەرکارەکەبەردەوامبوون.
(إنْهَـدَّ - الجَبَـلُ أو البَيـتُ): خانووەکە یان شاخەکە داکەوتورما/ رووخا.

(إِسْتَهَدَّ - هُ): بێهێزیکرد/ لاوازیکرد.
(أَلهادّ)(فــا): ١-رمێــن/ کاولکــەر/ رووخێنی خانوو وهیتر ٢-گرمەی دەریا.
(أَلهادَّة): ١- مێی وشەی (الهاد) ٢-هەورەگرمە.
(«ماسَــمِعنا العامَ هادَّة»): ئەمســاڵ هەورە گرمەیەکمان نەبیست.
(أَلهَدُّ).(مص): ١-پیاوی جوامێروبەخشــندە کــە لەداراکەی ببەخشــێت/ دەســتی بچێتە سامانەکەیەوە ٢-دەنگی قەبەو زل.
(أَلهَــدُّ والهِــدُّ (ج) هَدُّون وهِــدُّون): پیاوی بێتوانا/ لاوازو سست/ بێدەسەلات.
(أَلهَدَد): دەنگی قەبەو زل.
(أَلهَــدَّةُ): ١-گرمەیەك، تەپەیــەك، هاڕەیەك ٢-جارێك رماندنی خانوو وشتی وەها.
(أَلهَداد): هێواشــیی/ نەرمی/ لەسەرخۆیی/ شێنەیی.
(هَدادَیــكَ): هێواش هێــواش/ بەنەرمیی و لەسەرخۆیی/ نەرم نەرم.
(قَومٌ هَدادٌ): خوێشگەلێکی زۆر ترسنۆك.
(أَلهَدادُة): زۆر ترسنۆك/ زیرە کردوو.
(رَجُلٌ هَدادَةٌ): پیاوێکی زیرەکردوو
(أَلهَــدود): ١-زەویــی تەختانــی ٢-تەگەرەی گرانو سەخت.
(أَكَمَــةٌ هَــدودٌ): گردێکــی لێژگــە کــوورو ناخۆش.
(أَلهدید)(مص): (گرمەی/ تەپەی) رووخان/ تەپین/ رمان/ ناڵەو هاڕەی دەنگ.
(أَلأَهَدُّ): زیرە کردوو/ زۆر ترسنۆك.
(أَلتَهْداد): ترســاندنو هەڕەشــەو گورەشەی سزادان.
(أَلمِهْدَة): پیکی بەرد شکاندن.
(«جــاؤُوا مُهَادِّیــن ومُتَســائِلین»): هاتــن بەشوێن یەکدا وەك لەیەك بگەڕێن.
٢-(أَلهَدید): پیاوی بەژن بەرز/ درێژ.
٣-(هَدْ هَدَ - البَعیرُ). هَدْ هَدَةً): حوشــترەکە بۆڕاندی
(- الطائِــرُ: باڵندەکــە قیڕانــدی، دەنگــی لێوەهات
(- تِ الصَبِيَّ أُمُّهُ): دایکی ســاواکە ســاواکەی راژەند تا بنوێت.
(- الشــيءَ مِــن عُلُوٍ إلى أَسْــفَل): شــتەکەی لەبەرزییــەوە تلــۆر کــردەوە/ گلکــردەوە/ خلکردەوە.
(«یُهَدْ هَدُ إِلَيَّ كذا»): ئەوەم بەخەیاڵدا دێت/ سەودای ئەوەم هاتێ.
(أَلهَدْ هَدْ: جووکە جووکــی جنۆکەکان (ئەم وشەیە کۆیە تاکی نییە).
(أَلهُدْ هُدُ) (ح): پەپوسلێمانکە
(هُد هُدَة)(ح): پەپوسلێمانکەیەك
(ج)(هَداهِدوَهَداهید)(ح):پەپوسلێمانکەکان باڵندەیەکە میلو رەنگی زۆری هەیە.
(أَبْصَــرُ مِــن هُدْهُدِ): چاوی لــە هی پەپوو

سـلێمانکه تیـژ تـره، (گوایا دەڵێـن: ئاو له ژێرزەویدا دەبینێت. (هَدهَد): هەربالّندەیەك کـه بقیرێنێـت. بگمێنێـت/ یـان بگارێنێت ٢-کۆتری بەگمە/ کۆتری هاقوو.

(اَلهُدهُـد الواحِـدَةُ هُدهُـدَةٌ (ج) هَداهِـد وهَداهید) (ح): پەپوسلێمانکه.

(اَلهُداهِـد الواحِـدَةُ هُداهِـدَةٌ (ج) هَداهِد وهَداهید) (ح): پەپوسلێمانکه.

(اَلهَداهِد): لەسـەرخۆیی/ نەرمیی/ هێواشی شێنەیی.

(«عَلَیـكَ بالهَداهِـد»): دەبـێ/ پێویسـتـه (شێنەیی/ لەسەرخۆ/ هێواش) بیت/ بە ئارام بیت.

هـدا:١- (هَـدَأَ. یَهْدَأُ هَـدْأً وَهُـدوءً): کپو بێدەنگبو یـان دامرکا/ سـرەوت (- بالمكانِ: لەشوێنەکەدا سرەوت/ دانیشت/ نیشتەنیبوو («تَسـاقَطوا إلی بَلَـدٍ کـذا فَهَـدَأُوا فیه»): دابارینـه ئەو شـارەو تیایدا سـرەوتیان کرد ونیشتەجێبوون.

(هَدَأَ - فُلانٌ): مرد.

(اَتانـا فُلانٌ وقَـد هَدَأَتِ العَـینُ والرِجلُ): کاتێك فیسارهات کەچاونیشتبوو پێراکشابوو/ خەڵك نوستبوون

(هَـدا أو هَـدَأَ الصَبِـيُّ): سـاواکەی لاواندو هێواش دەستی بەپشتیدا کێشا/ بێدەنگیکرد/ دایمرکاندا تابنوێت.

(هَـدَأَ -هُ تَهْدِئَةً): هێمنیکردەوە/ هێواشـی کردەوە.

(اَهْدَأَ - هُ إهداءاً): هێواشـی کردەوە/ هێمنی کردەوە/ دایمرکاندەوە.

(- الصَبِيَّ): سـاواکەی لاواندو هێمنیکردووە وەکێشای بەپشتیدا تا بنوێت

(«لاأهْدَأَهُ اللهُ»): خودا سروتی لەبەر ببڕێتو راستینەکانەوە.

(اَلهُدْءُ والهَدْءُ): بەشێکی شەو

(«اَتانا بَعد هَدْءٍ مِنَ اللَّیل»): کاتێك هاتەلامان کە بەشێکی شەو رۆیشتبو خەڵك نوستبوون.

(اَلهَـدْأَةُ): جارێـك (سـتارەو ئارامگرتـن/ هێمنبوونەوە).

(- مِنَ اللَّیلِ): بەشێکی شەو.

(اَلهِدْأَةُ): (جۆر/ چەشن) ی هێمنیی

(«مالَهُ هِدْأَةُ لَیلَةٍ»): بێدەنگیی شەوێکی نییە.

(اَلهَدَأَةُ): جۆرە راکردنێك.

(«هُوَ أهْدَأُهما کانَ»): ئەو لەجاران هێمنترە/ ئارامترە.

(اَلهَدِيءُ مِنَ اللَّیلِ): بەشێکی شەو.

(اَلهُدُوء(مص) - مِنَ اللَّیلِ): بەشـێکی شـەو ٢-ئارامبوون/ کپبوون/ ستارەگرتن/ هێمنبوون/ هێواشی/ لەسەرخۆیی.

(اَتانـا فـلانٌ هُـدوءً): فیسـار کاتێك هات سەرخەوێکمان شکاندبوو.

(اَلمَهْدَأُ- مِنَ اللَّیل): بەشێکی شەو.

(أَلْمَهْدَأَةُ): بار/ رەوش/ چونیەتیی بوون.

(تَرَكْتُهُ على مُهَيْئَتِهِ): لەسەر باری خۆیبوو کە بەجێمهێشت.

(مُهَيْدِئَـــة): بچووکراوەی وشـــەی (المَهْدَأَة)یە

٢-(هَدِئَ. يَهْدَأُ. هَدَأً): چەمایەوە/ نووشتایەوە.

(- البَعيرُ): گۆپارەی حوشترەکە بچووکبووەوە لەبەر ئەرکی گرانیوباری زۆری.

(أَهْدَأَ - الكِـبَرُ أَو الضَربُ غُلاناً): پیری یان لێدان چەماندیەوە/ پشتیپێدانەواند.

(اللّهُ مَنْكِبَهُ): خودا شـــانی کوور کردوپشـــتی کۆمکردەوە.

(- الثوبَ): جلەکەی کۆنکرد.

(- أَلْهُداءَة): چارە وێی تێقوپاو چرووساو.

(الأَهْدَأُ): شان کوورو پشت چەماوە.

(مَنْكِــبٌ أَهْدَءُ ورَجُــلٌ أَهْدَأَ وامْـــرأَةٌ أَهْدَأُ): شـــانێکی کوور، پیاوێکی شـــانکورو وکۆماوە/ چەماوە، ژنێکی شانکورو کۆماوە.

٣-(أَلهَــدْء): رەوشـــتو رەفتـــار/ نیشـــانە/ خەسڵەت.

هدب (هَدَبَ - الشيءَ هَدْباً): شتەکەی (بڕی، لەتیکرد).

(- الناقَةَ): حوشترەکەی دۆشی.

(- الثَمَرَةَ): میوەکەی چنی.

(هَدِبَ-تِ العَينُ) (- هَدَباً): چاوەکە برژانگی درێژبوو.

(- تِ الشَجَرَةُ): لقوپۆپی درەختەکە درێژبوو و بەملاو لایدا شۆڕبووەوە.

(هَدَّبَ الثَمَرَة): میوەکەی چنی.

(-الثوبَ): ڕیشووی بۆ جلەکە کرد.

(أَهــدَبَ-تِ الشَــجرةُ): درەختەکە لقو پۆپی درێژبوو و بەملاولایدا شۆڕبووەوە.

(تَهَدَّبَ - الســحابُ): هەورەکە نیشـــتە ســـەر زەوی.

(-تِ الأغصانُ): لقەکانی درەختەکە شۆڕبوونەوە.

(إهْتَدَبَ الثَمَرَةَ): (بەرەکەی/ میوەکەی) چنی

(الهُدْب والهُدُب): برژانگی چاو.

(هُدُبَة (ج) أَهداب): تالێك برژانگ٢-پەراوێزو داوێنی جلو ڕیشووی.

(أَلهَــدَب (ج) أَهــداب): ١-لقوپۆپی درەختی سیرینچکە تالە/ یاسەمینی زەرد کە درەختێکە بەرەکـــەی لەهـــی عەنەب دەچێـــت وگوڵێکی جـــوان دەگرێـــت ٢-ئـــەوەی گەڵای هەمیشـــە سەوزە وەك درەختی سەرو وکاژ.

(أَلهَدَب - مِن النَّبات): گەڵای رووەك ودرەخت کـــە پانیـــی نییـــە وەك گەڵایـــتر وتراویشـــە هەموگەڵایەك کە پانیی نەبێت وەك هی کاژ.

هَدَبُ الشَــجَرَةِ: درێـــژ بوونی لقی درەخت و شۆڕبوونەوەیان.

(أَلهَدِب)(ح): شێر.

(مِنَ العُيون أَو الأشــجار): چـــاوی برژانگدار یان درەختی پەلوپۆ دار وشۆڕ.

(أَلهُدُبُّ): گێلو گەمژە ی لەشگران/ لەشقورس.

(- الشَرابُ): شەرابەکە یان شەربەتەکە کولا

(-ت جَــرَّةُ النَبيــذِ): کووپــەی مەیەکــە هاتەجۆش/ مەیەکەی تێدا کولا.

(- الرعدُ): هەورەگرمەکە ناڵەیکرد.

(- النَخلُ): دار خورماکە تۆودانەکەی قلیشا/ شەقیبرد.

(- البَعــيرُ. هَــدْراً وَهَديــراً): حوشــترەکە بۆرەکەی لەگەروودا، دایەوە.

(- العُشــبُ هُــدُوراً وَهَدِيــراً): گیاکــە زۆر بالایکردو گەورەبو زۆر بوو.

(هَدَّرَ - البَعيرُ): حوشترەکە بۆرەی لەگەرودا دایەوە و درێژەی دایە.

(ألهــادِر): ١-خوێــن بەفــیرو دەر ٢-گرمــەو ناڵەکەر ٣-بۆرەکەر ٤-دارا لەدەستدەر ٥-شیرێك کە ســەرەوەی مەییبێــتو ژێــرەوەی خۆی نەگرتبێت/ نەمەییبێت.

(ألهــادِرَةُ (ج) هَــوادِر): زەوییــەك گیایەکی زۆرو زەبەندەی هەبێتو بەربلاو بێت.

(ألهَــدَّار): وشــەیەکە بۆ زیاد رەویی وشــەی (هادر) ە.

(رَعْدٌ هَــدَّار): هەورەگرمەیەکی زۆر بەناڵەو دەنگدەرەوەیەکی بەرز.

(ألأَهْــدَر(م) هَــدْراء (ج) هُدْر): هەلاوســاو

(ألمَهْدَرَة): دانێکی بچووکی دانەکانی پێشەوە

٣-(الهِدْرُجــين (ك): هایدرۆجین): تەنێکی سادەیەو گازێکە بێبۆنو بێرەنگە. دەسووتێت.

سووکترین گازە. لەگەڵ ئۆکسجین پێکەوە ئاو پێکدەهێنن.

(- الثَقیــل أَو الدُوتیریــوم) (ك): جــۆرە هایدرۆجینێکــە کــە ســەنگی دوو نەوەندەی سەنگی هایدرۆجینی ئاساییە لەگەڵ ئۆکسجیندا یەکدەگرن ئاوی قورســی لێپەیدا دەبێت کەلە لێکۆڵینەوەئۆتۆمیەکاندا بەکار دێت.

٤-(الهَداریــس: وەیــەکان/ چورتومــەکان/ ئاپۆرەکان.

هدس: (هَدَسَ/ فیه) (عامیة) (سریانیه): بیری لێکردەوە.

هدش: (هُدِشَ - الکلبُ هَدَشــاً): ســەگەکە هاندرا/ حەپەپلێکرا.

(إِنْهَدَّش الکلبُ): سەگەکە تێزبوو.

هدغ: (هَدَغَ - هُ هَدْغاً): قرنجاندی، شکاندی/ درزی تێکرد.

إنهدَغ: شکا یان درزیتێکرد.

(- الشيءُ): لەوشکیدا نەرمبوو

(- ت الرُطَبَــةُ): فەریکە خورماکە کەکەوتە خوارەوە درزیتێکەتو شەقیبرد.

هــدف: ١-(هَــدَفَ - إِلیــهِ هَدْفــاً): چــووە ناویەوە.

(- لِلخَمسین): نزیکی پەنجا ساڵیی بووە.

(- الی الشــيءِ. هَدْفــاً): بــۆلای شــتەکە خێرایکرد.

(- إِلَیــهِ): ١-تــیری (تێگــرت/ ئاراســتەکرد)

٢-كردی بەنیشانەی خۆی ٢-كردی بە ئامانجی خۆی.
(أَهْدَفَ - لِلخَمسين): تەمەنی نزیكی پەنجا ساڵ بووە.
(- علی التَّلِّ): گەیشتە سەر گردەكە، سەركەوتە سەر گردەكە.
(- إلیهِ): پەنای بۆ برد/ خۆی كوتایە پاڵی
(- لَهُ الشيءُ): شتەكە هاتەبەری و لێینزیك بووەوە.
(- منهُ): لێینزیكبووەوە.
(«أَهْدَفَ لَكَ الصَّیدُ فأرمِهِ»): نێچیرەكەت لێنزیكبۆتەوە دەتێیبگرە.
(إِسْتَهْدَفَ - لَهُ الشيءُ): شتەكەبووبەمەبەستیو هاتەبەرچاوی و لێینزیكبووەوە.
(- الشيءُ): شتەكە بەرزبووەوە/ راستبوەوەو هاتە پێشەوە.
(«مَن صَنَّفَ فَقَد إِسْتَهْدَفَ»): هەركەسێك شت رێكبخات وبنوێنێت ئەوە مەبەستی دیاریكردووەو خەڵك لێی دەدوێت.
(- كَفَلُ الإنسانِ أَوِ الحَیَوانِ): سمتی مرۆڤەكە یان زیندەوەرەكە/ ئاژەڵەكە بەرز بۆتەوە لەبەر چاو دەبێت وەك نیشانەی لێدێت.
(الهادِف): (فا): ١-تێچوو ٢-مەبەستدار/ ئامانجگر ٢-بێگانە/ نەناس/ نامۆ.
(الهادِفَةُ): كۆمەڵ/ كۆ.
(أَلهِدف): تەنمەند/ لەشگەورە/ جەستەمەند

(أَلهَدَف(ج) أَهداف): ١-هەرچی بڵند بێتو لەبەرچاوبێت وەك كەژ/ كێووگردو تەلار و خانەی نھۆمدار یان گردەڵەم ٢-ئامانج/ مەبەست/ نیاز كە دەكرێت بە نیشانە ٣-پیاوی مەزن.
(أَلهِدْفَةُ (ج) هِدَف): كۆچەری یان مرۆڤێك یان كۆمەڵە خەڵكێك لە شوێنێكدا سەرەوت ناكەن هەر دەمەو لەجێیەكدا دەبن و هەڵدەدەن.
٢-(هَدَفَ - هَدْفاً): لەشگران و تەمەڵبوو بێتوانا بوو.
(أَلهَدَف: (ج) أَهداف): لەشگرانی هەمیشە خەواڵوو، خەوخۆش ٢-مرۆڤی لەشگرانی تەمەڵیو بێفەرو بێكەڵك.
هەدك: (هَدَكَ - البناءَ هَدْكاً): خانەكەی رماند/ رووخاند.
(تَهَدَّكَ. تَهَدُّكاً): خۆی گەوج كرد
(- عَلَیهِ بِالكَلام): بەقسە بەسەریدا هاتو شكاندی و سووكیكرد
هەدل: ١-(هَدَلَ - الشيءَ هَدْلاً): شتەكەی شۆڕكردەوە/ دایهێلایەوە. خوارەوەو شلیكردەوە.
(هَدِلَ. هَدَلاً): شلوشۆڕبووەوە
(- البَعِرُ): لچی حوشترەكە دوومەڵی لێهاتو بەهۆیەوە لچی شۆڕو شلبووەوە
(تَهَدَّلَ - ت الشَفَةُ): لچەكە شۆڕبووەوە/ داكەوت.

(-ت أَغْصَانُ الشَــجَرَةِ أَو ثَمَرَتُها): لقو پۆپی درەختەکە یان بەرمکەی شۆڕبووەوە.

(- الثَوبُ): جلەکە شەپوشۆڕبوو.

(أَلهادِل)(فا): شۆڕەوە بوو/ داکەوتوو.

(بَعِيرٌ هادِلٌ): حوشتری لچشۆڕ./ لچدرێژ.

(جَمَلٌ هَدِلٌ): حوشتری لچدرێژو شۆڕ

(أَلهَدَال): (لق/ چل/ پەل)ی شۆری درەخت.

(أَلهَدَال أَو الدِبْق) (ن): دەموکانە. رووەکێکی مشـــەخۆرە لەســـەر لقی هەندێـــك درەختی بەردار دەڕێ وشیلەی دارەکە دەمژێت وزیانی پێدەگەیەنێــت. جۆری هەیە، هەیە بەرەکەی سپیە ولینجە لەزستاندا دەردەکەوێت لەسەر سـێوو چواڵە دەردەکەوێت. هەیشە بەرەکەی سوورە لەســـەر درەختی زەیتون دەردەکەوێت وەك هی فەلەستین.

(أَلأَهْــدَل (م) هَدْلاء(ج) هُدْل): لچی شـــۆڕی حوشتر یان لچی شۆڕ

(- مِنَ السَّــحاب): هـــەوری دامێنی هاتوو و نزیك بەزەوی.

(مِشفَرٌ أَهْدَلُ): لچی شۆڕی حوشتر.

(شَــفَةٌ هَــدْلاء): لچێکی بەســـەر چەناگەدا شۆڕەوەبوو.

(أَلهَدِيل): پیاوی ســـەرقژن (وتراوە: یەکێکە قـــژی وەك کەپەنەکـــی لێهاتبێـــت، بەیەکدا چووبێت نەدایبهێنێو نەچەوریبکات.

(رَجُلٌ هَدِيلٌ): پیاوێکی قورس.

٢-(هَدَلَ الحَمامُ أَو الغُلامُ): کۆترەکە گماندی یان کورەکە دەنگی لێوە هات.

(الهدالةُ): کۆمەڵ/ دەستە خەڵك.

(أَلهَديــل) (مص): ١-گماندنی کۆتر ٢-بەچکە کۆتر.

هَدم (هَدَمَ - البِناءَ): خانووەکەی (رووخاند، تێکدا، هەڵیوەشاند).

(ضَرَبَهُ فَهَدَمَهُ): لێیدا پشتیشکاند.

(هَدَمَ - الثَوبَ): بەرگەکەی پینەکرد.

(هُــدِمَ - الرجُلُ فی البَحرِ): لە گوزارەی ناو دەریادا تووشی سەرەگێژە بوو.

(هَــدَّمَ - البِنــاءَ): خانەکـــەی تـــەوا تێکداو رووخاند.

(- الثَوبَ): پۆشاکەکەی پینە کرد.

(تَهَدَمَ - البِناءُ): خانەکە/ بیناکە وردە وردە رووخاو هاتە خواری/ وێرانبوو.

(- الثَوبُ): جلەکە کۆنبوو.

(«تَهَدَّمَ علية غَضَباً»): بەسەریدا تووەربووو هەرەشەی خراپی لێکرد.

(تَهادَمَ - القَومُ): خوێنی یەکتریان بەفیڕۆداو کەوتنە کوشتنی یەکتری.

(إِنْهَــدَمَ البِنـــاءُ): خانەکـــە تەپیوکاولبوو/ وێرانبوو/ رما.

(أَلهـــادِم) (فـــا): تێکدەر/ رمێـــن/ کاولکەر/ رووخێن.

(هـــادِمُ اللَّذّات): نەهێڵی ئـــارەزوو هەوەس و

خۆشی/ خۆشیبڕ/ مەرگ/ مردن.
(ئیدیۆمە بۆ مردن)
(ألهَدْم) (مص): خوێنی ڕژاو بە فیڕۆ ڕۆیشتوو.
(دَمُهُ هَدَمٌ) خوێنەکە بەفیڕۆ ڕژا.
(ألهَدْم (ج) أهْدام وَهِدَم): ١-جلی کۆن یان پیناوی/ پینەکراو.
(«عَلَيهِ هِدْمٌ أوأهْدامٌ») جلی کۆنی پیناوی لەبەردایە ٢-پێڵاوی کۆن ٣-پیری بەتەمەن و پەککەوتە.
(ألهَدَم): ١-ڕووخاو/ ئەملاولای ڕووخاوی بیر هەرچی بڕووخێت و بکەوێتە ناوی/ ڕماو/ تەپیو/ کاول/ داتەپاو.
(«إنْقَضَّ هَدَمٌ مِنَ الحائِطِ») ئەوەی لەدیوارەکە ڕووخابوو بەربووەوەو کەوتەخوارێ٢-خوێنی بەفیڕۆ ڕژاو.
(«دَمُهُ هَدَمٌ»): خوێنەکەی بەفیڕۆ ڕۆیشتووە. عەرەب زوو لە پەیمانبەستن و لەسەرکردنەوەدا دەیانگوت (دَمي دَمُكَ وهَدَمي هَدَمُكَ): ئەگەر یەکێک منی کوشت تۆ خوێنگرمیت وەك چۆن خوێنگری باوك و براو ئامۆزاو کەسی نزیکتی، خۆ ئەگەر یەکێك لەسەربەرزیی و ناموسی منییدا ئەوە لەهی تۆدراوە و لەسەرم هەڵدەدەیتێ.
(شَهِيدُ الهَدَمِ): شەهیدی ژێر تەپین، ئەو کەسەیە کەدەکەوێتە بیریکەوە یان دیوارێکی بەسەردا دەڕووخێت.

(ألهَدِم): گەوجی نێرەمووك.
(ألهَدْمَةُ): ١-یەکجار وێرانکردن ٢- یەکجار جل پینە کردن ٣- یەکجار ماڵ بەفیڕۆ چوون ٤- نەرمە باران یان ڕشێنە باران.
(ألهِدْمَة(ج)هُدُوم): بەرگی دڕاو/ شڕ
(ألهَدَام): سەرەگێژەی ناو دەریا کە سەرنشینی پاپۆڕ توشیدەبێت
(ألهَدِيم): ڕوەکی ماوەی پار.
(أرضٌ مَهْدُومَةٌ): زەوییەك سووکە بارانێکی بەرکەوتبێت
(خُفٌ مُهَدَّمٌ): پێڵاوێکی کۆنی پینەکراو
(عَجوزٌ مُتَهَدِّمَةٌ): پیرێژنێکی پەککەوتەی فەوتاو.
٢-(ألمُهْدَم والمَهْدوم وَالمَهْدومَة): ماستی ترش
٣-(هَدَمَلَ - الرَجُلُ): پیاوەکە بەرگەکەی شڕو وڕکرد/ دڕاند
(ألهِدْمل): ١-بەرگە کۆنەی (دڕاو وشڕ) ٢-کۆنەی چەند ساڵە/ زۆر کۆن.
(ألهِدَمْل): جلی دڕاو/ شڕو چەند ساڵەی کۆن.
(ألهِدَمْلَة) ڕۆژگاری/ چاخی کۆن/ دێرین
٤-الهِدْمِل: تووکن.
الهَدَمْل: گردی قوچی کووڕ.
(ألهَدَمْلَةُ): ١-زەوییەکی لمینی پڕ درەخت ٢-کۆمەڵێك خەڵك.
(هدن: هَدَنَ - هُدُوناً) ١-دامرکا/ هێمنبووەوە/

سرموت،کپبوو ٢-زۆر ترساو شلبووکربوو.
(- الرَجُلَ. هَدْناً): بەقسە یان گفتێك کە نیازی نەبێت بیباتە سەر پیاوەکەی هێمنکر دەوەودایمرکانەوە.
(- الصَبيَّ): کۆرپەکەی دامرکاندو قایلکرد.
(الشيءَ): شتەکەی نایە چاڵەوەو شاردیەوە
(- فِلاناً): فیساریکوشت.
(هُدِنَ عَنكَ فُلانٌ): بەشتێکی کەم فیسارت لێقایلبوو/ رازیبوو.
(هَـدَّنَ - هُ): ١-هێمنیکـردەوە/ دایمرکانـد ٢-بەشتێك لاسـیداو لەوەی نیازی بوو لایداو وازی پێلێهێنا.
(«هَدَّنُـوهُ بالقَـول حَتَى هَدَنَ»): بەقسـە هێواشیانکردەوە تا دامرکایەوە و وازیهێنا.
(- الصَبيَّ): کۆرپەکەی/ ساواکەی بێدەنگکردو دامرکاندو قایلکرد.
(«هَدَّنَتِ المَرأةُ صَبيَّهابكَلامِها لِيَنامَ»): ژنەکە بەقسـەی خۆش منداڵەکـەی بێدەنگکردن و خلافاندوهێمنکردەوە بۆ ئەوەی بنوێت.
(هادَنَ - هُ مُهادَنَةً): ١-ئاشتیکردەوەو لەگەڵیدا ڕێکەوتەوە ٢-لەگەڵ یەك هێمنبوونەوە.
(أَهْدَنَ - الخَيلَ): ئەسـپەکەی لاواز کرد یان مەشقی پێکرد.
(تَهادَنَ - الآمرُ): کارەکە (باری ڕاسـتی خۆی وەرگرت/ ڕاستبووەوە).
(- القَومُ): ئاشتبوونەوەو ڕێکەوتنەوە.

(إنْهَـدَنَ - الرجُلُ عَن عَزمِـهِ): پیاوەکە لە سوورە خواستەکەی ساردبووەوە/ خاوبووەوە
(ألهِدْن): پیتو نازونیعمەت یان سـەوزایی و ڕوومەکی زۆر.
(ألهِدِن): شل، سست، خاو.
(ألهَدْنَة): ١-جارێك خاوبوونەوەو شـلبوون٢-ڕشێنە بارانێکی کزو کەم.
(ألهُدْنَة (ج) هُدُن): ١-ئاشتبوونەوە ٢-هێمنیو دامرکان/ سرموتن ٣-بۆماوەیەك جەنگراگرتن تالەسـەر مەرجـی ڕێککەوتنو ئاشـتبوونە پێکدێن.
(ألهِدانَـــة): ئاشـتبوونەوەو ڕێکەوتنی پاش جەنگ.
(ألهُـدُون): ١-کـپو بێدەنگـی/ متبـوون ٢-ئاشتبوونەوە.
(ألمَهْدَنَة): بێدەنگیو نارامبوون.
(ألمَهْدون)(مفـع): ١-خەوگران کەنەبۆ نەوێژ هەڵدەسـتێت ونە زوو بـۆ کارێك ڕادەپەڕێت ٢-کەودەن کەبەقسـە قایل نابێت وبەگوێیدا ناچێت.
٢-(ألهِدان (ج) هُدُّون): ١-گەوجی قسـەترن/ قسـەنەزان/ کەرترِ٢-پێگـران لـە (جەنگدا/ شەردا) وتەمەڵ.
هدي: ١-(هَدى - هُ. يَهدِي هُدىً وَهَدْياًوَ هِديَةً وَ هِدايَـةً): رابەرییکـرد/ ڕانومایکرد/ ڕێیی پیشاندا (ئەمە پێچەوانەی: گومڕایکرد).

(«هَـداهُ الطَريـقَ وَ هَـداهُ إلى الطَريـقِ وَللطريق»): ريگەکەی (نیشانداو پێناساند).

(- هُ اللهُ إلى الإيمانِ أو لِلأيمان): خودا ئیمانی خستە دڵیەوە/ ڕانومای خودا ناسییکرد.

(- الرجُلُ: ڕێگەی ڕاستی دۆزییەوە/ ڕانوما بوو.

(- فُلاناً هداءاً): پێش فیسار کەوت وڕێگەی پیشاندا.

(«جاءَتِ الخَيلُ يُهديها فَرَسٌ أشْقَر»): ئەسپەکان هاتنو چارەوێیەکی ڕەنگخەنەیی پێشەنگیانبوو/ پێشیانکەوتبوو.

(هادی - فُلاناًمُهاداةً وَهداءً): فیساری دایە پێش خۆی ڕێگەی پێشانبدات.

(«جاءَ فُلانٌ يُهادی بَيْنَ الإثنَين»): فیسار هات لەبەر بێهێزیی خۆی بەسەر دوانە کەدادەدا کەلەنێوانیاندا بوو بەلارەوە لارەوە دەڕۆیشت.

(تَهَدَّی. تَهَدّياً): داوایکردرانومای بکەن.

(«تهادی الرَجُلُ. تَهادِياً»): بێهێزانە بەتەنیا بەلارەوەلارەوە دەڕۆیشت.

(جاءَ يَتَهادی بَيْن الاثنين): هات خۆی بەسەر دوانەکەدا دابوو، دەڕۆیشت.

(إهْتَدی. إهْتداءً): ڕێگەی ڕاستی دۆزییەوە/ ڕانومابوو.

(«إهْتَدی إلى الطريـق وَأهتَـدی الطريق إلى مـكانِ كـذا»): ڕیگەکـەی دۆزییـەوە و ناسییەوە/ چوەسەر ئەو ڕیگەیەی کە دەچوو بۆ ئەو شوێنەی دەیویست.

(- الرَجُلُ): ١-پیاوەکە داوایکرد (بیخەنەسەر ڕێگەکە/ ڕانومایبکەن). ٢-لەسەر ڕێ ڕاستەکەو ڕێنوماکە مایەوە.

(- الفَـرَسُ الخَيـلَ): چارەوێکە پێشـەنگی ئەسپەکانبوو.

(إسْتَهْدی إسْتِهْداءً): ڕانومایی خواست، داوای ڕێی ڕاستی خوداپەرستییکرد.

(ألهادي (ج) هادون وَهَداة)(فا): ڕێپیشاندەر/ ڕابەر/ ڕێنوماکار/ ڕێنیشاندەر.

(ألهادی (ج) الهَوادی): ١- داردەست ٢-پێشەنگ ٣-مل/ گەردن ٤-نووکی تیرو دەمی شمشێرو دەمـی تیـغ و چەقـۆ ٥-(ح)؛ شـێر ٦-(ا ع) قەرمووڵ/ سـیپە بەرزییەکی بچووکە لەسـەر لوولـەی تفەنـگ و چەکیـتر کەلە ڕاسـتەی ئەوەوە نیشانە لەشت دەگیرێتەوە.

(هَوادي اللّيل): سەرەتاکانی شەو.

(هَوادي الإبِل): پێشـەنگی حوشـترەکان کە لەریزی حوشترەکاندایەو دەردەکەوێت.

(الهادِيَةُ(ج) هادِيات وَهَوادٍ): ١-مێی وشـەی (الهادی)یە. ٢-دار دەست٣-تاوێری دەرکەوتوو و ڕاستەوەبووی ناو ئاو٤-مل/ گەردون.

(«أقْبَلَـت هادِيـاتُ الخَيـلِ وَ هَوادِيهـا»): پێشەنگە کانی ئەسپەکان هاتن.

(ألهَدْي): (مص):١-ڕانومایيکردن/ ڕێپیشاندان ٢-ڕێباز/ ڕێگا ٣-ڕەفتارو ڕەوشت.

(ماأَحْسَنَ هَدْيَةُ): رەفتارو رەوشتی/ هەڵسوکەوتی چەند جوانە.

(«هَدى هَديَةُ»): ڕێبازو رەوشتی ئەویگرت/ رەفتاری ئەوی نواند.

(جِئتُهُ بَعد هَدْيٍ مِنَ اللَّيلِ): کاتێك چوومەلای بەشێکی شەو رۆیشتوو.

(أَلهُدى): ١-ڕێبراست دۆزینەوە/ رانومابوون/ چوونە سەر ڕێبراست ٢-ئاینپەروەریی ئاشکرا کردنو دەرخستن/ روونکردنەوە ٣-نیشانەو بەڵگەی دیار٤-ڕێی راستگرتن کە پێچەوانەی گومرابوونە (ئەم وشەیە مێیەو دەیشکرێت بە نێر).

(«هُوَ على الهُدى»): ئەو لەسەر ڕێی راستە/ ڕێی راستیگرتووە.

(الهُدى): رۆژ.

(أَلهَدْيَة (ج) هَدْيٌ): ریگاو رەوشتو هەڵسووکەوت/ رەفتار

(ماأَحْسَنَ هَدْيَتَهُ) ئای کە رەفتاری جوانە/ ڕێی باشی گرتووە

(أَلهَدْيَةُ): جۆری رانومابوونو ڕێبراست دۆزینەوە.

(أَلهَدْيَة (ج) هَدْيٌ): ریگەو هەڵسوکەوت ورەفتارو هەڵسوکەوتی چەند جوانە.

ما أَحسَنَ هِديَتَهُ: ڕەفتارو هەڵسوکەوتی چەند جوانە.

(«خُذ في هِديَتِكَ») لەسەر ئەم قسەو رەوش و رەفتارەت بڕۆ کە لەسەری بویتو لێیلامەدە.

(ضَل هِديَتَهُ) ڕێو ڕەفتاری خۆی ونکرد.

(هِديَةُ الأَمرِ وهَديَةُ الاَمرو هُدْيَةُ الاَمرِ): (لا/ رووکار)ی کارەکە

(«نظر فُلانُ هَديَةُ أَمرِهِ»): فیسار تەماشای رووکاری کارەکەیکرد.

(رَجُلٌ هِداءُ): پیاوێکی کەودەنی بێتوانا/ بێدەسەڵات.

(أَلهِداية): (مص): ١-ڕێدەرکردن/ بەچاو روونبوون. ٢-ڕێی راستی خوداپەرستیگرتن

(أَلهَدَوُّ= الهادي): ڕێپیشاندەر/ رابەر.

(أَلحَمامُ الهَدِيُّ): کۆتری نامەبەر.

(أَلهَدِيُّ)(مفع): ڕێنوما پیکراو/ لەلایەن خوداوە سەر ڕێبراستخراو.

(أَلمُهاداة): ئاشتبوونەوە کۆبوونەوە/ تەبابوونەوە ٢-(هَدَى - العَروسَ إلى بَعلِها. يَهدي هِداءً): بووکەکەی بۆ زاوا گوێزایەوە.

(هَدَّى - الهَديَّةَ لِفُلانٍ وإلَيهِ. تَهْدِيَةً): دیاریی بە فیساردا، دیاریی بۆ فیسار نارد.

(- العَروسَ إلى بَعلِها):بووکەکەی بۆ زاوا بۆ مێردەکەی گوێزایەوە.

(- الشيءَ): شتەکەی بڵاوکردەوە.

(هادا - هُ. مُهاداةً وَهَداءً): هەریەکەیان دیارییەکی بەویتریاندا یان بۆینارد.

(- فُلانٌ فُلاناً): هەریەکەیان خواردنی خۆی هێناو پێکەوە خواردنەکانیان لەشوێنێکدا خوارد.

(أَهدى - العَروسَ إلى بَعلِها. إهداءً): بووكەكەی بۆ شووەکەی گواستەوە.

(- الهَدى إلى الحَرَم): قوربانییەكەی بۆ كابەبرد.

(- لِفُلانٍ وَإلى فُلانٍ كذا): بۆ رێز لێنان ئەوەی بە فیسار دایان بەدیاریی بۆینارد.

(- الشيءَ): شتەكەی بڵاوكردەوە و جیاكردەوە.

(تَهادى - القَومُ تَهادِياً): خوێشكەل دیارییان بەیەك (بەخشی/ دا).

(«هذا شيٌ يُتَهادى»): ئەمە شتێكە خەڵك دەیكەنە دیاریی بۆ یەكتری.

(إهْتَدى) - العَروسَ إلى بَعْلِها. إهْتِداءً): بووكەكەی بۆ مێردەكەی/ شووەكەی گوێزایەوە.

(إسْتَهْدى - الشيءَ إسْتِهْداءً): داوایكرد شتەكەی بەدیاری بدەنێ.

(اَلهَدْيُ. الواحِدَة هَدْيَةُ): ١-ماڵاتێك كە بكرێت بە قوربانی و پێشكەش بەكابە بكرێت ٢-مێرد/ شووی ژنەكە.

(اَلهَدِيُّ): ١-بووك ٢-ماڵاتێك/ ئەو ئاژەڵەی (حوشتر یان مەڕ یان گا یان بزن)كە دەكرێت بە قوربانیی‌و بۆ كابە دەنێررێت٣-دیل٤-پیاوی خاوەن ژن‌و خێزان.

(اَلهَدِيَّە (ج) هَدايا وهَداوى وَهَداو): ١-مێی وشەی (اَلهَدِيّ) ١-بووك ٢-دیاری كە بۆ رێزو خۆشەویستیی دەدرێت یان دەنێرێت/ خەڵات مزگێنیی/ مژدانە/ پۆیلانە.

(اَلهُدَيّا): هاوچەشن/ لەو وێنەیە/ وەك ئەو («لَكَ عِندی هُدَيّاها»): لەم چەشنەم لاهەیە بۆ تۆ.

(اَلمِهداءُ): كەسێكە نەریتی دیاریبەخشینی هەیە.

(رجُلٌ مِهداءُ وامرأةٌ مَهداء): پیاوێكی یان ژنێكی دیاریبەخشە.

(المِهْدى): ئەو قاپەی كە دیارییەكەی لەسەر دادەنرێت یان دەخرێتە ناوو پێشكەشدەكرێت.

(اَلمُهْداة والمَهْدِيَّةُ): بووك كە بۆ زاوا دەگوێزرێتەوە.

هَذَّ: (هَذُّ هُ. هَذَذاً وهذّاً و هُذاذا): خێرا/ یەكسەر بڕی یان هەر بڕی/ لەتیكرد.

(- الحَديثَ): فەرموودەكەی یان قسەكەی گێڕایەوە.

(- بِهِ): دڵی پێوەلكا/ نووساو وازیلێنەهێنا/ لەگەڵیدا سەرومڕ بوو.

(إهْتَذَذْتُ - الشيءَ): شتەكەم خێرا كوتكوتكرد/ پارچە پارچە كرد.

(اَلهذُّ):بڕەر/ لەتكەر.

(إزميلٌ هَذٌّ): تیژوبڕەر.

(تَقولُ لِلْمُخاطَب) (هَذّاً ذَيْك): بەقسەكەرەكە دەڵێت: لێبەرەوەو بیبڕەوە.

(اَلهَذّاذ): خێرا بڕ/ تیژ.

(جَمَلٌ هَذّاذٌ): حوشتری خێرا رێگە بڕ و

پێشەنگ.
شفرَةٌ هذوذٌ: کێردی تیژو بڕەر.
٢-(ألهَذهاذ والهُذاهِذ): خێرا.
(-مِن السَیوف): شمشێری تیژی بڕەر
(قَـرَبٌ هَذْ هـاذٌ): خزمایەتیـی دووروگران دۆزینەوەی.
(ألهَذا هِذ): ئەوانەن کە چاویان بەهەرکەسێك بکەوێـت دەڵێـن: من لـە ئێـوەم و نۆکەری ئێوەم.
هذأ:١-(هَذَأ- هُ یَهْذَأ.هَـذْأً): بەخێرایی ئەوە یبڕی.
(- العَدُوَّ): دوژمنەکانی فەوتاند.
(- فُلاناً بِلِسـانِهِ: بەزمان ئازاری دڵیداو چی پێخۆشنەبوو پێیداو دایبەگوێیدا.
(- الکَلامَ): قسـەی ناتـەواو و نابە جێی زۆر کرد.
(- تِ الإبلُ): حوشترەکان لەشەکەتیدا کەوتن.
(هَذِئَ - مِنَ البَردِ یَهْذَأُ. هَذَأً): لەسـەرماندا رەقبوومەوە و مرد.
(تَهَـذَّأتِ القُرحَـةُ): برینەکـە پیسـبوو تەشەنەیکرد
(ألهَذْأَةُ): خاکەناز/ پێمەرە
(سَیفٌ هَذّاءٌ وَهُذّاءٌ): شمشێری تیژی بڕەر
٢-(هَذا): وشەیەکە لە (ذا) کە ناوی ئاماژەیەو (ها)کە بۆ ورياکردنەوەیە لێکدراوە: ئائەمە/ ئەمە.

هـنب: ١-(هَـنَبَ - الشَـجَرَ وغَـیرَهُ هَنْباً): درەختەکەی هەڵپاچی وپاکیکردەوەو چاکیکرد
(- النَخْلَـةَ): ریشـووەکانی لـەدار خورماکە کردەوە.
(- هَـنَّبَ الشَـجَرَ وغَـیرَهُ): درەختەکـەی هەڵپاچیووریێکخستو شـتیتری پاککردەوەو چاککردو پوختە کرد.
(- الشِـعْرَ): هەڵبەسـتەکەی رازانـدەوەو پوختەیکردو کەموکووڕیی تێدا نەهێشت واکە لەلای زمانپاراوەکان رەوانو رۆیشتووبێت.
(- الرَجُلَ): رەوشتی پیاوەکەی راستکردەوە و پەروەردەیکردەوە.
(تَهَـنَّبَ): ١-پوخـت و بێخـەوشو چاکبوو ٢-چاکگۆشبوو.
(- الرَجُـلُ): پیاوەکـە بە وێڵو رەوشـت و ناسکبوو.
(ألهَنَب): پاکژیی/ پوختیی/ بێخەوشیی
(ألمُهَنَّب) (مفع): ١-بەرەوشتکراو/ باشپەروەردەو گۆشکراو، تێگەیشتوو و ناسك بەوێڵ ٢-پوختەو بێخەوشو کەموکووڕیی.
(کَلامٌ مُهَـنَّب): ئاخاوتنێکی ناسـکی رەوانی بێخەوش.
(شِـعْرٌ مُهَـنَّب): هۆزانێکـی/ شـیعرێکی رەوانی پوختــەی بێکەمـو کووڕیی لەچاوی رەوانبێژاندا.
٢-(هَنَبَ - الشـيءُ هَنْباً): شـتەکە شلبووە

وەك ئاو كشا/ ڕۆیشت.

(- هَنْباً و هَذابَةً): خێرایکرد/ پەلەیکرد.

(هَنَّبَ): خێرایکرد/ گورجبوو.

(هــانَبَ. مُهاذَبَةٌ): خێرایكــرد/ گورجبوو/ خێرا بوو.

(أهْنَبَ): خێرایکرد/ گورجبوو/ خێرا بوو.

(- تِ السَــحابَةُ ماءَهــا): هەورەكــە خێــرا دایرشتە باران‌و بارانەكەی ڕۆكرد.

(فَرَسٌ هَنِبٌ): چارەوێیەكی خێرا

(إبِلٌ مَهانیبٌ): حوشترانێكی خێرا.

(مِهْذاب): حوشترێكی خێرا/ گورج.

(فَــرَسٌ أو طائِرٌ مُهَــنِّب): چارەوێیەك یان باڵندەیەكی خێرا/ گورج.

٣-(هَذَبَ - القَومُ هَذباً وهَذابَةً): خوێشگەل غەڵبەغەڵب‌و (دەنگە دەنگ)یان زۆر هات.

هــذر: ١-(هَــذَرَ - الرَجُلُ فِي كَلامِــهِ. هَذراً وَتَهْذاراً): پیاوەكە قسەی هەلەق‌و مەلەقیكرد/ قسەی وایكرد كە نابێت بكرێت.

(هَذِرَ- كَلامُهُ. هَذَراً): هەڵەوەڕییكرد/ گاڵتە جارییكرد.

(أهْذَرَ فِي مَنطِقِهِ وَفِي كَلامِهِ): قسەی هەلەق‌و مەلەق‌و ناتەواویكرد.

(الْهَذَر) (مص): قسەی هیچو پووچكردن/ زۆر وتنی نارەوای بێهوودە/ قســەی بێسەروبەرو گاڵتەجاریی كەكەس گوێی لێنەگرێت.

(رَجُلٌ هَــذِرٌ وَهَذُرٌ و هُذَرَةٌ وَهُــذُرَةٌ وَهَذَّارٌ و هَیْــذارَةٌ وَ هَیْذَرٌ وَمِهذَرٌ مِهْذَرَةٌ): پیاوێكە قســەی (تێكەڵ‌و پێكەڵ‌و بێسەروبەر) دەكات قسەیەك دەكات كە نابێت بیكات، گاڵتە جارە چەنە بازە، هەڵەوەرە.

(إمــرأةٌ و هَیذَرَةٌ وهَــذِرَةٌ - هاذِیَةٌ): ژنێكی زۆر بڵێیە، هەڵوەرە/ قسەی وادەكات كە نابێت بیكات.

(رَجُلٌ هِذریان= هَذِر): قسەی‌بێسەروبەركەرە، وڕێنــە كەرە، چەنەبــازە هەڵەوەرەو. قســە سووكە قســەی هیچ‌و پووچەو كار بێكەڵك‌و ناتەواوە/ لۆتەرەوان.

(رجــلٌ مِهْــذار): زۆر بڵــێ‌و قســەی هیچ‌و پووچكــەر/ وڕێنەكــەر یــان گاڵتەجــار/ لۆترەوان/ قسەیەك دەكات كە نابێت بیكات.

(إمْرَأةٌ مِهــذار = هاذِیَةٌ): ژنێكــی زۆر بڵێ/ چەنەبــاز/ قەرەچەن، قســەی بێســەروبەر دەكات كــە هیچی بەســەر هیچەوە نییە وەك وڕێنە بكات.

٢-(هَــذِرَ- الیَومُ. هَــذْراً): گەرمــای ئەمڕۆ تاویسەند.

(یَومٌ هاذِر): ڕۆژێكی زۆر گەرم.

٣-(هَذْرَبَ): زۆریوت‌و خێرا خێرا قســەكانی بەسەریەكدا دا.

(اَلْهُذْرُبان): قسە سووك‌و ناتەواووكاروكردەوە ناتەواو.

(اَلْهُذَیرِبی): نەریت.

٤-(هَذْرَفَ): گورجبوو/ خێرایکرد/ پەلەیکرد.
(اَلهُـذْرُوف(ج) هَذاريـف): خێـرا/ گورج/ بەپەلە.
٥-(هَذْرَم. هَذرَمَةً): ١-زۆریوت/ چەنەبزۆردا هەڵەوەرییکـرد ٢-بەپەلـە قسـەی کرد یان خوێندیەوە.
(- الرَجُلُ فِي كَلامِهِ): قسـەی بێسەرو بەری کرد و قسەی بێکەڵکی بەسەریەکدا دا.
(اَلهَذْرَمَةُ)(مص): ١-خێرا رۆیشـتن ٢-قسەی زۆرو بێکەڵککردن ٣-بەپەلە قسەکردن.
(اَلهِـذرام): چەنەباز/ زۆربڵـێ/ قەرەچەن/ هەڵەوەر.
(«رجُلٌ هِذرام»): پیاوێکی چەنەباز.
(اَلهُذارِم وَ الهُذارِمَة): کەسـێکە زۆربڵێ یان بەپەلە پەل قسە بکاتو بخوێنێتەوە.
(إمـرَأةٌ هَذْرَمـى الصَخَـب): ئافرەتێکـی (شیرەشیرکەر/ بەهاتو هاواری شەڕانی).
هذف. (هَذَفَ.هُذوفاً): پەلەیکرد/ خێرایکرد.
(رَجُـلٌ هَذِفٌ وَهَـذّافٌ وَمُهْـذِفٌ): پیاوێکی خێـرای تونـدو تیـژ/ هەڵەشـەو بەپەلە/ جرپن.
هذل: ١-(أهْذَلَ): پەلەیکرد.
(أهْذَبَ فِي مَشْـيِهِ وَأهْذَلَ): لە رۆیشـتنەکەدا چابوکییکرد، خێرایکرد.
(اَلهاذِل): نیوەشەو.
(اَلهُذْلُـول (ج) هَذالِيل): ١-پیاوی سـووکەلە و چابـوك/ تیریسـووك و گورگـی چابوكو خێرا ٢-ئەسپی درێژی قایم/ پتەو ٣-گردۆڵکە ٤- جوگەلەی بچووك ٥-وردە لم ٦-دەمردی پەتا ٧-سـەرەتای شەو یان پاشـماوەی شەو/ پاینی شەو ٨-هەوری باریك.
٢-(اَلهُذلَوغ): لچئەستور.
(اَلهُذْ لُوغَة): ناشیرین شـێوە - لەشناشرینو ناتەواو.
٣-(هَذْلَمَ): هەنگاوی وردیناو خێرا رۆیشت.
هذم: ١-(هَذَمَ - الشيءَ. هَذْماً): خێرا بڕی.
(- الرَجُلُ): خواردنەکەی خێرا خوارد.
(هاذِم): بەپەلە خۆر.
(اَلهُـذام): ١-ئازا/ دلێر/ نەبەرد ٢-شمشـێری بڕەر.
(سَنانٌ هُذامٌ): سەر نێزەی تیژ.
(شـفرَةٌ هُذمَةٌ وهُذامَةٌ): گوێزان یان کێردی دەمتیژی خێرابڕ.
(سكينٌ هَذُومٌ): چەقۆیەکەی خێرا بڕ/ تیژ.
(المِهْـذَم - مِنَ السـيوف): شمشـێری بڕەر/ لەتکەر.
٢-(هَذْمَلَ = هَذلَمَ): بە هەنگاوی وردو خێرا رۆیشت.
هـذو: (هَـذا - هُ بِالسَّـيفَ يِهْذُو هَـذْواً): بەشمشێربڕی/ لەتیکرد.
(- فِي الـكَلام): بەهـۆی نەخۆشـییەوە یان شتیترەوە وڕێنەیکرد یان بزرکاندی.

(هَذو): بزركاندن يان ورێنەكردن.
هذي. (هذى.يَهــذي هَذْياً وهَذَياناً): بەهۆی نەخۆشــییەوە یان شــتیترەوەورێنەیكرد یان بزركاندی/ قسی بێسەروبەریكرد.
(هاذِ): ورێنەكەر. بزركێن.
(الهُذاء): ورێنەكردنو قسەی بێسەروبەركردن/ بزركاندن.
(هاذى - ە مُهاذاةً): پێكەوە قســەی هەلەقو مەلەقو بێسەروبەریانكرد.
(قَعَــدَ يهــاذِي أَصْحابَهُ): دانیشــتو لەگەڵ دۆســتەكانیدا كەوتە قســەی گاڵتەجاریی و هەلەقو مەلەقو گاڵتەو گەپ.
(أَهذى - اللَّحْمَ إِهذاءً): گۆشتەكەی وا برژاند یان كوڵاند شیبوەوە.
(تَهاذى - القَومُ تَهاذِياً): قسەی گاڵتەوهەلەقو مەلەقیانكردو بەكارهێنا.
(رَجُلٌ هَــذّاءةٌ وهَذَّاءةٌ): پیاوێكــە گاڵتەبازەو قسەی بێسەروبەر زۆر دەكات وەك ببزركێنێت.
هرّ: ١-(هَرَّ - الشــيءَ،هَرّاً وهَريراً): رقی لە شتەكە بووەوەو حەزیلێنەكرد
(«فُــلانٌ هَــرَّهُ النــاسُ»): خەڵقــی قینیان لەدیمەنو كرداری فیسار بۆوەوە
(- فِي وَجهِ السائل): رووی لە سواڵكەرەكە گرژ كردو بەســەریدا گرماندی/ پێیدا هەڵشاخا/ وەك سەگ پێی وەری.
(- تِ القَوسُ): كەوانەكە دەنگی لێوەهات
(- الشَــوكُ هَــرّاً): دڕكەكە وشــكبووروەپبوو شوانەكەخۆی لێلادا.
(- الكَلْــبُ هَريــراً): ســەگەكە مرانــدی/ مرمیهات.
(- البَــردُ الكَلْــبَ): ســەرماكە نــووزەی/ قرووسكەی بەسەگەكە پەیدا كرد.
(- الكَلْــبُ الضَيْــفَ): ســەگەكە لەمیوانەكە وەڕی.
(- هَرّاً): بەدرەوشتبوو.
هارَّ - ە. مُهارَّةً: پیادا هەڵشــاخاو بەســەریدا گرماندی.
(أَهَــرَّ - الكَلْــبَ): ســەگەكەكەی هێنایــە حەپەحەپوهانیدا/ تێزیكرد.
(- بالغَنَم): بۆ سەرئاو دەنگی لەمەڕەكان كرد یان كردنیە سەر ئاو.
(الهــارُّ) (فــا): ســەگی وەڕیــو كەدانیشــی دەربخات.
(الهِرُّ): ١-رقلێبوون/ چارە نەویســتن ٢-دەنگی لێخورینی حوشتر یان بانگكردنیان بۆ سەرئاو
(الهِرُّ (ج) هِرَرَةٌ) (ح): گوربە/ پشیلە نێرە.
(هِرَّةٌ (ج) هِرَر (ح): پشیلە مێچكە/ مێپشیلە. دەوترێت وشــەی (الهِرُّ) (بۆ نێرو مێیە) (ە) دەخەنە سەر وشەكە بۆمێ.
(هُرَيْرَة) مێپشیلەی بچووك.
(لایَعرِفُ هِرٌّ مِن بِــر): ئەوەی پێیدەگەفیو ئەوەی چاكــەی لەگەڵدا دەكات جیا ناكاتەوە.

ئێمــه دەڵێین هەری لەبــری ناکاتەوە، نەقڵی بەهیچ ناشکێت/ لەو شتە نازانێت.
(اَلهُرُّ (ح): ١-شێر ٢-شیراوی زۆر.
(اَلهَــرُّ): (مــص): لــە حوشــتر یــخ کردنو دەنگکردن.
(أجِـدُ فِي وَجهِهِ هِرَّةً وَهَرِيــرَةً): رقو کینە لەچاویدا دەبینم.
(اَلهَرَّار): ١-زۆر رقو کینە لەدڵ ٢-ســەگی دڕ کەدەمدەکاتەوە و داندەردەپەڕێنێت.
(هَلَكَ من لاهَرَّارَلَهُ): هەرکەســێك دڕکداری نەبێت لەسەری بکاتەوە دەفەوتێت.
(اَلهَــرَّاران): ١-(فك) (النســر الواقِع وقَلبُ العَقرب): دوو هەســارەن: داڵی داهاتوو ودڵی دووپشك.
٢-کانــون الأَول: بەفرانبــارو کانون الثانی: ڕیبەندان/ چلەی زستان.
(اَلهَرير): (مص): مرەمری ســەگ/ مراندنی سەگ.
(أَدبَــرَ غَريــرَهَ وأقبَلَ هَريــرُهُ): گەنجەفەو کوڕێنیی نەماوەوپیربووەکەوتۆتە بەدرەفتاریی پیریی.
٢-(هَرَّ - بِسَلْحِهِ هَرَّاً): پیساییەکەیکرد/ ریا
(- الدَّواءُ سَلْحَهُ): دەرمانەکە رەوانیکرد.
(-سَــلْحُهُ هَرَّاَوَ هَراراً): تووشــی (شۆریەکی گران/ بەلەفیرە) بوو پێی مرد.
(- تِ الإبِــلُ): ١-حوشــترەکە تووشــی لــووو هەلاوساوییەکی نێوان گۆشتو پێستبوو ٢-تووشی شۆری بوو.
(المَهْــرُور): تووشــبووی لوویــەك لەنێــوان گۆشتو پێستدا.
(أَلهُــرار): ١-شــۆر بوونــی حوشــتر بەهۆی هەردەمردێکــەوە بێت٢-دەردێکــە وەك لــوو لەنێوان پێستو گۆشتەکەیدا دەبێت.
(أَلهَــرُور): بۆڵەتــرێ کەلەهێشــوە ترێکــە دەکەوێتەوە/ هەڵدەوەرێت.
٢-(هَــرْ هَرَ - تِ الضَأْنُ هَــرْ هَرَةً): مەڕەکە باعاندی.
(- الرَّجُلُ): پیاوەکە لەهیچە پێکەنی.
(- الشيءَ): شتەکەی بزواند.
(- بِالغَنَــم أَو الإبِــلِ): بانگی مــەڕەکان یان حوشــترەکانی کــرد بچنــە ســەرئاوەکە یان بردینە سەر ئاوەکە/ باعەباعی بۆ کردن.
(- علــى فُــلانٍ): دەســتدرێژی کردە ســەر فیسار.
(- هَرْ هَرَ وَ تَهَرْهَرَ - ت الريحُ): باکە گفەو وژەی لێوەهات.
(اَلهَــرْ هَرَةُ)(مــص): ١-دەنگی نــاو جەنگی هندیەکان ٢-(باعەی/ بارەی) مەڕ.
(هَرْهَرَةُ الأَسَــدِ): نەعرەتــەو زریکەی یەك لەدوای یەکی شێر.
الهُراهر (ج) هَراهِر): (ح) شــێر ٢-شیراوێکی زۆر.

(أَلهَـرْ هـار): ١-شـيراوێکی زۆر٢-(ح) شـێر ٣-کەسێکە لەهیچە زۆر پێبکەنێت.
(أَلهَرْهُور): ئاوو شـیرێکی زۆر٤-ئاوی زۆر کە هارە هار بکات.
(هَرْ هَرَةُ الماءِ): هارە هار و هاژە هاژی ئاو.
(أَلهَرْهُور): جۆرەپایۆرێکە.
(أَلهرْهـير)(ح): ١-جـۆرە ماسـییەکە٢-(ح) رەگەزە مارێکەو پیسترینیەتی.
٤-(أَلهرهِر): مەرە پیرە.
(أَلهُرْهُرَةُ): بۆڵەترێ کەلەبنی مێوەکەدا و لە هێشوەکانی هەڵوەریوە.
(الهرهار): گۆشتی لەر.
(أَلهُرْهُور): ١-بۆڵە ترێی وەریو ٢-مەرە پیرە.
هرأ: ١-(هَرَأَ في مَنطِقهِ يَهْرَأُ هَرْءً): گوفتەکەی پر لەهەڵەو قسـەی ناپەسـەندو ناشـیرین‌و نابەجێبو.
(أَهْرَأَ - الكَلامَ وَفي الكَلام): زۆربوت‌و نەیپێکا/ قسەی (قۆریکرد/ نابەجێی کرد).
(أَلهُـراء): زۆر وتن وقسـەی هیـچ‌و پووچ و بێسەروبەر/ هەڵەوەریی
(أَلهُراءُ والهُرَأُ): زۆر بلێ/ چەنەباز ورێنەکەر/ هەڵەوەر.
(إمْرَأَةٌ هُـراءَةٌ وَهُـرَأَةٌ): ئافرەتی چەنەباز/ هەڵەوەر، هەڵەوەری قسەبێسەروبەرکەر.
٢-(هَـرَأَ - البَردُ فُلاناً يَهْرَأُ هَـرْءً وَهَراءَةً): سـەرما خەریکبوبیبـات/ رەقیبکاتـەوە یان سەرما رەقیکردەوەو مراندی.
(- تِ الريحُ): باکە زۆر سارد بوو.
(- اللَّحْمَ): گۆشتەکەی وا کوڵاند شییکردەوە.
(هَرِئَ - الَّلحْمُ. هَرْءًوَهُرْءً وَ هُرُوءً): گۆشتەکە وا کوڵا شیبوەوە.
(هُرِئَ - ت المواشـيُ): پاتاڵـەکان/ ئاژەڵەکان سەرما یان گەرما کوشتنی.
(مَهْرُوءَ): پاتاڵی سەرماو گەرمابردوو
(هَـرَّأَ- البَـردُ الماشـيَةَ تَهرِئَـةً): سـەرما پاتالەکەی/ ئاژەڵەکەی کوشت.
(- اللَّحْمَ): گۆشتەکەی واکوڵاند لە ئێسقانەکە یبووەوە.
(أهرَأ- هُ البردُ أهراءً): سـەرماوالێی توندبوو خەریکبـو رەقیبکاتەوە یـان رەقیکردەوە و مراندی.
(- فُلانٌ فُلاناً): فیسار فیسارکەسی کوشت.
(- اللَّحـمَ): گۆشـتەکەی زۆرکوڵانـد تـا شیبێتەوە.
(تَهَـرَّأَتِ الماشِـيَةُ): پاتاڵەکـە لە سـەرماندا رەقبووەوە.
(- اللَّحْمُ): گۆشتەکە وا کولێنرا شیبوەوە.
(«تَهَرَّأَ الثَوبُ»): بەرگەکە شڕو وڕبوو.
(أَلهِراء): بێچوولەی دارخورما.
(أَلهَرِيءُ): گۆشـتی وا کوڵاو کە لە ئێسقانەکە بێتەوەو شیبێتەوە.
(أَلهَرِيئَةُ): ١-مێی وشـەی (أَلهَـرِيْ) ٢-چلەی

زســتان كە ئەودەمەیە تیایدا ســەرما دەگاتە ئەوپەڕی.

(هذِهِ قَرَّةٌ لَها هَرِيئَة): ئەمەو وەیشومەیەکی ســەرمای وایە کــە مــرۆڤ و ئاژەڵزیانێکی زۆریان لێدەکەوێت و هەیە پێیدەمرێت.

(اَلْهَرَأْ) (مفع): گۆشتی تەواوکوڵاو

اَلملحَق

هر(هَراکیری): شـێوە خۆکوژییەکی ژاپۆنە ئەویش بە کونکردنی سکی خۆیە.

---

هــرب ١- (هَــرَبَ. هَرْبــاً وَهُرُوبــاً وَمَهْرَباً وَهَرَباناً): هەڵات/ رایکرد/ دەرچوو.

(- فِي مَشْـيِهِ): توندتــر ڕۆیشــت/ خێراتر ڕۆیشت پێی پێدانا.

(- فِي الأَرضِ): دوور کەوتەوە، بۆشوێنی دوور ڕۆیشت.

(- فِي الأَمرِ): لەکارەکەدا خنکا/ ونبوو/ خۆی زۆر پێوەخەریککرد.

(هَرِبَ - الرَجلُ هَرَباً): پیاوەکە بەساڵدا چوو و زۆر پیر بوو/ ئیفتادە بوو.

(هَــرَّبَ - هُ): رایفراند/ هەڵیفراند/ گوریزی پێکرد/ وایلێکرد هەڵبێت.

(- الأَشــياء المنوعَــة): قاچاغچێتییکــرد/ بەدزییەوەشــتی قاچاغــی لــە شــوێنێکەوە لــە شــارێکەلە ولاتێکــە بۆ شــوێنو شــارو ولاتێکیتریبرد.

(اَلتَهريب): قاچاخچێتیی/ دزە فرێنیی، دزە فرێنیکردن.

(أَهْــرَبَ - الرَجُــلُ): ١-تۆقــیو هــەڵات یان بەبێترس هەڵات/ گوریزیکرد ٢-دورکەوتەوە/ شوێنی دووری گرتەبەر.

(- فُــلانٌ فُلاناً): فیســار فیســاری رافراند/ وایلێکر هەڵبێت/ گوریزی پێکرد.

(- تِ الريــحُ): باکە بەســەر زەویدا خشــاو خۆڵەکەی بەئاسماندا برد.

(- الرَجُلُ): خــۆی لەکارەکەدا ونکردو خۆی زۆرپێوە خەریککرد.

(تَهارَبُــوا): پێکەوە (هەڵاتــن/ قوچاندیان/ رایانکرد).

(اَلهارِب) (فا): هەڵاتوو/ راکردوو.

(«مالَهُ هارِبٌ ولا قارِبٌ»): نەکەسێك لەبەری هەڵدێتو نەکەسێکیش نزیکی دەکەوێت.واتا کەس بە هیچی نازانێت.

(هــارِبُ الماءِ عِنْدَ الزَرَّاعــين): جۆگەلەیەك لە جۆگە گەورەکەوە ئاو بۆ کشــتەکە دەبات. ئاوبدات.

(اَلمَهْرَب(مــص): دەروو/ هەڵاتگە، دەربازگە/ ئەو شوێنەی بۆی هەڵدێیت.

(«فُلانٌ لَنا مَهْرَبٌ»):فیسار دەرووی هەڵاتنمانە/ لەتەنگانەدا هەڵدێینە لای و پەنای بۆ دەبەین.

٢-(اَلهَرْبَذَة): گورگە لۆقە/ جۆرە ڕۆیشتنێکی خێرایە/ سووکەراکردن.

(اَلهَرابِذَة الواحِد هِربِذ) (فارسية):١-مەزنانی

هیندســتان یان زاناکانیان ٢-ئاگر خۆشکەران/ کارگوزارانی ئاگری ئاگرپەرستان.
٣-(اَلهُرْبُع (ج) هَرابِع):دزو گورگی سووکەڵەو چابوك.
أَلمُلحَق
هــرب (اَلمُهَــرِّب): قاچاخچــی/ کەســێکە شــتی قاچاغ دەهێنێتە ولاتــەوە یان لەولات دەریدەکات بەدزیەوە دەیگەیەنێتە ولاتێکیتر
(مُهَرِّبُ الأَسلِحَة):قاچاخچیی چەك.
(مُحتَــرِفُ التَهریــب): ئــەوەی پیشــەی قاچاخچێتی بێت.
(اُلقِيَ القَبضُ على عَدَدٍ مِن كُبار المُهَرِّبین): ژمارەیەك قاچاخچیی گەورە دەستگیر کراون.

هــرت (هَرَتَ - هُ بِالرمــحِ - هَرْتاً):نیزەی پێداکرد.
(- الثَوبَ):جلەکەی دراند/ شرو وڕیکرد.
(- عِرضَ فُلان):ناموســی فیساری (شکاند/ برد/ لەکەداریکرد).
(- اللَحْمَ):گۆشتەکەی زۆر کولاند.
(هَرِتَ الشــيءُ هَرَتاً):شتەکە دەمکراوە بوو یان فراوانبوو.
(هَرَّتَ - الشيءَ: تَهْرِيتاً):شتەکەی فراوانکرد/ کراوەیکرد.
(«هَرَّتَ شَــدَقَهُ»): لالغــاوەی هەڵهێنایەوە/ واڵیکردەوە.
(أَهْرَتَ - اللَّحمَ):گۆشــتەکەی زۆر کولاندیان برژاند.
(اَلهَرِت والهَرّات والهَروت) (ح):شێر
(اَلهَرِیت):١-فــراوان/ واڵ/ بەربلاو ٢-لالغاوە کراوە/ دەمپان/ دەمدڕاو ٣-(ح) شێر ٤-پیاوێکی دەمدڕاوی قســەو نهێنی لەدەمدا نەوەستاو و دەمپیس.
(اَلاَهْرَت):لالغاوە پان.
(اَسَدٌ أَهْرَت وأُسُودٌ هُرْت):شێری لالغاوە پان شێرانێکی لالغاوە پانو کراوە.
(اَلمُتَهارِت):دەمدڕاوی چەنەباز/ زۆر بلێ.
(اَلمُهَرَّت) (مفع):شێر.
(كلابٌ مُهَرَّتَةُ الأَشداق)سەکانێکی لاشەویلگە پانوفراوان/ دەمفراوان
(اَسَدٌ مُتَهَرِّتُ الشَدَق):شێرێکی (لاشەویلگە/ لالغاوە) فراوان و دەمدڕاو.
(هُــوَ مَهــروتُ الفَــمِ (ج) مَهاریــت):ئەو (لالغاوە/ لاشەویلگە) پانە/ دەمزلە.
هرث: ١-أَلهِرْث:جلی شڕو وڕ/ دڕاو.
٢-(اَلهَرْثَم و الهُراثِم)(ح):شێر.
(اَلهَرْثَمَة):١-ڕەشی نێوان هەردوو کونەلووتی سەگ ٢-(ح) شێر.
هرج: ١-(هَرَجَ - النــاسُ هَرَجاً): خەڵکەکە دووچــاری ئاشــوبو ئاژاوەو کوشــتنو بڕین بوون.
(- فِي الحَدیــثِ):قســەی زۆر کــرد تێکەڵو پێکەڵ دایبەسەریەکدا.

(- الفَرَسُ): چارموێكه كەوتە غارو تاویدا.
(هَرِجَ - الرَجُلُ - هَرَجاً): لەگەرماندا یان لە زۆر ڕۆیشــتنەوە هەناسەی (سوار بوو/ تووند بوو).
(هَــرَّجَ - النَبیذُ فُلاناً): مەیە كە فیســاری سەرخۆشكردوشپرزەیكرد.
(-في الحَدیثِ) (عامیة): قسەی پیكە نیناویی وایكــرد پیــی پیبكەنــن/ قســەی هەلەق و مەلەقیكرد.
(مُهَرِّج): گاڵتەبازوكۆستەبا (عامیة).
(هَرَّجَ - بِالسَّبعِ): بەسەر درندەكەدا قیژاندی و هاواری لیكردو دەریكرد.
(تَهارَجَ - القَومُ): بەگژ یەكدا چوون.
(إنْهَرَجَ - فُلانٌ مِنَ النَبیذِ): شــەراب فیساری مەستكرد، خستیو پەرێشانیكرد.
(إسْــتَهْرَجَ - لَهُ الرأيُ): راكــەی ئەو بەهێزو دروستبوو و بیسترا.
(الهَرْج) (مص) ناشووب/ پشێویی/ بەیەكداچوون/ بەیەكداادان.
(الهِــرْج): ١-گەوج ٢-هەموو شــتێكی بێهێزو ناتەواو شل.
(الهِرجَــةُ (ج) هِــرَج): ١-جــرت وفــرت و بەرەلایی ٢-كەوانی شل و نەرم.
(الهَرَّاج): زیاد رەویی/ گەرەلاوژێ لەكردەوەدا.
(فَرَسٌ هَرَّاج): ئەسپێكی زۆر توندرەو
(الهَرَّاجَــةُ): مێی وشــەی (الهَــرَّاج) كۆمەڵە خەڵكانێك هەریەكە قســەیەك دەكاو دەیدەن بەیەكدا/ گەرەلاوژێكەر (هەریەكە لە ئاشتێك دەكات).
(فَرَسٌ مِهْرَج وَمِهْراج): ئەسپی توندرەو یان كە زۆر بڕوات.
٢-(هَــرَجَ - البــابَ هَرْجــاً): دەرگاكــەی بەكراوەیی بەجێهێشت.
٣-(الهرجــابُ والهِرْجَــبُ (ج) هَراجیــب): مرۆڤی درێژو شتی درێژ.
٤-(الهَرْجَعُ): درێژی شەل
٥-(هرجَلَ): ١-لەرۆیشتندا قاچی بەیەكدا داو تێكــەڵو پێكەڵبوو/ پەیزەن ٢-هەنگاو گەورە بوو/ هەنگاو بلاو بوو.
(الهَراجیــل): ١-مرۆڤی بالابەرز ٢-حوشــتری (كەتە/ زلە).
(الهُرجُل (ج) هَراجِل): هەنگاو گەورە.
هــرد: ١-(هَــرَدَ - هُ هَرْداً): دڕاندیو شــڕو وریكرد/ لەتوكوتیكرد.
(- الشــيءَ): ١-تواناى بەســەر شــتەكەدا شكا ٢-شتەكەی بۆ تێكدان هەڵهێنایەوە، هەڵیدڕی
(- اللَّحْمَ): گۆشتەكەی وا كولاند شیكردەوە/ شیتال شیتالیكرد.
(- عِرضَهُ): ناموسی شــكاندو لەكەداریكرد، جنێوی بە ناموسیدا.
هَــرِدَ اللَّحْمُ. هَــرَداً): گۆشــتەكە هێند كولا شیتاڵ شیتاڵبوو.

(هَــرَّدَ): بەرگێکی لەبەر کرد کەبەزەعفەران یان بە رەنگی رەگێك کەزەردیلێدەرهێنن یان بە قۆری سوور رەنگکرابوو.

(- اللَّحْمَ): گۆشتەکەی زۆر کوڵاند و شیکردەوە

(أَلهِرْد): پیاوی ناجسن/ نارەسەن و رسواو سووکبوو.

(أَلهُرْد) (ن): ١-زەعفەران ٢-قوری سوور٣-رەگ کەرەنگێکی زەرد دەداتەوەو رەنگی پێدەکەن

(أَلهَرْد (مص) = الهَرْج): پێشێویی و ئاشووبەو بەیەکدادان.

(أَلهَرْدی والهُــرْداء) (ن): حەیزەران. دارێکە لقەکانی بەگۆچان یان کەلەپەل دەکرێت (وەك کورســی و شتی وەها) هەروەها لە بیناکردندا بەکاردێت.

(أَلهُرِدِيُّ): ئەوەی بە زەعفەران یان زەردەچەوە یان بە قوری سوور رەنگکرابێت.

(رجُلٌ أَهْرَدُ الشِّدَقِ): پیاوی دەمزل دەمپان.

(أَلهَرِید): هەڵقڵیشـاو بەهۆی تێکچوونەوە/ خراپبوونەوە.

(أَلهُرود): بەرگــی زەرد کە بەزەعفەران یان زەردەچەوە زەردکراوە.

٢-(«هَرادَ - الشيءَ يُهَريدُهُ هِرادَةً») (يُريدُهُ أَراد): شتەکەیدەوێت.

٣ -(أَلهَرْد) (ح): وشترمرخ.

٤-(هَرْدَبَ. هَردَبَةً): گرانپێیانەو بێتابوشتانە رایکرد.

(أَلهَرْدَبَّةُ): ١-بەساڵداچوو/ پیر ٢-زیرە کردوو/ زۆر ترسنۆك ٣-ورگلێهاتوو.

٥-(هَردَجَ - الرَجُلُ): بە پەلەرۆیشت/ خێرا رۆیشت.

هرز: (هَرَزَ- هُ هَرزاَ): توند بەدەست گوشیو دەستی پێدانا.

(- هُ) بەداریان تەختە لێیدا.

(هَرِزَ و هَرْوَزَ. هَرْزاً): فەوتاو مرد.

(تَهَــرْوَزَ - مِنَ الجوعِ): لەبرســاندا فەوتاو/ مرد.

هرس: (- هَرَسَ - الشيّ.هَرْســاً): شــتەکەی کوتاو تەواو ورد کرد.

(- الطَعامَ): خواردنەکەی بەپەلە/ بە هەڵپە خوارد.

(هَرِسَ هَرَســاً): خواردنەکەی زۆرو بێپشوو خوارد ٢-خواردنەکەی بەدزییەوە خوارد.

(أَلهَرْس)(ح): پشیلە.

أَلهَــرِس)(م) هَرِســةُ: ١- (ح) پشــیلە٢-شــێری سەرســەختی بەهێز کە نێچیرەکەی تێکبشـکێنێتو بیخوات ٣-بەرگی دراو(ئەمە لەرووی لێچواندنەوەیە).

(هَراسَةُالقَوم):نگینیو زەبروزەنگ/ بەجنگیی نەتەوە.

(لِبَني فُلانٍ هَراسَةٌ): فیسار بەرە نگیندارنو بەزەبروزەنــگو دەســەلاتن کــە دوژمنــی پێدەهارن.

(أَلهُــراس)(ح): شـێری بەهێزوبەچنگــی/ سەرسەختو زۆر خۆرو تێکشکێنی نێچیر.

(أَلهَــرّاس): ١-تونــدرەو لــەکاردا ٢-شــێری بەزەبروزەنگ/ بەهێزو زۆر خۆرو تێکشکێن ٣-هەریســەکەر/ کەســێکە کە گەنمــە کوتاو دەکات بە چێشت ٤-گەنمە کوتاو فرۆش.

(أَلهَریس): توند کوتراو.

(أَلهَریس و الهَریسَة)(ط): هەریسە، چێشتی گەنمە کوتاو بەگۆشتەوە.

(أَلأَهْــرَس): ١-توندترینو قورســترین ٢-(ح) شــێری بەهێزو بەزەبرو زەنگ و زۆر خۆرو تێکشکێن.

(رِجلُ مِهرَس): پیاوێکی زۆر خۆر.

(المِهراس (ج) مَهاریس):: دەسکەوان ٢-دەسکە دۆڵ و دۆڵ (بەردێکــە چاڵکــراوە بەبــەرد دەســکێکی بۆ کراوە، دۆڵەکە شتی بە دەسکە دۆڵەکە تێدا دەکوترێت) ٣-دەنگ، کە لە دارەو گەنمی بەدەسکێك تێدا دەکوترێت ٤-حوشتری زۆر خــۆر ٥-حوشــتری زەبەلاحــی قــورس ٦-پیاوێك کەسل لە بەشەو رۆیشتن نەکاتەوە ٢-(مَکانٌ هَرِسٌ) (م)(هَرِسَةٌ): شوێنێکە گیای سپی لێڕواوە.

(أَلهَراس. الواحِدَةُ هَراسَة)(ن): ئەکاکیایەك درەختێکی درك گەورەیــە. درەختێکە (٤٠٠) جۆری هەیە لــە ناوچە ئاویەکاندا دەڕێو بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت.

هــرش: ١-(هَرَشَ – الدَهْرُ هَرشــاً): ڕۆژگار سەخت بوو/ تووشبوو.

(هَرِشَ. هَرَشاً): بەدرەوشت بوو.

(هَــرَّشَ بَینَ الــکِلاب): ســەگەکانی لەیەك هانداو بەردا.

(- بَینَ الناسِ): خەڵکەکەی بەگژیەکدا کردو نێوانی تێکدان - بەدزمانی لەنێوانیاندا کرد.

(هارَشَ بَعضَ الکِلاب علی بَعضِها مُهارَشَــةً وَهِراشــاً): هەندێك ســەگی لەیــەك بەردا/ لەیەکی هاندان.

(- فُلانٌ فُلاناً): فیســار بەرووی فیسارکەسدا هەڵپژاو شەری لەگەڵدا کرد.

(تَهــارَشَ وأَهْتَرَش - ت الکِلابُ): ســەگەکان لەیــەك بەربــوون و پەلامــاری یەکیانــدا/ چنگیان دایە یەك.

(أَلهَرِش): در/ نەزانـدوو/ کەرتر/ بەدرەفتار.

(أَلهِراش)(مص):١-بەگژدا چوون٢-ئاشووبگێڕیی ٢-بەیەکدا دان/ جەنگین و دوژمنایەتیی.

(أَلمُهــارِش) (فا): هانــدەری بەگژیەکداکەر/ ئاشووبگێڕ/ بەگژداچوو.

(فَرَسٌ مُهارِشُ العنان): ئەسپێکە خۆشجڵەو، چابوكو ڕەوتخۆش.

٢-(تَهَرَّشَ - الغَیمُ): هەورەکە ڕەوییەوە.

٢-(هَرْشَفَ وأَهْرَشَــفَ(تِ الهرشَفَّةُ): لۆکەی ناو مەرەکەبدانەکە وشکبووەوە

(تَهَرْشَــفَ - الماءَ): ئاوەکەی تۆزە تۆزە/ وردە

وردە هەڵچنی.
(الهِرْشَفُّ): پیرێژنی بەتەمەنی پەککەوتە.
(- مِـنَ الرجـال): پیـاوی لاوازی بێهێـزو بەتەمەن ٢ـکەسێکە زۆر بخواتەوە.
(الهِرشِفَة): ١ـپیرێژنی پەککەوتەی تەمەنگەورە ٢ـمێحوشتری بەتەمەن/ بەساڵدا چوو ٣ـپارچە خوریی وشکەوەبووی ناوشووشەی مەرەکەب.
هرص(هَرِصَ.هَرَصاً): تووشـی ئاڵۆشی لەش بوو، ئاڵۆشیگرت/ لەشی ئاڵۆشی تێکەوت.
(هَرَّصَ - الرَجُـلُ): لەگەرماندا گرمەژنەی دەردا/ تووشی گرمەژنەبوو.
(الهَـرَصُ) (ح): ١ـکرم ٢ـگرمەژنەو ئاڵۆشـی گرمەژنەو خورووی.
(الَهرِیصَة): زەلکاو.
هرض)هَـرَضَ - الثَـوبَ. هَرْضاً): جلەکەی دراند.
(هَـرِضَ. هَرَضـاً): لەگەرمانـدا تووشـی گرمەژنەبوو.
(الهَـرَض): گرمەژنـە/ زیپکـەی وردوردە لەگەرمادا لەش دەریدەکات.
(هَرَّضَ): لەگەرماندا لەشی گرمەژنەی دەردا.
هرط:١- (هَرَطَ - عِرضَ فُلان وفِي عِرضِهِ. هَرْطاً): ناموسی فیساری شکاندو ئابرویبرد/ نامووسی پایەماڵیکرد/ سووکیکرد.
(- فِي الـكَلام): قسـەی ناشـیرین‌و نابەجێی (لەدەم هاتەدەری/ کرد).
(تَهارَطا): شەرەجنێویانکرد.
٢-(هَـرِطَ, هَرَطـاً): گۆشـتەکەی داکەوت‌و شلبوو بەهۆی نەخۆشیەوە یان لە تۆقینەوە
(الَهَرْط (مص) والهِرْط(ج) أهراط وهُرُوط): ١ـگۆشـتی کەفەنۆکەی بێهێزو بێکەڵك ٢ـپیاوی پارەدار کە پارە بخاتـە کارەوە ٣ـمەڕی پیری لەڕ.
(ناقَةُ هِرطُ): مێحوشترێکی بەتەمەن.
(الَهرَطَةُ (ج) هِرَطٌ): ١ـمەڕی پیری لاواز/ لەڕ ٢ـگەوجی زیرەکردووی بێتوانا.
(الَهیْرَط): خاو.
٣-(الَهرْطَقَةٌ - عند النصاری): لای دیانەکان داهێنانی تازەیەلە ئایندا.
(هَرطوقیّ): سەر بە داهێنراوان لە ئایندا.
(هَرطَقَهُ): کردی بەکەسێك سەربەداهێنەران بێت لە ئایندا.
(هَرطَقَ وتَهَرْطَقَ): بووبەکۆمەڵی داهێنەرانی شتی تازە لە ئاینی عیساییدا (یونانِیة).
٤-(الَهرُطمـانِ) (ز): گـاڵ (دانەوێڵەیەکـە لەنێوان گەنم و جۆدا). دەڵێن (جُلُبّان)ە.
هرع: (هَـرِعَ- إِلیهِ. هَرَعاً): بەشـپرزەیی‌و بەشۆکاوییەوە خێراو بەپەلە چوو بۆ لای.
(هَـرِعَ- الدَمُ. هرعـاً): خوێنەکە خێراو بە تەوژم کشا.
(- الرَجُلُ): پیاوەکە: زوو خێرا دڵی پڕبوو و گریا یان خێرا ڕۆیشت.

(هُــرِعَ - الرَجُــلُ): خێرایانپێکرد/ پەلەیان پێکرد.

(هَرَّعَ - القَوم الرماحَ): خوێشگەل نێزەکانیان ئاراستەکردو بەرەو ڕووی دوژمن ڕۆیشتن.

(هُرِّعَ - الرَجُلُ ): پەلەیان پێکردو خێرایان لێکرد.

(أهْرَعَ - الرَجُلُ): پەلەیکرد/ خێرایکرد.

(- القَــومَ رِماحَهُــم): خوێشــگەل نێزەکانیان ئاراستەکردوبەرەو ڕووی دوژمن ڕۆیشتن.

(أُهْرِعَ الرَجُلُ): پیاوەکە ١-ئاوەزی ســووکبوو ٢-پەلەی پێکرا خێرا بکات

(مُهْرَعٌ): شپرزەوپەلەلێکراو وخێرا پێکراو

(«أقْبَــلَ الشَــيخُ يُهْرَعُ»): پیرەکــە بەپەلەو شپرزەییەوە هات.

(أُهْرِعَ): پیاوەکە لەترساندا، یان لەسەرما، یان لە بێهێزیدا یان لە توورەبووندا هەڵدەلەرزی

(تَهَرَّعَ - إلَيهِ): بۆلای ئەو پەلەیکرد

(- تِ الرمــاحُ): نێــزەکان لەئامادەباشــیدا بوون/ هەڵکێشرابوون و ڕووەو دوژمن بە دەستەوە بوون.

(إهْتَرَعَ - العُودَ):چێوە کەیشکاند.

(أُسْتَهْرِعَ - تِ الإبلُ): حوشترەکان بۆ گۆلەکە تەکانیاندا.

(الهَــرِع): خوێنی دەرپەڕیــوی خێراو لەبەر ڕۆیشتوو.

(رَجُــلٌ هَــرِعٌ (م) هَرِعَــةٌ):١-پیاوێکی یان ژنێکی گرینۆک ٢-چابوک لە ڕۆیشتندا.

(الَهَرَع) (مص):١-بەشبرزە ڕۆیشتن و پەشۆکان ٢-توند (لێخورین/ ئاژۆتن).

(الَهُراع): ١-ڕۆیشــتنێکی شــپرزەیی و خێرا ٢-خێراو تیژ ئاژۆتن.

(الَهَريعَةُ): دەومنێکە پەلك باریك.

(الَمُهْرَع)(مفع): ١-هەمتــەر/ بەتەنگەوە هاتوو ٢-پەلەلێکراوو تیژ لێخورراو.

(الَمُهْروع): ١- شێت ٢-کەوتووی شەکەتیی.

٢-(الَهَرْعَــةُ وَالهَرَعَــةُ)(ح): ئەســپێ یــان مێتولکە.

٢-(الَهَــيرَع): ١-زۆر ترســنۆك و وبوودەڵــەی تۆقیو ٢-گەوج ٣-ئافرەتی جرپن/ هەڵەشە.

(ريحٌ هَيْرَعٌ): بایەکی تیژ/ توند.

(الَهَيْرَعَةُ):شمشاڵی شوان (الَهَيْرَعَة= اليرَاعَةُ)

(ريحٌ هَيرَعَةٌ): بایەکی توند کە گفەیبێت.

هرف:(هَــرَفَ - بِفُــلانٍ هَرَفــاً): فیســاری ســەیرلێهات و بەشــانوباهوویدا (هەڵیــدا/ هەڵینا) ٢-بێناسین و شارەزاێبوونی هەڵینا.

(لاتَهْرِف بِما لاتَعْرِف): کەلەشتێك نەزانیت و نەیناسێت هەڵیمەنێ.

(هَــرَفَ - تــهُ الريحُ)تاکــە بەملاوبەولادا بردی.

(- السَبعُ): دڕندەکە هەرلوورەیهات

٢-(هَــرَّفَ - تِ النَخْلَةُ تَهريفاً): دارخورماکە زوو (بەرەکــەی دابەدەســتەوە/ بەریگــرت و پێیگەیاند).

(- القَومُ إلى الصلاةِ): خوێشگەل زوو بۆ نوێژ چوون.

(أَهْـرَفَ - تِ النَخلَـةُ): دارخورماکـە زوو بەریگرتو پێگەیاند

(- الرَجُلُ): داراییەکەی زۆر بوو،، پێگەیشت

هرق ١-(هَرَقَ - الماءَ. هَرْقاً): ئاوەکەی ڕۆکرد.

(هَرَّقَ - المـاءَ): ئاوەکەی خێـرا ڕۆکردو زو ڕۆیکرد.

(هَرِّقْ علـى جَمـرِك): ئاگـری توورەییت دامرکێنەرەوە/ سارد بەرەوە.

(هَراقَ. يُهَرِيقُ - المـاءَ هِراقَةً): ئاوەکەی ڕۆ کرد، ڕشت، لەبنچینەدا وشەکە (أَراقَ و يُريقُ إراقَةً) .

(هَـرِقْ): ڕۆیکـە (لـە بنچینـەدا) (هَريقْ) بـووە بۆ دوان دەڵێن،(هَريقـا) بۆ کۆ دەڵێن (هَريقوا): ڕۆیبکەن/ بیرێژن

(هَرِيَقوا عَلَيْكُم أَوَّلَ اللَّيل): سـەرەتای شەو بەسەرتاندا دابارین.

(أَهْراقَهُ يُهْرِيقُهُ إهراقَةً): ڕژاندی/ ڕۆیکرد.

(مُهْرِيق): ڕۆکردو.

(مُهْراق وَمُهَراق): ڕۆکراو/ ڕێژراو.

(أَهْرَقَ - الماءَ): ئاوەکەی ڕۆکرد.

(تَهارَقُوا): ئاویان بەیەکدا کرد.

(إهْـرَوْرَقَ – الدَمْـعُ والمَطَـرُ. إهريراقـاً): فرمێسك یان باران هاتە خوارێ و باری/ ڕژا.

(المُهْرَق (ج) مَهارِق): ڕێژراو/ ڕۆکراو یان باریو.

(المُهْرُقـانُ و المَهْرَقـان والمُهْرَقـانُ): ١-دەریا ٢-ڕۆخی دەریا کە ئاودێتە سـەری وبەسەریدا بڵاودەبێتەوە و دەکشێتەوە و پاشماوەی تێدا دەمێنێتەوە.

(مَطَرٌ مُهَرْوِرِقٌ): بارانێکی بە خوڕ/ بەلێزمە

٢-(ألهِرَق): بەرگی شڕ/ دڕاو.

(المُهْـرَق (ج) مَهـارِق): ١-پـەڕە ٢- بەرگێکی ئاوریشـمینی سـپیی کەتـیرە تێهەڵسـووراو لووسدەکرێتو لەسەری دەنوسرێت٣-بیابانێکی تەختو لووس (بەرووی پەڕە چوێنراوە).

٤-(ألمِصْقَلَة): لووسـکەر کە بەرگ و دەفتەری پێ لووسدە کرێت (فارسية)

٣-(هَرْقَل وَ هِرْقِل) (يونانية): بێژنگ.

هــرك: (هَـرْكَل. هَرْكَلَـةً): لەســەر خۆ و بەلەنجە ڕۆیشت.

(الهَرْكَلَة): لەسەرخۆو بە لەنجەولارو خۆبادان ڕۆیشتن.

(الهَرْكَلَـة والهُرَكِلَـة و الهِرَكْلَـة وَ الهِرْكَوْلَـة و الهِرْكِيـلُ): شۆخوشـەنگێکی لـەش ریکوپێـكو بەلەنجەولار یان سمت وکەفەڵ پان کە بلەرێتەوە.

(جَمَـلٌ أورَجُـلٌ هُراكِل):حوشـترێك یـان پیاوێکی زەبەلاحی زلەوکەتە.

(هِركِل (ج) هَراكِلَة): ١-ماسی زۆر زلە ٢-(ح) سـەگی ئاویی ٣-ولاخی دەریـای کلك مەزن و قەبە ٤-شەپۆلە کۆبووەکانی دەریا کەبەیەکدا دەدەن.

هــرل: (ألهَــرَل): زاروّلــەی ژن لەمێــردی یەکەمی.

هرم (هَرِمَ.هَرَماً وَمَهْرَماً وَ مَهْرَمَةً): بێهێزو پەککەوتەوئیفتادە بوو.

(هَــرِم (ج)هَرِمون وهَرْمَــی(م) هَرِمَة (ج) هَرِمات وَهَرْمی): پیری ئیفتادەی پەککەوتە

(هَــرَّمَ - هُ الدَّهــرُ): رۆژگــار ئیفتــادەو پەککەوتەیکرد.

(- فُلاناً): فیساری مەزنکرد

(جــاءَ فُلانٌ يُهَــرَّمُ عَلَيْنا الأَمــرأو الخَبَرَ): فیسار هات کارەکە یان هەواڵەکەمان لێکەوورە دەکاتو شاخوباڵی لێپەیدا دەکات.

١-( - اللحْمَ): گۆشتەکەی وردورد جنی.

(أهْــرَمَ - هُ الدَّهرُ): رۆژگــار ١-ئیفتادەیکرد ٢-پەکیخستو بێهێزیکرد.

(تَهارَمَ - الرَجُلُ): بەدرۆ خۆی بە پەککەوتەو ئیفتادە پیشاندا و وایش نەبوو.

(إستَهْرَمَ - هُ): ١-بە ئیفتادەیدانا ٢-بەئیفتادەی هاتە بەرچاوو ژمارد.

(ألهَــرْم ألواحِــدَةُ هَرْمَــة) (ن): جــۆرە ترشۆکەیەکە ســویرییەکی تێدایە لەهەموان باشتر پاندەبێتەوەو بە زەویدا دەکێشێت.

(ألهَرَم (ج) أهْــرام وَهِرام) (هـ): قووچەك/ تەنێکــە ســێ رووی سێگۆشــەیی هەیــەو بنکەیەکی سێگۆشــەیی ســەرێکی هاوبەشیان هەیە بنکەسێگۆشەییەکە بەرامبەر سەرەکەیە قووچەك دەشــێت ســیانی بێت چواریی بێت پێنجیــی بێــت. ئەگەر بنکەکەی ســیانی، یا چواری، یا پێنجی بێت.

(إرتفاع الهَرَم): دووریی سەری قوچەکە کەلە بنکەکەیەوە دەبێتە بەرزیی.

(هَــرَمٌ مُنتَظَــم قاعدتــة مضلــع منتظم ومسقط رأسة مركز المضلع): قوچەکی رێك بنکەکــەی چەند لایەکی رێکــە. جێکەوتەی لووتکەکەی چەقی چەند لاکەیە.

(عامد الهــرم المنتظم أو علــوه المائل:بعدُ رأسه عَن َضلع من أضلع قاعدته): ستوونی هەرەمــی رێــك یــان بەرزییــە لارییەکەی. دووریی سەرەکەی لە لایەك لە لاکانی بنکەی چەند لاکەیە.

(جذع الهرم و يقال لــه هرم ناقص وهرم مخــروط، جســم حاصل من هرم أســقط منــه (أو نادراً زيــد عليه هرم ثان ينطبق رأســه وحروفُهُ علــى رأس الآول و حروفه ويقال للجذع، المتوازی القاعدتین، إذا توازی مســتویا قاعدیتــه وارتفاعــه إذ ذاك بُعدُ المســتويين): هەرەمی لووتبڕاو پێــی دەڵێن هەرەمی ناتەواوو هەرەمی لێقرتاو تەنێکە لە هەرەمێك پەیدا بووە سەرەکەی کەوتووە یان بە دەگمەن هەرەمێکی تری بەسەردا کرابێت کە سەرو لاکانی لەگەڵ ئەویتردا جووت بووبێت بەو قوچەکە ســەر قرتاوەی کــە بنکەکانیان

تەریبین، ئەگەر تەختی بنکەکەیان تەریببین بەرزییەکەی ئەوسا بریتیە لە دووری نێوان دوو ڕووە تەختە کە.

(أَلهَرِم): ئیفتادە/ ئیختیار/ کەسێکە تەواو پیربێت.

(قَدحٌ هَرِمٌ): پیاڵەیەکی دەمکەل.

(أَلهَرِمَهُ): ١-مێی وشەی (الهَرِم): ٢-مێشێر.

(إبـنُ هَرِمَة غير مصروف): منداڵی پاشە بەرەی پیرە پیاوو پیرێژن

(أَلهَرْمی): کۆتەرە داری وشك.

(أَلمَهْرَمَة)(مـص): تـەواو ئیختیـار بوونو ئیفتادە بوونو گەیشتنە کۆتایی تەمەن.

(أَلمِهْرَمَة(ج) مَهارِم): تەختەی لەسەر جنینی گۆشت یان توتنو شتیتر.

٢-(أَلهَرِم): ١-دەرونو ئاوەز/ ژیریی.

(إنَّكَ لا تَـدري بِما يولَعُ هَرَمُـكَ): نازانیت دەروونو هۆشت، ئاوەزت بە چییەوە پەیوەندو سووتاو دەبێت.

٢-(أَلهَرِم): ڕای دروست و چاك.

(أَلهُرمــان): ١-ئاوەز/ ئەقل ٢-ڕای دروسـتو بەجێ.

(أَلهَرُوم): ئافرەتی بەدی بەدرەوشتو ناجسن.

٣-(هَرْمَزَ - الرَجُلُ. هَرْمَزَة): ١-زمانبەدییکرد/ قسە چنییکرد٢-پارووەکەی وورد جووهەرچەندە لای خۆشنەبوو ٣- ورتە ورتیکرد و قسەکەی لە هاوڕێکەی شاردەوە.

(- اللُقمَـةَ): پارووەکەی لەدەمیدا هێناو بردو حەزیشی لێنەدەکرد.

(- تِ النارُ): ئاگرەکە کوژایەوە.

٤-(هَرمَسَ – وَجْهُهُ هَرمَسَـةً): ڕووی (گرژ بوو/ ترش و تاڵبوو/ مۆنبوو).

(أَلهَرْمَسَةُ): (مص): (غەڵبە غەڵب/ ژاوە ژاو/ هەراو هوریا)ی خەڵك.

(أَلهُرامِس): شێری زۆر دڕندەی پەلاماردەری خەڵك.

(هِرامِس (ج) هَرامِسَـةُ): زانای ئەستێرە و هەسارەکان/ ئەستێرەناس (یونانية).

(أَلهرمــاس = الهُرامِــس): ١-ئەسـتێرە ناس ٢-(ح) بەچکە پڵنگ

(أَلهِرمَوْس): زۆر زانێکـی خاوەن ئەزمووونی لەسەر ڕای خۆ سوور.

(أَلهِرمیــس = أَلهُرامِس): ١-شـێری زۆر دڕی پیاو خۆر ٢-کەرکەدەن/ یەککەڵە شاخ

٥-(إهْرَمَّــعَ - الرَجُلُ إهْرِمّاعــاً): ١-خێرایی لەرۆیشـتنەکەیدا کرد ٢-گرینـۆك بوو، زوو دەگریاو فرمێسکی دەڕشت.

(إهْرَمَّعَتِ العَينُ): چاوەکە زوو فرمێسکی دادا

(- فِي مَنطِقِـهِ): لەســەر گوفتەکـەی زۆر ڕۆیشتو پێوەی خەریکبوو

(- إلَيهِ): فرمێسکی درۆی بۆ هەڵڕشت.

(أَلهَرَمَّع): ١-گرینۆك ٢-پێسووك لەرۆیشتنداو خێرا.

٦-(هَرْمَلَ - هُ. هَرْمَلَةً): تووكەكەی هەڵكێشا.
(- الشَـعَرَ): توكەكەی هەڵكێشـا یان تووكی حوشترەكەی بڕی، یان پەرەكەی هەڵكێشا.
(- عَمَلَهُ): كارەكەی تێكدا.
(- تِ العَجـوزُ): پیرێژنەكـە لەبـەر پیریی پەكیكەوتو تووشبوو.
(- الوَبرُ): تووكی حوشترەكە هەڵوەری.
(ألهِرْمِـل): ١-پیرێژنـی پەككەوتەی گۆشـت داكەوتـەی تێكچوو/ خەڵەفاو ٢-مێحوشـتری پیری پەككەوتە.
(ألهُرْمُول (ج) هَرامیل): پەڵە تووكی سـەر یـان پەڕ یا كوركی حوشـتر كە بە ئەملاولای سەرەوە دەمێنێتەوە.
المُلحق
هرمـن: (ألهُرْمون (ج) هُرْمُونات): هۆرمۆن ماددەیەكـی ئەندامییـە هەندێك لووی لەش دەیرژێنێتو خوێن بۆ ئەندامەكانوشانەكانی لەشـیدەباتو وریایاندەكاتـەوە و چالاكیـان دەكات وەكـو هۆرمۆنـی لـووی دەرەقـی كە كاردەكاتـە سـەر گەورەبوونو كـۆ ئەندامی هەست.
هرن (هَرنَفَ. هَرنَفَةً): سووكە پێكە نینێك پێكەنی/ بە كزێكەوە پێكەنی.
(ألهُرْنِفَة): دەنگ لاواز و كزو فرمێسك كەم
هرو (هَرا و تَهَرَّى - هُ يَهْرو. هَرواً وتَهَرِّياً): بە كوتەك لییدا./ دایە بەر كوتەك
(ألهِراوَة (ج) هَراوی وَهُرِيٌّ و هِرِيٌّ): كوتەك كـە وەك كلكە تەورو كلكە خاكەنازەو دارێكی ئەستوورە.
٢-(هَراة): شارێكی ئەفغانستانە.
(هَرَويّ):خەڵكی یان شتی هەرات/ هەراتی.
(ألهَرَّاءُ): فرۆشیاری پۆشاكی هەراتی.
٣-(هَـروَلَ): گورگـە لۆقەیكـرد/ نیمچـە راكردنێكیرد.
هري (هَـری - هُ. يَهْرِي هَرْيـاً): بەكوتەك لێیدا.
(هَری - الثَوبَ)(عامية): جلەكەی كۆنكرد.
(إهتَری - الثَوبُ): جلەكە كۆنبوو (عامية).
(هَرَّى - الثَوبَ. تَهْرِيَةً): جلەكەی رەنگزەرد كرد.
(هاری - ه مُهاراةً): بەتیزو گاڵتە پێكردنەوە قسەیلەگەڵكرد.
(ألهِراء): بێچوولەی درەختو دارخورما.
(ألهُرِيُ (ج) أهـراء): (لاتينية) كەندوو، كە گەنموجۆو دانەوێڵەی تێدەكێت.
هزّ:١- (هَزَّ- الشيءَ وَبِالشَيءِ. هَزّاً): شتەكەی راوەشـاند/ لەرانديـەوە/ لەقەلەقی پێكرد/ لەرزانديەوە
(- مِـن عِطـفِ فُلان): سـۆزی بـۆ كارەكە بزواند/ ووروژاندیو هانیدا كە بیكات
(- بـِهِ السَـيرُ): هانیداخێـرا بـڕوات/ پێی پێهەڵگرت

(- الإِبِـلَ هَزِيــزاً): حوشـترەوانەکە بــە گۆرانیەکانی خێرای بە حوشترەکانیکرد
(- الكَوكَبُ): هەسارەکەدا داهاتە خوارێ.
(هَزَّزَ - هُ تَهْزِيزاً): رایوەشاند/ لەراندیەوە/ لەرزاندەوە/ جووڵاندی.
تَهَزَّزَ: لەرییەوە، لەرزییەوە/ جووڵایەوە.
(إهتَزَّ): لەرزییەوە/ لەرییەوە/ بزوا/ جووڵایەوە.
(- تِ الإِبلُ): حوشترەکان بەدەنگ و گۆرانیی حوشترەوانەکە کەوتنە رۆیشتن و جووڵە.
(- الماءُ فِي جَرَيانِهِ): ئاوەکە بێوەســتان کشا/ دەرپەڕی و نەوەستا.
(- إليهِ قَلْبُهُ): دڵی بۆی لێیداو پێیخۆشبوو.
(«هُوَيَهتَــزُّ لِلمَعروفِ»): ئەو بە چاکە کردن دڵیدەکرێتەوەو/ سرەوتیدەبێت.
(- الكَوكَــبُ فِي انْقِضاضِــهِ): هەســارەکە لە داهاتەکەیدا خێرابوو.
(- تِ الأَرضُ): زەویەکە گیایدەرکرد.
(- النَباتُ): گیاکە درێژبوو بزواو پەلیهاویشت.
(الْهَزَّةُ): راوەشانێك/ لەرزەیەك/ لەرەیەك.
(إمْــرَأَةٌ هَــزَّةٌ): ئافرەتێکی شــرووە درە/ بەد خــوازە و لەوەخۆشــی دەبینێــت. کۆی ئەوە (نِســاءٌ هَزَّات) (الهَــزَّةُ): ١-جــۆرە لەرەیەك بزوانێــك ٢-جۆرە رۆیشــتنێکی حوشــترە./ بەلەقە لەق رۆیشتنیحوشتر ٣-چابووکیودڵ پێگوشاد بوون ٤-شاد بە چاکە کردن و هەمیشە دڵکراوە بــوون ٥-قوڵپە قوڵپی مەنجەڵی کوڵاو
٦-گرمە گرمی هەورە گرمە.
(الْهَزائِــز): چورتومــەکان، تەنگانــەکان/ لێقەومانەکان،گیروگرفتەکان/نەهامەتییەکان (ئەم وشەیە تاکی نییە).
(الْهَزِيز) (مص): ١-گرمە گرمی هەور ٢-گڤەو وژەی با.
(الْهَزُّ والهَزَّةُ): جووڵە/ بزوە.
٢-(هَــز هَز - الشــيءَ. هَزهَزَةً): شــتەکەی (راوەشاند/ بزواند/ لەراندەوە)
(- هُ): زەبوونیکرد/ سەری پێشۆرکرد.
(تَهَزْهَزَ- الشيءُ): شــتەکە جووڵایەوە بزوا/ کەوتە لەرینەوە.
(- إليهِ قلبی): دڵم بۆی جووڵاوپێی شاد بوو.
(الْهَزاهِز): ئاشووب و پشێویی کە خەڵك توند رادەچلەکێنێت/ رادەوەشێنێت.
(فُــلانٌ شَــهِدَ الهَزاهِزَ): فیســار پشــێویی و جەنگ و ناهەمواریی و تەنگانەی زۆری دیوە.
(مــاءٌ هَزاهِــز): ئاوێکــە ســافی و پاکیــی لێدەبێتەوەو خۆشی دەدات.
الْهُزاهِز: ئاوی زۆری لەبەر رۆیشتوو
(ماءٌ هُــزا هِز): ئاوێکە ســاف و پاك روونیی دەنوێنێت.
(بَعيرٌ هُزاهِز): حوشتری بۆرە بەرز
(الْهَزْهاز): ئاوی زۆر و لەبەر رۆیشتوو
(سَــيفٌ هَزهازٌ): شمشــێرێکی/ لووس و سافی بریقە دار.

(الهُزهُز): ئاوی زۆر و لەبەر ڕۆیشتوو.
(«ماءٌ هُزْهُزٌ»): ئاوێکی ڕوونی پاک.
بئرٌ هُزْهُزٌ): بیرێکی/ چاڵاوێکی قووڵ.
(عَـینٌ هُزهُـزٌ): کانیەکی/ سـەرچاوەیەکی فراوان و ئاولێشاو
(اَلهَزهَـزَةُ) (مص): لەرزینـەوە/ لەرینەوە/ لەرزە/ لەرە ٢-ئاشـووبو پشـێویی‌و جەنگ کـە خەڵـک ڕادەچڵەکێنێـت و ئارامی‌لەبەر دەبڕێت.
(شَـهِدَ فُلان الهَزهَـزَةَ): فیسـار ئەهامەتی جەنگ و ئاشـوبو فەرتەنەی پشـێویی دیوە و چەشتووە
(هزا:هَزَاَ - هُ يَهْزَاُ.هَزْءً): شکاندی
(- إبِلَهُ): حوشترەکانی دایە بەرسەرماو مردن/ لەسەرماندا مردن/ بە سەرما کوشتنی.
(- زَيْدٌ): زەید مرد.
(- راحِلَتَهُ): کۆپانی حوشترەکەی بزواند.
(- بِفُـلانٍ ومِنْهُ. هَـزءاً وهُـزءَاً وَ هُزؤاً وَ هُـزُوءًا وَمَهْزَاَةً): گاڵتەپێکـرد/ پێیرابوارد/ لاقرتێپێکرد.
(هَزِئَ.هَزَاً): مرد.
هَـزِئَ - بِفُلان وَ مِنْهُ. هَزْءاً وهُزْءاً. وَهَزوْءًا وَمَهْزَاَةً): گاڵتە پیێکرد/ قەشـمەرییپێکرد/ پێیرابوارد.
(اَهْزَاَ إهْزاءً): بە توندوتیژیی سـەرماو سۆڵە کەوت.

(- إبِلَهُ): بەسەرما حوشترەکانی کوشت
(تِ بِـهِ دابَّتُهُ): وڵاخەکـە هەڵیگرت‌و خێرا بردی.
(تَهَـزَّأَوَ تَهَـازَأَ و اسْـتَهْزَاَ تَهَـزُّؤً او تَهازؤاً وَاُسْتِهزاءً): گاڵتەیکرد، قەشمەرییکرد.
(الهازِئُ)(فا): گاڵتەکەرگاڵتەباز.قەشمەریکەر/ بەخەڵك رابوێر.
(«هذِهِ مَفازَةٌ هازِئَةٌ بالرُكَبِ وَ هَزَّاءَةٌ بِهِم»): ئەمـە بیابانێکـە سـەخت پێـدا تێپەڕینی گاڵتەبە پەرێشانیی‌و شەکەتیی کاروانییەکان‌و رێبوارەکانیدەکات.
(هَزّاءُ و هازِئَة): گاڵتە پێکەر
(«غَـداةٌ هازِئَةٌ») سـەرلەبەیان زۆر سـاردە وەکـو گاڵتـە بەخەڵك بکات کەلەسـەرماندا هەڵدەلەرزن و لەشیان کرژ دەبێت.
(رَجُلٌ هُزَاَةٌ): پیاوێکە گاڵتەجاری خەڵکە
(هُوَ هُزْاَةٌ بينَ النـاسِ): ئەو گاڵتەجاری ناو خەڵکەوپێیرادەبوێرن.
(رَجُلٌ هُزَاَةٌ): پیاوێکە گاڵتەبە خەڵك دەکات وپێیانرادەبوێرێت.
هزب: ١-هَزْبَرَ - هُ: لەتیکرد، بڕی.
(اَلهِزَبْـرُ(ج) هَزابِـرُ): ١-ئەسـتوری کەتە/ زەبەلاح ٢-پتەوی ڕەق‌و سەخت.
(اَلهِزَبْر والهِزْبَرو الهُزابِر (ج) هَزابِر): (ح): شێر.
٢-(هَزبَلَ - الرَّجُلُ هَزبَلَـةً): تەواو نەداراو

هەژار بوو و کەوتە سواڵ.

(اَلْهَزْبَليل): کەمەکێکی بێبایەخ.

هزج:١-(هَزَجَ-المُغَنّي في غَنائِهِ):گۆرانیبێژەکە بەئاوازو هەوەسەوە گۆرانییەکەی دەچڕی یان دەیخوێندەوە ٢- ئاوازی دەشتی چڕی.

(هَـزَّجَ): بەلـەرەو هەوەســەوە ئـاوازەوە گۆرانیەکەی چڕی یان ئاوازی دەشتی چڕی.

١-(- صَوتَـهُ): دەنگی خـۆی بەرزکردەوە و بەملاوبەولایدا گەیاند.

(أَهْـزَجَ - الشـاعِرُ): هۆزانڤانەکە شـیعری لەسەر ئاوازی دەشت دانا.

(تَهَزَّجَ - الصَـوتُ): دەنگەکە بەرز بووەوە و بەملاوبەولادا گەیشـت وبەئاوازو هەوەسەوە بوو.

٢-(- تِ القَوسُ): کەوانەکە کاتی راکێشـانو بەردانی دەرەنگەی لێوە هات.

(- الرعـدُ): هەورەگرمەکـە ناڵەیلێوەهات/ ناڵەیکرد.

(اَلْهَزَجُ): ١ـگرمەی هەورە گرمە٢ـگۆرانییەکە دەشــتەکی لـەرەی هەیە٣ـدەنگێکـە جـۆش بەخەڵك دەسـێنێت/ خەڵـك دێنێتە جۆش و سـەما ٤ـهەمــوو ئاخاوتنێـك کەسـفتو بەیەکگەیشـتوو بێـت ٥ـکێشـێکی هۆزانـی عەرەبییە. کە چوار جار لەســەر (مَفاعیلن) دەوترێت ٦ـچابوکیی‌و چالاکیی‌و سووکەڵەیی لە رۆیشتندا.

(اَلْهَزِجُ): گۆرانیبێژێك کە جۆشهێنبێت.

(مُغَـنّ هَـزِجٌ): گۆرانیبێژێك کـە جۆش بە خەڵك بگرێت.بیهێنێتە هەلەکەسەما.

(فَرَسٌ هَزِجٌ): چارەوێیەکی چابوکی سووکەڵە.

(اَلأَهزوجَــة (ج) أَهازيج): گۆرانیی‌و ئاوازێك کە خەڵك بجووڵێنێت.

٢-(اَلهَزيج مِنَ اللَّيلِ): بەشێکی شەو.

هزر (هَزَرَ - هُ بِالعَصـا هَزْراً): دارکاریکرد/ بەداردەست زۆری لێدا.

(- الشـيءَ): توند دەســتی بەشــتەکەدا ناو چەسپیکرد.

(- فُلاناً) دەریکردو دەربەدەریکرد

(مَهْزُوز وهَزيز): دەرکراو دەربەدەربوو

(- بِهِ الأَرضَ): کوتای بەزەویدا.

(- البائـِع): فرۆشـیارەکە نرخی شـتەکەی تەواو گرانکردو هەڵیبڕی.

(اَلهِزر): ١ـتوند٢ـگەوجی بێبەشکراو/ بەشبڕاو

(اَلْهَزْرَةُ): تەمەڵی‌و تەوەزەلی تەواو.

(اَلْهَزْرَةُ والهَزَرَةُ. (ج) هَزَرات): زەویی‌نەرم/ تەنکە زەوی.

(رَجُـلٌ ذو هَـزَراتِ): پیاوێکە هەمیشــە لە خشتەیدەبەن و بەشبڕاویدەکەن

(رجُلٌ مِهْزَرٌ): لە هەموو شــتێکدا بەشبڕاوی دەکەن وفێڵی لێدەکەن.

٢-(هَــزَرَ - لِفُــلانٍ): بەخشــینی زۆری بــە فیساردا.

(- الرَجُلُ): بۆ ئەنجامدانی کاروپێویستەکەی پەلەیکرد.
٣-(هَزَرَ- الرَجُلُ. هَزراً): پێکەنی
٤-(ألهَزار (ج) هَزارات) (ح): بلبل/ شالول/ شالور.
٥-(هَـزْرَفَ- فِي عَـدوِهِ): لـە ڕاکردنەکـەدا گوریدایە خۆی و خێرایکرد.
(- ألهِـزْراف والهُـزارِف والهِـزْرَوْف): نێرە وشترمرخی سووکەڵەی خێرا.
(ألهَزْرَفِيُّ): بزێو/ زۆر جووڵە.
(ألهُزْروف): ١-نێرە وشـتر مرخی سووکەڵەی خێرا/ چابوك ٢-ئەندامگەورە/ کەتە.
هــزع: ١-(هَـزَعَ. هَزْعـاً): ١-خێرایکـرد/ پەلەیکرد ٢-ڕاپەڕی/ ڕاچڵەکی.
(- الشيءَ): شتەکەی شکاند.
(هَـزَّعَ - هُ. تَهْزيعـاً): تـەواو شـکاندی/ لەتوپەتیکرد.
(تَهَـزَّعَ - الرَجُلُ): پەلەیکـرد/ خێرایکرد/ دەستوبردیکرد/ ئازابوو/ گورجبوو.
(- تِ المَـرأةُ فِي مَشـيَتِها): ژنەکە بەتەکانو شپرزە ڕۆیشت.
(- تِ الإبلُ فِي سَيرِها): حوشترەکە لە ڕۆیشتندا تەکانیدایە خۆیو لەرییەوە.
(- الرَجُـلُ): پیاوەکە گـرژو مۆنبوو/ ڕووی ترشو تاڵبوو.
(إنْهَزَعَ - الشيءُ): شتەکە شکا.

(إهْتَزَعَ): ١-پەلەیکرد/ خێرایکرد ٢-ڕاپەڕی/ ڕاچڵەکی.
(السَـيف ونحوهُ): شمشـێرەکەو شـتی وەها لەرییەوە کاتێك ڕاوەشێنرا.
(ألهَزَع): ١- شـلەژان ٢-هەڵلەرزین ٣-شـپرزە بوون
(ألهُـزَع والهَزّاع) (ح): شـێر کـە ڕاوەکات نیچیرەکان زۆر تیکدەشکێنێت.
(ألهَيْزَعَة): ١-ترس ٢-هاتو هاوارو غەڵبەغەڵب لـەجەنـگـدا ٣-شـپـرزەیـی و دڵـخـوردیـیو سەرلێشێواویی.
(ألهَزيع): گەوج.
(ألمِهْـزَع): ١-کەسـێکە کە هەمـوو درەختێك بشکێنێتەوە ٢-مێکوت یان دەسکەوانو ئەوەی شتی پێدەکوتن و ورد دەکەن ٣-خۆش شکێن/ فرەشکێن.
(سَـيفٌ مُهْتَـزِع): شمشـێرێك خۆش وباش بەدەستەوە بجولێت و هەڵسوورێت.
(فَـرَسٌ مُهْتَزِع): چارەوێیەك توندغاربکات/ لەغار کردندا بەگوربێت.
٢-(تَهَـزَّعَ - لَـهُ): خـۆی لێگۆڕیو پشـتی تێکرد.
(ألهَزيع - مِـنَ اللَيلِ (ج) هُزُع): بەشـیکی شـەو یان سـێیەکی یان چوار یەکی شەو یان کاتژمێرێکی شەو.
٣-(ألهِزاع): تاك/ یەك.

(ماَفِي الجُعْبَةِ إلاسَــهْمٌ هِزاعٌ): له تیردانەكەدا تەنها. تاكە تیرێکی تێدایە.

(اَلأَهْــزَع): دواتیرکەلــە تیردانەکــەدا مــاوە ساباشبێت یان خراپ.

(«مَالَهُ أَهْزَعُ»): هیچ شتێکی نییە.

(«ماَفِي الــدارِ أَهْزَعُ»): خانوومکە کەســێکی تێدا نیە.

(مابَقيَ فِي ســنام بَعيرِك أَهْــزَعُ): کۆ پارەی حوشــترەکەت چەوریــی هیــچ تێــدا نییە و نەماوە.

هــزف: (هَــزَفَ - تَــهُ الريحُ هَزْفــاً): باکە هەڵیگردو خستیە پەناوە شاردیەوە.

هزق: (هَزِقَ. هَزَقاً): چابوکبوو/ گورجوگۆڵ بوو.

(- فِي الضَّحِكَ): زۆر پێکەنی.

(أَهْزَقَ - فِي الضَحِكِ): زۆر پێکەنی.

(اَلهَزَق): ١-چابوکیی‌و هەرزەیی‌و سووکەڵەیی ٢-توندیی ناڵەی هەورەگرمە.

(اَلهَزِق): هەورەگرمەی (بەتین/ توند/ بە ناڵە).

(- مِــنَ الرجال): پیاوی هەرزەی هەمیشــە دەمبەپێکەنین/ سووکە پیاو/ ناسەنگین.

(اَلهَزِقَــة - مِــنَ النســاءِ): ئافرەتی جرپن‌و شوێن بەخۆ نەگرتوو.

(اَلمِهْــزاق:= اَلَمــرأَة الهَزِقَــة): ١-ئافرەتــی جرپن‌ونەســرەوت لەشــوێنێکدا.جێبەخۆی ناگرێت ٢-هەمیشە پێدەکەنێت/ سەنگین نییە.

(رَجُلٌ مِهزاقٌ): پیاوێکی هەرزەی ناســەنگین کە هەر خەریکی پێکەنینەو بێرێزە

هزل: ١-(هَزَلَ. هَــزْلاًو هُزْلاً وَهُزالاً): لاواز/ لەرو بێهێزو باریك‌و بنێس.

(- تْ حالُ فُلان): بەدگوزەرانبوو/ بەدحاڵ‌و ناتەواو بوو (بەلێچواندنی لاوازبوونی لەش).

(هَــزَلَ - الدابَّةَ).هَــزْلاً): وڵاخەکەی لاوازو بێهێــز کــرد و بــاش بەخێــوی نەکــرد/ بەتەنگیەوە نەهات.

(- القَــومُ): خوێشــگەل مــاڵ‌و ســامانیان کەمیکردو کزبوو.

(- فُــلانٌ): پاتالەکــەی/ ئاژەڵەکــەی مردار بوومووەو هەژار کەوت.

(هَــزِلَ وهُزِلَ.هَزْلاً وَ هُــزْلاً وَهُزالاً): (لەر/ لاواز)و بێهێزوباریکبوو.

(مَهْزول): (لەر، لاواز) و بێهێزوباریك

(هَزَّلَ - هُ): لاوازو بێهێزیکرد.

(أَهْزَلَ - فُلاناً): فیساری لاوازو بێهێزکرد.

(- القَــومُ): خوێشــگەل ١-مــاڵ‌و ســامانیان هاتــە کــزی و کەمیکــرد ٢-لەتــاو تەنگانەو نەهاتیی، نەبوونی ماڵ‌و سامانێك کە بوویان عەماریانکردو شاردیانەوە.

(اَلهُزال)(مص)١-لەر/ کەمگۆشت‌وکەمچەوریی لەش ٢-باریك‌و بنێسیی/ رەقەڵەیی.

(اَلهَزيــل (ج) هَــزْلى): لاواز/ لــەر/ باریك‌و سیسەڵە/ رەقەڵەوبێتوانا.

(ألهَزيلــة (ج) هَزائِــل وَهَــزلى): لاوازبوون، سيسبوون، لەربوون.
(الهَزيلَة في الإبِل): لاوازیی لەناو حوشترەکاندا تەشەنەیکرد.
(ألمَهزول (ج) مَهازيل): تووشی لاوازيبوون
(أرضٌ مَهزولَةٌ): تەنگە زەوی.
٢-(هَــزَلَ - في كَلامِهِ.هَــزْلاً): ١-قســەکەی بەگاڵتە کردو شۆخییکرد ٢-قسەکەی بەراست نەبوو.
(هازَلَ مُهازَلَةً): گاڵتەیکردو بەراستی نەبوو
(- فُلاناً): گاڵتەی لەگەڵ فیساردا کرد.
(أهْزَلَ - فُلاناً): فیساری بە گاڵتە باز داناو بە گاڵتەبازی هاتەبەر چاو.
(ألهُزالَة): گاڵتەوگەپکردن/ سـوعبەتکردن، قۆشــمەبوون، گەمــەو پێکەنــین و قســەی خۆشکردن. مەشرەبخۆشیی.
(وقعت بَينَهُما هُزالَة): لەگەڵ یەکدا کەوتنە گاڵتەو قسەی خۆش و پێکەنین.
(ألهَــزّال والهِزّيل): قۆشــمە/ ســوعبەتچی/ گاڵتەباز مەشرەبخۆش.
(ألهُزَّيلى): هۆقەبازیی دەستبریی/ کەڵەکەبازیی کەبەدەستسووکیی چاوبەست لەخەڵك دەکات.
٣-(ألهَيزَلَة): ئاڵا («ســاروا وفيهم هيزَلَةٌ»): دەرۆیشتن و ئاڵاکەیان لەناودابوو.
٤-(هَزْلَجة. هَزْلَجَةٌ): پەلەیکرد.
(ألهِــزْلاج (ج) هَزالِج): ١-پەلــەکار/ گورج/ خێرا/ چابوك٢-سووکەڵە ٢-(ح) گورگ
(ألهَزلَجَةُ (مــص): ١-بەیەکداچوونی دەنگ/ غەڵبەغەڵب ٢-خێرایی/ گورجیی/ ئازایی.
ألملحق
هــزل (ألمَهْزَلَــة (ج) مَهــازِل): گاڵتەبازیی، گاڵتەجاری/ ئەوەی خەڵك دەهێنێتە پێکەنین یان وەکو گاڵتەبازییە ٢-شــانۆ گەرییەك زۆر پێکەنیناویبێــت نــەك وەك شــانۆگەریی رەخنەبازیــی پێرابواردنبێت (ألمَهْزَلَة): کاری راســتی کە ببێتە گاڵتەجاریی و ســووکایەتی پێکردن وشەی.
(مَهْزَلَة): سووككردن و رسواكردن بگەیەنێت وبە بێزارییەوە بوترێت.
(ماهــذِهِ المَهزَلَــة): ئــەم گاڵتەپێکــردن و سووکایەتیە چییە؟/ ئەم گاڵتەجاریە چییە؟

---

هــزم: ١-(هَــزَمَ - العَدوَّ. هَزْمــاً): دوژمنی شکاند/ بەسەریدا زاڵبوو وراوینا.
(- لَــهُ حَقَّــهُ): مافەکــەی (حەلووشــکرد/ خوارد).
(- فُلاناً): ١-فیســاری کوشت ٢-تیغەکەی پێدا کرد بە نیوان هەردوو ســمتیدا چوو و ناوکی دەرهێنا.
(- الشيءَ): دەستی توند لە شتەکەچەقاند و چاڵیکرد.
(- البئرَ): چاڵاوەکەی هەڵکەند.
(- تِ القَوسُ): کەوانەکە دەرەنگەی لێوەهات

(- اللَّيلُ. هُزُوماً): شــەو هەڵات/ كشـايەوە، بەرەو بەيانبوو.

(هُزِمْتُ - عَلَيهِ): سۆزمی بۆخۆی ڕاكێشا.

(هَزَّمَ-العَدُوَّ): دوژمنی تەواو شكاند و راونا.

(تَهَزَّمَ - تِ القِربَةُ): مەشــكەكە وشكەوە بوو و شەقیبرد/ قڵیشا.

(- البِناءُ): خانەكە رووخا/ تەپی/ رما

(- تِ القَوسُ وَ الرَعــدُ وَالعَصا): كەمانەكە درنگەی لێوەهــات. هەورەگرمەكە ناڵەیهات. داردەستەكە شەقەیهات.

(- تِ السُــحُبُ بِالماءِ): هــەورەكان دایانكردە باران و گرمەیان لێوەهات.

(إِنْهَزَمَ): (شكا/ بەزی)و هەڵات/ راونرا.

(- الجَيشُ): سوپاكە بەزی وشكاو راونرا.

(- تِ العَصا): داردەســتەكە قڵیشــاو شەقەی لێوەهات/ شەقەیكرد.

(إِهْتَزَمَ - الشاةَ): مەڕەكەی سەربڕی.

(- تِ الســحابَةُ بِالمــاءِ): هەورەكە دایڕشــتە باران وناڵەیهات.

(- الفَــرَسُ): چارەوێیەكە دایــە چوارناڵەو دەنگی دەبیسترا.

(- الشــيءَ): دەستی بەشــتەكە كردو پەلەی لێكرد.

(إِسْــتَهْزَمَ - الجيُوشَ): ١-ســوپاكانی شكاند/ بەســەر ســوپاكاندا زاڵبوو ٢-داوای شكاندنو ڕاونانی سوپاكانیكرد ٣-سوپاكانی دی شكاونو هەڵدێن.

(الهازِمَة(ج) هَوازِم): چورتوم/ نەهامەتیی/ بەڵا/ وەی/ ناپۆرە.

(ألهَزْم (مص) (ج) هُزوم): ١-زەویی تەخت و نزم ٢-هەوری تەنكی بێئاو.

(ألهَزَم): درنگەی كەوان.

(ألهَزَم - مِــنَ الخَيل): ئەســپی نەرمی ژێر جڵەو.

(فَرَسٌ هَزِمٌ وفَرَسٌ هَزِمُ الصَوت): ئەسپێكی حیلە بەرز كە دەنگی وەك گرمەی هەورە.

(غَيثٌ هَزِمٌ): بارانی لێزمە/ بەخوڕ.

(قِدرٌ هَزِمَةٌ): مەنجەڵێكی جۆشسەندوو.

(ألهَزَمةُ (ج) هَزْمٌ هُزُومٌ وَهَزَماتٌ): ١-جارێك شكان و هەڵاتن ٢-زەویی تەخت و نزم ٣- چاڵی سەرسنگ و ســێو، ئەگەر دەستی پێدا بنێیت و چاڵبێت.

(هَزْمَة): چاڵی بەر گەروو.

(هُزومُ الجَوفِ): شوێنی خواردنو خواردنەوە لەلەشدا/ گەدەو ڕیخۆڵەكان.

(ألهَزُوم): كەوانی زرنگاوە.

(قَوسٌ هَزُوم.بَيِّنَةُ الهُزَم): كەوانێكی بەدەنگ و زرنگەوە كە زرنگەكەی باش ببیسرێت.

(ألهَزيــم): ١-گرمەی هــەور ٢-ناڵەو گرمەی توند ٣-ئەسپی حیلە بەرز.

(جَيشٌ هَزيمٌ): ســوپایەكی بەزیو/ شــكاو و هەڵاتوو.

(غَيثُ هَزِيمٌ): بارانێکی بەخورو نەوەستاو وەك لە هەورەکان هەڵاتبێت.

(- ألهَزِيمة): تێشکان/ بەزین، هەڵاتن.

(ألهَزِيمَة (ج) ألهَزائم):چاڵاوی پڕئاو لەبەرنزمی شوێنەکەی.

(هَزِيمَة الفَرَس): ئاوو ئارەقرشتنی ئەسپ کاتی بەگورتاودانی.

(ألهّزِيمى): بەزینێکی گەورە و زۆر، تێشکانو هەڵاتن.

(ألهَيزَم): ١-زۆر قایمو سەخت ٢-شێر

(ألمُتَهَزّم): (فا): ١-تێکشکاو ٢-هەورەگرمە.

(قَصَبٌ مُتَهَزّم ومُهَزّم): قامیشی تێکشکاوی شەقبردو.

(سَقاءُ تُهَزّم ومَهزّم): کوندە یان مەشکەی وشکەوە بووی تێقوپاوو بەسەریەکداچوو.

٢-(ألمِهْزام (ج) مَهازِيم): ١-کوڵەوژ کە ئاگری پێ خۆشدەکرێت و پێشدەکرێت ٢-کورتە دار دەست ٣-چیلکەی ئاگراوی کە منداڵانی عەرەب لەبیاباندا یاری پێدەکەن.

ألملحق:

هزم (ألإنْهِزامِيّة): ورەبەردان/ ورە رووخان/ شکانی بڕوابە سەرکەوتن

(أشارَت هذة الأنباء مَوجَةً مَنَ الإنهِزامِيّة): ئەم هەواڵانە گیانی بێورەییو ورەرووخانی پەیدا کرد

(ألإنْهِزامِيّة): هەڵوێست یان دەنگو رای ئەوانەیە کە دەیانەوێت واز لە شەڕو تێکۆشان بهێنرێتو جەنگ نەکرێتو بوەستێنرێت.

---

هسّ: هَسَّ - الشيءَ. هَسّاً: شتەکەی شکاند و کۆتایی ووردیکرد.

(- نَفْسَهُ: هَساً): لەگەڵ خۆیدا دوا.

(- الكَلامَ): قسەکەی شاردەوە/ چرپاندی.

(ألهَسِيس): ١-سرپەسرپ/ سرپە/ چرپە/ چرپەچرپ ٢-خاکەی/ ووردەی هاڕراوی هەموو شتێك.

(هَيسُ الجنّ وَهَساسُها): فسە فسی جنۆکە لە شوێنی چۆڵدا.

٢-(هَسهَسُ الدِرعُ أَو الحليُ هَسهَسَةً): زرێکە یان خشڵەکە درنگە درنگی لێوەهات.

(- الحَديثَ): قسەکەی بە چرپە کردو شاردیەوە.

(- الماءُ): ئاوەکە بێ وەستانو بە شێنەیی کشا.

(تَهَسْهَسَ الدِرعُ أَو الحِليُ): زرێکە یان خشڵەکە درنگە درنگو زرنگەزرنگی لێوەهات.

(ألهساهِس): بەشەو رۆیشتن.

(هساهِسُ الناسِ): سرپەو چرپەی خەڵك.

(ألهَسْهَسَةُ)(مص): ١-درنگەو زرنگەی زرێو خشڵو شتیتر ٢-سرپەو فسەوخشەو دەنگی نزم و سووکی هەموو شتێك.

(ألهَسْهاس): ورتەو چرپەوسرپە کە نابیسترێت و تێیناگەن ٢-لەگەڵ خۆدا ورتە ورتکردن ٣-شوان کە تابەیانی ئاژەڵ

دەلەوەرێنێـت ٤-ئـەوەی بەشـەو ناخەوێت کاردەکات ورەنجدەدات ٥-قەساب.

هـش: ١-(هَـشَ - وَرَقَ الشَـجَر): گـەڵای درەختەکـەی بەیەکـدادا تا گـەڵا بوەرێت/ رایوەشاند.

(- هَشاشَـةً وَهَشاشـاً): زەردەخەنەگرتـی/ بزەگرتی/ دڵی خۆشـبوو و دڵی کرایەوە بەو چاکەیە ٢- دڵی ئاسوودە بوو/ چالاکیی نواند/ چابوکبوو.

(هَشَشْـتُ وَهَشِشْـتُ بِفُلان وَ لِفلان وَ أَهِشُّ وَأَهَـشُّ بِهِ وَلَـهُ): دڵم بەفیسـار کرایەوەو پێیشاد بووم.

(هَشَ - الخُبزُ. هُشُوشَـةً): نانەکە ناسکبوو زوو وردبوو شکا.

(- الرَجُلُ): بێورەو بێهێزو لاوازبوو

(- العودُ هَشاشاً وَهُشَاشاً): چیلکەکە/ چێوەکە ناسکبوو زوو شکا.

(- الشيءُ): شتەکەنەرمبوو، خاوبوو، فشۆڵبوو.

هَشٌ: شتی زوو شکست/ ناسك.

(هَشَّشَ - هُ): ١-لاوازو بێتواناێکرد ٢-چابوکی کردو گەشاندیەوەو دڵخۆشکرد.

(إهْتَشَ - لِكَـذا): دڵی بـەوە کرایەوە ودڵی بۆیچوو حەزیلێکرد.

(- فُـلانٌ بِـيَّ: دڵـی پێمکرایـەوە ودڵـی پێمخۆشبوو.

(إسْتَهَشَّ - هُ): بەکەم وسووك هاتە بەرچاوی، بەکەم‌وسووکیزانی.

(ألَهَشُّ) (مص): هەموو شتێکی خاووو نەرم

(«فُلان هَـشُ المَكْسِـر»): دڵنەرمە هەرچی لێداوابکەیـت دەتداتـێ (ئەمـە بە شـێوەی هەڵنان‌و داشۆرینیش دێت).

(«فُلان هَشُّ الوَجهِ»): روو خۆشەو رووکراوەیە

(«أنابـِهِ هَـشٌ بَـشٌ»): من بـەو دڵخۆش‌و دڵگوشادم.

(فَرسٌ هَشٌ): ئەسـپێکە ئاو زۆر دەردەدات/ ئەرەق زۆر دەکاتەوە.

(فَرَسٌ هَشُّ العَنان): ئەسپێکە جڵەو سووکە/ لەژێر جڵەودایە.

(خُبزَةٌ هَشَّةٌ): نانێکی ناسکەو زوو دەشکێت

(خُبْزٌ هَشاشٌ): نانێکی نەرم‌و خاوە.

(قُربَةٌ هَشَّاشَـةٌ): کوندەیەکە لەبەر تەنکیی ئاو دەردەدات.

(ناقَةٌ هَشُوشٌ وَ شاةٌ هَشوشٌ): مێحوشترێك‌و مەرێکی فرە شیرە.

(ألهَشيش): ١- وردوخاشبوو ٢-خاوی نەرم‌وشل ٣-کەسێکە کە داوای شتی لێبکەن پێیخۆشدەبێت

٢-(هَشهَشَ - الشيءَ): شتەکەی بزواند.

(ألهَشْـهاش): رەوشـتجوانی (بەدەست ودڵ/ بەخشندە).

هشر(هَشَـرَ - النـاقَةَ هَشْراً): مێحوشترەکەی تەواو دادۆشی و شـیری لەگوانیدا نەهێشت/ گوانی چۆربرکرد.

(أَلهَشَــر)(مص): ســووكيیو ناســكيی شتو تەنكيی.
(أَلهَشْرَةُ): چالاكی/ چابوكيی يان لووتبەرزيی ناز.
(شَجَرَةٌ هَشِرَةٌ وَهَشُورٌ): درەختێكە گەلاكانی زوو هەڵدەوەرن.
(أَلهَيشَــر - مِــنَ الرجــال): پيــاوی درێژی بێهێزی نەرم وبێبڕشت
هشل(هَشَلَ - تِ الناقَةُ تَهْشيلاً): مێحوشترەكە شتێك شيرەكەی دادا.
(هَشَّــلَهُ) (عامية): كارێكيكرد، لەبەردەميدا هەڵبێتو ڕابكات.
(هَشَلَ): هەڵاتو لەبەردەمی ڕايكرد.
(أَهْشَلَ - الرَجُلُ): پياوەكە وڵاخی سوارييەكەی بەبێپرسی خاوەنەكەی دابە يەكێكيتر.
(إِهْتَشَــلَ - الفَرَسَ): ســواری چارەوێكە بوو بەبێ پرسی خاوەنەكەی.
(أَلهَشــيِلَةُ): هەر وڵاخێك كە تۆ ســوارييبيت بەبێ پرسی خاوەنەكەی.
(- مِــنَ الإبِلِ و غيرها): حوشــتر يان هيتری دەستبەسەردا گيراوو زەوتكراو.
(أَلهَيْشَلَةُ): مێحوشتری قەڵەوی بەتەمەن.
هشــم: (هَشَــمَ- الشــيءَ هشــماً): شتەكەی شكاند.
هشــم: (هَشَــمَ الثَريدُ لِقَومِهِ): تێكوشينی بــۆ خوێشــگەلكرد. نانــی وردكردووڵييــە چێشتەكەوە وتێكيهەڵدا.
(هاشِم): وردكەرو تێوڵی نان.
(هَشَّمَ - الشيءَ): تەواو ورديكرد.
(- الناقَةَ): مێحوشترەكەی دۆشی.
(- فُلانــاً): ڕێــزی زۆری لــە فيســار گــرتو بەگەورەيگرت.
(تَهَشَّمَ - الشيءُ): شتەكە تەواو وردبوو.
(- الشَجَرُ): درەختەكە لەبەر وشكی شكايەوە/ شكا.
(- فلانٌ الشيءَ): فيسار شتەكەی شكاند.
(- تِ الأَرضُ): زەويەكــە لەبــەر بێبارانــی وبێئاوی بێبەربوو.
(- الناقَةَ): مێحوشترەكەی دۆشی.
(- الإبِلُ): حوشترەكان بێهێزولاوازبوون.
(- الرَجُــلَ): ڕێــزی لــە پياوەكــە گــرت و بەگەورەيگرت.
(- زَيداً): ســۆزو ميهرەبانی زەيدی خواست ودڵی ڕاگرت.
(- على فُلان): ميهرەبانيی لەگەڵ فيســاردا كردو خۆشيويست.
(«تَهَشَّــمَهُ لِلمَعروف»): چاكــی لەلای ئەوو لەويخواست.
(إِتْهَشَمَ - الشيءُ): شــتەكە شكاو وردوخــاش بوو.
(-تِ الإبِلُ): حوشترەكان لاوازبوون وكەوتن
(إِهْتَشَمَ - النَاقَةَ): مێحوشترەكەی دۆشی

(«إهْتَشَـمْتُ نَفسي لَهُ»): لێی قایلبووم بەبێ ئەوەی گوێبدەمە دادبوونی لەگەڵمدا.

(ألهاشِمَةُ): ١-مێی وشەی (الهاشم) ٢-قرنجاندنێك کە بگاتە سەر ئێسقان و بیشکێنێت.

(ألهَشْمُ (ج) هُشُوم) (مص): ١-زەوی وشکوبێبەرهەم ٢-زەویـی نـزم و تەخـت٣-وردو خاشـکردن یان شکاندن.

(ألهَشِم): بەخشندەی دڵفراوان/ بەدەستودڵ

(ألهُشُـم) (مُفْرَدُهُ هاشم): ١-ئاژەڵو حوشترە دۆشەرە شارەزاکان ٢-نەرمەشاخ/ گلەشاخ

(ألهَشِمَة): جارێك شکاندنوووردکردن

ألهَـشَـمةُ (ج) هَـشَـمـات=(ح) ألأَرويَـــة): ١-مەرەکێویی.

(ألهشام): بەخشندەیی/ جوامێریی.

(ألهَشيم= ألمَهْشوم): ١-وردوخاشکراو ٢-گژوگیاو درەختـی وشـكو وردبوو/ پـۆشو پەلاش/ رووەکی ساڵی پار کە وشکبووەو وردبووە.

(نَبتٌ هَشِيم): رووەکی وشکبوی وردبوو.

(نَبـتٌ عامِـيّ وحَطِيـم): رووەكوگیـای پارساڵیوشکەوەبووی وردبوو.

(صارتِ الأَرضُ هَشـيماً): جـی لەزەویەکەدا بـووە گیـاو رووەكو درەخـت وشـکبووەو وردبوەو شکاوە.

(ألهَشِيم): لەش لاوازو بێهێز.

(«رَجُلٌ هَشِـيمٌ»): پیاوێکی وشـکەوە بووی بێهێز.

(ألهَشِيمَة): ١-زەوییەك درەختەکانی وشکبووبێت ٢-درەختی وشکبوو.

(كَلأُ هَيْشُـومٌ): پووشو پاوەنی نەرمو وشکو ناسك.

(ناقَةٌ مِهْشَامٌ): مێحوشترێك کە زوو لەر بێت

هشو: (هاشـى - هُ مُهاشـاةً): گاڵتەی لەگەڵدا کرد.

هـصّ: ١-(هَـصَّ - الشـيءَ هَصَّـاً): ١-پێی بەشـتەکەدا ناوڤلیشـاندی ٢-پیایدا کێشـاو شکاندی ٣-توند پەنجەی پێداناو بەپەنجەکانی گرتی.

(شـيٌ هصيص وَمَهْصُوص): شـتی پێلێنراو و ڤلیشـێنراو ٢-شـتی پێداکێشـراوو شـکاو ٣-بەپەنجە گوشراوو گیراو.

(ألهَـصُّ): (مـص): هەمـوو شـتێکی رەقو سەخت.

(ألهَصيص = ألمَهْصوص): ١-پێلێنراوو ڤلیشاو ٢-پێداکێشراوو وردکراو ٣-بەپەنجە گوشراو

٢-(هَصَّصَ - الرَجُلُ): چاوی بریسکەیدایەوە

(ألهاصَةُ): چاوی فیل.

(هَصيصُ النارِ): (شەوقی/ بریسکەی) ئاگر.

٣-(هَصْهَـص - هُ. هَصْهَصَةً): توند دەسـتی پێدانا.

(ألهُصْهُـص و الهُصَاهِص): پیاوی بەهێز یان شێری بەهێز.

٤-(ألهَصْهاص): چاوبریسکەدەر/ چاوبەبریسکە.

(اَلُهَصْهَصَة): چاوی دز بەتایبەتی بەشەو

(هصب: هَصَب. هَصْباً): هەلآت/ تێیتەقاندو بۆی دەرچوو.

هصــر (هَصَرَ - الشــيءَ وبالشــيْ. هَصْراً): شتەکەی ڕاکێشاو خواریکردەوە.

(- الغُصــنَ وَ بالغُصْن): چلــی درەختەکەی چەماندەوە وشــکاندی بێئەوەی شکاویەکەی پێوە دیار بێت.

(- الشــيءَ): شتەکەیشــکاند ٢-پاڵیپێوەنــا ٣-نزیکیکردەوە.

(- قِرنَـــهُ): تەنگــی بەبەربەرەکانێکەرەکەی هەڵچنی و زۆری لێکرد.

(- اَلأَسَــدُ فریسَـــتَهُ): شــێرەکە نێچیرەکەی تێکشکاند.

(نَهَصَّــرَ - تْ أغصــانُ الشــجرةِ): لقەکانی درەختەکە شۆڕبوونەوە.

(إنْهَصَرَ)١-خوار بووەوەو ڕاکێشرا/ چەمییەوە: شۆڕبووەوە ٢-پاڵیپێوەنرا ٤-نزیکخرایەوە.

(إهْتَصَــرَ - الغُصْــنَ): لقــی درەختەکــەی ڕاکێشاوشکاندیەوە بێئەوەی پێوەی دیار بێت

(- النَخلَــةَ): هێشــووەکانی دارخورماکــەی شۆڕکردەوەو ڕێکیخستن.

(اَلهاصِــر) (ح): شــێر (چونکــە نێچیرەکەی تێکدەشکێنێت).

(اَلهُصَر= اَلهاصِر): شێر یان تێکشکێن.

(رجُــلٌ هُصَــر): تەنگپێهەڵچــنو گوشــەر (کەسیکەکە بەربەرەکانێکەرەکەی بگوشێتو تەنگی پێهەڵچنێت).

(اَلهَصِــر والهَصُــور والهَصْــوَرو والهُصَوَرَة والهَیصَــرو الهَیصــار والهَیصُــور والهَصَّار والمِهْصَــر والمِهْصار والمِهْصیرُ والمِهْتَصِر) (ح): شێر، چونکە نێچیرەکەی تێکدەشکێنێت.

(اَلهَصْرَةُ والهَصَرَةُ): مووروویەکە گوایا پیاوی پێ بەیدەستدەکرێت.

(اَلهَواصِــر والهَواصیر): شــێرە دڕندەکان کە کەپەلاماری هەمــوو گیانلەبەرێــك دەدەنو تێکیدەشکێنن تاکەکەی وشەی (اَلهَصُور).

هصــم (هَصَــمَ - هُ هَصْهمــاً): شــکاندی/ قرچاندی/ تێکیشکاند.

(نــابٌ هَیصَــمٌ): کەڵبەیەکــی تێکشــکێنی هەمووشتێك.

هصــو: (هَصــا - الرَجُــلُ یَهْصُو.هَصْــواً): تەمەنیزۆر بوو وبەساڵدا چوو.

(هاصَى - هُ مُهاصاةً): بڕبڕەی پشتی شکاند

(اَلأهْصاء): جەربەزەکان.

هضّ. (هَضَّ - الشيءَ هَضّاً): شتەکەی شکاندو ورد کرد.

(شــيءٌ هَضیض وَمَهْضُوض): شتێکی شکاوی وردکراو.

(هَضَّ - تِ الإبلُ): حوشترەکان خێرا یانکرد/ گورجبوون/ توند ڕۆیشتن.

(- فُلانُ المَشيَ): فیسار ڕۆیشتنێکی باش ڕۆیشت.

(اَلهَمِير والهَمِيرَة): پیرێژنی کەنەفت‌وفەوتاو.

(اَلهِمــار): ١-کەســێکە بــە هەمــوو جۆرێك میوانداری خەڵکبکات.

(الِهمْروَالِهمار): زۆر بڵێیەکی هەڵەوەر/ قسە بزرکێن.

(اَليَهْمُور= ١-اَلِهمار): ٢-لی زۆر

٢-(هَمْرَجَ - عَلَيه الخَبرَ): هەواڵەکەی لێچەواشە کرد/ راست ودرۆی هەواڵەکەی تێکەڵکرد.

(اَلهَمْرَجَةُ): ١-بەســەریەکدادانی راست‌ودرۆی هەواڵ و پێکەیاننی ٢-ناوێتەکردن ٣-سووکەڵیی ٤-خێرایــی/ گورجــی ٥-غەڵبەغەڵبی خەڵك‌و بەیەکدادانی دەنگیان ٦-ناراستی/ نارەوایی.

(اَلهَمْرَجان): دەنگە دەنگ وژاوەژاوی خەڵك/ غەڵبەغەڵبی خەڵك.

٣-(تَهَمْــرَشَ - القَــومُ): خوێشــگەل جمان/ جووڵان/ بزوان.

(اَلهَمْرَشَةُ): جوڵەکردن/ جمان/ بزوان

(اَلهَمْرَش): جووڵە/ جمە/ بزوە.

(اَلهَمَّــرِش): ١-پیرێژنــی بەســاڵدا چــوو ٢-مێحوشتری بەشیر/ فرەشیر.

همز: (هَمَزَ - ه‍ُ. هَمْزاً): ١-تێوەیژەندو زۆری لێکــردو پالیپێوەنا ٢-لێیدا ٣-گەســتی/ گازی لێگرت ٤-لەپاشملە بەخراپ لێیدوا.

(هَمّاز وهُمَّزَة): ١-لە پاشملە بەخراپە لەخەڵکدوو ٢-تێــوەژەنو زۆر لێکــەر ٣-پاڵپێوەنەرو هاندەر ٤-گازگر.

(هَمَزَ - ه‍ُ): شکاندی.

(- بِهِ الأَرضَ): دایبە زەویدا.

(- الفَــرَسَ): بە ئاوزەنگی لەئەســپەکەیەوە ژەند تا خێرا بڕوات و غار بکات.

(- العِنَبَ أَو رأسَــهُ): ترێکە یان سەری خۆی گوشی.

(- الشَّيطانُ الانسانَ): شــەیتان واسواسەی‌و دڵخوردیی خستە دڵی مرۆڤەکەوە.

(- الكَلِمَةَ أَو الحَرفَ): وشــەکەی بەهەمزەوە دەربڕی یان نیشــانەی هەمزەی خســتە سەر پیتەکە.

(إنْهَمَــزَ - تِ الكَلِمَةُ أَو الحَرفُ): وشــەکەیان پیتەکەی بە هەمزەوە دەربڕی یان نیشــانەی هەمزەی بۆ دانا وخستەسەر.

(اَلهامِــز: (فــا) (ج) هَمَّــاز وَهامِــزون): ١-خەوشلێگر ٢-لەپاشملە لێدوو/ زەمکەر.

(اَلهَمْز): (مص): خەوشــلێگرتن‌و لەپاشــملە بەخراپە لێدوان.

(هَمْزُ الشَيطان): شێتیی/ دێوانەیی/ تێکچوون.

(اَلهَمْزَةُ (ج) هَمَزات): ١-جارێك غەیبەتکردن ٢-جارێك تێوەژەندن.

(هَمَزاتَ الشَيطان): واسواسیی ودڵخوردی کە شەیتان دەیخاتەدڵەوە.

(اَلهَمْزَة): یەکەمین پیتی عەرەبییە.

(اَلهُمَزَةُ): ١-تیرو تەشــەر هاوێژ، خەوشــلێگر ٢-لە پاشملەبە خراپە دوو/ غەیبەتکەر.

(رَجُــلٌ هُمَزَةٌ إمــرأةٌ هُمَــزَةٌ): پیاوی (تیرو توانج/ تەشەر) هاوێژو غەیبەتکەر. ژنی (لە پاشــملە بەدگۆو لەمو لەو خەوشدەرهێنەر/ تیرو توانج هاوێژ).

(ریــحٌ هَمَــزَی): بایەکی بە (لــووره/ گفە/ وژە)ی توند.

(قَوسٌ هَمَزی): کەوانی توندو بەهێز/ چاك تیر هاوێژ.

(ألهَمَّــاز): ١-تیروتوانجهاویژ ٢-خەوشــلێگرو زەمکەری ئەمو ئەو.

(قَوسٌ هَمُوزٌ): کەوانێکی چاك تیر هاوێژ.

(رجلٌ هَمیزُ الفُؤادِ): پیاوێکی دڵوریا.

(أَلمِهْمَز و المِهماز (ج) مَهامِزو مَهامِیز): ١-هۆی تێوەژەنــدن/ نەقیزە ٢-ئاوزەنگی کەبەپشــت پاژنەی پێڵاوی ســوارەکەوەیە لە ولاخەکەی پێ تێوەدەژەنێت.

(أَلمِهْمَزَة): ١-قامچی ٢-نەقیزە/ داریکە سەرێکی بزمارێکی پێوەیە پێی لە ولاخەوە دەژەنرێت.

(هَمس)هَمَسَ - الصَوْتَ. هَمْســاً): قسەکەی بەچرپەکرد/ سرپاندی/ دەنگەکەی شاردەوە.

(- إليَّ بَحدیثِهِ): بە چرپە لەگەڵمدا دوا.

(- الطَعامَ): بەدەمداخراوییەوە خواردنەکەی خواردو جوو.

(- الشَیطانُ): شەیتان (دڵخوردیی خستەدڵەوە/ وەسوەسەیکر).

(- بِالقَــدَمِ): (بەبــێ تەپەی پێ/ بێخشــپە) ڕۆیشت.

(- الرَجُلُ): پیاوەکە بێســتییو خاوە خاو/ گورجانە بەشەو ڕۆیشت.

(- العِنَبَ): تریکەیگوشی.

(- الشيءَ): شتەکەیشکاند.

(هامَسَ - هُ مُهامَســةً): بەچرپە نهێنیەکەی پێوت/ چرپەچرپی لەگەڵدا کرد.

(تَهامَســا): رازیــان بەچرپــە، بەیەك گوت/ بەگوێی یەکدا چرپاندیان.

(أَلهَمْــس): ١-چرپــە چرپ/ چرپە/ ســرپە سرپ/ سرپە ٢-بێخشپەو بێتەپە ڕۆیشتن.

(«هُو یَطَأُ الأرضَ هَمْســاً»): ئــەو بێتەپە/ بێخشپە دەروات.

(«هویَتَکَلَّم هَمْساً»): ئەو بەچرپە دەدوێت.

(«هُوَ یَأکُلُ هَمْساً»): بێملچە ملچ خواردنەکە دەجوێتو دەم دادەخات.

(«أَخَذْتُهُ أَخْذاً هَمْســاً»): بەبێچرپەو خشپە توند گرتم.

(أَلهَمَّاس): ١-زۆر بە چرپەو بێخشــپە بدوێت و بڕوات/ کەســیکە زۆر بە چرپە قسە بکات ٢-شێری تێشکێنی نێچیرەکەی.

(أَلهَمُــوس): ١-بەشــەو ڕۆیشــتوو ٢-شــێری تێکشکێن ٣-شیری بەبێ خشپە ڕۆیشتوو.

(أَلهَمیــس): ١-ڕۆێشــتنی بێخشــپەو تەپەو بێدەنگ ٢-دەنگی گوێزانەوەی پێی حوشتر.

(أَلمَهْموس)(مفع) - مِنَ الــکلام): ئاخاوتنی

شارراوه بەچرپەو نهێنی.
(- مِـنَ الحُـروف - غَـير المجَهُـور): تیپە دەنگنزمـەکان کـە دەبیتـن (ح. ث. ه. ش. خ. ص. ف. س. ك. ت). هەموویـان لـەم رسـتەیەدا کۆ دەبنەوە (حَثُّهُ شَخصٌ فَسَکَتَ)
همش (هَمَشَ - الشَـيءَ. هَمْشـاً): شتەکەی کۆکردەوە.
(- فلاناً): فیساری گەست.
(هَمَـشَ وَهَمِشَ - الرَجُلُ هَمْشـاً وهَمَشـاً): پیاوەکە قسەیەکی زۆری ناراستو بێسەروبەری کرد.
(- القَـومُ): بـەدەم قسـەکردنەوە کەوتنـە جووڵە.
(- الجرادُ): کوللـەکان کەوتنە جموجۆڵ بۆ هەستانو راپەرین.
(هامَشَ - ه مُهامَشَةً): پەلەپیێکرد/ پەلەپێکرد.
(تَهَمَّشَ - الشيءُ): شتەکە سواو خورا.
(- مَنْبَطُ البِئْرِ): سـەرچاوەی چاڵاوەکەناوی کێشایە چاڵاوەکەوە.
(تَهامَـشَ - القَـومُ): خوێشـکەل بەیەکـدا چوون وکەوتنە جموجووڵ/ کەوتنە جووڵەو رۆیشتن.
(إهْتَمَشَ - القَومُ): تێکەڵیەکبوون و کەوتنە جموجوولو هاتن.
(- تِ الدابَّـةُ أَو الجَـرادُ): وڵاخـەکان یـان کوللەکان کەوتنەبزاوتنو کشان.

(الهامِـش) (فـا): ١ـکۆکـەرەوە ٢ـگازگـر ٣ـپەراوێزی (پەرتووك/ کتێب یان نامە).
(اَلْهَمْش) (مص): خێرا خواردن.
(اَلْهَمِش): دەستو پەنجە گورج لەکارکردندا
(إمْرَأةٌ هَمَشى أو هَمَشى الحَديثَ): ئافرەتێکی سـازندەی بەگرمە گرمو قەڵەباڵغ/ بەقسـەو باس.
(اَلْهَميشة): کوللەی لێنراو.
أللمُلْحَق
همـش: (هَمَّـشَ - الكِتـابَ): پەراوێزی بۆ نوسراوەکەیان کتێبەکە کرد. واتا لەپەراوێزی نوسـراوەکە یان کتێبەکەدا ئەوەی نووسی کە پێویستبوو.

---

همط: (هَمَطَ - الرَجُـلُ هَمْطاً): ١ـپیاوەکە زۆرداریکرد/ سـتەمیکرد ٢ـبەدەربەسـەوە/ بەتەنگەوە نەهات چی وتو چی خوارد.
(- الشيءَ): شتەکەی لە گۆترە برد.
تَهَمَّطَ واهْتَمَطَ المالَ: ماڵەکەی بەزۆر برد.
(- المالَ): شتەکە یان داراکەییەی بە زۆر برد
(- عَرضَ فُلان): ناموسـی فیساری شکاندو ئابروویبرو تێر جنێویکرد.
(- الذِئـبَ الشـاةَ): گورگەکـە مەرەکەیبرد/ فراند.
(اَلْهَمّاط): زۆر دار/ ستەمکار.
همـع: ١-(هَمَـعَ -ـتِ العَـينُ هَمْعـاً وَهَمَعاً وهُمُوعاً وهَمَعاناً وَتَهْماعاً): چاوەکە فرمێسکی

(داهێشت/ ڕشت).
(«هَمَعَتِ العَينُ بِالدَّمع»): چاوەکە فرمێسکی ڕشت.
(هَمَعَ الطِلُّ على الشَجَرَةِ): ئاونگ/ شەونم یان نمەباران لە درەختەکە باری.
(- رَأسَهُ): سەری قرنجاند.
أَهْمَعَ - الدَمْعُ و نَحْوُهُ): فرمێسك وشتیتر: ڕژا/ داهاتە خوارێ.
(- الطِلُّ): نمرمەبارانەکە یان شەونمەکە کەوتە سەر درەختەکە/ لەدرەختەکە باری.
(تَهَمَّعَ - الطِلُّ): نمرمەبارانەکە یان ئاورنگەکە/ شەونمەکە باری/ هاتە خوارێ/ ڕژا.
(- الرَجُلُ): بەزۆر گریانی بەخۆی هێنایان بەگریاو خۆی پێشاندا.
(- الدَمعُ وَنَحوُهُ): فرمێسکەکە داهاتە خوارێ.
(اَلهامِعَةُ (ج) هَوامِع): مێی وشەی (الهامِع).
(دموعٌ هَوامِعٌ): فرمێسکی ڕژاو/ لەبەر ڕۆیشتوو/ داهات.
(سَحابٌ هَمِع): هەوری باراندارشتوو.
(عَينٌ هَمِعَةٌ): چاوێکی بەفرمێسك/ فرمێسکدارشتوو/ گریاو.
(اَلهَموع): لەبەر ڕۆیشتوو/ کشاو.
(اَلهَيْمَع): زوو مردن خێرا مردن.
٢-(اُهْتُمِعَ - لَونُهُ):ڕەنگی گۆڕا/ ڕەنگی پەڕی.

همغ (هَمَغَ - رَأسَهُ هَمْغاً): سەری قرنجاند/ شکاند.
(إنْهَمَغَ - ت الرطبةُ): فەریکە خورما کە قرنجا قڵیشا/ شەقیبرد.
(- تِ القُرحَةُ): دوومەڵەکە تەربوو.
(اَلهَمْيَغ): ١-مردن/ زوو مردن.
همك: (همك - هُ في الأَمرِ هَمْكاً): لە کارەکەدا زۆری لێکرد و پێیلێداگرت کە زوو ئەنجامی بدات.
(تَهَمَّكَ و انْهَمَكَ في الأَمرِ): بۆ کارەکە لێبڕاو کوششی زۆریکرد/ لەسەری هەتەربوو.
(إهماكَ - الرَجُلُ إهْمِيكاكاً): پیاوەکە ڕقی زۆر هەستا/ دەمارگیر بوو.
(مُهْمَئِكٌ): دەمارگیر/ شێتگیر/ زۆر تووڕە.
همل: ١-(هَمَلَ - تِ الإبِلُ هَمْلاً): حوشترەکان بەشەوو ڕۆژ بەرەڵا کران.
(إبلٌ. هامِل (ج) هَوامِل وهُمولَة وهامِلَة وهَمَل وَهُمَّل وَهُمّال وَ هَمَلی): وشتری بەشەوو ڕۆژ بەرەڵا و لێنەپرسراو.
(- ت عَينُهُ. هَمْلاً وَهَمَلاناً وهُمولاً): چاوی فرمێسکی بەخوڕ پێدا هاتە خوارێ.
(- تِ السَماءَ): بێپشوو و بێدەنگ لەسەر خۆ ئاسمان بارانی باراند.
(أَهْمَلَ - هُ): پشتگوێیخست (بەدەربەسیەوە/ بەتەنگیەوە) نەهات فەرامۆشیکرد/ وازی لێهێناو بەکاری نەهێنا، بەئارەزوو یان بە

بیرچوونەوە.
(- أمْــرَهُ): کارەکــەی بــاش دانەمەزرانــد/ کەمتەرخەمیی لە کارەکەیدا کرد.
(- الحَــرفَ): پیتەکەی بێســەرو بۆر کرد و ڕێزمانی پشتگوێخست.
(تَهامَــل - فِي الأمــرِ): (عامية): تەمەڵیی و سستیی لە نەنجامدانی کارەکەدا کرد.
(إنْهَمَــلَ - ت عَينُهُ): چاوی لە فرمێســك پڕ بووو بەخور لێیهاتە خوارێ.
(- تِ الســماءُ): سەرومڕ ئاســمان باراندی و بارانەکەی خۆشینەکردەوە.
(ألهِمْل): بەرگی (پینەکراو/ پێناوی).
(ألهَمَــلَ): ١-ئــاوی کشــاوی بێبەربەســت/ پێگیرو گرفت ٢-ڕیشاڵی لێکراوەی درەخت.
(- مِــنَ الإبِل): حوشــتر گەلێك کە بێشــوان بەرەڵا کراوە تا بەشەوو ڕۆژ بلەوەڕێت.
(ألهِمِلُّ): تەمەنزۆر/ تەمەنگەورە.
(ألهَمّال): ١-زەوییەك کەکەس خۆی تێنەگەیەنێت و ئاوانەکرێتــەوە و بەکارنەهێنرێت ٢-هەموو شتێکی نەرم و خاو.
(ألهَمالِيْل): ١-پاشماوەی پوش و پاوەن ٢-بەرگی شرووڕ.
(أَلمُهْمَـل) (مفـع) - مِـنَ الـكلام: ١-ئاخاوتنی فەرامۆشکراو/ بەدەربەسەوەنەهاتوو/ گوێپێنەدراو ٢-ئـاخـاوتـنـی بێـکـەڵك و بـەکـارنـەهـێـنـراو و فەرامۆشکراو/ وازلێهێنراو.

(- مِنَ الحُروف): پیتی خاڵ و ســەرو بۆر بۆ نەکراو.
٢-(الهَمَل): خانووی بچووك.
٣-هملج (هَمْلَجَ البَرذونُ هَمْلَجَةً): بارگیرەکە باش وخێرا ڕۆیشت ٢-خێراو خۆشرەوتبوو (ألهملاج(ج)هَماليج) بارگیری خۆشرەوت (دابَةٌ هِمْلاجٌ): ئاژەڵێکی خۆشرەو.
٤-(ألهَمَلَّــع(م) هَمَلَّعَــة): ١-مرۆڤی (ســپلەو بێپەیمان/ تاســەر لەگەڵ کەسدا دوستو برا نەبێت) ٢-حوشــتری چابــوك/ خێرا ٣-پیاوی بەپێ توندرۆ. کە توندپێبە زەویدا بنێت
٥-(هَمْلَــقَ. هَمْلَقَــةً): پەلەیکــرد/ ئازابوو/ خێرایکرد.
همو: (هَمَــا - یَهموا المــاءُ أو الدَمعُ هَمواً): ئاویان فرمێسك کشاو ڕۆیشت/ داهات.
همي: (هَمَى - الشيءُ یَهمی هَمْیاً): ١-شتەکە ونبوو ٢-کەوت.
(- المــاءُ أو الدَمعُ. هَمْیــاً وَهُمِیًا وَ هَمَیاناً): ئاوەکە کشا یان فرمێسکەکەرژاو هاتە خواری نەبوو بەربەستیان بکات.
(- تِ العَینُ): چاوەکە فرمێسکی دارشت.
(- تِ الماشِــیَةُ): ئاژەڵەکــە بــۆ لــەوەر لەلەوەرگاکەداپەرش و بڵاو بوونەوە.
(الهامِیــة (ج) هَــوام): چــاوی (فرمێســکر ڕشــتوو/ بە فرمێســك)/ ئاژەڵی پەراگەندەو پەرشوبڵاو (ناوی بکەرە بۆ مێ).

هَوامي الإبِلِ: حوشتره پەراگەندەو ونبووەکان.
هُمايُون: وشـەیەکی فارسـیە لـە بنچینەدا ناوی باڵندەیەکە گوایا وتوویانە هەرکەسێك دەسـتگیری بێت یـان سـێبەری بەربکەوێت دەگاتـە بەرزتریـن پایـە بۆیە بەشـاو پایە بڵندان وتراوە (هُمايون).
(بابُ هُمايون): دەرگای سوڵتان.
(الهِمْيَـان (ج) هَمايين) (فارسـية): ١- بەندە خوێنی شەرواڵ ٢-تووره‌کەی پارەکە بەکەمەرەوە بەند دەکرا/ قایمدەکرا.
هنّ:١- (هَنَّ. هَنّاً وَ هَنينا): گریا.
(- إليه): بیریکرد/ سۆزی بۆی جووڵا/ تاسەی کرد.
(الهَنَّانَة): ئەو ژنەی کە دەگریو دەناڵێنێت.
٢-(أهَنَّ - الجمَلَ): حوشترەکەی بەهێز کرد.
(جَمَلٌ مَهْنُون): بەهێز کـراو. بەپێی پێوەر نییە. پێوەرەکە دەبێت وشەی (مُهَنٌّ) بێت.
(الهانَّة و الهُنانَة): چەوری ناو چاو.
(مابِهِ هانّةٌ): بێفەرە. هیچ خێری نییە.
٣-(هَنَّـاوَ هُنَّـا وَ هِنّا): هۆئـەوێ/ ئائەوێ. ئامرازی ئاماژەی شوێنی دوورە.
(«تَنَحَّ هاهُنا وَ ها هُنَّا أو هَهُنّا»): کەمەکێك دوورتر بکەوەرەوە.
هنأ: ١-(هَنَأَ - هُ. يَهْنُؤُ ويَهنِئُ. هَنْأ): نۆشـی پێکرد/ خواردنیدایە.
(- فُلاناً): دای بە فیسار.
(- الإبِلَ): قەترانی لە حوشـترەکان هەڵسوو/ بەقەتران رەنگیکردن.
(- الرَّجُـلَ): پشـتی پیاوەکـەی گـرت/ سەریخست/ لەسەریکردەوە/ پیشتگیریرد.
(هَنَـأَ يَهْنِئُ وَ يَهْنَـأُ وَيَهْنُؤُ- الطعامُ الرجُلَ وَ للرَجُـلِ هِنْـأَ وَ هَنْأً وَهَنـاءً): خواردنەکە بەپیاوەکە کەوت ولای خۆشبوو.
(لِيَهْنِئْكَ ألوَلَدُ): منداڵەکە شـادو دڵخۆشـت بکات پیرۆزتبێت.
(- هَنَـأَ - هُ بِالأمرِ.يَهْنأُ. هَنْـأً): پیرۆزبایی کارەکەی لێکردو پێیوت: کارەکەت پیرۆزبێتو پێیشاد بیت.
(- الطعامَ هَنُـأَ وَهِنْأً وَهَناءَةً): خواردنەکەی باش دروستکرد.
(هَنِئَ - بِهِ. هَناءً وَهَنْأً): پێیدڵخۆشبوو.
(- الطَعامَ: تَهَنَّأَ بِهِ): خواردنەکەی پێکەوتو بەدڵیبو.
(«أكَلْنا مِن هذا الطَّعامِ حَتى هَنِئْنا مِنهُ»): لەم خواردنەمان خوارد تالێی تێر بووین.
(هَنُـؤَ. يَهْنُؤُ هَناءَةً وَهَنَأةً وَهَنْأً): ئاسـانبوو بە ئاسـانیی دەسـتگیر بوو/ بێگیرو گرفت و ماندوبوون دەستکەوت.
(هَنَّأَ - هُ بِكَذا تَهْنيئاً وَ تَهْنِئَةً): ١-پیرۆزبایی ئەوەی لێکرد ٢-پێیوت پیرۆزتبێت.
(أهْنَأَ - هُ إهْناءً): دایە.
(تَهَنَّأَ - بِهِ تَهَنُّؤً): پێی (دڵخۆشبوو/ شاد بوو).

(- بالطَّعـام): خواردنەكـەی بەدڵبوو/ لای خۆشبوو و پێیكەوت.

(إهْتَنَـأَ - مالَهُ. إهْتِناءً): دارایەكەی سـازداو خەملاند.

إسْـتَهْنَأَ - الطَعامَ. إسْـتِهْناءً): خواردنەكەی (لاخۆشبوو/ بەدڵیبوو).

(- هُ): ١-پشـتگیریی و كۆمەكی (لێخواسـت/ لێداواكرد) ٢-داوای بەخشینی لێكرد.

(ألهانِئُ) (فا): نۆكەر/ كارگوزێر.

(ألهَنْءُ): ١-بەخشش ٢-قەتران تێهەڵسوون.

(ألهِناء): قەتران (لەوانەیە، بۆیە وا ناونراوە، چونكە چاكبوونەوەی پێوەبێت).

(ألهَنيءُ): ١-خواردنی بەدەمخۆش و پێكەوتوو ٢-دڵخۆشكەر ٣-ئەوەی بێئەرك دەستگیربێت.

(«هذا أمرٌ أتاكَ هَنيئـاً»): ئەمە كارێكە بە بێئەرك وشەرمشـەق بە ئاسـانی بۆ تهاتووە دەستگیرتبووە.

(«أكلتُـهُ هَنيئـاً مَريئـاً»): بـە ئاسـانی خواردنەكەم خوارد و بەدڵمبووپێمخۆشبوو

(هَنيئاً لَكَ): ١-نۆشـی گیانتبێت٢-پیرۆزتبێت كە بە ئاسانی دەستگیرت بووە.

(ألمَهْنَـأُ): ١-نۆشـبوو ٢-ئـەوەی بێئـەرك‌و نارەحەتیی دەستگیرتبووە.

٢-(ألهِنْءُ: بەشێكی شەو.

(ألهِناء): هێشووی دارخورما.

(ألهَنـاء): دڵخۆشـیی/ شـادیی/ بەختیاری/ شادمانیی/ شادانیی/ كامەرانیی ٢-ئاسوودەیی‌و ئاشتی.

هنـب: ١-(هَنْبَتَ - الرَجُلُ هَنْبَتَةً): پیاوەكە راكشاو لەشی خاوبووەوە.

٢-(ألهَنْبَتَـةُ(ج) هَنابِت): ١-كاری سـەخت‌و گـران/ لێقەمانی قـورس ٢-قسـە بزركاندو قسەی هەڵەق‌و مەلەقكردن.

(ألهَنابِـت): ١-چورتومـەكان/ ومیـەكان/ بەڵاكان ٢-كاروبارو هەواڵی (تێكەڵ‌و پێكەڵ/ بەسەریەكدا چوو)

٣-(ألهَنْبَذَة(ج) هَنابِذ): لێقەومانی سەخت/ رووداوی گەورەو گران.

٤-(ألهِنْبِر) (ح): ١-جاشـولكە ٢-(ح) كەمتیار ٣-(ح) _بەچكە/ بێچوە)كەمتیار.

(ألهِنْبِرَة) (ح): ١-جاشـەمیچكە ٢-(ح)ماكەر ٣-كەمتیار

(ألهِنَّـبر): ١- (ح) كەمتیار ٢-(ح) گا یان مانگا ٣-چارەویٚ ٤-پێسـتی خراپ خۆشـەكراو یان ئەملاولا خراپبوو.

(ألهُنبور): لی كەلەكە بووی بەرز.

(هُنْبورَة (ج) هَنابـیر): كۆمەڵە لی كەڵەكە بووی بەرز، وشەكە هەڵگەراوەی (النَّهابیر)

٥-(هَنْبَسَ وتَهَنْبَسَ): سووسەی هەواڵەكانیكرد

٦-(هَنْبَغَ - الرَجُلُ): پیاوەكە برسیبوو.

(- العَجاجُ): تۆزو گەردەكە زۆر بوو هەسـتاو بەرز بووەوەو بڵاوبووەوە.

(اَلهُنْبُغ): ١-خولێکی گەردین کەبە سووکترین باوشت هەستێت ٢-(ح) شێر ٣-ژنی سۆزانیی گەوج ٤-برسیەتی سەخت.

(جوعٌ هُنْبُغٌ وَهِنْبَاغٌ وَهُنْبُوغٌ): برسێتیەکی سەخت.

٧-(هَنْبَلَ - الرَّجُلُ): لە رۆیشتندا ئەملاو لایکرد/ بەلەقە لەق وەك کەمتیار رۆیشت

هنت: (هَنْتَبَ - فِي أَمرِهِ): (خاوە خاو/ سستیی)ی لە کارەکەیدا کردو بەدەربەسیەوە نەهات.

هنج: (تَهَنَّجَ - الفَصيلُ): کۆرپەلەی حوشترو مانگاکە لە سکی دایکیدا ژیانی تێهاتو کەوتە جووڵە.

هند: ١-(- هَنَّدَ - الرَّجُلُ): وەك کوندە بەبوو خوێندیو هاواریکرد.

٢-(هَنَّدَ - فُلاناً): جنێوی پیسی بە فیساردا

(هُنَّدَ زَيدٌ): جنێویان بە زەید دا خۆیگرت و جنێوی پێنەدانەوە.

(- فِي الأمرِ): کەموکووریی لەکارەکەدا کرد/ بێدەربەستییکردن.

(«ما هَنَّدَ عَنِ الأمرِ»): خۆی لە کارەکە لانەدا و لێی دوانەکەوت/ بێدەربەستیی نەکرد.

٣-(هَنَّدَ - السَّيفَ)شمشێرەکەی تیژ کردەوە

(ألهِند): هندستان.

(هِندِي (ج) هُنُود): هندستانی/ خەڵکی هندستان (دەشێت بە دانیشتوومرسەنەکانی ئەمەریکایش بڵێن (هیندی).

(لَقِيَ هِندَالأحامِس): مرد.

(اَلهِندوانِيُّ وألهُندُوانِيُّ): هندستانی.

(سَيفُ هِندُوانِيٌّ): شمشێرێکی هنداستانیی.

(الأهانِد): پیاوانی هندستان.

(اَلمُهَنَّد): شمشێری لەئاسنی هندستان دروستکراو.

٤-(هَنَّدَتْهُ المَرأةُ): ژنەکە بەلاوانەوە دڵی لیسەندو کردیە دڵخوازی خۆی.

(«هَنَّدَت بِقَلْبِهِ»): دڵی لێسەند گرفتاری دلی خۆیکرد/ دڵیبرد.

(هِندٌ(ج)هِندات و هُنُود): ناوی ژنێکە پاشان کرا بە ناوی رەگەزی ژنان. بۆ ژنان بووبە ناووو بووبە باو وەك چۆن دەڵێن زەیدو عەمرو کە پیاون.

٥-(هِندٌ و هُنَيدَةٌ (ج) أهْنُد وَأهْنَاد و هُنُود): ناون بۆ سەد حوشتر یان زۆرترین.

٦-(الهِنْدَب (ن): الهِنْدَباء وَالهندباوَالهندَبا) (ن): رکاستی. گیایەکی کشتوکاڵیە لەئەوروپاو ئاسیای خۆر ئاوا لە دەشت دەروێت/ دەشتەکیە گەڵاکەی چرچە کەمە تاڵییەکی هەیە وەك بەهارات بەکاردێت و لێیشدەنرێت.

(اَلهِندباء البَرِّيَّة) (ن): تاڵیشك. رووەکێکی گیایی تەمەندرێژە گەڵاکەی دانداره وەك دانی شێر زۆر جۆری هەیە. هەیەتی لەهەندێك وڵات لەزەڵاتەدا بەکاردێت، هەندێکی لە

پزیشــکیدا بــۆ دەرمانی ڕەوانیــی بەکاردێت ولەڕەگــی هەندێکیــان مــادەی کاوتشــۆك. دەردەهێنرێت.

(اَلهِنْدَبــاة والهِنْدِبــاة واحِــدةُ الهندِباء): تاڵیشك.

٧-اَلهِنداز: ئەندازە.

(«أعطاهُ بلاهِندازولاحساب»): بەبێ ئەندازەو بێژمارە دایە.

(اَلهِندازة): گەز کە چیتی پێدەپێون.

(اَلهُنْــدِز): ئەندازیــار ئەم وشــانە هەمووی فارسین.

٨-(هِنْدَسَ هَندَسَــةً مجاري القَنی والآبنية و نَحوِهــا): ئەنــدازەی ئــاوەڕۆو خانەو ئەو بابەتانەی گرتو وێنەی کێشان.

(اَلهِنْدِس - مِنَ الرجالِ): پیاوی ئەزموندارو وردبینی چاك.

(اَلهَنْدَسَة) (مص): ئەندازە گرتن. ئەندازەو پێوان (فارســية): زانســتیکە لە بڕو باریو هەڵسەنگاندنی دەکۆڵێتەوە.

(هُنْــدُوس - الأَمــرِ(ج) هَنادِسَــة): زانــاو شارەزای کارەکە.

(اَلهُنْــدِس): ئەندازیــار/ خاوەنبڕوانامــەی کۆلێجی ئەندازەیی.

٩-(اَلهَنــادِك الواحِــد (هِنْدِكي)): پیاوانــی هندستان (فارسية)

١٠-(هَنْدَمَ-الشيءَ): شتەکەی بەئەندازەوپێوان ڕێکخســت و چاککردو ڕازاندیەوەو تیایدا قاڵ بوو.

(- العُــودَ وغَيْــرَهُ): چێوەکەو شــتیتری بە ئەندازە و پێوان ڕێکخستو چاککرد.

(اَلهِندام) (فارســية): چاکی ئەندام/ بەژن/ باڵاوڕێکوپێکیی/ شۆخیی (فارسی).

هنع: (هَنَعَ - الشــيءَ هَنْعاً): شــتەکەی قەد کردوبەسەر یەکدا نوشتاندیەوە.

(- لِفُلانٍ): ملی بۆ فیسار شۆڕ کرد.

(هانِع): ملشۆڕ/ سەرشۆڕ/ ژێردەستە.

(ج) (هُنَّعٌ) (هَنِعَ. هَنَعاً): پشتی کۆمبوو.

(أَهْنَع): مرۆڤی کۆم.

(إسْــتَهنَعَ - الرَجُــلُ): شــکاو ســستبوو/ خاوبووەوە یان بێتابوشتبوو.

(اَلهَنَــع): ١-کۆمیی/ پشــتکۆمیی ٢-داکەوتنی ملی حوشتر.

(الهَنْعَة): ١-جارێك سەرشــۆڕ بــوون ٢-جارێك کۆمبــوون ٣-نیشــانەیەك لــە خــوارووی ملدا ٤-تەمنشتی چەپی کەشکەشان کە پێنج ئەستێرەن و ڕیزی یەکن و مانگ لە خواریانەوە دەبێت.

(اَلهُناع)(طب): دەردێکە دەداتە ملی مرۆڤ

(الأَهْنَــع): ١-کەســێکە پشــتی چەمابێتەوە/ پشــتکۆم ٢-ســوارێکە لەســەرزینەکە بەملاوبەولادا بکەوێت ٣-حوشــترێك ملی بۆ زەوی خوار بێت (کە ئەوە خەوشە).

(اَلهَنْعاء): مێی وشەی (الأَهْنَع).

(نَعامَةٌ هَنْعاءُ): وشترمرخێکی ملخوار

(أَكَمَةٌ هَنْعاءُ): گردێکی بچووك و نزم

هنف: (هَنَّفَ - فُلانٌ صاحِبَهُ): فیسار لەگەڵ هاورێکەیدا یاریکرد.

(هانَــفَ- تِ المَرأَةُ خاصَــةً مُهانَفَةً وَهِنافاً): ژنەکــە بەنیمچــە گاڵتــە پێکردنــەوە بەساردیەکەوە پێکەنی.

(أَهْنَــفَ): بەســاردییەکەوە وەك پێکەنینــی گاڵتەپێکردن پێکەنی.

(- تِ المرأَةُ): ژنەکە بەنیمچە گاڵتە پێکردنەوە بەساردیەکەوە پێکەنی.

(تَهانَفَ): بەلاقرتییەوە/ بەگاڵتە پێکردنەوە پێکەنی.

(أَلهُنُوف): پێکەنینێکی لە بزە زیاترو لەقاقا کەمتر.

٢-(هَنَّــفَ و أَهْنَــفَ - الرَجُــلُ): پیاوەکــە پەلەیکرد/ گورجبوو/ خێرایکرد.

٣-(أَهْنَــفَ وَتَهانَــفَ - الصَبِــيُّ): منداڵەکە خەریکبوو بگری.

(تَهَنَّفَ): گریا.

٤-(تَهانَــفَ - بِهِ): (ئەوەی بەلایەوە) ســەیر بوو/ سەیری لێهات.

هنــق: (أَلهَنَــق): نیمچــە ومرســبونێك و بێتابوشتییەك توشی مرۆڤ دەبێت.

هنم: (أَلهَنَم): خورما یان جۆرە خورمایەك.

هنو. (أَلهِنْو): کات/ دەم (أَلهَنُ): (لەشــیعردا نوونەکــە دەگیرێت): هــین/ هەرامە/ وانێك (ئیدیۆمە بۆشت).

(هذا هَنُكَ): ئەمە هینەکەی تۆیە.

(هُنَيّ): شتۆکە (هینۆکە).

(هَنَّة): مێی وشەی (الهَن).

(هُنَّة): تۆزێك/ کۆمەڵێك.

(أَمْكِثْ هُنَيهَةَ): نیمچە کاتژمێرێك.

(هُنَيَّــة (ج) هُنَوات و هَنَــات): کەمەڵێك/ تۆزێك/ چاولێکنانێك/ جووتی وشەی (الهن) دەبێتە (هَنان وهَنَوانِ (ج) هَنون)

(فِي فُلان هَنَاتٌ): فیســار کەمەکە نیشــانەی خراپیی تێدا هەیە (ئەمە بۆ چاکە ناوترێت)

(أَلهَنا): رەسەنی (هیچو پووچ/ سووك/ رِسوا/ نزم).

(هَنا= أَنا): (هَنا فَعَلْــتُ): من کردم. (هُنا): ئێــرە ئامــرازی ئاماژەیە بۆ نزیــك). (هـ)ی ورياکردنەوەی دەچێتە ســەر دەبێتە (هَهُنا): ئائێــرە (ك) ی گوێگریشــی پێــوە دەلکێــت دەبێتە: (هُناكَ وهُنالِك): ئائەوێ/ ئەوێ.

(هُنا): یاری وگەمە.

(أَلهَناة (ج) هَنَوات): وەی/ ئاپۆرە/ چورتوم.

(جاءَ مِن هَنِيّ): لێرەوە هات.

هە: (هَهْ): (دەنگە بۆ هەرەشەو بیرخستنەوە): باشــە باشــە قەیناکا/ بیرت نەچێتــەوە/ ئێ باشە.

هــە: (هَهٌ.هَهًــا وهَهَّةٌ): زمانــی گرتیو لاڵە

پەتەبــوو (دەنگەکانــی دەگــۆڕی وەك (ر)ی دەکرد بە (غ) و (ث)ی دەکرد بە (س)

هو: (هُوَ): ئەو (بۆتاکی ونی نێر).

(هُما): ئەو دوانە بۆ ونی نێرو ما.

(هُم): ئەوانە. (هِيَ): ئەو (بۆتاکی ونی مێ).

(هُما): ئەو جووتە (بۆ نێرو مێی ون).

(هُــنَّ): ئەوان (بــۆ کۆی مێی ون)، دەشــێت بوترێــت (هُــوْ وَهِــيْ): (ئەمە پــاش (و، ف) دەوترێــت (وَهُوْ فَهُوَ).(وهْــيَ. فَهْيَ) هەروەها دوای (ل) وەکو (إنَّ هذا لَهُوَ الحَقُّ): (کە ئەمەیان کەمە) بە ڕاستی ئەمە ڕاستی تەواوە.

(اَلْهُويَّة): بەراستی ئەمە ڕاستیەکی تەواوە.

(اَلْهُويَّة): ڕاســتیی کەســەکە یان شــتەکە/ ناسنامە. ئەمە لە (هُوَ) وە هاتووە.

(اَلْهُوْهُوْ) (وشــەیەکی لێکدراوە لە (هُوَ هُوَ): خۆی خۆیەتی/ خۆیەتی خۆی.

هوا: (هاءَ - بِنَفِسِــهِ إلى المَعالي.يَهُوءُ. هَوْءً): خۆی (بڵند/ بەرز) ڕاگرت.

(هاءَ- هُ بِخَيرِ أَو شَــرِ وَهاءَبِهِ خَيراً أَو شَراً): گومانــی خراپــەی لێکرد یــان خراپەی دایە پــاڵ/ گومانباریکــرد. یان باشــیی دایەپاڵو بەباشیزانی.

(- بِفُلان): بەفیسار دڵخۆشبوو.

(هاءَ هَيئَةً حَسَنَةً): شێوەو قەلافەتی باشبوو

(هَــوئَ - إِلَيهِ. يَهْوَأُ هَواءً): دڵی بۆیچوو/ دڵی بۆی لێیدا/ تاسەیکرد.

(هــاءَ: = لَبَيــكَ): ١-بەڵــێ بەدەنگتەوە هاتم ٢-بگرە/ وەریگرە.ئەمەیش بەم شێوەیە دێتو دەوترێت.

(هاءَ): (بۆ یەکێك).

(هاؤُما): (بۆدوان).

(هاؤُم): ئەمانە بۆ نێرن.

(هاءِ): (بۆ تاکی مێ).

هاؤُما. هاؤُنَّ: (ئەمانە بۆمێن).

لەبری (هەمزەکە) (ك) دادەنرێت وەك: (هاكَ.هاكُما.هاكُم): (بۆ نێر).

هاكِ. هاكُما.هاكُنَّ: (بۆ مێ) بگرە. بگرن.

(اَلْهَوْء): ١-هەمتەرمەندیی ٢-ڕای دروستوچاك وکارکردە ٣-بۆ چوونو بەبیرداهاتن.

(«وقع كَذا في هَوْئــي أَو هُوْئي»): وامزانی/ وابەبیرمداهات/ وابۆیچووم.

هــوب: ١-(اَلْهَــوْب): ١-دووریــی ٢-گەوجــی بزرکێــن/ هەڵەوەر ٣-گــڕو گەرمیی ئاگریان گرگرتنی ئاگر/ کڵپەسەندنی.

٢-(اَلْهَوْبَــر):(ن): ١-گوڵــە سەوســەن یــان سەوسەنی سوور ٢-(ح) یۆز/ وێز/ هووشنگ/ دورەشێر/ کورەپەسك ٣-(ح) مەیمونی تووکن

(ناقَةٌ مُهَوْبِرَة): مێحوشتری قەڵەو/ گۆشتن.

(أُذنٌ مُهَوْبِرَةوَمُهُوْبَرَةُ): گوێیەکی تووکن یان خوریی پێوەبێت.

هوت: (هَوَّتَ - فُلانٌ تَهويتاً): فیسار داپەڕییە نزماییەکەوە.

(- بِهِ): بانگیکرد.
(اَلهُوتَــةُ و أَلهَوْتَــةُ (ج) هُــوَتٌ): ١-زەویــی (نزمایی/ نەویو/ چاڵ) ٢-ڕێگایەك داپەرێتە خوارەوە بۆسەر ئاوەکە.
هوث: (الهَوثَةُ): تینو بوونێك.
هوج: (هَوِجَ: يَهْوَجُ هَوَجاً): درێژێکی گەوجی بەپەلە بوو، جرپنی هەڵشەبوو.
(أَهْوَج (م) هَوجاء): درێژی گەوجی هەڵەشەی جرپنی بەپەلەی.
(أَهْوَجَ - هُ): بەگەوجو هەڵەشەو جرپنی دانا.
(تَهَوَّجَ - الحَرُّ): گەرماکە ورووژاو تاویسەند.
(الأَهْوَج): دلێری بێباك و سەرچل کەهەڵەشانە خۆی دەهاوێتە توونی جەنگەوە.
(«هُو أَهْــوَجُ الطولِ»): ئەو درێژییەکەی بێ ئەندازەیە.
(الهَوجاء(ج) هُــوْج): مێحوشــتری توندڕەو وەك تووشــی شــێتگیریی بووبێت: ناوترێت (جَمَلٌ أَهْوَج)
(- مِنَ الرياح): بایەکی زریانیی کەلە ئاسـتێکدا نەبێت و خانوو لەبن دەهێنێت و هەڵدەتەکێنێت.
(«لَعِبَــت بِها هُوجُ الريــاح»): گەردەلوولیبا یاریی پێکرد.
(ضَرَبَةٌ هَوجاء): لێدانێکی تاناخچوو.
٢-(هَوجَلَ - الرَجُلُ): ١-ســووکە خەوێکیکرد ٢-بەبیابانــە فراوانەبێنیشــانە بێڕانوماکەدا ڕۆیشت.

(الهَوجَل): ١-بیابانی فراوانی دووری بێنیشانەو ڕانومــا ٢-ڕێگەیــەك نیشــانەوئالآی لەســەر نەبێت ٣-زەوییەك هەرجارەی بەجۆرێکبێت. ٤-بەدەنقورســی خاووخلیچك ٥-گەوج ٦-ژنی سۆزانی/ قەحبە ٧-شــەوی درێژ ٨-پاشماوەی خــەو کەلەچــاودا بێت٩-لەنگــەری پاپــۆر ١٠-ڕانومای شــارەزا ١١-ڕۆیشتنێکی لەسەرخۆ/ خاووخلیچك).
(«مَشيٌ هَوجَلٌ»): ڕۆیشتنێکی خاوو خلیچکانە.
هود: ١-(هــادَ. يَهــودُ. هُــوداً): تۆبەیکرد/ پەشیمانبووەوە وهاتەوە سەر ڕێی خودا.
(هادَ المُذنِبُ إِلى اللهِ): گوناهبارەکە تۆبەیکردو ڕوویکردەوە ڕێی خودا.
(هائد): تۆبەکار/ گەڕاوە بۆ ڕێی خوداپەرستی (ج) (هُوْد)
(هادَ- فُلانٌ): فیسار چووە سەردینی جوولەکە
(هادَ - تَهْــواداً): دەنگێکی نەرمی هێواشــی لێوەهات.
(- في المَنطِــق): گفتەکــەی لەســەرخۆو نەرمدەربڕی.
(هَــوَّدَ. تَهْويــداً): ١-دەنگەکــەی نــەرم و هێواشدایەوە/ گێڕایەوە ٢-گۆرانیوت ٣-بێدنگ و خاو ڕۆیشت
(- فُلاناً): ١-کەیفی فیساری هەستاندو خستیە گۆرانی ٢-کردی بە جوولەکە.
(- الشَــرابُ فُلانــاً): مەیەکــە/ شــەرابەکە

فیساری سەرخۆشکرد/ مەستیکرد.
(- فُلان في المَنطِق): گفتەکەی لەسەرخۆو بەشێنەیی‌و نەرم دەربڕی.
(- في السَیرِ): لەرۆیشتندا خاوەخاویکرد.
(هـاوَدَ - ه مُهـاوَدَةً): ١-دڵـی بەدڵیـەوە ناوو لایدایەوە‌لای٢-دڵی‌هێنایەوە‌جێ‌و‌ئاشتیکردەوە/ لەگەڵیدا ڕێککەوتەوەو نەرمبوو.
(- ه في البَیعِ) (ت): لە سەوداو فرۆشتنەکەدا خاتریگرت و هەرزان شتەکەیدایێ.
(تَهَـوَّدَ. تَهَوُّداً): ١-پەشـیمانبووەوە و هاتەوە سـەرڕێی ڕاسـت‌و ڕێـی خوداپەرسـتیی/ تۆبەیکرد٢-بووبە جوولەکە.
(- في المَنطِق): لەسەرخۆوبە شێنەیی و نەرم گفتەکەی دەربڕی‌و پەیڕەوکرد.
(الهُود= الیَهود): جوولەکەکان.
(هائد): یەك جوو/ جوولەکەیەك.
(ج): (الهُود).
(الهَوادَة): ١-ئەوەی‌دەبێتەهۆی‌تەبایی‌و چاکیی نێـوان خوێشـگەل ٢-نەرمیی‌ومیهرەبانیی/ بەزەیی ٣-دڵڕاگرتن‌و خۆشەویستی ٤-ڕێپێدان/ مۆڵەت.
(یَهُـوْدُ): جـوو/ جوولەکـە کەبەرمیەکـی خەڵکن لەوشـەی(هادوا) واتا: گەڕاونەتەوەو تۆبەیانکردووە.
(الیَهودِيّ): جوولەکەیەك/ جوویەك.
(الیَهودِیَّـة): ١-مێـی وشـەی (الیهـودِيّ):
٢-جوولەکەیی/ ئاینی جوولەکە کە موسـایبن شوێنکەوتەی حەزرەتی مووسان.
(التَهْواد): ١-نەرمیـی وبەزەیی/ میهرەبانیی ٢-دەنگی نەرم‌ونزم‌وخاو.
(التَهوید)(مـص): ١-وژە وژێکـی نەرمـی بابەسـەرلەدا وەك بیلاوێنێت ٢-دەنگی نەرم‌و نزم‌و خاو.
(المُهاوَدَة) (مص): ١-گەڕانەوەو پاشکەزبوونەوە/ تۆبەکـردن (ت) ٢- لەنرخـدا، لە فرۆشـتندا خاترگرتن‌و کەم لێوەرگرتن.
(المُهَـوِّد) (فا): گۆرانیبێژێك کە نەرم‌و هێمن بۆ ڕابواردن وخۆشی گۆرانی بڵێت.
٢-(هَوَّدَ. تَهْویداً): کۆپارەی حوشتریخوار.
(الهَـوَدَةُ و الهَـوْدَةُ (ج) هَـوَدٌ): کۆپـارەی حوشتر.
٣-(هُوودٌ): هوود پێغەمبەر.
(قَـومُ هُودٍ = قَـومُ عـاد): میللەتی هوود/ میللەتی عاد.
٤-(الهَـوْدَج (ج) هَـوادِج): کـەژاوە کـەژن سواریدەبوو
٥-(الهَودَعة) (ح): وشترمرخێك.
(الهَودَع): وشتر مرخ.
٦-(الهَوْدَك(م) هَوْدَکَة): قەڵەو/ گۆشتن.
هوذ: (هُـوَذا): وشـەیەك لە (هُـوَ) وَ (ذا) پێکهاتووە (ها) ی وریاکردنەوەی دەچێتەسەر دەبێتە.

(هاهُوَذا): ئائەومتا.

(ألهاذَة(ج) هاذٌ) (ن): درەختێکە.

(ألهَونَة (ج) هَوْن) (ح): کورکور/ قمتێ.

(ألیَهُوذِیُّ=ألیَهُودِيُ): جوولەکە/ جوو.

هــور: ١-(هارَ - فَلاناً بِالأمــرِ. یَهُورُ هَوراً): فیساری بەو کارە گومانباکرد.

(- هُ بِکَــذا): بــەوە گومانباریکــرد/ واهــات بەمێشکیدا کە ئەو ئەو کارەیکردووە.

(- الشيءَ): وا بۆ شتە چوو/ وایخەملاند.

(- فُلاناً): دەغەڵی لەگەڵداکرد.گزیی لێکرد.

(ألهُــورَةُ): گومانباریــی/ دڵ لیکرمێکــردن/ وابۆچوون.

٢-(هــارَ - هُ عَــنِ الشــيءِ یَهُــورُ/ هَــوْراً): لەشتەکەی لاداو لێیدوورخستەوە.

(- علی الشيْ): لەشتەکەی هاندا/ ناچاریکرد کە پەلاماری بدات/ بۆ شتەکە بچێت.

٣-(هــارَ - القَــومَ. یَهُــورُ هَوْراً): کوشــتنی ولەسەریەك کەڵەکەیکردن.

(- فَلاناً): فیساری کوتا بەزەویدا.

(- البِناءَ): خانەکەی رووخاند.

(- البِناءُ): خانووەکە رووخا/ رما/ تەپی.

(- البِناءُ هَوْراً وَهُؤُوراً): خانەکە شــەقیبرد/ قڵیشا و نەروخا.

(هائِر): خانووی شەقبردوو ونەرووخاو.

(هار= هائِر): شەقبردوو.

(هَوَّرَ - هُ تَهویراً): ١-کوتای بەزەویدا/ دایبەزەویدا

٢-تووشی مەترسیی و فەلاکەتیکرد.

(تَهَــوَّرو تَهَیَّــرَ - البِنــاءُ تَهَوُّراًوَتَهَیُّــراً): خانەکە/ بیناکە تەپی و رووخا/ رماو کەوت/ هەرەسیهێناورمیا.

(- الرَّجُــلُ): پیاوەکــە هەڵشــەبوو لەبــەر بێدەربەســی و گوێنەدان لەکارەکەداتیشــکاو کەوت.

(- الوَعكُ الناسَ): تاو نەخۆشیی لەناوخەڵکدا بڵاوبووەوەو تووشیبوون.

(- اللَّیلُ): شەو بەسەر چوو یان بەشی زۆری رۆیشت وتاریکی شکا.

(- الشتاءُ): بەشی زۆری زستان رۆیشت وتەشقی سەرماکەی شکا.

(إنْهــارَ - البِناءُ. إنْهِیــاراً): خانەکە/ بیناکە داتەپی/ رماو هاتەخوارەوە/ کەوتو هەرەسی هێنا.

(- الخَرقُ): درزەکە یەکالأبووەوە وکەوت.

(إهْتَوَرَ - الشــيءُ إهْتِواراً): شــتەکە فەوتا/ لەناوچوو.

(رَجُــلٌ هارٍ وهــاراً): پیاوێکــی پەککەوتەو لاوازو فەوتاوی سالأنی تەمەن.

(ألهَــوْر (مص) (ج) أهوار): ١-دەریاچەکە ئاوی بۆ هاتووی تێدەچێت وفراوان دەبێت وئاوی زۆر دەبێت.

٢-رانەمەرلەبەر زۆری بەسەریەکدادەکەون.

(خَرْقٌ هَوْرٌ): دەلاقەیەکی قڵیشێکی فراوان و بەربلاو و درێژ.

(اَلهَوْرَةُ (ج) هَورات): فەوتگە.
اَلهوارَة: فەوتان/ لەناوچوون.
(اَلهَـوَّارة- عِنـدَ القُدَمـاء): لای کۆنـەکان جاشپۆلیس/ جاشسەرباز/ جاش.
(اَلهَيَّار): لاواز/ بێهێز/ بێتوانا
(اَلهَيّر): هەڵشە لەشتدا، لە کاروباردا/ جرپن.
(اَلتّيهور): ١-لی هەرەسـهێناو ٢-زەویی نزم/ نەویو.
اَلمُلحَق
هور: (اِنهيار): داړووخان/ تەپین/ خاپووربوون/ دارمان/ هەرەسهێنان/ ړووخان وکەوتن.
(اِنهيار هائِط): روخـان وکەوتنی دیوارێك/ رمان و کەوتنی.
(اَلاِنهيار العَصَبي): هەرەسهێنانی کۆئەندامی هەسـت/ بـاری بێهێزبـوون ونزمبوونەوەی کۆئەندامی هەسـت کە لەش شەکەت دەبێت وخـەو پشـێوی تێدەکەوێـت ونائومێدیـی وخەفەتودڵخـوردی/ خەمناکیی لێوە پەیدا دەبێت.

هوز:١ـ (هَوَّزَ. تَهوِيزاً): مرد.
(اَلهَوْز): خەڵك/ بەدیهاتوو.
(«ماڧِي الهَوْزِ مِثلَكَ»): لەناو خەڵکدا کەسێکی وەك تۆی تێدا نییە.
(«مـاأدْري أيُّ الهَوْزِهُـوَ»): نازانم ئەو چۆن کەسێکە/ چۆن زەلامێکە
٢-(هَوَّزْ): دووەم وشـەیە کە هەندێك دەنگی عەرەبی تێدا کۆکراوەتەوە و بەپێی ژمارەیان لەکۆی ڕستەدا (اَبْجَد. هَوَّز..).
(اَلأَهـواز): ناوچەیەکـە لەنێـوان بەسـرەو فارسـدایە نۆشـارو ئاوەدانییە، کە هەرشارو ئاوەدانییـەك ناوی تایبەتی خـۆی هەیە بە هەموویان دەڵێن (ئەهواز) وناوی تاکی نییە.
٣-(اَلهَوْزَب)(ح): ١-داڵ/ پێشە خۆرە ٢-حوشتری بەهێزی بوێر.
٤-(اَلهَوْزَن): تۆز/ گەرد.
هوس):هـاسَ - الشـيءَ. يَهُوسُ. هَوسـاً): شتەکەی وردوخاشکرد/ تێکیشکاند.
(«حَمَلَ على العَسْـكَرِ فَداسَهُم وهاسَهُم»): هێرشـی بردە سەر سـەربازی دوژمن کردنی بەژێر پێوەو هارینی/ تێکیشکاندن.
(- الطعـام): خواردنەکـەی خواردوهاریی/ بەهەڵپە/ شپرزەو بەپەلە خواردی.
(- الرَّجُلُ): ڕۆیشتو توند پێی بەزەویدا نا.
(- بالّليلِ): بەشەو گەڕا.
(- حَولَ الشيءِ): خولی شتەکەیدا.
(- الإبل): لەسەرخۆ حوشترەکانی لێخوڕی.
(- الذِئـبُ ڧِي الغَنِـمَ): گورگەکـە چـووە ناوەمەڕەکانەوە وخراپی پێکردن.
(هَوِسَ - القَومُ يَهْوَسُ. هَوَسـاً): خوێشـگەل سەراسـیمەو شـپرزە بـوونو خراپیـان بەسەرهاتو/ تێکچوون.
(- فُـلانٌ): فیسـار تێکچوو/ سەرشـێتبوو/

(ئاوەز/ ئەقڵ)سووكبوو.

(هَـوَّسَ - هُ): ١ـهاری/ وردیكـرد ٢ـتێكیدا/ سەرشێتیكرد.

(تَهَوَّس): ١ـلەزەوییەكـی نەرماندا پێگرانانە رۆیشـت ٢ـدەلـوو بـوو/ نیمچـە شـێتبوو/ ئاوەزسووكبوو.

(ألهَوَس) (مص): نیمچەشـێتیی/ شێتۆكەیی دەلوویی وئاوەزسووكیی.

(بِرَأسِـهِ هَوَسٌ): سـەری گێـژ دەخوات یان درنگەدرنگێكی تێدایە.

(ألهَـوَّاس وألهَوَّاسـةُ): ١ـشـێری درنـدە كەبەشـەو دەگەڕێـت وزۆر بوێـرە ٢ـدلێری خاوەنئەزموون.

(رَجُلٌ هَـوَّاسٌ): پیاوی زۆر خـۆر/ چلێس/ بەخۆرا.

(ألأهْـوَسْ (م) هَوْسـی): كەسـێكە ١ـنیمچە شـێتیو دەلوویـی هەبێـت ٢ـكەمئـاوەز/ ئەقڵسووك بێت ٣ـزۆر خۆر/ چلێس.

(الناسُ هَوْسـی و الزمان أهـوَسُ): خەڵكی زۆر دەخـۆنو مەرگیش لـەوان بەخۆراترەو دەیانخواتو دەیانمرێنێت.

(ألهَوِیـس): ١ـبـیر/ هزر ٢ـئـەوەی لەدڵتایە ونهێنیەو شاردووتەوە.

(- عند الفَلاحین): قەرەخەرمان.

(ألمُهَوَّس) (مفع): شێتۆكە/ یا ئاوەزتێكچوو/ خەڵەفاو بزركێن لەبەرخۆیەوە.

(رجُـلٌ مُمهـوَّس): پیاوێكی خەڵەفـاو، یان لەخۆیەوە قسە دەكات ودەبزركێنێت/ تێكچوو

هـوش: ١ـ(هـاشَ - القَومَ یَهُوشُ. هَوشـاً): خوێشگەل بەیەكدا چوونو شڵەژان و ئاژاوەو پشێوییان تێكەوت.

(- اَهلُ الحَربِ بَعْضُهُم إلی بعضٍ):شەركەرەكان لەیەك راپەڕین وبۆ یەك هەسـتان وكەوتنە پەلاماری یەك.

(- تِ الخَیـلُ فِي الغـارَة): ئەسـپەكان لـە هێرشبردنەسـەرەكەدا تەرەبـوون و پەرشو بڵاوبوونەوە.

(هَوائش): ئەسپی تەرەو پەرشوبڵاوبوو.

(- المالَ): دارای بەحەرام كۆكردەوە.

(- الكَلْبُ) (عامیة): سەگەكە وەڕی.

(هَوِشَ یَهْوَشُ هَوَشـاً): شـپرزەبوو/ شڵەژا/ شێوا.

(- القَومُ): خوێشگەل شڵەژانو بەیەكدا چوون پشێوییان تێكەوت.

(هَـوَّشَ - الشـيءَ تَهْویشـاً): ١ـشـتەكەی (بەسەریەكدادا/ تێكەڵیكرد) ٢ـشتی لەملاولاوە كۆكردەوە.

(- تِ الریحُ الغُبارَ): باكە گەردی هەمەرەنگی هەستاندوهێنا.

(- القَـومَ): ئاشـوبوئاژەوی خسـتە ناوخوێشگەلەوەو ناتەباو ناكۆكیكردن.

(- الكَلْبَ) (عامیة): سەگەكەی خستە وەڕین

(هاوَشَهُم - هَمش. مُهاوَشَةً): تێکەڵیان بوو.

(تَهَوَّش - القَومُ تَهَوُّشاً): ١-تێکەڵی یەکبوون

(تَهَوَّشوا - على فلان): لە فیسار کۆبوونەوەو دەوریانگرت.

(تَهاوَش - القَومُ. تَهاوُشــاً): خوێشگە تێکەڵ بەیەکبوون.

(اَلهائِــش): (فــا): ١-تێکەڵبــوو ٢-شــپرزەو پەرێشانبوو ٣-پەلامار دەرو راپەریو / لەیەکهەســتاوو بەیەکــداداو (جەختکردنــی لەیەکهەستان وبەیەکدادانە).

(«جاءَ بالهَوْش الهائش»): ژمارەیەکی زۆری هێنا.

(الهَوْش (مص): ژمارەیەکی زۆر.

(«جــاءَ بِالهَــوْشِ والبَــوْشِ): خەڵکێکــی بێشوماری هێنا.

(اَلهَوْشَةُ (ج) هَوَشات): ١-جارێك تێکچوونو لەیــەك بەربوون ٢-کۆمەڵــی تێکەڵبەیەکبوو لەگەڵ یەکدا هەڵســوکەوتکردوو ٣-ئاشووب/ ئاژاوەوپشێویی.

(«إِيَّاكم وهَوَشــاتِ اللَّيــلِ»): وریای ئاژاوەو قەوماوی ناخۆشو فەرتەنەی شەوبن

(«إِتَّقوا هَوَشاتِ السوقِ»): خۆتان لەدەستبڕین و گومرایــیو گــزی لێکردنی بــازار بپارێزن ئاگاداربن لەخشتەتاننەبەن ودزیتان لێبکەن.

(اَلهُواشات): ١-دارایو سامانی کۆکراوەی حەرام وحەڵاڵی بەسەریەکدا دراو ٢-کۆمەڵانی خەڵك یان گەلە حوشتر.

(اَلهَويشَة): کۆمەڵە خەڵکێکی تێکەڵ.

(اَلتَهاوِش): داراو ماڵی حەرام.

(اَلمَهــاوِش): هەرچــی دەســتگیربوو بێــت و نەزانرابێت لــە کوێوە ولەچییەوەدەســتگیر بووە/ سەرچاوەی دەستکەوتنەکە نەزانرێت

٢-(هَوِش. يَهْوَش. هَوَشــاً): لەلاوازیدا سکی بەیەکدا چوو.

(اَلهَوْش): چۆڵبوونی گەدە.

هــوع: ١-(هــاعَ - الرجُــلُ يَهــاعُ ويَهُــوعُ. هَوعاً): لەخۆیەوە دڵی تێکەڵهات/ هێڵنجیداو ڕشایەوە.

(اَلهَــوْع والهُــواع والهَيعُوعَــة): هێڵنجدانو ڕشانەوە.

(هَوَّعَ —الرَجُلَ ما أَكَلَهُ): پیاوەکەی ڕشاندەوە، هێڵنجی پێهێنا.

(لأُهَوِّعَنَّــهُ مــا أَكَلَــهُ): (بــۆ هەڕەشــەیە). هەرچــی خواردبوو لەقوڕگی دەردەهێنمەوەو دەیڕشێنمەوە.

(تَهَوَّعَ. تَهَوُّعاً): ١-بە هێڵنج پێهێنان ڕشایەوە ٢-خوێنی هێنایەوە.

(تَهَوَّعَ القَيءَ): بەزۆر هێڵنجی هێنا.

(تَهَــوَّعَ نَفْسَــهُ): بەزۆرهێڵجــی بەخۆیهێنا بڕشێتەوە.

(اَلهُواع والهُواعَة): ئێڵنجدانو ڕشانەوە.

٢-(هاعَ. يَهاعُ. هَوْعاً): تۆقی و شپرزە بوو.

(ألهـاع): چنـگ لێگیرکردووهەتەرو سـوور لەسەر شت.

(«رجُلُ هـاعٌ وهـاعٌ»): پیاوێکـە بەتەنگ شتەوە زۆر دێت/ چنگە چاوەو هەتەرە (ئەمە هەڵگێراوەی) (ألهائع)ە.

(ألهَوْع (مـص): چاوچنۆکێکی زۆر هەتەری خراپە.

٣-(هاعَ. يهاعُ. هَوعاً): هەڵسڵەمیەوە، راپەری.

(- القَـومُ بَعْضُهُـم إلى بَعـض): خوێشـگەل ویستیان/ نیازیان بوو راپەڕن و ئامبازی یەکبن.

(ألهَوْع والهُوْع): دوژمنایەتی.

(ألمِهْـوَع وَ المِهْـواع): نەعرەتــەو هــاوار لەجەنگدا.

هــوف (ألهَـوْف): ١-بای گەرم ٢-بای سـاردی هەڵکردوو.

(ألهُوْف): ١-بای گەرم ٢-بای ساردی هەڵکردوو ٣-مرۆڤـی بێفـەرو هیــچ لەباردانەبــوو/ بێدەسەلات ٤- پیاوی گەوج.

هوك: (هَوِكَ. يَهْوَكُ هَوَكاً): گەوج بوو.

(هَوَّكَ - هُ. تَهويكاً): ١-گەوجیکرد ٢-چاڵەکەی هەڵکەند.

(تَهَوَّكَ وأنْهاكَ تَهَوُّكاً وأنهياكاً): ١-حەپەسـا/ شـڵەژاو هەڵەشـەیکرد/ خـۆی هاویشـتە شـتەکەوە بەبـێ سـەرنجدان و بیرکردنەوە ٢-لەقسـەکردندا تێکچـوو/ شڵەژاوقسـەی بێسەروبەری کرد کە بەسەریەکەوەنەبوو.

(ألهَوْك وألهَوِك وألأهْوَكُ والهوَكُ واليَهْكُوْكُ) (مص): گەوجێك، شـێتێك هوشـیاریی لای خۆی مابێت/ نیمچە گەوج.

(ألهُوْكة): چاڵ.

(ألهَوَّاك): حەپەسـاو/ سەراسیمە/ سەرسام.

(ألهَوَّاكة): مێی وشەی (الهَواك).

(أرضٌ هَوَّاكةٌوَهَوكَةٌ): زەوییەکی شۆرەکات.

(ألأهكَاء): حەپەساوەکان/ سەرسامەکان.

(ألْمُتَهَوِّك): ١-سەرسام/ سەرگەردان/ حەپەساو، کاس ٢-کەوتەی چاڵی قووڵی مەرگەوە.

هول: (هالَ - الأمْرُ فُلاناً يَهُولُ هُولاً): کارەکە ڕۆحیبرد/ تۆقاندیو زارەترەکیکرد.

(هِيـلَ - السَـكرانُ. هَوْلاً): سەرخۆشـەکە بەدەم سەرخۆشـیەوە شـتی ترسـناکی هاتە بەرچاوولێیتۆقی.

(هِلْتَ مِنهُ): لێیتۆقیت/ زۆرترسایت.

(هَوَّلَ - هُ تَهْويلاً): تۆقاندی.

(- على الرَجُلِ): پەلاماریدا/ شاڵاوی بۆبرد

(- الأمـرَ): کارەکەی (دزێو کرد/ ناشـیرین و گەورەکرد)..

(- عِنْـدي ألأمـرَ): لای مـن کارەکـەی زۆر گەورەوبەسامکرد.

(- القَومُ على الرَجُل بكذا): خوێشگەل بەوە پیاوەکەیان تۆقاند/ زراویانبرد

(تَهَوَّلَ - الرَجُلُ تَهَوُّلاً): پیاوەکە سامداربوو/ ترسناك وتۆقێنەربوو.

(- مالَهُ): ویستی ماڵەکەی/ داراکەی بەچاوەوە بکات.

(إهْتال إهْتِيالاً): تۆقی.

(«هُلْتُهُ فَأهْتالَ»): تۆقاندمو‌تۆقی.

(إسْـتَهالَ - فُلانٌ الأمْرَ يَسْـتَهيلُ): کارەکەی لازۆر گەورەوبەسامبوو.

(يَستَهولُهُ الجيد يَستَهيلُهُ): چاك بەسامی دەکات.

(الهائِــل): تۆقێنــەر/ ســامناك/ ترســناك/ بەسام.

(- مِنَ الأُمور): کارێك کەلەبەرچاو زۆر گەورەو بەسامبێت ولات سەخت بێت، هەڵنەگیرێت

(هَولٌ هائِــل): مەترســیوتۆقێنەرێکی زۆر ترسناك.

(ألهَوْل (مص) (ج) أهْوال وَ هُؤُول): مەترسی/ زراوچوون وتۆقێن لەکارێك.

(ألهُوْلَة = نار التَهويــل): ١-ئاگری تۆقاندن/ ئاگرێکە لەبیرێکدا دەکرایەوە خوێو گۆگردی تێفرێدەدرا ئەگەر گڕی سەندایە وبتەقایەوە تۆقێنەرەکە دەیگوت ئەوە هەرەشە لە سوێند دراوەکــە دەکاتو پێیدەڵێــت: ئــەم ئاگــرە هەرەشــەت لێدەکات، ئەوســا ســوێندراوەکە دەترساو پاشگەز دەبووەوە.

(ألهَوْلَــة): ٢-ترســێنەر/ تۆقێنــەر/ ئەوەی منداڵی پێدەترســێنرێت ٣-پەیکەر کەلەرەزدا دادەنرێت بۆ ترســاندنی چەقــەڵ کە ترێکە نەخوات٤-شتی سەیروسەمەرەو سەرسورهێن

(«وَجْهُهُ هُوْلَةٌ مِنَ الهُوَل»): دەمووچاوی دەڵێی دەعبایەکی ترسناکە/ سامناکەو سەمەرەیە.

(«ماهُــوَ إلا هُولَةٌمِن الهــول»): دەعبایەکی تۆقێنەری ناشیرینی پیسە.

(ألهيلَة): تۆقین/ زارەترەکبوون/ زراو چوون/ سامڵێنیشتن.

(ألتَهْويل) (مص): ئەوەی پێی دەتۆقێنن.

(ألَهَال وَالَمهيل): شــوێنی (بەســام/ ترسناك/ تۆقێنەر/ زراوبەر سامناك).

(ألَمهُول): تۆقێنەر/ سامناك/ بەسام/ زراوبەر.

(ألُمهَوّل)(فا): ١-ترسێنەرێکی بەسام/ ترسناك/ تۆقێنەر ٢-سوێندەر.

٢-(هَوَّلَ - تِ المَــرأةُ تَهْويلاً): ژنەکە بەرگی جوانی پۆشــی و ئارایشتیکردو بەخشڵ خۆی رازاندەوە.

(ألتَهويــل (ج) ألتَّهاويل): ١-رەنگی جیاجیای ســوورو زەردوســەوز ٢-جوانیــی و رازاوەیی وێنەو نیگارو خشل.

(تَهاويلُ الربيــع): رازانەوەی بەهار بە گوڵی رەنگاو رەنگ.

(ألهال= ألآل): تراویلکە.

(ألهالَة (ج) هــالات) (يؤنانية): خەرمانەی مانگ/ ئاخڵە وەك خەرمانەی خۆر.

هــوم: (هَــوَّمَ. تَهَــوَّمَ. تَهْويماًوتَهَوُّمــاً): ١-بەوەمنەوزەوە ســەری بزواند ٢-سەرخەوێکی کەمی شکاند.

(ألهامَــةُ(ج) هامٌ وَهاماتٌ): ١-ســەری هەموو شــتێك ٢-تەرمی مردوو ٣-ســەرداری نەتەوە وگەورەیــان/ ســەروەریان ٤-كۆمەڵــی خەڵك ٥-(ح)چاوەڕێ ٦-(ح) بایەقوش كە پێشیدەڵێن: (الصَدى).

(«هذا هامَــةُ اليَوم أَو غَدٍ»): ئەمە مردووی ئەمڕۆیــە یان بەیانــی/ ئەمڕۆ یــان بەیانی دەمرێت.

(أَصْبَــحَ فُــلانٌ هامَــة): بووبە لاشــەیەكی بێگیان/ مردو/ مرد.

(بَناتُ الهام): مێشكی سەر.

(أَلهَوْم): چاو گەرمكردن/ سەرخەوشــكاندن/ سووكە خەو.

(أَلهُوام)(ح): شێر.

(أَلأَهْوَم: (كەللە/ سەر) زل.

٢-(أَلهَوْم): زەویی نزموچاڵ.

(هَوْمُ المجوس) (ن): گیایەكە وەك یاسەمینە كەمەكێــك شــیرینیو تیژیــی تێدایە.بۆیــە ناونــراوە، چونكــە ئاگرپەرســتەكان لــە پەرستندا بەكاریان دەهێناو دەیانگوت كەڵكی سەیرسەیری هەیە.

(أَلهُــوام): شــەیدایی حــەزو دڵداریــی/ سەرگەردانیی خۆشەویستیی.

(أَلهَوَماة والهَومَة): بیابانی فراوانو بەربلاوو وشكوبرنگ.

(أَلهِيم): لمانێك كە ئاوی بەرنەكەوێت یان تێر ئاو نەبێت وئاوی تێدا نەوەستێت.

(قَومٌ هِيمٌ): خوێشگەلێكی تینوو.

هون: (هانَ - الأَمرُ على فُلان. يَهُون هَوناً): كارەكە بۆ فیسار ئاسانو سووكبوو.

(«هُــنْ عنــدي اليَــومَ»): ئەمــرو لای من بحەرەوەو بحەسێرەوە/ بحەوێرەوە.

(-الرَجُل. هُوْناًوَهَوانــاً وَمَهانَةً): ١-پیاوەكە زەبــوونو سەرشــۆڕو ســووكبوو/ رســوابوو ٢-بێتواناو بێدەسەڵاتبوو، سرەوت.

(إذا عَــزَّ أَخُــوك فَهُــن): ئەگــەر براكــەت بەســەرتدا لووتی بەرز بوو خۆی بەزل زانی تۆ بەرامبەری بێفیز بە ئارامی لەگەڵدا بگرە ئەگەرلەگەڵتدا توند بوو تۆنەرم بە.

(هَــوَّنَ - عليهِ الأمرَ تَهويــناً): كارەكەی بۆ ئاسانو سووككرد.

(«هَوِّنْ عَلَيكَ»): شتەكە وابەگرانی مەگرەو بە دەربەسەوە مەبە/ سووكیبگرە ولەسەرخۆو بەئارامبە.

(- الشــيءَ): گاڵتــەی بە شــتەكە هات ولای سووكبوو/ شــتەكەی بێبایەخ هاتە بەرچاو و دانا.

(هاوَنَ - نَفسَهُ مُهاوَنَةً): بەتەنگ خۆیەوە هاتو لەگەڵ خۆیدا نەرم بوو.

(أَهانَ - هُ إهانَةً): رســوایكرد/ ســووكیكرد/ بەسووك تەماشایكرد/ گاڵتەی پێكرد.

(تَهاوَنَ واسْــتَهانَ - بِهِ تَهاوُناً وأَسْــتِهانَةً):

بەسووك تەماشايكرد/ بەكەميدانا وبەسووك هاتە بەرچاوى/ گالتەى پێكرد.

(إهْـوَأنَّ - تِ المَفازَةَ. إهْوِئْنانـاً): بيابانەكە بەرفراوانو نەويبوو/ نزمبوو.

(ألهـاوَن و الهاوُن والهـاوُون) (ج) هَواوين) (فارسـية): دەسكەوان، دنگ/ دسكو دۆڵ كە دەرمانو شتى ترى تێدا ورد دەكەن.

(ألهَوْن)(مص): ئارامگرتن/ لەسـەرخۆبوون ستارە گرتن: سرەوتن وئاغريى و هێمنى.

(إمشِ على هَونِكَ): (لەسەر خۆ/ هێمن) برۆ.

(«هذا شيءُ هَونٌ»): ئەمە شتێكى (بێبايەخە/ هيچە).

(«أحبب حَبيبَكَ هَوناًما»): لە خۆشەويستى خۆشەويستەكەتدا هێمنبەو زيادرەويى مەكە. (ما)كە واتاى كەمييش دەدات).

(ألهَوْن) (مص): نەنگيى/ رسوايى/ سووكيى/ ئابڕوچوون ٢-خەڵك، كەس/ زەلام.

(مـاأدري أيُّالهَوْنِ هُـوَ): نازانم ئەو چ جۆرە زەلامێكە، كەسێكە.

(ألهَوْنَـةُ(ج) هُـوَنَ): ١-دامركان ٢-ئاشـتى/ تەبايى.

(ألهَوْنَـةُ و الهَوَنَـةُ): ئافرەتى (لەسـەرخۆ/ هێمن/ شێنەيى).

(ألهُوَينـا): شـێنەيى/ لەسـەرخۆيى هێمنى/ هێواشـىو بەزميـى ئەمـە بچووككـراوەى (ألهُوْنَى)يەو (ألهُونى) بە مێكردنى (ألأهْوَن)ە.

(ألهينَـةُ): ١-جـۆر ٢-سـرەوتن وئاغريـىو سەنگينى

(«إمشِ على هِيَنتِكَ»): (نەرم/ لەسـەرخۆ/ بەهێمنى) برۆ.

(ألهَيِّن وَ الهَين (ج) أهْوناء وَهَيْنوُن وَ هَيِّنون (م) هَيِّنَـةُ وهَيْنَة (ج) هَيِّنـات وَ هَيْنات): ١-ئاسان/ سووك ٢-لاواز/ كز/ بێهێز/ بێتوانا/ ٣-زەبوون/ كەساس/ سەرشۆڕ، رسوا ٤-شێنەيى/ لەسەرخۆ/ هێمن/ سەنگين وئاغر.

ألأهْوَن: ١-ئاسـانتر/ سـووكتر ٢-لەسەرخۆتر/ هێمنتر/ نەرمتر.

(هُـوَ أهْـوَنُ عليـه): ئـەولاى (ئاسـانترە/ سووكترە).

(ألمُهْوَئِـنُّ و المُهْوَأنُّ (ج) مُهْوَئِنَّات): شـوێنى دوور يان زەويى نزم.

(ألمَهانَة): رسوايى/ سەرشۆڕيى/ سووكيى.

(«رَجُلٌ فيه مَهانَةٌ»): كابرايەكە سەرشـۆڕو نەنگو بێدەسەلاتە/ بێتوانايە.

(ألمِهْوان (ج) مَهاوين): زۆر شلو نەرم.

هوە: (تَهَوَّةَ الرَجُلُ): بۆ كۆستو لێقەومانەكە سوێو ژان چووە دڵيەوە/ پەرێشانبوو.

(ألهَوْ هاءَة): گەوج.

(ألهَوْهاءَة و الهَوها): چاڵاوێك كە بۆ خوارەوەى پێپيلكەى نەبێتوپەتێكيش نەبێت پێيبچيتە خوارەوەى.

(رَجُلٌ هَوْهاةٌ): ١-بێورەو دڵ ٢-گەوج.

(اَلهُوْهَةُ و الهَواهِيَةُ): زۆر ترسنۆك/ زيرەكردوو
(اَلهَواهــي): قســەی هیچو پووچ ونــارەوا./ نادروست.
هوَ: (اَلهَوّ): ١-تەنیشــت/ لا ٢-كەلەبەر/ درز/ دەلاقە.
(اَلهُــوَّة (ج) هُــوَى و هُوُّوَ هُــوِيٌّ): ١-زەوی چاڵو قوول/ نــزم، كەنــدەڵان ٢-زەویی زۆر چاڵو نادیار ٣-هەواو بۆشــایی نێوان زەوی و ئاسمان.
(اَلهُــوّاءَة): ١-زەوی چاڵو نــزم ٢-زەوی چاڵی زۆر قووڵو نادیار.
هــوي: (هَــوى - تِ العُقابُ. يَهْــوي. هُوِيّاً): كۆلارەكە بــۆ نێچیرەكەیان شــتیتر (داهاتە/ داپەڕییە) خوارێ.
(- ت يدَي لَهُ): دەستم بۆی درێژ كردوبەرز كرد.
(تِ الريحُ): باكە هەڵیكرد.
(- تِ الناقَةُ براكِبِها): مێحوشترەكە سوارەكەی هەڵگرت/ توندبردی.
(- الرجُلَ): پیاوەكە مرد.
(- تِ الطَعْنَــةُ): شــوێنتیغەكەی یان برینی پێدا كردنی نێزەكە دەمیكردەوە.
(- في السَّيرِ): لەسەر ڕۆیشتنەكە ڕۆیشت.
(- في الأَرضِ): بەزەویەكەدا ڕۆیشت.
(- تِ الأُذُنُ) گوێكە زرنگایەوە.
(- الجَبَــلَ هُــوًّا): بەشــاخەكەدا هەڵزنــاو سەریكەوت و بەرزبووەوە .
(- الشَــيءُ. هَوِيًّاً وَهُوِيّاً وَهَوَياناً): ١-شــتەكە لــە بەرزیــەوە بەربــووەوە/ كەوتەخــوارێ ٢-بەرز بووەوە و سەركەوت، وتراوە: (اَلهَوِيُّ): بــۆ بەرزبۆنەوەیە/ باســكە/ ســەرەو ژوورە (اَلهُوِيُّ): بۆ ســەرەو لێژیی/ لێژگە/ ســەرەو خوارەیە.
(- تِ الأُمُّ): ١-دایكەكــە فەوتا/ مرد ٢-جەرگی سووتا.
(أُمّ هاوِيَة): دایكێكی مردوو یان جەرگسووتاو/ كۆستكەوتوو.
(هَــوِيَ- هُ. يَهْــوَى هَــوىً): خۆشیویســت/ حەزیلێكرد/ دڵی تێچوو.
(هَوٍ): حەزلێكردوو/ خۆشویستوو/ دڵتێچوو/ دڵدار/ دڵخواز.
(هاوَى فُــلانٌ. مُهــاواةً وَهِــواءً): (توندتر/ بەگورتر) ڕۆیشت.
(- هُ): ١-دڵیراگرت ٢-پێوەی بەندبوو
(أَهــوى - الشَــيءُ. إِهــواءً): شــتەكە كەوتە خوارێ.
(- تِ العقابُ: كۆلارەكە بۆ نێچیرەكە داپەڕییە خوارێ/ داهاتە خوارێ.
(- الشَيءَ): شتەكەی لەسەرەوە هەڵدایە خوارێ
(- تْ يَدى لَهُ): دەستم بۆی بەرزو درێژ بوو
(أَهوى إِليهِ بيَدِهِ لِيَأخُذَهُ): دەســتی بۆ درێژ كــرد بیگرێــت (دەڵێن ئەو (ب)یــە زیادەیە

راسـتيەكەى: (أَهـوى يَـدَهُ إِلَيهِ)(أَهْوَيـتُ بِالشيءِ): بەشتەكە ئاماژەمكرد.

(أَهْوَيتُ لَهُ بالسَّـيفِ فَأَطَـرتُ أَرنَبَةَ أَنفِهِ): شمشێرەكەم بۆداهێنايەوەوپەرەكەى لووتيم پەراند.

(تَهاوى - القَومُ في المهواة): خوێشـگەل يەك بەدواى يەكدا كەوتنە خوارێ.

(- الرَجُلُ): (توند/ بەگور)رۆيشت.

(إِنْهَوى - الشيءُإِنْهَواءً): شتەكە لەبەرزيەوە/ لەسەرەوە (بەربووەوە/ كەوتە خوارێ).

(إِهْتَـوى- إِلَيهِ بِشَـيءٍ إِهْتِواءً): بە شـتێك ئاماژەى بۆ كرد.

(إِسْـتهوى - هُ إِسْـتَهواءً):١-دڵى وا لێسـەند هۆش‌وگۆشى لێبرى و سەرساميكرد/ شەيداى حەزەكەيكرد ٢-حەزەكەى بۆ رازاندەوەخستيە سەر كەڵكەڵەو هەوەس ٣-نواندى. نواندنێكى/ نوستنێكى موگناتيسيى گرفتارى دڵيكرد.

(أَلهاوي) (ح): كوللە.

(أَلهاوي): پيتى (ئا) أَلـف لەبەر ئەوەيە دەم بۆدەم دەربرينى لە پيتى (واو)و (ياء)زۆرتر دەكرێتەوە لێرەدا وشـەى (الهاوي): هەوادار (دەگرێتەوە).

(أَلهاوِيَّــة): ١-بۆشـايى ئاسـمان ٢-دايكـى جەرگسـووتاو/ زارۆڵە مردوو/ كۆستكەوتوو ٣-يەكێكەلـە ناوەكانـى جەهەنـەم/ دۆزەخ دەيشوترێت: (أَلهاوِيَة).

(أَلهَواء (ج) أَهْوِيَة): با/ هەوا ٢-بۆشايى نێوان ئاسـمانەو زەوى ٣-شـتى بۆش ٤-هەرشـتێك بنەكەى كونبووبێت وهيچى پێوەنەوەسـتێت وەك مەشكەو كوندەى دراو٥-ئەو هەوايەى كە هەڵيدەمژين.

(هَوائـى):١-هەوايـى ٢-زيـرە كـردوو/ زۆر ترسنۆك (تاك و كۆى وەكو يەكە).

(هُوَ هَواءٌ): ئەو زۆر ترسنۆكە/ زيرەكردووە.

(هُم هواءٌ): ئەوان ترسنۆكەكانن.

(أَلهواءوآللواء)تەرمىودڵراگرتن‌وتوندوتيژيى: ئەوەيە بەشتەكەقايلبيت‌و لەگەڵيدا نەرمبيت‌و جارێكيش توندو تيژ بێت.

(عامَلَــهُ بِالهواء و اللـواء): جارێك لەگەڵيدا نەرمبووجارێكيش توندبوو.

(أَلهَـوى (مص) (ج) أَهـواء):١-حەزلێكردن، حەزو ئارەزوو/ دڵتيچـوون/ حەزلێكردن، لە خێرو بێردا يان لە خراپەدا ٢-خواستى دەروون ولادان بەلاى ئەوەدا كە چێژى لێوەرگيرێت.

(أَلَهوى: كان محمـوراً أَو مَذموماً): حەزێك كـە دڵ بيەوێت باشـبێت يان خـراپ بەڵام بەزۆريى بەلاى خراپەدا دەوترێت.

(«فـلان إِتَّبَع هَواهُ»): فيسـار دواى هەوەس‌و ئارەزووەكانيكەوت (ئەمەبۆ خراپ لێوتنيەتى)

(«فُـلان مِن أَهل الأَهـواءِ»): فيسـار لەرێى راسـت لايداوەو دواى هەوەس‌و شتى داهاتووى نابەجێوە كەوتووە.

(أَلهَوي (م) هَوِيَة): دڵدار/ دڵخواز/ حەزكردوو/ خۆشەويست.
(أَلهَوِيّ): ١-زرنگەی ناو گوێ/ گوی زرنگانەوە ٢-هەواو هەوەسی دڵ و دەروون.
(«مَضى هَوِيٌّ أَو هُوِىّ مِن اللَّيل»): بەشى زۆری شەو يان بەشێكی شەو تێپەری.
(«جلستُ عِندَهُ هَوِيّاً»): سەردەمێكی زۆر/ ماوەيەكی زۆر لای دانيشتم.
(أَلهَوِيَّة (ج) هَوايا): بيرێكی/ چاڵاوێكی قووڵ.
(أَلأَهوى): خۆشەويستر/ زۆرتر دەچێتە دڵەوە/ پتر حەزيلێدەكرێت.
(«هذا الشئُ أَهوى إِلَيَّ مِن كذا»): ئەم شتەم لەوە زۆرتردەچێتە دڵەوە/ حەزلەم شتە زۆرتر دەكەم تائەو.
(أَلأُهْوِيَّة): ١-هەوا/ بۆ شايی نێوان زەوی وئاسمان ٢-نزماييەك يان چاڵێكی قووڵ.
(أَلإِسْتِهواء) (مص):خەواندنی موگناتيسيی خستە دڵو مێشكەوە/ تێگەياندن و فێر كردنی بيرو خواستێك بەرێگەی نواندنی موگناتيسييەوە.
(مَضى تَهواءٌ مِن اللَّيل): بەشى زۆری شەو يان بەشێكی شەو تێپەری.
(أَلمَهْوى وَالمَهواة(ج)مَهاوٍ): ١-هەوا يان بۆشايی نێوان زەویوئاسمان ٢-بۆشايی نێوان دوو شاخ، دووشتيتر.

أَلمُلحَق
هَوِي: (أَلهاوِي (ج) هُواة): حەزكار، ئەو كەسەيە حەز كارييەكەی/ حەزخوازييەكەی/ پيشە نەبێت.
(مُصارِعٌ هاوٍ): پاڵەوانێكی زۆرانبازيی حەزكار.
(أَلهِواية أَو أَلهَواية): حەزكاريی. كارێك كە مرۆڤ بيكات بۆ ئارەزووی دڵ وبۆ رابواردن نەك بيكاتە پيشە.
(هِواية الرسم): حەزكاريی/ وێنەكێشان
(ماهِوايَتُكَ): حەزكارييەكەت چييە؟ وێنەكێشانە.
(أَلتَهْوِيَة): گۆرينی هەوای ناو خانەو ماڵەكانو تەلارەكان.
(تَهْوِيَة صالَة السِينَما): تازە كردنەوەو گۆرينی هەوای ناو سينەماكان بەرهەواخستنی بۆ ئەوەی بۆنە ناخۆشەكەی ببرێتو بروات.
(تَهوِيَة فُراش): بەرهەوادانی نوێنی نوستن
(عمليَة التهوية): كردەی تازەكردنەوەی هەواو گۆرينی.

---

هيئ: هاءَ. يهَيءُ هَيْأَةً وَهَياءَةً): قەڵافەتو ديمەنی روخساری رێكوپێكو جوانبوو.
(إليهِ يَهاءُ هِيأَةً): تاسەيكرد/ دڵی بۆی كوركا/ بيريكرد.
(- لِلأَمر. يَهاءُ وَيَهيءُ): شتی پێويستی كارەكەی ئامادە كردو خۆی بۆ ئامادە كرد.

(هَيئَ يَهاءُ وَيَهْيَأ وَهَيُؤ.يَهْيُؤ هَيْأَة وَهَياءَة): قەلافەت رێکوپێك وديمەن جوانبوو.
(هَيَّأَ - هُ. تَهْيِئَةً وَتَهييئاً): پێکهێناو ئامادەیکردو چاکیکرد.
(هاياَ - هُ في الأمرِ. مُهاياَةً)لەکارەکەدالەگەڵیدا. ریککەوتوگونجا (دەشێت هەمزەکەی بۆ سووکی بکرێت بە (ي) بوترێت (هايَيتَه مهاياةً) لەگەڵیدا رێککەوتیت.
(«هاياَهُ في دارِ كذا»): لەگەڵیدا لە خانووەکەدا رێککەوت ئەمیان ماوەیەك وئەویتریان ماوەیەك تیایدا بێت یان هەریەکە بەپێی بەشداریی کەڵکی لەشتەکە بینی.
(فعلوا كذا بالمُهاياَةِ)هەریەکە بەپێی بەشداربوونیان کەڵکیان لێوەرگۆت (ئەمەیش زاراوەیەکی شەرعییە).
(تَهَيَّأَ - لِلأمرِتَهَيُّؤاً): بۆ کارەکە خۆی ئامادە کردو پێویستیشی بۆ دابینکردو خۆی بۆ تەرخانکرد.
(تَهَيَّأَ - الشيءُ لِفُلان): شتەکە بۆ فیسار لەباربوو/ بۆی لوا وتوانای بەسەریدا بوو.
(تَهاياَ - القومُ على الأمرِ تَهايُؤاً): خوێشگەل لەسەر کارەکە ریککەوتن/ گونجانو کومەکی یەکتریانکر.
(تَهايَأوا -على كذا): بۆ ئەنجامدانی ئەوە کۆمەکی یەکتریانکردو بەلای یەکترەوە چوون.

(ألهَيْءُ والهِيْءُ): بانگکردن بۆ خواردنو خواردنەوە.
(ألهَيْئَةَو الهِيئَة(ج)هَيْئات): ١ـباری شتەکە، چۆنیەتی/ شێوازی/ شێوەی ٢ـدیمەنی روخسارو قیافەت ٣ـدەستە، رێکخراو/ کۆمەڵ.
(عِلمُ آلهَيئَة): زانستیەکە لەرەوشی ئەستێرەکان دەکۆڵێتەوەو باسیاندەکات.
(ألهَيْ والهَيءُ): قیافەتوروخسار ریکوپێك و جوانبوون.
هیب: ١-(هابَ - هُ يَهابُ. هَيباًوَ هَيبَةً وَمَهابَةً): لێیترساو خۆی لێپاراست وسڵی لێکردەوە (هائِب وَهَيُوب وَهَيُوبَة) وَهَيَّاب وَهَيِّب وَهَيْبان وَ هَيِّبان وهَيَّبان وَهَيَّابَة): لەخەڵکترساوو/ سڵکردوو خۆپارێز.
(مَهُوب ومَهيب وَهَيُوب وهَيْبان) خەڵکترسێن/ بەسام/ سامدار یان شکودار، بەرێز.
(هابَهُ يهيبُهُ): لێیترسا. سلی لێدەکاتەوە یان رێزی لیدەگرێت.
(هابَ - الرجُلُ فُلاناً): رێزی لە فیسار گرتو بەگەورەیگرت/ مەزنیکرد.
(هَيَّبَ - هُ إلى فُلان. تَهْييباً): ئەوی لای فیسار ترساککرد.وایلێکرد خۆی لێبپارێزێت یان لای مەزنکرد.
(أهابَ - الراعي بِغَنَمِهِ إهابَةً): شوانەکە دەنگی لە مەرەکانیکرد بگەرێنەوە یان برۆن.
(- بالإبلِ) بە تورەبونەوە دەنگی لەحوشترەکان

کرد وتی: (هابْ): هۆش.
(- بِالخَيلِ): بانگــی چارەوێکەیکردو دەنگی لێکردبــروات یان بوەســتێت وتــی: (هَب أو هبي) هەچە یان هۆش.
(- بصاحِبِهِ): دۆستەکەی بانگکرد.
(تَهَيَّبَ - هُ تَهَيُّباً): ١-لێیترســا، سڵی لێکردەوە ٢-تۆقاندی و ترساندی.
(تَهَيَّنني زيدُ): زەید ترساندمی.
(إهْتابَ - هُ إهْتِياباً): لێیترساو سڵی لێکردەوە
(ألْهَاب)(ح): مار.
(ألهَيبَــةُ) (مص): ١-تـرس ٢-ســل، ســام ٢-دڵ نەسرەوتنو ڕێزلێگرتن بەترسو سامەوە.
(ألهَيَّبَــان): ١-ئەوەی ســل لەخەڵك دەکاتەوەو دەترسێت خۆی لێیان دەپارێزێت ٢-زیرەکردو/ زۆر تر سنۆك٣-شوان.
(ألأهْيَب): پەسامترین ترسناکترین.
(مكانٌ مَهابٌ وَمَهُوبٌ): شــوێنێکی (سامدار/ سامناك/ ترسناك).
(«هــذا الشــيءُ مَهيَبــةٌ لــكَ»): ئەم شــتە دەتترسێنێت/ سامی بۆت هەیە.
٢-(ألهَيَّبان): ١-خاك/ خۆڵ/ گل ٢-کەفی دەمی حوشتر ٣-زۆر/ فرە ٤-سووك/ سووکەڵە.
هیت:١- (هَيَّتَ - بِفُلانٍ تَهْييتاً): دەنگیلێکردو بانگیکرد/ هاواری لێکرد.
(هاتِ): بمدەرێ/ بێنەو بیدەرە دەستم.
(هاتِ يارَجُل وهاتي ياإمرأة. وهاتِيا يارجلانِ ويا إمرأتانِ و هاتوا يارجال وهاتينَ يانساءُ): بێنە بیدەرە دەســتم پیاوەکــە، بێنە ژنەکە. بێنەدوو پیاوەکــەو دووژنەکە.بێنە بمدەنێ بیدەنەدەستم پیاوەکانو ژنەکان.
(هَيْتَ وهَيْتُ وهَيــتِ. وهَيتَ وهِيتُ وهِيتِ لَكَ): ئادەی وەرە بــۆی (تاكو کۆو نێرو مێ وەك یەکە بۆ بەکار هێنانی. تەنها راناوەکانی دەگۆڕێــن دەڵێــن: (هَيتَ لَكُمــا و هَيتَ لَكُم وهَيتَ لَكُنَّ): ئادەی بۆی وەرنە بەرەوە.
٢-(ألهِيْــت): کەندەڵانێکــی زۆر قووڵی وا کە بنەکەی نەزانرێت چۆنە ودیار نەبێت.
هیث: (هــاثَ - لِفُلانٍ يَهيثُ هَيْثاً و هَيثَاناً) شتێکی کەمی بەفیساردا.
(- مِنَ المالِ): دارای پێویستی خۆی دەستکەوت
(هايَــثَ - هُ مُهايَثَــةً): ١-لــەوی زۆر تربــوو ٢-شانازیی بەسەردا کرد کە لەوی زۆرتر هەیە.
(تَهَيَّثَ - لَهُ شَيئاً. تَهَيُّثاً): شتێکی دایە.
(إسْــتِهاثَ - ماأعطاهُ إسْــتِهاثَةً): ئەوەی کە دایێ بەزۆری دانا/ بەزۆری زانی.
(ألمَهايث): زۆر بردە کەسێکە شتەکە بۆ خۆی دەماشێتەوەو رایدەدات و دەیبات.
٢-(هاثَ - القَومُ - يَهيثُ هَيثاً): لە ناکۆکیدا بەیەکدا چوون.
(-الشيءُ): شتەکە (بزوا/ جوڵا).
(- في الشيءِ. هَيثاًوَهَيَثاناً): چووە شتەکەوە وتێکیدا/ خراپیکرد.

(- الذِئـبُ في الغَنَـم): گورگەکـە چـووە مەڕەکانەوەو کوڵەواریکردن.
(- برجلِهِ التُرابَ): بەپێ‌خۆڵەکەی دەردا.
(تَهايَثَ القَومُ): خوێشگەل لە ناکۆکییەکەدا، لە شەڕدا بەیەکدا چوون.
(إسْـتَهاثَ - المـالَ إسْـتِهاثَةً): داراییەکەی لەکەڵکداو لەناوبرد.
(هايِثَةُ القَـوم): ژاوەژاووهات‌و هاوار/ دەنگە دەنگی خوێشگەل.
(ألهَيث): بزوە/ جووڵە.
(ألهَيثَة): کۆمەڵە خەڵکێك.
هيج:١ -(هاجَ - الشيءُ يَهيجُ. هَيجاً وَهِياجاً وَهَيَجاناً): شـتەکە هەسـتاو وورووژاو کەوتە جووڵە وراپەری/ خرۆشا.
(البَحرُ): دەریاکە هەسـتا، خرۆشـاو کەوتە شەپۆڵدان وجووڵە.
(- الرَجُـلُ): ١- شـێتگیربووو ەماری گەوجی هەستاوشـپرزەو یاخیبو ٢-ئازابـوو بێباکانە خۆی هاویشتە کارەکەوە.
(- الشـيءَ وبالشَـيءِ): شـتەکەی وروژاندو خستە جووڵەو هەستان.
(- تِ لإبِلُ): حوشترەکان تینویانبوو
(- الإبِلَ): حوشـترەکانی بەشەو خستە ڕەو/ جووڵە بۆ سەر ئاو خواردنەوە یان لەوەڕ.
(«-هاجَت السَّماءُ فَمُطِرنا»): ئاسمان وروژا هەور کەوتە ئاسمان و بازۆر بووو بارانی لێداکردین.
(هَيَّجَ الشَـيءَ تَهَيُّجاً): شـتەکەی ورووژاند، هەژاند وهەستاند/ راپەراند.
(هَيَّجَ بَينَهُما الشَـرَّ): شەڕو خراپەو ئاژاوەی لە نێوانیاندا (ورووژاند/ بەرپاکرد).
(هايَـجَ -هُ مُهايَجَةً وَهِياجـاً): ورووژاندی ودەمارگیریکردو لەگەڵیدا کەوتە جەنگەوە
(تَهَيَّجَ، تَهَيُّجاً): وروورژا/ خرۆشـا، هەڵچوو/ بەلەسەبوو/ راپەری.
(تَهايَجَ - القَومُ.تَهايُجاً): خوێشـگەل لەیەك راپەریـن/ لەیـەك خرۆشـان‌و جەنگیان دایە یەك/ پەلامـاری یەکیاندا/ شـەڕیان لەگەڵ یەك کرد.
(إهْتاجَ الشـيءُ إهتياجاً): شتەکە هەڵچوو/ هەستا/ خرۆشا/ ورووژا.
(ألهائِج) (فا): هەژیو/ بەلەسـە/ خرۆشـاو/ شێتگیر/ رقهەستاو توورەو دەمارگیر.
(«هاج هائِجُهُ»): دەمارگیربوو/ رقی هەستاو توورەبوو.
(«هَدَأ أهائِجُهُ»): (رقەکەی/ توورەییەکەی) نیشتەوە/ دامردەوە.
(الهائِجَةُ: مێی وشەی (الهائِج).
ألهَيْـج (مص): جەنگ/ شـەڕ ٢-خرۆشـان/ وروژان، جووڵە/ بزوە ٣-توندەبا.
(يَـومُ هَيج): رۆژێکی تـووش/ رۆژی باو بژ یان باران‌و هەوراوی. بەهەوری تازە پەیدابوو دەڵێن.

٤-(أَلوَجيئَة)(ج): مانگا/ چێڵ.
وجب: ١-(وَجَبَ-الشيءُ يَجِبُ. وُجُوباً و وَجبَةً): شتەکە پێویست بوو، بوو بە ئەرك
(وَجَبَ لي علی فلان كذا): ئەوەم لەسەر فیسارە پێویستە بیداتەوە/ هێندەم لەسەر فیسار هەیە دەبێت بیدات و بیداتەوە
(-الرَجُلُ وَجَبةً): لە رۆژێکدا ژەمێکی خواردن خوارد.
(-الحائِطُ و نَحْوُهُ): دیوارەکە یان شتی وەها رما/ کەوت/ رووخا.
(-الرَجُلُ. وَجْباً وَ وُجوباً): پیاوەکە کەوت و مرد.
(«ضَرَبَهُ فَوَجَبَ»): لێیدا و رما و مرد.
(-تِ الشَمسُ): خۆرەکە داکەوت و ئاوابوو.
(-تِ العَينُ): چاوەکە بەقووڵداچوو.
(-القَلبُ وَجْباً وَ وَجيباً وَ وَجَباناً): دڵەکە کەوتە لەرزین و کوتەکوت/ تەپە تەپ.
(وَجُبَ يَوْجُبُ وجوبَةً): زیرەکردوو بوو/ زۆر ترسنۆکبوو.
(وَجَّبَ): لە رۆژێکدا ژەمێك نانی خوارد.
(وَجَّبَ نَفْسَهُ وَ لِنَفسِهِ): خۆی بە ژەمێك خواردنی رۆژێك راهێنا.
(-الأَمرَ عَلَيه): کارەکەی خستە ئەستۆی ئەو و بەسەریەوە کردی بە ئەرك/ پێویست.
(-النَاقَةَ): مێحوشترەکەی لە شەو و رۆژێکدا تەنها یەکجار دۆشی.
(-الضَّيفَ)(عامية): میواندارییەکی باشی میوانەکەی کرد و رێزی لێگرت.
(-بِهِ الأَرض): کێشای/ کوتای بە زەویدا.
(-تِ الإِبلُ): حوشترەکان شەکەت بوون.
(-البَعيرُ): حوشترەکە چۆکی دادا و خۆی بە زەویدا دا.
(-اللبأُ فِي ضَرعِ الناقَةِ): ژەکەکە لە گوانی مێحوشترەکەدا گرێی بەست/ رەقبوو.
(واجَبَ-هُ وِجاباً وَ مُواجَبَةً): خستیە ئەستۆی ئەو/ کردی بە پێویستی سەر شانی/ کردی بە ئەرك بەسەریەوە.
(أَوجَبَ- لِفُلانٍ حَقَّهُ إِيجاباً): مافی فیساری پاراست و بە تەنگیەوە هات.
(«قد فَعَلْتُ ذلك إِيجاباً لِحَقِّهِ»): ئەوەم وەك ئەرکێکی پاراستنی مافی ئەو کرد، مافەکەیم پاراست.
(-الشيءَ): شتەکەی بە ئەرکی سەر شانی دانا یان کردی بە پێویستیی سەر شانی خۆی.
(-البَيعَ): فرۆشتنەکەی کرد بە پێویست.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە کردارێکی کرد کە پاداشتەکەی یان ئاگری جەهەنەمە یان بەهەشتە.
(-الرَجُلُ): بە رۆژە کە تەنها ژەمێك نانی خوارد.
(-اللهُ قَلْبَهُ): خودا دڵی هێنایە لەرزین و خستییە تەپەتەپ.
(تَوَجَّبَ): لە رۆژێکدا ژەمێك نانی خوارد.

(تَواجَبَ-القَومُ): خوێشکەل گرەویان لەگەڵ یەکدا کرد (وەکو شتیان لەسەر یەك پێویست کردبێت).
(إستَوجَبَ-الشـيءَ): ١-إسـتيجاباً: شـتەکە شـیاوی ئـەوە/ مافیەتـی/ هەڵدەگرێت هی ئەوبێـت/ بەریدەکەوێـت. ٢-بە پێویسـت و ئەرکی دانا.
(ألواجِـب) (فا): ١-ئەرکـی زۆرەملی کە هەر دەبێت بکرێت/ پێویسـت/ دانی ئەو شتە یان جێبەجێ کردنی ئەو کارەی لەئەسـتۆدایە و دەبێت بکرێت و لەسەریەتی ٢-بەرامبەرەکەی دەشـێت و ناشـێت/ رەنگـە/ لەوانەیە/ بۆی هەیە ٣-کوژراو.
(واجِبُ الوُجُود): ئەوەیە دەبێت هەر ببێت و لە خۆیەوە هەیەو پێویستی بە هیچ هۆکارێکی بوون نەبێت.
(واجب الوُجود): خودایە.
(ألوَجْب (مـص) وَ الوَجابَـة): زیرەکردوو (بۆیە وا ناونراوە چونکە وەك کەوتوو وایە).
(ألوَجَب): ١-مەترسیی ٢-پێشبرکێیەکە خەباتی بۆ دەکرێت کێ پێشـکەوت ئـەوە دەیباتەوە و خەڵاتەکەی وەردەگرێت.
(ألوَجْبَة) (ج) وَجَبات(مص): ١-کەوتن/ رمان لەگەڵ تەپەی کەوتنەکـە یان دەنگی رمان و کەوتووەکە. ٢-ژەمە خواردنێك لە رۆژێکدا.
(-عند العامة): دەستە شتێك کە لەیەك جۆر بێت وەك دەستەی کەوچك.

(وَجْبَـةُ الأَسـنان): ئەمە بە پێـی زاراوەی پزیشکی ددانیی: تاقمی ددانی دروستکراو.
(ألوَجَّاب): زۆر ترسنۆك/ زیرەکردوو.
(قَلْبٌ وَجَّاب): دڵێکی زۆر بەترپە/ دڵێك زۆر دڵەکوتێ بکات.
(ألوُجوب) (مص): ١-بەرگ/ پۆشاك ٢-سەلماندن و خۆسـەپاندن و دامەزراندن بۆ پێزانینی لەلایەن خەڵکەوە.
(ألوَجيبَـة): ١-کارمەندیـی ٢-جارێـك یـان کۆمەڵێك، شتێك، جارێك بفرۆشیت و دەست بە دەسـت پارەکـەی وەرگریت، یـان رۆژ بە رۆژ پارەکەی وەربگریـت، ئەگەر لێبوویتەوە و هەموویـت وەرگرت، دەڵێیت لە فرۆشـتنی شتەکە بوومەوە.
(ألموجِب)(فـا): هـۆکار یـان هانـدەر یـان پێویستیی.
(ألموجِبَة): کاری گـەورەی چاکە یان گوناهی گـەورە و کردگـاری خراپـەی گـەورە کـە ئەنجامەکەی بۆ بەهەشت یان دۆزەخ چوونە.
(ألمُوجِب (ج) مَواجِب): مردن/ مەرگ.
(خَـرَجَ القَومُ إلى مَواجِبِهِم): خوێشـکەل بۆ مەرگی خۆیان چوون.
(ألمُوجَب)(مفع)- مِنَ الكلامَ): قسەی دروست و بنجبەسـت و تەواو (کە نە پرسـیارە و نە دەڵێت نەکراوە و نە دەڵێت مەیکە).
٢-(وَجَبَ-فُلاناً عَنهُ يَجِـبُ وَجْباً ووجوباً):

بەری لە فیسار گرت و نەیهێشت/ لێیگێڕایەوە.
٢-(أَلوَجْب (ج) وِجاب): کوندەیەکی گەورە.
أَلْلَحَق
وجب: (أَلإِيجاب): ١-پێویست و ناچاری/ بەدەربەستکردن ٢-جەختکردن و چەسپاندن پێچەوانەی خۆدزینەوە و حاشالێکردن
(«رَدٌّ بالايجاب»): وەڵامی پێقایلبوونی دایەوە بەدەنگەوە چوو.
(أَلإيجابيّ): جەختکردنانە و سەلماندنانە کە نیشانەی پێقایل بوون و ڕێکەوتن.
(رَدٌّ إِيجابي): وەڵامدانەوەیەکی (بەدەنگەوە چوون/ قایلبوون)
(إِشارةٌ إِيجابِيّة): ئاماژەیەکی بەدەنگەوەچوون و قایلبوون و ڕێکەوتنە.
(أَلحياد ألإيجابي): بێلایەنیی بەدەنگەوەچوون.

---

وجح: (وَجَّحَ-الشيءُ): دەرکەوت و بینرا/ ڕوونبووەوە/ دیاریدا.
(أَوجَحَ): دەرکەوت/ بینرا/ دیاریکرا.
(-تِ النارُ): ئاگرەکە شەوقیدایەوەو دەرکەوت.
(-تِ غُرَّةُ الفَرَسِ): پەڵەی ناوچەوانی ئاسپە مارۆکە دەرکەوت/ دیاربوو.
٢-(أَوجَحَ-البَيتَ): پەردەی خانووەکەی دادایەوە).
(-هُ إِلى كَذا): ناچاری ئەوەیکرد/ پەنای ئەوەی پێبرد.
(-البَولُ فُلاناً): میزەکە تەنگی پێهەڵچنی.
(-الحافِر): بیرهەڵکەنەکە گەیشتە تاوێرە لووسەکە تاوێرەکە ژێرەوەی شاردۆتەوە ناهێڵێت بیگاتێ. (أَلوَحْجُ): کەورگ/ نیمچە ئەشکەوت.
(أَلوَجاح): ١-پەردە ٢-تاوێری لووس.
(أَلوُجاح و الوِجاح): پەردە.
(أَلوَجيح): جلی کوتاڵسفت و قایم
(أَلمُوجَح)(مفع): ١-پەناگا ٢-جلی کوتاڵسفت و قایم. ٣-چەرمی لووس/ پێستی لووس.
(أَلموجوح-مِن الأبواب): دەرگای ڕووتێنەکراو یان پەردە دادراو.
وجد: ١-(وَجَدَ-المَطلوبَ يَجِدُ. وَجْداً وَ وُجْداً وجِدَةً وَ وُجُوداً وَ وِجْداناً و إِجْداناً: دۆزییەوە/ دییەوە/ دەستگیری بوو/ پێیگەیشت
«وَجَدتُ الضالَّةَ»: ئەوەی لێم ون بووبوو دۆزیمەوە.
وَجَدَ: زانی/ پێی زانی/ پێی گەیشت
(«وَجَدتُ كلامَكَ صادِقاً»): ئاخاوتنەکەتم بە ڕاست زانی.
وَجَدَ-المالَ وَ نَحْوَهُ. وَجْداً وَ وِجداً وَ وُجْداً وَجِدَةً: بە داراییەکە/ بە سامانەکەدا کەوت/ دەوڵەمەند بوو.
(-بِفُلان يَجِدُ ويَجُدُ وَجْداً): زۆر خۆشی ویست.
(- عليه وَجْداً وجِدَةً و مَوجِدَةً وَ وجداناً): لێی تووڕە بوو.

(-لَهُ): داخی بۆ خوارد/ بۆی دڵگرانبوو.
(وَجِدَ-المَطلـوبَ. يَجِدُ وَجْداً وَ وُجْداً وَجِدَةً وَ وُجـوداً وَ وِجدانــاً وَ إجدانــاً: دۆزییەوە دییەوە دەســتگیری بــووەوە چنگی کەوتەوە، کــە لە دەســتی چووبوو. ئەوەی دەیخواســت پێیگەیشت.
(وُجِدَ الشـيءُ عَن عَدَمٍ): شــتەکە لە نەبوو (پەیدابوو/ بوو)/ بەدیبوو.
(موجود): بووە/ بەدیهاتوو/ هەبوو.
(أوجَدَ-اللهُ الشيءَ): خودا شتەکەی لە نەبوو بەدیهێنا/ هێنایەدی
(-هُ مَطلوبَهُ): ١-ئەوی بە خواســت و حەزی خۆی گەیاند ٢-دەستگیری کرد.
(-فُلانــاً): ١-بــە دەســەڵات و هێزی کــرد ٢-وا دەوڵەمەندی کرد کە پێویستی بە کەس نەبێت.
(-هُ على الأمرِ): بە زۆر ناچاری ئەنجامدانی کارەکەی کرد.
(-هُ إلَيهِ): ناچاری لای ئەوی کرد یان ناچاری ئەوەی کرد.
(تَوَجَّدَ-بــهِ): ئــەوی خــۆش ویســت/ دڵی پێداچوو.
(-لَهُ): بۆی دڵتەنگ و خەفەتبار بوو/ داخی بۆ خوارد.
(-السَــهَرَ وَ نَحوَهُ): سکاڵا و هاواری لە دەست بێخەوی و شتی تر کرد.
(تَواجَدَ): خۆی بە (بەختیار/ شاد/ کامەران) زانی. خۆی بە دڵتەنگ/ خەفەتبار دی. خۆی بە دڵدار و حەزخواز نواندو دەربڕی.
(اَلواجِد) (فا): ١-ســاماندار/ دارا/ دەوڵەمەند ٢-دڵدار/ حــەزدار ٣-بێنیاز لە هەموو کەس و شتێك.
(«أنا واجِدٌ لِلشَّــيءِ»): من توانام بەسەر ئەو شتەدا هەیە و بە دەسەڵاتم.
(اَلجِدَة) (مص): ١-دەوڵەمەندیی/ دارایی ٢-تواناو دەسەڵات.
(اَلوَجْــدُ اَلوُجــد و الوِجْــد): (چاوگــن) ١-دەوڵەمەنـدیــی/ دارایی ٢-(خۆشەویســتی/ حەزلێکردن)ی بەسۆز و گەرم/ بۆشەیدا بوون ٣-دڵخۆشیی/ گوشادیی ٤-توانا و دەسەڵات.
(«هذا مِن وَجْدِي»): ئەمە لە توانای مندایە
(اَلوَجّاد): قوشقی/ تووڕەوتڕۆ کەسێکە زۆر و زوو تووڕە بێت.
(الوِجدان) ١-(مص): ویژدان ٢-لای هەندێك: دەروون و هێزە ناوەییەکانە.
(اَلوِجدانِــيّ (ج) وجدانِیّــات): ١-ئــەوەی هەرکەسە لە دەروونی خۆی دەگات و دەزانێت چۆنــە و تیایدا دەبینێــت ٢-ئەوەی بە هێزی دەروون دەرکی پێدەکرێ.
(اَلوُجود): (مص): بوون و مان کە پێچەوانەی نەبوون و نەمانە.
(اَلوُجودِيّ): لەخۆوە بوون و مان. پێچەوانەی نەبوون و نەمانە.

(اَلْوُجودِيَّــةُ): لەخــۆوە بــوون. ڕێڕەوێكــی فەلسەفانەیە دەڵێت: مرۆڤ كە سەرەتا پەیدا بووە میتافیزیكــی خۆی خۆی بەدیدەهێنێت و بە كــردەی خۆی خۆی دەنوێنێت و بەڕێوە دەبات.

(اَلْوجودِيّ): پەیڕەوكاری فەلسەفەی لەخۆوە بوون.

٢-(اَلْوَجْد (ج) وِجاد): شوێنی ناوگر/ زۆنگ.

(اَلْوَجيد (ج) وُجدان): زەویی تەخت و ساف.

وجــذ: (أَوجَــذَ-هُ إِلى كذا): ناچــاری ئەوەی كرد.

(-هُ عَلَيــهِ): زۆری ئــەوەی لێكــرد/ ناچاری ئەوەی لێكرد.

(اَلْوَجْــذ (ج) وِجــاذ وَ وِجــذان): چاڵێكی ناوشــاخ كە ئاوی تێــدا كۆدەبێتەوە و دەبێتە زۆنگ و زەلكاو دەیڵێن: گۆڵە.

(مكانٌ وَجِذٌ): شــوێنێك كە گۆلاوی زۆر بێت زۆنگ بێت.

وجر: (وَجَرَ-هُ يَجِرُ. وُجْراً): دەرمانی كردە دەمیەوە.

(-فُلاناً): قسەی ناشــیرینی بەگوێی فیساردا داو پێی وت.

(وَجِرَ-مِن كذا. يَوْجَرُ وَجَراً): لەوە (ترســا/ سڵی كردەوە).

(وَجِــرٌ و أَوجَــر (م) وَجِــرَة وَ وَجْــراء): لێترساو/ سڵكردوو.

(أَوجَــرَ-هُ الوَجُورَ إِيجــاراً): دەرمانی كردە دەمیەوە.

(-هُ الرمحَ): نیزەكەی بە دەمیدا كرد.

(تَوَجَّرَ-الماءَ): ئاوەكەی بە ناچاریی خواردەوە.

(-الــدواءَ): دەرمانەكەی قومــە قومە خوارد یان تۆزە تۆزە قووتدا.

(اِتَّجَــرُ): دەرمانــی كردە دەمــی خۆیەوە لە بنچینەدا (اَوْتَجَرَ)یە.

(اَلْوَجر (مص) (ج) أَوجار): كەورگ كە وەك ئەشكەوتێكی بچووكە لە شاخدا.

(اَلْوَجْــرَةُ و الوَجَرَةُ (ج) أَوجار): چاڵی داوی دڕندەگرتن كە دڕندەكە بە ســەریدا بڕوات و تێیدەكەوێت دەگیرێت.

(اَلْوِجــار وَ الوُجــار (ج) أَوْجِــرَة وَ وُجُر): ١-كەندر/ شیو، كە لافاو دایدەدڕێت و دروستی دەكات لە دۆڵدا ٢-كونە كەمتیار و كونی هیتر (چونكە وەك چۆن خواردنەوە لە گەرووداوون دەبێت ئەویش لە كونەكەیدا ون دەبێت).

(اَلْوَجُور والوَجُــور): دەرمانێك كە دەكرێتە دەمەوە.

(اَلْميجار): ڕێكتی تۆپ.

(اَلْميجَــر و الميجَرَة): كەوچكێك شــتێكی لەو بابەتە كە دەرمانی پێ دەكرێتە دەمەوە.

وجز: (وَجَزَ-الكَلامَ يَجِزُ. وَجْزاً): ئاخاوتنەكەی كورتو پڕ واتاكرد.

(-الرَّجُلُ في مَنطِقِــهِ): پیاوەكە گفتەكەیدا

کورتۆ پرواتا بوو.

(وَجُزَ-ألكَلامُ يَوجُزُ وجازَةَ): وتەکە کورت و چڕوپڕ واتا بوو.

(-الرَجُــلُ في مَنطِقِــهِ. وَجْــزاً وَ وجازَةً وَ وُجُوزاً): پیاوەکە لــە گفتەکەیدا کورتو پڕ واتا دەربڕی.

(أوجَزَ-الكَلامَ. إيجازاً): قســەکە کورت و بە واتا بوو.

(-الــكَلامَ و في الكَلامِ): لە کورتی قســەکەی بڕییەوە/ ئاخاوتنەکەی کورتکرد.

(-العَطِيَّة): شتەکەی زوو بەخشی/ پەلەی لە بەخشینەکەدا کرد.

(تَوَجَزَّ-الشَــيْءَ): ویستی شــتەکە زوو تەواو بێت و ئەنجام بدرێت.

(إسْــتَوْجَزَ-الكَلامَ. إسْــتيجازاً): ئــەوەی لە ئاخاوتنەکەدا زیاد بوو لایبردو نەیوت.

(ألواجز): ئاسانو کورتکراوە.

(-مِنَ الكلامِ): قســەی سووك و کورت و چڕ کە زوو تێیبگەن.

(ألوَجْز):(مص): سووك و پوختە و کورتکراوە

(-مِنَ الكَلامِ): ئاخاوتنــی کورت و پوختە و چڕ.

(رَجُلٌ وَجْــزٌ): پیاوێکی چابــووك و ئازا لە بەخشیندا یان لە هەستان و هاتوچۆدا.

(ألوَجيز): سووکەڵە و کورت و بەکەڵك.

(-مِــنَ الكَلامِ): ئاخاوتنی کــورت و پڕواتا و ئاسان/ چڕوپڕ و ئاسان کە زوو تێیبگەن.

(ألمِيجاز) کەسێکە کە هەمیشە قسەکانی کورت و چڕوپڕ و ئاسانە بۆ تێگەیشتن.

ألمُلْحَق

وجــز: (ألإيجــاز): کورتکردنــەوەی قســەو چڕوپڕکردن.

(«تَكَلَّمَ بإيجازٍ»): بە کورتی دوا.

ألإيجــاز: بەکارهێنانی وشــەی کەم کە واتای زۆر ببەخشێت یان وەکو دەڵێن: نیاز بە چەند رستەیەکی کورتی پڕ واتای باو دەرببڕێت

(«يقابلُهُ الاطناب»): بەرامبەرەکەی قســەی درێژ دادریە.

---

وجس: (١-وَجَسَ. يَجِسُ. وَجْساً): شاردراوە بوو/ پەنهان بوو.

(-تِ الأُذُنُ): گوێکە دەنگێکی نزمی بیســتو هەستی بە شتێك کرد.

(-وَجْساً وَ وَجَساناً): بەو دەنگەی کە بەر گوێی کەوت تۆقی یــان دڵی کەوتە ترپە ترپ/ دڵی داخورپا. (أوجَسَ-الرَجُلُ. إيجاساً): پیاوەکە هەســتی بە شــتێك کرد و دڵی داخورپا/ دڵی بۆ شــتێك چوو کە لێی بترســێت. («أوجَسَ القَلْبُ فَزعاً»): دڵی ترسا و خورپەی تێکەوت، راچڵەکی چاوەڕێی شتێکی خراپ بوو.

(-تِ الأُذُنُ): گوێکە دەنگێکی نزمی بیست.

(تَوَجَّسَ): بە ترسەوە گوێی بۆ دەنگە نزمەکە هەڵخست/ سووسەیکرد.

(-فَزَعاً): هەستی بە تۆقین و ترس کرد.
(-الصَوتَ): دەنگەکەی بەر گوێ کەوتو ترسا ترس و خورپە کەوتە دڵییەوە.
(-تِ الأُذُنُ): گوێکە دەنگێکی تێهات.
(الواجِسُ) (فا) = الهاجِس): ١-ئەندێشەی ترسناك کە بە دڵ و مێشکدا بێت و بەسەر مرۆڤدا زاڵ بێت ٢-دڵ خەبەردانی شتێك یا پەژارەیەك کە دڵ بگرێت.
(اَلوَجْس):(مص): ١-دەنگێکی نادیار و شپرزە بوون و تۆقین ٢-دڵ داخورپان و راچڵەکانی و دەنگێکی نهێنیی.
٢-(تَوَجَّسَ-الطَعامَ اَو الشرابَ): کەمە کەمە خواردن یان خواردنەوەکەی چەشت/ چێزکە چێزکەی کرد (الأَوْجَس): کەمەکە خواردن و خواردنەوە.
٣-(الأَوْجَس): رۆژگار
(«لا اَفْعَلُهُ سَجِيسَ الأَوجَسِ»): هەرگیزاو هەرگیز ئەوە ناکەم هەتا هەتایە بە لای ئەوەدا ناچم و نایکەم.
وجع: ١-(وَجِعَ. يَوجَعُ. وَجَعاً): دەردەدار بوو، نەخۆشکەوتو ئازاری پەیدا کرد.
(يَيجَعُ و ياجَعُ=يَوجَعُ): نەخۆشدەکەوێت و ئازار پەیدا دەکات.
(وَجِعَ فُلاناً رَأْسُهُ وَ وَجِعَ فُلانٌ رَأسَهُ): سەری هاتەژان/ سەری یەشا.
(اَوجَعَ-هُ. إِيجاعاً): ئازاری دایە/ ژانی پێگەیاند.
(- بالعَدوِ): دەرد و ئازاری بە دوژمن گەیاند. واتا: زۆری لێ کوشتن و پەرێشانی کردن.
(تَوَجَّعَ): ژان و ئازاری بوو/ ئازاری پێگەیشت و لە تاو ئازار هاواری لێهەستا ئای و ئۆیی کرد.
(-لَهُ): شینی بۆ کۆستەکە کرد و بۆی لاواندەوە و پێیدا هەڵیدا.
(اَلوَجَع)(ج) وِجاع وَ أَوجاع): نەخۆشیی/ دەرد و ئازار/ ژان/ ئێش.
(اَلوَجِع (ج) وَجِعون وَ وَجعى وَ وَجاعى ووِجاع واوجاع (م) وَجِعَة(ج) وَجاعى وَ وَجِعات): ١-دەردەدار/ نەخۆش ٢-ژان کردوو/ ئێش و ئازاردار.
(اَلوَجيع=اَلموجِع): بە ئازار/ بە ژان/ بە ئێش/ ئازاربەخش/ ژانەدەر/ بەئێش.
(«ضَرْبٌ وجيع»): لێدانێکی ئازاراوی/ بە ئێش.
(الأَوجَع): زۆر بە ئازار/ زۆر بە ژان.
٢-(اَلجِعَة): ناوی جۆ/ شەرابی جۆ/ بیرە.
(اَلوَجْعَاء (ج) وَجْعاوات): پشت، پشتەوە و دواییی هەموو شتێك/ پاشینی/ بن/ قنگ.
وجف: (وَجَفَ-الشيءُ يَجِفُ وَجْفاً وَ وَجِيفاً وَ وُجُوفاً): شتەکە لەرزی و لەرییەوە.
(-القَلْبُ وَجِيفاً): دڵەکە کەوتە کوت و لەرزین.

(وَجَّاف و واجِف): دڵی تووش بووی دڵەلەرزێ و کوتە کوت.
(وَجَف-الفَرَسُ وَجْفَاً وَ وَجيفاً): چارەوێکە غاری کرد و توند ڕۆیشت.
(فرسٌ واجِف): چارەوێیەکی خێراو تیژڕەو.
(أَوْجَفَ الفَرَسَ): غارێکی توندی بە چارەوێکە کرد/ تاوی بە چارەوێکەدا.
(-البابَ): دەرگاکەی خرِ داخست.
(-الشيءَ): شتەکەی خستە جووڵەو لەقەلەقو بزواندن.
(إِسْـتَوجَفَ الحُـبُّ فُـؤادَهُ): دڵداریـی/ خۆشەویستیی دڵی برد و پەرێشانی کرد.
(أَلوَجيْف):(مص): لە ترساندا کەوتن.
(ناقَـةٌ مِيْجَـافٌ): مێحوشـترێکە زۆر دەسڵەمێتەوەو دەترسێتو دەکەوێت.
وجق: (أَلوُجاق و الأُوجـاق (ج) وُجاقات): ١-ئاگردان/ کوورەی ئاگر ٢-دەستەیەك سەرباز و هی لەوانە (ترکیە).
وجـل: ١-(وَجِـلَ-هُ. يَوجُـلُ وَجْـلاً): لەو ترسنۆکتر بوو/ لەو زۆر ترسا.
(وَجِـلَ. يَوجَلُ وَجَلاً و مَوْجَلاً): ترسـا یان سـڵی کردەوە و هەستی بە ترس کرد/ ترسی لێ نیشـت (کرداری تێنەپەڕیوی وشەی وَجِلَ دەیشبێتە: يَيْجَلُ و ياجَلُ وَ يِيْجَلُ: دەترسێت یان سل دەکاتەوە/ ترسی لێ دەنیشێت.
(وَجُلَ. يَوْجُلُ. وَجالَةً): پیربوو.

واجَلَ-هُ مُواجَلَةً. فَوَجَلَهُ): لەو زۆر ترسا. لە ترسدا بۆری ئەویدا.
(أَوجَلَ-هُ): ترساندی.
(أَلوَجَل (ج) أَوجَال): ترس. سل کردنەوە.
(أَلوَجِـل (ج) وَجِلون وَ وِجـال(م) وَجِلَة): ترساو/ سل کردوو.
(أَلأَوْجَل): ترسـاو/ ترسنۆك/ سل کردوو (بۆ مێی ترسـنۆك ناوترێت (وَجْلاء): دەوترێت (وَجِلَـة) («هُـوَ أَوجَلُ مِنـكَ»): ئەو لە تۆ ترسنۆکترە.
(أَلوُجُول): پیرەکان.
(أَلمَوْجِل): ترسـگە. شوێنی سـل کردنەوە و ترس.
٢-(أَلوَجيل والمَوْجِل): چاڵێکە زەلکاوی تێدا پەیدا دەبێت.
وجم: ١-(وَجَمَ-هُ يَجِمُ وَجْماً): مسـتەکۆڵەی بەسەر سنگیدادا.
٢-(وَجَمَ يَجِمُ. وَجْماً وَ وُجُوماً): لە ترساندا یان لە تووڕەییدا زمانی بەسـتراو قسـەی بۆ نەکرا/ مت بوو/ بێدەنگ بوو.
(«لَـم أَجِم عَنْهُ»): لە ترسـدا لێی بێدەنگ نەبووم.
(وَجَـمَ): لە تاو خەفـەت و داخی زۆر کرژ و مۆن بوو، پەست بوو سەری داخست.
وَجِمٌ وَ واجِمٌ: کرژ و پەسـت/ مۆن و سـەر داخستوو.

(-مِــنَ الأَمْــرِ): بە ناچاری لــە کارەکە دوور کەوتەوە و وازی لێهێنا.
(-الشيءَ): رقی لە شتەکە بوومەوە.
(-لِفُــلانٍ مِن کــذا): بۆ ئــەوە بەزەیی پێدا هاتەوە بۆی گریا و داخ و خەفەتی بۆ خوارد.
(الأَوجَم): مۆنترین و پەسترین.
٢-(ألوَجم (ج) وُجوم وَ أَوجام): کەڵەکەبەرد کە لەسەر گۆڕ دایدەنێن یان لەسەر تەپۆڵکە و لــە بیاباندا بۆ رانوما کردنی خەڵك کەڵەکەی دەکەن.
(رَجُلٌ وَجْمٌ): پیاوی (خراپ/ بەد).
(«هُــوَ وَجْــمُ ســوءٍ»): ئــەو (بەدپیــاوە/ پیاوخراپە).
(بَیتٌ وَجْمٌ): خانوویەکی زۆر زل/ مەزن.
(ألوَجَم): ١-بەدزمان/ ناپاك/ بەدخواز ٢-لەش سووکەڵە ٣-چرووك/ رژد
(ألوَجَــم (ج) وُجوم وَ أَوْجَام=الوَجْم. (بَیْتٌ وَجْمٌ): خانوویەکی زۆر زل.
(ألوَجْمَة): ژەمە خواردنێك.
(ألوَجَمَة): جنێوو فسەی ناشیرین.
(ألوَجیم-مِنَ الأَیام): رۆژانی زۆر گەرم.
(أَوْجَمُ الرَملِ): لمێکی زۆر.
وجن: (وَجَنَ-بِالشيءِ. يَجِنُ. وَجْناً): شتەکەی فڕێدا/ تووردا.
(-الوَتَــدَ): (مێخەکــە/ ســنگەکە)ی داکوتا/ چەقاند.

(-بِهِ الأَرضَ): دای بە زەویدا
(-أَلقَصَّــارُ الثَــوبَ): خومگەرەکــە جلەکەی کوتا.
(وَجَّنَ الجلدَ): چەرمە یان پێستەکەی کوتا و پێیدا کێشا تا نەرم بێت.
(تَوَجَّنَ): ســەری شــۆڕ کــرد و ملکەچبوو/ زەبوونبوو.
(ألواجِــن وَ الوَجْــن و الوَجَــن): زەوییەکی رەقەنی بەردەڵانی.
(أَلوَجْنَــةُ وَ الوجِنَــةُ وَ الوُجْنَةُ وَ الوَجَنَةُ وَ الوَجِنَــةُ و الأَجْنَةُ وَ الإِجْنَــةُ و الأُجْنَةُ(ج) وَجَنــات): کوڵــم/ گۆنــا (بۆیــە وا ناونراوە چونکە توندیو رەقی تێدایە).
(أَلوَجِــین (ج) وُجْــنٌ): ١-کەنــاری دۆڵ یان رووبــار ٢-تەپۆڵکە و بەرزییەکــی زەویی کە ســەخت و رەقەنــە (أَلأَوجَــن (م) وَجْناء): ١-کێوی سەخت و پتەو ٢-کوڵم گەورە و بەرز.
(ناقَةٌ وَجناء): مێحوشترێکی توند.
(أَلمُوَجَّن): ١-کوڵم بەرز و گەورە ٢- گۆشتن.
(أَلموجُون) (مفع): شەرمن.
(ألمِیجَنَة (ج) مَیاجِن وَ مَواجِن): گەڵاکوتك.
وجه: (وَجَهَ. يَجِهُ وَجاهَةً): بوو بە پیاوێکی (پایەبەرز/ ناســراو/ نــاودار/ پیاوماقووڵ/ گەورەپیاو).
(وَجَّــهَ-هُ الأَمیرُ): میر شــکۆی دایــە و رێزی لێگرت.

(-الشيءَ): ڕووی شتەکەی کردە لایەك.
(-القَومُ الطَريــق): خوێشــگەل ڕێگەکەیان گرت/ پیادارۆیشــتن وایان لە ڕێگەکە کرد کە پێدارۆیشتنی دیار بێت.
(-المَطَرَ الأَرضَ): ١-بارانەکە ڕووی زەوییەکەی (برد/ کراند) و کاری تێکرد ٢-بارانەکە هەموو لایەکی زەوییەکەی وەك یەك لێکرد
(-لِعَبــدِهِ): بە کۆیلەکەی وت پاش مردنم تۆ ئازادیت
(-البَيتَ): ڕووی خانووەکەی کردە قیبلە
(إلى فُلان): بەرەو لای فیسار ڕۆیشت
(-هُ الى فُلان): بۆ لای فیساری نارد
(-تِ الريحُ الحَصى): باکە چەوەکەی ڕادا
(واجَــهَ-هُ وِجاهاً وَ مُواجَهَــةً): ڕووبەڕووی بووەوە/ ڕووبەڕوو دی.
(«لَقِيَهُ مُواجَهَةً وَ وِجاهاً»): ڕووبەڕوو پێی گەیشت/ ڕووبەڕووی بووەوە دی.
(أَوجَهَ-الرَجُــلَ. إيجاهاً): ١-کــردی بە پیاو ماقوڵ و پلە و پایەی دایە/ گەورەی کرد ٢-بە پایــەدار و بە ڕێزی دانــا و زانی ٣-پیاوەکەی ئاراستە کرد ٤-گێڕایەوە
(تَوَجَّهَ-إلَيهِ): نیــازی ئەویکرد و بەرەو لای ئەو ڕۆیشت
(-ألجَيشُ): سوپاکە شکا و هەڵات
(-الشَيخُ): پیرەپیاوەکە تەواو پیر بوو و پەکی کەوتو ڕۆیشت.

(تَواجَهَ-الرجــلانِ أَو المَنزلانِ): دوو پیاوەکە ڕووبــەڕوو یەکتریــان دی/ دوو خانووەکــە بەرامبەر یەك دروستکران.
(إتَّجَهَ-إلَيهِ): بەرەو ڕووی ئەو هات
(-لَهُ رأْيٌ): ڕایەکی بۆ ڕەخســا و بە مێشکیدا هات.
(ألواجِهَــةَ): ڕووکاری هەمــوو شــتێك وەك ڕووکاری خانووەکە/ پێشەوەی خانووەکە.
(ألجِهَة والجَهَــة والجُهَة (ج) جِهات وَ جَهات وَ جُهات والوُجْهَة وَ الوِجْهَة): تەنیشــت/ لا/ دیو. ئەو ڕووکارەی کە بەرەو ڕووی دەچێت
(«ضَلَّ وِجْهَــةَ أَمــرِه»): ڕووکاری کارەکەی ونکرد و لێی تێکچوو/ ڕووی کارەکەی ونکرد/ نیازەکەی فەرامۆشکردو لێ تێکچوو.
(ألوَجْهُ)(مص): ڕوو/ ڕووتێکردن/ دیو/ لا.
(«لِهــذا القَولِ وَجْهُهُ»): ئەم ئاخاوتنە ڕووی وەرگرتنی خۆی هەیە کە لێوەی وەرگیراوە
(ألوَجْه): ١-مەرام/ ئامانج/ نیاز.
(«الوَجْهُ أَن يكونَ كذا»): نیازەکە/ ئامانجەکە کە دیارە دەشــێت وابێت. ٢-ئەو کار و شتەیتر کە مرۆڤ بۆی دەچێت و بەرەوڕووی دەڕوات ٣-بــۆ ڤایلکردنــنو لەبەرخاتــر/ لــە ڕێــی دڵڕاکێشاندا.
(«فَعَــلَ ذلك لِوَجْهِ اللهِ»): لــە ڕێی خوداداو بــۆ ڤایلبوونی خودا ئەوەی کرد ٤-ســامان و دەوڵەمەندیی/ بوون/ دارایــی ٥-(ج) وُجوه:

سەروەری نەتەوە/ سەردار.
(«رَجُـلٌ وَجْـهٌ»): پیاوێکی بـووە و بەرێز و پایەدار ٦-جۆر/ چەشن و بەش.
(وَجْهُ الكَلامِ): نیاز و مەرامی قسەکە.
(«الـكَلامُ فيه على وجُـوهٍ أو علـى أَرْبَعَةِ أَوْجُـهٍ»): قسـەکە رووی زۆرە یـان لە چوار رووەوە تەماشا دەکرێت و چوار نیاز/ ئامانج لەخۆ دەگرێت.
(«لَيـس لِكلامِـكَ وَجْهُ»): قسـەکەت هیچ ناگەیەنێت/ راست نییە.
(«صَرَفَ الشـيءَ عَن وَجْهِهِ»): شـتەکەی لە شێوازی و لە رێی خۆی لایدا.
(اَلْوَجْه (ج) أَوجُهٌ وَ وُجوهٌ وَ أُجُوهٌ): چارە/ روخسار/ روو/ دەموچاو کە دوو چاو و دەمێك و لووتێکی پێوەیە.
(«رَجُلٌ ذو وَجْهَين»): ئەگەر پیاوەکە ئەوەی لە دڵیدایە پێچەوانەی ئەوە دەرببڕێت دەڵێن: دووڕووە.
(«فُلان أَحْسَـنُ القَـومِ وَجْهاً»): فیسـار بە رووالەتـە: بە دیمـەن گوزەرانی لە هەمووان باشترە.
(«ضَرَبَ وَجْهَ الأَمرِ وَعَينَهُ»): کارەکەی باش رەنگرێژ و تەگبیر کرد.
(«مَضى على وَجهِهِ»): ئەو رووکار و نیازەی گرتبووی بـەری نەدا بێدەربەسـانە و بەبێ بەتەنگەوە هاتن رۆیشت.
(«اِبْيَضَّ وَجْهُهُ»): رووی سپی بوو.
(«بَيَّضَ اللهُ وَجَهَهُ»): خودا رووی سپی بکات، ئـەم دووانە بە یەکێك دەڵێن کە کارێك بکات باشـەی پێ بڵێنو ستایشـی بکەن («اِسْـوَدَّ وَجْهُهُ»): رووی رەش بوو.
(«سَوَّدَ اللهُ وَجْهَهُ»): خودا رووی رەش بکات. بە یەکێك دەڵێن کە خراپەیەك بکات.
(«وَجْهُ الثَوبِ و نَحْوَهُ»): رووی دەرەو دیاری بەرگو هیتر.
(«وجْـهُ الدَّهـرِ»): سـەرەتای سـەردەم و رۆژگار
(«كان ذلك علـى وَجهِ الدَّهـرِ»): ئەوە لە سەرەتای سەردەمدا بوو
(كَثير الوجوه) (هـ): (فرە/ زۆر) روو (جسم محاط بمضلعات مستوية من جميع جهاتِهِ و تسمى المضلعات، وجوهه وأَضلاعها، حروفـه أو حدودهُ و رؤوسـها رؤوسـه): تەنێکـە بە چەنـد لای رووتەخت لە هەموو لایەکەوە سـنوور دراوە بـە لاکانی دەوترێت رووەکانی بە لاکانی دەوترێت لێوارەکانی یان سنوورەکانی سەرەکانیشی سەری دەبێ
(الوجـه الجانبـي أَو الجنـب في الهـرم و الموشـور) (هــ): المضلعـات التـي تحدهما باستثناء القاعدة اذا تناظرت نقاطه مثنى مثنى بالنسـبة لـ(س) أَو(و)، مثلاً قطر الدائـرة محور لها و المتوازى المسـتطيلات

ثلاثة مستويات تناظر: ئەو رووتەختانەن لە هەرەمو مەوشوردا کە دەوریان دەدەن جگە لە بنکە. ئەگەر خاڵەکانی بە پێی (س) هاوجێ بوون یان بە پێی (و) بوون بۆ نموونە تیرەی بازنە تەوەرەکەی و لاکێشە تەریب سێ رووتەختە هاوجێن.

(اَلوجْهُ و الوُجْه): تەنیشت/ لا/ رووکار/ دیو/ بەر.

(اَلوَجه وَ الوَجُه): ساماندار/ دەوڵەمەند.

(«هُم وجاهُ اُلْفٍ»): ئەوان نزیکەی هەزارن.

(وَجاهَهُ وَ وِجاهَهُ وَ وُجاهَهُ وَ تِجاهَهُ تُجاهَهُ و تَجاهَهُ): بەرامبەری.

(«قَعَدوا تِجاهَهُ وَ وِجاهَهُ»): (رووبەرووی/ بەرامبەری) ئەو دانیشتن.

(اَلوَجاهَة)(مص):١-سامانداریی/ دەوڵەمەندیی ٢-پایەداریی و بەرێزبوون/ رێز

(اَلوَجیه (ج) وُجَهاء(م) وَجیهَه(ج) وَجیهات وَ وَجائِه): ١-پیاوماقووڵ/ سەردار و گەورەی نەتەوە و خوێشگەل ٢-دەوڵەمەند و پایەدار و رێزدار

(-مِنَ الأكسِيَة): بەرگی دووبەر/ دوودیو

(اَلوَجیهَةُ): ١-مێی وشەی (الوجیه) ٢-مووروویەکە دوو رووە وەك ئاوێنە رووی تێدا دەبینرێت رەنگە بۆ چاوەزار یان بۆ ئومێدی بە دەوڵەمەند بوونو گەورەیی لە مل دەکرێت.

(اَلوجَه): دەوڵەمەندتر یان پایەدارتر و بەرێزتر.

(«هُوَ اَوجَهُ قَومِهِ»): ئەو دەوڵەمەندترینی یان پایەدارترینی خوێشگەلەکەیەتی.

(اُوَیجِه): بچووککراوەی وشەی (اَوجُهِ) کۆی (وَجْه)ە.

اَلتَوجیه (مص): ١-ئاراستە کردن/ رابەریی/ رێ بۆ دانان و نیشاندانی رێ ٢-في علم العَروض: لە زانستی کێش لە هۆزاندا جیایی بزوێنی پێش پیتی سەرواکە وەکو (لَغِبْ. عِنَبْ).

(اَلمُوَجه): ١-ئاراستەکراو ٢-ساماندار/ دەوڵەمەند

(مِنَ الکَساءِ): بەرگی دوو روو.

(-مِن الکلام): ئاخاوتنێك کە هەڵبگرێت بە پێداهەڵدان یان داشۆرین دابنرێت

(شَیءُ مَوَجَّهُ): شتێکی رێك و راست ئاراستەکراو بەملاولادا نەچێت.

(اَلمواجَهَة): ١-رووبەروو بوونەوە ٢-دەستەو یەخەو بەرەنگار بوونەوەی یەکتری/ ئاوقەد بوون ٣-بە قسە یان بە رووبەکتر بینین.

٢-(الوَجْه وَ الوَجه): چکە ئاوێك/ کەمەکە/ تۆزە ئاوێك.

اَلْمُلحَقْ

وجه: (اَلتَوجیهیَّة): بروانامەی تەواو کردنی خوێندنی دواناوەندییە لە هەندێك وڵاتی عەرەبیدا.

وَجي: ١-وَجَى-الرَجُلَ يَجي وَجْياً): پیاوەكەی بە (بێفەر/ بێخێر)دی یان دانا.

(أَوجى-الرَجُلَ إِيجاءً): پیاوەكەی بێفەر كرد

(-عَلَيـهِ): درێخیی لێكرد، رژدیی دەربارە كرد.

(-الرَجُلُ): پیاوەكە بۆ پێداویستییەكی خۆی هاتو هیچی دەست نەكەوت.

(«سَـأَلَ حاجَةً فأَوجى»): پێداویستییەكی خواست و دەستگیری نەبوو. سەرنەكەوت.

(-عَن كذا): وازی لەوە هێنا و نەیویست مانی لێگرت.

(-الشيءَ): شتەكەی دوورخستەوە.

(-فُلاناً): دەسـتی بـە ڕووی فیسـارەوە ناو پێداویستییەكەی نەدایە.

(«أَوجاهُ عَنهُ»): دووری خستەوەو نەیهێشت ئەوەی دەیەوێت بیگاتێ.

(«أَوجَيتُ عَنكُم ظُلمَ فُلان»): ستەم و زۆرداریی فیسارم لەسەر لابردن/ لێ دوور خستنەوە

(أَلوَجي): مرۆڤی (بێفەر/ بێكەڵك) و سوودی لێ دەستگیر نابێت.

٢-وَجِـيَ وَ تَوَجّى الماشـي. يَوجـى. وجيً: ڕۆیشتووەكە پێخاوس بوو یان پێپەتییەكە بە ڕۆیشتنی زۆر پێی سوا و ناسك بوو.

(وَج وَ وَجِـيّ (م) وَجِية وَ وَجياء): مرۆڤی پێپەتی یان پێناسـك بوو. یان ئاژەڵی پێسواو و ناسك بوو.

٣-(أَوجى- الرَجُـلَ. إِيجاءً): بـە پیاوەكەی بەخشی/ دایە.

٤-(أَلوجـاء (ج) الأَوجِيَـة): دەفری بچووكی كالاّ.

وحّ: ١-(وَحْـوَحَ): ١-دەنگێكـی گـڕی لە دەم هاتـەدەر/ نحە نحـەی كرد. ٢-لە سـەرماندا فووی بە دەسـتیدا كرد وتی: (أَح-أَح) أَو (حو حو) واتا: فو فو.

(تَوَحْـوَحَ الظَليـمُ فَـوقَ البيـضِ): نێرە وشـترمرخەكە بە خۆشـییەوە چووە سـەر هێلكەكە یان

(أَلوَحْوَح (ج) وَحـاوِح): كرژ بووی دەروون رەق

(أَلوَحْـوَح و الوَحْواح (ج) وَحاوِح): سـەگی زۆر وەڕیو.

٢-(أَلوَحْوَح (ج) وَحَاوِح): ١-پیاوی سـووكەڵە ٢-بەهێز

(أَلوَحْواح (ج) وَحاوِح): بەهێز

(-الوَحْواح (ج) وَحاوِيح): گەورە و سەرۆك/ سەردار.

وحج: (وَحِجَ-بِـهِ يَوحَجُ وَحَجاً): پەنای بۆ برد/ دایەلای ئەو/ هانای بردە لای.

(أَوحَجَ-هُ): پەنایدا و پاراستی/ داڵدەی دا.

(أَلوَحَج): پەنا/ پەناگا/ داڵدە.

وحد: (وَحَدَ وَ وَحُدَ يَحِـدُ. وَحْداً وَ وَحْدَةً وَحِـدَةً وَ وُحُوداً. يَحِدُ وَحـادَةً وَ وُحُودَةً):

تاك بووەوە/ خۆی تەنیا و تاك كردەوە.
(وَحيد): تاك/ تەنیا، سەڵت، بێ هاودەم.
(وَحَّـدَ-هُ تَوحيـداً): تەنیـای كـرد/ تاكی كردەوە/ كردی بەیەك.
(-اللهَ تَعالى): ١-خـودای بە تاك و تەنیا دانا/ بـڕوای بە تاك و تەنیایی خـودا هێنا. ٢-وتی خـودا تـاك و تەنیایە و یەكـە و یەك خودا هەیە وتی.
«لا إلهَ إلا الله»: تەنها یەك خودا هەیە
(أَحَدَّ-هُ= وَحَّدَهُ): بە یەكی دانا و زانی.
(أَوحَـدَ-هُ، إيحاداً): ١-تەنیـای كردەوە/ تاكی كردەوەو بە تاكیی بەجێی هێشت ٢-بە تاك و تەنیای سەردەمو چەرخی دانا.
(-هُ لِلأَعداءِ): بۆ دوژمنانی بەجێهێشت
(-تِ الشاةُ): مەڕەكە بەرخێكی مێچكەی بوو.
شـاةٌ (موحِـدٌ): مەڕێكـە كـە بەرخێكـی بووبێت.
(تَوَحَّدَ): بە تەنیا مایەوە.
(-هُ بالفَضلِ): بـە تەنیا چاكەی هەر لەگەڵ ئەودا كرد.
(-برَأيِهِ): بەراكـەی خۆیەوەی مایەوە و هی كەسی تری وەرنەگرت.
(إتَّحَدَ-الشَـيئانِ): دووشتەكە یەكیان گرت و بوون بە یەك.
(-الشَيءُ بِالشَّيءِ): شتەكە بە شتەكەی ترەوە لكا و یەكیان گرت و بوون بە یەك.

(-القَومُ): خوێشـگەل ڕێككەوتـن و یەكیان گرت.
(الواحدَ (م) واحِدَة): ١-یەك. ژمارەی یەك
(واحِدان): دوو تاك/ دوو یەك
(ج) (واحِـدون): تاكـەكان/ یەكەكان ٢-تاكە كەسـێك یـان (دانەیەكی/ قلێكی شـت) یان یەكەی ناو نەتەوە و خوێشگەل
(«هُـوَ واحِـد قَومِـهِ»): ئـەو تاكـی نـاو نەتەوەكەیەتی/ تاكی بێهاوتایە/ بێوێنەیە لە چاكە و پیاوەتیی و زانایيدا ٢-تاكە و ناوێزە و بێوێنەیە یان كەسی لەگەڵدا نییە. ٣-یەكێكە لە نـاوە پیرۆزەكانی خودا/ كەسـی لە ڕەنگ نییە و بێوێنەیە.
(أَلفٌ واحِدٌ): هەزارێك.
(عَشَرةٌ واحِدَةٌ): دەییەك.
(الحِدَة) (مص): تاكیو جیا.
(«بَقِيَ على حِدَتِهِ»): هەر بە تاك و تەنیایی مایەوەو جیا لە هیتر و لەوان باشتر.
(«فَعَلَهُ على ذاتِ حِدَتِهِ وَ مِن ذاتِ حِدَتِهِ وَ مِـن ذي حِدَتِهِ»): لە خۆیەوە و بەڕای خۆی و بیری خۆی/ سەربەخۆ ئەوەی كرد.
(الوَحْد)(مص): تەنیا/ تەنها/ تەنیا بوون.
(«رَأَيْتُـهُ وَحْدَهُ»): دیم بە تەنیا بوو یان بە تەنیا ئەوم دی.
(«جـاءَ وَحْدَهُ»): بە تەنیـا/ هەر خۆی بوو هات.

(«جلَسَ وَحْدَهُ وَ على وَحْدِهِ»): به تەنها دانیشت.

(«جَلِسَ على وحْدَيْهِما و على وَحْدِهِما»): به تەنیا دانیشتن (بۆ دووان).

وَوَحْدِهِم: به تەنیا دانیشتن (ئەمە کۆیە). دەڵێن پـاڵ نادرێت تەنها لـەوەدا که دەڵێن: («فُـلان نَسـيجُ وَحـدِهِ»): ئـەو داهێنراو و دارشـتەیەکی ناوێـزە و جیایـە (ئەمە بۆ هەڵدانە).

(فُـلان عُبَيرُ وَحـدِهِ و جُحَيـشُ وَحدِهِ»): ئـەو لە ناتەواویی و کەرێتیـدا بێ وێنەیە و کەرێکی تەواوە (ئەمە بۆ داشۆرینە)

(رَجُلٌ وَحْدٌ): پیاوێکە تاك و بێوێنەیە.

(أجِـيرُ الوَحْـدِ): بەکرێگـیراوی تایبەتی که نابێتە هی ئەم و ئەو (ئەمەیش لە زاراوەکانی زانا و شەرعناسەکانە).

(ألوَحَـد والوَحِـد (م) وَحْـدَةٌ وَ وَحِـدَةٌ): یەکدانە، قلێك، تەنها یەکێك،

ألوَحْدَة (مص): یەکە.

(ألوَحْدَة الفَلَكيَّـة) یەکەی گەردوون (فك): تێکـڕای دووریـی نێـوان زەویـی و خۆر که دەکاتە (١٤٩,٥٠٠,٠٠٠)کم٥.

(ألوَحْداني): تاکوتەنیا.

(ألوَحدانيَّة): تاکوتەنهایی.

وُحَـادَ وَ أُحـادَ وَ مَوْحَدَ: تاکـە تاکە/ یەکە یەکە/ یەك لە دوای یەك.

(«جـاؤوا وُحَادَ وَ أُحادَ وَ مَوحِدَ): تاکە تاکە هاتـن/ یەك یەك هاتـن (هەروەها بۆ مێیش هەروەهایە.

(ألوَحيد): تاك و تەنها.

(ألإتِّحاد أَو الجِسمُ المُرَكَّب)(ك): تەنی ئاوێتە بریتیە لە یەکگرتنی دوو گەردیلەی سـادە بە ڕێژەی کێشـی جێگیر، سـیفەتەکانی گەردی ئاوێتەکە لە هیچ شتێکدا لە گەردیلەکان ناچێت کـە لێی پێکهاتووە، وەك ئاو کە لە یەکگرتنی ئۆکسجین و هایدرۆجین پێکهاتووە.

(ألإتِّحادِيُّ): ١-ئەندامێکی یەکێتیی ڕێکخراوی کرێکاران یان هەر ڕێکخراوێکیتر. ٢-یەکێتیی ڕامیاریـی ولاتێـك/ ولاتێکـی یەکگرتووە لە رووی ڕامیارییەوە.

(ألإتِحاديَّـة): ١-نیشـانەی یەکگرتـن ٢-ناوی ڕێکخراوی کرێکارانی یەکگرتوو.

(ألأحَد=الوَحيد): ١-تاك/ تەنیا.

رجلٌ أَحَدٌ: پیاوێکی تەنیا/ بەتەنیا بوو/ تاك بووەوە ٢-بێوێنە.

(ألأحُد=الواحد) («هُوَ الواحِدُ الأحَد»): ئەو خوایەکی تـاك و تەنیایە تەنها هەر بۆ خودا ئەوە دەوترێت. لە ناوی ژمارەدا دەوترێت (أَحَدٌ و عشرون و واحِدٌ و عشرون): بیست و یەك. وشەی (أَحَد) بۆ نێر دێت بۆ مێیشت دەبێت وەکو: (لَسْتُنَّ كأَحَدٍ مِنَ النِّساءِ): ئێوە ژنان وەکو شتی تر نین.

(إحــدى): بۆ تاكی مــێ دەوترێت و بە تەنیا ناوترێــت دەبێت لەگەڵ هیی تردا بێت وەكو: (إحدى و عشرون و احدى عَشرة): بیست و یەك و یازدە.

(إحدى بَناتِ طَبَق): ١-وەی/ چورتوم/ ئاپۆرە ٢-(ح) مار

(«هُوَ ابنُ إحداها»): ئەوەی دایك و باوكێكی رەســەنە (بــۆ پیاو و حوشــتریش دەوترێت) راناوەكە بۆ دایكە.

(يَومُ الأَحَد(ج) آحاد): یەكشەممە كە یەكەم رۆژی گاورانە.

(الأَوحَد): تاك و تەنها.

(الله الأَوحَد): خودای تاكو تەنیا/ تەنها

(«هُوَ أَوحَدُ أَهل زمانِهِ»): (ج) أُحدان): ئەو بێوێنەی چەرخو سەردەمەكەیەتی

(«لستُ في هذا الأمرِ بأَوحَدَه»): من لەمكارەدا تەنهانیــم بێهاوكــوف نیم (بۆ مــێ ناوترێت (وَحْداء).

(اَلتَوحِيــد (مــص): یەكخســتن یەككردن. یەكتاپەرستیی/ بڕواكردن بەیەكێتیی خودا

(اَلمُوَ حد) (فا): كەســێكە كەخــودا بەتاكو تەنیا بناسێت.

(اَلمُوَحدَ مِنَ الحروف): ئەو پیتانەن كە یەك پنتیان هەیە وەك (ب).

(اَلمُتَوَحد (ج) مُتَوَحدون): تەریك/ تاكبوو/ گۆشەگیر/ كەنارگیر.

(اَلمُتَوَحدون مِن الرهبان): پارساگۆشــەگیرو تەریكبووەكانی ناو شــاخو دەشتو لە خەڵك پچڕاو/ كەنارگیرەكان بۆ خوداپەرستیی.

(اَلميحــاد (ج) مَواحــد): تاكــە گــردە/ تەنیاگردە.

اَلمُلحَق

وحــد: (اَلواحِدِيــة): یەكەیــی. رێڕەوێكی فەلســەفانەیە گەردوون دەباتەوە ســەریەك بڕوا وەك مادە یان گیان یان ئاوەز (سبینۆزا) یەكێكە لەو فەیلەسوفانە كە خوداو سروشتی بەیەك داناوەو كردوونی بەیەك.

(اَلمُوَحــدَة): بڕوانامــەی دواناوەندییــە لــە سوریەدا.

وحــر: ١-(وَحِــر. يَوحَــرُ وَحَــراً): ئەوەی خوارد یان خواردەوە كە شەوگەرد بەسەریدا رۆیشــتبوو یــان لێیخواردبــۆوە ژەهرەكەی كاریتێكرد

(-الطَعامُ): خواردنەكە شەوگەرد تێیكەوت

(وَحِرٌ): خواردنی شەوگەرداوی

(وَحِرَ- عَلَيهِ. يَحِرُ وَيَوْحَرُ وَيَيْحِرُ. وَحَراً): رقــی لێهەســتاو زۆر لێیتوورە بــوو قینی لێ خستە دڵیەوە.

(وحِر): تووڕە بووو قینلەدڵو قینی لێهەستاو

(اَوحَرَ-هُ): تووڕەیكرد/ ئەوەی پێوت كە رقی هەستێت.

(-تِ الوَحْرَةُ الطَعامَ): شــەوگەردەكە وای لە

خواردنەكە كرد كە پێبڕشێنەوەو سكیان بچێت.

(اَلوَحْر): ١-ڤین ٢-رقێكی شێتگیریی/ نەوپەڕی توورەبوون ٣-گزی/ دەغەڵیی

(اَلوَحَــر): (مــص): ١- رق/ توورەیی ٢-ڤین ٣-مەراقی دڵ‌و دڵخوردیی‌و واسواسی.

(اَلوَحَــرَةُ (ح) وَحَر (ج): شــەوگەرد دەڵێن بەسەر هەر شتێكدا بڕوات ژەهراویدەكات

٢-الوَحَــرَةُ (ج) وَحَــر: ئافرەت‌و حوشــتری كورتە بنە.

(اِمْرَأةٌ وَحِرَة): ئافرەتی رەشــی ناشیرین یان ئافرەتی سووری كورتە بنە.

وحش: (وَحَشَ وَ وَحش بِثَوبِهِ أو سلاحِهِ- يَحِــشُ. وَحْشــاً): جلەكەی یــان چەكەكەی فڕیدا لەترســی ئــەوەی دوای بكەون‌و خۆی رزگار كرد.

(أوحَشَ- المَكَانُ إيحاشاً): شوێنەكە چۆڵبوو كەسی تێدا نەماو لێدووركەوتنەوە

(-المَكَانَ): شــوێنەكەی بەچــۆڵ بینی‌و هاتە بەرچاو.

(-الرَّجُلُ): ١-برســیبوو ٢: خواردنی پێنەماو خواردنەكەی تەواو بوو.

(-الرَّجُــلَ): ١-وای لــە پیاوەكە كرد هەســت بەتەنیایی بكات ٢-وەك درندەی لێكرد.

(تَوَحــشَ): ١-جلەكانی فڕیدا ٢-لە برســاندا سكی چۆڵبوو ٣-وەك درندەی لێهات.

(-المكانُ): شــوێنەكە چۆڵ بوو كەســی تێدا نەما.

(إسْتَوحَشَ): ١-هەســتی بەتەنیایــی‌و ترس‌و بێتاقەتییكرد.

(«إذا أقْبَــلَ الليــلُ إسْــتَنأنَس كل وَحْشِــي واسْتَوحَشَ كَل إنسيٌّ»): كەشەو داهات هەموو درندەیەك هەســت بەدڵنیایی دەكات‌و ســڵ‌و ترسی لەســەر نامێنێت‌و هەموو مرۆڤێكیش هەست بەجۆرە سڵ‌و نارەحەتیی دڵ دەكات

(إسْتَوحَشَ- مِنهُ): دڵی بەو نەكرایەوەو لێی بێتاقەتبوو.

(-المَكَانُ): خەڵكەكە شــوێنەكەیان چۆڵكردو لێی رۆیشتن.

(-لَهُ): بۆی بێتاقەتبووو بەبێ ئەو هەســتی بەتەنیاییكرد.

(الوَحْش (مص) (ج) وُوُحُوش وَ وُحْشــان): ١-كێویــی/ كێویلــە/ دەشــتەكی ٢-درنــدە. زیندەوەری كێویی‌و دەشتەكی.

وَحشي: كێویلەیەك/ دەشتەكییەك.

(حمار الوَحش وحِمار الوَحشي): كەرەكێویی.

(بَقَرُ الوَحْش): مانگاو گای كێویی. پێچەوانەی هی ماڵییە.

(مَكَانُ وَحْشٌ): شوێنێكی چۆڵ‌و هۆڵ.

(مشَى في الأرضِ وَحشاً»): بەتەنیا بەخاكەكەدا رۆیشت.

(«باتَ وَحْشــاً»): بە برسێتی مایەوە- (وەكو

لـه شـوێنێکی چۆڵـدا بێت‌و هیچی دەسـت نەکەوێت بیخوات).
(«هُم أوحاش»): ئەوان برسین.
(«هُـوَ مِـن وَحْـشِ النـاسِ»): ئـەو لـە سوکەکەکان‌و هیچ‌و پووچەکانی ناو کۆمەڵە.
(اَلوَحْشَةُ): ١-چۆڵەوانیی ٢-ترس‌و دڵگوشرانی چۆڵیـی‌و چۆڵەوانیی ٣-مەراق/ داخ ٤- لەیەك بـڕان‌و لەیەکپچـڕان ٥- دووریـی دڵ لـە پەیوەندیی‌و سـۆزی خۆشەویستیی ٦-زەویی چۆڵ‌و ترسناك.
(اَلوَحْشان (ج) وَحاشى): خەمناك/ خەفەتناك/ خەمگین.
(اَلوَحْشِيُ): کێویلە/ دەشتەکی/ دڕندە/ نامالیی‌و سـرك/ هەرچی سـڵ‌و ڕەو لە مرۆڤ بکاتەوەو لێیبترسـێت‌و لێی دووربکەوێتەوە ٢- لای ڕاستی هەمـوو شـتێك دەڵێن، بۆ وڵاخ ئـەو لایەیە کە مرۆڤەکـە لێـوەی سـوار دەبێت یان دۆشـین‌و چارەسـەرکردنی ئـاژەڵ تەنها لەلای ڕاسـتەوە دەبێت.
(-مِـنَ التينِ ونَحوَهُ): هەنجـیرە کێویلە یان دارو میوەیتری کێویلە.
(-مِنَ القَوسِ): پشتی کەوان.
(اَلوَحْشِـيةُ): ١-دڕندەیـی ٢-مێـی وشـەی (الوَحْشِـي) ٣-بایەکـی بەهێز کـە دەچێتە جلەکانتەوە لە بەهێزیدا.
(الوَحِيْش): گیانداری دەشت‌و کێو/ جانەوەر.

(الجانِـب الوَحيـش): لای ڕاسـتی هەمـوو شتێك.
(أرضٌ مَوحَوشَـةُ): زەوییـەك کـە دڕندەو جانەوەری کێویی‌و دەشـتەکیی زۆر بێت. یان ترسناکبێت.
وحف: ١-(وَحَفَ- البَعـيرُ أو الرَجُلُ. يَحِفُ. وَحفـاً): ١-حوشـترەکەیان پیاوەکـە خـۆی بەزەویدادا ٢-دانیشت.
(وَحَّفَ): خۆی بەزەویدادا.
(-فُلاناً): بەداردەست لە فیساریدا.
(اَلوَحْفَةُ (ج) وِحاف): جارێك خۆ بەزەویدا دان.
(اَلمَوحِف (ج) مَواحِف): شوێنی مۆڵدان‌و خۆ بەزەویدادانی حوشتر.
(اَلمِيحـاف- مِنَ النـوق (ج) مواحيف): ئەو مێحوشـترانەی کـە شـوێنی مۆڵدانەکانیان بەرنادەن.
٢-(وَحَفَ- مِنْهُ. يَحِفُ وَحْفاً): لێینزیکبووەوە
(-إلَيهِ): ڕوویتێکردو بۆلای چوو.
(-إلى كذا): بۆلای ئەوە خێرایکرد/ پەلەیکرد
(وَحَّفَ): پەلەیکرد/ خێرایکرد.
(أوحَـفَ. إيحافـاً): پەلەیکـرد خێرایکرد/ گورجیکرد.
٣-(وَحِفَ وَ وَحُفَ- الشَعَرُ أو النَباتَ. يَوحَفُ وَيَوحُـفُ. وَحَفاً حافَةً و وُحُوفَةً): تووکەکە یان گیاکە/ ڕووەکەکە چڕبوو.

(اَلواحِـف- مِــنَ الأَجْنِحَة): باڵــی پەرچڕی باڵندە/ پەڕ زۆر.

(اَلوَحْفِ) (مص) ١-قژی/ تووکی زۆری ڕەش‌و جوان ٢-گیای تێر ئاوو/ بەشکۆفە.

(-مِنَ الأَجنحة): باڵی (پڕپەڕ/ پەر زۆر).

(عُشــبُ وَحْــفٌ): گیایەکی چڕو پــڕو زۆر کەرەش بنوێنێت.

(اَلوَحَف) (مص): قژی پری زۆرو جوان.

(اَلوَحْفَةُ (ج) وِحاف ١-تاوێری ڕەش ٢-هەڵەتی/ زەویی بەزری خڕو ڕەشرەنگ.

(الوَحْفاء (ج) وَحافى مِنَ الأَراضي): زەوییەك کە بەردی ڕەشی تێدا بێت جیانەبێت.

٤-(اَلوَحْفَةُ (ج) وِحاف): دەنگ.

(اَلوَحْفاء (ج) وَحافى- مِنَ الأَراضي): زەویی سوورەمەن/ سوورە زەوی.

(بَعيرٌ مُوَّحفٌ): حوشتری لاواز/ چرووساو.

وحــل: ١-(وَحِــلَ. يَوْحَلُ وَحَــلاً وَمَوحِلاً: کەوتە (قوڕاوو چڵپاوەوە/ لیتاوەوە).

(واحَــلَ-هُ مُواحَلَــةً): لــەو باشــترچووە لیتاوەکەوە/ قوڕاوەکەوەو ئەوی بەزاند.

(أَوحَلَ-هُ): خستیە قوڕاوەکەوە.

(-هُ شَــراً): قــوڕی بــۆ گرتــەوەو گرفتاری ناهەمواریکرد.

(تَوَحلَ): قوڕاویبوو.

(تَوَحلَ وَ اَسْتَوَحَلَ- المكانُ): شوێنەکە (قوڕی تێکەوت/ بوو بەقوڕو لیتە).

(اَلوَحْــل= الوَحَــل. اَلوَحَــل (ج) اَوْ حال وَ وُحُول): لیتە/ چڵپاو/ قوڕوچڵپاو.

(الوَحِل): لیتاویی‌و قوڕاویی.

(اَلمَوحِل): ١-شــوێنێکی قــوڕو لیتە ٢-کەوتنە قوڕو لیتەوە.

٢-(اِتَّحَــلَ- فِي يمِينِهِ اِتّحالاً): ســوێندەکەی بەمــەرج‌و خۆدزینــەوە خــوارد وەك بڵێت: إنشــاءَ الله: گەر خودا حــەز بکات/ گەر خودا یار بێت ئەو کارە دەکەم.

وحم: ١-(وَحِمَ- الشيءَ يَحِمُ وَ يَوحَمُ. وَحَماً: دڵی چووە ســەر شتەکە/ دڵی بۆ شتەکە بزوا/ حــەزی لێکرد (-ت المَرأَةُ): ١-ژنەکە ســکی پڕ بوو بێزووی بەهەندێك خواردن کرد ٢-حەزی بۆ خواردن گۆڕاو هەندێك خواردنی لەبەرچاو کەوت.

(هِــيَ وَحمــى (ج) وِحــام وَ وَحامى): ژنی بێزووکەر

(«وَحْمَــى ولا حَبَــلَ»): بێــزوو بەشــتەکە دەکات‌و هەوڵی بۆ دەداتو پێویستیشی نییە.

(«وَحَمْــتُ وَحْمَــهُ»): دوای نیازەکــەی ئەو کەوتم/ نیازم نیازەکەی ئەوە.

(وَحْــمَ- الحُبْلــى): ئــەوەی بێزووکەرەکــە بێزووی پێدەکــرد دەرخواردیدا بێزووەکەی شکاند.

(-لَها): ئەوەی حەزی لێدەکرد بۆی سەر بڕی یان دەرخواردیدا.

(تَوَحمَ- تِ المَرأَةُ): ژنەکە بێزوویکرد.
(اَلوَحَم (مــص) ١-بێزووکردنی ژنی ســکپڕ
٢-ئەو خواردنەی کە بێزووی پێدەکات.
(اَلوحــام والوَحَــام): بێزووکردنــی ســکپڕ
بەخواردنێك.
٢-(اَلوَحَم): وڕەی باڵی مەل/ باڵندە.
(«لَيلَةٌ ذاتُ وَحَم»): شەوێکی زۆر گەرم.
(اَلوَحِيم): ڕۆژی زۆر گەرم.
وحــن: (وَحَنَ وَوَحِــنَ- على فُــلان. يَحِنُ
ويَوحَنُ وَحَناً و وَحِنَةً): ڕقی لێهەڵگرت.
(تَوَحَنَ): ١-سەرشــۆڕو کەســاس بووو فەوتا
٢-ورگی لێهات/ ورگی زلبوو.
(اَلوَحْنَةُ): ١-جارێك ڕق لێهەڵگرتن ٢-قوری خز.
(وحي): ١-(وَحــى- إِلى فُلانَ. يَحِي. وَحْياً):
١-ئاماژەی بۆ کرد ٢-فرستادەیەکی بۆ نارد.
(- إِليــهِ أَو وَحى إِليه كَلامــاً): بەدزییەوەو
بەنهێنی قسەی لەگەڵ کرد یان قسەی لەگەڵ
کردو نەیهێشێت کەس پێی بزانێت
(-اللهُ في قَلْبِــهِ): خــودا خســتیە دڵییــەوە/
سروشی بۆ نارد.
(-اَلكِتابَ):(نامەکە/ نووسینەکە/ پەڕتووکەکە)ی
بۆ نووسی.
(أَوحى- إِلى فُــلان إِيحاءً): ئاماژەی بۆ کرد و
تێی گەیاند ٢-بە شــێوەیەك قســەی لەگەڵدا
کرد کە خەڵك تێی نەگات/ بە نهێنی دواندی
٣-ناردی و کردی بە فرستادەی خۆی.
(-القَومُ): بانگ و هاواریان کرد.
(-اللهُ إِلَيــهِ بِكَذا): خودا سروشــی ئەوەی بۆ
کرد/ ئەوەی خستە دڵییەوە و پێی ڕاگەیاند.
(-اَلكِتابَ): نووسینەکەی/ نامەکەی نووسی.
(-نَفْسَــهُ): تــرس کەوتە دڵیەوە/ ترســی لێ
نیشت.
(إِسْــتَوحى-هُ): هاواری (بۆ کــرد/ لێ کرد).
هانای بۆ برد.
(-هُ الشــيءَ): ویستی لە شــتەکە بگات و لێی
پرسی.
(اَلواحــى (ج) واحــون وَ وُحــاة) (فــا):
١-ئاماژەکار ٢-فرستادەنێر ٣-بە نهێنی و قسەکەر
لەگەڵ یەکێکدا کە خەڵك تێی نەگات.
(اَلوَحي):(مص): ئاماژە بۆ کردن ٢-بە نهێنی
و دزییەوە پێ ڕاگەیاندن/ هەرچی بە خەڵك
بڵێیــت و فێری بکەیــت ٣-پەیغامی خودا کە
بــۆ پێغەمبەران و نێرراوانی خۆی دەنێرێت/
سروشی خودایی کە بۆ پێغەمبەرانی دەنێرێت
٤-ئــەوەی کــە دەخرێتە دڵەوە ٥-نووســراو و
نامە.
(اَلوَحي وَالوَحاة): دەنگ.
(اَلوَحى (ج) وُحيّ): دەنگ.
٢-وَحــى. يَحــي الذبيحَــةَ وَحْيــاً): خێرا
قوربانییەکەی سەربڕی.
(-وَحْياً وَ وَحىً و وَحاءً): پەلەی کرد/ گورج
بوو/ خێرای کرد.

(وَحَىَّ- نبيحَتَهُ. تَوحِيَةً): خێرا قوربانییەکەی سەربڕی.

(-هُ): پەلەی لێکرد/ پەلەی پێکرد.

وحیَّ- الدواءُ المــوتَ: دەرمانەکە مردنەکەی زووتر کرد.

(أوحی العَمَلَ إیحاءً): پەلەی لە کارەکەدا کرد.

(-الدواءُ المَوتَ): دەرمانەکە مردنەکەی زووتر کرد.

(تَوَحّی): پەلەیکرد.

(تَواحی-القَومُ. تَواحِیاً): پەلەیان لە یەکتری کرد.

(إستَوحی-هُ): داوای لێکرد پەلە بکات.

(اَلوَحی (ج) وُحِیٌّ): پەلەکردن/ دەستوبرد کردن/ خێراکردن.

(«الوَحی الوَحـــی الوَحاكَ الوَحاكَ»): ئەمە بۆ خێراپێکردنــە، خێرا خێرا/ گورج گورج/ گورجانــە گورجانە.(اَلوَحِــیُّ): بە خێرایی/ ئازایانە/ بەپەلە/ گورجانە.

(«مَوتٌ وحیٌّ»): مردنێکی خێرا.

(ذَکاةٌ وَحِیَّــةٌ): ســەربڕینێکی (گورجانــە/ بەپەلە/ خێرا).

(الأَوحی): خێراتر/ خێراترین/ گورجترین.

(«اَلقَتْلُ بِالسَّیفِ أوحی»): کوشتن بە شمشێر خێراترە/ گورجترە.

٢-(أوحی-الرَجُلُ إیحاءً): پاش هەژاریی بوو بە خاوەن سامان/ دارابوو.

(اَلوَحـــی (ج) وُحِیٌّ): ١-ئاگر ٢-شـــا (بە ئاگر چوێنراوەکە وەك ئاگر ســوود بەخشــە و بە زیانیشــە. ٣-(ســەرۆك/ پێشــەوا/ سەردار)ی گەورە.

وخد: (وَخَدَ-البَعیرُ یَخِدُ. وَخْداً وَ وَخِیداً وَ وَخَدَاناً): حوشترەکە وەك وشترمرخ زۆر توند غاریدا/ خێرا ڕۆیشت/ پەلی هاویشت.

(واخِــدٌ وَ وَخَودٌ وَ وَخّادٌ): حوشــتری خێرا غارکردوو وەك وشترمرخ پەلهاویشتوو.

(اَلوَخْــد (ج) وُخُــود): تــاودان/ تونــد پەلهاویشتن/ غارکردن.

وخــز: (وَخَزَ-هُ یَخِزُ وَخْزاً): بە نەقیزە یان ســووژن یان دەرزی یان نێزە شــتی تری لەو بابەتە تێوەی ژەند.(-هُ الشَّــیبُ): ســپیێتی دایە قژی ســەری و سەری ماش و برنج کرد/ قژی بۆز بوو.

(-فُلانٌ): فیسار تریتی هەنگوێنیکرد.

(اَلوَخْز) (مص): (چکێك/ تۆزێك/ کەمێك)ی هەموو شتێك.

«جاؤُوا وَخْزاً وَخْزاً»: چوار چوار هاتن.

(الوَخِیــز): تریتــی هەنگوین. تێکوشــینی هەنگوین.

وخش: (وَخُشَ. یوخُشُ الشَــیءُ. وُخُوشَةً وَ وَخاشَةً و وُخوشاً): شــتەکە دارزا گەنبــوو و پەکی کەوت

(-رَأسُ الکَبشِ): سەری بەرانەکە وشك هەڵات

و بچووكبووەوە.
(-العَطِيَّةَ): بەخششەكەی كەمكردەوە.
(-الشيءَ): شتەكەی گەن و خراپ كرد.
(أَوْخَشَ الشيءَ): شتەكەی ئاوێتە كرد/ تێكەڵكرد.
(-لَهُ بِالعَطِيَّةِ): بە كەمیی بەخششەكەی دایە.
(-في عَرْضِهِ): ناموسی شكاند و ئابڕووی برد/ سووكی كرد.
(اَلوَخش): ١-گەندەی هەموو شتێك ٢-پووشت و ڕسوا/ سووك/ كەوتووی ناو خەڵك (ئەم وشەیە بۆ تاك و كۆ و نێر و مێ وا دەوترێت). (دەشێت كۆبكرێتەوە بوترێت: (وِخاش وَ أَوخاش).
(اَلوَخْش (عامية): زبر.
وخص: (وَخَصَ. يَخِصُ وُخُوصاً): بزوا/ جوولا/ جما.
(أَوخَصَ-فُلان لي بِعَطِيَّةٍ. إِيْخاصاً): فیسار كەمەكە بەخششێكی دامێ.
وخَض: (وَخَضَ- فُلاناً بِالرمْحِ. يَخِضُ وَخْضاً): نێزەیەكی پێداكردو بە لەشیدا نەچوو.
(هُ الشيبُ): مووی سپی تێكەڵ بە ڕەشی مووی سەری بوو/ سەری ماش و برنج بوو/ بۆز بوو.
(اَلوَخِيض): نێزە پێداكراو/ تێگیركراو.

وخط: ١-(وَخَطَ-فُلاناً بِالرمحِ. يَخِطُ وَخْطاً): نێزەی پێدا كرد.
(-هُ بالسَّيفِ): لە دوورەوە شمشێری پێدادا.
(اَلوَخَّاط): نێرە وشترمرخ یان حوشتری خێرا و هەنگاو بڵاو.
(طَعنٌ أَوْرمحٌ وَخَّاط): تیغ تێچەقاندن یان نێزە پێداكردنێكی تەواو.
(اَلمِيْخَط): پێداچەقیوی تەواو/ ناوەوەچوو.
٢-(وَخَطَ-هُ الشيبُ يَخِطُ وَخْطاً): مووی سپی تێكەڵ بە مووی ڕەشی سەری بوو.
(-في البَيعِ): لە كڕین و فرۆشتندا جارێك قازانجیكردو جارێك زیان.
(وُخِطَ): مووی سپی تێكەڵ بە مووی ڕەشی سەری بوو.
وخف: ١-(وَخَفَ-السُوَيقَ. يَخِفُ. وَخْفاً): ئاوی كردە ئاردەكەوە و تێكیهەڵشێلا تا لینجبوو و یەكیگرت (-السُوَيقُ): ئاردەكە بوو بە هەویر و لینج بوو
(-الرَجُلَ): بە ناشیرینی ناوی پیاوەكەی هێنا
(وَخَّفَ و أَوْخَفَ-السُوَيقَ): ئاوی كردە ئاردەكەوە و تێكی هەڵشێلا تا تێكەڵ بێت و یەكبگرێت و لینج بێت.
(«إِنَّهُ لَيوخِفُ في الطين»): لە قوڕدا چەقیوە و نازانێت چی دەڵێت (بە گەوجێك دەڵێن كە قسەی هەلەق و مەلەق بكات).

(الوَخْفَة): ١-جارێك ئـاو كردنه ئاردەكەوەو تێكهەڵشێلانی. ٢-دەفرۆكە یان توورەكەیەكی بچووكی چەرمین(اَلوُخيفَة): ئارد یان شتی وەهـا كە ئاوی تێبكەیـت و تێكەڵی بكەیت و بیشێلیت.

(اَلمُوْخِف): گەوج.

(اَلمِيْخَف): دەفرێك كە ئاردی تێدا هەڵبشێلرێت.

٢-(اِتَّخَفَ-تْ رِجْلُهُ): قاچی هەڵخلیسكا.

وخـم: (وَخَمَ-هُ يَخِـمُ. وَخْماً): لەو خراپتر گەدەی تێكچوو.

(وَخِـمَ و اتَّخَمَ-مِن كذا وَعَنــهُ): بەوە یان لێوەی ئینتەلای كرد تلخەی كرد.

(وُخُمَ-المَـكانُ) أو الطَعـامُ. يَوْخُـمُ وَخامَةً وَوُخُومَـةً وَ وُخُوماً): شـوێنەكە ئاووهەوای ناساز و نادروست بو یان خواردنەكە بۆگەنبوو قورس و خراپ بوو/ گرفتاوی بوو.

(وَخُمَ-الشـيءَ): شـتەكەی بــەد و بێكەڵك لێكرد.

(واخَـمَ-هُ مُواخَمَــةً فَوَخَمَهُ): لــەو زووتر گەدەی تێكچوو لەو گەدەتێكچووتر بوو.

(اَتَّخَمَ-هُ الطَعامُ) اِتِّخاماً: خواردنەكە گەدەی تێكـدا/ تلْخەی پێكــرد/ ئینتەلای پێكرد (لە بنچینەدا.

(اَتَّخَمَ-هُ) وە (تَوَخَّمَ-الطَعامَ): خواردنەكەی بــە خراپ دانــا و دڵی لێی هەڵكەنــرا و دڵی نەچووە سەری.

(اِسْـتَوخَمَ-الطَّعامَ): خواردنەكەی بە خراپ دانا و دڵی نەچووە سەری

(-المَـكانَ): ١-شـوێنەكەی بــە ناســاز و ناتەندروســت دانا هەواكەی پێنەكەوت ٢-بە زیانبەخشی دانا و زانی.

(اَلوَخْــم (ج) اَوخَام-مِنَ الرجــال): پیاوی لەشگران و قورس.

الوَخِم (ج) اَوخام= الوَخم

(شَيءٌ وَخِمٌ): شتێكی خراپ و دەرداوی.

(اَلوَخَم) (طب): ١-دەردێكە وەك مایەسـیری ٢-پیسـبوونی هــەوا و كە نەخۆشــیی و پەتا بكەیەنێــت/ تــووش بكات. (ئەم وشــەیە بۆ هەموو شــتێكی زیانبەخش بەكار دێت). لای خەڵكە رەشــۆكەكە(عامية) بە پیسایی گوو دەڵێن (بە ئیدیۆم).

(أرضٌ وَخْمَة وَ وَخِمَة وَ وَخامٌ): ١-زەوییەك گیاكــەی بۆڕۆ و خراپ بێت و ئاژەڵ نەیخوات ٢-شوێنێك پەتا و نەخۆشی بەخش بێت.

(اَلوَخُوم-مِنَ الرجال (ج) وَخامى وَ وِخامٌ): ١-پیاوی رەزا (گرانی/ تاڵی) نەگونجاو و رەفتار خوار ٢-قورس/ گران.

(بَلَــدٌ وَخيــم): وڵاتێكی هەوا و ئاو ناســاز/ ناتەندروست/ بێكەڵكی تێدا دانیشتن.

(شيءٌ وَخيم): شتێكی دەرداوی

(أمرٌ وَخيمُ العاقِبة): كارێكی ئەنجام خراپ/ بەد و زیانبەخش.

(أَرضٌ وَخيمَة):١-زەوییەك كە گیاكەی بەد و بێكەڵكە ٢-خاكێكی دەرداوی و ناتەندروستە

(اَلتُخَمَةُ (ج) تُخَمَات وَ تُخَم):گەدە تێكچوون بە هۆی خواردنەوە/ ئینتەلاكردن/ تلْخەكردن وشەكە لە بنچینەدا (اَلوُخَمَة)یە.

(أَرضٌ مَوخِمَــة وَ مَوخَمَــة وَ مُوخِمَــة): ١-خاكێــك كە گیاكەی خــراپ و بێكەڵك بێت زیان بەخش بێت. ٢-زەوییەكی دەرداوی.

(«هذا الطَّعام مَتْخَمَةٌ»): ئەم خواردنە گەدە تێكدەدات و زیانبەخشە (لە بنچینەدا وشەكە (مَوْخَمَة)یە).

وخــن: (تَوَخَّنَ): نیــازی خراپە یان چاكەی بوو.

(اَلوَخْنَة): گەندەڵیی.

وخــي: ١-(وَخی-الأَمرَ يَخــي وَخْياً): نیازی كردنی ئەو كارەی كرد/ ئەو كارەی بوو.

(-تِ الناقَــةُ): مێحوشــترەكە وا ڕۆیشــت نە خێرا و نە هێواش ڕۆیشت.

(«وَخی وَخْيَــهُ»): ڕووی كردە ئامانجەكەی خۆی.

(«ما أَدري أَينَ وَخــى»): نازانم ڕووی كردە كوێ.

(وَخَّی-الأَمرَ): تەنها هەر ئەو كارەی نیاز بوو/ ئەو كارەی ویستو هیچی تری نەویست.

(-هُ لِلأَمر): ڕووی پێكردە ئەو كارە.

(تَوَخَّــی وَ تَأَخی-الأَمرَ تَوَخِّيــاً وَ تَأَخِّياً): تەنها بــە دوای ئەو كارەدا چــوو هەر نیازی ئەو كارەی هەبوو بیكات. (إِسْتَوخی-القَومَ): هەواڵی خوێشانی پرسی. لە خوێشانی هەواڵ پرسی.

(اَلوَخْــي) (مــص) (ج) وُخِــيّ وَ وِخِــيّ): ١-نیاز/ مەبەست ٢-ڕووكردنە لایەك و شتێك. ٣-ڕێگەیەك كە متمانەی پێبكرێت و بەكەڵك بێتو مەبەستی بێت ٤-نیازدار/ مەبەستدار.

(اَلوَخی و الخِيَّة): نیاز/ مەبەست/ ئامانج.

٢-(واخی-فُلاناً مُواخاةً=آخاهُ): فیساری كرد بە برای خۆی.

ودّ: (وَدَّ-هُ. يَــوَدُّ وَدّاً وَ وُدّاً وَ وِدّاً وَ وداداً وَ وُداداً وَ وَدادَةً وَ مَوَدَّةً وَ مَوِدَةً وَ مَوْدُودَةً): خۆشــی ویست.. دڵی چووە ســەری حەزی لێ كرد.

(«وَدِدتُ لَــو كان كــذا و لَــو أَنَّــكَ فَعَلــتَ كذا»): حەزم دەكرد/ خۆزگەم دەخواست ئە ئاوابووایە. حەزم دەكرد واتبكردایە.

(وادَّ-هُ وِداداً وَ مُوادَّةً): دۆستایەتیی لەگەڵدا گرت/ خۆشیویست.

(تَــوَدَّدَ-هُ): خوازیــاری دۆســتایەتی ئــەو بوو/ ویســتی دڵی بۆ لای خۆی ڕابكێشــێت/ پەیوەندیی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی لەگەڵدا (قایم بكات/ هەبێت).

(-إِلَيــهِ): خــۆی لا بــردە پێشــەوە/ خــۆی لا خۆشەویست كرد و خۆشەویستی بەرامبەر نواند.

(تَوادَّ-الرَّجُـلانِ): یەکتریان خۆشویســت و بوونە دۆستی یەکتری.

(اَلوَدّ و الوِدّ وَ الوُدّ): خۆشەویستی/ دڵویستن/ حەز.

(«بِــوُدی أن یَکــونَ کــذا»): حــەز دەکەم/ حەزمە وابێت.

(«بِــدّي أفْعَلَ کذا») (عامیــة): دەمەوێت/ حەز دەکەم وابکەم.

(اَلوَدّ (ج) أَوداد وَ أَوُدّ وَ أَوِدّ): زۆر حەزکردوو زۆر پێخۆشبوو. زۆر دۆست زۆر خۆشەویست

(«هُوَ وُدُّكَ وَهُم أَودادُكَ»): ئەو خۆشەویستتە/ ئەو دۆستی خۆشەویستی تۆیە اوان خۆشەویستی تۆن/ دۆستی تۆن.

(اَلوُد والوَد والِود = اَلمحبین): خۆشەویستان

(«قَومٌ وُد»): خۆێشــگەلێکن خۆشەویســتی یەکترین.

(اَلوَدُود):١-دۆستخواز،میهرەبان/ دۆستپەروەر ٢-خۆشەویست/ دۆست.

(هُوَ وَدُود وهَي وَدُود): ئەو خۆشەویســتە/ دۆستخوازە/ میهرەبانە ئەو ژنە خۆشەویستە/ میهرەبانە.

(اَلوَدید (ج) أَوِدة وَ أَوِداء): دۆستدار/ خۆشەویست، برادەر، میهرەبان.

(الوَدیــد= اَلمُحِبین): دۆســتان، دۆســتداران خۆشەویستان. میهرەبانان

(اَلأَوَد (ج) اَلأَوَدون): دۆستترین، دۆستدارترین خۆشەویستترین،دۆستخوازترین،میهرەبانترین پەیوەندیدارترین.

(اَلمِوَد):زۆردۆستپەروەرزۆر خۆشەویستپەروەر زۆر دۆستخواز، زۆر بەحەزو دڵ.

ودا: (وَدَأَ- الشيءَ یَدأُ وَدْأَ: شتەکەی تەختکرد، راستکردەوە.

(-بالقَــوم): خوێشــگەلی خراپــە بارانکردو گرفتاری ناهەمواریی کردن.

(وَدِئَ. یَوْدَأُ وَدَأً): برا/ پچرا.

(«وَدِئَتِ الأَخبارُ عَنــهُ»): هەموو هەواڵێکی دەرباره برا.

(وَدَّأَ- عَلَیــهِ الأَرضَ تَوْدِیئــاً وَتَودِئَــةً): زەویەکەی بەسەردا تەختکرد.

(-عَلَیهِ وَبِهِ): فەوتاندی/ مراندی.

(-وَدَّأتــهُ- الأَرضُ): زەویەکــە شــاردیەوەو ونیکرد.

(تَوَد أَعَلَیهِ): فەوتاندی/ مراندی.

(-ت علیه الأَرضُ): زەویەکە هەرەســیهێناو بەســەریدا رمــاو تەختبوو. شــاردیەوە وەك چۆن مردوو دەشاردرێتەوە.

(-ت عَلَیهِ وَعَنهُ الأَخبارَ): هەموو هەواڵێکی براو ونبوو.

(-الرَجُلُ): مرد.

(-فُــلانٌ علی مالِهِ): داراکەی دەســتگیربووو بردی.

(اَلوَدَأ) (مص): فەوتان/ لەناوچوون/ مردن.

(اَلتَّوْدِئَــةَ) (مص): بەژێر خاكــەوە كردن/ ناشتن.

(اَلْمُوَداةُ): ١-فەوتگە ٢-بیابانی فراوانی وشك‌و بێئاو ٣-چاڵی مردوو/ گۆڕ/ گڵكۆ.

ودب: (اَلــوَدَب): بەدبارِیی/ بەد گوزەرانیی/ باركەوتن/ گوزەران تاڵ بوون.

(«هُوَ علی وَدَب»): ئەو بەدبارە/ باركەوتووە/ گوزەرانتاڵە ودج:

(وَدَجَ و وَدَّجَ -الدابةَ. یَدِجُ. وَدْجاً): شادەماری ملی چوارپێكەیبری

(-بَینَ القَومِ): نێوانی خوێشكەلی چاككردەوەو یەكیخســتنەوە/ ئاشــتیكردنەوە/ خراپــەو ناتەبایــی لــە نێوانیاندا نەهێشــت (لە دوو شادەماری) ملەوە وەرگیراوە كە پێكەوەن.

(وادَجَ-هُ. مَوادَجَــةُ): لەگەڵیــدا ئاشــت‌و نەرمبوو.

(اَلوَدَج (ج) أوداج): (ع ا): ١-دوو شــادەماری ملن كە لە تووڕە بووندا هەڵدەستن.

(وَدَجان): دوو شادەماری مل.

٢-(عِــرق الأَخْــدَع): شــادەماری مــل كــە ســەربڕەكە، بــڕی، ژیــان لەســەر بڕاوەكەدا نامێنێــت ٣-ریگەو هۆكار («كان فُلان وَدَجي إلى كــذا») بەهۆی فیســارو لەڕێگەی ئەوەوە گەیشــتمە ئــەوە/ فیســار هــۆكارو رێگــەی گەیشتنم بەوە بوو.

(اَلوَدَجان): دوو براكە.

(«بِئْــسَ وَدَجا حَربِ هُمــا»): هەردووكیان دوو برای خراپ‌و بەدی جەنگبوون.

(اَلوِداج (ع ا): دوو شــا دەمــاری ملن لەكاتی تووڕەبووندا هەڵدەستن/ بەرزدەبنەوە.

(اَلوداجان): ئەو دوو شادەمارەن.

(ودح: (أَودَحَ- لَهُ): بەگوێیكردو ملیداو خۆی بەدەســتیەوە دا دوایكەوت جڵەوی خۆی دایە دەست.

(-تِ الإبــلُ): حوشــترەكان قەڵەوبــوون‌و بەخۆیاندا هاتن/ باریان باشبوو.

(-الحَوْضَ): گوڵەكەی چاككرد.

(اَلوَدَحة): شتێكی كەم.

(«ما أَغنى عَني وَدَحَةً»): شــتێكی كەم دادم نادات.

ودر: (وَدَرَ. یَــدِرُ وَدْراً): وا سەرخۆشــبوو خەریكبوو بێهۆشبێت.

(-الشيءَ): شتەكەی لاداو دووریخستەوە.

(«دِرْ وَجْهَــكَ عَني»): رووم لێوەرگێڕەو لێم دووركەوەرەوە.

(وَدَّرَ-هُ): لاسیدا/ فریویداو خستیە مەترسیی فەوتانەوە.

(-الرَسولَ): فرستادەكەی نارد.

(- الشيءَ): لایداو دووریخستەوە.

(-المالَ): ســامانەكەی/ داراكەی (تەخشــان‌و پەخشــانكرد/ دەســتبڵاویی تێــدا كــرد/ بەفیرۆدا).

(-الرَجُلَ): پیاوەکەی فریودا لە خشتـەیبرد/ لایدا/ گومرایکرد/ گومرابوو.

(تَوَدَّرَ): لاسـیخوارد/ فریویخـواردو کەوتە مەترسـییەوە ٢-کەلاکـەوتو دوور خرایەوە ٣-داراکە تەخشانو پەخشانبوو بەفیرۆچوو.

(تَـوَدرَ- فِي الأمـرِ): لـە کارەکـەوە گـلاو تووشبوو.

(-هُ): خستیە فەوتانو مەترسییەوە.

ودس: ١-(وَدَسَ- عَلَيَّ الشـيءُ يَدِسَ وَدْساً): شتەکەم لێ شاردرایەوە لێونبوو.

(-إلَيهِ بكَلام): سـەری قسەیەکی بۆ درکاندو قسەکەی تەواو نەکرد.

(-بالشيءِ): شتەکەی شاردەوە.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە رۆیشت.

(-المَكانُ): شوێنەکە بەگیا داپۆشراو گیای زۆر بوو.

(وَدَّسَ- الشيءُ): شتەکە شاردرایەوە ونبوو.

(-المَكانُ): شوێنەکە بەگیا داپۆشرا.

(-تِ الماشِـيَةُ): ئاژەڵەکـە لەگیـا زۆرەکـەی زەویەکەدا لەوەڕا کە زەویەکەی داپۆشیبوو.

(-إلَيهِ بكَلِمَةٍ): وشەیەکی بەگوێدادا.

(أَودَسَ- تِ الأَرضُ): زەویەکـە بەگیایەکـی زۆر داپۆشـرا/ گیایەکی وای دەرکرد کەرووی داپۆشێت

(تَوَدسَ- المكانُ): گیای زۆر بوو

(أَلوادِس والوِداس): گژوگیایەکی زۆری وا کە زەوی داپۆشێت.

(أَلـوَدَس= الـوادِس): ١-گیایەکـی زۆر کـە زەوی داپۆشـێت ٢-خـەوش/ ناتەواویـی/ کەموکووڕیی.

(أَلوَديس): پووش/ گیای وشك.

(أَرضٌ مَودوسَـةٌ): زەوییـەك گیـای تێـدا دەربێتو زۆر نەبێت.

٢-(الوَديس): هەنگوینی پاڵاوتەو پوختە.

وَدَصَ - إلَيهِ بكَلام - يَدِصُ وَدْصاً): سـەری قسەیەکی بۆ درکاندو تەواو نەکرد.

ودع: ١- (وَدَعَ- الشيءَ يَدَعُ. وَدْعاً): شتەکەی وازلێهێنـا/ دەسـتی لـە شـتەکەی هەڵگرت بەجێیهێشت.

(-مالاً عِندَهُ): ماڵەکەی لا داناو پێی سپارد.

(-الثَوبَ بالثَّوبِ): بەرگێکی بەسەر بەرگەکەی تردا لەبەرکرد تا ئەوی ژێرەوە بپارێزێت.

(-الشـيءُ): شـتەکە مت بوو/ لە جێی خۆی راوەستا.

(-المُسـافِرُ الناسَ): گوزارکارەکـە ماڵئاوایی/ خواحافیزی لە خەڵکەکـە کرد/ دۆعاخوازی لێکردن.

(«وَدَعُوُهُ»): نزای ئاسانیی رێ و بێومییان بۆ کرد/ بەرێیان کرد.

(وَدَعَ ووَدُعَ-الرَجُلُ يَـودَعُ وَداعَةً): ئارام و دڵنیا بوو/ ستارەی گرت/ دڵی سرموت.

(وَديع و وادِع): بە ئارام/ دڵسـرموت/ دڵنیا/

دڵهێمن/ لەسەرخۆ/ هێمن.

(وَدَّعَ-الثوبَ فِي صَوان): جلەكەی/ پۆشاكەكەی خستە كەنتۆر یان بوخچە یان شوێنی جل هەڵگرتنەوە. بۆ ئەوەی بیپارێزێت.

(-اَلْمُسافِرُ القَومَ):گوزاركارەكە/ سەفەركەرەكە ماڵئاوایی لە خوێشگەل كرد و ئەوانیش بەنزاوە بەرێیانكرد.

(-القَومُ المُسافِرَ): خوێشگەل گوزاركارەكەیان بەرێكرد/ خواحافیزبوونیان لێكرد.

(-فُلاناً): لە فیسار جیابووەوە و بەجێی هێشت/ وازی لێ هێنا.

(-الصَبيُّ أو الكَلْبَ): ملوانكەی گوێچكەماسی و شتی لەو بابەتەی كردە ملی منداڵەكە یان ملی سەگەكە (-فَرَسَهُ): خزمەتێكی زۆری چارەوێكەی كرد/ ئالیكی باشی بە چارەوێكەیدا.

(وادَعَ-هُ مُوادَعَةً وَ وِداعاً): پێكەوە ئاشت بوونەوەو رێككەوتنەوە/ تەبا بوونەوە.

(اَلوِداع): ئاشت بوونەوە و تەبا بوونەوە.

(أودَعَ-هُ الشيءَ): شتەكەی لا بە بارمتە دانا/ لا سپاردە كرد پێی سپارد.

(-هُ السِرَّ): نهێنییەكەی لا دركاند و داوای پاراستنی لێ كرد.

(-كِتابَهُ كَذا): ئەوەی لە نامەكەدا نووسی.

(-الكَلامَ مَعنىً حَسَناً): واتایەكی جوانی (بە قسەكەیدا/ خستە ئاخاوتنەكەیەوە).

(«أودَعْتُهُ مالاً»): ماڵەكەم بە بارمتە لێ وەرگرت لام سپاردە بێت.

(تَوَدَّعَ الثَوبَ): بەرگەكەی/ جلەكەی پاراست

(-فُلاناً): دەستی بە روویەوە نەنا و پێویستییەكەی دایە و كۆمەكی كرد.

(-القَومُ): خوێشگەل یەكتریان بەرێكرد و دۆعاخوازییان لە یەكتر كرد.

(تَوادَعَ-القَومُ): ١-خوێشگەل ئاشت بوونەوە ٢-یەكتریان بەرێكرد/ دۆعاخوازیان لە یەكتر كرد.

(إتَّدَعَ): دامركاو ستارەیگرت/ جێگیر بوو و هێمن بووەوە.

(إسْتَودَعَ-فُلاناً مالاً): مال/ دارایی بە فیسار سپارد و بە بارمتە لای دانا

(اَلدَعَة و التُدْعَة وَ التُدَعَة و التَداعَة): ١-ئارامبوون و لەسەرخۆیی و ئاغری/ سەنگینی. ستارە گرتن. ٢-حەوانەوەی ژیانی تێر و تەسەلیی/ خۆشگوزەرانیی.

(اَلوَدْع)(مص)(ج) وُدوع): گۆڕ/ گڵكۆ.

(اَلوَدْع و الوَدَع): هێلكە شەیتانۆكە و شتی لەو بابەتە كە لە دەریادا دەردەهێنرێت.

(وَدْعَة وَ وَدَعَة (ج) وَدَعات): هێلكە شەیتانۆكەیەك.

(اَلوَداع): ١-خواحافیزی كردن/ خواحافیز/ ماڵئاواییكردن كە گوزارەكار دەیكات ٢-سووتووی رووەكی ترشۆكە.

(اَلوَداعَــةَ): هێمنی و ســەنگینی/ ئاغریی/ لەسەرخۆیی.

(اَلوَدیع(ج)وُدَعاء): ١-هێمن/لەسەرخۆ/هێواش ٢-ســەنگین و ئاغر ٣-دامرکاو/ ســتارەگرتوو. ٤-گۆڕستان ٥-پەیمان/ بەڵێن.

(اَلوَدیعَــة (ج) وَدائِــع): ١-ســپاردە/ بارمتە ٢-مێی وشەی (اَلوَدیع).

(المُستَودَع): ١-عەمبار/ گەنجینە/ شوێنی شت تێدا کۆکردنەوە و پاراســتنی ٢-(ع)منداڵدان کە لە سکی ئافرەتدا دەبێت.

(اَلمُوْدَع)(مفع): (مِنَ الخَیل): ئەسپی هێمنی رامی لەسەرخۆ و حەوێنراوە.

(اَلمَوْدوع): سەنگینی/ ئاغریی و لەسەرخۆیی.

اَلمِیــدَع (ج) مَوادِع: ١-کەنتۆر و شــوێنی تری بــەرگ هەڵگرتن و پاراســتنی. ٢-جلی کۆن و دڕاو/ شڕو وڕ.

(کَلامٌ میدَعٌ): قسەی داخبەخش/ خەفەتدەر.

(لمیدَعَة): ١-ئــەوەی بەرگی تێدا دەپارێزرێت ٢-جلەکۆنەی شڕودڕاو.

(اَلمیداعَــة): ١-پیاوێك کە حــەز بە هێمنی و حەسانەوە و دوور لە ئاژاوە و نارەحەتی بکات ٢-شــوێنی جل/ پۆشــاك/ بەرگ هەڵگرتن و پاراستنی.

٢-(اَلوَدْع (ج) وُدوع): ئامانجێك کە کۆششی بۆ بکرێت و ملی بۆ بنێن.

(اَلأوْدَع)(ج): گۆڕهەڵکەنە.

اَلمُلحَق

ودع: (اَلإیداع): ســپاردنی شتێك بە لایەك/ بە بارمتە دانانی شت.

(«إیداع مَبْلَغ»): دانانی پارەیەك وەك بارمتە لە بانکێکدا.

(اَلإیداع فِي التِجارَة): سپاردن و دانانی کەلوپەلی بازرگانیــی هاوردە لــە عەمبارەکانی گومرگدا یان خستنی ئەوانە لەژێر چاودێریدا.

(اَلإیداع): ســپاردنی کەلوپەل بە بازرگان یان کۆمپانیایەك بۆ فرۆشتنی بەرامبەر پارەیەك بۆ ئەو ماندویەتیە.

(اَلإیــداع فِي القانــون المَدَنــي): ســپاردە لە یاسای شارســتانیدا ئەوەیە وام وەرگرێك ئەو وامەی کە لە لایەتی بخاتە ســندوقی دادگاوە ئەگەر خاوەن وامەکە لــە قەرزارەکە پارەکە وەرنەگرێت.

(اَلإیداع فِي قانون الإیجار): بارمتە/ سپاردن لە یاسای بەکرێداندا ئەوەیە کە کرێگرتەکە پارەی کرێی خانووەکە یان ئەوەی بەکرێی گرتووە بخاتە ســندوقی پۆســتەخانەوە ئەگەر بەکرێدەرەکە پارەکە لە کرێگرتەکە وەرنەگرێت.

(اَلایــداع فِي الإدارَة): بارمتــە/ ســپاردە لە بەڕێوەبەرێتیــدا ئەو پارەیــەی کە دەخرێتە ســەر شــانی خەڵك و لێیــان داوادەکرێت بۆ دڵنیابوون لــەو پابەندبوونەیان کە داویانە و وەك بارمتەیەك دەبێت.

(إيـداع ألمعامَلَـة دائـرة كـذا): سـپاردنی کارنامەیەك بە فەرمانگەیەك و لە لای تۆمار بکرێت و دابنرێت.

(ألإستيداع): سـپاردنی کەلوپەل بۆ کاتێکی کەم/ بارمتەکردنی لە عەمارێکدا.

(«مَخزَن ألإستيداع»): ١-عەمارە سـپاردن/ بارمتە کردنی کەلووپەل بۆ ماوەیەك.

٢-(وضـع إداري خـاص بمُوَظـف لم يَعد يُمـارس عَمَلَهُ «أُحيـلَ إلى الإسـتيداع»): ١-بارێکـی تایبەتـی کارمەندێکـە کـە ئیتر کارەکەی نەکات: دەستی لەکارکێشرایەوە.

(ألإسـتيداع) ٢-إعفاء الضابط مِنَ الخدمة قَبـلَ سـن المَعـاش: لەسـەر کار لابردنـی ئەفسەرێك پێش تەمەنی خانەنشین کردنی.

ودف: ١-(وَدَفَ-الشَحمُ. يَدِفُ وَدْفاً): بەزەکە توایەوە و کشا.

(-الإناءُ): قاپەکە تکەی کرد.

(-لَهُ العَطاءَ): بەخشینەکەی کەمکردەوە.

(تَوَدَّفَ الخَبَرَ): بۆ هەواڵەکە گەڕا/ سـۆراغی هەواڵەکەیکرد.

(إسْـتَودَفَ-الخَبَرَ): بـۆ هەواڵەکـە گـەڕا و سۆراغی کرد/ دوای هەواڵەکە کەوت.

(-الشَحمَ): بەزەکەی تواندەوە و دڵۆپاندی.

(-اللَّبَنَ): شیرەکەی ڕۆکردە قاپەکەوە.

(-مَعروفَ فُلانٍ): چاکە و یارمەتی فیسـاری خواست/ داواکرد.

(ألوَدَفَة): بەز.

٢-(تَـوَدَّفَ-تِ الأَوْعالُ فَـوقَ الجَبَلِ): بزنە کێوییـەکان سـەرکەوتنە سـەر بەرزایـی کێوەکە.

(إسْتَودَفَ-فِي الإناءِ): سەری قاپەکەی لادا و لە سەرەوە تێی ڕوانی.

(-النَباتُ): گیاکە باڵای کرد.

(ألوَنْفَـة و الوَدِيفَة): مێرگ/ باخ و باخچەی پڕ لە گوڵ و سەوزایی/ مێرخوزار.

(أَلوَدَفَةُ (ن)=النَصِيّ): چاوبازەڵە.

ودق: ١-(وَدَقَ-إلَيهِ يَدِقُ وَدْقاً وَ وُدُوقاً): لێی نزیك بووەوە/ لێی هاتە بەرەوە.

(-بطْنُهُ): ورگی لێهات/ ورگی گەورە بوو یان سکیچوو.

(-بِهِ): دڵی (پێکرایەوە/ پێخۆشبوو).

(- تِ السماءُ): ئاسمان باراندی.

(-المَطَرُ وَدْقاً): باران دڵۆپە دڵۆپە باری

(-وَدَقَ وَ وَدِقَ وَ وَدُقَ-ذاتُ الحافِـرِ يَـوْدَقُ وَ يَـوْدُقُ. وَدَقاً وَ وُدْقاً وَ وُدُوقـاً وَ وَداقاً وَ وَدَقاناً): مێ سمدارەکە هاتەکەڵ/ بەکەڵبوو. بزنەکە. مەڕەکە هاتە تگە.

(وادِق وَ وَدُوق وَ وَدِيـق): وڵاخـی بەکـەڵ. مانگای بەکەڵ. بزن و مەڕی بەتگە.

(ألوداق): بەکەڵبوون بەتگەبوون.

(أَودَقَ-تِ السَّماءُ): ئاسمان باراندی.

(ألوَدْق) (مص): باران.

(اَلوَديقَــة (ج) وَدائِق): ١-شــوێنێك كە گیادا یان ســەوزەدارە ٢-نەوپەڕی گەرما (بۆیە وای پێدەڵێــن چونكــە گەرماكە دەگاتــە هەموو شوێنێك).

(اَلمَوْدِق): هەڵوێســتی هەڵزنی ئاســك و هیتر لەو شــوێنەدا كە گەڵای درەخت لێدەكاتەوەو دەیخوات.

٢-(وَدِقَــت عَینُــهُ یَیــدَقُ وَدَقــاً): چــاوی زیپكەیەك یان خاڵێكی سووری لێ پەیدا بوو.

اَلوَدْقَةُ والوَدَقَةُ (ج) ودْقٌ ووَدَق): زیپكە یان خاڵێكی سوور كە لە چاودا پەیدا دەبێت.

(عَینٌ وَدِقَةٌ): چاوێك زیپكەی لێ هاتبێت یان خاڵێكی سووری تێدا پەیدا بووبێت.

٣-(وَدِقَ-اَلسَــیفُ. یَــدِقُ وَدْقــاً وَ وُدُوقــاً): شمشێرەكە تیژ بوو.

٤-(اَلمَــودِق): ١-ئاشــووبگە شــوێنی بەدیی و خراپە/ ئاژاوەگا ٢-(چەپەری/بەســتی)نێوان دووشت.

ودك: (وَدِكَ. یَودَكُ وَدَكاً): گوشتن و بەزاوی بوو/ چەوربوو.

(وَدَّكَ-الثَّرِیدَ): (تێكوشــینەكە/ تریتەكە)ی چەوركرد/ رۆنی تێكرد.

(اَلوادِك وَ الوَدِك): ١-قەڵەو/ گۆشتن ٢-چەور ٣-لەش بەزگرتوو.

(اَلدِكَة): ١-قەڵەوبوون/ بەزگرتن ٢-چەوربوون

(اَلوَدَك): گۆشتی چەور و بەزاویی.

(رَجُلٌ ذو وَدَك): پیاوێكی (قەڵەو/ گۆشتن و غەز و بەزدار).

(وَدَكُ المَیتَةِ): ئــەوەی لە مردووەكە دەڕوات و دەڕژێت.

(اَلوَدّاك): بەزو پیوفرۆش.

(دِجاجَةٌ وَدُوكٌ وَ وُدیكٌ): مریشكی قەڵەوی چەور.

(اَلوَدیكــة): ١-مێی وشــەی (اَلوَدِیك) ٢-ئارد رۆنی تێدەكرێت و هەڵدەشێلرێت.

دجاجَةٌ ودیكة): مریشكێكی قەڵەوو چەور.

٢-(بَنــاتٌ اَودَك): وەی/ چورتــوم/ بــەڵا/ ئاپۆرە.

ودل: (وَدَلَ-الســقاءَ یَدِلُ وَدْلاً): مەشكەكەی ژەند/ ڕایوەشاند.

ودن: ١-(وَدَنَ-الشــيءَ یَدِنُ. وَدناً): شتەكەی ١-كــورت كردەوە ٢-كەمی كــردەوە و بچووكی كردەوە ٣-كوتای و هاریی/ وردی كرد.

(شيءٌ مَوْدون): وردكراو/ هارراو/ كوتراو.

(وَدَن-هُ بالعَصا): بە داردەست لێیدا.

وَدَنَ وَ وَدِنَ-تِ المَــرأةُ یَــودَنُ وَدَناً): ژنەكە منداڵێكی/ ساوایەكی لاواز و باریكەلەی بوو.

(وَدَّنَ-الشــيءَ): ١-شــتەكەی كــورت كردەوە ٢-كەمی كردەوە.

(اَودَنَ-الشــيءَ): ١-شــتەكەی كــورت كردەوە ٢-بچووكی كردەوە

(-تِ المَرأةُ): ژنەكە منداڵێكی باریكەلەی بوو

(اَلْمُوْدَن): ساوای/ منداڵی باریکەلە.
(اَلْمُوَدَّن): کورتی ناتەواوی زگماکیی
(اَلْمَـوْدُون (م) مَوْدُونَـــة): (ســاوا/ منداڵ)ی باریکەلە ٢ـملکورتی شــان بچــووك و ناتەواو دەست و پێ کورتی زکماك.
٢-(وَدَنَ-الشيءَ. يَدِنُ وَدْناً وَ وِداناً): شتەکەی تەڕ کرد و خووساند.
(-الجِلْدَ): پێســتەکەی خســتە ژێر گڵەوە تا نەرم بێتەوە.
(وَدَّنَ-الشيءَ): شتەکەی تەڕ و نەرم و شل کرد.
(تَوَدَّنَ الجِلْدُ): پێستەکە نەرم بوومەوە
(اِتَّدَنَ-الجِلدَ): پێســتەکەی خســتە ئاوەوە و خوساندی.
(-الجِلْدُ): پێستەکە خووسایەوە
(اَلْأَوْدَن): نەرم و شل.
(اَلْوَدِين): خووساو/ لە ئاونراو.
ودە: ١-(وَدَهَ-فُلاناً عَــنِ الأَمرِ. يَدِهُ. وَدْهاً): فیساری لە کارەکە گێڕایەوە.
(اَودَهَ-بالإِبلِ. إِيداهاً): دەنگی لە حوشترەکان کرد و گێڕانیەوە.
(-فُلاناً عَن كذا): ڕێی فیســاری لەوە گرت و لێی گێڕایەوە/ نەیهێشت بۆی بچێت.
(اِسْــتَوْدَهَ-الخَصْمُ): نەیارەکــە/ ناحەزەکــە بەزێنراو ملیدا.
(-تِ الإِبــلُ): حوشــترەکان گــرد بوونەوە/ مۆڵیاندا و کەوتنەڕێ.
(-الرَجُــلَ): پیاوەکەی ســووك کــرد یان بە سووکی دانا.
(-الأَمــرُ): کارەکــە باش بوو و باری ڕاســتی وەرگرت.
٢-(اَلْوَدهاء-مِــنَ النســاء): ئافرەتــی ڕەنگ جوانی سپی پێست.
ودي: ١-(وَدَى-القاتِــلُ القَتيــلَ. يَدِي وَدْياً. وِدْيَةً): پیاوکوژەکــە خوێنبایی کوژراوەکەی بە کەســوکاریدا. (اِتَّدى اِتِّــداءً): خوێنبایی کوژراوەکەی وەرگرت و تۆڵەی نەســەند. (لە بنچینەدا (أَوتَدى)یە)
(اِسْتَودى-بِحَقِّهِ اِسْتِيداءً): پێی لە مافەکەی ئەو نا.
(اَلدِيَة (مص) (ج) دِيات): خوێنبایی کوژراو. (لــە بنچینەدا (وِدْيُ)ە (ة) کە لە بری (واو)ە لابراوەکەیە).
٢-(وَدى-الشــيءُ. يَدى وَدياً) شــتەکە شلە و کشا لەبەری ڕۆیشت.
(الوادى): دۆڵ: شیو: لەوەوە وەرگیراوە چونکە ئاو تیایــدا دەکشــێت و دەڕوات بــۆ فرمانی داخوازی. دەوترێت:
(دِ. دِيا دُوْا. دِيْ. دِيا. دِيْنَ): بکشێ. بڕەوێ/ بڕۆ بکشێن بڕەوێن/ بڕۆن
(اَوْدَى. إِيداءً): فەوتا/ مرد.
(مُودٍ): فەوتاو/ لەناوچوو/ مردوو.
(اَودى-بِهِ الموتُ): مردن (فڕێستیەوە/ بردی).

(-بالشيءِ): شتەکەی برد.
(الـوادی) (فا) (ج) أَودِیه وَ أَوادِیَة وَ أَوْداء): (رەشـە خەڵکە بـە کۆکەی دەڵێـن ( ودیان) ١-دۆڵ/ دەرە ٢-شـیو/ چەم ٣-رێگـە/ رێباز و رێرەو.
(«هُمـا مِـن وادٍ واحد»): لـە واتایەکن یان گۆیەکن.
(«سالَ بِهِمُ الوادي»): لێشاوی شیوەکە بردنی و مردن/ فەوتان.
(«أَنْـتَ في وادٍ و نَحـنُ في وادٍ»): تـۆ لـە دۆڵێکدایـت و ئێمە لە دۆڵێکـی تردایـن/ واتا ئێـوە ئامانجێکتان هەیـە و ئێمە ئامانجێکی ترمان هەیە.
(اَلوَدی): (فەوتان/ مردن).
(اَلـوَدِيّ الواحِـدَةُ وَدِیَّـة)(ز): بێچووڵـە بچووکـەکان (لە بنـی دارخورمـادا دەردێت و پاشـان لێدەکرێتەوە و لە شـوێنێکی تردا دەروێنرێت.
(اَلْمَوْدي)(ج): شێر.
٣-(وَدی-الأَمْرَ یَـدِی. وَدْیاً وِدیَةً): کارەکەی نزیك خستەوە.
٤-(اَلتَودِیَة (ج) اَلتَـوادي): ١-پیاوی کورتەباڵا. ٢-تەختەیەکە بە پشتی مێحوشترەوە دەبەسترێتەوە.
وذّ: (وَذْوَذَ-الرَجُلُ): خێرایکرد/ پەلەیکرد
(«مَرَّ الذِئـبُ یُـوَذوِذُ»): گورگەکە تێپەڕی پەلەی دەکرد.

(رَجُلٌ وَذْواذٌ): پیاوێکە بەپەلەیە لە رۆیشتندا خێرایە.
وذا: (وَذَاَ-فُلانـاً. یَذَأُ وَذْأً): ١-تەرزەشـکێنی کـرد/ پێـدا هەڵشـاخا ٢-بە چاوی سـووك تەماشـای کرد/ سـووکی کرد ٣-تیر و توانجی تێگرت/ خەوشی لێگرت.
(-تِ العَـینُ عَنِ الشـيءِ): چاوەکە لەسـەر شتەکە کەلابوو/ لاچوو.
(إتَّذَأَ): پێدا هەڵشاخان.
(اَلوَذْء):(مص): پێدا هەڵشاخان و تەرزەشکێن کردن/ خنێو و قسەی دزێو پێوتن.
(اَلوَذْأَة): ١-خـەوش/ ناتەواویی/ کەموکوڕیی ٢-هۆ/ هۆکار.
وذح: ١-(وَذَحَ. یَـذِحُ وَذْحـاً): شـێتگیرانە رۆیشت/ زۆر توندوتیژو بە گوڕ رۆیشت.
(وَذِحَ-الرَجُـلُ. یَوْذَحُ و یَیذَحُ وَذَحاً): دیوی نـاوەوەی هـەردوو ئەژنۆی سـووتا/ سـوور بووەوە.
٢-(وَذِحَ-تِ الشـاةُ یَـوذَحُ وَ یَیـذَحُ وَذَحاً): مەڕەکـە (خلێنکـەی پێوەبـوو/ خلێنکاوی بوو).
(اَلـوَذَح): خلێنکـە/ کە بە خوریـی مەڕەوە دەلکێت کە هی پشـقڵو میزیەتـیو پێوەی رەق دەبێت.
(وَذَحَة (ج) وُذْح): خلێنکەیەك.
(اَلأَوذَح): بەد/ بەدخواز/ بەدزمان.

وذر: ١-(وَذَرَ. يَذِرُ. وَذْراً): بڕی.
(-الجرحَ): برینەکەی هەڵدڕی.
(وَذَّرَ-الوَذْرَةَ تَوْذیراً): گۆشتە کوتەکانی ورد ورد کرد.
(اَلـوَذْرَةُ مِنَ اللَّحـم (ج) وَذْرٌ وَ وَذَرٌ): کوتە گۆشتێکی بچووک.
(اَلوَذْرَتان): لچ و لێو.
(اَلوَذِرَةُ): ١-بازوو کە پلە گۆشـتی زۆری تێدا دەبێت ٢-ژنی بۆن ناخۆش و بۆگەن، وتراویشە ژنی لچ و لێو ئەستوور.
(اَلوُذارَةُ): سەرەبڕشتی لای بەرگدروو.
٢-(وَذَرَ-الشـيءَ يَـذِرُ وَذْراً): شـتەکەی (بەجێهێشـت/ وازلێهێنـا)/ لێی گـەڕا. بەم واتایە تەنهـا ڕانەبوردوو داخوازیی دەوترێت و بەکاردەهێنرێـت دەوترێت: (ذَرْهُ وَيَذَرُهُ): وازی لێبهێنە/ لێی گەڕێ و وازی لێدەهێنێت/ لێی دەگەڕێت. بۆ فرمانی ڕابوردوو دەوترێت: تَرَكَ وازیهێنا. چاوگەکەی: تَرْك، وازهێنان.
(اَلتارِك): وازهێن دەوترێت.
وذع: (وَذَعَ-المـاءُ يَذَعُ وَذْعاً): ئاوەکە کشـا/ ڕۆیشت.
(اَلواذِع) (فا): ١-ئاوی کشـاو و لەبەرڕۆیشتوو ٢-هەمـوو ئاوێکی سـاف و ڕوون کە بەسـەر تاوێردا بڕوات/ بکشێت.
وذف: (وَذَفَ-الشَـحْمُ و غَيرُهُ يَـذِفُ وَذْفاً): پیوەکە شل بووەوە و کشا.
(وَذَفَ وَ وَذَّفَ و تَـوَذَّفَ وَذْفـاً): بە لەنجە و خۆبادانەوە ڕۆیشت.
وذل: ١-(تَوَذَّلَ-القَومُ مِن الجَزّار): گۆشـتیان لـە قەسـابەکە وەرگـرت بەبـێ وەك یـەك بەشکردن.
الوَذالَـةُ: ئەو بـەش و کوتانەی قەسـابەکە دەیبڕێت بەبێ ئەوەی هێندەی یەك بن.
(اَلوَذيله): پارچەیەك گۆشـتی پشتی حوشتر و کۆپارەکەی.
٢-(اِمـرَأَةٌ وَذِلَـةٌ وَ وَذَلَـةٌ): ژنێکی چابوکی شۆخ.
(اَلوَذيلَـةُ (ج) وَذيـلٌ وَ وذائِـلٌ): ١-پارچە زیوێکـی بریقەدار و سـافکراو یـان پارچەی هەمەڕەنگ/ هەرچۆنێك بێت ٢-ئاوێنە.
(-مِنَ النِسـاءِ): ژنی شۆخ/ بالآبەرزی ناوقەد باریك و لەش ڕێکوپێك.
وذم: (وَذِمَ-تِ الدَلْـو يَـوذَمُ وَذَماً): چەرمی گۆشەی سەتڵەکە پچڕا.
(وَذِمَـةٌ): سـەتل یـان دۆلکـەی قایشـی گۆشەپچڕاو.
(وَذِمَ الوَذْمُ نَفسُهُ): قایشی دۆلکەکە/ سەتڵەکە کە لەخۆیەوە پچڕابێت.
(وَذَّمَ-هُ): پارچەپارچەی کرد.
(-الكَلْـبَ): قایش یان ڕسـتە مووڕووی کردە ملی سەگەکەوە.
(-الدَلْوَ): قایشـی بۆ سـەتڵەکە/ دۆلکەکەی

چالاوەکە کرد و پێوەی قایم کرد.
(-اليمينَ): سوێندەکەی پێویست کرد.
(-على الخَمسين): تەمەنی لە پەنجا تێپەڕیکرد/ وەکو پترەکەی لە پەنجا ساڵەوە هەڵواسرابێت.
(أوذَمَ-الدَلوَ): چەرمی/ قایشی گۆشەی دۆلکەکەی قایم کرد یان بۆی کرد.
(-ألنِذرَ): ئاهەکەی/ نەزرەکەی لەسەرخۆی پێویست کرد.
(-على الخَمسين): تەمەنی لە پەنجا تێپەڕی کرد.
(ألوَذَم (مص) (ج) وُذوم و أوذَام وَ أوذُم و (جـج) أوادِم): ١-پتر/ زۆریی ٢-زیپکەیەکی رەق کە لە لەش دەردەچێت ٣-چەرمێکە/ قایشێکە بە گۆشەی هەردووسەری دۆلکەی بیرەکەوە دەبەسترێت و ئەو تەختەیەی بەسەر سەتڵەکەوەیە/ دۆلکەکەوەیە پێی قایم دەکرێت.
(ألوَذَمَةُ): قایشێکی پێبەستی تەختەی سەر سەتڵەکە.
(ألوَذَمَة:(ج) وِذام): ریخۆڵە و ورگ.
(إمْرَأةٌ وَذْماء و فَرَسٌ وَذْماء): ژنێکی نەزۆك. ماینێکی نەزۆك.
(ألوَذيمە (ج) وَذائِم): ئەو پارە و ماڵەی لە رێی خودادا بۆ خێر دەبرڕێتەوە.
(وَذِيمَةُ الكَلْبِ): قایشێکە دەکرێتە ملی سەگەوە.

وذن: (تَـوَذَّنَ-هُ تَوَذُّنـاً): پاڵی پێوەنـاو دەریکردو لایدا.
(-الشـيءُ فُلاناً): شـتەکەی لا جوان و سەیر بوو/ چووە دڵیەوە و سەرسامی بوو.
وذي: (وَذى-وجْهَـهُ يَـذي وَذيـاً): رووی دەموچاوی رووشاند.
(ألوَذاة): ئەوەی پێی دەرووشێنرێت یان ئازار دەگەیەنێت.
(ألوَذيَة): ١-جارێك روو رووشاندن ٢-ئازار/ ئێش/ ژان پێگەیاندن ٣-نەخۆشیی/ دەرد ٤-خەوش/ کەموکووری ٥-جۆرە ئاوێك/ ئاوی کەم.
ورّ:١-(ألوَرّ (ع)): سمت (ألوَرَةُ):١-چاڵۆچکەیەکی زەوی ٢-سمت.
٢-(وَرْوَرَ-النَظَـرَ): تیژ تەماشـای کرد/ تیژ چاوی لە شتەکە بڕی
(-في الكلام): بە پەلە قسـەی کرد/ گورجیی لە قسەکەدا کرد.
(ألوَروار):(ج): کە نەسـمە، باڵندەیەکی قاچ کورتە و دەنووك درێژ و رەش تەوقەسـەری سوورە گەردنی تەوقێکی مەیلەو زەردی هەیە ئەوی تری لەشـی سـەوزێکی مەیلەوشینە و دووپەری درێژ لە ناوەڕاستی کلکیدا هەیە
(ألوَروَرِيُّ): چاوکز.
(ألمُوَرْوِر (فا)): باڵندەی بخوێن.
ورأ: (وَرَأ-الشـيءَ يَرَأُ وَ يَورَأُ وَرءاً): پاڵی بە شتەکەوەنا.

(-مِنَ الطَّعامِ): تێری لە خواردنەکە خوارد.
(«ما وُرِثْتُ و ما أُورِثْتُ و ما وُرِّثْتُ بِهِ»): هەستم پێنەکرد/ پێم نەزانی.
(تَوَرَّأَت عليه الأَرضُ): زەویەکەی بەسەردا تەپی و دایپۆشی وەك چۆن مردوو. دادەپۆشرێت.
(أَلْـوَراء): ١-کورەزا یان کچەزا/ وەچەی وەچە ٢-(کەتە/ زەبەلاح)ی ئێسك ئەستوور.
(وَراءُ الإنسانِ): (پاشەوە/ پشتەوە/ دواوە)ی مرۆڤ دەشـێت بـە واتای پێشـەوەیش بێت (دەکرێت بە مێ و نێر).
(وُرَيْئَة وَ وُرَيِّء): ١-بچووك کراوەی وشـەی (وَراء): تۆزێك لە پشتەوە یان لە پێشەوە.
(«هُوَ وَرَيْئَةَ الحائِطِ أَو وُرَيْئَهُ»): تۆزێك لە پشتەوەی دیوارەکەوەیە. (ئاوەڵناوەی جێیە).
٢-(وُرَيْئَة): بێجگە لەوە/ جگە لەوە.
(«مَن إبتَغى وَراءَ ذلك»): هەر کەسێك جگە لەوە شتێکی تری بوێت.
ورب: ١-(وَرِبَ-العِـرقُ يَورَبُ وَرَباً): دەماری لەشەکە تێکچوو/ گەنبوو.
(وَرِب): دەمـاری (گەنبـوو/ خـراپ بـوو/ تێکچوو).
(وَرَّبَ-الشـيءَ فَأنْوَرَبَ)(عامية): شـتەکەی خوار و گێر کردو پێچیدا. ئیتر شتەکە پێچی خـوارد و خوار بوو. (وَرَّبَ-عَنِ الشـيءِ): بە شتی بەرچاوگر خۆی لە شـتەکە نادیارو ون کرد/ خۆی شاردەوە.

(وارَبَ-الرَّجُـلَ وِرابا وَ مُوارَبَـةً): فێڵی لە پیاوەکـە کـرد/ لە خشـتەی برد و تووشـی دەردیسەری کرد.
(الـوَرْب (ج) أَوْراب): ١-کونـە درِندە ٢-دەمی کونەمشك یان کونە دووپشك.
(أَلْـوِراب): لادان و پێچخـواردن/ خـوار و خێچی/ پێچ و پەنا.
٢-(أَلْـوَرْب (ج) أَوراب): ١-نێـوان دوودانـە پەراسـووی لـەش ٢-قولانج/ مـاوەی نێوان پەنجەی شایەتمان و پەنجە گەورە گەر تەواو کرابنەوە ٣-قنگ/بن.
(الورْب-الارب): ئەندام.
(اَلوَرْبَةُ): ١-قنگ/ بن ٢-کەمەر/ ناوقەد.
ورث: ١-(وَرِثَ-فُلاناً. يَـرِثُ. وِرْثاً وَ وَرْثاً وَ إرثاً وَ إرثَةً وِرثَةً وَ تُراثاً): بوو بە میراتگری فیسار میراتی فیساری وەرگرت و بۆ مایەوە.
(«وَرِثَ المـالَ و المَجـدَ عَن فُـلان»): دارا و نگینی لە فیسارەوە بۆ مایەوە.
(وَرَّثَ-الرَّجُـلَ مـالاً): دارای بـۆ پیاوەکـە بەجێهێشت و کردی بە میراتگری خۆی.
(-هُ مِن فُلان): میراتی فیساری کرد بە هی ئەو.
(وَرَّثَ-الرجُـلُ فُلانـاً): فیسـاری کـرد بە میراتگری خۆی.
(أَورَثَ-هُ. إيراثاً): میراتی بۆ بەجێهێشت.
(-فُلانـاً مـالاً): دارا/ ماڵـی بـە میراتی بۆ بەجێهێشت.

(-هُ السَقَمَ): بوو بە هۆی تووش بوونی نەخۆشیی/ لێوەی دەردی گرت/ دەردی بۆ بەجێهێشت.
(-هُ الشَيءَ): شتی لە پاش خۆی بۆ بەجێهێشت.
(-هُ الحُزنُ هَمّاً): خەفەت بوو بەهۆی دڵشکستیی و مەراقی.
(-المَطَرُ النباتَ نَعْمَةً): بارانەکە بوو بەهۆی شکۆفە و جوانیی و گەشەی گیاکە، رووەکەکە
(-وَلَدَهُ): میراتەکەی تەنها بەکورێکیدا/ بە فرزەندێکیدا و کەسی تری لەگەڵدا بەشدار نەکرد.
(تَوارَثَ-القَومُ): خوێشگەل میراتیان لە یەکتر برد.
(-القَومُ المالَ أو المَجدَ): نەتەوە دارا و نگینییان/ شکۆیان یەك لە یەکەوە بۆ مایەوە و بە میرات وەرگرت («تَوارَثوا المَجدَ کابِراً عَن کابِرٍ»): شکۆییان لە بزورگەوە بۆ بزورگ بە میرات ماوەتەوە و وەرگرتووە («المَجدُ مُتَوارِثٌ بَینَهُم»): شکۆی و نگینیی میراتە لە نێوانیاندا یەك بۆ یەکی بەجێدەهێڵێت.
(-هُم فِي إرثِ مَجدٍ): ئەوان لە میراتی نگینی و شکۆیین.
(«تَوارَثَتنی الحَوادِثُ»): لێقەومان یەك لە دوای یەك بەشمبوو بۆم مایەوە.
(الوارِث (ج) وَرَثَة وَ وُرّاث)(فا): میراتگر/ بەشبەری میراتی.
(الإرث وَ الوِرث والوِراثَة و التُراث): ١-میرات/ میراتیی/ بۆماوە ٢-کەلەپوور/ کەلتوور/ پاشماوەی دێرین. (المَورُوث)(مفع): میرات/ میراتیی بەجێهێڵراوی مردوو/ دارا و ماڵ و سامانی پاشماوەی مردوو هەرچییەك بێت.
(المُوَرِّث): میراتدەر/ میرات بەجێهێڵ.
(المِیراث(ج) مَوارِیث): میرات/ بەجێهێڵراوی پاش مردوو.
٢-(وَرَّثَ-النّارَ): ئاگرەکەی پێشکرد و خۆشکرد بۆ ئەوەی باشتر بگرێت.
٣-(الوَرْث): شتی تەڕ و تازە و ناسك.
ورخ: ١-(وَرِخَ-العَجینُ. یَورَخُ وَرَخاً): هەویرەکە ئاوی زۆربوو شلبووەوە.
(أورَخَ العَجینَ): هەویرەکەی شلکردەوە.
(تَوَرَّخَ-العَجینُ تَوَرُّخاً): هەویرەکە ئاوی زۆر بوو شل بووەوە.
(تَوَرَّخَ وَ اسْتَورَخَ-تِ الأرضُ إستیراخاً): زەویەکە تەڕدەبوو/ تەڕبوو.
(مَکانٌ وَرِخٌ): شوێنێك فرەگیا و گیاکەی بەیەکداچووبێت/ شوێنێکی ئاوەزێ.
(الوَرِیخَة(ج)وَرائخ):١-زەوییەکی(تەڕ/ئاوەزێ)
٢-هەویری شلی ئاو زۆر/ فرە ئاو.
٢-(وَرَّخَ-الکِتابَ): رۆژی نووسینی لەسەر نووسراوەکە دانا.
(التاریخ): مێژوو/ نووسینی قەوماو رووداو و شوێن و دەم و سەردەمی ئەو قەوماوانە و

هەموو شتێك دەربارەیان.
ورد: ١-(وَرَدَ-الماءَ يَرِدُ وُرووداً): ئاوی هێنا.
(وارد): هێنراو.
(وردَ الماءَ وَ غيرَهُ): ١-بۆ ئاوهێنان یان بۆ شتی تر چوو ٢-لێی نزیك بووەوە و گەیشتێ.
(الورد): چوونە سەرئاو و گەیشتنی.
(وَرَدَ-الرَجُلُ): پیاوەکە هات و ئامادە بوو
(-تِ الحُمَّى): تاکە ناوبەناو نەخۆشەکەی گرت.
(«وَرَدتُ البَلَدَ»): هاتمە شارەکەوە.
(«وَرَدَ عَلَـيَّ كِتــابٌ»): نووســراوێك یــان نامەیەك یان پەراوێکم بۆ هات.
(وُرِدَ-الرَجُلُ): تاکە پیاوەکەی گرتەوە.
(-عَلَيهِ بِفُلانٍ): فیساریان هێنایەلای/ بۆیان هێنا.
(وارَدَ-الرَجُلَ. مُوارَدَةً): بۆ لای پیاوەکە هات.
(-الشاعِرُ الشاعِرَ): هۆزانڤانێك هەڵبەستێکی دانا شاعیرێکی تریش هەر بەو مەبەستە و بەو وشانە شـیعرێکی دانا بێئەوەی ئاگای لەویتر و لــە هی ئەوی تــر بێت. (بــە رێکەوت ئەو مەبەست و واتا و وشانەیان بەبیردا هات).
(أَورَدَ-هُ إيراداً): هێنایە سەر سەرچاوەی ئاوەکە (ئەمــە بۆ هەمــوو هێنانێــك بەکارهێنرا وەك هێنانی کەلوپەل لە دەرەوەی وڵات. پێچەوانەکەی ناردنی کەلوپەل بۆ دەرەوەی وڵات.
(-هُ المــاءَ): وایکرد کە بچێتە ســەر ئاوەکە/ بردیە سەر ئاوەکە/هێنایە سەر ئاوەکە.

(-الكَلامَ): قسەکەی باسکرد و چووەسەری
(-الشيءَ): باسی شتەکەی کرد.
(عليه الخَبَرَ): هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە.
(تَوَرَّدَ): داوای بەشمئاوی خۆی کرد.
(-الماءَ): چووەسەر ئاوەکە و گەیشتێ.
(-الخَيلُ البَلدَةَ): ئەسپ سوارەکان وردە وردە و دەستە دەستە هاتنە شارەکەوە.
(تَوارَدَ —القَومُ إلى المَكانِ): خوێشگەل یەك بە دوای یەکدا هاتنە شوێنەکە.
(-القَومُ الماءَ): پێکەوە هاتنە سەر ئاوەکە.
(-الشاعِران): دوو هۆنەرەکە/ هۆزانڤانەکە/ شــاعیرەکە بە رێکەوت هەردووکیان لەســەر یەك مەبەست و بە وشەی وەك یەك شیعریان دانا بێئەوەی ئاگایان لە یەك بێت.
(إسْــتَورَدَ-الماءَ): ئاوەکــەی هێنا یــان ڕووەو ئاوەکە چوو و گەیشتێ.
(-هُ): ئەوی بردە سەر سەرچاوەکە.
(-الضَلالَةَ): بەرەو گومرایی ڕۆیشــت و تێی کەوت.
(-فُلاناً الضَلالَةَ): فیســاری ڕووەو گومرایی برد و تووشی کرد.
(-الَضائِــع)(تِ): کەلوپــەلی بازرگانیــی لــە دەرەوەی وڵاتەوە هاورد/ هێنا.
(الَــوارِد): ١-دلێــر/ ئەبــەرد/ بوێــر ٢-رێگە ٣-قژوشتی وەهای درێژ و بەردراوە.
(«فُلان وارِدُ الأَرْنَبَةِ»): فیسار لووت درێژە.

(وارد): هەموو شتێکی درێژ.
(وارد (ج) واردون وَ وُرّاد وَ وُرُود وَ وارِدَة):
(فا): هاتوو گەیشتوو.
(الــوارِدَةُ): ١-مێی وشــەی(الــوارِد) ٢-رێگا/ شــەقام/ جــادە ٣-خوێشــگەل دەچنە ســەر سەرچاوەی ئاو.
(الواردة): هاتوو.
(الــوارِدات): دەرامەتی میری کە لە گومرگ و سەرچاوەی ترەوە دەستگیری دەبێت.و عکسە الصــادرات ٢-ئەو کەلوپەلانــەی کە میری لە دەرەوە بەرێی گومرگــدا دەیهێنێت/ هاوردە. پێچەوانەی ئەوە هەناردەیە.
(الوَرْد (ج) وُرْد وَ وِراد وَ أَوْراد): (ح)١-شــێر ٢-ئازا/ دلێر ٣-چاونەترس/ چاوقایم/ بوێر.
(الوِرد): ١-تینوێتیی ٢-بەشــەئاو ٣-ئەو ئاوەی کە دەچنە ســەری/ کانی/ بیر/ ســەرچاوەی ئاو ٤-حوشــتر یان خوێشگەل کە دەچنە سەر ئاوەکە ٥-سوپا ٦-پۆلە باڵندە.
(الوِرْد (ج) أَوْراد): ١-تا ٢-سەرپەرشــتیکردنی ئاو و شتیتر ٣-ئەو بەشە قورئانەی کە هەموو شەوێك یەکێك دەیخوێنێتەوە.
(الوَرُود): حوشتری خێرا/ گورج/ چابوك
(الوَرِيــد (ج) أَوْرِدَة وَ وُ وُرُد وَ وُرُود (ع): شــارەگی گــەردن/ مــل/ کــە خوێــن بۆ دڵ دەهێنێتەوە. پێشی دەوترێت:
(حبل الوريد): خوێنهێنەر دوورەگن.

(«رَجُلٌ مُنتَفِــخُ الوَرِيد»): کابرا تووڕەیە و دەماری ملــی/ ڕەگی ملی هەڵســتاوە/ تورە و ترۆیە.
(المَــورِد (ج) مَــوارِد): ١-ســەرچاوەی هاتن/ داهات ٢-رێی چوونە سەر سەرچاوەی ئاو.
(المَــوْرِدَةُ): ١-ســەرچاوەی ئــاو/ کانــی/ ئەو شــوێنەی کە ئاوی لێوەدێت ٢-رێگەی چوونە سەر ئاوەکە ٣-قەوتگە/ هەڵەمووت.
٢-(وَرَدَ-تِ الشَــجَرَةُ يَرِدُ وُرُوداً): درەختەکە گوڵی گرت.
(وَرَّدَ وَ إِيراداً-الفَرَسُ. يَوَرُدُ وُ رودَةً): ڕەنگی چارەوێکە ڕەنگ سوریی زەردباو بوو/ پەمەیی بوو.
(وَرَّدَ-الشَــجَرُ): درەختەکە گوڵــی دەرکرد/ هاتەگوڵ.
(-تِ المَــرْأَةُ): ژنەکــە ڕوومەتی خۆی ســوور کرد/ سووراوی کرد.
(-الثَوبَ): جلەکەی گوڵڕەنگ کرد.
(تَوَرَّدَ- الخَدُّ): ڕوومەتەکە سوور هەڵگەڕا.
(الوَرْد (ج) وُرْد وَ وِراد وَ أَوْراد): ١-زەعفەران ٢-(-مِن الخَيل): ئەسپی پەمەیی ڕەنگ.
٣-(وردة (ج) وُرُود): خونچــەی درەخــت ٤-(ن) گوڵمباخ: دەختێکی دڕکاوییە لە شوێنە فێنکەکانی باکــووری نیــوەی گــۆی زەوی زۆر بــڵاوە بــە بەتەنگەوەهاتن و باش بەخێوکردنی، گوڵی باش دەگرێت زۆر ڕەنگ و شــێوەی هەیە بۆنی خۆشی

جۆراوجۆر دەدات گوڵاوی لێدەگرن و گوڵاوەکەی لە دروستکردنی شیرینیشدا بەکاردێت.

(وَردُ نَفْــراء) (ن):گوڵە جاڵجاڵۆکە. گوڵێکە ئەندامی نێرییەکەی درێژە

(اَلوَرْدَة):ڕەنگی ئەسـپ وەك خۆڵەمێشـی و سووری زەردباو/ ئاڵ.

(اَلوَردِيّ (م) وَردِيَّة):ئاڵ/ پەمەیی.

(اَلوَرْدِيَّــة) (ن): گوڵەبــاخ. درەختێکـی چـڕە گوڵەکەی ڕەنگی زۆرە کە بەسـەر لقە بڵاوەکانیـەوە خۆی دەنوێنێت. لە دەشـت و لە نیوەی سـەرەوەی گۆی زەوی دەڕوێت زۆر جـۆری هەیە کە لە باخچە گشتییەکانیشـدا دەڕوێنرێت ٢- (الـوردة عند الکاثولیك)لای دیانە کاسۆلیکیەکان جۆرە خوداپەرستیەکە کە لـە بەردەمی حەزرەتی مریەمدا لە یەکەمین یەکشـەممەی هەمـوو مانگێکداپێشکەشـی دەکەن.

(اَلوَرْدِيّــات):کۆمەڵەیەکـی دوو خەپلەیین. گەلێـك گیـا و دەوەن و درەخـت دەگرێتەوە وەکـو گوڵەباخ و سـێو و قەیسـی و درەختی سنجو و بەهێ.

(بِنــتُ وَرْدان (ج) بَنــاتُ وَرْدان) (ح): سیسـرك. مێروویەکی بۆگەنە/ بۆن پیسە لە شوێنە پیسـەکانی ماڵدا دەژی زۆر دەژی زۆر ڕەنگی هەیە.

(اَلمُوَرَّد) (مفع):هێنراو.

٣-(اَلوَرْدِیان) (إیطالیة)وەردیان/ زیندانەوان/ پاسەوانی بەندیخانە.

اَلمُلحَق

ورد: (اَلتَوارُد):هاتنی کەسان بەرودوا/ یەك بە دوای یەکدا گەیشتن

(تَــوارُدُ الأَفْــکار أَو تَداعیهــا):هاتنی بیر یا یەکتری/ هێنان و کێش کردنی بیر بە مێشکدا/ بارێکـی دەروونیە بنجی لەسـەر ئەوەیە کە هزر/ بیر و وێنـەی جیا جیا و هەمەڕەنگ و جۆر بەیەکەوە پەیوەند دەبن بە شـێوەیەك یەك یەك ڕادەکێشن و دەیخەنە بەر ئاوێنەی مێشك.

---

ورس: (وَرَسَ-اَلنَبْــتُ وُرُوســاً): گیاکــە/ ڕووەکەکە سەوز بوو.

(وَرِسَ-الصَخــرُ يَوْرَسُ. وَرَســاً): تاوێرەکە قەوزەی بە سەرەوە سەوز بوو تاوێرەکە ڕەنگ سەوز و لووس بوو.

(وَرَّسَ-الثَوبَ):بە ڕووەکی (وەرس) جلەکەی ڕەنگ کرد.

(أَوْرَسَ-الشَجَرُ):درەختەکە گەڵای کرد.

(-المَکانُ):شـوێنەکە ڕووەکی (وەرس)ی تێدا ڕوا و پەیدا بوو.

(اَلوارِسُ-مِنَ الثیاب):جلی سوور.

(وارِسُ الحمَرةِ):سووری تێر/ تۆخ.

(اَلوَرْس) (ن):ڕووەکێك وەك کونجی. زەردە ڕەنگی پێدەکرێت و زەعفەرانی لێدەگیرێت

(اَلْوَرِس-مِنَ الثِياب): جلى سوور.
(اَلْوَرِســيّ وَ الوَريس و المُوَرَّس): به (وەرس) ڕەنگكراو.
ورش: (وَرُشَ. يَــرِشُ وَرْشــاً وَ وُرُوشــاً): چاوچنۆكييەكى وەهاى كرد شــوێن كارى نزم و ناشياو كەوت.
(-شَيئاً مِنَ الطَّعام): بە هەڵپە و چڵێسييەوە خواردنەكەى خوارد.
(-هُ بِفُلانٍ): بــەوە فريويدا/ بەهۆى ئەوەوە لاسيدا و لە خشتەى برد.
(-على القَوم): بەبێ بانگ كردن خۆى خستە ناو خوێشــان و دەســتى بە نانخواردن كرد/ خۆى تێهەڵكێش كرد.
(«لا تَرْشِ عَلَيَّ»): بەر قسەم قسە مەهێنە و قسەكەم پێ مەبڕە.
(وَرَّشَ-بَــينَ القَوم تَوْريشــاً): خوێشــگەڵى لەيەك هاندان/ تێكى بەردان
(«اَرِّشْ تَأْريشاً»): هانيدا چۆن هاندانێك
(اَلْوَرْش) (مص): خواردنێكە لە شير دەكرێت.
(اَلْوَرَش): ئازارێكى ناو هەناوە.
(اَلْوَرشَــةُ) (ب): تاقمێك وەســتا و خەلفە و كرێكار لە خانەسازييەكدا يان لە كارێكدا كار دەكەن. ٢-كارگەيەكى بچكۆلە.
(اَلْوَرَشان (م) وَرَشانَة (ج) وِرْشان وَ وَراشِين (ح): كۆتــرە كێويلە/ گاكۆتــر ڕەنگ بۆرە و سەرى كلكى سپييە. گەورەترين كۆترە.

٢-(وَرِشَ. يَورَشُ. وَرَشاً): سووكەڵە و چابوك بوو.
(وَرِشٌ (م) وَرِشَــة (ج) وَرِشات): سووكەڵە و چابوك/ ئازا/ گورج وگۆڵ.
(وَلَدٌ وَرِشٌ) (عامية): منداڵێكى بزێو.
ورص: (وَرَصَ وَ وَرَّصَ و أَورَصَ-تِ الدَجاجَةُ يَرِصُ. وَرْصاً): مريشكەكە يەكەمجار هێلكەى كرد.
(اَلْوَرِص (ج) أَوراص): مريشــكى بارۆكە كە تازە هێلكە بكات.
ورض: (وَرَّضَ): بە زەويدا بە دواى گژوگيادا گەڕا.
ورط: ١-(وَرَّطَ-هُ): بە قوڕيدا برد/ وا گرفتارى كرد كە دەرچوونى نەبێت/ تووشيكرد.
(-إبِلَــهُ فِي إبِلٍ أُخرى): حوشــترەكانى لە ناو حوشترى تردا ون كرد و تێكەڵ كرد.
(وارَطَ-هُ وراطاً وَ مُوارَطَةً): هەڵى فريواند/ هەڵيخەڵەتاند/ فێڵى لێكرد.
(أَورَطَ-هُ): گرفتارى كرد و تووشــى تەنگ و چەڵەمەى كرد/ قوڕى بۆ گرتەوە
(-الشيءَ): شتەكەى (شاردەوە/ داپۆشى).
(تَــوَرَّطَ-تِ الماشِــيَةُ): ئاژەڵەكە لــە قوڕدا/ لە زۆنگانــدا چەقى يان كەوتە شــوێنێكەوە دەرچوونى نەبێت.
(-الرَجُلُ): ١-تووشى تەنگ و چەڵەمە بوو/ يان گرفتارى گێژاوێكى سەخت بوو ٢-فەوتا/ مرد.

(إِسْتَورطَ): فەوتا/ لەناوچوو/ مرد.
(-فِي أمرٍ): لە کارێکدا شـڵەژاو پەشـۆکا لێی چەواشە بوو نەیتوانی لێی ڕزگار بێت.
(«إسْـتَورَطَ فِي حِبالَتي»): لـە داوەکەمەوە گلا/ کەوتە داوەکەمەوە.
(ألوَرطَة (ج) وَرَطات وَ وِراط): ١-قوڕو لیتە کە تێی بچەقـن ٢-زۆنگ کە مەڕو ناژەڵ تێی بکەوێـت و دەرنەیـەت ٣-زەوییەکـی چاڵ و نـزم کە ڕێگەی دەرچوونـی نەبێت ٤-چاڵاو/ بیر ٥-چاڵێکی زۆر قـووڵ و نادیار ٦-فەوتان/ لەناوچوون هەموو کارێکی سەخت و گران کە لێ ڕزگاربوونی گران بێت/ تەنگ و چەڵەمەی سەختو تووشبوونو گرفتاربوون.
(ألوراط): دەغەڵیی/ گزیی و فێڵ/ تەڵەکەبازیی.
٢-(ألوَرْطَة (ج) وَرَطات وَ وِراط): بن/ قنگ
ورع: ١-(وَرَعَ. يَرَعُ. وَرَعاً وَ وَرْعاً وَ وَرُوعاً وَ وُرُوعاً): لە گوناه و خراپەکاریی دوورکەوتەوە و خۆی لە هەمـوو لادان و نافەرمانیی خودا پاراست.
(وَرِعٌ): لـە گونـاه و نافەرمانیی خۆپارێز و لادەر لە هەموو خراپەیەك.
(وَرَعَ. وَرْعَـةً وَ وَراعَـةً وَ وُرعَةً وَ وَراعاً وَ وَرُوعاً وَ وُرْعاً وَ وُرُعاً): ١-(بێتوانا/ بێهێز) بوو ٢-زۆر ترسنۆك و بوودەڵە بوو.
(وَرِعَ-عَن كـذا (يَرِعَ. وَراعَـةً): وازی لەوە هێنا.
(-يَـرِعُ ويَوْرَعُ وَرَعـاً وَ وَرْعـاً وَ وَرُوعاً وَ وُروعـاً): لە گونـاح دوور کەوتـەوە و خۆی پاراست لە نافەرمانیی و لە ڕێی خودا لادان.
(وَرِعٌ): لە گونـاح خۆپارێز/ دوورکەوتوو لە گوناح/ تۆبـەکار/ دوورکەوتوو لە نافەرمانی خودا.
(وَرُعَ يَوْرُعُ وَرْعَةً وَ وَراعَةً وَ وُرْعَةً وَ وَراعاً وَ وُرُوعـاً وَ وُرْعـاً وَ وُرُعـاً): ١-بێهێز بوو/ بێتوانا بوو ٢-زیرەی کرد و بوودەڵەبوو.
(-وَرَعاً وَ وَرْعاً وَ وَرُوعاً وَ وُرُوعاً): لە گوناح دوور کەوتەوە و خۆی لە نافەرمانیی خودا و لادان پاراست.
وَرِعٌ: لـە گونـاح و نافەرمانیی خۆلادەر و لە خراپە دوورەوەکەوتوو/ تۆبەکار.
(-وَراعَـةً وَ وُرْعـاً وَ وُرُوعـاً): مالیاتەکانی بچووك بوون.
(وَرَّعَ-الفَرَسَ): چارەوێکەی جڵەوکێش کردو بەستییەوە.
(-الإبِـلَ عَـنِ المـاءِ): حوشـترەکانی لە ئاو گێڕایەوە.
(وَرَّعَ وَ أوْرَعَ فُلانـاً عَن كذا): ڕێی ئەوەی لە فیسار گرت و نەیهێشت بەلایدا بچێت.
(-بَينَهُما): لەیەکی کردن/ بوو بە بەربەست/ بەرلێگر لە نێوانیاندا.
(«ما وَرَّعَ أن فَعَلَ كذا و كذا»): سڵی نەکردەوە وە نەگەڕایەوە و ئەوە و ئەوەی کرد.

(تَوَرَّعَ-مِن أَو عَن كذا): خۆی لەوە (پاراست/ دوورەپەرێز کرد) و خۆی لێ لادا.

(اَلرِعَة والرِيعَة): دوور کەوتنەوەو خۆپارێزیی لە نافەرمانیی و گوناح/ خۆلادان لە گوناح.

(اَلــوَرَع) (مــص): خۆپارێزیی لــە گوناحو دوورکەوتنەوە لە خراپەو نافەرمانیی.

(اَلوَرَع (ج) أَوراع): خۆپارێزیی و خوداپەرستیی.

(رَجُــلٌ وَرَعٌ): زیرەکردوو بوودەڵە ناتەوان و نەبوو.

(اَلوَرِع): خۆپارێز لە گوناحو نافەرمانیی.

(اَلوَرِيــع): وازهێــن/ تۆبــەکار و ملکەچــی فەرمانی خودا.

٢-(وارَعَ-هُ مُوارَعَةً): قســەی لەگەڵدا کرد و ڕاوێژیان پێکەوەکرد.

٣-(اَلرِعَة): ڕەوش و کاروبار

(«فُلان حَسَنُ الرِعَة أَو سَيِّءُ الرِعَة»): فیسار ڕەوش و کاروباری باشە یان ڕەوش و کاروباری خراپە.

ورف: ١-(وَرَفَ الظِلُّ. يَــرِفُ. وَرْفاً وَ وَرِيفاً وَ وُرُوفــاً وَرِفَةً): ســێبەرەکە درێژ بووەوە و فراوان بوو.

(-النَبــاتُ): گیاکە یان ڕووەکەکە گەشــایەوە و شــکۆفەی کرد و کەوتە شــەکانەوە و تەواو سەوز بوو.

(وارِف): (ڕووەکی/ گیای) شکۆفەدار/ سەوز و گەشاوە و پاراو و تەڕ.

(وَرَّفَ-النَبــاتَ الناضِــرَ): ڕووەکــە تــەڕو ناسکەکەی مژی.

(وَرَّفَ وَ أَوْرَفَ-الظِلُّ): ســێبەرەکە کشا درێژ و پان بووەوە.

(اَلرِفَة)(مــص): گیا و ڕووەکی (شــکۆفەدارو گەش و پاراو/ بە شەوق/ ناسك).

(اَلرُفَة): کا.

(اَلوَرْف) (مص): فەراغە تەنکەکانی جگەر.

(وَرْفُ الشَــجَرِ وَ وَرَفُــهُ): شــکۆفەو شــنەو پەلهاوێژیی‌و ســەوزیی درەخت، بەهۆیی تێر ئاویی‌و خزمەتکردنیەوە.

٢-(وَرَّفَ-الأَضَ): زەوییەکــەی بــەش بــەش کرد.

ورق: ١-(وَرَقَ-الشَجَرُ. يَرِقُ وَرْقاً):درەختەکە گەڵای کرد/ گەڵاکەی هاتە دەر.

(-الشَــجَرَ): گەڵای درەختەکــەی لێکردەوە و بردی.

(وَرَقَ-الشَــجَرُ): گــەڵای کــرد/ درەختەکــە گەڵاکەی دەرکەوت.

(-الشَجَرَ): گەڵای درەختەکەی ڕنی‌و بردی.

(أَورَقَ-الشَجَرُ): درەختەکە گەڵای کرد.

(-الرَجُلُ): دارا و پارەی زۆر بوو.

(-الطالِــبُ): خوازیارەکە بە خواســتی خۆی نەگەیشت.

(-الصائِدُ): ڕاوچییەکە هیچی ڕاو نەکرد.

(ــالغــازي): ١-داگیرکەرەکــە ســەرنەکەوت

٢-تالانیی دەستگیر بوو (ضد).
(تَوَرَّقَ-الظَبیُ): ئاسکەکە گەڵاکانی خوارد.
(إیراقٌ و أَوْراقٌ-العِنَبُ. یَـوراقُ. إیْریقاقاً): تریکە رەنگی گرت/ ئاڵ و بۆڵ بوو.
مُوْراقٌ: تریی رەنگ گرتوو/ ئاڵ و بۆڵ بوو.
(أَلــوارِق والوَرِیقُ-مِنَ الشَــجَرِ): ١-درەختی گەڵادار/ گەڵاکردوو ٢-پرگەڵا ٣-گەڵاجوان.
(شَــجَرَةٌ وارِقَــةٌ وَ وَرِیقَــةٌ): درەختێکی پڕ گەڵای سەوز و/ شکۆفەدار و جوان.
(أَلرِقَةُ): ١-گیای تازە لەســەر بنج دەرهاتوو و سەوز بوو ٢-زەویی لە فرچەی گەرمادا بارانی لێدابێت و سەوز بووبێت/ گیای لێ رِوابێت.
(-الرِقَةُ (ج) رِقُون): سکە و پارەی لێدراو.
(أَلوَرْقُ و الوِرْقُ و الوُرْقُ (ج) أَوْراق وَ وِراق): سکە و پارەی لێدراو.
(أَلوَرَقُ): ١-هەمــوو زیندوویەکــی گیانەوەر ٢-ســامان/ دارا و مــاڵ و ئــاژەڵ ٣-خوێن کە بڵاوبووبێتــەوە و خــڕ بووبێتــەوە بەســەر زەویدا (بە گەڵای وەریو چوێنراوە).
٤-(-ج أَوراق): سکە و پارەی لێدراو ٥-کاغەزی نامە و پەرتووک.
(وَرَقَةُ (ج) وَرَقات): پەرە کاغەزێك.
(وَرَقُ الشَّــباب): (تــاف/ گــوڕو گەرمیــی/ جوانیی) گەنجێتیی.
(وشــەی (الوُرُقُ): بۆ جوانیی/ خۆشیی دڵ و شۆخیی و قەڵافەتی جوان دەخوازرێت.

(أَلوَرَقَــةُ) (ز): گــەڵای رووەك و درەخت کە سێ بەشە بنکی و ملی/ لاسکی گەڵاکە و رووی گەڵاکە کە ســەوزە گەڵایــش هەیە کە بنك و لاسکی نییە بەڵکو هەر رووی گەڵاکە خۆیەتی و بــە رووەکەکــەوە دەنووســێت گەڵا جۆری زۆرە. لەبەرئەوەی مــادەی کلۆرۆفیلی تێدایە بــۆ رووەك زۆر گرنگــە چونکە بــۆ خواردن دروستکردنی کارێکی گەورە دەکات.
(أَلوُرَقَــةُ): لای ئەوانــەی گەچکاریی دەکەن ئەو گەچەیە کە قوری دیواری پێ دادەپۆشــن گەچکاریــی دەکــەن ئــەو قــورەی بــەردی دیوارەکانیان پێ داناوە.
(«وَرَّقَ الحائِطَ»): بە گەچ قوری دیوارەکەی داپۆشی/ گەچکاریی کرد.
(أَلــوَرِق(ج) أَوراق وَ وِراق): پــارە و ســکەی لێدراو.
(-مِنَ الشَجَرِ): ١-درەختی گەڵادار ٢-درەختی گەڵا زۆر و چڕوپڕ ٣-گەڵاجوان.
(شَــجَرَةٌ وَرِقَةٌ): درەختێکی پڕ و چڕ گەڵای سەوز و گەڵاجوان.
(أَلوَرْقَةُ-فِي القَوس): خەوش لە کەواندا.
(أَلوَراق): ســەوزایی زەوی/ گژوگیای سەوزی زەوی.
(أَلوِراق): دەمی دەرهاتنی گەڵا.
(أَلوِراقَة): کاغەزفرۆشیی/ کاغەزکاریی.
(أَلــوَرَّاق): ١-خاوەن کاغــەز ٢-کاغەز فرۆش

٢-كاغەزساز/ كاغەز دروستكەر ٤-نووسەر ٥-خاوەن (پارە و پوولی زۆر) دراوداری چاك).

(اَلتِجارَةُ مُوْرَقَةٌ للمال): بازرگانیی پارەهەڵرێژە/ پارە خەملێنە.

(اَلمُوَرِّق) (فا): ١-درەختی گەڵادەرکەر/ گەڵاگر ٢-خاوەن کاغەز/ کاغەزدار ٣-کاغەزساز کاغەز دروستکەر ٤-(ب)گەچکاری دیوار.

٢-(اَلوُرْقَةُ): رەنگی بۆر.

(اَلأَوْرَق (م) وَرْقاء (ج) وُرْق): ١-رەنگ بۆر یان خۆڵەمێشیی ٢-خۆڵەمێش.

(عامٌ أَوْرَقُ): ساڵی بێباران/ وشکەساڵ.

(زَمانٌ أَوْرَقُ): سەردەمێکی/ چەرخێکی وشکی بێدەرامەت.

(اَلوَرقاء (ج) وُراق وَ وَراقی): ١-مێی وشەی (اَلأَوْرَق): ٢-کاکۆتر کە رەنگی سەوز باوە و دەروونی پێدەچوێنرێت ٣-(ن): دەوەنێکە گەڵاکەی نەرم و خڕ و فراوانە و قەدەکەی بۆرە قنیە ٤-(ح):گورگەمێ.

ورك: ١-(وَرَكَ. يَرِكُ وَرْكاً): خۆی خستە سەر سمتی و لەسەری دانیشت.

(-الرَّجُلَ): کێشای بە سمتی پیاوەکەدا.

(-الشيءَ): شتەکەی خستە لای سمتی خۆیەوە.

(-وُرُوكاً): سمتی خستە سەر زەوی‌و پاڵکەوت/ راکشا.

(-الراكِبُ): سوارە سمتی نوشتانەوە بۆ ئەوەی دابەزێت یان بحەسێتەوە.

(-بالمَكان): نیشتەجێ بوو.

(وَرِكَ-تِ الوَرِكُ يَوْرَكُ): سمتی گەورە بوو.

(وَرَّكَ-اَلحَبْلَ أَو الرَحلَ): پەتەکە یان کورتانەکەی خستە ژێر سمتیەوە.

(-الراكِبُ):سوارەکە هەردوو قاچی نوشتانەوە وەك چوار مەشقی و هەردوولای سمتی خستە سەر زینەکە.

(تَوَرَّكَ): خۆی خستە سەر سمتی/ بە قنگەوە دانیشت.

(-الشيءَ): شتەکەی بە سمتی هەڵگرت.

(-الراكِبُ): سوارەکە قاچی نوشتانەوە بۆ ئەوەی دابەزێت یان بحەسێتەوە.

(-بالمَكان): لە شوێنەکەدا نشتەجێ بوو.

(-عَنِ الأمرِ): لە کارەکەدا (خاوەخاوی کرد/ قنگەقنگی کرد) و دوای نەکەوت.

(-للرَجُلِ): پاشقولی لە پیاوەکە گرت.

(«تَوَرَّكَ لَهُ فَصَرَعَهُ»): پاشقولی لێگرت و دای بە زەویدا.

(تَوارَكَ): خۆی خستە سەر سمتی و بە قنگەوە دانیشت.

(اَلوَرْك وَ الوَرِك (مێیة)(ج) أَوراك): سمت/ کەفەڵ.

(«قَعَدَ المَلاّحُ على وَرِكِ السَفينَةِ»): پاپۆڕەوانەکە لە پاشینی پاپۆڕەکەدا دانیشت.

(«هُمْ عَلَيَّ وَرْكٌ واحِدٌ»): هەموو نیشتنە

سەرم/ گەلەکۆمەکێیان لێکردم.
(أَلورك): تەنیشتی کەوان یان شوێنی بەستنی ژێکەی.
(أَلـورْك (میَیــة) (ج) أوراك (ع)=الوَرِك): سمت/ کەفەڵ.
(أَلـوارِك والـوِراك (ج) وُرُك. والمَـورِك والمَورِكة-مِنَ الرَحْل): ئەو شوێنی کورتانەیە کــە ســوارەکە تاقەتی چوو یــان ماندوو بوو قاچی دەخاتە سەر تا بحەوێتەوە.
(أَلوَركی): (بن/ بنچینە)ی هەواڵەکە.
(«إنَ عِندَهُ لَوَركی الخَبَر»): راســتیی‌و بن و بنچینەی هەواڵەکەی لەلایە.
(ألأورَك (م) وَرْكاء (ج) وُرْك): (سمت/ گەفەڵ) گەورە.
(اَلمُورَك): پێشەوەی کورتان.
اَلمُورَكَةُ: ١-پێشــەوەی کورتان ٢-دۆشەکڵەیەك کە سوار دەیخاتە ژێر سمتی.
٢-(وَرَكَ-علی الأمرِ. يَرِكُ. وُرُوكاً): توانای بەسەر کارەکەدا شکا.
وَرَّكَ - علی الأمرِ: توانای بەسەر کارەکەدا شکا.
(-الشيءَ): شتەکەی پێویست کرد.
(-الذَنْبَ عَلَيهِ): گوناهباری کرد/ گوناهەکەی خستە ئەستۆی ئەو.
(-اليَمــينَ): لە ســوێند خواردنەکــەدا ئەم ســوێندی بــەوە نەخوارد کە ســوێندەرەکە مەبەستی بوو.

(وارَكَ-الجَبَلَ. مُوارَكَةً): لە کێوەکە/ شاخەکە تێپەری.
(تَوَرَّكَ-علی الأمرِ): توانای بەســەر کارەکەدا شکا.
(اَلمُوَرَّك) (مفع): بێسووچ/ بێگوناح.
(«إنه لَمُوَرَّكٌ في هذا الأمرِ»): ئەو بەراســتی بێسووچ و گوناهە لەم کارەدا.
ورل: (اَلوَرَل): بزنمژە.
(وَرَلَة): بزنمژەی مــێ (ج) (وِرْلان وَ أورال و أَرْوُل): زیندەورێکــە وەك مارمێلکەیە زۆر گەورەترە کلکی درێژە و باریکە.
ورم: (وَرِمَ وَ تَوَرَّمَ-الجِلــدُ. يَــرِمُ وَرَمــاً): پێستەکە بە نەخۆشی هەڵاوسا.
(جِلدٌ وارِم): پێستی هەڵاوساو.
(وَرِمَ-أَنْفُ فُلان): لووتی فیســار فشــبوو واتا تووڕە بوو.
(-النَبــتُ): رووەکەکــە درێژ و (ئەســتوور/ قەوی) بوو.
(وَرَّمَ-الجِلدَ): پێستەکەی هەڵاوساند.
(-أَنْفَ فُلان): فیساری تووڕەکرد
(-بِأَنْفِهِ): لووتی کردە ئاسمان/ لووتی هەڵبڕی فیزی کرد/ ترزلیی کرد
(أَورَمَ-فُلانــاً وَ بِفُلانِ. إيراماً): قســەی وای پێوت کە تووڕە بێت.
(«فَعَلَ بِهِ ما أَورَمَهُ»): کارێکی خراپی پێکرد و رقی هەستاند/ تووڕەی کرد.

(اَلوَرَم (مــص)(ج) أورام): ئاوســان بەهۆی نەخۆشییەوە/ ئاوساویی/ باکردن.

(اَلأَوْرَم): خەڵکان یان خەڵکێکی زۆر

(«مــا أدري أيُّ الأَوَرَم هُوَ»): نازانم ئەو لە چ جۆرە خەڵکێکە/ کێیە.

(اَلَــورِم): شــوێنی دەرهاتنـــی دانەخرێکان/ پووك.

(اَلمُورَّم)(مفــع): پیاوی زەبــەلاح/ زلحۆرت/ کمتە/ چەتەوڵ.

ورن: ١-(وارَنَ-هُ. مُوارَنَـــةً): ڕووبەڕووی بوو و دیدەنیی کرد.

(تَوَرَّنَ): ڕۆنی زۆری لە خۆی هەڵسوو و خۆی تاس و لووسدا.

٢-(الوَرَنْك):(ح): جۆرە ماسییەکە، ماسییەکی پانی کلك درێژی کرکراگەدارە.

اَلمُلحَق

ورن: (اَلوَرنیــش): جــۆرە ڕۆنێکە شــت لە کارتێکردنی هەوا دەپارێزێت.

---

ورە: (وَرِهَ. يَــوْرَهُ وَرَهــاً): خۆی گەوج کرد/ گەوج بوو.

(أَوْرَه): گەوج (م).

وَرْهاء: ژنی گەوج (-تِ الريحُ): با زۆر هەڵیکرد.

(-تِ المَرْأةُ يَرِهُ وَرَهاً): ژنەکە لەشی (چەوریی/ بەزی) زۆر بوو.

(إمــرأةٌ وَرِهَــة): ژنێکی لــەش چەوریدار و بەزدارێکی زۆر.

(تَوَرَّهَ-فُــلانٌ في عَمَلِ هذا الشــيءِ): فیســار لــە کردنی ئەم کارەدا شــارەزا نەبوو/ کارامە نەبوو.

(اَلوارِهُ): فراوان.

(اَلوَرِهُ-مِنَ السَّحابِ): هەوری (بە بارانی زۆر/ فرەباران/ بە لێزمە).

وري: ١-(ورَى-الرَجُــلَ يَــري. وَريــاً): بەرسییەکەی خست/ دا.

(-القَيحُ جَوفَهُ): کێم و زووخ هەناوی بۆگەن کردو خواردیەوە.

(اَلوَرى): ناوســك و ناوهەناو بۆگەن بوون و دارزان.

(وُرِيَ-الرَجُلُ): ناوسکی تووشی کێم و زووخ بــوو کــە بۆگەنی کــرد و ناوســك و هەناوی دارزاند.

(مَوْرُوُّ وَ مَوْرِيّ): هەناو بۆگەن بوو و دارزاو

(اَلوَرْيُ)(مــص): کێم و زووخ لە هەناودا یان برین لە بۆریی هەناسە و هەردوو سیدا.

(اَلــوَرى): کێم و زووخ لە هەناو یان برین لە بۆریی سیدا بوون.

٢-(وَرى-تِ النارُ يَرْي. وَرْياً وَرِيَةً): ئاگرەکە گرا/ گڕی گرت/ خۆش بوو.

(وَرى وَ وَرِيَ-الزَنْدُ يَرِيَ. وَرْياً وَ وُرْياً ورِيَةً): چەرخەکە ئاگریدا/ ئاگری کردەوە

وار: چەرخی ئاگرکەرەوە/ ئاگرپڕێن.

(وَرَّى-النارَ تَوْرِيَةً): ئاگریدا/ ئاگری دەرکرد

(ورًى وَ أَوْرَى-الزَنْدَ): چەرخەکە ئاگری دا.

(إسْــتَوْرى): چەرخەکــەی ئاگــردا/ ئاگــری (پژاند/ کردەوە)

(«إسْــتَورَيتُهُ رَأيَهُ»): داوام لێکرد ڕای خۆیم بۆ دەربڕێت.

(اَلزَنــدُ الــواري وَ الــوَرِيُّ): چەکوشــی ئاگرکەرەوەی چەرخەکە ئاگر دەکاتەوە.

(رِيَةُ النــارِ وَ وَرِيَتُها): چاوگی ئاگرکردنەوە وەك پەڕۆ شرەو شتی تر.

٣-وَرى-تِ الإبِــلُ. يَــرِي وَرْيــاً وَ وَرِيَــةً): حوشــترەکان قەڵەو و بەزگرتوو و ئێســك پڕ مۆخبوون.

(وَرِيَ. يَرِي-المُخُ. وَرِياً): مۆخی ئێســقانەکە پڕبوو.

(وَرّى-الشــيءَ تَورِيَةً): شــتەکەی شاردەوە/ پەنهان کرد.

(-عَن کذا): شتێکی لە دڵدا بوو بەڵام شتێکی تری دەرخست و نیشاندا/ دەربڕی

(-الخَبَرَ وَ عَنِ الخَبَرِ): هەواڵەکەی بەژێرەوە کرد و شاردیەوە.

(-عَــن فُــلان بَصَــرَهُ): چــاوی خــۆی لە فیسارلادا.

(واری-الشــيءَ مُواراةً): شتەکەی (شاردەوە/ ونکرد).

(تَوَرّى وَ تَواری-عَنهُ تَوَرّياً وَ تَوارِياً): خۆی (لێشاردەوە/ لێونکرد).

(اَلواري): بەزی چڕوپڕو زۆر.

(الوَراء): پڕ.

(اَلــوَرِيّ): ١-بــەزی توند و چڕوپــڕ ٢-میوان ٣-دراوسێ/ هاوسایە/ هاوسێ.

(لَحْمٌ وَرِيٌّ): گۆشتێکی قەڵەو.

٤-(اَلوَرى): بوونەوەر/ بەدیهێنراوەکان.

(اَبــو الــوَرى): ڕۆژگــار (ناوی شــاردراوەی ڕۆژگارە).

وَزّ: ١-(اَلــوَزّ و الأُنثى وَزَّة (ج) وَزّات=اَلإوَز): قازە نێرە و قازە مێیە.

(أَرضٌ مَوَزَّةٌ): زەوییەك قازی (زۆر بێت/ زۆر تێدابێت).

٢-(وَزوَزَ. وَزوَزَةً): ١-هەنگــاوی کورتــی نا و لەنجەی کرد ٢-سووکەڵانە خێرا خۆی هەڵدا/ بازدیدا.

(اَلوَزواز): ئەوەی هەنگاوەکانی کورتە و خۆی بهێنێ و بەرێت/ لەنجە بکات.

(اَلــوُزاوِزة): ١-پیــاوی بەجــرت و فــرت و سووکەڵەی کورتەبنە ٢-(ح) باڵندەیەکە.

(اَلمُوَزْوِز) (فا): باڵندەیەکە بخوێنێت.

وزأ: ١-(وَزَأَ-اللَّحْــمَ يَوْزَأُ وَزْءً): گۆشــتەکەی وشك کردەوە.

٢-(وَزَأَ-القَومُ. يَوزَأُ وَزْءً): خوێشگەل یەکتریان لەیەك دوور خستەوە.

(-القَومَ): خوێشگەل لە یەکتری دوورکەوتنەوە.

وَزّأَ (-الفَــرَسُ بِراکِبِهِ. تَوزِئَــةً وَ تَوزِيئاً):

چارەوێکە سـوارەکەی دا بە زەویدا/ خستیە خوارەوە.
٣-(وَزَّأَ-فُلانـاً. تَوْزِئَةً وَ توزيئاً): سـوێندی قورسی بە فیسار خوێند/ سوێندی قورسیدا.
٤-(وَزَّأَ-القِربَةَ تَوزِئَةً وَ تَوزيئاً): مەشكەكەی یان كوندەكەی پڕ كرد.
(تَوَزَّأَ-الوعاءُ): قاپەكە پڕبوو.
(-الرَجُلُ): پیاوەكە تێر ئاو بوو/ تینوویەتی شكا.
وزب: (وَزَبَ-المـاءُ و نَحـوُهُ. يَـزِبُ وُزُوباً): ئاوەكە یان شتی تر كشا و لەبەری ڕۆیشت.
(أَوزَبَ-فِي الأَرضِ. إِيزاباً): كشا و ڕۆیشت وەك چۆن ئاو دەكشێت/دەڕوات.
(أَلوَزّابُ): دزی كارامە و چابوك.
(أَلمِيـزابُ وَ المِئْزابُ (ج) مَيازِيبُ وَ مَآزِيبُ): ڕەنگە بیشـوترێت («مَوازِيبُ») (فارسية): پلووسك یان ئاوەڕۆ.
وزر: (وَزَرَ-الشيءَ يَزِرُ وَزْراً وَ وِزراً): شتەكەی هەڵگرت.
(-الرَجُلُ): پیاوەكە شـتی قورسی دا بە كۆڵی خۆیداو هەڵیگرت و لای گرانبوو.
(-الرَجُلَ. وَزْراً): بەسەر پیاوەكەدا زاڵ بوو.
(-لِلمَلِكِ وَزارَةً): بوو بە وەزیری شا.
(وَزَرَ وَ وُزِرَ. يَـوْزَرُ وَزْراً وَ وِزْراً وِزرَةً): گوناهی كرد. تاوانی كرد.
وُزِرَ. وَزْراً وَ وِزْراً وَزْرَةً: گوناهی كرد.
(-فُلانٌ): گوناه و تاوان درایە ئەستۆی فیسارو گوناهبار كرا.
(وازَرَ-هُ علـى الأَمرِ مـوازَرَةً): لە كارەكەدا كۆمەكی كـرد/ یاریدەیدا و پشـتگیریی كرد (ئـەم وشـەیە هەڵگێـڕاوەی (آزَرَهُ)ە (-ەُ): ١-پێشـبڕكێی كۆڵهەڵگرتنی لەگەڵدا كرد ٢-بوو بە وەزیری ئەو.
(أَوْزَرَ-الشيءَ إِيزاراً): شتەكەی برد.
(تَوَزَّرَ-لَـهُ): بوو بە وەزیـری ئەو/ وەزیریی ئەوی كرد.
(إِتَّزَرَ): ١-بەركۆشـەكەی یان پەشتەماڵەكەی پۆشـی ٢-گوناهبـار بـوو/ خـۆی هاویشـتە گوناهەوە.
(-بِثَوبِهِ): جلەكەی وەك پەشتەماڵ/ بەركۆش لەبەركرد/ پۆشی.
(إِستَوزَرَ-هُ): ئەوی كرد بە وەزیری خۆی.
(الشيءَ): شتەكەی برد.
(أَلوِزْرُ (مـص)(ج) أَوزار): ١-گونـاه ٢-بار و كۆڵـی گـران ٣-قورسـایی/ گرانیـی ٤-جل و بەرگـی پێچراوە یان خواردەمەنی پێچراوە و شەتەكدراو و بەكۆڵكراو.
(أَوزار الحَرب): چەك و ئامێر و كۆڵ و باری جەنگ.
(وَضَعَـتِ الحَربُ أَوزارَهـا): جەنگ كۆتایی هـات و چەك و ئامێری جەنگ و كۆڵ و باری دانرا.

(اَلــوِزْرَةُ (ج) وِزْرات وَ وِزِرات وَ وَ وَزَرات): بەرکۆش یان پەشتەماڵ.

(اَلوِزارَة و الوَزارَة): وەزارەت، پایەی وەزیری

(الوَزیــر (ج) وُزَراء وَ اَوزار): وەزیــر (ج) کەســێکە کە شــا یان ســەرداری دەسەڵات بۆ بەڕێوەبردن و سەرپەرشتیی کردنی کاروباری وڵات دایدەنێ و ڕاوێژی پێدەکات. وەزیرەکان لە دەوڵەتە تازەکاندا زۆرن لەوانە وەزیری داد وەزیری ناوخۆ وەزیری دەرەوە... هتد.

(اَلوَزِیر): یارمەتدەر بە گشتی.

(اَلمَوْزُور)(مفع): ١-گوناهکار/ تاوانکار ٢-گوناه لە ئەستۆخراو تاوانبار کراو/ گوناهبار کراو.

٢-(وَزَرَ-الثلْمَةَ. یَزِرُ وَزْراً): درزی دیوارەکەی گرت/ درزەکەی پڕکردەوە.

(اَوْزَرَ-الرَجُلَ. اِیزاراً): پەناگایەکی بۆ پیاوەکە کرد تا خۆی تێدا پەنابدات.

(-الشــیءَ): ١-شــتەکەی (شــاردەوە/ پەنادا) ٢-شتەکەی دەستگیر بوو.

(اَلوَزَر): ١-پەناگا ٢-کێوی/ ســەخت و قووچ/ قایم ٣-ســەنگەر/ هەر شوێنێك یان شتێك کە خۆتی لەپاڵدا پەنا بدەیت.

وزع: ١-(وَزَعَ-الجَیْشَ یَــزَعُ وَ یَزِعُ. وَزْعاً): ســوپاکەی ڕێکخســت و دامەزراند ڕیز کردو ئامادەی جەنگی کرد.

(-فُلانــاً وَ بِفُلانٍ): بەری لە فیســار گرتو نەیهێشت ئەو کارە بکات.

(اَوْزَعَ-بَینَهُمــا): ڕێکیخســتنەوە/ ئاشــتی کردنەوە.

(اِتَّزَعَ): وازی هێنا و دەستی هەڵگرت.

(اَلوازِع (ج) وَزَعَة وَ وُزّاع): ١-نەهێل/ ڕێگر/ جڵەوگر ٢-کەسێکە سوپا ڕێك بخات کاروباری بگرێتە دەست ٣-سەگ.

(اَلوَزُعَــةُ): ١-کۆی وشــەی (الوازع)ە ٢-شــاو پشــتگیرانیو پۆلیــسو ئەوانەی ســەربەون ٣-والییەکان و کاربەدەستان کە ڕێگەی خراپەو خراپکاریو حەرام و حەرامکاریی دەگرن.

(اَلمُتَزِّع) (فا): دەروون قایم و خۆگر و دەروون بەرز.

٢-(وَزَعَ-فُلانــاً بِفُــلانٍ یَزَعُ وَیَــزِعُ وَزُعاً): فیساری بە هۆی فیســار کەسەوە فریودا و لە خشتەی برد.

(اُوزِعَ-هُ بِکَذا): بەوە لاسیدا/ فریویدا.

(-هُ الشیءَ): شتەکەی خستە دڵیەوە.

(اُوزِعَ-بِهِ): بەولاسدرا/ فریودرا.

(مُوزَع): لاسدراو/ فریودراو.

(اَوْزَعَ-الشیءَ): شتەکە خرایە دڵیەوە.

(اِسْــتَوزَعَ-اللهَ شُکرَهُ): لە خودای خواست کە بە سوپاسگوزاری خۆی وەرگرێت/ بە شوکرانە بژێری خۆی دابنێت.

٣-(وَزَّعَ-المــالَ بَینَهُم): ماڵەکــەی/ داراکەی لە نێوانیاندا دابەشــکرد (-داراکەی/ ماڵەکەی بەسەریاندا دابەش کرد).

(اَوزَعَ-المالَ): دابەشیکرد.
(-بَینَهُما): جیای کردنەوە.
(تَوَزَّعَ): بڵاوبــووەوە/ دابەش بوو/ جیا جیا بوو.
(-القَــومُ المالَ): خۆیشــگەل لە نــاو خۆیاندا ماڵەکەیان دابەشکرد.
(«تَوَزَّعَتْهُ الأَفكارُ»): بیر، دەیهاورد و دەیبرد هەرجــارەی بــیری لە شــتێك دەکــردەوە و بەلایەکدا دەرۆیشت.
(«تَوَزَّعــوا ضُیوفَهُــم»): میوانەکانیــان لەناو خۆیاندا دابەشکر و بەسەر ماڵەکاندا دابەشکرد.
(الأَوزاع): کۆمەڵــەکان/ دەســتە خەڵکــەکان (ئەمە تاکی نییە).
اَلمُلحَق
وزع: (اَلتَوزیع): دابەشــکردنی شتێك بەسەر چەند کەســێکدا هەریەکە بەجیا بەشی خۆی و هێنــدەی یەکتریــان بدرێتــێ/ بەشــەکان یەکسانبن.
(«تَوزیــع المُــؤَن»): دابەشــکردنی ئازووخە بــە پێــی یاســا و رێســا و دەســتوورێك یان رێکەوتنێکی دیار.
(«توزیع الضَرائِب»): دیاریکردنی باج لەسەر ئەوانەی کە دەبێت بیدەن.
(«تَوزیــع الأَربــاح»): دابەشــکردنی قازانج بەپێی بەشداریی بەشداربووەکانو لە کەڵكو کارێکی هاوبەشدا.
(«تَوزیعٌ نِسبِيّ»): دابەشکردنی رێژەیی.
(تَقدیم المَنافِع لِأَماکِنَ مُختَلِفَة): دابەشکردنی کەڵك بەسەر شوێنانی جیاجیادا.
(«تَوزیع الكَهْرُباء»): دابەشکردنی کارەبا.
(اَلتَوزیع): دابەشکردنی بەرهەمە پیشەسازییەکان لە کارگەکانەوە بەســەر کار بردەکاندا/ ئەوانەی بــەکاری دەهێنــن و کاری دەکــەن و بەهــۆی بریکارەکانەوە یان بازرگانەکانەوە بە دەســتیان دەگات.
(«تَوزیع الأَفْلام»): فیلم دابەشکردن.
(تَوزیــع البَرید): پۆســتە دابەشــکردن کە پۆســتەخانە دەیــدات بــە پۆســتەچییەكو دەیگەیەنێتــە دەســتی خاوەنەکانــی لــە شوێنەکانیاندا.
(تَوزیع الجَوائِز): دابەشــکردنی خەڵاتەکان بەسەر شیاوەکانیدا.
(تَوزیع المَنشورات): دابەشکردنی بڵاوکراوەکان وەك رۆژنامــە و شــتیتر بــە پــارە یــان بــە بەشــداربوون (اَلتَوزیــع-فِي الموســیقی): لــە مۆسیقادا دابەشکردن، هونەرێکە یان کردەیەکی گونجانە کە ئامێرە مۆسیقاییەکان والێدەکات لە تیپەکەدا سازیان لەگەڵ یەکدا بگونجێت.
(اَلمُوَزِّع): دابەشکار.
(مُوَزِّعُ المُؤون): دابەشکاری ئازووخە.
(اَلمُوَزَّع): دابەشکراو.
(مُوَزِعُ الصُحُف): دابەشکاری رۆژنامەو گۆڤار.

(مُـوَزِعُ البَريـد): پۆسـته دابەشـكار/ پۆستەچی كە پۆستەكە دەیگەیەنێتە دەستی خاوەنەكانی/ كە بۆیان نێرراوە.

وزغ: (وَزَغ وَ أوزَغ بِبَولِـهِ. يَزِغُ وَزْغاً): پچڕ پچڕ میزەكەی كرد و هەڵدا.

(«أوزَغَتِ الطُعْنَةُ بِالدَّم»): پێداكردنی تیغەكە خوێنەكەی بە فیچقە فیچق دەرپەڕاند.

(وُزِّغَ-الجَنِينُ): كۆرپەلەكە لە سـكی دایكیدا دەركەوت و كەوتە بزوان/ جووڵە.

(اَلوَزَغ): ١-موچـڕك پێداهاتن و داچڵەكین/ لەرزین ٢-پیاوی زیرەكردووی شكستخواردوو

(اَلوَزَغَـة (ج) وَزَغٌ وَ وِزاغ وَ أوزاغ وَ وِزغان وَ إِزْغان) (ح): شەوگەرد.

(الأوزاغ): بێتواناكان/ بێهێزەكان/ بێدەسەلاتەكان.

وزف: (وَزَفَ يَزِفُ وَزْفاً وَ وَزِيفاً): خێرایكرد/ پەلەیكرد.

(-فُلاناً وَزْفاً): پەلەی لە فیسار كرد.

(وَزَّفَ و أوزَفَ. تَوزيفاً و إيزافاً): پەلەیكرد.

(وازَفَ وَ تَوازَفَ-القَـومُ. مُوازَفَةً و تَوازُفاً): لە یەكتری نزیكبوونەوە.

وزل: (اَلوَزّال) (ن): گەسـكی ئیسپانی/ زەلی گەسـك، دەوەنوكێكە لە وڵاتـی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆرە لاسـكەكەی خڕ و بێگەڵایە. گوڵەكەی زەردێكی كاڵە و جوانە.

وزم: (وَزَمَ-فُلاناً بِفيهِ يَزِمُ وَزْماً): بە دەمی هێواش گەستی.

(-الشيءَ): لێواری شتەكەی شكاند/ شتەكەی كەلكرد.

(وُزِمَ-في مالِهِ وَزْمَةً): شـتێك لە ماڵەكەی لە داراكەی ڕۆیشت ماڵەكەی كەلبوو.

(اَلوَزْم): ١-چەپكە سەوزەیەك ٢-ئەو گۆشتەی كە شاهەڵۆ لە هێلانەكەیدا كۆیدەكاتەوە.

(اَلوَزّام): خاوەن گۆشت و ماسولكەی زۆر.

(اَلوَزيم): ١-گۆشـتی كوتە كوت كراوی وشـك كراوە ٢-ماسولكە.

(اَلوَزيـم و اَلوَزيمَة): ١-(دەسـتكە/ چەپكە) سـەوزەیەك ٢-ئـەو گۆشـتەی شـاهەڵۆ لـە هێلانەكەیـدا كۆیدەكاتەوە (رَجُـلٌ وَزيمٌ): پیاوێكی قەڵەوی تێكسمراو.

٢-(وَزَمَ وَ وَزَّمَ-نَفْسَـهُ. يَـزِمُ. وَزْمـاً): لـە ڕۆژێكدا ژەمێك نانیخوارد.

(اَلـوَزم): ١-(مص) دەم گرتنـەوە لە خواردن ٢-بـڕ (اَلوَزْمَة) ١-ژەمە خواردنێك لە ڕۆژێكدا ٢-بڕ.

٣-(وَزَمَ-الدَيْن. يَزِمُ وَزْماً): وامەكەی دایەوە

(اَلـوَزْم): كارێـك كە لە كاتـی خۆیدا دێت و دەبێت.

٤-(تَـوَزَّمَ): كارتێكردنی قـورس و زۆر بوو/ توندبوو.

٥-(اَلوزام): خێرایی/ گورجیی/ پەلە.

(اَلوَزيـم) عند اربـاب عِلم النَبـات): لای ڕووەكناسـەكان: ئەندامـی مێیە لـە گوڵ و

درەخت و ڕووەکەکانی تردا.(اَلوَزِيمِيَّة) (ن): ڕووەکێکە وەك کاڕووش لە ئەمەریکاوە هاتووە لاسکێکی درێژی هەیە چەند مەترێك درێژ دەبێتەوە هێشووە گوڵێکی زیوین دەگرێت. لە کۆمەڵەی دەغڵودانە و لە دەشت و دەر دەڕوێت بۆ جوانیش دەڕوێنرێت.

وزن: ١-(وَزَنَ-الشــيءَ يَزِنُ وَزْنــاً و وَزْنَةً): شتەکەی کێشا/ هەڵیسەنگاند بزانێت کێشی/ قورسایی چەندە.

(«هذا يَزِنُ رطلاً»): ئەمە سەنگی ڕەتڵێکە.

(-وَزَنَ-لَــهُ الدراهِــمَ وَ غيرَها): بە کێشــان پارەکە یان شتەکەی دایە.

(-الشِــعْرَ): لەســەر کێش هۆنراوەکەی دانا/ هۆنییەوە.

(وَزُنَ-الشيءُ. يَوزُنُ وَزانَةً): شتەکە (سەنگین/ قورس/ بەکێش) بوو.

(وازِن): قورس/ سەنگین/ بەکێش.

(وَزُنَ-الرَجُلُ): پیاوەکە ڕادروســت و ڕاست و تەواو بوو.

(وَزَن وَ أَوزَنَ- نَفسَهُ على كذا): خۆی لەسەر ئەوە ڕاهێناوو بۆ ئەوە ئامادەکرد.

(وازَنَ-هُ وِزانــاً وَموازَنَــةً): ١-پاداشــتی کارەکانیدایــەوە ٢-بەرامبــەری ئــەو بــوو ٣-هاوکێشی ئەو بوو ٤-هاوکێشەی ئەویکرد.

(-بَينَ الشَيئَين): دوو شتەکەی هەڵسەنگاند/ بەراوردیکردن بزانیت کامیان قورسترە.

(توازَنَ –الشَــيئان): دوو شــتەکە هاوکێشە بوون/ لە کێشدا یەکسانبوون.

(إتَزَنَ): کێشرا/ هەڵسەنگێنرا.

(-الدَراهِمَ): ســەرنجی پارەکەیداو لە ســاغو ناساغیی کۆڵییەوە.

(-العِدْلُ): لەنگەکە هاوکێشەی لەنگەکەیتری بارەکە بوو.

(-الشــيءَ إتَّزَنَ): شتەکەی بەکێشان وەرگرت یان کڕی.

(اَلوازِن) (فا): ١-کێشتەواو.

(«دِرهَــمٌ وازِن»): پارەیەکــی کێشــتەواو/ سەنگتەواو.

(اَلــوَزن (مــص) (ج) أوزان): ١-کێشــان/ ســەنگکردن/ ترازوو کردن ٢-کێش/ ســەنگ قورسایی.

(«هــذا درهَــمٌ وَزْنٌ»): ئەمــە پارەیەکــی کێشتەواوە/ سەنگتەواوە.

(«هذا رَجُلٌ راجِحُ الــوَزنِ») ئەمە پیاوێکە ژیرو ئاوەز تەواوو/ ڕا دروستە.

(«هُــوَ وَزْنَ الشــيءَ أوزِنَةَ الشــيءِ أَو وِزانَ الشيءِ وَ بِوِزانِهِ أَو بِوَزانَتِهِ»): ئەو هاوکێشی شــتەکەیە بەقەدیەتی یان هاوســەنگیەتی/ بەرامبەریەتی.

(«هُوَ وَزْنَ الجَبَلِ»): ئەو لایەکی شاخەکەیە

(اَلوَزنَة): ١-کێشــێك/ جارێك کێشــان ٢-ژنی ژیرو کارامەو ڕ ڕاستو دروست.

(الوَزنَة عند أَهالى لُبنان): كێشێك/ سەنگێك لەلای لوبنانییەکان سێ رەتڵە.
(اَلوَزنَة): جۆرو چۆنیەتیی کێشان.
(«فَلان وَزِينُ الرأي»): فیسار راکانی ئاغرانەو سەنگینانەو دروستو رەسەنانەیە.
(اَلأوزَن): بۆ لە پێشدانانە.
(«هذا القَولُ أَوزَنَ مِن غَيرِهِ»): ئەم قسەیە سەنگینترو دروستترو بەهێزترە.
(«هُـوَ أَوزَنُ القَـومِ»): ئەو لە خوێشـگەلدا لـە هەموان پیاوماقوڵترو قسـەزانترو قسـە بەجێترە.
(اَلمَوزونَة): ژنی کورتە بنەی ژیر.
(اَلمِيـزان (ج) مَوازِيــن): ١-ترازوو/ شـایەن ٢-بـر/ چەنـد ٣-(ع ح): رێکەیەکـە بـۆ ساغکردنەوەی راسـتیو ناراستیی کردەیەکی ژمێرەیی وەك کۆکردنەوەو لێکدانە ٤-داد.
(«اِستَقامَ ميزانُ النهارِ»): رۆژ بوو بەنیوەی/ بەنیوەرۆ.
٢- (الوَزين): تۆوی گوژاڵکی هارراوە.

اَلمُلحَق

وزن: (اَلتَـوازُن): لـە ترازوودا، بوونی شـت کە لەبـاری سـتوونییەکی چەسـپیودابێت/ هاوکێشەیی/ جووتترازووبوونو لەنگەرگرتن
(«فَقَـدَ توازُنَــهُ»): لەنگبوو/ بـاری رێکیی نەماو بەلایەکدا خواربـوو/ خۆی ترازووبوو بەهـۆی چەند هۆکارێکــەوە/ هێزیکەوە/ کە یەك کاری ئەویــتر پوچەڵ دەکاتەوەو رێکیو ترازوو بوونی ئەو شتە ناهێڵێت.
(التوازُن مَجـازاً): بەخوازە هاوکێشـەبوون ئەوەیە هێـزە بەرەنگـارە جۆراوجـۆرەکان هاوکێشـەی یەك ببن بەوە هێمنییو ئاشتیی بەرپاربێت.
(«التــوازُن السياسِــي»): هاوکێشـەبوونو هاوسـەنگیی رامیاریـی (التــوازن الـدولی): هاوکێشەی بوونی نێوان دەوڵەتان.
(اَلتوازُن): دابەشکردنی دەسەڵات بەرێکەیەك کە سـنوور بۆ هەموویان دابنرێتو سـنوور بەزینی یەکـتر نەبن کە ئەوە دەبێتە مایەی پێکەوە گونجانی دەسەڵاتەکان.
(«اَلتَّوازُن بَينَ السـلطات الثلاث التشريعية و التنفيذية و القَضائِيّة»): هاوسەنگبوونی سـێ دەسـەڵاتەکە دەسـەڵاتی یاسـادانانو جێبەجێکردن و دادوەریی.
(توازُن الميزانِيَّة): هاوکێشـەبوونی بۆدجە، بە هاوکێشــە و یەکسـان بوونـی دەرامەت و بەختکــردن لە بۆدجــەداو بــەو پێیەی کە دادەنرێت.
(اَلتَّوازُن الإقتِصــادِي): بیردۆزێکی نوێیە لە ئاڵوگۆردا دەڵێت: دیاریکردنی نرخی کەلوپەل زۆر هــۆکاری هەیە ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە هەمــوو دیاردە ئابوورییــەکان بەیەکەوە بەستراون.

(اَلإتِّزان): قنج و ســتوونیی وەستانی شتێك‌و چەسپاویی.
(راكِبُ دَرّاجَة يَحْفَظ إتِّزانَهُ): پاسكیل سوار ڕێكی و ســتوونیی خۆی لەسەر دوو چەرخی پاسكیلەكە ڕادەگرێت.
(اَلإتِّزان): جێگیر بوون و وەســتانی ستوونیی تەنێك بە هۆی كاریگەریی كۆمەڵە هێزێك كە یەك كاری ئەویتر پووچەڵ دەكاتەوە و دەبێتە هۆی قنج ڕاوەستانیو چەسپینی.
(إتِّزانٌ غَيْرَ مُسْـتَقِر): هاوســەنگ بوونێكی نەچەسپیو.
(اَلإتِّزان مَجازاً): ڕێكیی بە(خوازە) سەنگینیی ڕەوشت و ڕەفتارو مامناوەندیی تیایاندا.
(رَزانَةُ الطَّبع): سروشت ئاغر و سەنگینی.
(«هــذا دليلٌ على اتزانِــهِ»): ئەمە بەڵگەی سەنگینیی و ئاغرییە لە ڕەوشت‌و سروشتیدا ئەوەیشــە كە بەهرە سروشتیە ئاوەزییەكانی مرۆڤ لەگەڵ یەكدا ڕێكدەبن.
(«هُوَ ذَكِيٌّ جــداً لكِنَّهُ يفتَقِرُ إلى الإتزان»): ئەو زۆر زیرەكە بەڵام لەسەرخۆ نییە.
(اَلْموازَنَة): یەكســانبوونی ســەنگ/ كێشــە/ هاوكێشە بوون.
(المُوازَنَة بَينَ ثِقلَين): هاوسەنگ كردنی دوو قورسیی.
(اَلميزانِيَّة): بودجە.
(الموازَنَةَ في النَّقد): لە نێوان دوو نووســەردا بەراوردكردنی ڕەخنەیی وەكو بەراورد كردنی (أَبوتمام و بحتري): كە ئامەدیی كردوویەتی
(موازَنَــة سِــعر الصَّــرف في الإقتصــاد): هاوسەنگ كردنی نرخی برەوو بوونی پارە لە ئابووریدا: ئەوەیە بانكەكان ئەو پارە بێگانانە لەو شوێنانەدا بكڕن كە نرخەكانیان داشكاوە و برەوی نەبێت‌و لەو شوێنانەدا بفرۆشێت كە نرخیان تیایدا بەرزە و برەویان هەیە.
(اَلميزانِيَّة): بودجە: تۆمارێكە پارەی دەرامەتی دەوڵەت یان كۆمەڵەیەك یان كۆمپانیایەك یان بەرژەوەندییەكی گشتی یان پرۆژەیەك لەگەڵ خەرجیــی خەمڵێنــراوی پێویســتی ســاڵێك بەراورد و هاوسەنگ كراوی تێدا دەردەخرێت.
(تَقديرات الميزانِيَّة): خەمڵاندنی دەرامەت‌و خەرجیــی بودجەیەك یان كۆی دەســكەوت‌و دەرامەتــی خێزانێــك یــان تاكە كەســێك‌و خەرجیی پێویست لە ساڵێكدا.
(«وازَنَ ميزانيتَــهُ»): بۆدجەكــەی خــۆی هاوسەنگكرد.
وزي: ١-(وزى-الشــيءُ يزي وَزْياً): شــتەكە چوومەیەك و گرد و كرژ بوو/ كۆبووەوە.
(-الأَمرُ فُلاناً): كارەكە پەستی كرد/ تووڕەیكرد.
(اَلــوَزى): پیاوی كورتەبنــەی لەش بەیەكدا چووی زگماكیی.
٢-(وازى-هُ مُــوَزاةً): ١-ڕووبــەڕووی بــوو/ وەستا/ بەرامبەری بوو ٢-دی.

(أوزى-ظَهْرَهُ إلى الحائطِ إيزاءً): پاڵی بە دیوارەکەوە دا.
(-إلى فُلان): پەنای بردە بەر فیسار/ پاڵی بە فیسارەوە دا.
(-هُ إليه): پەنای پێ بردە بەر فیسار.
(-الشيءَ): شتەکەی قنج وەستاندو رایگرت.
(-لِداره): دیواری خانووەکەی پاڵدا قور و شتی تری خستە پاڵی و قایمیکرد.
(تَوازى الشيئانِ تَوازِياً): دووشتەکە جووت بەرامبەر و رێکی یەك بوون/ تەریب بوون.
(متوازي السُطوح) (هـ): رووتەریب: جسم تحده ستة متوازيات الأضلاع وهو موشور قاعدتاهُ متوازيا الأضلاع): تەنێکە شەش رووی لاتەریب دەوری داوە ئەویش پوازکە کە هەردوو بنکەکەیشی لاتەریبین (متوازي السطوح القائم(هـ) أحرُفه الجانبية أعمدة على مستوِيَي القاعدتين و القاعدتان ليستا مستطيلين): رووتەریبی وەستاو شانە تەنیشتەکانی لەسەر دوو رووی بنکەکەی ستوونین دوو بنکەکە لاکێشە نین (متوازي المستطيلات (هـ) جسم تحده ستة مستطيلات و هو مَوشورٌ قائم): تەنێکە شەش لاکێشە دەورەی دەدات کە پوازکێکی وەستاوە هەردوو بنکەکەی لاکێشەیین.
٣-(إستَوزى-في الجَبلِ إستيزاءً): بە شاخەکەدا هەڵزنا و سەرکەوت.

(اَلمُسْتَوْزي) (فا): قنج وەستاو و بەرزەوەبوو.
٤-(اَلمُسْتَوْزي): رایخۆپەرست/ راخۆسەپێن.
وس: (وَسْوَس-الشَيطانُ لَهُ و إليهِ وسْوَساً وَ وَسْوَسَةً): شەیتان خراپەی خستە دڵیەوە یان ئەوەی خستە دڵەوە کە بێکەڵك بێت و زیان بگەیەنێت.
(-الرَجُلُ):١-پیاوەکە تێکچوو و کەوتە قسەی شرم برم ٢-هەردەبیرەبوو/ تێکچوو تووشی وەسواسیبوو.
مُوَسْوِس: هەردەبیر/ واسواس.
(وَسْوَسَ): لەبەرخۆیەوە دەیچرپاند.
(-الحُليُ أَو القَصَبُ): خشڵەکە خرنگە خرنگی هات و قامیشەکە کەوتە خشەخش یان وژەوژ.
(-الرَجُلَ): قسەی نهێنیی لەگەڵ پیاوەکەدا کرد.
(وُسْوِسَ بِهِ): قسەی هەڵەق و مەلەقیکرد کە هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو قسەی سەیریکرد.
(اَلوَسْواس (ج) وَساوِس): وەسواسی/ هەردەبیریی/ دڵ پیسکردن و گومان پەیدا کردن ٢-شەیتان ٣-نەخۆشییەکە بەهۆی رەشبینییەوە تووشی مرۆڤ دەبێت و مێشك تێك دەچێت ٤-بیر و خولیایەکی بێبنچینەییە کە بە دڵی مرۆڤدا دێت و خەریکی دەکات و تووشی دڵەخورتێی دەکات، کە خراپە یان بێکەڵکە.
وسب: ١-(وَسَبَ-المَكانُ يَسِبُ وَسباً): شوێنەکە گژوگیای زۆر بوو.

(أَوسَبَ-المَكانُ. إيساباً): شوێنەکە گیای زۆربوو.

(-الكَبشُ): بەرانەکە خوریی زۆر بوو.

(اَلوسْبُ): گیا.

(اَلمِيساب): فەریکە خورمای نیوەگەییو.

٢-(وَسِبَ-الثَوبُ يَوسَبُ وَسْباً): جلەکە چڵکنبوو/ پیسبوو.

(الوَسَب) (مص): چڵك/ پیسی/ پۆخڵیی.

وسج: (وَسَجَ-تِ الإبلُ يَسِجُ وَسْجاً وَ وَسِيجَاً وسَجاناً): حوشترەکان پەلەیان کرد.

(واسِجَة): حوشتری خێرا چابوك/ گورج/ پەلەکردوو.

(أَوْسَجَ- البَعير): پەلەی بە حوشترەکە خست/ لوقەی پێکرد/ گورجیکرد.

(اَلوَسْج وَ الوُسْجان و الوَسيج): لوقەکردن/ لۆقەی حوشتر.

(اَلوَسَّاج وَالوَ سُوج (ج) وُسُج- مِنَ الإبلِ): حوشتری خێرای لۆقەکردوو.

(«إبلٌ وَسُوج»): حوشتری لۆقەکردوو و خێرا.

وسخ: (وَسِخَ-الشَيءُ يَوْسَخُ و ياسَخُ وَ يَيسَخُ وَسخَاً): چڵکن بوو/ چڵکی گرت/ پیس بوو.

(وَسِخ): چڵکن/ پیس/ چەپەڵ.

(وَسَّخَ وَ أَوسَخَ-الشَيءَ): شتەکەی (چڵکنکرد/ چەپەڵکرد/ پیسکرد).

(تَوَسَّخَ و اتَّسَخَ وَ استَوسَخَ): چەپەڵبوو/ پیسبوو/ چڵکنبوو/ پۆخڵبوو.

(اَلوَسَخ (ج) أَوساخ): چڵك/ پیسی/ چەپەڵیی.

وسد: (وَسَّدَ-هُ الوَسادةَ): سەرینەکەی خستە ژێر سەری.

(-إلَيهِ الأَمرَ): کارەکەی (بەو سپارد/ دایە دەست ئەو بیکات).

(تَوَسَّدَ-الوِسادَةَ):سەری کردە سەر سەرینەکە/ سەرینەکەی خستەژێر سەری خۆی.

(-ذراعَهُ): لەسەر (باسکی/ قۆڵی) خۆی نوست/ کردی بە سەرین.

(اَلوَسَاد وَ الوِساد وَ الوُساد (ج) وُسُد): ١-سەرین/ بالیف ٢-گۆشە.

(«رَجُلٌ عَريض الوِساد»): پیاوێکە بێمێشك/ کەودەن.

(«إنَّ وِسادَكَ لعَريض»): خەوەکەت خۆشە/ قورسە خەویت/ زۆر دەنوێت (ئیدیۆمە).

(اَلوَسادَة و الوِسادَة و الوُسادَة (ج) وَسادات وَ وِسادات وَ وُسادات وَ وَسائِد): سەرین بالیف.

٢-(أَوسَدَ-فِي السَيرِ): لە ڕۆیشتندا پەلەی کرد.

٣-(أَوسَدَ-الكَلبَ بالصَيدِ): سەگەکەی لە نێچیرەکەی تیژ کرد/ هەدەی لێکرد/ هانیدا.

وسط: (وَسَطَ-المَكانَ أَو القَومَ. يَسِطُ وَسطاً وَسِطَةً): ناوەندی شوێنەکە کەوت یان خوێشگەل کەوت/ لە ناوەڕاستدا دانیشت.

(واسِط): ناوەند گرتوو/ ناوەڕاست گرتوو/ ناوەند کەوتوو/ ناوەڕاست دانیشتوو.

(وَسَطَ-القَومَ و فِيهِم وَساطَةً):دادپەروەرانە کەوتــە نێوانیانــەوە/ ناوبژێکــرد و ڕێکــی خستنەوە.

(وَسُــطَ-في حَسَبِهِ. يَسِطُ وَســاطَةً وَسِطَةً): ڕەسەن گەورەو خانەدان بوو.

(وَسَّــطَ-هُ):١-کردی بە هــۆی ناوبژی و ڕێك خستنەوەی نێوان ٢-خستیە ناوەندەوە.

(-هُ في حَسَــبِهِ):بــوو بــە خانــەدان و پیاو ماقوڵ.

(-الشيءَ):شتەکەی کــرد بە دوو کەرتی وەك یەکەوە.

(أَوسَطَ-القَومَ إيساطاً):چووە(ناوەڕاستیانەوە/ ناوەندیانەوە).

(تَوَسَّــطَ-القَومَ أَو المــكانَ): لە ناوەڕاســتی شوێنەکەدا یان خوێشگەلدا دانیشت.

(-بَينَهُــم):ناوبژییکردن و ڕێکیخســتنەوە/ تەبایکردنەوە.

(-الرَّجُلُ): پیاوەکــە لە نێوان باش‌و خراپدا شتی مامناوەندیی هەڵبژارد.

(ألواسط)(فا):١-ناوەندگرتوو ٢-دەرگا ٣-ناوەڕاست کەوتوو ٤-پێشەوەی کورتان یان زین.

(ألواسِــطَة): ١-مێــی وشــەی (الواسِــط) ٢-پێشــەوەی کورتان یان زیــن ٣-گەوهەرێك کە بەنرخترینە لە ناوەڕاستی ملوانکەدا بێت ٤-هۆ/ هۆکار.

(«كانَ بِواســطة كذا»): بەهۆی ئەوەوە بوو

٥-ناوبژێــکار/ نێوانکەوتــوو ٦-هەڵبــژاردە و لــە هەمووان خانەدانتر. («فُلان في واسِــطَة قَومِهِ»):فیســار وەجاخــزادە و هەڵبژاردەی خوێشگەلەکەیەتی/ نەتەوەکەیەتی.

(ألوَسَــط):(بۆ نێــر و مێ و تــاك و کۆ)یە مامناوەندی.

(«شيءٌ وَسَط»):شــتێکی مامناوەندی. واتا: نە باشەو نە خراپیشە.

(وَسَــط (ج) أوســاط):نێوان/ ناوەڕاســت/ ناوەند.

(ج) أوســاط. (وَسَــطُ الشــيءِ) ناوەڕاستی شتەکەی.

«وَسَطُ الحَبلِ»:ناوەڕاستی گوریسەکە.

«وسط الدارِ»:ناوەڕاستی خانووەکە.

(رَجُــلٌ وسَــطٌ): پیاوێکــە لــە ناوەنــدی میللەتەکەیــدا خــاوەن باپیرانــی شــکۆدارو گەورەیە.

(هُــوَ في وِســطِ القــوم و في ووَسَــطِهِم): لــە ناوەڕاســتی خوێشــگەلەکەیاندایە/ لــە ناوەندیاندایــە/ لــە ناویانــدا (دەڵێــن هەر شــوێنێك لە نــاودا بێت لە بری ناوەڕاســت دەوترێت: (وَسْط وَ وَسَط) («وَسْطَ القَومِ»): لە ناوجەرگەی نەتەوە یان خوێشگەلدا.

(«وُسَطَ الحَبْلِ»):ناوەڕاستی پەتەکە.

(ألوَسَط الهَنْدَسي لِعَدَدَين أو لِطولين) (هـ): عدد ثابــت أو طول يكون جــذراً تربيعياً

لجدائلهمـا (حاصـل ضربيهـا): ناوەنـدى ئەندازەى دوو ژمارەيان دوو درێژى ژمارەيەكى نەگۆڕە يا درێژييەكە دەبێتە (ڕەگى دووجا)ى ئەنجامى لێكدانيان.

(اَلوَساطَة): (مص): ناوبژيكردن/ بەينەوەكەوتن/ ئاشـتكردنەوە، ناوەنديارِيـى/ ڕێكخسـتنەوە/ نێوانكەوتن (اَلوَسـوط= اَلْمُتَوَسِّـط) ١-ناوەنديى ناوەڕاسـت ٢-ڕەشـمالْ/ دەوار يـان ڕەشـمالْێكى بچووك.

(وُسُـوطُ الشَـمسِ): خۆركەوتنە ناوەڕاستى ئاسمان.

(اَلوَسِيط (ج) وُسَطاء (م) وسِيطة): نێوان دوو ناحەز/ دوو شەركەر/ كەوتوو/ ناوبژيكەريان ڕێكخەريان/ بەيەك گەيەنەريان.

(«هُوَ وسِيط فيهِم»): ئەو پايەدارترينيانەو خانەدانترينيانە.

(الوَسـيط في القُطـوع المخروطِيَّـة) (هـ): ناوەڕاستە لە برگە قووچەكييەكاندا نيوەتيرەى تێپەڕيوە لە برگەكەوە كە ستوندەبێت بەسەر تەوەرەى برگەكەوە.

(اَلأوسَـط (ج) أواسِـط): ناوەندييەكـى مامناوەنديى.

(أوسَـطُ الشـيءِ): نێـوان هەردوو سـەرى شتەكە.

(اَلعِلْمُ الأوسَط) (=اَلحِكْمَة الوسطى): زانستى بيركاريى.

(اَلوُسطى (ج) وُسْط): مێى وشەى (الأوسط): ناوەند/ ناوەڕاست.

(-مِـن الأصابِـع): پەنجـەى بەرزەلووتـە/ بالابـەرزە كە لە نێـوان پەنجەى برايتووتەو دۆشاوەژەدايە.

(مُوسَـطُ- البَيتِ): ئـەوەى لە ناوەڕاسـتى (خانووەكە/ مالْەكە)دايە.

(اَلْمُتَوَسِّط) (فا): ١-ناوەندكەوتوو/ ناوەڕاست/ ناوەند ٢-(هـ) لە سێگۆشەدا ئەو هێلْە ڕاستەيە كە لە سەرێكى سێگۆشەكەوە دەگاتە ناوەڕاستى لاى بەرامبەرى سەرەكە.

وسع: (وَسَعَ- اللهُ عَلَيهِم رِزْقَهُ): خودا ڕۆزيى و بژێويى بۆ فراوانكردن و زۆريدانێ.

(«وَسَعَ عليه»): خودا دەولْەمەندو دارايكرد

(وَسِـعَ- اَلَكانُ يَسَـعُ وَيَسِع. سَـعَةً وَسِعَةً): شوێنەكە بەرفراوانبوو/ پان و بەرينبوو.

(الشَيءَ): جێى شتەكە بووەوە شتەكەيگرت.

(«هـذا الإناءُ يَسَـعُ عشـرين كَيـلاً): ئەم قاپە بيسـت پێـوەر دەگرێت (جێى بيسـت پێوەر دەگرێت).

(«وسَـعَت رَحْمَةُ اللهِ كُلَّ شيءٍ و لِكُلِّ شيءٍ و على كُلِّ شيءٍ»): بەزەيى و ميهرەبانى و سۆزى خوداوەند هەموو شتێكى گرتۆتەوە.

(اللَّهُمَّ سَعْ عَلَينا): خودا بەزەيى و ميهرەبانيت بۆمان فراوانكە/ با زۆر بێت.

(ما أَسَعُ هذا): ئەوەم پێ هەلْناگيرێت و تواناى

ئەوەم نییە/ ئەوەم لە وزەدا نییە.

(لا یَسَعُكَ أن تَفعَلَ هذا): ناشێت/ نابێت ئەوە بکەیت یان ناتوانیت ئەوە بکەیت/ لە وزەتدا نییە ئەوە بکەیت.

(«وَسَعَ القَومَ فَضْلُهُ»): چاکەکەی هەموو خوێشگەلی گرتەوە.

(«وَسَعَ المالُ الدَینَ»): داراکە هێندە زۆر بوو تا هەموو وامەکەی پێدرایەوە.

(وَسُعَ-المَکانُ. یَوسُعُ سَعَةً وَ وَساعَةً): شوێنەکە فراوان بوو.

(-الفرسُ): چارەوێکە توند ڕۆیشت یان پەلی فراوانی هاویشت.

(وَسَّعَ): فراوانی کرد/ پان و بەرینی کرد.

(أوسَعَ): ١-دەوڵەمەندتر و داراتر بوو ٢-فراوانیکرد.

(-المَوضِعَ): شوێنەکەی فراوان هاتە بەرچاو یان بە فراوانی دانا.

(-هُ الشيءَ): وای کرد شتەکە بگرێت.

(-النَفَقَةَ): بژێوییەکەی زۆرتر کرد.

(-اللهُ عَلَیهِ): خودا (دارا/ دەوڵەمەند)ی کرد.

(تَوَسَّعَ): فراوانبوو

(-القَومُ في المَکانِ): لە شوێنەکەدا بڵاو بوونەوە و بڵاو دانیشتن.

(-الرَجُلُ في النَفَقَةِ): بۆ بژێویی خێزانەکەی زۆری بەختکرد/ بەختکردنەکەی پترکرد.

(إتَّسَعَ): فراوانبوو.

(-النَهارُ وَ غَیرُهُ): ڕۆژ یان شتیتر درێژ بووەوە سەرکەوت.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە دەوڵەمەند و پایەدار بوو/ بووە و بەدەسەڵات بوو.

(إستَوسَعَ): ١-فراوان بوو ٢-بە فراوان و بەرینی (زانی یان دانا).

(-الشيءَ): شتەکەی بە فراوان زانی یان داوای کرد شتەکە فراوانبێت.

(ألواسِع) (فا): فراوان/ بەرفراوان پان و بەرین.

(-في الأسماءِ الحسنی): لە ناوە پیرۆزەکانی خودایە خودای زۆر بەخشندەیە و بەدەسەڵاتە و ئاگای لە هەموو شتێکە/ هەرچی داوای لێبکرێت بە دەنگەوە دێت..

(ألسَعَةُ): ١-دەستڕۆیشتوویی دەوڵەمەندیی ٢-وزە و توانا.

(ألسَعَة و الوُسْعَة و التَوسِعَة): ١-فراوانبوون/ بەرینبوون ٢-فراوانیی.

(ألوَسْع و الوِسْع و الوُسْع): وزە.

(لیس في وِسْعِهِ أن یَفْعَلَ کذا): لە وزەیدا نییە ئەوە بکات/ ناتوانێت ئەوە بکات.

(ألوَساع-مِنَ الخَیل): ئەسپی ڕەسەن یان ئەسپی هەنگاو بڵاو/ بە هەنگاو.

(ألوَسیع): ١-فراوان/ بەرین/ ڕاق.

(-مِن الخَیل): هەنگاو بڵاو.

أَلْمُلْحَق

وسع: (أَلْمَوْسُوعَة): ئينسـكليۆپيديا/ دەریای زانیاریی.

(أَلْمَوْسُوعِيّ): تایبەتیی دەریای زانیاری.

(الشامِل لجميع المعارِف): هەموو زانیارییەك دەگرێتەوە و تیایدا هەیە.

(«قامــوسٌ مَوسُــوعِيّ»): فەرهەنگێکـی زانیاریی گشتی.

(مَعارِفُ مَوسوعِيَّة): زانیارییەکی بەرفراوان/ زۆر فـراوان کـە گەلێـك لایەنـی زانیـاری بگرێتەوە.

(أَلْمَوسُـوعِيّ (ج) مَوسُـوعِيُّون): ١-دانـەری ئینسکلۆپیدیایەك ٢-کەسێکە کە زانیارییەکەی لە ڕادەبەدەربێـت/ زۆر زانا بێت/ لە هەموو زانیارییەکـدا بەهـرەدار بێـت وەك دەریای زانیاریی بێت.

(أَلْجاحِـظ أديـب مَوْسُـوعِيّ): جاحـظ وێژەوانێکبوو دەریای زانیاریبوو.

---

وسـف: (وَسَّفَ-الشيءَ. تَوسـيفاً): شتەکەی پاککرد/ توێکڵی شتەکەی گرت.

(تَوَسَّـفَ الشـيءُ): شـتەکە پاککرا/ توێکڵی شتەکە گیرا.

(-البَعـيرُ): حوشـترەکە قەڵەو بـوو یەکەم تووکی فرێدا و تووکی تازەی دەرکرد.

(-تْ أَوبـارُ الإبلِ): با تووکی حوشـترەکانی برد/ تووکەکەی لێبووەوەو با بردی.

وسق: ١-(وَسَقَ-الشيءَ يَسِقُ وَسْقاً):١-شتەکەی هەڵگرت ٢-شتەکەی کۆکردەوە.

(-البَعيرَ): حوشترەکەی بارکرد.

(-تِ الناقَةُ وَ غَيرُها): مێحوشترو هیتر باریان هەڵگرت.

(واسِق): بارهەڵگرتـوو (ج) واسِقات وَ وِساق و مَواسـيق وَ مَواسِق)(ئەم دوانەی دواوە بە پێی پێوەر نییە).

(-تِ العَـينُ الماءَ): چاوەکە ئـاوی تێزا/ ئاوی کرد گەرچی ساغیشبوو.

(-تِ النَخْلَـةُ): دارخورماکـە بەرێکی زۆری گرت/ بەرێکی زۆری پێوە بوو.

(«وَسَقَ-السَـفينَةَ»): پاپۆرەکـەی بارکردو پڕکرد.

(الوَسْقَةُ): بار.

(وَسَقَ-البَعيرَ وَسيقاً): حوشترەکانی دایەپێش و ڕادا.

(وَسَّـقَ-الحُنطَةَ): گەنمەکـەی کرد بە (٦٠) (٦٠) مەنیی و لەسەریەك هەڵیچنین.

(واسَـقَ-هُ مُواسَقَةً): وەك ئەو تاکەی لێکردو یەکسانی کردن/ وەك تای ئەو بووو لەو کەمتر نەبوو.

(أَوسَقَ-الدابَّةَ) إيساقاً: چوارپێکەی بارکرد.

(-تِ النَخلَةُ): دار خورماکە بەری زۆر گرت.

(إتَّسَقَ-الأَمرُ): کارەکە ڕێکوپێك و ڕاست بوو.

(إتَّسَقَ-تِ الإبلُ): حوشترەکان کۆبوونەوە.

(-القَمَرُ): مانگەکە (پڕبوو/ خڕبوو).

(إسْتَوْسَقَ إستيساقاً): کۆبووەوە و ملیدا.

(-الأمرُ): کارەکە (ڕێکوپێك بوو/ باری ڕاستی خۆی وەرگرت).

(-لَهُ الأمــرُ): کارەکەی بۆی بە باشــی هاتە پێشەوە و توانای بەسەردا شکا.

(ألوَسْق (مص) (ج) أوساق): ١-٦٠مەن ٢-باری حوشتر.

(الوَسْق (ج) أوســاق وَ وُسُوق): بەری زۆری دارخورما.

(ألوَسيق) (مص): ١-دەرکردن/ ڕادان ٢-باران.

(الوَسيقَة): بارهەڵگر/ باربی.

(«ناقــةُ وَســيقَة»): مێحوشــترێکی باربی/ بارهەڵگر.

(-مِنَ الإبِلِ (ج) وَسائِق): ڕەوە حوشتر.

(ألمُتَّسِق): مانگی پڕ/ مانگی چواردە.

(-عندَ أهــل العَروض): لای کێشناســەکانی هۆزان کێشــێکە کە هەشت جار لەسەر کێشی (فَعِلُن)ە پێیشی دەوترێت (المُتَدارك).

٢-(ألميســاق (ج) مَياســيق وَ مَآســيق-مِنَ الحَمام): کۆتری باڵپڕپەڕ و باڵبەهێز.

ألمُلحق

وسق: (ألإتِّســاق): ڕێکوپێکیی و زنجیرەیی و یەك لە دوای یەکیی شتەکان یان بیرەکان.

(ألتَناسُــق و التَرابُط): ڕێکبــوون و پێکەوە بەندبوون و گونجان.

(إتساق الأفكار): ڕێکوپێکیی و پێکەوەبەستنی بیرەکانو جوان گونجانو زنجیرە وەرگرتنیان.

(-فِي البَلاغَة): لــە ڕەوانبێژیدا ئەوەیە واتاکان جنگ بدەنە یەك/ یەکبگرن و یەکتریی تەواوکەن و ئاخاوتنەکە بگونجێنن و جوانیی دەربخەن.

---

وسل: (وَسَلَ وَ وَسَّلَ وَ تَوَسَّلَ-الی اللهِ بِعَمَلٍ أو وَسيلَةٍ. يَسِلُ وَسِيلَةً): بەکارێکی چاك یان هەر هۆیەکیتر خوازیار و نیازداری نزیکبوونەوەی بارەگای خودای مەزنبوو.

(واسِلٌ): کەســێکە کە بــە کردەوەی باش یان هەر هۆیەکیــتر خوازیاری نزیــك بوونەوەی بارەگای خودا بێت.

(ألواسِلَةُ و الوَســيلَةُ (ج) وَسِيلٌ وَ وَسائِل وَ وُسُــل): ١-هۆ/ هۆکاری لە خەڵك نزیکبوونە. ٢-جێگە و پلەوپایە لای شاکان ٣-پلە.

وسم: (وَسَــمَ-ەُ. يَسِمُ وَسْماً وسِمَةً): ١-داخی کرد و بە داخ نیشــانەی لەسەر لەشی دیاریی کرد و جێهێشت ٢-نیشــانەیەکی بۆ کرد پێی بناسرێتەوە.

(الوَســمِيُّ ألأرضَ): بارانی ســەرەتای بەهار بەسەر زەویدا باری.

(وَسُــمَ-الغُلامُ. يَوْسُــمُ وَســاماً وَ وَسامَةً): مێردمنداڵەکە شــێوەی دەموچــاوی جوان و گەشبوو، شەنگیی تێدا دەرکەوت.

(-الوَجْــهُ): ڕوومکــە (جــوان و گەشــبوو/ شێوەشیرین بوو).

(وَسَّمَ): له كاتى حەجدا بۆ مەكە رۆيشت.
(واسَمَ-هُ مُواسَمَةً): له جوانيى و شۆخيدا بۆرى ئەويداو لەو پتربوو.
(تَوَسَّمَ-الرَجُلُ): بە دواى لەوەڕ و گياى بەهاريدا گەڕا.
(-الشيءَ): له شتەكە وردبووەوە و سەرنجى لێدا.
(تَوَسَّمَ): ١-بۆ نيشانەى شتەكە گەڕا ٢-ناسييەوە.
(-فيه الخيرَ): فەڕ و خێر و بێرى لێ چاوەڕێ كردو لێ بينى.
(-بالوَسِمَةِ): بە وسمە قژى خۆى ڕەنگ كرد
(إتَّسَمَ): نيشانەيەكى بۆ خۆى دانا كە پێى بناسرێتەوە.
(اَلسِمَةَ (مص)(ج) سِمات): ١-نيشانە ٢-شوێنداخ ٣-(ن): كۆسپ/ بەشى سەرەوەى قەڵەم لە گوڵدا كە هەڵاڵە وەردەگرێت و دەمژێت.
(حامِلُ السِمَّة) (ن): قەڵەم كە كۆسپى بەسەرەوەيە و لە نێوان كۆسپ و هێلكەداندايە جارى واهەيە زۆر كورت دەبێت يان هەر نابێت.
(اَلوَسْم (مص)(ج) وُسُوم): ١-(ن) درەختى وسمە كە گەڵاكەى ڕەنگى وسمەى لێ دەردەهێنن و پێدەكەن ٢-نيشانە ٣-جێداخ.
(الوَسْمَةُ و الوَسِمَةُ): گەڵاى ڕووەكى چويت يان هى ڕووەكێك كە ڕەنگى پێدەكەن.

(اَلوَسْمِيُّ): يەكەمين بارانى بەهار (بۆيە وا ناونراوە چونكە زەوى ڕەنگدەكات/ سەوز دەكات).
(اَلوِسام (ج) أوسِمَة): نيشانەكردنى ئاژەڵ و وڵاخ بە داخ لە گەلێك وێنە و شێوە/ نيشانە/ مۆر ٢-مەدالياى ئافەرين/ نيشان كە بەوانە دەدرێت كە كارى گەورە بۆ وڵات دەكەن يان لە بوارێكدا لە پێشەوە دەبن و نيشانەكە بە بەرسنگياندا دەكەن.
(اَلوَسامَة)(مص): ١-شۆخيى و جوانيى/ شەنگيى پاشماوەى جوانيى و شۆخيى.
(اَلوَسيم (ج) وُسَماء وَ وِسام (م) وَسيمَة (ج) وَسيمات وَ وِسام): ڕووو شێوە جوان/ قەشەنگ.
(اَلأوسَم): جوانترين/ قەشەنگترين.
(اَلمَوسِم (ج) مَواسِم): ١-كۆمەڵبوونى خەڵك زۆر تريشى بۆ كاتى كۆمەڵبوونى حاجييەكانە لە مەكەدا و چوونە بازاڕيان ٢-جەژنە گەورەكان.
(-عند أَهل لُبنان): لە لاى خەڵكى لوبنان كاتى ئاوريشم كردنە ئەوە بۆنەيەكى تايبەتييانە لەلايان دەڵێن:
(إسْتَدانَ إلى مَوسِمِ الحَريرِ): وامى تا كاتى ئاوريشم گرتن وەرگرت.
(-عند العامَّة): لەلاى ڕەشە خەڵكەكە بە نەخۆشييەك دەڵێن كە لە ژيانى مرۆڤدا جارێك بيگرێت وەك سوورێژە و ئاوڵە و لەو جۆرانە.

(اَلْمَوسِم): كات/ وەرز/ دەم/ هەرەت.
(اَلْمِيسَـم (ج) مَياسِـم): ١-ئاسـنێك كە بەوە داخی ئاژەڵ و وڵاخی پێدەكەن و پێی نیشانە دەكەن ٢-جوانیی و قەشەنگیی/ شۆخیی.
(اَلْمَواسِيم): حوشتری نیشانەكراو.
(الْمَوسومة): نیشانەكراو/ مۆركراو.
وسن: ١-(وَسِنَ. يَوسَنُ وَسَناً. وَسِنَةً) (ضد): ١-خەوبردیەوە/ كەوتە وەنەوزەكوتێ ٢-لەخەو (هەستا/ راپەڕی).
(وَسِـن وَ وَسـنانٌ وَ ميسـانٌ و هي وَسِنَةٌ وَ وَسْنى وَ ميسان): ١-خەوبردوو یان وەنەوزدەر ٢-لە خەو راپەڕیو/ بەئاگاهاتوو.
(وَسِنَ-فُلانٌ): فیسار لە بۆن و بەرامەی پیسی بیرەكە بەلادا هات و بوورایەوە.
(أَوسَنَ-تْهُ البِئرُ): هەوای بیرەكە بووراندیەوە.
(تَوَسَّنَ-ه): كاتی خەوتن هاتەلای.
(إِسْتَوسَنَ=وَسِـن) (ضـد): ١-خەوبردیـەوە ٢-لەخەو راپەڕی.
(اَلسِنَة) (مص): خەوبردنەوە/ وەنەوزدان و لەش خاوبوونەوە.
(«هُـوَ فِي سِـنَةٍ»): ئـەو لـە وەنـەوزدان و بێئاگاییدایە/ خەوڵوو.
(اَلْوَسَن) (مص): خەوگرتن و لەش گرانبوون/ خەواڵوو/ نووستن.
(اَلْوَسْنَةُ): ١-كەمخەویی ٢-وەنەوزدان.
(اَلْوَسَنِي): كەسێكە زۆر وەنەوزە كوتێی بێت

(اَلْمَوسُـون (م) مَوسونَة): تەمەڵ/ لەشگران/ تەوەزەل.
٢-(اَلْوَسَن(ج) أَوسان): پێداویستی.
وسي: (وسى-رَأسَهُ يَسي وَسياً): سەری خۆی تاشی.
(أَوسى-الرَأسَ إِيساءً): سەری تاشی.
(-الشيءَ): شتەكەی لەتكرد/ بڕی.
(الْمُوسى (ج) مَواسٍ): گوێزان/ ئەوەی سەری پێدەتاشن.
٢-(واسى-الرَجُلَ مُواساةً): ١-دڵخۆشی دایەوە و دڵنەواییكرد ٢-یارمەتیدا/كۆمەكیكرد.
وش: (وَشْـوَش-فُلاناً وَشْوَشَةً): چرپاندی/ سرپاندی بەگوێی فیساردا.
(-هُ الشيءَ): سووكەڵانە شتەكەی دایەدەست.
(تَوَشْـوَش-القَومُ): خوێشـكەل لەگەڵ یەك كەوتنە قسەی (سرپە سرپ/ چرپە چرپ).
(اَلْوَشْوَش والوَشواش): ١-سـووك/ سووكەڵە ٢-چابوك/ خێرا/ گورج/ ئازا.
(«رَجُلٌ وَشْوَشِـيُّ الـذراع»): پیاوێكی ئازا و دەست و بازوو سووك و گورجە.
وشب: (اَلْوَشْب): خورما و شتی تری ئەستوورو گەورە.
(الوشـب (ج) أَوشاب): هەرچی و پەرچیی و خوێریی ناو خەڵك.
وشـج: (وَشَـجَ-تِ اَلْغصانُ. يَشِـجُ وَشْجاً): چڵەكان/ پەلەكان/ لقەكان بەیەكدا چوون.

(«وَشَـجَت بِكَ قَرابَتُهُ»): خزمایەتیەکەتان تێکئالآوە/ خزمایەتیەکەیان ئالآوەتۆ.
(«وَشَـجَتْ فِي قَلْبِهِ أُمُـورٌ و هُموم»): کار و مەراق و خەفەت ئالآوەتە دڵی.
(وشَجَ مَحْمَلَهُ): کەژاوەکەی بە قایش و شتی وەها قایم بەست تا شتی لێ نەکەوێتە خوارێ
(وَشَّـجَ-مَحْمَلَهُ): کەژاوەکەی بە قەیاسـە و قایش و شتی لەو بابەتە توند شەتەك داوە تا هیچی لێ نەکەوێت.
(-اللهُ قَرابَتَهُ بِكُم): خودا خزمایەتیەکەیانی لەگەڵ ئێوەدا تێکئالآند.
(-اللهُ بَين القَوم): خودا خۆشەویستی و تەبایی خستە خوێشگەلەوە و هۆگری یەکتری کردن.
(تَوَشَّـجَ و تَواشَـجَ-ت عُـروقُ الشـجرةِ و نحوُها): رەگ و ریشـەی درەختەکە یان هی تر بەیەکداچوون/ چنگیان دایەیەك/ لەیەك ئالآن.
(ألواشِج(فا)(م)واشِجَة):١ـتێکئالآو/بەیەکداچوو ٢ـخزمایەتیی (نزیك و بەیەکداچوو/ قووڵ).
(ألوَشيج): بەیەکداچوون و تێکالآنو نزیکیی خزمایەتـی/ خوێشـایەتی/ کەسـایەتیی خزمایەتیـی ئالۆز کە لـە ژن و ژنخوازییەوە پەیـدا بووبێت ٢ـدرەختی نێزە، کە نێزەی لێ دروست دەکرێت.
(«تَطاعَنو بالوَشيج»): بە داری نێزەـواتا بە نێزەـبەربوونە یەکتری.
(ألوَشـيجة (ج) وَشـائِج): رەشکە کە دەغل و گەنمی دوورواوی تێدەخەن و بۆ سەرخەرمانی پێدەگوێزنـەوە، ریشـووی درەخـت کـە دەهۆنرێتەوە و دەچنرێت و رەشکەی پێدروست دەکرێت (یان بە مووی رێسراو دروست دەکرێت دەچنرێت وەك تۆری ماسیگرتن)
(ألوَشيجه (ج) وَشائِج): دەماری گوێ
(«هُم وَشيجَةُ القَوم»): ئەوان بێگانەن لە ناو خوێشگەلدا/ نەتەوەدا.
وشـح: (وَشَّـحَ-هُ): شـێوە گەردانەکـە یان سـنگبەندەکەی کـردە ملـی و بە لاسـنگیدا هاتەخوارێ.
(تَوَشَّحَ بِسَيفِهِ): شمشێرەکەی لە کەمەربەست.
(-بِثَوبِهِ): جلەکەی پۆشـی یان خسـتیە بن دەستیەوەو بەسەر شانیدا دا.
(-الجَبَلَ): رێی شاخی گرتەبەر.
(وَشَّـحَ و أتَّشَـحَ): شـێوە گەردانەکـە یـان سنگبەندەکەی لەملکرد.
(ألوِشاح): ١ـشمشێر ٢ـکەوان.
(ذو الوِشـاح): شمشـێری عومـەری کـوڕی خەتاب.
(ألوِشـاح و الوُشـاح (ج) وُشُـح وَ أَوشِحَة وَ وَشائِح): شێوەگەردانەیەکە یان سنگبەندێکە چنراوێکی پانە بە مرواریی و زێڕ و نیشانەی جوان دەرازێنرێتەوە ژن دەیکاتە ملی و بەسەر غالیگەیدا بەری دەداتەوە.
(ألوِشاحَة): شمشێر/ شیر.

(اَلوَشْـحاء): بزنی ڕەنگ ڕەش و پەڵەی سپی بە غالیگەیدا هاتبێت.

(اَلُوَشَّـح): جۆرە هەڵبەستێکە بـە گەلێک کێـش دادەمەزرێـت و برگـە برگەیـە و بە سەروایەکەوە بەند ناکرێت. ئەمە لە داهێنانی ئەندەلوسیەکانە (بۆیە وا ناونراوە چونکە لە سنگبەند دەچێت شێوەدار و جوانە).

(مُوَشَّـحَة (ج) مُوَشَّـحات): هەڵبەستی لەو شێوەیە.

(اَلُوَشَّـحَةُ- مِنَ الطَّیرِ أَو الظِباء): باڵندە یان ئاسکێك کە ئەملاولا یان دوو پەڵەی هێل یان میلییان پێوەبێت.

وشـــر: (وَشَرَ-أَسنانَهُ یَشِرُ. وَشْراً): دانەکانی تیژ و تەنککرد.

(-الخَشَـبَةَ بِالمِنشـارِ): تەختەکەی بە مشار بڕییەوە.

(إِتَّشَرَ و اَسْتَوشَرَ): داوای تیژکردنی دانەکانی کرد.

(اَلَوشـور (مفع) (ج) مَواشیر) (هـ): پوازك (هـ) تەنێکـی بلووریـنـە ئەگـەر بنکەکـەی سێگۆشـە بێـت پوازکی سێگۆشـەییە ئەگەر چوارگۆشە بێت چوارگۆشەییە ئەگەر پێنجلا بێت پوازێکی پێنجییە.

(موشـور مائل) (هـ) راسـماته مائله علی مسـتوی القاعـدة): پوازکـی لار ئەوەیـە پەیداکەرەکەی لەسەر بنکەکەی لارە.

(موشور قائم: راسماته عمودیة علی مستوی القاعدة): پوازی وەستاو پەیداکەرەکەی لەسەر بنکەکەی ستوونە (سطح موشور (هـ): جسم یحده سطح موشوريّ و مستویان متوازیان یقطعان راسـمات السـطح): ڕووی پوازك. تەنێکـە ڕوویەکی پوازگـیو دوو ڕووتەختی هاوتەریـب دەوری دەدەن کە پەیداکەرەکانی ڕووە تەختەکە دەبڕن.

(جذع موشـور (هـ) جسـم یحده سـطح موشوري و مستویان غیر متوازیین یقطعان راسماته): تەنێکی پوازك ڕوویەکی پوازکیی/ دوو ڕووی تەختـی ناتەریبی پەیداکەرەکانی دەبڕن.

(سطح موشوری: یرسمه مستقیم یتحرك بموازاة نفسـه مرتکزاً علی خط منکسـر بحیث لا یکون الخط و المسـتقیم في مستو واحـد): پـواز گەروویـەك هێڵێـك وێنەی دەکێشـێت کە ڕێکی خۆی دەبزوێت لەسـەر هێڵێکـی شـکاوە دەجوڵێتەوە بـە مەرجێك هێڵەکە و هێڵە شکاوەکە ڕێك نەبن.

(اَلیشار=المِنْشار): مشار. برەك.

وشـز: (وَشِـزَ. یَشِـزُ وَشْـزاً): گورج بوو/ خێرایکرد.

(تَوَشَّزَ-لِلشَرِّ): ئامادەیبەدییبوو/ خراپەکاریی بوو.

(اَلوَشْز و الوَشَـز (ج) أَوشاز): ١-پەلەکردن/

گورجیی ٢-هەڵمەت/ شوێنی بەرزیی ٣-پەناگا یان ئەوەی پەنای بۆ دەبەیت/ هانای بۆ دەبەیت ٤-سەختیی ژیان و نەدارایی/ نەبوونیی/ بێگوزەرانیی.

(اَلْوَشِيْزَة (ج) الوَشَائِز): سەرینی تەواو ئاخنراو ڕەقکراو.

وشظ: (وَشَظَ-العَظْم يَشِظُ. وَشْظاً): پارچەیەکی ئێسقانەکەی شکاند.

(-الفَأْسَ): کونی تەشوێکەی بە پواز ئاخنی و قایمی کرد.

(-القَوْمُ إِلَيْنا): خوێشگەل کە کەمبوون پێمان گەیشتنەوە.

(اَلْوَشِيظ (ج) أَوْشاظ): ١-شوێنکەوتوو/ سەر بە کەسێك و لایەك ٢-پەیمان و بەڵێن ٣-کۆمەڵە خەڵکێك کە بە ڕەچەڵەك یەك نەبن. ٤-سووك و ڕسوا/ پوشت ٥-الدخيل في القَوم: بێگانەی ناو خوێشان/ ناو نەتەوە (اَلْوَشِيظ و الوَشِيظَة (ج) وَشائِظ): تەڵەزم کە سەری تیرەکەی پێ قایم دەکرێت.

(هم وشِيظَةٌ في قَومِهِم): ئەوان دەرەکین لە ناو خوێشگەلدا ئاخنراونەتە ناویانەوە.

(هُوَ وَشِيظَةٌ فيهم): ئەو لە ناویاندا دەرەکییە.

وشيع: ١-(وَشَعَ-الشَيءَ. يَشَعُ. وَشْعاً): شتەکەی تێکەڵکرد/ تێکهەڵدا.

(-القُطنَ): پاش شیکردنەوەی لۆکەکەی گوڵۆڵە کرد/ پێچایەوە.

(-تِ البَقْلَة. وَشْعاً وَ وُشُوعاً): سەوزەکە گوڵی گرت/ گوڵەکەی گەشایەوە.

(-هُ الشَيءُ): شتەکە سەریکەوت.

(وَشَّعَ-القُطنَ): پاش شیکردنەوەی لۆکەکەی (پێچایەوە/ گرمۆڵە کرد).

(-الشَيءَ في الشَيءِ): شتەکەی بە ناو شتەکەیتردا کرد.

(-الثَوبَ): بەرگەکەی ڕەنگ و نیگارکێش کرد/ بەوە نیشانەیکرد.

(-الشيبُ رأسَهُ): مووی سپی دایە سەری.

(-القَومُ على كَرْمِهِم أَو بُستانِهِم): خوێشگەل پەرژینیان بۆ ڕەزەکانیان یان باخەکانیان کرد.

(أَوشَعَ البَقلُ أَو الشَجَرُ): سەوزەکە یان درەختەکە هاتە گوڵ/ گوڵی کرد.

(تَوَشَّعَ-بِالكَذِب): بە درۆ خۆی هەستانەوە یان قسەکانی جوانکرد.

(-الشيبُ رَأْسَهُ): مووی سپی دایە سەری.

(-الشيءُ): شتەکە بڵاوبووەوە.

(-بِهِ): بەو شتە زۆریکردو جوانیکرد.

(-القَومُ الضُيوفَ): میوانەکانیان بەسەر ماڵەکانیاندا دابەشکرد و هەریەکە تاقمێکیانی بردە ماڵی خۆی.

(اَلْوَشْع (مص) (ج) وُشوع): ١-گوڵی سەوزەوات ٢-وردەگیایەکی ناوشاخان.

(اَلْوُشْع): تەناف و لانەی جاڵجاڵۆکە.

(اَلْوُشُوع): ١-گژوگیای بڵاوی ناوشاخ

٢-دەرمانێك كە بكرێتە دەمەوە.
(اَلوَشيع): ١-ڕەنگ و نیگاری پۆشاك‌و نیشانەی ٢-بنمیچــی خانوو یان ئەوەی دەخرێتە ســەر دارەراكانی (وەك حەســیر و شــتیتر) ٣- پەلی درەخــت كــە وشــك دەبیّــت و دەكەوێت ٤- پەرژینی درگەزیی باخ یان هەرشتێكی تر بێت ٥-چادرێك یان ســاباتێك بۆ فەرماندەی سوپا دەكرێت تا سەرپەرشتی سەربازەكان بكات.
(اَلوَشیعَة (ج) وَشیعٌ وَوَشائِع): ١-تەختەی لەسەر هەڵكردنی مووی ڕێسراو یان خوریی و دەزووی ڕەنگاوڕەنــگ هەرچۆنێــك بێــت ٢-خەرەك ٢-بەكرە/ خولخولۆكە كــە خەیاتەو دەزووی ڕەنگاوڕەنگی لەســەر هەڵدەكرێت. ٣-مەكۆی دەسگای جۆلایی.
(اَلمُوَشَّــع) (مفع): ١-هەڵكراو/ گولۆڵە ٢-ڕەنگ و نەخشێنراو.
(«بُردٌ مُوَشَّع»): بەرگێكە هێل و نیگاری تێدا كراوە و ڕەنگینە.
٢-(وَشَعَ-الجَبَلَ و فیه یَشَعُ وَشْعاً وَ وُشوعاً): بە كێوەكەدا هەڵزنا و سەریكەوت.
(تَوَشَّــعَ- فِي الجَبَلِ): بە پێچاو پێچ بەســەر شاخەكەدا سەركەوت.
(-تِ الغَنَــمُ فِي الجَبَلِ): مــەڕەكان بۆ لەوەڕ سەركەوتنە سەر شاخەكە.
وشغ: ١-(وَشَغَ-بِبَولِهِ یَشِغُ وَشْغاً): میزەكەی هەڵدا.
(وَشَّــغَ-الثَوبَ بالدَم): بەرگەكەی خوێناوی كرد تا هێڵی تێدا پەیدا بێت.
(أَوشَغَ-بِبَولِهِ إِیشاغاً): میزەكەی هەڵدا.
(تَوَشَّغَ-بالسوءِ): بە خراپە لەكەدار بوو.
٢-(أَوشَــغَ-العَطِیَّةَ إِیشــاغاً): بەخششەكەی كەمكردەوە.
(اَلوَشْغ و الوَشیغ): كەم.
وشــق: (وَشَــقَ-ُهُ یَشِــقُ وَشْــقاً): (ڕنــی/ ڕووشاندی)-هُ بالرمحِ): نێزەی پێداكرد.
(-اللَّحَمَ): گۆشــتەكەی توێتوێكرد و دایەبەر خۆر وشك بێتەوە/ هەڵیخست.
(وَشَّقَ-الشيءَ): شتەكەی لەتلەت كرد و جیای كردنەوە.
(أَوشَقَ-الشــيءُ في الشــيءِ): شــتەكەی لــە شتەكەیتر هەڵچەقاند/ پێداكرد.
(تَواشَقَ-القَومُ العَدُوَّ بِأَسیافِهِم): بە شمشێر وەك چۆن گۆشت پارچەپارچە دەكرێت ئاوەها خوێشكەل دوژمنیان لەتوكوتكرد.
(إِتَّشَقَ-القَومُ العَدُوَ بِأَســیافِهِم): خوێشكەل بە شمشێرەكانیان دوژمنیان لەتوكوتكرد.
(-فُلانٌ اللَّحمَ): فیســار گۆشتەكەی كوتەكوتە كردو لەبەر هەتاو هەڵی خست وشك بێتەوە.
(اَلوَشْق (مص): لەوەڕاندنی ئەملاولا و جیا
(اَلوَشَق) (ح): وشــەك/ كوڕەبەشە/ ڕۆدەك، جۆرێكە لە پشیلەكێویی پێستەكەی بەلەك‌و بەنرخە.

(اَلوَشـــيق والوَشيقَة (ج) وَشائِق): گۆشت كه لەبــەر هەتاو و هەوا وشــك دەكرێتەوە و بۆ كاروان و گوزار دەبرێت.

(اَلميشاق (ج) مَواشيق): دانی كليل.

٢-(وَشَقَ-الرَجُلُ. يَشِقُ. وَشْقاً): خێرای كرد/ گورجی كرد.

(اَلواشـــق) (فا): ئەوەی (زوو/ خێرا) دەروات و تێدەپەرێــت وەك تەمـــەن و چاخ/ زەمان/ سەردەم.

(اَلواشِق) : ١-جۆرە شــيرێك/ كەمەكە شيرێك ٢-واشە.

وشك: (وَشُكَ وَ وَشَّكَ الأَمرُ. يَوشُكُ. وشْكاً وَ وَشــاكَةً): كارەكە خێرابوو زوو هاتە بەرەوە/ نزيك بووەوە/ گورج بوو.

(أَمرٌ وشــيك): كارێكە نزيك/ خەريكە بێتە بەرەوە/ زۆری نەماوە بێت.

(واشَــكَ. مُواشَــكَةً): خێرا/ گورج رۆيشت و زۆر نزيك بووەوە.

(أَوشَكَ): خێرابوو زۆر نزيك بووەوە/ هێندەی نەمابوو/ وەختەبوو/ هاكا بگات/ خەريكە.

(«أَوشَــك أَن يَموتَ»): خەريكــی مردنبوو/ لــە مــردن زۆر نزيكبوو/ هێنــدەی نەمابوو بمرێت.

(أَوشَكَ): نزيكبووەوە/ هاكا.

(اَلوَشْــك والوُشْــكَو الوَشْــكان والوِشْــكان وَالوُشكات): خێرايی/ گورجيی.

(اَلوشاك): خێرايی/ گورجيی.

(اَلوَشيك): (بۆ نێر و مێ) ١-زۆر نزيك ٢-خێرا/ زوو/ بە پەلە.

(«خَرَجَ وَشيكا»): خێرا دەرچوو/ دەرپەری.

وشل: ١-(وَشَــلَ-الماءُ يَشِلُ. وَشْلاً وَ وَشَلاناً): ئاوەكە كشا/ رۆيشت و دڵۆپەی كرد.

(-وُشُولاً): بێهێز و نەبوو بوو.

(أَوشَلَ-الماءَ): ئاوەكــەی بە كەم هاتە بەرچاو، بە كەمی دانا.

(-حَظُّهُ): بــەش و بەركەوتی ئەوی كەمكرد و بێنرخيكرد.

(اَلواشِــل (فا)-مِــنَ الجِبــال): كێوانێك كە ئاويان هێشتا لێدەچۆرێت.

(«فُلان واشِلُ الرَأْيِ»): فيسار رابێهێزو كزە.

(«هُوَ واشِــلُ الحَــظ»): ئــەو كەمبەختە و كەمبەشە.

(اَلوَشَــل (ج) أَوشــال): ١-كــەم(ضــد) يان فرمێســكی كــەم ٢-كەمەكــە ئاوێــك كە لە تاوێرێك يان لە شاخێك بێتەرێ و بدڵۆپێت/ دڵۆپە بكات.

(الوَشَــل) (ضد): ١-ئاو يان فرمێسكێكی زۆر ٢-ئاو يان فرمێسكێكی كەم.

(«جاءَ القَومُ أَوشــالاً»): بــەرودوا/ يەك لە دوای يەك/ يەك بە دوای يەكدا هاتن.

(عُيُونٌ وَشْــلَة): كانياوێكی/ سەرچاوەيەكی كەمئاو.

(اَلوُشُول): کەمدەرامەتبوون/ کەمدەستبوون/ ناتەواویی.
(ناقَةٌ وَشُـــولٌ) (ضد): ١ـمێحوشتری کەمشیر. ٢ـمێحوشتری فرەشیر/ زۆر بەشیر.
٢-(وَشَلَ-إلَيهِ يَشِلُ وُشُـــولاً): لێی پارایەوە/ لێی لالایەوە.
(اَلوَشَل): سام و ترس.
(وَشَمَ-اليَدَ يَشِمُ وَشماً): خاڵی لە دەستیدا کوتا. بـــە دەرزی دەرزیناژنیکرد و پاش ئەوەی تەنیی خستە سەر شوێنی خاڵ کوتانەکە بەوە خاڵ یان هێڵ و وێنە و ئەوەی دەیانەویست دەرکەوت
(وَشَّمَ الغُصنُ): گەڵایگرت.
(-اليَدُ): خاڵ و هێڵی لەسەر دەستی دەرکرد.
(أوشَـــمَ-المَكانُ إيشــاماً): شـــوێنەکە گیاکەی دەرکەوت و پەیدا بوو.
(-الكَـــرمُ): مێوەکـــە کەوتـــە ڕەنـــگ کردنی بەرەکەی.
(-الشيبُ في رأسِـــهِ): مووی سپی قژی سەری گرتەوە.
(-البَرقُ): بروسکەکە وردە وردە/ کەمەکێك شەوقیدایەوە.
(-تِ السَماءُ): ئاسمان چەخماخەیدا.
(-تِ الجارِيَةُ): کەنیزەکەکە بناغەی مەمکی دانا/ مەمکی کەوتە دەرکەوتن.
(-في عـــرضِ فـــلان): جنێوی بە نامووســـی فیساردا و ئابرووییبرد.
(-في الأَمـــرِ): لە کارەکـــە ورد بووەوە و بیری لێکردەوە.
(«أوْشَمَ يَفعَلُ كذا»): دەستی بە کارەکە کرد.
(إسْتَوشَمَ إسْتِيشــاماً): داوای خاڵکوتانیکردو ویستی بۆی بکوتن.
(اَلوَشـــم (مص) (ج) وُشُوم وَ وِشَام): خاڵ و میل کوتان کە لەسەر پێست دەکوترێت ]تۆزی دووکـــەڵ/ تەنیی[ دەخرێتە ســـەر پێســـت و دەرزینـــاژن دەکرێت بەوە خاڵ و میلی شـــین دەردەچێت.
(اَلوَشْـــم): ١ـخاڵ و میل کوتان. ٢ـســـەرەتای رووەکی تازە دەرهاتوو.
(اَلوَشـــمَة): ١ـجارێـــك خـــاڵ و میـــل کوتان ٢ـدڵۆپە بارانێك.
(اَلوَشِيمَة): خراپە/ بەدیی و دوژمنایەتی.
(بَينَهُما وَشـــيمَةٌ): لە نێوانیاندا شەڕە قسەو خراپەو دوژمنایەتیی هەیە.
وشن: (تَوَشَّنَ-الماءُ): ئاوەکە کەمبوو/ کەمیکرد.
(اَلوَشْـــن): ١ـهەڵەت/ زەویی/ بڵند/ بەرزایی ٢ـحوشتری قەبە و ئەستوور.
(اَلأَوشَـــن): کەســـێك کـــە هەڵدەکوتێتـــە لای یەکێـــكو دەچێتـــە ســـەر خوانەکـــەیو خواردنەکەی لەگەڵ دەخوات.
وشي: ١-(وَشى-الثَوْبَ. يَشي. وَشْياً. وِشْيَةً): بەرگەکەی/ جلەکەی ڕەنگکردو نەخشـــاندو بە چنینو نیگارکردنی ڕازاندیەوە.

(-الكَلامَ): درۆی له قسەکەدا کرد.
(-بـهِ الى المَلِك وَشْـياً وَ وِشـايَةً): لای شـا بوختانی بۆ کرد و بەدزمانیی دژ کرد/ درۆی بۆ هەڵبەست.
(وَشَی-هُ ثَوباً): بەرگێکی لەبەرکرد.
(-الثَوبَ): جلەکەی بە ڕەنگ و نیگارو چنینی جوان ڕازاندەوە و قەشەنگ کرد.
(-الـكَلامَ): درۆی له قسـەکەدا کردو بە درۆ ڕازاندییەوە.
(أَوشـی-المَكانُ. إيشاءً): شـوێنەکە بە پەڵەی گیا ڕازایەوەو جوانبوو.
(-تِ النَخْلَـةُ): سـەرەتای فەریکـە خورمای لێدەرکەوت.
(-المَعـدِنُ): کانزاکـە کەمێـك زێـڕی تێدا دۆزرایەوە.
(تَوَشَّـی): ڕەنگـین و ڕازاوە و نیگارکێشـراو بوو.
(-الشـيبُ فِي رَأْسِـهِ): مووی سەری سپی بوو مووی سپی سەری گرتەوە.
(اِسْتَوشـی-المَعدِنُ): کانزاکە کەمەکێك زێڕی تێدا دەرخست.
(الواشِـي) (فـا) (ج) (واشـون وَ وُشـاة): ١-بوختانکەر/ قسەچن/ بەدزمان ٢-جۆلا.
(الشِيَةُ (مص)(ج) شِيات ): ١-هەر ڕەنگێك کە لە هەموو ڕەنگی شـتەکە نەچێت و جیابێت. ٢-نیشانە.

(الوَشِي) (مص) (ج) وِشاء) : ١-ڕەنگ و نیگاری بەرگ. ٢-بەرگی ڕازاوەو نیگار کێشراو.
(وَشـيُ السَـيفِ): بریـق و باقی شمشـێر/ شەوقدانەوەی شمشێر.
(اَلوشـاة): کەسـانێك کە پارەی زێڕ/ سکەی زێڕ لێدەدەن.
(اَلوَشّـاء): ١-زۆر بوختانکـەر/ زۆر بەدزمان زۆر قسەچن ٢-فرۆشیاری بەرگی نەخشێنراو و/ نیگارکێشراو.
(اَلأَشْـيَة): ئـەوەی پەڵـەی ڕەنگاوڕەنگـی پێوەبێت یان بەڵەك بێت.
(«ثَورٌ اَشيَة»): گای بەڵەك.
(فَرَسٌ اَبْلَق): چارەوێیەکی بەڵەك.
(وَشَوِيٌ): بەڵەکاویی.
(وَشَـوِيٌ-بَنو فُلانٍ يَشِيُ وَشـياً وَ وِشايَةً): فیسار بەرە زۆر بوون.
(أَوشـی-الرَجُلُ إيشاءً): ئاژەڵەکەی زۆربوو و زاوزێیان کرد.
(-الشـيءَ): ١-شـتەکەی دەرهێنا ٢-شتەکەی زانی.
(-الفَرَسَ): چارەوێکەی تیژ کرد و هانیدا
(-الدواءُ المَريضَ): دەرمانەکە نەخۆشـەکەی چاککردەوە.
(-فِي الدراهِمِ): شتێکی پارەکەیبرد.
(اِيتَشی- العَظْمَ اِيتِشاءً): شکاویی ئێسقانەکە خۆی گرتەوە/ یەکی گرتەوە.

(إستوشى-الفَرَسَ): چارەوێكەی هاندا.
(-الحَديثَ): بۆ فەرمایشتەكانی پێغەمبەر گەڕا و كۆیكردنەوە.
(-الرَّجُلَ): ١-سواڵی لە پیاوەكە كرد و چی لە دەستیدا بوو لێیوەرگرت.
(اَلواشي (ج) واشُون وَ وُشاة): ئاژەڵدارێكی زۆر یان خاوەن منداڵێكی زۆر.
(اَلوَشاء): حوشتر زۆریی.
وصّ: (وَصَّ-العَمَلَ. یَوُصُ. وَصّاً): كارەكەی باش دامەزراند.
(وَصَّصَ-تِ المَرأةُ وتَوصیصاً): ژنەكە پەچەكەی/ رووپۆشەكەی هێنایەوە یەك و قایمكرد.
٢-(وَصْوَصَ-عَینَهُ):١-چاوی (هێنایەوە یەك/ تەسك كردەوە) تا باش بڕوانێت ٢-لە درزێكی/ كونێكی پەچەكەیەوە ڕوانی/ تەماشایكرد.
(-الجَرو): تووتكەكە چاوی كردەوە/ چاوی تروكاند.
(-تِ الجارِیَةُ): كەنیزەكە كە لە ژێر پەچەكەوە هەر چاوی دەبینرا.
(اَلوَصْوَص و الوَصْواص (ج) وَصاوِص وَ وَصاویص): ١-كونێك لە پەردە و شتی وەهادا كە هێندەی چاو لێوەی بڕوانێت ٢-(پەچە/ رووپۆش)ی بچووك.
(اَلوَصاوِص): بەردی سەرزەویی بڵندو دەركەوتوو.

وصأ: (وَصِئَ. الثَوبُ. یَوْصَأُ وَصَأً): جلەكە چڵكن و پیسبوو.
وصب: ١-وَصَبَ. یَصِبُ وُصُوباً: درێژەی كێشاو وەك خۆی مایەوە/ بنجبەستبوو.
(-الدَینُ): كاتی دانەوەی وامەكە هات و پێویستبوو.
(-علی الأمرِ): لەسەر كارەكە سەرومڕ بوو و باش هەڵی سووڕاند.
(وَصِبَ وَ وَصُّبَ. یَوصَبُ وَصَباً): نەخۆشكەوت.
(وَصِب (ج) وَصابی وَ وِصاب): نەخۆش.
(واصَبَ-علی الأمرِ): سەرومڕ خەریكی كارەكە بوو و بەرینەدا.
(أوصَبَ): نەخۆشكەوت
(أوصَبَ-اللهُ فُلاناً): خودا فیساری نەخۆش خست.
(-الرَّجُلُ): پیاوەكە منداڵی نەخۆشی خستەوە.
(-الشيءُ): شتەكە سەرومڕ بنجبەستبوو.
(-علی الأمرِ): لەسەر كارەكە سەرومڕ خەریكبوو.
(تَوَصَّبُ): ١-نەخۆشكەوت ٢-ئازاری پەیدا كرد
(اَلواصِب): بەردەوام/ درێژخایەن ١-هەمیشە/ سەرومڕ ٢-بنجبەست.
(اَلواصِبَةُ): ١-مێی وشەی (اَلواصِب) ٢-بیابانێكی بەرفراوانی دوور كە بێپایان بێت.

(اَلْوَصَب: (ج) أَوصاب): نەخۆشـیی و ئازاری درێژخایەن/ هەمیشـەیی و لاواز و بێهێزیی لەش ٢-شـەكەتیی زۆر و لـەش كفت بوون و لەش خاوبوونەوە.

(اَلْمُوَصَّـب): مرۆڤـی دەردەدار/ دەرداویی كە گرفتاری چەند نەخۆشیی و ئازارێك بێت.

٢-(الوَصَب (ج) أَوصاب): پەنجەی بالآبەرزە/ بەرزە لووتە.

وصد: ١-(وَصَدَ. يَصِدُ وَصْداً): بنجبەستبوو/ جێگیر بوو.

(-الثَوبَ): بەرگەكەی چنی.

(-بالمَكان): لە شوێنەكەدا مایەوەو نیشتەنیبوو.

(وَصَّدَ-الثَوبَ): جلەكەی چنی.

(أَوصَدَ-البابَ): دەرگاكەی داخست.

(-القِدرَ): سەری مەنجەڵەكەی نایەوە.

(-على فلان): فیساری تەنگەتاو كرد/ تەنگی پێهەڵچنیو شەكەتیكرد.

(أَوصَدَ واسْـتَوصَدَ): گەورێكـی بەردینی لە شاخەكەدا بۆ ئاژەڵەكە دروستكرد.

(اَلوصاد): ١-دەرگا داخستن ٢-نانەوەی سەری مەنجەڵ.

(اَلوَصَّاد): چنەر/ بەرگچن بەرەچن جۆلاً.

(اَلوَصِيد (ج) وُصُد): ١-تەسـكیو هاتوومیەك/ زۆر تەسـك ٢-گیا و رووەكی ریشـە نزیك/ بنج پاڵیـەك ٣-ئەشـكەوت ٤-بەردەرگا ٥-حەوشـەی خانو. ٦-شاخ ٧-ئەوەی دووجار خەتەنە كرابێت.

(اَلوَصِيْد وَ الوَصِيْدَة (ج) وَصائِد): خانووی بەردین وەك گـەور لە ناو شـاخدا بۆ ئاژەڵ دروسـت بكرێـت (اَلْمُوَصَّـد) الخِدر: بەشـی ئافرەتان كە جیایە لە خانوەكەدا.

٢-وَصَّدَ-الكَلْبَ بِالصّيدِ): بۆ گرتنی نێچیرەكە هانی سەگەكەیدا.

(أَوصَدَ-الكَلْـبَ بِالصَّيـدِ): سـەگەكەی لـە نێچیرەكە تیژ كرد.

٣-(وَصَّدَ-فُلانـاً): فیسـاری ورياكـردەوەو ئاگاداریكردەوە.

وصر: اَلوِصْر (ج) أَواصِر): پەیمان.

(اَلوِصْـر و الوَصِـيرَة و الأَوصَـر): ١-چـەك ٢-الحُجَّة: دەفتەری كڕین و فرۆشتن/ وصل (دەڵێن ئەم وشانە بێگانەن و كراون بە عەرەبی).

وصع: (وَصَعَ-الشيءَ يَصَعُ. وَصْعاً): شتەكەی ونكرد.

وصف: (وَصَفَ-الشـيءَ يَصِـفُ. وَصْفاً وصِفَةً): نیشانەكانی شتەكەی هەڵدا و باسیكرد/ ناساندی.

(-الشيءَ): شتەكەی لەبەرچاو شیرینكرد.

(-الطبيبُ لِلمَريض): پزیشكەكە چارەسەری بۆ نەخۆشەكە دیاریكرد.

(-الفَرَسُ وُصُوفـاً): چارەوێكە ڕەوتی خۆش بوو/ باش ڕۆیشت.

(وَصُفَ-الغُلامُ. يُوْصُفُ. وَصافَةً):مێردمنداڵەكە گەیشتە تەمەنی كاركردن و بە باشیش كاریكرد.

(وَصِيف): مێردمنداڵی بەردەست وەروێركە.

(الإيصــاف وَ الوَصافَة): بەردەســتیکردن بە تەمەن گەیشــتنی مێرد منداڵ و بەردەستیی کردنی/ کارگوزاریی.

(واصَفَ-هُ): بە نەبەدییە شتەکەی بەکڕیارێك فرۆشــت هەر بە ناونیشــان هەڵدانی شتەکە فرۆشتنی.

(أوصَفَ-الغُــلامُ إيصافــاً): مێردمنداڵەکــە گەیشتە تەمەنی کارگوزاریی و بەردەستیی.

(تَوَصَّفَ-وَصِيفــاً أو وَصِيفَةً): نۆکەرێك یان کارەکەرێکی ڕاگرت.

(تَواصَفَ-القَومُ الشيءَ): خوێشگەل شتەکەیان بۆ یەکتری نیشان هەڵدا و بە یەکتریان ناسی.

(إتَّصَفَ-الشيءُ): توانرا نیشانی شتەکە هەڵدەن و بەرچاوی بخەن/ شتەکە خۆی نواند.

(-الرَجُــلُ): پیاوەکە بــە چاکیی و پیاوەتیی ناسراو و دیاربوو.

(-بالصِفــاتِ الحَمِيدَةِ): خاوەنی ناونیشــانی باشی وابوو کە پێی بناسرێت.

(إسْــتَوصَفَ-فُلاناً الشَيءَ): لە فیساری خواست کە نیشانی شتەکەی بۆ هەڵبدات و باسی بکات.

(-الطَبيبَ): لە پزیشکەکەی خواست کە ئەو دەرمانانــەی بەکاری دێنێــت کامانەن و چۆن بەکاریان بهێنێت.

(-ألغُلامُ): مێرد منداڵەکە گەیشــتە تەمەنی بەردەستیی و کارگوزاریی.

(ألصِفَة) (مص): ١-نیشــانە/ مــاك/ ئەوەی کــە نیشــانەدارەکە پێــی دەردەکەوێت وەك جوانیی و زانســت و ئەو نیشانە و خاڵەی کە نیشانەدارەکە دەنوێنێت و پێی دەناسرێت.

(ألصِّفاتِيّة): تیپێکن دەڵێن: خودا خەسڵەت و نیشانەی نییە تەنها پێ لە بوونی خودا خۆی دەنێن.

(ألصِفاتِــيّ): یەکێکــە لەو تیپە کە باســمان لێکردن.

(ألوَصْفِيَّة): چۆنیەتیی نیشــانە دەرخستن و هەڵدان و باسکردنی نیشانەکان.

(ألوَصّاف): ١-شــارەزای نیشانەی ئەو کەسە و ئەو شتەو باش باسکردنی ٢-پزیشك.

(ألوَصِيــف (ج) وُصَفــاء (م) وَصِيفَــة (ج) وَصائِف): مێردمنداڵ یان کچ کە نەگەیشتبێتە تەمەنی باڵقبوون و بەردەستیی بکات.

(ألمُستوصَف): چارەســەرخانەی نەخۆشیی/ خەســتەخانەی بچــووك. کــە بــۆ ڕاوێــژە پرســەی هەمــوو جــۆرە نەخۆشــییەکە ٢-خەســتەخانەیەکی تایبەتیــی بچووکــە (کلینیك).

ألمُلحَق

وصــف: (الوَصف): باســی نیشــانەکانی ئەو کەســە یان ئەو شــتە بکەیت و نیشــانەکانی دەربخەیت.

(«وَصــف حیــاة بَحّــار»): باســی ژیانــی دەریاوانێك.

(«وصف مُغامرات»): باســی سەرکێشــیی‌و خۆهاویشتنە مەترسییەوە.

(تصویر الشيء وتمثیله في مجمله شفهيّاً أو کتابَةً): هێنانە بەرچاوی شتێك‌و نواندنی بە جۆرێکی گشتی بەدەم یان بە نووسین.

(وَصف مَشهَد): باسکردن و لێدوانی بەشێکی شانۆگەرییەك.

(اَلوَصف-في الأَدَب): هونەرێکی وێژەییە سا هۆزان بێت/ شـیعر بێت یان پەخشان بێت. ئەویش بە هێنانە بەرچاوی سروشــت و وێنە نواندنی وەك چۆن نووسەرەکەی بە هەستی خۆی و دەربڕینی بە شێوەیەك کە لە دەروونیدا ورووژابێت و گینگڵی پێــوە خواردبێت و بە ئەندێشــە و خەیاڵی بێتە بەرچاوی «بوحتــوری یەکێکە لەو هۆزانڤانانەی کە نیشانەکاریی دەکەن‌و کردبێتیان».

(اَلوَصْفَة): ڕەچەتەی پزیشك.

(تَقَیَّد بِوُصْفَةِ الطَبیب): بە پێی ڕەچەتەکەی پزیشك کار بکرێت.

(اَلوَصفَة): ئەوەی کە پزیشك بۆ چارەکردنی نەخۆشەکە دەینووسێت.

(حفظ جمیــع الوَصفات الطِبیَّــة في عُلبَةٍ صَغــیَرة): هەموو ڕەچەتە پزیشــکییەکان لە قوتوویەکی بچووکدا بپارێزرێت.

وصل: (وَصَلَ-الشــيءَ بِالشَّــيءِ یَصِلُ وَصْلاً وصِلَــةً وَصُلَةً): شــتەکەی بە شــتەکەی تر گەیاند و پێکەوە بەندیکردن‌و گرێدیکردنەوە.

(-هُ بِأَلفِ دینارٍ): وەك خێر/ بەخشین هەزار دیناری دایە.

(-زیــداً. وَصْــلاً وصِلَةً): چاکــەو پیاوەتیی لەگەڵ زەیدیدا کردو بە بەخشین دایە.

(-رَحِمَهُ): چاکەی لەگەڵ کەسە نزیکەکانیدا کرد/ میهرەبانیــی لەگەڵدا کردن‌و کۆمەکیی کردن‌و دەستیگرتن.

(-فُلانــاً): لەگــەڵ فیســاردا پەیوەندیــی خۆشەویســتیی پەیدا کردو پێــی لێنەبڕی‌و هاتوچۆیکرد/ پەیوەندی بەهێزکرد.

(-إلى المَكانِ وُصُــولاً وَ وُصْلَةً و صِلَةً): تەواو گەیشتە شوێنەکە.

(«وَصَلَنــي الخَبَــرُ وَ وَصَلَ إِلــيَّ الخَبَرُ»): هەواڵەکەم گەیشتێ/ هەواڵەکەم پێگەیشت.

(«ضَرْبَــةٌ لا تُوصَلُ»): پێداکێشــانێك پێدا کێشا کە تیمار نەکرێت/ چار نەکرێت.

(وَصَّلَ-الشيءَ بِالشَّيءِ): شتەکەی بە شتەکەی ترەوە بەندکردو بەستەوە.

(وَصَّلَ وَ أَوصَلَ-فُلاناً الی کذا): فیساری بەوە گەیاند/ گەیاندییە ئەوە و لەگەڵیدا ڕۆیشت.

(واصَلَ-الشيءَ وَ في الشيءِ وِصالاً وَ مُواصَلَةً): لەســەر شــتەکە ڕۆیشــت بێ پچڕ خەریکی ئەنجامدانیبوو/ دەســتی لێ هەڵنەگرت/ وازی لێ نەهێنا.

(واصَلَ-هُ): لەســەر پەیوەندیی و دۆستایەتی لەگەڵیدا ڕۆیشت و پەیوەندیی نەپچڕاند.

(تَوَصَّلَ-إلى كذا): گەیشتە ئەوە/ پێی گەیشتو کۆتایی پێهێنا.

(-إلى فُلان): بۆ بەفیسار گەیشتن سۆزو خۆشیەوستیی دەربڕیو نواند.

(تَواصَلَ الرجلانِ): دوو پیاوەکە بەیەك گەیشتن و پەیوەندییان قایم و پەیدا کرد و نەیانپچڕاند.

(إتَّصَلَ-بالشَيءِ): بە شتەکە گەیشت پەیوەندبوو و بەری نەدا.

(-إلَيهِ): گەیشتیِ و کۆتایی هات.

(-بيَ خَبَرُ فُلان): هەواڵی فیسارم گەیشتیِو پێمزانی.

(-فُلانٌ بِالوَزِيرِ): فیسار لە خزمەتی وەزیردا بوو/ بوو بە کارگوزاری.

(-الى بَنـي فُلان): بوو بە یەکێك لە فیسار بەرە/ بە هی ئەو بەرەیە ناسرا.

(إسْتَوْصَلَ): ١-داوای گەیاندنی کرد ٢-داوای کرد پەیوەندیی هەبێت ٣-داوای کرد بگاتە شتێك.

(ألصِلَـةُ (مص) (ج) صلات): ١-پەیوەندی کردن/ پەیوەندی ٢-بەخشین، خەڵات/ چاکەو پیاوەتی.

(ألوَصْل)(مص): ١-گەیاندن ٢-پێکگەیاندن/ پێوەنووسان.

(لَيلَةُ الوَصْل): دوا شەوی مانگی عەرەبی

(حَرف الوَصل عِنـدَ أهل القوافِي): گەیاندن لەلای هۆزانڤانەکان و خاوەن سەرواکان پیتی (واو) (یێ) یان (ئەلف) یان (هێ) کە لە پاش پیتی دوایی بزوێنداری شیعرەکەوە دێت.

(«هذا وَصْلُ هذا»): ئەمە لە شێوەی ئەوەیە/ وەك ئەوەیە.

(ألوُصْـل و الوِصْل (ج) أوْصَال): ئەندامێکی تەواوی لەش و هەر ئەندامەی جیا لەویتر.

(ألوُصْلَة (مص)(ج) وُصَل): ١-پێکگەیشتن/ پەیوەندیکردن ٢-گەیەنەری دووشت بەیەك ٣-زەویی دوور ٤-هاوڕێیان/ هاوکاروانان/ هاوگوزەران/ هاودەمان.

(ألوَصُول): ١-پەیوەندی گەرم یان خێرخواز/ زۆر بەخشندە.

(ألوُصول): (مص) (ج) وُصُولات)(ت): پسوولە/ پەتە/ کاغەزی پارە پێگەیشتن یان کەلوپەل وەرگرتن و پێگەیشتن لە یەکێکەوە بۆ یەکێکیتر.

(ألوُصولِيّ): چاوچنۆك/ خۆپەرست/ خۆکوت کەسێکە چاوچنۆك خۆی بۆ ئامانجێك دەکوتێت هەرچی چۆنێك بێت و بە هەر ڕێگایەك بێت بیگاتێ.

(ألوُصُولِيَّة): خۆکوتیی و چاوچنۆکیی.

(وَصِيلُ الرَجُلِ): کەسێکە یان شتێکە کە هەمیشە هاوڕێی پیاوەکەیەو لەگەڵیدا.

(«هـذا رَجُلٌ وَصِيلُ هـذا»): ئەمە پیاوێکە وەك ئەوە/ سێبەری ئەوە.

(ألوَصيلَة (ج) وَصائِل): ١-ئەوەی کە شـتێك بگەیەنێت بلكێنێت ٢-كلآفەی رستن ٣-زەویی پان و بەریــن و دوور (وەكو بە زەویی ترەوە نووسابێت) ٤-تەلار و ئاوەدانیی. ٥-فەڕ و بێرو بوون چونكە خەڵك كۆدەكاتەوە و بەیەكیەوە دەگەیەنێتو دەنووسێنێت ئەگەر وشكەساڵو نەبوونی بێت خەڵك پەرش و بڵاو دەبێتەوە) ٦-مێــی وشــەی (الوَصیــل) ٧-هاوڕێیــی/ هاوكاروانی/ یاران.

(ألوَصِیلَة)(ج) وَصیل وَ وَصائِل): بەرگێكی میلداری یەمەنییە.

(إتِّصالُ النیِّرَین) (فك): بەیەك گەیشــتن و بەرامبەر بوونی خۆر و مانگ.

(ألمَوْصِل):١-شوێنی بەیەكگەیاندن و بەیەكەوە گرێدان و بەســتنی پەت/ گوریس و شتی تر ٢-(مَوصِلُ البَعیر)-نێوان سمت و ڕانی حوشتر. ٢-مەردن ٣-شاری موســڵ كە لە نێوان عێراقو جزیرەدایە.

(ألمَوصِلان): موسڵو جزیرە.

(المَوصُول)(مفع): ١-گەیەنراو ٢-مۆریچەیەكە وەك زەردەواڵە بە خەڵكەوە دەدات.

(ألمُستَوصِل): كەسێكە كە حەز لە پەیوەندی دەكات و بەدوایدا دەگەڕێت.

(المُســتَوصِل مِنَ النِّساء): ژنێكە حەز دەكات كــە قژی بگاتە قــژی ئافرەتی تر وەك ئەوی لێ بكات.

ألمُلْحَق

(وَصْــل: ألإیصال): گەیاندن/ وەســل پەتە. كاغەزێكــە كە دانــی پارەیــەك و وەرگرتنی دیاری دەكات یان گەیاندنی شــتێك بە دەستی خاوەنەكەی نیشان دەدات.

(«لَدَيَّ إیصالٌ مِنكَ»): پەتەیەكم پێیە كە لە لایەن تۆوە دراوەمەتێ.

(ألمُواصَــلات): ناوێكــی گشــتییە بــۆ هــۆی پێگەیانــدن و بەیەكگەیشــتن و پەیوەندیی وەك ڕێگەی ســەر زەوی و ئاسمانی و دەریایی و هاتوچۆ و تەلەفۆن و برووسكەو هیتر.

(قَطــع خُطــوط المواصــلات): بڕینی هۆی هاتوچۆ و بەیەكگەیشتن.

(ألمُوَصِّــل (ج) مُوَصِّــلات): تەنی گەیەنەری تــەزووی كارەبــا و گەرمیــی بەرامبەرەكەی نەگەیەنەرە.

---

وصــم: (وَصَمَ-العُــودَ أَو العَظــمَ. یَصِــمُ. وَصْماً): درزی كردە چیلكەكە یان ئێسقانەكە بێئەوەی دیاربێت.

(-الشيءَ): ١-خێرا شتەكەی شەتەكدا/ بەست ٢-خەوشداریكرد.

(وَصِّمَ-الرَجُلُ): تووشــی لــەش داهێزران و شكستییو خاویی بوو.

(-فُلاناً): ئازاری بە فیســار گەیاندو لەشــی داهێزراندو تەمەڵیكرد.

(-تِ الحُمَّی فُلاناً): تاكە ئازاریدایە

(تَوَصَّــمَ. تَأَلَّم): هــاواری ئازاریکرد/ ئازاری پەیداکرد.

(تَواصَمَ-القَــومُ): خەوشــیان لــە یەکــتری دەرهێنــا و گــرت/ کەموکووڕییان لە یەکتری دەرهێنــا. (اَلوَصْم (مص)(ج) وُصُوم): ١-درز کردنە ئێسقان و چێو بێ ئەوەی دەرکەوێت ٢-گرێی چێو ٣-حەیا و نامووس چوون و ئابڕوو چوون.

(اَلوَصَم): نەخۆشیی/ دەرد.

(اَلوُصْمَةُ): ١-لەش داهێزران و خاوبوونەوەی/ سســتیی لــەش ٢-نەنگیــی و ئابڕووچوون/ شووڕەیی.

(اَلوَصیــم): بۆشــایی نێوان پەنجــە تووتەو براتووتە.

(اَلمَوصوم)(مفع): (لەکەدار خەوشدار) کراو. («رَجُلٌ موصومُ الحَسَب»): پیاوێکە خەوش لە ڕەسەنەکەی دەگرن/ بە نارەسەن و نەنگی دادەنێن.

وصــي: ١-وصی-الشــيءُ بِهِ. یَصــي وَصْیاً: شتەکەی پێگەیشت.

(-الشيءَ بآخَر): شتەکەی بەویتر گەیاند.

(-المَکانُ وَصْیاً وَ وَصاءَةً): گیاکەی گەیشــتو شوێنەکەی هەموو گرتەوەو چڕیدایەیەك.

(-النَبــتُ): گیاکــە/ ڕووەکەکــە زۆربــووو بەیەکداچوو/ یەکیگرت.

(وَصّی-فُلانــاً بِکَذا تَوصِیَةً): ١- فیســاری بۆ ئەوە ڕاســپاردو کردیە گەردنی ٢-ئەنجامدانی ئەوەی پێسپارد.

(-إلی فُلان): فیســاری کرد بە سەرپەرشتیار بە وەســـی پــاش مردنی بەســـەر دارا و ماڵو موڵك و منداڵەکانیەوە.

(-فُلانــاً بِوَلَدِهِ): منداڵەکەی بەو ســپارد کە ئاگاداریی بکات و لەگەڵیدا میهرەبان بێت.

(-إلَیهِ بالصَلاة): فەرمانیدایە کە نوێژ بکات («وَصّاهُ بِفُلان أن یُحسِنَ إلَیه»): فەرمانیدایەو ڕایســپارد کە ئاگای لە فیســار بێتو چاکەی لەگەڵدا بکات، کۆمەکی بکات.

(«وَصَّیتُ لَهُ بِکَذا»): وەسیەتم کرد کە پاش مردنم ئەوەو ئەوە بۆ ئەو بێت و بیدەنێ.

(واصی-البَلَدُ البَلَدَ): وڵاتەکە دۆســتایەتیی‌و پەیوەندیداریی وڵاتەکەی تری کرد.

(أَوصی-فُلانــاً بِکَــذا إِیصاءً): ١-ئــەوەی بە فیسار سپارد و گرتیە ئەستۆی ئەو ٢-فەرمانی ئەنجامدانی ئەوەی دایە.

(-لَهُ بِکَذا): وەســیەتی کرد کە پاش مردنی خۆی ئەوەی بدەنێ.

(-إلَیهِ): کردی بە وەسیی.

(تَواصی-القَومُ. تَواصِیاً): خوێشــگەل بوون بەسەرپەرشتیاری یەکتری.

(إِسْــتَوصی-بِفُلانٍ إِسْــتِیصَاءً): ڕاســپاردەو وەسێتی فیســاری وەرگرتو قایلبوو/ بوو بە وەسیی ئەو.

(اَلوَصاة (ج) وَصـىً و الوَصايَة والوِصايَة):
١-لاسكى دارخورما/ پەلى دارخورما كە گەلاّى پێوە نەبێت و شتى پێ دەپێچرێت ٢-وەسيەت/ راسپاردە.
(اَلوَصِيّ (ج) اَوصِياء): (بۆ نێر و مێ) وەصى/ پێسـپێردراو. كە چاودێريى و سەرپەرشـتى كردنى دەخرێتە ئەستۆ.
(اَلوَصِيَّة (ج) وَصِيّ): لاسكى رووتى دارخورما شتى پێ شەتەك دەدەن.
(اَلوَ صِيَّة (ج) وَصايا): وەسيەت/ راسپاردەى مـردوو و ئـەو شـتانەى كە ئـەو دەربارەى رادەسپێرێت و وەسيەت دەكات.
(«هذه وَصِيَّتُهُ»): ئەمە وەسێت و راسپاردەى ئەوە/ هى مردووەكەيە.
(وَصايـا اللهِ): ئـەو فەرمانانـەى كـە خودا داويەتـى و كردوويەتـى بە ئەرك پێويسـت بەسەر شانى بەندەكانيەوە.
٢-(وَصَى. يَصِي وَصْياً): سوك و رسوا بوو كە لەوەو پێش پايەدار و بەرز بوو.
وضـأ: (وَضَـأَ-ەُ يَضَـأُ. وَضْأً): لـەو پاك و تەميزتر و جوانتر بوو.
(وَضُؤَ-الشـيءُ يَوضُـؤُ وُضُـوءً وَ وَضاءَةً): شتەكە پاك و جوان بوو.
(وَضَّأَ-ەُ بالماءِ تَوضِئَةً): بە ئاو شـتى و پاكى كردەوە.
(واضَأَ-ەُ): لەو جوانتر و پاكتر بوو.

(«واضَأَهُ فَوَضَـأَهُ»): بۆربۆرێنى پياكانكرد/ لە پاكىو جوانيدا بـۆرى ئەويداو لەو پاكترو جوانتر بوو.
(تَوَضَّأَ-بالماء لِلصَّلاةِ): بە ئاو دەستنوێژى شت.
(-الغُـلامُ و الجَارِيَـةُ): مێردمنداڵەكـەو كەنيزەكەكە بالّق بوون/ پێگەيشتن.
(اَلوَضُوء): ئەو ئاوەى دەستنوێژى پێدەشۆن/ ئاوى دەستنوێژ.
(اَلوَضِـيْ (ج) وِضاء وَ اَوضِياء والواضِئ (ج) وَضاَة و الوَضـاء (ج) وُضّاؤُون وَ وَضاض): (پاك/ تەميز)ى جوان.
(اَلأَوضَأُ): جوانتر و تەميزتر/ پاكتر.
(اَلميضاة والميضاءَة): شـوێنى دەستنوێژشتن ٢-ئەو شـوێنەى كە خۆتى لىّ پاك دەكەيتەوەو دەستنوێژى لێدەگريت.
(اَلمُتَوَضَّأُ): ئاودەسـتخانە/ شـوێنى خۆ پاك كردنەوە/ ئاودەست.
وضـح: (وَضَحَ و تَوَضَّـحَ و اتَّضَحَ-الأَمرُ اَو الـكلامُ) يَضِـحُ ضَحَةً وَ ضِحَـةً وَ وُضُوحاً: كارەكە يان قسـەكە دەركـەوت/ كەوتەروو/ ئاشكرابوو/ روون بووەوە.
(واضِـحٌ وَ وَضّـاحٌ): ديار/ ئاشـكرا/ روون/ دەركەوتوو.
(وُضِحَ. يَوضَحُ. وَضَحاً): چڵكن و پيس بوو و پەڵەى سپى گرتبوو.
(وَضَّحَ-الأَمرَ): كارەكەى ئاشكرا و روون كرد.

(أَوضَحَ-الأمرُ): کارەکە ڕوون و ئاشــکرا بوو/ دەرکەوت.

(-الأمرَ): کارەکەی ڕوون کردەوە و دەرخست/ ئاشکرایکرد

(-تِ الشَــجَّة فِي الرأسِ): شــکانی ســەرەکە ئێسقانەکەی دەرخست.

(-فِي رَأسِــهِ): ســەری بە جۆرێك شــکاند کە ئێسقانی کاسەی سەری دەرخست.

(«من أَينَ أَوضَحتَ»): لە کوێوە دەرکەوتیت و دەرپەڕیت.

(إستَوضَحَ-عَنِ الأمرِ إستيضاحاً): بۆ کارەکە گەڕاو سۆراغیکردو بۆی پشکنی.

(-هُ الأَمــرَ أَو الــكَلامَ): دەربارەی کارەکە یان قســەکە لەوی پرسیو داوای لێکرد بۆی ڕوون بکاتەوە/ تێی بگەیەنێت.

(-الشــيءَ وَ عَنِ الشيءِ): دەستی خستە سەر برۆی تا بزانێت شتەکە دیارە و دەیبینێت.

(-الشَــمْسَ): دەســتی خســتە ســەر بــرۆی و پێڵووەکانــی هێنایــەوە یەك و تەماشــای خۆرەکەیکرد.

(ألوَاضِح) (فا): ئاشکرا/ دیار/ ڕوون/ زانراو/ پێچەوانەی نادیار و ناڕوون.

(-مِنَ الإبِلِ): حوشتری سپیواشت/ سپات.

(واضح الحَسَــب): ڕەســەنی تــەواو/ باوكو باپیری دیارو دەرکەوتووو پاك.

(ألواضِحَــةُ (ج) واضحــات وَ أَواضِــح): ١-مێی وشــەی (ألواضِح) ٢-ئەو دانانەی کە لە پێکەنیندا دەردەکەوێت.

(ألوَضَح) (مص): ســکە و پارەی بێخەوشو تەواو.

(«دَراهِــم وَضَحٌ»): پارەی تەواو و بێخەوش. (وشــەکە واتا «وَضَح» نە دەکرێت بە مێ نە بە جووت نە بە کۆ).

(ألوَضَح (ج) أَوضاح): ١-(ڕووناکیی/ ڕۆشنایی) بەیان.

(«جــاء فِي وَضَحِ الصُبــحِ»): بــە ڕووناکی بەیانیــی هات. ٢-ڕووناکیی مانگ ٣-ســپێتیی مووی ســەر ٤-ســپێتیی قولەپێــی چارەوێ و سپێتیی ناوچەوانی ٥-پەڵەی سپیی لە پێستدا ٦-شیر و ماســت ٧-خشڵی زیوین ٨-پاوانەی پێ ٩-سەوزە و گیای تازە دەرهاتوو.

(وَضَحُ الطَريق): ناوەڕاســتی ڕێگە/ شوێنی دیار و ئاشکرای ڕێگا.

(-القَدَم): سپێتیی سنگی پێ.

(أَوضاحٌ مِــنَ الناسِ): کۆمەڵانێکی خەڵك کە لە خێڵی جیا جیان (وشەکە تاکی نییە).

(ألوَضَحَةُ) (ح): ماکەر.

(ألوَضّاح): ١-ڕەنگ ســپی ٢-ڕووگەش و جوان ٣-دەم بە پێکەنین و ڕووخۆش ٤-ڕۆژ.

(ألنَّسَبُ الوَضّاح): ڕەسەنی/ ڕەچەڵەکی دیارو پاك.

(بِكْرُ الوَضّاح): نوێژی بەیانی.

(اَلوَضِيْحَـــة (ج) وَضائِح): مالآت/ پاتاڵ وەك مەرو بزن‌و مانگاو حوشتر.
(اَلمُتَوَضِح)(فا): ١-ئاشــكرا و روون/ دیار بوو/ دەرکەوتوو ٢-کەسێکی دەرکەوتوو و دیار ٣-ئەو کەسەی کە بە ناوەراستی رێگەکەدا دەروات.
(-مِــنَ الإبِــل): حوشــتری رەنــگ ســپات/ سپیواشت.
وضــخ: (وَضَخَ-الدَلْـوَ يَضِــخُ. وَضْخـاً): دۆلکەکەی نیوەپر ئاو کرد.
(واضَخَ-هُ وِضاخاً وَ مُواضَخَةً): لە ئاودان یان راکردن یان رۆیشتندا ئەوی بەزاند.
(أوضَخَ-الدَلـوَ): ١-(ســەتڵەکە/ دۆلکەکە)ی نیوەپرئاو کرد ٢-ئاوێکــی کەمی بە دۆلکەکە دەرهێنا.
(-تِ البِئرُ): چاڵاوەکە ئاوی کەمیکرد.
(تَواضَخَ-القَومُ): خوێشکەلەکە لە ئاودەرهێنان یان راکردن یان رۆیشتندا پێشبرکێیان کرد.
(اَلوَضوخ): ١-ئاو تا نیوەی دۆلکەکە/ سەتڵەکە ٢-ئەو شتەی ئاوی پێ هەڵدەکێشن.
وضر: (وَضِرَ. يَوضَرُ. وَضَراً): ١-چەپەڵبوو/ پیسبوو/ پۆخڵبوو ٢-رۆناویبوو.
(وَضِرٌ (م) وَضِرَةٌ وَ وَضْرى): ١-چڵکن/ پیس/ پۆخل/ چەپەڵ ٢-چەور بوو.
(«فُــلان وَضِرُ الأخلاقِ وَ في أخلاقِهِ وَضَرٌ): فیســار رەوشتپیســە بەدیــی و پیســیی لــە رەوشتیدا هەیە/ بەدخووە/ بەدرەوشتە.

(وَضَّرَ-هُ): پیس‌و پۆخڵیکرد.
(«کانَ نَقِــيُّ العِــرضِ فَوَضَّــرَهُ بِالدَّنــاءَةِ»): بەناموســبوو بــە کــردەوەی پیس‌و ناشــیرین‌و بەدرەوشتیی ناموس خۆی لەکەدار کردو شکاند.
(اَلوَضَــر) (مــص) (ج) أوضــار): ١-چڵکــی چەوریی ٢-ئاوی شــتنی لەگەن و قاپ‌و شتیتر ٣-پاشماوەی چێشت کە بە قاپەوە بە لەگەنەوە دەمێنێتەوە.
(اَلوَضْرى): کۆم/ قنگ/ بن/ قوون.
وضــع: (وَضَــعَ-هُ يَضَعُ وَضْعاً): ١-ســووك و رســوایکرد/ زەبوونیکــرد ٢-سەرشــۆڕیکرد/ کەساسیکرد.
(-عُنقَهُ): کێشای بە ملیدا.
(-الحَديثَ): ئاخاوتنی بە زمانی پێغەمبەرەوە دانا و هەڵبەست و درۆی کرد.
(-الكِتابَ): پەرتووکی دانا.
(-السلاحَ في العَدُوِّ): لەگەڵ دوژمندا جەنگی/ چەکی لە دوژمن هەڵبڕی.
(-يَدَهُ عَن فُلان): دەستی لە فیسار هەڵگرت‌و وازی لێهێنا.
(-الجِنايَــةَ عَــن فُلان): تاوانەکــەی لە ملی فیسار داماڵی.
(-عَصــاهُ): لە رۆیشــتن کــەوت راوەســتاو نیشتەنیبوو.
(-تِ المَــرأةُ خِمارَهــا): ژنەکــە پەچەکــەی (هەڵدایەوە/ لادا).

(هی واضِعٌ): ئەو ژنە بێپەچەیە.
(وَضَعَ-الشـيءَ بَينَ يَدَيه): شتەکەی خستە بەردەستیو داینا.
(-يَدَهُ فِي الطَّعام): دەستی خستە چێشتەکەوەو خواردی.
(-الجزيــةَ أَو الحَـربَ): باجەکەی لەســەر هەڵگرت یان شەڕەکەی ڕاگرت.
(-الشَــيءَ. وَضعــاً وَ مَوْضَعــاً وَ مَوْضِعــاً وَ مَوْضُوعاً): ١-شــتەکەی دانا ٢-لە شــوێنێکدا جێگیریکرد.
(-الشيءَ مِن يَدِه): شــتەکەی فڕێدا/ تووڕدا یان داینا.
(-مِن فُلان): فیســاری بێڕێزو ڕســوا کرد/ پایەی نزمکردەوە.
(-عَــن غَرِيمِــهِ): شــتێکی کەمی لــە وامی سەروامگرەکە داشکاندو بەخشی.
(-البَعِيرُ وَضعاً وَ مَوضوعاً): سەری دانەواند و کەوتە پەلە.
(-نَفْسَــهُ) وَضعاً وَضَعَةً و ضِعَةً وَ وُضوعاً): خۆی سەرشۆڕو ڕسوا کرد/ کەساس کرد.
(-تِ المَــرأَةُ حَمْلَها. وَضعاً وَ وُضعاً وَ تُضعاً): ژنەکە منداڵەکەیبوو/ سکەکەی دانا.
(واضِع): ژنی منداڵبوو/ زاو.
(وَضِــعَ وَ وُضِــعَ-فِي تِجارَتِــهِ. يَوْضَعُ ضَعَةً وَ ضِعَــةً وَ وَضيعَــةً): لــە بازرگانیەکەیــدا زیانیکرد.

(مَوْضُــوعٌ فِي التجــارة): زیــان لێکەوتــوو/ زیانکردوو تیایدا/ لە بازرگانیدا.
(وَضُــعَ. يَوْضُعُ و ضِعَةً. ضَعَــةُ وَ وَضاعَةً): بەدخواز بــوو، نامەرد بوو. یان هەر خۆی لە بنەڕەتدا(نارەسەن/ناجست)بوو/ناکەسبەچە بوو ٢:هەڵگیرابووەوە و بەخێوکرابوو/ باوکی دیار نەبوو کێیە و ڕەسەنی کێیە.
(وَضَّعَ-الشيءَ): شتەکەی گونجاندو پێکیەوە ناو دروستکرد.
(-الجُبَّةَ): ناواخنــی لۆکەی بۆ جبەکە کردو درووی.
(-النَعامَةُ بَيضَها): وشترمرخەکە هێلکەکانی ڕێکخست.
(-الرَجُلَ): پیاوەکەی سەرشۆڕکردو زەبوونی کرد.
(وَضَعَ-هُ وِضاعاً وَ مُواضَعَةً): گرەوی لەگەڵدا کرد.
(-هُ فِي الأَمرِ): لەسەر شتەکە ڕێککەوتن/ پێکهاتن.
(-هُ البَيــعَ): فرۆخت و ســەوداکەی لەگەڵدا بڕی و نەیکرد/ وازی لێهێنا.
(-هُ الرِهانَ): مەرجکاریی‌و گرەوەکەی لەگەڵدا هەڵوەشاندەوە و نەیکرد.
(«هَلُمَّ أُواضِعُكَ الرَأْيَ»): وەرە ڕای خۆتم بۆ دەربخە و ڕای خۆمت پێدەڵێم.
(أَوْضَعَ-البَعِــيرُ): حوشــترەکە خێرایکرد لە ڕۆیشتنەکەیدا گورجبوو.
(-البَعيرَ): خێرای بە حوشترەکە کرد.

(-فِي تِجارَتِهِ): له بازرگانیەکەیدا زیانیکرد.
(تَواضَعَ): ١-خۆی کەساس و سەرشۆڕ پیشاندا ٢-بێفیز و بێهەوابوو.
(-تِ الأَرضُ): زەویەکە نزمبوو.
(-القَومُ على كذا): خوێشگەل لەسەر ئەوە ڕێککەوتنو پێکهاتن.
(-ما بَينَنا): نێوانمان دوور بووەوە/ دوورکەوتەوە.
(إتَّضَعَ): ١-سەری شۆڕ کرد ملی بێچارەییدا خۆی بەدەستەوەدا ٢-بێهەواو فیزیی نواند ٣بەدخوازبوو/ ڕسوابوو/ ناکەسبەچە بوو.
(-البَعيرَ راكِبُهُ): سوارەکە ملی حوشترەکەی دانەواند تا قاچی بخاتە سەر ملی و سوار بێت.
(إسْتَوضَعَ-مِنهُ إستيضاعاً): ١-داوای لێکرد کۆڵەکەی لە کۆڵ بکاتەوە ٢-داوای لێکرد وازی لێ بهێنێتو لە کۆڵی بێتەوە.
(-هُ فِي دَينِهِ): داوای لە وامدەرەکە کرد کە وامەکەی بۆ دابشکێنێت/ کەمی کاتەوە.
(ألواضِع) (فا) (امرأةٌ واضِع): ١-ئافرەتی بێپەچە/ ڕووبەرەڵا ٢-ئافرەتێك منداڵەکەی دانابێتو بووبێت/ زەیستان
(ناقَةٌ واضِعٌ): مێحوشترێك لە لەوەڕگایەکی شۆرەکاتدا مابێتەوە و بلەوەڕێت.
(ألوَضْع (مص)(ج) أوضاع): ١-دانان ٢-جێگە/ شوێن ٣-بار/ دۆخ. ٤-منداڵبوون.
(الوَضْعَةُ وَ الوِضْعَةُ): شوێن/ جێ/ جێگە و مەڵبەند/ جەرگە/ چەق.
(ألوَضيع): ڕسوا/ سووك/ نزم/ بێ بایەخ/ خوێریی ٢-سپاردە.
(«وَضَعْتُ عِندَهُ وَضِيعاً»): سپاردەیەکم لا دانا/ شتێکم پێ سپارد.
(ألوَضيعَة (ج) وَضائِع): ١-ئەوەی لە نرخێك یان ژمێرەیەك دادەشکێنرێت ٢-سپاردە ٣-گیای زەویی شۆرەکان ٤-ئەو باج و خەراجەی کە شا دەیسێنێت و وەری دەگرێت ٥-کەسێك بە درۆ خۆی بەرێتە سەر رەسەنیتر ٦-کۆمەڵە سەربازێك کە بۆ جەنگ نابرێن و پارێزگاریی شوێنانی تری پێ دەکەن ٧-پەرتوکێك کە پەند و وتەی دانا و بە نرخی تێدا تۆمار کرابێت ٨-کەمنەکوتاو لەگەڵ ڕۆندا دەکرێت بە چێشت.
(ألوَضائِع): باروبنەی قورسی کاروانکەرانو گوزارکەران.
(ألتَوضيع)(مص): نەرمو شلبوونو بێدەسەڵاتیی.
(«فِي كَلامِهِ توضيعٌ»): قسەکانی بێدرکییو مێینانەیە.
(ألمَوْضَع وَ المَوْضِع (ج) مَواضِع): شوێنی دانان/ جێ/ جێی شت بەجێهێشتن.
(ألمَوضِع أو المَحَل الهَندَسي): شكل تنفرد نقاطه أو خطوطه (هـ): بخاصِيَّةٍ دون سواها مِن النقاط أو الخطوط): جێ یان ئەندازگە شێوەیەکە خاڵ و هێڵەکانی جیان لە هیتر ناچن.

(الموضوعــة: دعــوى هندســية يؤخذ بها دون برهــان): داوايەكــى ئەندازەييــە كارى پێدەكرێت بەبێبەڵگە.

(اَلمَوضِعَة): شوێن/ جێ/ جێگە

(«لَهُ فِي قَلْبِي مَوْضِعَةٌ وَ مَوقِعَةٌ»): لە دڵمدا جێی خۆی هەیە و خۆشەویستە.

(اَلمُوَضَّع)(مفع): شكاو و پارچەپارچە كراو

(المَوْضُوع (ج) مَواضِيع وَ مَوضُوعات)(مص): ١-دانراو ٢-دروستكراو/ هەڵبەستراو ٣-بابەت/ باس/ ئــەو مادەیەی كە قســەكەر و وتاربێژ لێی دەدوێت.

(مَوضُوعُ العِلم): بابەتی زانســت: ئەوەیە كە تیایــدا لــەوە دەدوێت و نیشــانە خۆییەكانی دەخاتە بەرچاو وەك لە پزیشكیدا باسی لەشی مرۆڤ دەكرێت.

(مَوضوعُ الكَلام): باسێك كە لە ئاخاوتنەكەدا لێی دەدوێن.

(اَلأَحاديثُ المَوْضُوعَة): حەدیســە درۆكان كە دانران و بە زمانی پێغەمبەرەوە دەیگێرنەوە

(اَلمَوضُوعَة)(هــ): دعوى هندســية يؤخذ بها دون برهــان): گوتەیەكی ئەندازەییە كە لەســەری دەڕۆن و وەریدەگرن بێ سەلماندن/ بەڵگەنەویستە.

اَلمُلحَق

ضع: (اَلوَضْعِيَّة أَو المَذهَبُ الوَضعِي): ڕێڕەوی چۆنیەتیــی/ بــارودۆخ. (ڕێــڕەوی ئۆگســت كۆنت)ە كە دەڵێت زانیاری لەســەر ڕووداو و ئەزموون و تاقیكردنەوەی زانستیی بێت نەك لەسەر كورۆكی شت/ گەوهەری شت).

(اَلمَوضوعِيَّــة): بێلایەنی و ئامانجی ڕووت و پاك بێت لە ڕا و هەڵوێستدا. یەكەمین نیشانە و ماكی ڕەخنەگری بێلایەن و ئامانجی ڕووت و پاك بێت لە ڕەخنەكەیدا.

(المَوضوعِيَّــة- فِي الفَلْسَــفَة): ڕێڕەوێكــە لە فەلســەفەدا دەڵێــت: ڕاســتییەكی ڕووت و بێلایەن هەیە كە لــە دەرەوەی خۆی مرۆڤی (وشیاردایە/ پێزاندایە).

وضف: (وَضَفَ وَ أَوضَفَ-البَعيرُ يَضِفُ وَضْفاً): حوشترەكە (خێرایكرد/ چابووكبوو).

---

وضــم: (وَضَمَ-اللَّحْــمَ يَضِــمُ. وَضْمــاً): گۆشــتەكەی خســتە ســەر تەختە دەستگای لەتكردن.

(-القَومُ. وُضُوماً): خوێشــگەل كۆبوونەوەو لەیەك نزیك بوونەوە.

(-بنو فُــلان على بَني فلان): فیســار بەرە دابەزینە لای فیسار بەرەیتر.

(أَوضَم-اللَّحْمَ وَ لِلَّحْمِ إِيضاماً): بۆ لەتكردن گۆشتەكەی خستە سەر تەختە دەستگاكە.

(-الشَّجَرَ): پەلەكانی درەختەكەی خستە سەر یەكتر.

(إِســتَوْضَمَ-هُ إِسْتِيضَاماً): ســتەمی لێكرد/ زۆرداریی بەرامبەر كرد.

(ألْوَضَم (ج) أوضَام وَ أوضِمَة): كۆتەی قەساب كە گۆشتی لەسەر لەت و كوت دەكرێت.
(«تَرَكَهُم لَحْماً على وضم»): بە لەتوكوت كراویی بەجێی هێشتن/ لێی كوشتن سەرشۆڕ ڕسوای كردن.
الوَضَم: ١-هەر شتێك كە خرابێتە سەر زەوی و گۆشتەكەی خرابێتە سەر وەك تەختە و حەسیر و شتی تر ٢-خوان و سفرەی نانخواردن.
(ألوَضْمَة): كۆمەڵە خەڵكێك كە نزیكەی دووسەد كەس بن.
(ألوَضيمَة=الوَضْمَة): ١-كۆمەڵە خەڵكێكی نزیك دووسەد كەس ٢-نان و چێشتی پرسە.
(ألمِيضَمَة (ج) مَواضِم): شوێندانانی تەختە دەستگای قەساب.
٢-(الوَضِيم): نێوان پەنجەی برای تووتە و دۆشاومژە.
وضن: (وَضَنَ-الشيءَ يَضِنُ وَضْناً):
١-شتەكەی لە پاڵ یەكدا ڕێكخست و ڕیز كرد یان لەسەریەك هەڵیچنی ٢-بەسەریەكدا نووشتانیەوە/ چەمانیەوە ٣-چەندانەی كرد.
(-النِسْعَ): گوریسەكەی هۆنییەوە.
(تَوَضَّنَ-لَهُ): ١-سەری بۆ شۆڕكرد و كەساسیی نواند ٢-خۆشەویستیی بەرامبەر نواند.
(إتَّضَنَ-بِهِ): پەیوەندیی لەگەڵدا كرد.
(ألوَضين (ج) وُضُن)= ألموضُون: ١-لەسەریەك هەڵچنراو یان لە پاڵ یەكدا ڕیز كراو و ڕێكخراو. ٢-تەنگەی وڵاخ كە لە چەرم یان لە موو دەكرێت وتراوە كە (الوَضين) : بۆ كەژاوە بەستنەوە وەك تەنگەی بەستنەوەی زین.
(ألمَوضُونَة): زرێی سفتچنراو یان چنراوێكی مرواریچنە.
(ألمِيضَنَة (ج) مَواضِن): دەفرێكە وەك جەواڵە لە گەڵای دارخورما دروست دەكرێت
(ألميضانَة (ج) مَواضين): قوڵینەی قیرین.
وطّ: (وَطَّ-الوَطْواطُ يَوَطُّ وَطّاً): شەمشەمەكوێرە كە زیكاندی/ دەنگی لێوە هات.
(-ألمَحْمَلُ): كەژاوەكە جیڕەی لێوە هات.
٢-(وَطْوَطَ): ١-بێهێز بوو/ بوودەڵە بوو ٢-پلتەپلتیكرد و قسەكەی بەسەر یەكدادا/ بە پەلە قسەی كرد.
(الوَطْواط): پیاوی بوودەڵە و كەمناوەز و بێڕا ٢-كەسێك بە پەلە قسەبكات و قسە قووت بدات.
(ألوَطْواط (ج) وَطاوِط وَ وَطاويط) (ح): ١-شەمشەمەكوێرە ٢-(ح) چەوڕۆكە كە لە شاخدا هەیە و وەك پەرەسێلكەیە.
(ألوَطْواطَة): ١-ئەو ژنەی كە بە پلتەپلت قسە دەكات قسەكە بەسەر یەكدا دەدات و قسەكە قووت دەدات ٢-ژنی شاتە شاتكەر.
وطأ: وَطِئَ- (الشيءَ بِرِجْلِهِ يَطَأُ وَطْأً): پێی لە شتەكە نا/ شتەكەی (بەژێر پێوە كرد/ بە پێ شێلا).

(-الفَرَسَ): سواری چارەوێکە بوو.
(-أَرضَ عَدُوِّهِ): چووە خاکی دوژمنەکەیەوە/ پێی خستە خاکی دوژمنەوە.
(-الشيءَ): شتەکەی ئامادە و تەخت و خۆش و ئاسان کرد.
(وَطُؤَ-المَوضِـعُ. يَوْطُؤُ وَطـاءَةً وَ وُطُوءَةً): شـوێنەکەن پێخوست بوو نەوی و نەرم بوو/ تەخت بوو.
(وطَّأَ-الشـيءَ بِرجلِـهِ تَوطِئَـةً): پێـی بە شتەکەدا نا و شێلای/ شتەکەی ژێرپێنا.
(-الفراش): نوێنەکەی ڕاخست نەرم و شل و خۆشیکردو ئامادەیکرد.
(-الأَمرَ): کارەکەی ئامادەو خۆشکرد/ ئاسان کرد.
(-المَوضِعَ): شـوێنەکەی نزم و تەخت و چاك کرد
(-الشِعْرَ وَفيهِ): سەرواکان و واتای شیعرەکەی دووپات کردەوە.
(واطَأَ-فُلانـاً علـى الأَمر مُواطَـأَةً): لەگەڵ فیسـاردا ڕێککـەوت/ پێکهـات و بـوو بـە هاوبەشی.
(-في الشِعْرِ): سەروای هەڵبەستەکەی دووپات کردەوە (بە واتا و وشەیەوە)
(أَوطَأَ فُلاناً الأَرضَ و بِالأَرضِ إِيطاءً): وای لە فیسـار کرد کە زەویەکە بشێلێت/ پێخوستی بکات.
(-هُ فَرَسَهُ): سواری ئەسپەکەی خۆیکرد.

(-هُ على الأَمرِ): لەسەر کارەکە/ لە کارەکەدا لەگەڵیدا ڕێککەوت.
(-الشِعْرَ و في الشِعْرِ): سەروای هۆزانەکەی بە واتا و وشەوە دووپات کردەوە.
(تَوَطَّأَ-فُلانـاً بِرجلِـهِ): پێی لە فیسـار نا/ فیساری خستە ژێر پێی خۆیەوە.
(-الرجُلَ على الأَمرِ): لەگەڵیدا لەسەر کارەکە ڕێککەوت.
(-هُ علـى الأَمـرِ): لەگەڵیدا لەسـەر کارەکە پێکهات/ ڕێککەوت.
(تَواطأَ-القَـومُ على الأَمرِ): لەسـەر کارەکە پێکهاتن/ ڕێککەوتن.
(إتَّطَـأَ و إِتَّطَاءَ-الشـيءُ إِبتَطَـأَ و إِبتِطاءً): شتەکە (ئامادەو ئاسانبوو) گونجا.
(-الأَمرُ): کارەکە ڕاسـت و خۆش ڕۆیشـت و گەیشتە (کۆتایی/ ئەنجامی خۆی).
(إِسْتَوطَأَ-الشـيءَ): شـتەکەی دی ئامـادە و ئاسانە و نەرمە گوزەرینی خۆشە.
(اَلواطِئَةُ): خورمای وەریو.
(اَلواطِئَةُ والوَطْأَةُ): خوێنشـگەلێك کە بەڕێدا تێپەڕیبن/ ڕێبواری ڕێ.
(اَلطَأَةُ والطِئَةُ): ١-ئاسانیی و نەرمیی/ شلیی ٢-نزمی و تەختی شوێنەکە و نەویویی.
(اَلـوَطْء): (مـص): ١-پێدانـان/ پێلێنـان ٢-تەخت کردن ٣-جووت بوون/ سـوار بوون/ لاقە کردن.

(اَلوَطْء وَ الوَطاءَ): زەویی نەویو/ نزم و تەخت.
(اَلوَطْأَة): ١-جارێك پێلێنان/ شێلان/ پێ پێدانان. ٢-جارێـك لاقەكـردن/ سـوار بـوون ٣-جێپێ ٤-پەستاوتن‌و توند گوشین و توندگرتن.
(اَلوِطـاء وَ الوُطـاء): دۆشـەك و ئەوەی كە رادەخرێت.
(اَلوَطـاءَة والوُطـوءَة) (مص): ١-سـووك و ئاسانیی ٢-نەرمیی/ شلیی.
(«أنا أُحِـبُّ وَطاءَة العَيـش»): من حەز لە ژیانی ئاسان و نەرم دەكەم/ بێگرێ‌و گۆڵ.
(الوَطِيء): ١-نزم/ نەوی/ چاڵ ٢-ئاسان، نەرم و شـل و خـۆش ٣-نەرم كراو/ خـۆش كراو/ ئامادە كراو كە بتوانیت لەسەری خۆ هەڵگێڕ و داگێڕ بكەیت/ تەپاوتل بكەیت.
(اَلوَطيئَة): ١-مێی وشەی(الوَطِيء) ٢-خورما كە دەنكەكەی دەردەهێنرێت‌و لەگەڵ شـیردا دەشـێلرێت ٣-پەلّوولە/ ئـارد رۆنی دەكرێتە سـەر و لێدەنرێت ٤-شـیر كە دەترشێنرێت‌و دەبەسترێت‌و شەكراویی دەكرێت.
(اَلمَوْطَأ و المَوطِئ): جێپێ/ شوێنپێ/ پێگا.
(المُوَطَّأ):(مفع): تەختكراو/ ژێر خراو/ نەرمكراو.
(«رَجُـلٌ مُوَطَّأُ الأَكنافِ»): پیاوێكە رەفتار و رەوشت نەرمە/ جوامێرە/ میوان پەروەرە
(«هُوَ مُوَطَّأُ العَقِب»): ئەو هەمیشە خوێشكەل بە شوێنیەوەن/ بەدوایەوەن‌و خەڵكێكی زۆرن ئەوانە.

(اَلمیطَـأ): زەویـی نـزم/ نەویـو و تەخت و خۆش.
اَلْمُلْحَق
وطأ: (اَلتَوطِئَة-في الشِعر): دووپات كردنەوەی سەروا بە وشە و واتاوە
(-في الإنشـاء والتَأليف): پێشەكیی پەرتووك یان لێكۆڵینەوەیەك.

---

وطـب: (اَلوَطْـب): ١-مەمكـی گەورە و شـۆڕ ٢-پیـاوی/ وشـك/ توند و تیـژ و نەزاندوو/ كەرتر.
(-(ج) أَوطُـب وَ وِطـاب و أَوْطاب و (جج) أَواطِب): مەشكە/ جەوەندە.
(«صفرت وِطابُهُ»): مەشكە و جەوەندەكانی وشـك بوونەتەوە/ وشـك هەڵگـەڕاون واتا: كـوژراوە یان مردووە.(اَلوَطْباء): ژنی مەمك گەورە.
وطح: (وَطَحَ-هُ يَطِـحُ. وَطْحاً. وَطِحَةً): بە هەردوو دەست توند پاڵی پێوەنا.
(تَواطَحَ-القَومُ): خوێشكەل خراپەیان بەرامبەر یەك كرد یان لەگەڵ یەكدا كەوتنە جەنگەوە/ بەگژ یەكدا چوون/ لە یەك هەڵپڕژان.
(-تِ الإبِلُ على الحَوضِ): حوشترەكان لەسەر گوڵەكە كەلەكەیان كرد/ شەرەشـانیان كرد/ چربـوون.(اَلوَطَح)(مـص): قورو پیسـی‌و شتیتر كە بە سم‌و چنگەوە دەلكێت.
وطد: (وطَدَ-الشـيءَ يَطِدُ وَطْداً): شتەكەی

قايــم كــرد و جێگــير كــرد و دايمەزراند و پتەوىكرد.
(فالشيءُ وطيدٌ وَ مَوطُودٌ):شتەكە بنجبەست و دامەزراوە/ جێگير و پتەوە
(-الأَرضَ):زەويەكــەى پركردەوە و كوتايەوە تا پتەوبێت.
(-الشــيءَ إلَيــهِ):شــتەكەى ختەســەرى/ دايەپاڵى و پێوەى چەسپكرد.
(-لَهُ مَنزِلَةً):پايەيەكى بۆ ئامادەكرد.
(-هُ إلى الأَرضِ):چەقاندىو بەلاى زەويەكەدا لارى كردەوە توندىكرد.
(-الشــيءُ)(ضد):١-شتەكە بنجبەست و قايم و دامەزراو بوو ٢-شتەكە لەرزۆك و بن فشەڵ بوو.
(-الصَخرُ علــى الغارِ): تاوێرەكانى لەســەر ئەشكەوتەكە هەڵچنى.
(وَطَّدَ الشــيءَ):شتەكەى جێگيرو پتەو قايم كرد.
(تَوَطَّدَ): چەسپ بوو/ بنجبەست و قايم بوو
(«وَطَّدَهُ فَتَوَطَّدَ»): بنجبەســتيكردو قايمو چەسپبوو.
(«تَوَطَّــدَت لَهُ عِندَهُم مَنزِلَةٌ»):پايەى ئەو لاى ئەوان بنجبەستو قايم بوو.
(الواطِد وَ الوَطِيد وَ المَوطُود): بنجبەســت/ چەسپ/ دامەزراو/ جێگير.
(الأَوطاد):شــاخان/ كێــوان/ كەژان/ چيايان (لەبەر جێگيريىو بنجبەستييان).
(الوَطيدَةُ (ج) وَطائِد):١-(بناغە/ بنچينە)ى خانوو يان پايە يان ستوون ٢-سێپاى مەنجەڵ
(«أَنْــتَ مِن وطائِــد الحَقِّ»):تۆ ســتوون و راگرى هەقيت/ راستييت.
(«لَــهُ عِندَهُ وطيدَةٌ»):ئــەو لە لاى ئەمەوە پايەيەكى بەرز و ئەگۆڕى هەيە.
(المِيْطَدَةُ):١-تەختەيەكە بنچينە و ســتوونى خانووەكــە و پايــەى خانووەكەى پــێ راگير دەكرێــت تا خــۆى دەگرێت و قايــم دەبێت ٢-دەسكى كونكەرەكە/ لە تەختەيە/ دارە.
(المُتَواطِــد): ١-بنجبەســت و دامــەزراوى هەميشــەيى/ تەواو چەســپ ٢-توند و پتەو ٣-شتى يەك بە دواى يەكدا هاتوو.
وطــر: (الوَطَر (ج) أَوطار):پێداويســتيى و خواست/ ئامانج/ نياز/ ئارەزوو.
(«قَضــى مِنْــهُ وَطَرَهُ و أَوطــارَهُ»):ئەوەى ويســتى و نيازى بوو لێى دەســتكەوت و پێى گەيشت.
وطس: (وَطَسَ-هُ يَطِسُ. وَطْسـاً):بە پێڵاو يان شتى تر تێرى لێدا.
(-الشــيءَ):شتەكەى شــكاند و كوتاى وردى كرد.
(تواطَسَ-المَوجُ):شەپۆلەكان بەيەكياندا دا
(-القَومُ عَلَيَّ):خوێشــكەل لەســەرم كەڵەكە بوون/ گەلەكۆمەكێيان لێكردم.

(اَلوَطّاس): شوان.

(الوَطيس (ج) اَوطِسَــة وَ وُطُس): ١-تەنوور یان لە شـێوەی تەنووردا، کە وەك چاڵێکە لە زەویدا ٢-پەلاماردان/ بەیەکدادانی جەنگ

(حَمِيَ الوَطيــسُ): جەنگەکە و بەیەکدادان تیایدا گەرمبوو/ توند بوو.

(اَلوَطِیسَــة): ســەختیی و توندی کار/ گەرم بوونیکار.

وطش: ١-(وَطَشَ-هُ يَطِشُ. وَطْشــاً): پیایدا کێشا/ لێیدا.

(-هُ عَنْ فلان): لە فیســاری دوور خستەوەو لێیدا.

(وَطَّشَ-القومَ عَنْهُ): خوێشگەلی لێ دوورخستەوە.

(«ضَرَبوهُ فَما وَطَّــشَ إليهِمْ»): لێیاندا ئەو دەســتی بــۆ نەبــردن و بەرگریی لــە خۆی نەکرد/ دەستی لێ نەکردنەوە.

٢-وَطشَ-الحَديثَ اَو الخَبَرَ يَطِشُ. وَطْشاً): سەرێکی/ کەمەکێکی حەدیسەکە/ ئاخاوتنەکە یان هەواڵەکەی دەرخست.

(-الــكلامَ): قســەکەی دەرنەخســت و روون نەکردەوە.

(«ماوَطِشَ لَنا بِشَيءٍ»): هیچی نەدایێ.

(وَطَّشَ-الحَديثَ): کەمەکێکی ئاخاوتنەکەی دەرخست.

(-فيه): کاری تێکرد.

(-لَهُ): رووی قسەکە و رای خۆی و چۆنیەتیی کارکردن و ئەنجامی کارەکەی خستەروو.

(-هُ): کەمەکێکی دایە.

(«سَألوهُ فَما وطَّشَ إليهِم بِشَيءٍ»): سواڵیان لێکرد/ داوای شتیان لێکرد هیچی نەدانێ.

وطــف: ١-(وَطَفَ. يَطِــف. وَطْفاً): شــوێن نێچیرەکە راکردووەکە کەوت راوینا بیگرێت.

٢-(وَطِــفَ. يَوطَــفُ وَطَفــاً): تووکی برۆ و برژانگی پڕ و چڕبوو/ زۆر بوو.

(اَوطَف (م) طفاء (ج) وُطْفٌ): کەسێکە برۆ و برژانگی زۆر و پڕ و چڕ بێت.

(وطِفَ-المَطَرُ): باران بە خوڕ دایکرد.

(الوَطَــف) (مص): پڕوچــڕ و زۆریی برۆ و برژانگ.

(«فِي السَــحابَةِ وَطَف»): هەورەکە نیشتۆتە زەویەکە و کلکی نزیکی زەویەکەیە.

(اَلوَطْفَةُ): مووی کەم.

(ظَلامٌ اَوطَفُ): تاریکیەکی چڕ هەموو لایەکی گرتۆتەوە.

(سَحابٌ اَوطَفُ): هەورێك کە نیشتبێتە سەر زەوی.

(عامٌ اَوطَف): ساڵێکی بە پیت و فەڕ.

(عَیــشٌ اَوطَــف): ژیانێکی تێروتەســەل و هەرزانیی.

(سَحابَةٌ وَطْفاءُ): هەورێکی قورسی داکەوتووی پڕ باران و ئاو.

وطق: (اَلوطَــاق (ج) وطاقــات) (ترکیە): چادر/ دەوار/ رەشماڵ.

وطم: (وَطَـمَ. يَطِمُ-هُ وَطْمـاً): ١-پێی لێنا ٢-سواری بوو.

(-السِّتْرَ): پەردەکەی دادایەوە.

(وَطِـمَ وَ وُطِمَ-الرَجُلُ يَوطَمُ وَطْماً): باوبڕ و پیسایەکەی دەرنەچوو/ گیرا.

وطـن: (وَطَنَ-بِالْمَـكانِ يَطِـنُ وَطْنـاً): لە شوێنەکەدا نیشتەنیبوو و کردی بە نیشتمانی خۆی.

(وَطَّنَ-نَفْسَـهُ على الأَمـرِ وَ لِلأَمرِ): خۆی ئامادەی کردنی کارەکە کرد و خۆی بۆ تەرخان کرد/ زۆری لە خۆی کرد کە کارەکە بکات.

(-البَلَدَ): وڵاتەکەی کرد بە نیشتمانی خۆی

(واطَـنَ-هُ على الأَمـرِ): نیازی کـرد کە لە کارەکەدا کۆمەکی بکات.

(أَوطَـنَ- بِالْمَـكانِ. إِيطانـاً): لـە شـوێنەکەدا نیشتەنیبوو مایەوە و کردی بە نیشتمانی خۆی.

(أَوطَنَ و اتَّطَنَ و اسْتَوطَنَ-البَلَدَ): وڵاتەکەی یان شارەکەی کرد بە نیشتمانی خۆی.

(تَوَطَّنَ-ت نَفسُـهُ على كـذا): خۆی/ دەروونی ناچاری ئەنجامدانی ئەو کارە بوو یان ئەوە بوو.

(-البَلَـدَ): (وڵاتەکـەی/ شـارەکەی) کرد بە نیشتمانی خۆی.

(اَلوَطَــن (ج) أَوطان): ١-نیشـتمان/ جێیەك تیایدا لەدایك بووبێت یان نەبووبێت و تیایدا بژی و نیشتەجێ ببێت ٢-شوێنی تێدا مۆڵدان و بەستنەوەی (ماڵیات/ پاتاڵ).

(اَلمَوطِــن (ج) مَواطِــن): ١-جێــی بــوون ٢-نیشــتمان/ شــوێنی نیشــتەنی ٣-شــوێنی مۆڵدانــی ئــاژەڵ ٤-دیدگــەی/ دیمەنــی تێکبەربوونێکی مەیدانیی جەنگ.

(اَلمُواطِن): هاونیشتمانیی/ هاووڵاتیی.

(اَلمِيطــان): ١-شــوێنی ناردنــی ئەســپ بــۆ پێشبرکێی غاردان ٢-ئامانج.

اَلمُلحَق

وطن: (اَلوَطَني): ١-نیشتمانپەروەر ٢-نیشتمانیی/ خۆماڵیــی/ ئەوەی پەیوەندیی بە نیشــتمانەوە بێت.

(اَلنَّشيد الوَطَني): سروودی نیشتمانیی.

(«رَجُلٌ وَطَنِي»): پیاوێکی نیشتمانپەروەر.

(اَلوَطَنِــي): ئەوەی کە ســۆزی نیشــتمانیی تێدا دەردەبڕێت و خۆشەویســتی نیشــتمان دەنوێنێت.

(حَمــاسٌ وَطَنِــي): گەرموگوڕیــی ســۆزی نیشتمانپەروەریی.

(الذي يَهُمُّ البَلَدَ بِأَسـره لا مَنطِقَةً مُعَيَّنَة): ئەو خۆشەویســتیەی بۆ هەموو وڵاتەکە بێت نەك بۆ ناوچەیەکی.

(اَلتَربِيَة الوَطَنِيَّة): پەروەردەی نیشتمانیی.

(مَأْتَمٌ وَطَني): پرسەی نیشتمانیی.

(اَلمُنبَثِق مِـنَ الوَطن/ الذي يُمَثِّلُـهُ أَو يُعَبِّر عَنهُ): ئەوەی لە نیشــتمانەوە هەڵقوڵابێت کە نیشتمان بنوێنێت یان دەربڕەی نیشتمان بێت

(اَلإرادَة الوَطَنِيَّة): خواستی نیشتمانیی.

(«اَلجَمعِيَّة الوطنِيَّة»): پەرلەمان/ ئەنجومەنی نیشتمانیی.

(اَلوَطَنِيَّة): نیشتمانپەروەریی/ خۆشویستنی نیشتمان و بەختکردن لە پێناویدا.

(اَلمُواطَنِيَّة): نیشانەی هاونیشتمان.

---

وطـي: (وطئَ-الشـيءَ تَوطِيَةً): شـتەکەی نزمکردەوە و داینا.

(تَوَطَّى): داکەوت/ نزم بووەوە.

(اَلواطي) (عند العامَّة): لای ڕەشە خەڵکەکە ١- شوێنی نەویو ٢-ڕسوا/ سووك/ نزم.

(«رَجُلٌ واطٍ»): پیاوێکی سووك و بێبایەخ.

(«مكانٌ واطٍ»): شوێنێکی نزم/ نەویو.

وظـب: (وظَبَ-الأمرَ و على الأمـرِ. يَظِبُ وُظُوبـاً): لەسـەر کارەکـە ڕۆیشـت و لێـی هەڵنەپچـڕا/ دەسـتی لێ بەرنـەدا لەسـەر ڕۆیشتوو/ گرتیە ئەستۆی خۆی.

(وظَبَ-الشيءَ. وَظباً): شتەکەی پێشێلکرد/ شتەکەی خستە ژێرەوە.

(واظَبَ-علـى الأمرِ. مُواظَبَةً): دەسـتی لە کارەکـە بەرنەدا/ لەسـەر کارەکە ڕۆیشـت/ بەردەوام بوو/ سەرومڕ کاریکرد.

(-هُ علـى خدمة فـلان): وایکـرد کە هەر لـە کارگوزاریـی فیسـاردا بێت و دەسـتی لێ بەرنەدات ڕایسپارد کە بەردەوامبێت

(تواظَبَ-تْ عَلَيهِ الرياحُ): با هەر تاوەناتاوێك لێی هەڵدەکرد و لە لایەکەوە دەهاتێ.

(اَلمِيْظَب): بەردی خڕی نووك تیژ.

(اَلمَوْظُوب) (مفع): بەسەرداهاتوو.

(«رجُلٌ مَوْظُوب»): پیاوێکە نەهامەتی زۆری بەسـەردا هاتووە و ئەوەی کە بووی لەدەستی چوو.

وظر: (وَظِـرَ. يَوظَرُ. وَظَراً): قەڵەو و لەش پڕ بوو.

(وظِر): قەڵەو و تێکسمڕاو/ لەشپڕ.

وظـف: (وَظَفَ-البَعـيرَ يَظِـفُ وَظْفـاً): ١-پێوەندی حوشـترەکەی کورت کرد ٢-کێشای بـە سـەر و قوولەپێیـدا و خـوار ئەژنۆی/ ئێسقانی لوولاقی.

(-القَـومَ): دوای خوێشـگەل کـەوت (وەکو لوولاقی خـۆی بەرامبەر بـە لوولاقی ئەوان بکات).

(-الشـيءَ على نَفسِـهِ): شـتەکەی خسـتە ئەسـتۆی خۆی/ کردی بە ئەرك بەسەر شانی خۆیەوە.

(وَظَّفَ-هُ): دایمەزرانـد و کاری ڕۆژانەی بۆ دیاری کرد لە کاری میریدا کردی بە کارمەند

(-عَلَيهِ عَمَـلاً): کارێکی بۆ دیـاری کرد کە بیکات و جێبەجێی بکات.

(«وَظَّفَ له اَلرزقَ و لِدابَّتِهِ العَلَفَ»): ڕۆژیی بۆ خۆی بڕییـەوە و ئالیکیش بۆ وڵاخەکەی بڕییەوە.

(«وَظَّفَ على الصَبيِّ كُلَّ يَوم حِفْظَ آياتٍ مِن كتـــابِ الله»): هەموو ڕۆژێك چەند ئايەتێكی نامـــەی خودای بۆ منداڵەكـــە تەرخانكرد كە دەبێت لەبەری بكات.

(وَاظَفَ-هُ): بوو بە هاوڕێی لەگەڵیدا گونجاو بەری نەداو پێكەوە بوون.

(إسْتَوْظَفَ-الشـــيءَ): شـــتەكەی لەبـــن هێنا ٢-هەموو شتەكەی برد ٣-هەموو شتەكەی گرت

(اَلوَظيـــف (ج) وُظُـــف وَ أَوْظِفَـــة): (ع ١): ١-لـــوولاق و لووبازووی حوشـــتر و چارەوێ و هیتر (لە ســـەرو قولەپێ و لە خوار ئەژنۆوە) ٢-پیاوی بە توانا و بە تابوشت لەسەر ڕۆیشتن لە كاتی دڵتەنگیدا.

(«جـــاءَت الإبِـــلُ علـــى وَظيـــفٍ واحد»): حوشـــترەكان وەك قەتار كرابن یەك بە دوای یەكدا هاتن.

(اَلوَظيفَة (ج) وَظائِـــف وَ وُظُف): ئەو كارە یـــان خواردنـــە ڕۆژییـــە كە دیـــاری دەكرێت و دەبڕێتـــەوە و دەدرێـــت ٢-فەرمانبەریی/ كارمەندیـــی و پایە و كاركـــردن لە فەرمانگە میرییەكاندا ٣-پەیمان و مەرج.

(«لِلدُّنْيا وَظائِفُ»): جیهان جۆرتومی هەیە و چەرخی هەیە.

الملحق:

وظـــف: (تَوَظَّـــفَ): بـــوو بـــە فەرمانبـــەر/ كارمەند لە دامەزراوێكی فەرمانگەیی میریدا یان دامەزراوێكی تایبەتیدا.

(اَلْمُوَظَّف): كارمەند/ كەسێكە كارێك دەگرێتە دەســـت لە فەرمانگەیەكدا كە بۆی دیاریكراوە و بە پێی یاســـا بەڕێوەی دەبات ٢-كەسێكە كە لە دامەزراوێكدا یان كۆمپانیایەكدا كاردەكات و مووچەیەكی دیاریكراوی دەدەنێ

(مُوَظَّفو الشركات): كارمەندانی كۆمپانیاكان.

وعّ: (وَعْوَعَ-اَلْكَلْـــبُ أَو ابـــنُ آوى وَعْوَعَةً وَ وَعْواعـــاً): ســـەگەكە وەڕی یـــان چەقەڵەكە لووراندی.

(-القَـــومُ): خوێشـــگەڵ كردیان بـــە (غەڵبە غەڵب/ ژاوەژاو/ دەنگە دەنگ).

(-القَـــومَ): خوێشـــگەڵی ڕاوەشـــاند و تەكانی پێدان.

(اَلـــوَعُّ) (ح): ١-چەقـــەڵ ٢-لـــوورەی چەقەڵ ٣-كورووزانەوە و گریانی ساوا.

(اَلوَعْـــواع) (مـــص): كۆمەڵـــە خەڵكێك كە بیكەن بە غەڵبە غەڵب و ژاوەژاو ٢-چەنەباز/ زۆربڵـــێ ٣-لوورەی چەقەڵ و وەڕین و لوورەی سەگ.

(اَلوَعْـــوَع (ج) وَعاوِع) (ح): ١-چەقەڵ ٢-(ح) ڕێوی ٣-وتاربێژی ڕەوانبێـــژ ٤-بیابانی پان و بەرین و بێئاو/ وشك ٥-پاسەوان.

وعب: (وَعَبَ-الشـــيءَ يَعِبُ وَعْباً): شتەكەی (سەراپا/ هەموو) برد.

(أَوعَبَ-الشـــيءَ إيعابـــاً): ١-ســـەراپا هەمـــوو

شتەکەی برد ٢-شتەکەی کۆکردەوە.

(-الأَمرَ): لە کارەکە بووەوە.

(-الرَّجُلَ): زمانی پیاوەکەی لە بنەوە بڕی

(-الشيءَ فِي الشيءِ): هەموو شتەکەی کرد بە شتەکەی تردا.

(-فِي مالِهِ): سامانەکەی/ داراکەی بە هەموو لایەکدا تەخشانو پەخشانکردو دەستبڵاویی کرد.

(-القَوْمُ): خوێشگەل هەموو چوونە دەرەوە و کەسیان نەما دەرنەچێت.

(إِسْتَوعَبَ الشيءَ. إِستيعاباً): ١-هەموو شتەکەیگرت/ جێی هەموو شتەکەی تێدابووەوە. ٢-هەڵیکەند/ لە بن و بێخی دەرهێنا/ ڕیشەکێشی کرد.

(-الحَديثَ): تەواو گوێی لە حەدیسەکە یان ئاخاوتنەکە گرت و باش تێیگەیشت.

(-المَكانُ أَو الوِعاءُ-الشيءَ): شوێنەکە (یان قاپەکە/ دەفرەکە) شتەکەی گرت.

(أَلوَعْب (ج) وِعاب): ڕێی فراوانو پان.

(أَلوَعيب): فراوان.

(«بَيتٌ وَعيبُ وَ أَوعاءُ، وعيب»): خانوویەکی فراوان یان (قاپێك/ دەفرێك)ی فراوان کە ئەوەی تێی دەکرێت بیگرێت.

(أَلمُوَعَّب): فراوانبوو/ کراوەو گەورە.

(«هذا أَوعَبُ بِكذا»): ئەمە فراوانترە و باشترە بۆ گرتنی ئەوە و تەواو دەیگرێت.

وعث: (وَعِثَ-الطَريقُ يَوعَثُ. وَعْثاً وَ وَعَثاً): ڕێگەکە سەخت و ناڕەحەتبوو/ پێدا ڕۆیشتنی گرانو ناخۆش بوو/ گەنبوو.

(-الأَمرُ): کارەکە تێکچوو/ گەنبوو و ئاڵۆز بوو.

(وَعْثٌ و وَعِثٌ وَ مُوَعَّثٌ وَ أَوعَثُ): کارێکی تێکچووی ئاڵۆز/ بەپەکداچووی گران.

(ت-يَدُهُ وَعَثاً): دەستی شکا.

(يَدٌ وَعِثَة): دەستێکی شکاو.

(وَعُثَ-الطَريقُ. يَوعُثُ وُعُوثَةً): ڕێگەکە سەختبوو پێداڕۆیشتنی گرانبوو.

(-الأَمرُ): کارەکە تێکچوو و گەن بوو ئاڵۆز بوو.

(أَمرٌ وَعْثٌ وَ وَعِثٌ وَ مُوَعَّثٌ وَ أَوعَثُ): کارێکی ئاڵۆزی تێکچوو و گەنبوو.

(وَعَّثَ-هُ عَنِ الأَمرِ. تَوْعِيثاً): لە کارەکەی دوورخستەوە و لایدا، بەری لێگرت.

(أَوعَثَ): ١-کەوتە ڕێگەیەکی سەختو دژوارەوە/ ناڕەحەتەوە ٢-بە ڕێگەیەکی سەخت و گراندا ڕۆیشت.

(-المُتَكَلِّمُ): قسەکەرەکە قسەی بۆ نەهات و بۆ نەکرا.

(-فُلاناً): فیساری ناچارکرد کە بەڕێی سەختدا بڕوات.

(-الرَّجُلُ): پیاوەکە خواردنی خراپی خوارد.

(-الأَمرَ): کارەکەی (گەنکرد/ تێکدا).

(-فِي مالِـهِ): داراگەی تەخشــان و پەخشــان کرد/ دەستبلاوبی تێدا کرد.

(ألوَعْـث (مـص) (ج) وُعـث وَ وُعـوُث): ١-ئێسقانی شکاو ٢-لاوازیی/ لەربی/ بێتوانایی ٣-ســەخت و زبریی و رەقیی ٤-ڕێی سەخت و گران بۆ ڕۆیشــتن/ ڕێی نارەحەت ٥-شــوێنی تەخــت و نەرمان کە قاچ تیایــدا بچەقیت و ڕۆیشــتن پیادا گران و ناخۆشــبێت ٦-هەموو کارێکی دژوار/ سەخت/ گران/ نارەحەت.

(ألوَعْثاء): ١-زەحمەتو ماندوێتی/ نارەحەتیی ٢-هەموو نیشانەو ماکێکی قێزەونو بەد.

(«رَكِبَ الوَعثاءَ»): خۆی هاویشتە خراپەکاریی و گوناهەوە.

(ألوُعُوث): تەنگانەو سەختیو خراپیی.

(ألمَوْعوث): نارەسەن/ ناجسن.

وعــد: (وَعَدَ-فُلانــاً الأمرَ وَ بالأمــر. يَعِدُ. وَعْداً وعِدَةً وَ مَوعِــداً وَ مَوعِدَةً وَ مَوْعوداً وَ مَوعُــودَةً): گفتــی ئەنجامدانــی کارەکەو جێبەجێ کردنی دایە یان گفتی دەستگیرکردنی ئەوەی دایە کە دەیەوێت.

(-تِ الأرضُ): زەویەکە فەڕ و بەرهەمی چاکی لێ چاوەڕوانکرا.

(-الرَجُلَ وَعيداً): هەڕەشەی خراپی لێ کردو گفتی دا کە خراپی بەسەر بهێنێت.

(-الفَحْلُ): کەڵەکە پرمانەی یان بۆڕاندی.

(واعَدَ-هُ مُواعَدَةً): گفتیان بە یەکتریدا.

(-هُ المَوضِعَ أو الوَقتَ): گفتی بینیی شوێنێك یان کاتێکیدایە/ ژوانگەی بۆ دیاری کرد.

(«واعَدَهُ فَوَعَدَهُ. يَعِدُهُ»): لەو باشــتر گفتو بەڵێنی ڕاگرت و بردەسەر.

(أوعَــدَ-هُ إيعاداً): ١-گفتی دایە ٢-هەڕەشــەی لێکردو پێی وت چاوت بە خۆت دەکەوێت.

(تَوَعَّدَ-هُ): هەڕەشەی خراپی لێکرد.

(تَواعَدَ-القَــومُ): خوێشــکەل گفتیــان بــە یەکتریدا.

(إتَّعَدَ. إتِّعاداً): گفتەکەی وەرگرت و (متمانە/ بڕوا)ی پێکرد.

(-القَومُ): گفتیان بە یەکتریدا.

(-هُ=أوعَــدَهُ): ١-گفتــی لەگەڵــدا بەســت ٢-هەڕەشەی خراپی لێکرد.

(إيتَعَدَ. ياتَعِدُ) (لُغَة ضَعِيفَة فِي إتَّعِدُ): (ئەم وشــەیە لاوازە و کەم بەکاردێــت) گفتەکەی وەرگرت و بڕوای بە گفتەکەیکرد.

(مُوتَعِد): گفت وەرگرتوو متمانەپێکردوو.

(إسْــتَوعَدَ-هُ): داوای لێکرد کە گفتی شوێن و کاتی بداتێ.

(ألعِدَة) (مص): گفتدان/ بەڵێندان/ شــوێنی ژوان و کاتی دیاریکردن (دەوترێت کە وشــەی (العِدَة): کۆناکرێتەوە دەیشڵێن کۆکەی وشەی (وُعُود)ە.

(ألمَوعِد (مص) (ج) مَواعِد): ١-گفت/ بەڵێن/ ژوان ٢-شــوێن ژوان/ شــوێن گفــت/ بەڵێــن

٣-دەمی گفتەکە/ کاتی ژوانەکە ٤-پەیمان.

(اَلمِیعـاد (ج) مَواعِیـد): کاتـی گفتەکـە/ بەڵێنەکە ٢-شـوێنی گفتەکـە و یەکتربینین ٣-گفت بەیەکتریدان/ ژوانبەستن.

(اَلمَوْعُود) (مفـع): کات و ڕۆژی دیاریکراوی گفت/ گفت پێدراو.

(اَليَـومُ الموعـود): ڕۆژی زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە/ ڕۆژی قیامەت.

وعر: (وَعَرَ-فُلاناً. يَعِـرُ وَعْراً): جڵەوگیری کرد/ نەیهێشت بگاتە ئامانج و پێویستیەکانی و ئەوەی نیازیبوو.

(-المَـكانُ. وَعْراً وَوُعُوراً وَ وَعِرَ يَوْعَرُ-المَكانُ وَعَراً): شـوێنەکە سـەختبوو ڕۆیشتن پێدا گرانبوو.

(مكانٌ وَعْرٌ): شوێنێکی سەخت و دژوار.

(وَعُرَ-المَكانُ. يَوعُرُ وَعارَةً وَ وُعُورَةً-وَعِرَ): شـوێنەکە سـەخت بوو پێدا ڕۆیشـتن دژوار بوو/ هەردەبانبوو.

(-الشيءُ): شتەکە کەمبوو.

(شيءٌ وَعرٌ): شتێکی کەم.

(وَعَّرَ-المَكانَ): شـوێنەکەی سـەخت و دژوار کرد.

(-الرَجُلَ): پیاوەکەی گێڕایەوە و نەیهێشـت بگاتە پێداویسـتیەکانی ٢-نەیهێشـت ڕووەو ئامانجەکەی بڕوات.

(-المُتَكَلِّمَ): قسەکەی پێبڕی.

(اَوْعَرَ-بِـهِ الطَريـقُ إيعـاراً): ڕێگەکەی لێ سـەختبوو یـان ڕووی پێ کـردە زەوییەکی ڕەقەن و ناهەموار.

(-المَكانَ أو الطَريقَ): شوێنەکەیان ڕێگەکەی بە سەخت و ڕەقەن و ناخۆش دی.

(-الرَجُلُ):١-پیاوەکە کەوتە زەوییەکی ڕەقەن و سەخت و ناخۆشەوە ٢-نەدارابوو.

(-الشيءَ): شتەکەی کەمکردەوە.

(تَوَعَّرَ-المَكانُ): شوێنەکە سەخت و دژوار بوو.

(-الأمرُ عَلَيَّ): کارەکەم لێدژوار و گرانبوو.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە ڕەقیی و توندیی نواند.

(-في الكَلام): لە قسـەکردنەکەدا سـەری لێ تێکچوو/ چەواشە بوو.

(-هُ في الكَلام): لە قسـەکردنەکەدا سەری لێ تێکدا و چەواشەیکرد.

(إسْـتَوعَرَ-المَكانَ أو الطريقَ): شوێنەکە یان ڕێگەکەی بە سەخت دانا و هاتە بەرچاو.

(اَلواعِـر) (فـا): سـەخت/ ڕەق/ ناهەموار ٢-شوێنی ڕەقەن و بەرزیی و نزمیی و سەخت

(اَلوَعْر (ج) أوْعُر وَ وُعُور وَ أوْعار وَ وُعُورَة): ١-شوێنی ترسناك و چۆڵ و ناهەموار ٢-شوێنی سەخت و هەڵەت و بەرزیی.

(«مَـكانٌ وعْرٌ»): شـوێنێکی سـەخت و پڕ هەڵەت و ناهەموار.

(«طريـق وَعْـرٌ»): ڕێگەیەکـی سـەخت و پێداڕۆیشتنی گران.

(«مَطلَبٌ وَعْرٌ»): خواستێکی دژوار و دەستگیر بوونی گران.
(«رَجُلٌ وَعْرُ المَعروف»): پیاوێکی کەم چاکە
(الوَعِــر (ج) أوْعــار وَ الوَعِــير (ج) أوْعَار. والأوْعَر): شــوێنێکی ســەختی بــە هەڵەت و بەرزیی و نزمی/ ناتەخت.
(الوَعْرِيُّ-مِنَ الــكَلام): ئەو وتەیەی کە کەم بەکاربهێنرێت و بە گوێ ناخۆشبێت و خەڵك پێی پەستبێت.
وعــز: (وَعَز و وَعَّــزَ و أوعَزَ-إلَيــهِ في كَذا أن يَفعَلَــهُ أو يَترُكَهُ يَعِــزُ وَعْزاً و تَوْعِيزاً وَ إِعَــازاً): ئاماژەی بۆ ئەوە بــۆ کرد هانیدا کە ئەوە بکات یان وازی لێبهێنێت ٢-فەرمانیدایەو پێی ڕاگەیاند کە ئــەو کارە ئەنجام بدات یان فەرمانیدایە وازی لێبهێنێت.
وعــس: (وَعَسَ-الشــيءَ يَعِــسُ. وَعْســاً): شتەکەی نایە ژێر پێ/ پێی بە شتەکەدا نا
(-هُ الدَهرُ): ڕۆژگار قاڵۆ دانایکرد/ دەرهاتوو بوو.
(واعَسَ-هُ): پێشبڕکێی شەوڕۆیشتنی لەگەڵدا کرد.
(-تِ الإبلُ): حوشــترەکان لە ڕۆیشتندا ملیان درێژ کرد و هەنگاوی فروانیاندا.
(أوعَسَ-القَومُ إيعاساً): ١-بە لی خزی نەرمدا ڕۆیشــتن کە پێــی تێ دەچەقێت و ڕۆیشــتن تیایدا گرانە ٢-بە درێژایی شەو ڕۆیشتن.
(-تِ الإبلُ): حوشــترەکان ملیان درێژ کرد و هەنگاوی گەورەیاندا/ هەنگاویان گەورە کرد.
(الوَعْس) (مص) (ج) أوعاس): ١-شــوێنپێ/ شــوێنکار ٢-لــی نەرمــی خز کە قــاچ تیایدا دەچەقێــت و ڕۆیشــتن تیایدا گرانــە ٣-(ن) درەختێکە عودی لێ دروست دەکرێت.
(الوَعْسَــة): لی نــەرم و خز کە قــاچ تیایدا دەچەقێت.
(الأوعــس (ج) وُعْــس وَ أوْعُــس و (جج) أواعِس): شوێنێکە لی خز و نەرمی تێدایە و ڕۆیشتن تیایدا گرانە.
(الوَعْســاء): گردە لی نەرم گیای دەشــتەکیی تێدا دەڕوێت.
(وَعْساءُ الرَملِ): گردەلێك کە تەخت بووبێت و نەرم بووبێت.
(المَوعِس): ١-شوێنپێ ٢-لی نەرم و خز کە پێ تێیدا دەچەقێت.
(المِيْعــاس (ج) مَواعِيــس): ١-لــی نــەرم ٢-زەوییەك کە کەس پێی تێنەخستبێت ٣-ڕێگە
(المُوَعَّس): ڕێگەی پێداڕۆیشتوو.
وعط: (ألوعاط)(ن): گوڵەزەردە.
وعظ: (وَعَــظَ-هُ. يَعِــظُ وَعْظــاً وَعِظَةً): ئامۆژگارییکــرد پەنــدی دادا ٢-ڕێــی تۆبە و گەڕانەوەی بۆ لای خودای خستە بەر و واز لە خراپە و خراپەکاریی بهێنێت.
(إتَّعَــظَ): ئامۆژگارییەکانــی وەرگرت و بەو

پێیە ڕەفتاریکرد.
(اَلواعِـظ (فـا)(ج) واعِظـون وَ وُعّـاظ): ئامۆژگار/ پەند دادەر و فێرکار.
(اَلعِظَة (ج) عِظـات): ئامۆژگاریی و پەندی ئامۆژگار/ بەرچاوخستنی پاداشـت و سزای ئەوە دنیا.
(اَلوَعْظَة (ج) وَعْظات): ١-جارێك ئامۆژگاریو ڕێـی خـودا پیشـاندان ٢-قسـەی ئامۆژگارو پێشاندانی ڕێی خوداپەرستیی.
(اَلوَعّاظ): کەسـێکە کە زۆر پەند دادەداتو ئامۆژگاریـی خەڵك دەکات/ مرۆڤی دڵسـۆزو میهرەبان کە ئامۆژگاریی خەڵك زۆر دەکات.
(اَلمَوعِظَة (ج) مَواعِظ): ١-ئامۆژگاریی ئاینی ٢-ئـەو ئامۆژگاری و پەندانەی کـە ئامۆژگار دەیدات.
وعـف: (وَعُفَ-البَصَـرُ. يَوعُـفُ وُعُوفاً): چاوەکە کز بوو/ هانای کەمبوو.
(اَلوَعْف (ج) وِعـاف): زەویی ڕەقەن کە ئاو تیایدا پەنگ دەخواتەوە و دەبێتە زەلکاو.
وعـق: ١-(وَعِقَ-عَلَيهِ. يَعِـقُ وَعْقاً): پەلەی لێکرد.
(«ما أَوعَقَهُ»): ئای کە بەپەلەیە.
(اَلوَعْقَةُ): جارێك پەلەکردن.
٢-(وَعَقَ-الفَـرَسُ يَعِـقُ. وَعْقـاً وَ وُعاقاً وَ وَعِيقاً): لە ڕۆیشـتندا سکی چارەوێکە قرمە قرمیکرد.
(اَلوُعَـاق والوَعيـق): قرمـە قرمی سـکی چـارەویَ کاتێك دەڕوات یـان قرمە و دەنگی هەموو شتێك.
٣-(وَعُقَ وَ تَوَعَّقَ وَ أستَوعَقَ. يَوْعُقُ. وَعْقَةً): بەدڕەوشتبوو/ بەدخوو بوو.
(وَعْـق وَ وَعِق وَ وَعْقَةُ وَ وَعِقَةُ): بەدخوو/ بەدڕەوشت.
(وَعَّقَ-هُ): ١-جیاکاری لەگەڵدا کرد/ ناتەبایی کرد ٢-گیروگرفتی هێنایە (بەر/ ڕێ) ٣-بە دڕو هاری (لەقەڵەمدا/ دانا) ٣-تێکیدا/ گەنیکرد.
(«وَعَّقَهُ الطَمَـعُ أَو الجَهلُ»): چاوچنۆکیی و تێنەگەیشتن بۆی بوونە گیروگرفت/ تەگەرە.
(اَلوَعْقَةُ): ١-دڕیی ٢-بەدڕەفتاریی ٣-هەڵسوکەوت توند و تیژ.
(«بِـهِ وَعْقَـةٌ»): دڕندەیـی و بەدڕەفتاریی تێدایە.
وعك: (وَعَكَ-الحَرُّ يَعِـكُ. وَعْكاً و وَعْكَةً): گەرما تاویسەند.
(-تْهُ الحُمَى): تاکەی بەرز بووەوە و ئازاریدا
(مَوْعُوك): تای بەرز گرتوو بە ئازارەوە.
(-الرَجُلُ): بەهۆی زۆریی ماندوویێتیەوە یان قورسیی نەخۆشییەوە تووشی ئازار بوو.
(-الشيءَ وَعْكاً): شتەکەی کوتاو وردی کرد.
(-الشيءَ فِي التُرابِ): شتەکەی لە خۆڵەوەداو کردی بەژێر گڵەوە.
(-تِ الإِبلُ عِنـدَ الحَوضِ): لەلای گۆلەکەدا/

لەسەر گۆلەکە حوشترەکان کەڵەکەیان کردو کەوتنە شەڕمشان.
أَوعَكَ (-الشيءَ في التراب): شتەکەی لە خۆڵەوەدا و کردی بەژێر گڵەوە.
(-تِ الإبلُ عِندَ الحَوضِ): حوشترەکان لەسەر گۆلەکە کەڵەکەیانکردو کەوتنە شەڕمشان.
(تَوَعَّكَ): نەخۆشکەوت/ ناتەندروستبوو/ ناساغبوو/ لەشی تێکشکا.
(اَلوَعْك (مص) والوَعِك): ناتەندروست/ ناساغ/ لەش تێکشکاو.
(اَلوَعْكَة)(مص): ١-جارێك لەش تێکشکان/ ناساغ بوون ٢-با کپبوونو تاو سەندنی گەرما ٣-نەخۆشیی ٤-جەنگی ڤارەمانەکان ٥-لە ڕاکردندا پەککەوتن.
(وعكةُ الحمى): بەرزییو تیژیی تا.
(-وعكة الأمرِ): نارەحەتیی و سەختیی کارەکە.
(وعكة الإبلِ): ڕەوە، ڕەوەی حوشتر.
(اَلموعوك) (مفع): ١-تا گرتوو ٢-پەککەوتەو نارەحەتبوو ٣-نەخۆشو لەش تێکشکاو/ ناساغ.
وعل: ١-(وَعَلَ-الرَجُلُ يَعِلُ. وَعْلاً): پیاوەکە بەسەرەوە ڕوانی.
(تَوَعَّل-الجَبَلَ): سەرکەوتە سەر شاخەکە/ چووە ڕۆپەی شاخەکە.
(إستَوعَلَ-تِ الأَوعالُ): کەڵە کێوییەکان (چوونە/ سەرکەوتنە) ڕۆپەی کێوەکە.

اَلوَعْل (ج) أَوْعال وَ وُعول): خانەدان/ مەزنەپیاو.
(«هُم عَلَينا وَعْلٌ واحِدٌ»): هەموو پێکەوە (دوژمنایەتیی ئێمە دەکەن/ دوژمنی ئێمەن).
(اَلوَعْل وَ الوَعِل و الوُعِل (ج) أَوْعالُ وَ وُعول وَ وُعُل وَ وَعِلَة وَ مَوْعِلَة): (ئەم دوانەی دواوە ناوی کۆن)(ح): کەڵەکێویی/ سابرێنەکێویی (دوو شاخی ڤایمی هەیە و بۆ دواوەیە وەك شمشێری چەماوە).
(م) وَعِلَة (ج) وَعِلات وَ وِعال (ح): بزنەکێویی.
(اَلوَعْلَة): ڕۆپە و شوێنی ڤایمی شاخ/ جێی سەختی شاخ.
(-مِنَ القَميص): کونی ڤۆپچەی کراس.
(وَعْلَةُ الإبريق): دەسکی مەسینە.
(اَلمُستَوعَل (ج) مُستَوعَلات): شوێن و لانەی بزنەکێویی لە لووتکەی کێودا.
٢-(إستَوعَلَ-إلَيهِ): پەنای بۆ برد/ خۆی دایە پاڵی.
(اَلوَعْلُ (ج) أوعال وَ وُعول): پەنا/ پەناگا/ پەسێر.
(«مالَكَ عَنهُ وَعْلٌ»): بەرامبەری چارت نیەو هیچ پەنایەکت نییە.
وعم: (وَعَمَ-الديارَ يَعِمُ وَعْماً): نزای بۆ ولاتەکە بۆ شارەکە کرد و وتی: هەر ئاوابیت و بەخۆشی بژیت.
(«عِم صَباحاً»): بەیانیت باش.

(عِم مَساءً): ئێوارەت باش.
(وَعَمَ-بالخَبَرِ): هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند
(وَعِمَ-الديارَ. يَعِمُ وَعْماً=وَعَمَ): ئاوەدانیی و خۆشـیی بۆ وڵاتەکە خواست و نزای باشی بۆ کرد.
(اَلوَغْـم (مـص) (ج) وِعـام): هێڵێکـە لە شاخەکەدا ڕەنگی لە ڕەنگی شاخەکە جیایە.
وعـن: ١-(تَوَعَّنَ-الشـيءَ): شـتەکەی تەواو وەرگرت گرتیە خۆی
(-تِ الدابَّةُ): چوارپێکـە زۆر قەڵەوبوو/ لە قەڵەویدا لێکرەوایەوە.
٢-(الوَعْن (ج) وِعان): پەناگا/ پەناوپەسێر
(الوَعْـن وَ الوَعْنَـة (ج) وِعـان): ١-زەویـی ڕەقەن/ سەخت ٢-زەوییەکی سپیی شۆرەکات کە هیچی تێدا نەڕوێت.
وعي: ١-(وَعى-الشيءَ يَعي وَعياً): شتەکەی (گرد/ کۆ) کردەوە و ئاخنیە شتێترەوە.
(-ألحَديـثَ): فەرمایشـتەکەی پێغەمبەری وەرگرت و تێیگەیشتو لەبەریکرد.
(-تِ الأُذُنُ): گوێکـە دەنگەکـەی بیسـتو وەرگرت.
(«وَعِـيَ فُلان») (عامية): لـە خەو ڕاپەڕی یان لە بێئاگایی وشیار بووەوە/ وریا بووەوە
(وعى-القَيحُ في الجرحِ): کێم و زووخەکە لە برینەکەدا کۆبووەوە.
(-الجِرحُ): کێمی برینەکە لەبەری ڕۆیشت.
(-العظمُ): ئێسقانە شـکاوەکە یەکیگرتەوە/ خۆیگرتەوە.
(أَوعى-الـكَلامَ أو الشـيءَ، إيعاءً): قسـەکە تێگەیشــت/ وەریگرت/ لەبەریکرد. شتەکەی کۆکردەوە و پاراستی.
(-الزادَ وَ نَحْوَهُ): توێشووەکەی خستە توێشوو بەرەکەوە شتەکەیکردە/ خستە ئەوەوە وە کە تیایدا هەڵیدەگرێت.
(-الشيءَ): هەموو شتەکەیبرد.
(-الرَجُـلَ و عَلَيـهِ): ڕژدیـی/ چرووکیـی (بەرامبەر پیاوەکە کرد/ لەگەڵدا کرد).
(إستَوعى-الشـيءَ): ١-هەموو شـتەکەیکردە قاپەوە/ دەفرەوە ٢-هەموو شتەکەیبرد.
(ألواعــي) (فا): ١-چاوکراوە/ تێگەیشـتوو و دووربین/ هۆشمەنگ/ هۆشیار/ هەستیار/ ئاگا
(واعــي أليَتيم): سەرپەرشـتیار و گەورە و پارێزەری هەتیو.
(ألواعِيَة): مێی وشەی (الواعي).
(ألوَعْي)(مص): ١-کێم/ زووخ. ٢-وشـیاریی/ وریایی یان هەستیاریی/ هەست ٣-تێگەیشتن و دوور ئەندێشیی.
(مالي عنــهُ وعْـيٌ): هیچ چارێکـم نییە/ ناچارم.
(ألوَعِـيّ): ١-پارێزگـار ٢-زانـای ئاییـنی تێگەیشتوو.
(ألوِعــاء والوُعــاء (ج) أوعِيَة وجــج أواعٍ):

ئەوەی شـــتی تێدەكەیت و تیایدا دەیپارێزیت
وەك: قاپ/ قاجاخ/ دەفر و شتیتر.

(وعائِیات البُزورْ=مُسْـتَورات البُزُور) (ن): ئەو ڕووەكانەن كـــە تۆوەكانیان توێكڵی ڕەقی هەیـــە و دەیپارێزێت وەك بادام و گوێز. نەك تۆوەكە ڕووت بێت و بە دەرەوە بێت.

(«هُــوَ أوعــی مِن فُــلان»): ئەو لە فیســار چاوكراوەترە و تێگەیشتوو ترە.

(«هُوَ أوعــی مِن نَمْلَة»): ئـــەو لە مێرووله وریاترە و پتر ڕەنجدەرەو كۆدكەرەوەیە.

(اَللاوَعي): نائاگایی/ بێئاگایانە/ ئاوەزی ناخ و هەستی ناخ و ناوەوە/ دەروون.

(مَوعِيُّ الرسغِ): مەچەكقایم.

٢-(اَلواعِیَة): ١-دەنگ/ سەنگ ٢-قیژە/ هات و هاوار/ زریكە.

(اَلوَغْـــي والوَغَـــى): ژاوەژاو/ هـــات و هاور/ غەڵبەغەڵب/ گرمەگرم.

(فَرَس وَعِي): ئەسپی توند وتیژ.

وغـــب: ١-(وَغُبَ-الجَمَـــلُ يَوْغُـــبُ وَغابَةً وَ وُغُوبَةً): حوشترەكە زلە بوو/ كەتەبوو

(اَلوَغْـــب (ج) أوغاب وَ وِغـــاب (م) وَغْبَة): حوشتری زلە/ كەتە.

٢-(اَلوَغْـــب (ج) اَوغاب وَ وِغاب (م) وَغْبَة): ١-كەلوپـــەلی شـــڕەو بێ كەڵك. ٢-لـــەش لاوازو بێهێز/ بێتین ٣-بەدخوازی سووك/ ڕسوا.

(الوَغْب و الوَغْبَة): گەوج.

وغد: ١-(وَغَدَ-القَومَ يَغِدُ. وَغْداً): كارگوزاریی كردن/ خزمەتیكردن.

(وَغُدَ. يَوغُدُ وَغادَةً): بێمێشـــك و ڕسوا بوو/ گەمژە و بێڕێز بوو.

(اَلوَغْد): ١-تیرێكی قومار كە هەر سەركەوتنی نەبێت و نەباتەوە ٢-ڕاو/ شكار.

(اَلوَغْـــد (ج) اَوْغـــاد وَ وُغْدان و وِغْدان (م) وَغْدَة): ١-بێمێشـــك/ گێل ٢-گەوج ٣-ســـووك/ سەرســـەری/ خوێڕی/ دەروونزم ٤-ســـاوا ٥-نۆكەری گەل ٦-كۆیلە.

٢-(واغد-هُ مُواغَدَةً): ١-ئەو چی كرد ئەمیش ئەوەی كرد/ لاسایی ئەویكردەوە.

(-فُلانـــاً فِي اَلسَّـــيرِ): پێ بە پێـــی ئەویكردو ڕۆیشت و بەسەریدا زاڵبوو.

وغـــر: ١-(وَغَرَ-اليَومُ يَغِرُ. وَغْـــراً): گەرما ئەمڕۆ تاوی سەند.

(-تْـــهُ الشَـــمسُ): خۆرەتاوەكـــە كاری زۆری لێكرد.

(وَغَرَ وَ وَغِرَ-صَدْرُهُ علی فُلان. يَغِرُ . وَغراً): دڵی لە فیسار پڕ بوو/ ڕقی لێ هەستا.

(واغِـــرُ الصَـــدرِ عَلَيـــه): دڵ لێپڕبـــوو ڕق لێهەستاو.

(وَغَّرَ-هُ عَلَيه تَوغيراً): دڵی ئەوی لێپڕكرد.

(اَوغَرَ-هُ إيغاراً): ڕقی هەستاند/ تورەیكرد.

(-صَدْرَهُ): دڵی پڕ لە قین و ڕق كرد.

(-هُ إلی كذا): ناچاری پەنابردنی ئەوەی كرد.

(-الماءَ): ئاوەکەی گەرمکرد.
(-الخَنزيرَ): بە ئاوی گەرم تووکی بەرازەکەی بە زیندویی لێکردەوە پاشان سەری بڕی.
(-القَومُ): خوێشگەل لە قرچەی گەرمادا هاتن.
(-المَلَـكُ لِرَجُـلٍ أرضاً و أوغَرَهُ أرضاً): شـا، زەوییەکـەی دا بە پیاوەکە بۆ خۆی بێت و بێ باج بێت.
(تَوَغّرَ): ئاگری ڕقی گرت.
(اَلوَغْر و الوَغَر): ١-قین و ڕق ٢-دوژمنایەتی
(وَغْـرُ الجَيـشِ): دەنـگ و هـات و هاوار و ژاوەژاوی سوپا.
(اَلوَغْـرَةُ): ١-جارێك ڕق لێهەڵگرتن ٢-جارێك ڕق خسـتنە دڵـەوە. ٣-جارێك تاوسـەندنی گەرما ٤-قرچەی گەرما.
(لَقيتُهُ في وَغْـرَةِ الهاجِرَةِ): لە کاتێکدا پێی گەیشتم کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا بوو/ قرچەی گەرمابوو.
(اَلوَغير): گۆشـتێك بە تینی گەرما و تیشکی خۆر ببرژێت.
(اَلوَغِير وَ الوَغِيْرة): شـیر کە بە بەردی داخ گەرم بکرێت.
٢-(اَوغَرَ-القَـومُ بينَهُـم إيغـاراً و ميغَراً): خوێشـگەل شـوێن و کاتیان بۆ یەکتر بینین دیاریکرد.
(اَلميغَـر): کات و شـوێن کە بـۆ یەکتر بینین دیاری دەکرێت.

وغـف: ١-(وَغَفَ-الرَجُـلُ يَغِـفُ. وَغْفـاً وَ وُغُوفاً): پیاوەکە خێرایکردو رایکرد.
(اَوْغَفَ-الرَجُـلُ إيغافاً): پیاوەکە پەلەیکردو رایکرد.
(-الكلبُ): سەگەکە هەناسەبڕکێی پێکەوت.
(-الطائِـرُ): باڵندەکـە خێـرا باڵندەکانـی بەیەکدادا.
٢-وَغَفَ-البَصَرُ. يَغِفُ وَغْفاً وَ وُغوفاً): چاو کە (کز بوو/ هانای کەمیکرد/ تینی کزبوو).
(اَوْغَفَ-الرَجُـلُ. إيغافاً): پیاوەکە چاوی (کز بوو/ کەم هانابوو).
٣-(اَوْغَفَ-الرَجُـلُ إيغافاً): هێندەی خواردن خوارد تا تێربوو.
وغل: (وَغَلَ. يَغِلُ وُغُولاً): ڕۆیشـت و دوور کەوتەوە.
(-في الشَـيءِ): چـووە شـتەکەوە و تیایـدا ونبوو.
(-علـى القَوم وَغْـلاً وَ وُغُـولاً وَ وَغَلاناً): خـۆی کـرد بـە نـاو خوێشـگەلداو بەبـێ بانگکـردن لەگەڵیاندا خواردیەوە بەبێئەوەی بانگیبکەن.
(اَوغَلَ-فُلاناً في كذا): فیسـاری بەناو ئەوەدا کرد.
(-في السَيرِ): پەلەی لە ڕۆیشتنەکەدا کرد.
(-في البِلادِ): دوور چووە ناو وڵاتەکەوە.
(-في العِلـمِ و نَحـوِهِ): زۆرو تەواو چووە ناو

زانســـتەوە/ خوێندیو زانســـتی پەیدا کردو شارەزابوو.
(-القَومُ): خوێشـــگەل زۆر ڕۆیشتن و کەوتنە پشت کێوانەوە یان چوونە خاکی دوژمنەوە.
(تَوَغَّلَ-في البلاد): دوور بە وڵاتەکەدا گەڕاو چوو/ تیایدا دوور کەوتەوە.
(ألوَغْــل (مــص) (ج) أوغــال): ١-بوودەڵــەی نامــەردی درێخیکەر ٢-مشــەخۆر کــە دەچێتە ناو خوێشــگەلەوە و بە بێ بانگکردن لەگەڵیاندا دەســت بــە خــواردن و خواردنــەوە دەکات. ٣-درەختی پەل بەیەکداچوو/ تێکئاڵاو ٤-پەناگا/ پەنا ٥-مرۆر کە کۆتر دەیخوات.
(ألوَغْــل و الوَغِل): ١-کەســێکە کــە بە درۆ ڕەسەن بۆ خۆی پەیدا بکات ٢-بەدخۆراك.
(ألوَغال): ١-کەسێکە کە بە شان و باهوودا زۆر هەڵبدات ٢-فرۆشیاری گرانجان.
(ألمُوغِل) (فا): تێچوو، خێرا خۆتێهاویشــت/ بێخی ناوەوە چوو.
وغم: ١-(وَغَمَ-هُ يَغِمُ. وَغماً): بەزاندی.
(وَغِمَ-عَلَيهِ يَوغَمُ وَغماً): ڤینی لێ هەڵگرت
(أوغَمَ-هُ): ڕقی لێ پەچنیــە دڵییەوە/ ڤینی لێهەڵگرت.
(تَوَغَّمَ عَلَيهِ): ڕقی لێهەستا.
(تَوَغَّــمَ و تَواغَمَ-الأَبطــالُ في الحَــربِ): قارەمانان بەدڵ جەنگین و بەڤینەوە ڕوانیانە دوژمن و بەگژداچوون.

(ألوَغْم (مص)(ج) أوغام): ١-ڤینی چەسپیوو ڤینی پەنگخواردووی ناودڵ ٢-(جەنگ/ شەڕ) و کوشــتار ٣-دەروون (رَجُلٌ وَغْمٌ): پیاوێکی ڤینــاوی/ ڤینەلــەدڵ/ ڤینهەڵگرتــوو/ ڕق لێهەڵگر.
٢-(وَغَمَ-بالخَــبر يَغِــمُ وَغمــاً): بێئــەوەی هەواڵەکە ساغبکاتەوە گەیاندی.
(-الى الشيء): خەیاڵی بۆ شتەکە چوو.
٣-(ألوَغْم (ج) أوْغام): ١-ئەوەی لە خواردنەکە دەوەرێت/ هەڵدەوەرێت ٢-گەوج.
وغــن: (تَوَغَّنَ. تَوَغُّناً): ١-خۆی کوتایە کۆڕی جەنگەکەوە.
(-علــى المَعاصي): لەســەر گوناهــو خراپە (هەتەر/ سوور) بوو.
وغــي: (ألوَغَــى وَ الوَغْــي): ١-دەنگەدەنــگ و غەڵبەغەڵــب/ هــات و هــاوار و ژاوەژاو. ٢-جەنگ/ شەڕ.
وفــد: ١-(وَفَدَ-إلى أو على الأَمــيرِ يَفِدُ. وَفْداً وَ وُفُــوداً وَ وِفادَةً وَ إفــادَةً): وەك نوێنەر و ڕاسپاردە و پەیامهێنەر هاتەلای میر.
(وافِد (ج) وَفْد وَ وُفود وَ وُفّاد ووُفَّدٌ و أوْفادٌ): فرســتادەیەك بە ناوی نوێنەرییەوە نوێنەری نێرەر بۆ لای ســەرۆکێك. کاربەدەستێك یان هەر کەس و کەسانێکیتر.
(وَفَّدَ-فُلانــاً إلى أو على الأَميرِ): فیســاری بۆ لای میر نارد.

(وافَدَ-فُلاناً على الأَميرِ): یەکێکی بۆ لای میر لەگەڵدا نارد.

(أوفَدَ. إيفاداً): بەرزبووەوە.

(-عَلَيهِ): بەسەریدا ڕووانی سەرپەرشتی کرد.

(-الريمُ): ئاسکەکە سەری بەرز کردەوە و گوێی قوت کردەوە.

(-فُلاناً إلى أو على الأَميرِ): فیساری ناردە لای میر.

(-الرَجُلُ): خێرایکرد/ گورجبوو.

(تَوَفَّدَتِ الإبلُ أو الطَيرُ): حوشترەکان یان باڵندەکان لەگەڵ یەکدا کەوتنە پێشبڕکێ.

(-عَلَيهِ): بەسەریدا بەرز بووەوە و ڕووانی

(تَوافَدَ-القَومُ عَلَيهِ): خوێشگەل هاتنەلای/ ڕوویان تێکرد.

(إستَوفَدَ-هُ): وەك نوێنەرێك/ ڕاسپاردەیەك ناردیەلای.

(الوافِد) (فا): لای ڕوومەت کە لە کاتی جووندا بەرز دەبێتەوە کە دوو لان.

(-مِنَ الإبِلِ وَ نَحْوَها): ئەو حوشترە یان حوشترانەی پێش دەکەون.

(الوَفد) (مص) (ج) وُفود): ١-نوێنەر خوێشگەلێك یان ئەوانەن کە کۆدەبنەوە بە کۆمەڵ دەچنە ولاتێکەوە ٢-یان کۆمەڵێك بە نوێنەریی دەچنەلای میر یان لایەکیتر.

(-(ج) وُفود و أوفاد): کۆمەڵە لێکی درێژەوەبوو کە بە دەوروپشتدا بڕوانێت.

(الوَفّاد): کەسێکە کە زۆر نوێنەرایەتی دەکات و بەملاولادا دەڕوات.

٢-(إستَوفَدَ-فِي قِعْدَتِهِ): لە دانیشتنەکەیدا سرەوتی نەبوو/ ناڕەحەتبوو.

وفر: (وفَرَ-لَه المالَ. يَفِرُ وَفْراً. وِفرَةً): داراو سامانی بۆ زۆر کرد و زۆریدایە.

(-الثَوبَ): جلەکەی بە تەواویی و تێر و تەسەلیی بڕی

(-عرضَ فلان): نامووسی فیساری پاراست و نەیشکاند/ جنێوی پێنەدا.

(-عَطاءَكَ): بەخششەکەتی دایەوە بەبێ دڵشکاویی و بە قایلبوونەوە و پێویستی پێی نەبوو.

(وَفَرَ وَ وَفُرَ-المالُ أو المَتاعُ وَفْراً وَ وُفوراً. وَ يَوفُرُ وَفارَةً): داراکە یان کەلوپەلەکە زۆر و مشە بوو/ فرە فرە بوو.

(وَفَّرَ-الشيءَ تَوفيراً): شتەکەی وا زۆر کرد کە مشەبێت/ فرەبێت.

(-لِفُلانٍ طَعامَهُ): خواردنەکەی بۆ فیسار تەواوکردو زۆریکرد.

(-اللهُ حَظَّهُ مِن كذا): خودا لەوەی (زۆردایەو بەسەرداباراند).

(-الثَوبَ): جلەکەی بە تێر و تەسەلیی و تەواویی بڕی.

(-لِفُلانٍ عِرضَهُ): نامووس و ئابڕووی فیساری پاراستو نەشکاند/ جنێوی پێنەدا.

(-المالَ): دەستی بە داراکەوە گرت و لێی کەم نەکرد.

(-حِصَّةً مِنَ المالِ): بەشێکی داراکەی پاشەکەوتکرد/ هێشتیەوەو پاراستی.

(-الرَجُلُ)(عامية): دەستی گرتەوەو دەست بڵاویی نەکرد/ پاشەکەوتیکرد.

(-فِي النَفَقَة)(عامية): لە بژێویدا دەستی زۆر گرتەوە/ چرووکییکرد.

(أوفَرَ-فُلانٌ الشيءَ): ١-شتەکەی (فرە/زۆر) کرد ٢-مشەیکرد/ شتەکەی تەواو زۆر کرد.

(تَوَفَّرَ-على كذا): کۆشش و هەڵمەتی تەواوی بۆ ئەوەداو تەرخانکرد.

(-على صاحِبِهِ): خانەوادە و نامووسی دۆستەکەی پاراست و چاودێرییکرد.

(توافَرَ و أتَّفَرَ-الشيءُ): شتەکە فرە و مشەی بەربڵاو بوو.

(إسْتَوفَرَ-الشيءَ): شتەکەی گەیاندە ئەوپەڕی تەواویی.

(-الحَقَّ): مافەکەی (تەواو وەرگرتەوە/ کەوتەوە دەست).

(ألوافِر) (فا): ١-فراوان/ فرە/ زۆر/ مشە ٢-یەکێکە لە کێشەکانی شیعری عەرەبی کە (مُفاعَلَتُنْ. مُفاعَلَتُن. فَعُولُن. مُفاعَلَتُن مُفاعَلَتُن فَعُولُن)ە.

(الوافِرَةُ): مێی وشەی (الوافِر) ٢-دووگی بەران کە زۆر گەورە بێت و دابکەوێت.

(ألوَفْر (مص) (ج) وُفُور): ١-فرەبوون/ زۆربوون/ مشەبوون ٢-دەوڵەمەندیی/ دارایی

(-مِنَ المال أو المَتاع): ماڵ و دارا/ سامانی بێ ئەندازە یان کەلوپەلی زۆر و بێ شومار یان هەموو شتێکی لە ئەندازە بەدەر.

(ألوَفْرَةُ (ج) وِفار): ١-جارێك زۆربوونو مشەبوونی شت. ٢-فرەیی/ زۆریی ٣-قژ کە زۆر بێت و بەلای گوێدا بەربێتەوە.

(ألأَوْفَر): زۆر تەواو/ بێ کەموکوڕیی.

(ألوَفراء): پڕ.

(مَزادَةٌ وَفراء): جەوەندەیەك کە تەواوو باش دووررابێت.

(أُذُنٌ وفراءُ): گوێیەکی زل.

(أرضٌ وَفراء): زەوییەکە گیاکەی زۆر بێتو کەمی نەکردبێت.

(قَومٌ مُتَوافِرون): میللەتێکی زۆرن.

(ألمُوَفَّر) (مفع): زۆربوو/ فرەبوو/ تەواوو بێکەمبوو.

(ألمُوَفَّرُ الشَعرِ): کەسێکە قژی درێژ و زۆر بێت.

(«تَرَكْتُهُ على أَحْسَنِ مُوَفَّرٍ»): کە بەجێمهێشت لە بارێکی زۆر تەواودا بوو.

(ألمَوْفُور) (مفع): شتی (تەواو/ زۆر/ فرە) کراو.

وفز: (وافَزَ-هُ): لەگەڵیدا (پەلەیکرد/ خێرابوو).

(أَوفَــزَ-هُ إيفازاً): پەلەی پێکرد/ هانیدا پەلە بکات.

(تَوَفَّزَ-لِلأَمرِ): ئامادەو دەســتبەکاری کارەکە بوو.

(«أَخَذَ يَتَوَفَّزُ على فِراشِهِ»): لەسەر نوێنەکەی هەر تەپاوتلیبووو خەوی لێنەدەکەوت.

(إسْــتوفَزَ-في قِعدَتِــهِ إسْــتيفازاً): لــە دانیشتنەکەیدا نەدەســرەوت هەر جموجوڵی بوو وەك ئامادەی راپەڕین بێت.

(اَلوَفْز و الوَفَز (ج) أَوفاز وَ وِفاز): پەلەپەل/ پەلەکردن/ خێراکردن.

(«نَحنُ على وَفْز أَو وِفــازٍ أَو أَوفازٍ»): ئێمە ئامادە و خەریکی گوزارین لەســەر سەفەرین یان زۆر بە پەلەین.

(مَكانٌ وَفْزٌ): شوێنێکی بەرز.

وفــض: ١-(وَفَضَ وَ أَوفَــضَ. يَفيضُ. وَفْضاً وَ وَفَضــاً وَ إيفاضــاً): پەلەیکــرد ڕایکرد/ تێیتەقان.

(إسْتوفَضَ. إستيفاضاً): گورج ڕایکرد/ خێرای کرد و ڕایکرد.

(-هُ): پەلەی لێکرد/ خێرای پێکرد.

(اَلوَفْض و الوَفَض دوو چاوگن(ج) أَوفاض): پەلەکــردن/ گورجبــوون/ خێراکــردن/ دەستوبردکردن.

(اَلوَفْضَةُ (ج) وِفــاض): جارێك پەلەکردن/ گورج بوون و ڕاکردن.

٢-(أَوفَضَ-هُ إيفاضاً): دەریکرد/ ڕاوینا.

(-الإبِلَ): حوشترەکانی بڵاوکردەوە.

(إسْتَوْفَضَ-تِ الإبِلُ إستيفاضاً): حوشترەکان بڵاوبوونەوە.

(-هُ): ١-دەریکــرد ٢-ئاوارەیکــرد/ دەربەدەری کرد.

(اَلأَوفــاض): ١-تاقمــی خەڵــك ٢-خەڵکی لە هەمەچیزە تێکەڵ.

٣-(أَوفَضَ-للرجُــلِ إيفاضــاً): ڕایەخێکی بۆ پیاوەکە ڕاخست تا لەسەری دانیشێت.

(اَلوِفــاض (ج) وُفُــض): ١-چەرمێــك کە لە ژێر دەســتاردا دادەخرێت ٢-شــوێنێك ئاو گل بداتەوەو ڕایگرێت/ ئەستێل.

(اَلوَفْضَةُ (ج) وِفاض): دەفرێکە وەك تیردان بنەکــەی تەختــە و چەرمە ٢-توێشــەبەرەی شوان لە پێستە ٣-جاڵی بەر لووت و سەر لێو.

وفــع: (اَلوَفْع (ج) أَوفاع): خانە یان شــوێنی بەرز.

(غُــلامٌ وَفَــعٌ (ج) وِفْعان وَ وَفَعَــةٌ وَ أَفْعَةٌ): کوڕێکی باڵا هەڵکشاو و گەورەبوو.

(اَلوَفْعَــة): شــتێکە وەك ســەبەتە لە گەڵای دارخورما یان لە لاســکی هێشــووی خورمای بەجێماو دروست دەکرێت.

(اَلوَفْعَة و الوِفاع): دەمەڵبێنی شووشەی بۆن یان قاپ.

(اَلوَفِيعَة=الوَفْعَة): ١-ســەبەتە کە لە گەڵا یان

لاسـكى هێشـووى خورما دروسـت دەكرێت.
٢-پەڕۆیـەك نووكـى ئـووچ و قەڵەمـى پێدەسڕێت.
وفـق: (وَفِقَ-الأَمْـرَ يَفِـقُ. وَفْقـاً): كارەكەى بەلەبار/ گونجاو/ ڕەخساو هاتەبەرچاو و زانى.
(-الأَمرُ): كارەكە (لەبار/ گونجاو/ ڕەخسـاو) بوو/ بە پێى پێویستبوو.
(وَفَّقَ-الأمرَ): كارەكەى گونجاند/ ڕەخساند.
(-بَـينَ القَوم): خوێشـگەلى ڕێكخسـتەوە/ ئاشتیكردنەوە/ تەبایكردنەوە.
(-هُ اللهُ لِلخَـيرِ): خـودا ڕێـى چاكـەى نایە دڵیەوە.
(«وُفِّقتُ لَهُ»): ڕێكەوتیكردمو یەكترمان دى/ دیمى.
(وافَقَ-هُ وِفاقاً وَ مُوافَقَةً): ١-ڕێكەوتى ئەوى كرد و دى.
(-هُ فِي أو على الشيءِ): لەسەر شتەكە لەگەڵیدا پێكهات/ ڕێككەوت.
(-بَـينَ الشَـيئَين): دوو شـتەكەى پێكەوە گونجاند یەكى پێگرتن.
(أوفَقَ-القَومُ لَهُ): لێى نزیكبوونەوەو لەگەڵیدا یەكیانگرت هەڵیانبژارد.
(-السَهْمَ وَ بِالسَّـهمِ): بنى تیرەكەى لە ژێكە قایمكرد تا تیرەكە بهاوێن (وەكو هەڵگێراوەى وشـەى أفْوَقَ بێت). زۆر كەمیش وشەى أفْوَقَ بەكاردێت).

(تَوَفَّقَ): سـەركەوت/ دەرچوو/ خودا ڕێگەى سەركەوتنى بۆ خۆشكردو سەریخست.
(«لا يَتَوَفَّـقُ عَبدٌ إلاّ بتَوفيـقِ الله»): هیچ بەندەیەكـى خـودا سـەرناكەوێت تەنها بە سەرخستنى خودا نەبێت.
(تَوافَقَ-القَـومُ فِي الأمرِ): ١-بۆ كارەكەى و لە كارەكەدا پێكهاتن/ ڕێككەوتن ٢-لەیەك نزیك بوونـەوە و تەبا بوون ٣-كۆمەكـى یەكتریان كرد/ هاوكارى یەكبوون.
(إتَّفَقَ-الرَجُلانِ على الشَـيءِ و فيهِ): ١-دوو پیاوەكە لەسەر شتەكە (ڕێككەوتن/ پێكهاتن/ یەكیانگـرت) ٢-لەیـەك نزیـك بوونـەوە و یەكیانگرت.
(-مَعَـهُ): لەگەڵیـدا (پێكهـات/ ڕێككەوت/ گونجا.
(-الأَمْرُ): كارەكە بەڕێكەوت ڕوویدا.
(إسْتَوْفَقَ-اللهَ. إسْتِيفاقاً): داواى لە خودا كرد سەریبخات سەركەوتووى بكات.
(اَلوَفْـق) (مـص): ڕێككەوتنـى دووشـت/ گونجانى دووشـت/ وەك یەكبوونى دووشت و بە پێى پێویست.
(«كَسْـبُهُ وَفْـقُ عِيالِهِ»): دەسـتكەوتەكەى بەپێى پێویسـتى خێزانەكەیەتى و هێندەى پێویستە.
(«جـاءَ القَـومُ وَفْقـاً»): خوێشـگەل بـە ڕێككەوتوویى و لەگەڵ یەك گونجاندا هاتن

(«أَتيتُهُ وَفْقَ طَلْعَتِ الشمسِ»): لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا هاتمەلای/ دەمی هەڵهاتنی خۆر.

(اَلوَفِيق): هاوڕێ/ هاوەڵ/ برادەر.

(اَلتَوفِيقُ)(مص): سەرکەوتن/ سەرکەوتن بەدەستهێنان/ بۆ ڕێککەوتن.

(تَوفيقُ الهلال وَ تَوفاقُهُ وَ تَيْفاقُهُ وَ تِيفاقُهُ وَ تَوَفُّقُهُ وَ ميفاقُهُ): کاتی هەڵهاتنی مانگەداس و دەرکەوتنی (اَلمُوَفَّق)(مفع): ١-سەرخراو/ دەرچوێنراو ٢-ڕانومابوو/ ڕاستەڕێگرتوو ٣-ڕابەر.

(«إِنَّ فلاناً مُوَفَّقٌ»): بەڕاستی فیسار کەس سەرکەوتووەو ڕێی ڕاستی دۆزیوەتەوە.

اَلمُلحَق

وفـق: (اَلإتِّفـاق): گونجاندن و یەکبوونی بیروبڕوا یان ئارەزوو و حەز یان سۆز.

(«إتفـاق وجهـات النَظَـر»): یەکبوون و یەکگرتنی باری تێڕوانین.

(«إتِّفاق الأذواق»): وەك یەك چێژ لە شتێك وەرگرن و وەك یەك خۆشیی لێوەرگرن.

(اَلإتِّفـاق): ١-لـە یەکگەیشتن و ڕێککەوتن لەسەر کارێك ٢-گەیشتنە ڕایەك و ئامانجێکی هاوبەش.

(«اَلإتِّفاق على بَرنامج أَو خِطَّةَ»): ڕێککەوتن لەسەر بەرنامەیەك یان پلانێك.

(اَلإتفاق): بەڕێکەوت کارێك ڕوویدات.

(«وَقَـع هذا الحادِث إتفاقـاً»): ئەم ڕووداوە بەڕێکەوت قەوما.

(اَلإتِّفاق: معاهَدَة بَينَ دَولَتَين أَو أَكثر حَولَ قضايا مُعَيِّنَةَ): ڕێککەوتن و پەیمانبەستن لەسەر کێشەیەکی دیار لە نێوان دوو دەوڵەت یان پتردا.

(«إتِّفـاقٌ إقتِصـادِي»): ڕێکەوتن و پەیمانی ئابووری.

(اَلإتِّفـاق: تَعَهُّدٌ مُتَبـادَلُ أَو وثيقَة تراضٍ بَينَ أَفرادٍ لتنظيم بعض الشُؤون): پەیمانی نێوان دووکەس یان پتر یان بەڵگەنامەیەکی لێکقایلبوون و دڵنیاکردنی یەکتری بۆ ڕێکخستنی هەندێك کاروبار.

(جرى توقيع الإتفاق بَـينَ مُمَثِلِي أَصحاب العَمَـل و اَلعُمـالُ): ڕێککەوتننامەی نێوان خاوەن کارگەکان و کرێکاران مۆر کرا.

(إتِّفاق الآراء): یەکبوون و یەکگرتنی گشت ڕاکان/ یەکبوون و یەکگرتنی تێکڕای هەموو ڕاکان.

(اَلإتِّفاقِيَّة): پەیمانی نێوان دوو دەوڵەت یان زۆرتر لەسەر هەندێك کاروبار.

(إتفاقِيَّـة تجارِيَّـة): ڕێککەوتننامەیەکی بازرگانیی.

(إتِّفاقِيَّةالبَريد):پەیمان و ڕێککەوتننامەیەکی ڕێکخستنی پۆستە.

(إتفاقِيَّـة العَمَـل): ڕێککەوتننامـەی کار: پەیمانێکـە دەبێـت هەمـوو ئەوانـەی لەو

پەیمانـــەدان پابەنـــدی ئەوەبن کە ڕەوشـــی کار و کرێـــکار لە وڵاتەکـــەی خۆیاندا بە پێی ڕێککەوتنەکە بێت و وای ڕەچاو بکەن.

(اَلتَوافُق): یەکگرتن و وەك یەکبوونی بیر یان ئارەزووەکان یان سۆز و حەزەکان.

(«توافـــق وجهات النَّظَر»): یەکگرتن و وەك یەك بوونی بۆچوونەکان.

(تَوافُق أذواق): وەك یەکبوونی چێژ لێوەرگرتن.

(صفةُ شـــيءٍ يُتَلائَم مَعَ شـــيءٍ آخر. صِلَةُ التَّطابُق و التَّماثُل): ماك و نیشـــانەی شتێك کە لەگەڵ نیشـــانەی شـــتێکی تردا بگونجێت. پەیوەندیی و لەیەکچـــوون و وەك یەکبوونی ئەو گونجانە.

(«تَوافق بَينَ أقسام بناءٍ»): پێکەوە گونجانی بەشەکانی خانەیەك/ خانوویەك.

(اَلتَّوافُقِ في الموســـيقى): پێکـــەوە گونجان و هۆگربوون و هاوســـاز بوونی ئاوازەکان لەگەڵ یەکدا.

(-في عِلـــم النَفـــس): لە زانســـتی دەروونداء خۆگونجان ئەوەیە کەســـێك خـــۆی ڕابهێنێت و بگونجێنێت لە کۆمەڵێکدا و لە شـــوێنێکدا لەگـــەڵ ئەو نەریـــت و خـــوو و بۆچوونانەی لەوێدا هەیـــە و خۆی وەك ئەوان لێبکات ئەو ڕەفتـــار و هەڵســـوکەوتانەی کـــە هەیبووە و ئەو خـــوو و نەریتانەی خۆی کە لەگەڵ هیی ئەواندا ناگونجێت واز لێبهێنێت.

---

وفـــل: ١-(وَفَلَ و وَفَّلَ-الشـــيءَ. يَفِلُ وَفْلاً وَ تَوْفيلاً): توێکڵی شـــتەکەی گرت/ شـــتەکەی پاککرد/ ڕووتکرد.

(اَلوَفْل) (مص): شتێکی کەم.

٢-(وَفَّلَ-الشيْءَ. تَوْفِيلاً): شتەکەی زۆر کرد/ زۆر پەیدا کرد/ مشەیکرد.

وفه: (وَفَهَ-النَصْرانِيُّ يَفِـــهُ وَفْهاً): دیانەکە بوو بە سەرپەرشتیاری کڵێسە.

(اَلوافِه):١-سەرپەرشتیاری کڵێسە ٢-ناوبژیوان لە کڵێسەدا.

(اَلوِفَاهَـــة): ئـــەرك و کاری سەرپەرشـــتیاری کڵێسە.

(اَلوَفَهِيَّة): پلەی ناوبژیوان و سەرپەرشتیاری کڵێسە.

وفي: ١-(وَفى يَفـــي بِالوَعْدِ أو العَهدِ): گفتو پەیمانەکەی (بردەسەر/ نەشکاند).

(-النَـــذرَ): ئاهەکەی/ نەزرەکەی (بەجێهێناو کرد/ لەسەرخۆی لابرد).

(-الشـــيءُ): شـــتەکە (درێژ بووەوە/ درێژەی کێشا).

(«مات فُـــلانُ وَ أنتَ بِوَفاءٍ»): فیســـار مردو تەمەندرێژیی بۆ تۆ/ تۆ تەمەنت درێژ بێت.

(-ريشُ الجَناح): پەری باڵەکە تەواو درێژ بوو.

(-الشَيْءُ وَفِيّاً): شتەکە تەواو و زۆر بوو.

(-الدرهَمُ المِثقالَ): پەنجایییەکە لە ســـەنگدا مسقاڵێك بوو.

(«هذا الشـيءُ لا يَفي بِذاكَ»): ئەم شتە بە ئەنـدازەی ئەوە نییە/ هێندەی ئەویتر نییەو لەو کەمترە.

(وفیَّ-الرَجُلَ حَقَّهُ. تَوفِیَةً): هەموو مافەکەی بە تەواویی بە پیاوەکە دایەوە.

(وافی-فُلاناً حَقَّهُ. مُوافاةً): مافی فیساری بە تەواویی دایەوە.

(-الرَجُـلَ): ١-هاتە لای پیاوەکە/ سـەری لە پیاوەکـەدا ٢-لەپڕ/ لە ناکاو هاتەلای خۆی بۆ دەرخست.

(-الحِمـامُ أَو الکِتابُ): لە نـاکاو مەرگ بۆی هات یان نامەکەی گەیشتە دەست.

(أَوفی-بِالوَعْدِ. إِیفاءً): بەڵێنەکەی بردەسەر

(-النَـذْرَ): ئاهەکـەی/ نەزرەکـەی کـرد/ بەجێگەیاند.

(-الکَیلَ): پێوانەکەی (تەواو/ باش) پێوا.

(-فُلاناً حَقَّهُ): مافی فیساری تەواو دایەوە

(-المَکانَ): هاتە شوێنەکە/ جێگەکە.

(تَوَفّـی. تَوَفِّیـاً): وەرگرتنـەوەی هەمـوو مافەکە.

(«تَوَفَّیـتُ مِن فُـلان مالي عَلَیـهِ»): هەر مافێکم لەسەر فیسار بوو لێم وەرگرتەوە.

(-المُدَّةَ): ماوەکەی تەواو کرد گەیاندیە کۆتایی.

(-الشيءَ): شتەکەی تەواو کرد.

(-عَدَدَ-القَـوم): هەموو خوێشـکەلی ژمارد/ هەموویانی سەرژمێر کرد.

(-هُ اللهُ): خودا (مراندی/ کوشتی).

(تُوُفِّيَ فُلانٌ): خودا گیانی فیساری کێشا و بۆ خۆی بردەوە/ مرد.

(اللهُ المُتَوَفّي): خودا خەڵك مرێنە.

(المُتَوَفّی): گیانکێشراو/ مرێنراو/ مردوو.

(تَوافی-القَومُ تَوافِیاً): خوێشگەل هەموویان هاتن و ژمارمیان تەواو بوو.

(إِسْـتَوفی حَقَّهُ. إِستیفاءً): هەموو مافەکەی خۆی بە تەواوی وەرگرتەوە.

(أَلوافِي (فـا) (م) وافِیَة): ١-گەیشـتوو ٢-زۆر و بـەس ٣-بە ئەنـدازە ٤-درهەمێـك و چوار شەشیەکی درهەمێك.

(-عِندَ الشُعَراء): لای هۆزانڤانەکان. دێڕێکی هۆزانەکەیە کە پارچەکانـی تەواو بێتو بێ کەموکوریی بێتو بێخەوش بێت.

(اَلوَفِـيّ: (ج) أَوفیـاء): ١-تـەواو/ پـڕ و بێ کەموکوریـی ٢-زۆر بە ئەمـەك/ ئەمەکدار/ وەفـادار ٣-کەسـێکە مافـی خـۆی تـەواو وەربگرێتەوە یان مافی خەڵك تەواو بداتەوە.

(اَلوَفاء)(مص): ئەمەکداریی/ بەینەتداریی/ وەفاداریی.

(«ماتَ عَن وَفاءٍ»): مرد و هێندەی بەجێهێشت کـە ئەوەی لەسـەریەتی بـە خاوەنەکەی بە تەواویی بدرێتەوە.

(«ماتَ و أَنتَ بِوَفاءٍ»): مرد و تەمەنی درێژی بۆ تۆ بەجێهێشتبێت/ تۆ تەمەن درێژب بێت.

(اَلوَفـاة (ج) وَفَيـات): مـردن/ کۆچکردنی دوایی/ گیان دەرچوون/ سـەرنانەوە/ سـوێ بوونەوە.

(اَلمِیفـاء): ١-بەئەمەك/ ئەمەکـدار/ بەوەفا ٢-سەرراست.

٢-(أَوفى-علـى المَـكانِ. إِيفـاءً): بەسـەر شوێنەکەدا روانی.

(-علـى المِئَـةِ): لـە سـەد (تێپەڕیکـرد/ زۆرتربوو).

(-على الشَـيْءِ وَ فِي الشَـيْءِ): سەرپەرشتیی شتەکەیکردو بەسەریدا ڕوانی.

(اَلوَفـي و اَلمِیفـاة): زەوییەکـی بـەرز کـە بەملاولایدا بڕوانێت.

(اَلمِیْفـی): ١-زەوییەك کـە لەملاولای بەرزتر بێت ٢-مایەی تەنوور ٣-کوورەخشتی سوور.

وق: (وَقْوَقَ-الكَلْـبُ): سـەگەکە (وەڕی/ حەپەیکرد).

(-الطائِرُ): باڵندەکە/ پەلەوەرەکە خوێندی.

(اَلوَقْـوَق)(ح): کوکـو باڵندەیەکـە لەسـەر هێلکەکانی هەڵنانیشێتو هێلکەکانی دەخاتە هێلانەی باڵندەی ترەوە زۆر جۆریشی هەیە.

(اَلوَقواقَة-مِنَ الرجال): پیاوی زۆر هەڵەوەڕ/ چەنەباز/ قەرەچەن/ زۆربڵێ.

(إِمْرَأَةٌ وَقْواقَه): ژنێکـی زۆربڵێ/ هەڵەوەڕ/ چەنەبار/ کە کەس گوێ لە قسەی نەگرێت.

(«وَقْـوَقَ فُـلانٌ») (عامیـة): فیسـار هەر چەنەیـدا و خەرەکی ڕسـت و کەس گوێی لە قسەکانی نەگرت.

(«وَقْواق»): پیاوی چەنەباز.

(«وَقْواقـه»): ژنـی چەنەبـاز/ هەڵـەوەڕ/ قەرەچەن/ زۆربڵێ.

٢-(وَقْوَقَ-الرَجُلُ): پیاوەکە بێتواناو بوودەڵە بوو.

(اَلوَقْواق): زیرەکردوو/ زۆر ترسنۆك.

وقب: (وَقَبَ. يَقِبُ وَقْباً): چووە کەلەبەرەکەوە یان چاڵەکەوە یان کونەکەوە.

(-تِ الشَـمسُ وَقْباً وَ وُقُوبـاً): خۆرەکە ئاوا بوو.

(-الظَلامُ): تاریکیی (هەموو لایەکی گرتەوە/ بڵاوبووەوە).

(-القَمَرُ): مانگەکە گیرا.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە چاوی بەقوڵدا چوو.

(-تْ عَيناهُ): هەردوو چاوی بەقووڵدا چوو

(أَوقَبَ-الشَـيءَ إِيقابـاً): شـتەکەی خسـتە کەلەبەرەکەوە.

(اَلقِبَة (ج) قِبات): بەشێکە لە ڕیخۆڵەی کار کە پەنـیری پێ دەمەیەنرێـتو پەنیرەکە لە شـیر دروسـت دەکرێت. (اَلوَقْب (مص) (ج) وُقُوب وَ وِقاب): ١-چاڵێکە لە تاوێردا کە ئاوی تێدا کۆ دەبێتەوە ٢-کەلەبەر/ یان کلاورۆژنە ٣-هەموو چاڵێکی لەش وەك چاڵی چاو. چاڵی شان.

(الوَقْبَـةُ): ١-چاڵـی تاوێـر کـه ئـاوی تێدا دەوەسـتێت یان چاڵی لـەش وەك هی چاو و شان ٢-کەلەبەرێکی گەورە لە شاخ یان شوێنی تردا کە سێبەری هەبێت ٣-دەفرێك کە تریت و تێکوشـینی تێـدا بکرێت یان ڕۆنـی تێدا هەڵبگیرێت.

(رَكِيَّةٌ وَقْباء): چاڵاوێکی ئاو قووڵ

(ألأوقـاب): کاڵا و کوتاڵـی مـاڵ و کەلوپەلی ناوماڵ.

(ألميقـاب): مەیخۆرێکـی زۆر/ هەمیشـەیی هەمیشە سەرخۆش.

(«إنَّهُـم يَسـيرون سَـيرَ الميقـاب»): وەك سەرخۆشێکی هەمیشە مەیخۆرەوە ئاوا شەوو ڕۆژێك هەر لە ڕۆیشتندان.

(ألمِيقَب): مورووی سپی کە لە دەریا دەریدەهێنن و گەورەو بچووکی هەیە.

٢-(وَقَبَ-الرَجُـلُ يَقِبُ. وَقْبـاً): بەرەوروو هاتو هاتەپێشەوە.

٣-(أَوْقَبَ. إيْقَاباً): برسیبوو.

٤-(أَوقَبَ-النَخْلُ إيْقاباً):لاسکە هێشووگرەکانی دارخورماکە بۆگەنبوو.

٥-(أَلوَقْب (ج) أوْقاب): ١-گەوج ٢-دەروونـنزم و ڕسوا/ سووك.

(أَلوَقْبان (ج) وَقْبَى): گەوج.

(أَلوُقْبِيُّ): گەوجدۆسـت کە هەمیشە لەگەڵ گەوج و گێلەکاندایە.

وقت: (وَقَتَ-الأَمرَ يَقِتُ. وَقتاً):کاتی بۆ کردنی کارەکە (دانا/ دیاریکرد) کە تیایدا بیکات.

(وَقَّتَ-الأَمـرَ):١-کاتـی بـۆ کردنـی کارەکە دانا ٢-کاتی تێچوونـی کارەکەی دانا و ماوەی کردنەکـەی دیاریکـرد («وَقَّتَ الأَمـرَ لِيَوم كَذا»): کاتی کردنی کارەکەی بۆ فیسـار ڕۆژ دانا/ کارەکەی بۆ ئەو ڕۆژە دواخست.

(أَلوَقت (مص) (ج) أَوقات): دەم/ کات.

(أَوقاتُ السَنَة): وەرزەکانی ساڵ.

(أَلمِوقِت=أَلتَوقيـت):١-کات دیاریکردن ٢-کات دانان و شوێن دیاریکردنی.

(أَلمُوَقِّت): کەسـێکە کە بە تەنگ کاتەوە بێت و لەسـەری بڕوات/ کاتی خـۆی ڕێك و پێك بکات/ کاتگر/ کاتراگر.

(وَقْـتٌ مَوقُوتٌ وَ مُوَقَّـتٌ): کاتێکی کەم یان کاتێکی دیاریکراو.

(أَلمِيْقات (ج) مَواقيـت):١-کات/ دەم ٢-کاتی گفتـدراو بـۆ بینین یـان کۆبونـەوە/ دەم و شوێنی ژووان.

أَلمُلْحَق

.وقت: (أَلتَوْقِيت): دیاریکردن و دانانی کات/ دەم.

(تَوقِيتُ مَواعِيد): دیاریکردنو دانانی گفتو شوێنی گفتەکە.

(-التَوقيـت= قيـاس الوَقـت): کاتپێوانو ڕاگرتن بەتەواویو ڕێکیی.

(«توقيتُ سِباق»): راگرتنی کاتی پێشبڕکێی غاردنی ئەسپ لە گۆڕەپانەکەیدا.

(التَوْقِيت): راگرتنو دیاریکردنی کات بەپێی سووڕانەوەی گۆی زەوی بەسووری خۆردا کە ئەوە بەپێی جێی ولاتەکە لەسەر هێڵی درێژی گۆی زەوی دەگۆڕێتو جیا دەبێت.

(«توقيت غرينتش»): کات راگرتن ئەڵێی گرینتش.

(التوقيت الصَيفي): کاتی دیاریکراوی هاوینە/ بەکاتی هاوینە کە کاتژمێرێك پێشدەخرێت.

---

وقح: (وَقَحَ وَقِحَ وَقُحَ. يَقِحُ قِحَةً وقَحَةً يوقُحُ وَقحاً يوقُحُ وَقاحَةً وَ وُ قُوحَةً): (بێشەرم/ بێنابروو) بوو/ بێحەیا بوو چەقاوەسووانە روویکردە کاری ناشیرینو پیس.

(وَقِح): بێشەرم/ بێنابروو/ ئابرووتکاو چەقاوەسوو/ چوختی/ بێناموس/ بێحەیا/ رووهەڵماڵراو.

(وَقَحَ. وَقِحَ وَقُحَ- حافِرُ الدابَّةِ): سمی چوار پێکە/ وولاخەکە رەقبوو.

(وَقَّحَ- الحَوضَ): (حەوزەکە/ گۆلەکە)ی بە قوڕو بەرد چاکسازکرد.

(-حافِرَ الدابَّةِ): سمی وولاخەکەی بەپێوی تواوە رەقکرد.

(أوقَحَ وَ اُسْتَوقَحَ- الحافِرُ): سمی وولاخەکە رەقبوو.

(تَوَقَّحَ واتَّقَحَ): چەرداوە روو بوو/ کەمشەرمبوو/ بێنابروو بوو.

(تَواقَحَ): خۆی بەبێنابروو نواند.

(الوَقاح (ج) وُقُح وَ وُقْح): بۆ نێرومێ: بێشەرم/ بێحەیا/ بێنابروو رووهەڵماڵراو/ چەقاوەسوو/ چەرداوەروو/ بێشەرم.

(حافِرٌ وَقاحٌ): سمێکی رەقبوو/ رەق.

(رَجُلٌ وَقِيحُ الوَجهِ): پیاوێکی رووهەڵماڵراو/ بێنابروو/ ئابرووتکاو.

(المُوَقِح) (مفع): ١-شەرمو ئابروو لێهەڵگیراو ٢-گرفتاربووی وەیو چورتوم.

(بَعيرٌ مُوَقَّح): حوشترێکی پەریشانی کاری زۆر.

وقد: ١-(وَقَدَ. واتَّقَدَ. يَقِدُ وَقْداً وَ وَقَداً وَ وُقُوداً وَ وَقَداناً وَقِدَةً): بریسکایەوە/ درەوشایەوە کەوتە ورشەورش.

(-تِ النارُ): ئاگرەکە هەڵگیرسا/ گڕیگرت/ کڵپەیسەند.

(«وَقَدَت بِكَ زِنادي»): کارەکەم گڕی پێگرتیتو سەرکەوتیت.

(وَقَّدَ- النارَ): ئاگرەکەی (کردەوە/ داگیرساند).

أوقَدَ- النارَ: ئاگرەکەیکردەوە.

(تَوَقَّدَ- الكَوكَبُ): هەسارەکە ورشە ورشیبوو/ بریسکایەوە.

(-تِ النارُ): ئاگرەکە کڵپەیسەند.

(إسْتَوقَدَ- تِ النارُ): ئاگرەکە گڕیگرت/ گرەکەی بەرزبووەوە.

(اَلوَقْــد والوَقَــدْ): (دوو چاوگن) ئاگرگرتن/ ئاگر.
(اَلوَقْدَةُ): ١ـجارێك كلپەو گڕگرتن ٢ـتیژترین گەرما/ گەرمی.
(اَلوِقــاد والوَقید والوَقود): ســووتەمەنی/ ئەوەی ئاگری پێدەكەنەوە.
(اَلوَقّاد): خێراســووت/ زوو گڕگرتوو ٢ـزۆر بەگڕ ٣ـزۆر بەبریسكە.
(كَوكَبٌ وَقّاد): هەســارەیەكی (رووناك/ زۆر بەبریسكە).
(رَجُــلٌ وَقّــاد): پیاوێكــە ئاســك زوو دڵــی دەسووتێت‌و دێتە جۆش.
(المَوقِــد (ج) مَواقِد والمُسْــتَوقَد): ئاگردان/ وەجاخ/ كوانوو/ جێی ئاگركردنەوە.
(اَلمَوقِــدَة): كــوورەی ئاگــر مەقەڵــی كە بۆ چێشــتلێنان‌و شــتیترە یــان بەبــەردو قوڕ دروستدەكرێت دەبێتە كوورە.
(اَلمُتَوَقّد (فا): ١ـرووناكیبەخش/ درەخشــێن ورشــەدەر ٢ـگڕگرتــوو ٣ـئاســك ٤ـزیــرەك‌و هۆشیار.
(زَنْدٌ میقــادُ): چەرخێكی خۆشــئاگر/ زوو ئاگركەرەوە.
٢ـ(اَلقِــدَة): (لە بنچینەدا وشــەكە (اَلوَقْدْ): ئــەوەی پشــتی پێدەبەســتیت‌و شــوێنپێی هەڵدەگریــت/ دەیكەیت بەرێبەری خۆت بەم واتایە وشەكە دەبێتە (قَدْو).

وقذ: ١ـ(وَقَــذَـهُ - یَقِذُ. وَقْــذاً): ١ـ(دایبە/ كوتایبە) زەویدا ٢ـهێندەی لێدا نزیكی مردنی كردەوە.
(وَقیذ وَ مَوقوذ): كەسێكە هێندەی لێدرابێت خەریكی مردنبێت.
(-هُ النُعَــاس): وەنــەوزە كوتێیبوو/ وەنەوز بردیەوە وەك سەرخۆش وابوو.
(وَقَذَ و اَوقَذَ- فُلاناً): بەنەخۆشــیی فیساری بەجێهێشت.
(اَلوَقیذ (م) وَقیذَة (ج) وَقائذ):١ـنەخۆشێكی زۆر كەشــەنگ كــە لــە گیانكەنشــتدا بێت/ خەریكی مردنبێت ٢ـلەشــگران/ لەشــقورس ٣ـخاوو خلیچك/ سست.
(وَقیــذُ الجَوانَح): دڵشكســت وەك ئاســۆرو خەفەت تێكیشاندبێت‌و لاوازیكردبێت.
٢ـ(اَلوَقائــذ): بــەردەكان كــە بەردەرێژیان پێكرابێت.
(وَقیذَ): بەردێكی بەردرێژكردن.
(اَلمَوقِذ (ج) مَواقِذ): سەری ئەندامێكی لەش وەكو پاژنەو ئەژنۆو سەرشان.
(وقر): ١- (وَقَرَ وَ وَقِرَ وَوُقِرَ- ت اُذنُهُ. یَقِرُ ویَوْقَــرُ. وَقْراً): گوێی گرانبوو یان بەتەواوی كەربوو/ گوێی لە هیچ نەبوو.
(اُذُنٌ مَوقُورَة): گوێی گران یان كەر.
(وَقَّرَ- للشيءِ تَوقیراً): شوێنكاری بۆ شتەكە دانا/ دیارییكرد/ بەجێهێشت.

(وَقَّرتني الأَسـفارُ): گوزەران/ سەفەرەكانو كاروان قالّيكردمو توكمەيكردمو رايهێنام.

(أَوْقَـرَ- الدابَّةَ إيقارٌ. وَقِرَةٌ) (شـاذٌ): بارى گرانى لە ولآخەكەنا.

(-تِ النَخلَةُ وَ أُوقِـرَت): دارخورماكە بەرى زۆر گرت/ بەرەكەى قورسبوو.

(مُوقِـر وَ مُوقِـرَةٌ وَ مُوقَـرَةٌ): دارخورماى (فرەبەر/ بەرى زۆر گرتوو).

(أَوقَرَ- الدَينُ فُلاناً): وام/ قەرز/ بارى شانى گرانكرد.

(إستَوقَرَ- تِ الإبلُ إستيقاراً): ١-حوشترەكان قەلّەوبوون ٢-بارى قورسيان هەلّگرت.

(-وقَرَهُ طعاماً): بارى خۆراكى هەلّگرت.

(الفِـرَة (مـص) (ج) فِـرات- الثقـل: ١-قورسـايى/ قورسـى ٢-مالّومنـدالّ/ خێزان ٣-كاتى نەخۆشيى.

(الوَقْر) (مص): قين.

(«فِي صَـدرِهِ وَقْـرٌ»): قينـى لـە دلّدايـە/ قينلەدلّە.

(الوِقـر (ج) أوقار): ١-كۆلّى گران، بارى گران ٢-هەورى قورسى پڕ باران، پڕ ئاو.

(وَقْـرَةُ الدَّهـرِ) (ج) وَقَـرات): گرفتاريىو سەختيى رۆژگار.

(الوَقَرات): شـوێنكار (بەجۆرێكى گشـتى). شوێندەست/ شوێنپێ).

(الوَقير): سەرشۆرى سووككراو/ نەنگ/ رسوا.

(أُذنٌ وَقيرَةٌ): گوێى گران يان كەربوو.

(الميقـار- مِـنَ النَخـل (ج) مَواقـير): دارخورمايەك كە بەرى زۆر گرتبێت.

(المُوَقَّر): (مضـع): ١-مرۆڤى خاوەنئەزموون/ جيهانديدە ٢-مرۆڤى ژێـرى دەرهاتوو/ قالّى رۆژگار.

٢- (وَقَـرَ- فِي بَيتِهِ. يَقِرُ وَقْـراً وَ وُقُورَةً): سـەلارانە/ ئاغرانـە بەرێـزەوە لـە مالّـدا دانيشت.

(وَقَرَ وَ وَقُرَ- الرَجُلُ. قِرَةً وَ وَقارَةً وَ وَقَراً. يَوقُـرُ. وَقارَةً وَ وَقاراً): ١-پياوەكە سـەلاربوو ئاغـرو سـەنگينبوو/ مەنديـوو/ بەرێز بوو ٢-جێگير بوو.

(وَقَّرَ- الشَّيخَ. تَوقيراً): رێزى زۆرى لە پيرەكە گرتو بەگەورەيگرتو دانا.

(-الدابَّـةَ): ولآخەكـەى هێمنكـردەوەو دايمركاند.

(تَوَقَّـرَ واْ تَّقَـرَ): سـەلارو بەرێزبـوو/ سەنگينبوو/ ئاغربوو.

(الوَقُر- مِنَ الرِجال): پياوى بەرێز/ مەند/ سەنگين/ ئاغر.

(القِرَّة (ج) قِرات): پيرى ئيفتادە.

(الوَقار): ١-سەنگينىو سەرمەنديى ٢-مەزنيى/ گەورەيى.

(الوَقار- مِنَ الرجال): پياوى بەرێز/ سەنگين سەلار.

(اَلوَقُــور (ج) وُقُــر= ذو الوَقــار: (بۆ مێ و نێر)؛ سەلار/ ســەنگین ئاغر/ مەند/ بەرێز/ شکۆمەند.

٢- (وَقَرَ- العَظمَ. يَقِرُ وَقْراً): ئێســقانەکەی قڵیشاند/ درزی تێکرد.

(وُقِرَ العَظمُ): ئێســقانەکە کونی تێبوو یان درزی تێبوو/ درزیدا.

(مَوقُــور وَ وَقــير): ئێســقانی کونبــوو یان درزیتێبوو.

(وَقَّرَ- فُلاناً تَواقيراً): فیساری برێندار کرد.

(اَلوَقــر (مــص) (ج) وُقُــور): ١-قڵیشــانی ئێسقانی لاق ٢-کون یان درز/ قڵیش لە بەرددا یان لە ئێسقانو شتیتردا.

(اَلوَقْرَةُ (ج) وَقَرات): ١-جارێك درزتێبوون/ قڵیشــان یان کونبوون ٢-درز/ قڵیش یان کون لە بەرد یان لە ئێسقاندا.

(اَلوَقير): ئێســقانی (دز/ قڵیــش) تێبوو یان کونبوو.

(اَلوَقير و الوَقــيرَة): کونێکی، چاڵێکی گەورە لە تاوێردا کە ئاو بگرێتە خۆی.

٤-(اَلقِرَةُ (ج) قِرات): رانەمەرێك.

(الوَقِرِيّ): شوانی مەر یان خاوەنەکەی.

(اَلوَقير): ١-رانەمەر ٢-کۆمەڵە خەڵکێك.

(اَلمَوقِر): تەختایی دامێنی کێو.

وقــس: (وَقَــسَ- الجَــربُ في بَدَنِــهِ. يَقِسُ وَقْساً): گەری بەلەشیدا بڵاووەوە.

(-الفاحِشَــةَ): نــاوی ســۆزانییەکەی (هێنا/ برد).

(-هُ بِالْمَكْروهُ): شتی ناشیرنیی پێووت.

(-الجلدَ): پێســتەکەی داماڵی/ تووکەکەی لە پێستەکە کردەوە.

(وَقِّــسَ- الإبِــلَ): حوشــترەکەی تووشــی گەرییکرد.

(اَلأوقــاس): کۆمەڵــە خەڵکێکــی هەرچیو پەرچێ.

وقش: ١- (وَقَشَ- الرَســمُ. يَقِشُ. وَقْشــاً): وێنەکە یان پاشــماوەی خانووەکە سڕرایەوەو دیارنەما.

٢-(وَقَــشَ- مِــن فُــلان يَقِــشُ وَقْشــاً): بەخشینێکی لێوە بەرکەوت.

(وَقَــشَ وأوقَــشَ- لَــهُ بِشَــيءٍ): شــتێکی کەمیدایە.

٣-(تَوَقَّشَ): بزوا/ جووڵا/ جما.

(اَلوَقْش): ١-دەنگ ٢-بزوە/ جووڵە.

(اَلوَقْش والوَقَش): چیلکەو چەواڵ کە ئاگری پێدەکرێتەوە.

(اَلوَقْشَة والوَقَشَة): ١-دەنگ ٢-جووڵە/ بزوە/ جمە.

٤-(اَلوُقْش): خموش/ کەموکووری.

(اَلأوقاش= اَلأوباش): خەڵکی هەرچیو پەرچی.

وقــص: (وَقَــصَ- عُنُقَــهُ. يَقِــصُ وَقْصاً): ملیشکاند.

(-تِ العُنُقُ): ملەکەشکا.
(-تِ بِهِ الدابَّةُ) وڵاخەکە فرێیدایە خوارەوەو ملی شکاند.
(وَقَصَ- رَأسَهُ): سەری لە ژێرەوە گرت و توند گوشی.
(-الشيءَ): شتەکەی کەم و خەوشدارو ناتەواو کرد.
(وَقِـصَ. يَوقَـصُ وَقَصاً): ملی بـە زگماکی کورتبوو.
(أوقَص): ملکورت لە خوداییەوە.
(م) وَقصـاء (ج) وُقْص): ژنێکی کورتە ملی زگماکی بۆ ملیش بەکاردێت دەوترێت.
(عُنقٌ أوقَص و عُنقٌ وقصاء): ملی کورت.
(وَقِصَ- الرَجُلُ): ملی وردبوو/ ملی شکا.
(رجلٌ مَوقُوص): ملشکاو/ مل وردبوو.
(وَقَّصَ- عُنُقَهُ): ملی شکاند.
(-السَـبُعُ): درندەکـە ملشـکاوەکەی گرت و خواردی.
(-علی النارِ): وردە چڵ و چێوی خسـتە سەر ئاگرەکە.
(أوقَصَ-هُ): کورتیکرد.
(تَوَقَّصَ- البَعيرُ): حوشـترەکە لە رۆیشـتندا لۆقەیکرد یان توند پێی بە زەویەکەدا نا.
(تَواقَصَ): لاسایی ملکورتیکردەوە.
(اَلوَقص) (مص): خەوش/ کەموکووڕیی.
(اَلوَقـص- في آلعَروض): لە کێشـی هۆزاندا لابردنـی پیتـی دووەمـی بزوێنـدار دووەم پیتی (بۆیـە وا ناونراوە وەکـو یەکێکە ملی شکابێت).
(اَلوَقَـص (مص) (ج) أوقـاص): وردە چڵ و چێو کە ئاگرەکەی پێ خۆشدەکرێت.
(اَلوَقَّـاص (ج) الوَقاقيص): توری راوکردنی باڵندە.
(«خُذ أوقَـصَ الطَريقَين»): کورتترین رێگا بگرە/ نزیکترینییان بگرە.
(اَلوَقيصَـة (ج) الوَقائـص): ١-ئێسـکە دەرپەڕیوەکەی بنی گرێی مل ٢-نێچیر.
(الوَقيصَة) (عاميه): لاکە تۆپیوی بۆگەن.
(اَلمَوقُوص) (مفع): ١-کەسـێکە ملی شکا بێت ٢-ملکورت.
(-في العَروض): لە کێشـەی شـیعردا ئەوەی پیتـی بزوێنـداری دووەمی لابرێـت. ئەوە تەنها لـە (مُتَفاعِلُـن): دادەکرێت دەبێت بە (مفاعِلُن).
وقط: (وَقَـطَ-هُ يَقِطُ وَقْطاً): ١-دایبەزەوییدا ٢-هێندەی لێدا تا پەکیخست.
(وُقِطَ- في رَأسِهِ): سەری قورسبووو کەوت.
(«أكَلْـتُ طعامـاً وقَطَنـي»): خواردنێکـم خوارد لەش و سەری قورسکردم و/ گرانکردم و خەواندمی.
(وَقَّـطَ- الصخـرُ): تاوێرەکـە چاڵـی تێدا پەیدابوو.

(إِسْتَوقَطَ- المَكانُ إِسْتِيقَاطاً): شوێنەکە چاڵبوو بەوەی خەڵكو وڵاخ پێدا ڕۆیشتن.

(الوَقْطُ والوَقِيطَةُ (ج) أَوقاطٌ): چاڵێکە باراناوی تێدا کۆدەبێتەوە.

(الوَقِيطُ (ج) وِقاطٌ وَ وِقطانٌ وَ إِقاطٌ): چاڵێکە بارانـاو دەگرێتـە خـۆی/ تیایـدا کۆدەبێتەوە.

(الوَقِيطُ (ج) وَقطى وَ وَقاطى (م) وَقِيطٌ): ١-هەمـوو لەشـگرانکراوێكو پەکخراوێـك کـە بەلێـدانو نەخۆشـی بەخواردنی زۆرو تێربوون بەزەویدا بکەوێت. ٢-کەسێکە خەوی زرا بێتو لەشی قورسو بێتابوشتبێت.

وقظ: (وَقَظَهُ- يَقِظُ- وَقْظاً): هێندەی لێدا تا نزیکی مردنیکردەوە.

(-على الأَمرِ): سەرومر لەسەر کارەکە بوو لەسەری ڕۆیشتو پێوەی بەند بوو/ جێگیربوو.

(الوَقِيظُ): کەوتوویەك کـە نەتوانێـت هەستێت/ پەککەوتە.

وقع: (وَقَعَ- الشَّيءُ مِن يَدي يَقَعُ. وُقُوعاً): شـتەکەم لە دەست (کەوتە خوارێ/ بەربووەوە).

(الحَقُّ): مافەکە چەسپی/ دەرکەوت ساغبووەوە.

(-القَولُ عَلَيهِم): پابەندبونیان بەئاخاوتنەکەوە لەسەر پێویستبوو.

(-تِ الإِبِلُ): حوشترەکان خۆیان بەزەویدا دا

(-تِ الدَّوابُّ): وڵاخـەکان بۆ حەسـانەوەو خەوتـن پەڵیان نوشـتانەوەو سـنگیان دادو کەوتن/ بەچۆکدا هاتن.

(-رَبيعٌ بِالأَرضِ) یەکەمین بارانی پەڵەباری/ پەڵەیدا کـە لە پایزدا دەبێتو زەوی سـەوز دەبێت بۆ ئەم بارانە ناوترێت (سَقَطَ المَطَرُ)

(-الطَّيرُ علـى شَـجَرٍ أَو أَرضٍ): باڵندەکـە بەسـەر درەختەکەوە نیشـتەوە یان لەسـەر زەوی نیشتەوە.

(وُقُوعٌ وَ وُقَّعٌ): باڵندەی نیشتەوە بوو.

(-في الشَّرَكِ): کەوتە داوەکەوە.

(-في أَرضٍ فَلاةٍ): لە بیابانێکی وشكو بێناودا بوو.

(-الرَّجُـلُ في عَمَلِـهِ): پیاوەکـە کارەکـەی بەشێنەیی و چاك ئەنجامدا.

(-في العَمَلِ): دەستی بەکارەکە کرد.

(-الكَلامُ في نَفسِهِ): قسەکە کاری تێکرد.

(-الأَمرُ): کارەکە ڕوویدا/ قەوما.

(«وَقَـعَ لَهُ وَقِـعٌ»): توشـی ڕووداوێکبوو/ شتێکی لێقەوما.

(-في فُلانٍ وُقُوعاً وَ وَقِيعَةً): دایە بەر جنێوو نەنگیکردو لە پاشـملەش بەخـراپ ناویبرد/ غەیبەتیکرد.

(-إِلى كَذا. وَقعـاً): بەپەلەو گورجانە بۆ لای ئەوە/ بۆ ئەوە دەرپەڕی.

(-مِن كَـذا أَو عَـن كَذا): خۆی لـەوە لاداو بەلایدا نەچووو وازی لێهێنا.

(-النَصْـلَ بالميقَعَـةِ): بەبڕبەنـد یان هەر تیژکـەرە یەکیـتر دەمی چەقۆکـە یا نووکی تیرەکەی تیژ کرد.

(نَصْـلٌ وَقيع): دەمـی تیغێك یـان تیرێکی تیژکراو.

(وَقَــعَ البَعـيرَ): پشـتی هـەردوو لاڕانـی حوشترەکەی بەخرپی داخکرد.

(-بالعَـدُوِّ وَقْعاً وَ وَقْعَـةً): لەگەڵ دوژمندا چاك جەنگی/ حەشری پێکردن.

(«وَقَعَ عِندَ فُلان مَوقِعاً حَسَناً»): لای فیسار پلەو پایەدارو شانسدار بوو/ خۆشەویستبوو.

(«وَقَعَ الأَمر مِنهُ مَوقِعاً حَسَـناً أو سَـيِّئاً») کارەکە کارێکی باشـی (لێکـرد/ تێکرد) یان خـراپ/ کارەکە لای باشـبوو یـان خراپبوو

(«وَقَــعَ مَوْقِعــاً مِــن كِفايَتِــهِ»): هێندەی پێویست دەوڵەمەند بوو.

(«فُلان يَسِفُ ولا، يَقَعُ»): لە کارەکە دەچێتە پێشەوەو نایکات.

(«هــذه نَعْلٌ لا تَقَع علــى رِجلي»): ئەمە پێڵاوێکە بە پێم ناکات.

(وَقِعَ. يَوقَعُ وَقْعاً): ١-پێپەتیبوو/ پێخاوسبوو ٢-هاواری قاچی لێهەسـتا لەبەر بەردەڵانیی و ڕەقیی زەویەکە.

(وَقِــعٌ): قــاچ ئازاراویــی هــی خراپیــی و بەردەڵانیی ڕێگەکە.

(وُقِعَ فِي يَدِهِ=سُقِطَ فِي يَدِهِ): پەشیمان بووەوە.

(وَقَّعَ-الوَبَرُ ظَهْرَ البَعيرِ): تووکی حوشترەکە لەسەر پشتی و کەمەری کاری تێکرد.

(-المَطَرُ الأَرضَ): باران لە هەندێك شوێندا گیای رواند و لە شوێنی تردا هیچی دەرنەکرد.

(- العَهْدَ أو الفرمانَ): مۆری سوڵتانی لەسەر پەیمانەکەدا یان لە فەرمانی سوڵتاندا.

(-الكِتــابَ أو الصَــكَّ): نــاوی خۆی لەســەر دامێنی نامەکە یان چەکەکە نووسی.

(-الكاتِــبُ الكِتابَ): نووســەرەکە نووســینە زیادەکانی کتێبەکە یان نامەکەی لابرد.

(-تِ الإِبلُ): حوشــترەکە بــە چۆکدا چوو و خۆی بە زەویدادا.

(-ظَنَّهُ على الشـيءِ): شـتەکەی خەملاندو بۆی چوو.

(-عَلى فُلان): گومانی لە فیسار پەیداکرد و/ گومانی بۆ برد.

(-الصَّيقَلُ على السَّـيفِ): چەرخچییەکە یان شتیتیژکەرە کە دەمی شمشێرەکەی تیژ کرد.

(-تِ الحِجـارَةُ حافِرَهُ): بەرد قەراغی سـمی وڵاخەکەی لەت و پەت کرد.

(-القَــومُ): خوێنشــگەل بــۆ حەســانەوە لە گوزارەکەدا دابەزین.

(واقَــعَ-هُ. وِقاعــاً وَ مُواقَعَــةً): لەگەڵیــدا (جەنگی/ شەڕیکرد).

(-الأُمورَ): کارەکەی هێنایە نزیکەوە و دەستی پێکرد.

(أَوقَعَ-هُ إيقاعاً): خستی.

(-بِالعَــدُوِّ): توند لەگــەڵ دوژمنـدا جەنگیو شپرزەیکردن.

(-بِهِ الشَّرَّ): خراپی بەسەرهێناو گرفتاریکرد.

(-الدَهرُ بِهِ): ڕۆژگار ناهەمواریی بەسەرهێنا و سەختیی بەسەرهێنا.

(-تِ الروضَةُ): میرغوزارەکە ئاوی گرتەخۆی

(-المُغَنِّي): گۆرانیبێژەکە بە پێی سەنگ و بار و شوێنی خۆی ئاوازەکەی داناو ڕێکخست یان ڕوونی کردەوە.

(تَوَقَّعَ-الأَمرَ): چاوەڕێی ڕوودانی کارەکە بوو

(تَواقَعَ-الأَعــداءُ): ١-دوژمنــان لەگەڵ یەکدا (جەنگین/ بەشــەڕهاتن/ شــەڕیانکرد) ٢-لە یەکتریان کوشت/ بەسەر یەکدا تلانەوە.

(إِســتَوقَعَ-الأَمرَ): چاوەڕێی ڕوودانی کارەکە بوو ٢-مەترسی ئەوەی هەبوو ڕوویدات.

(-السَــيفُ): شمشــێرکە تیــژ کردنــەوەی دەویست.

(اَلواقِــعُ (ج) وُقَّــع وَ وُقــوع) (فــا): ١-بوو ٢-ڕووداو ٣-ڕاستی.

(طائِرٌ واقِعٌ): باڵندەیەك کە لەسەر درەختێك یان هێلانەکەیدا هەڵنیشتبێت.

(«رَجُــلٌ واقِعِ الطَــيرِ»): پیاوێکــی نەرمی بێدەنگ.

(اَلنَسْــرُ الواقِــعُ) (فــك): داڵــی داکەوتــوو ئەستێرەیەکە نزیك حەوتەوانەیە.

(اَلواقِعَةُ): ١-مێی وشەی(الواقع) ە ٢-بەیەکدادان لــە جەنگدا ٣-(چورتوم/ وەی/ ئاپۆرە/ بەڵا)ی ڕۆژگــار ٤-قیامــەت/ ڕۆژی زیندوبوونــەوەو لێپرســینەوە چونکە بەســەر خەڵکــدا دێتو هۆشیان لێدەبرێت.

(رَجُــلٌ واقِعَةٌ): پیاوێکی دلاوەر/ دلێر/ ئازا/ نەبەرد/ بەجەرگ.

(اَلواقِعــي): کەســێکە کە ژیان ڕاســتەقینە دەبینێــت/ چۆنــە وای دەبینێت ٢-کەســێکە لەسەر ڕێڕەوی ڕاستەقینەبینەکان دەڕوات.

اَلواقِعِيَّةُ: ڕاستەقینەبینین ئەمە ڕێڕەوی ئەوانەیە کە بڕوایان بە گەوهەری شتەکانە بە ڕووتی.

(اَلواقعيــة في الأَدَب و الفَــن): لــە وێــژەو هونەردا شتەکان بە ڕاستەقینە چۆنە وا وێنە بگیرێتو وا پیشــان بدرێت گەرچی ناشیرینو قێزەونیش بێت.

(اَلوَقع)(مــص): ١-دەنگی بەرکەوتنو لێدانی شت.

(الوَقْعَة): دەنگێکی بەرکەوتن و لێدانی شت

(«سَــمِعْتُ وَقْــعَ حافر الدابَّــه»): گوێم لە تەپەی پێی وڵاخەکە بوو.

(«ســمعتُ وَقْعَ المطر»): گوێــم لە خرمەی بارانبوو ٢-بەرزترین شــوێنی شاخ/ (لووتکە/ پۆپە)ی شاخ (بۆیە وا ناونراوە ئەوەی دەچێتە ئەوێ دەترسێت بکەوێتە خوارەوە) ٣-هەوری تەنك ٤-چەوی بوحس/ چەوە وردە.

(«لِفُــلان وَقْعٌ عِندَ الأَميرِ»):فيســار ڕێز و پایەی لای میر هەیە/ قسەی ڕەوایە.
(الوَقَع (مص) الواحِدةُ وَقْعَة):وردە چەو.
(الَوقِع):هەوری تەنك.
(الَوقْعَــة (ج) وَقَعَــات):١-جارێــك کەوتن/ کەوتنێــك ٢-هەمــوو لێقەومانێکــی لەپــڕ ٣-بەرکەوتنێکــی لە ناکاوو و پــاڵ پێوەنانێك ٤-بەیەکدادان لە جەنگــدا ٥-خەوی (دوادوای شــەو/ بەرەبەیــان) ٦-جارێــك لــە ڕۆژێکدا بــۆ سەرپێشــاوچوون ٧-داپەڕینــی باڵنــدەو نیشتنەوەی.
(وَقْعَةُ السَّــيفِ): داهاتنەوە و پێداکێشــانی شمشێر.
(الَوقْعَــة) (عند العامَّة) ئــەوەی بە ژەمێك دەخورێت.
(الِوقْعة): جۆری کەوتن یان داپەڕین.
(وِقاع كقِطام): داخێکی خرە کە لە هەردوو ڕانی ولاخدا دەکرێت و دەدرێت.
(الَوقاعَة): ڕەقیی و ســەختیی زەوی کە ئاو هەڵنەمژێت.
(وِقاعَةُ الســترِ): دامێنی پەردە کە بکەوێتە سەر زەوی کە دادرایەوە.
(الَوقَّاع و الوَقَّاعَة): کەسێکە کە ناوی خەڵك لە پاشــملە بە خراپە دەبــات/ غەیبەتکەر/ ئاشووبگێڕ/ خەڵك بەیەکدادەر.
(الَوقيع (ج) وُقَع):١-ئاسنی نووکی تیر و نێزە و شمشــێر و چەقۆ و شتی لەو بابەتانەی تیژ ٢-ســمی بەربەرد کەوتووی قڵیشــاو ٣-شوێنی سەخت و ڕەقەن کە ئاو هەڵنەمژێت.
(وَقيعُ الرَجُلِ):کەســێکە کە پەنا بەرێت بۆ پیاوێك.
(«أَنا وقيعــك»): من پەناهێــن‌و پەنابەری تۆم.
(الَوقيعَة (ج) وِقاع وَ وَقائِع):١-بەیەکدادانی لەناکاوی جەنگ و کوشتار و بڕێ ٢-لە پاشملە بەخراپــە ناوبردنــی خەڵــك/ غەیبەتکردن ٣-چاڵێك کە ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە و دەبێتە زەلکاو.
(وَقيعَةُ الطائِرِ): شــوێن نیشتنەوەی باڵندە کە بەو شوێنە ڕاهاتبێت.
(وَقائِعُ العَرَبِ): ڕۆژانی جەنگەکانی عەرەب.
(الإِيقــاع):هاوئــاواز بوونــی دەنگــەکان لە گۆرانیدا و گونجانیان لەگەڵ یەکدا.
(التَوقيع) (مص):١-مۆرکردن/ شــەقڵکردن/ ئیمزاکردن/ ئیمزا/ مۆر/ شــەقڵ. ٢-لابردنی شــتی زیــادەی نووســراوێك ٣-پوختەکردنی نووســراوێك ٤-مەزندەکــردن و بۆچــوون‌و خولیای شتێك.
(تَوْقيع السلطان):مۆرکردنی سوڵتان‌و نیشانە کردنی لەسەر بیسمیلای سەر نووسراوەکە.
(الَموقِع (ج) مَواقِع):شوێن/ جێ/ یان شوێنی ڕووداوەکە/ شوێنی بەربوونەوە.

(مَواقِعُ القطرِ): شوێن دڵۆپە/ ناوەڕێژ.

(مَواقِــعُ القتــال): شــەرگە/ (مەیدانــی/ گۆڕەپانی) جەنگ و بەیەکدادان.

(مَوقَعَــةُ الطائِــرِ (ج) مَواقِــع): شــوێنی نیشتنەوە و وەستانی باڵندە.

(اَلمُوَقِّع) (فا): ١-ئیمزاکــەر/ مۆرکار/ خاوەن ئیمزا ٢-پیســووك كــە هێــواش پێدادەنێت و دەروات ٣-پارێزەری مۆری سوڵتان و ئیمزاکەی کە لە سەروو بسمیلاکەوە دەیکات ٤-نووسەری ئیمزاکە.

(اَلمُوَقَّــع) (مفــع): ١-وەی بەرکەوتــوو/ بەلاگرتوو/ گرفتاری چورتــووم ٢-مۆرکراو/ ئیمزاکراو ٣-ڕێی خۆشــکراو ٤-چەقۆ و تیغی تیژکراوی تەنککراو.

(اَلمَوقــوع) (مفع): ئەوەی بەربەرد دەکەوێت تیژ و تەنك دەبێت.

(قَدَمٌ مَوقُوعَةٌ): پێیەکی زبری ڕەقی ئەستوور.

(اَلمِیقَعَةُ (ج) مَواقِع): ١-چەکوش ٢-گەلاکوتك کە بەرگــی پێدەکوتن و ســپیی پێدەکەنەوە ٣-بربەندێکی درێژ کە شتی پێ تیژ دەکەن.

(مِیقَعَــةُ الطائِــرِ): شــوێنی لێنیشــتنەوەو پێراهاتنی باڵندە/ پەلەوەر.

وقف: (وَقَفَ. یَقِفُ وَقْفاً وَ وُقُوفاً): وەســتا/ بێجووڵە بوو ٢-بەپێوە وەستا.

(-في المَســألَةِ): لەســەر پرســە بابەتەکە بە گومانەوە/ بە دوودڵییەوە وەستا.

(-القارِئُ): خوێنەرەکە لەسەر وشەکە وەستا و بێدەنگیکــرد/ زەنەدارییکردو لە وشــەکانی تری دوای خۆی دابڕی.

(-علی الأمرِ): کارەکەی هەڵگێڕ و داگیر کرد و لێیوردبووەوە تێیگەیشت و زانی.

(وَقَــفَ الدابَّــةَ وَقْفــاً): وڵاخەکەیڕاگرت/ وەستاند.

(-هُ عَنِ الشــيءِ): نەیهێشــت بگاتە شتەکە/ بەری شتەکەی لێگرت.

(-الدارَ): خانووەکەی بە وەقفی خودا کرد.

(«وقَفَها لَهُ و عَلَیه»): کردی بە وەقفی ئەو، دایە و بۆ ئەوی تەرخانکرد.

(-الأمرَ علی حُضُورِ فلان): کارەکەی لەسەر ئامادەبوونی فیســار ڕاگــرت/ بڕیاری کۆتایی کارەکەی بەست بە ئامادەبوونی فیسارەوە.

(-هُ علــی الذَنْــبِ): گوناهەکەی پیشــانداو خستەڕوو/ لە گوناهەکەی ئاگادار کرد.

(-القِدرَ بالمِیقاف): مەنجەڵەکەی بە چیلکەی تێوەردانەکە لە هەڵچوون خست.

(-عَلَیــهِ): وێڵەمەیکــرد/ ســەرنجی لێداو تێیڕوانی.

(- النَصرانِــيُّ وَقِّیفــی): دیانەکــە بوو بە مجێوری/ کارگــوزاری کڵێســەکە/ خزمەتی کڵێسەکەیکرد.

(وَقَّــفَ-هُ): وەســتاندی/ ڕایگــرت/ بە پێوە ڕایگرت و وەستاندی.

(-الـتُرسَ): دەوری قەڵغانەکـەی بـە تەنکە ئاسنی باریك گرت.

(-المَرأةَ): بازنی کردە دەستی ژنەکەوە.

(-الســرجَ): زینەکەی وا چاك کرد کە پشتی ئەسپەکە نەگرێت و برینداری نەکات.

(-الحَديـثَ): فەرمایشـتەکەی لێکدایـەوەو ڕوونیکردەوە.

(-القـارِئَ): خوێنەرەکـەی فێرکـرد کە لە خوێندنەوەدا لە کوێدا بوەستێت.

(-الجَيشَ): سوپاکە بەریز یەك لە دوای یەك وەستان.

(-تِ المَـرْأَةُ يَديها بالحَنـاءِ): ژنەکە هەردوو دەستی بە خەنە خاڵخاڵاویکرد.

(-الدابَّةَ): وڵاخەکەی (وەستاند/ ڕاگرت).

(-فُلاناً على ذَنبِهِ): فیسـاری لە گوناهەکەی ئاگادار کرد.

(واقَـفَ-هُ في الحَرب أَو الخُصومَـةِ وِقافاً): لە شـەڕدا یان لە دوژمنایەتیدا لەگەڵ یەکدا وەستان و کۆمەکی یەکتریانکرد.

(-هُ علـى كـذا): داوای لێکرد لەسـەر ئەوە وەستاو و جێگیر بێت.

(أَوقَفَ-هُ): وەستاندی/ ڕایگرت/ ڕایوەستاند.

(-الدارَ): خانووەکەی کرد بە وەقفی خودا.

(-الجارِيَةَ): بازنی بۆ کەنیزەکە کرد/ دایە.

(-عَنِ الأَمرِ): وازی لە کارەکە هێنا و دەسـتی لێهەڵگرت/ بەجێیهێشت.

(تَوَقَّفَ-في المَكانِ): لە شـوێنەکەدا وەسـتاو مایەوە.

(-على الأَمرِ): لەسـەر کارەکە وەستاو خۆی خایانـد/ مایـەوەو چاوەڕێـی ئەنجامیکرد/ پێوەی بەندبوو.

(عَن كذا): دەسـتی لـەوە هەڵگـرت و وازی لێهێنا/ بەلایدا نەچووەوە.

(تَواقَفَ-القَـومُ في الحَـربِ): خوێشـگەل لە جەنگدا شان بە شانی یەك وەستان و کۆمەکی یەکتریان کرد.

(إتَّقَـفَ): ١-وەسـتاو ٢-ڕاگـیراو ٣-وەقف بوو ٤-بەشتێکەوە بەندبوو و وەستاو ٥-ڕاماو.

(إسْتَوقَفَ-هُ): داوای لێکرد بوەستێت و ڕایگرت و ناچاری وەستانیکرد.

(ألواقِف (ج) وُقْف وَ وُقُوف) (فا): ١-وەستاو/ لەکارکەوتـوو ٢-ڕاوەسـتاو ٣-ڕاسـتەوەبوو/ هەستاو ٤-پێزان و ئاگادار لە شتێك.

(الواقِـف عِندَ الفُقَهاء): لای شەرعناسـەکان کەسـێکە کە شتی خۆی/ موڵکی خۆی وەقفی ڕێی خودا بـکات و کەڵکەکەی بەڕێی خودادا بدات یان سەرپەرشـتیاری وەقفـی خەڵکیتر بکات.

(ألوَقْف) (مص): ١-لە خوێندنەوەدا وەستان و برینی وشـەکە لەوانی تر کـە بەدوایدا دێن ٢-بـازن کە لە عاج یـان لە هەر شـتێکی تر بێت ٣-لای کێشـی شـیعر ناسـەکان بێدەنگ

کردنــی حەوتەمین پیتی ســەروبۆردار وەك بێدەنگ کردنی/ زەنــەدار کردنی پیتی (ت) لە (مَفْعُولات)دا.

(-مِنَ الــتَرس): قەراغی قەڵغــان بە باریکی ئاســن یان شــاخی نــاژەڵ یان عــاج یان هەر شتێکی تری تێبگیرێت.

(اَلوَقْــف (ج) أوقَاف وَ وُقُوف عندَ الفُقَهاء): لای شەرعناســەکان ئەوەیە وەقفکردنی هەر شــتێك بێت لە ڕێی خودادا یان هەر شتێکیتر کە وەقفکەرەکە وەقفی کردبێت یان هەرچی لە ڕێــی خودا دانرابێت قازانجەکەی بۆ خودا دەکرێــت بەخێــر بــە شــتەکەش دەوترێت (وَقف): وەقف.

(الوَقفَــة): ١-جارێــك وەقفکــردن ٢-جارێك وەستان/ پشوودان ٣-گومان.

(مِنَ التَرسِ): قەراغ تێگرتنی قەڵغان.

(اَلوَقّاف): ١-لەســەرخۆ/ شێنەیی ٢-دەست لە شەرکێشەرەوە/ شەڕنەکەر.

(اَلوَقّافَة): سڵکەرەوە و ترسنۆك کە دەوەستێت و ناچێتە بەرەوە/ پێشەوە.

(اَلوَقیفَة): زیندەوەرێکی ڕاونراو کە ماندوو دەبێــت و ڕادەوەســتێت ٢-هەر شــوێنێك کە سەگەل ڕێ بۆ خاوەنەکانی بگرێت.

(التَوقیف)(مص)١-بەندکردن ٢-پاراستن و چاودێــری کــردن ٣-بەرلێگرتن ٤-ڕاگرتنی خــوێــنــدەرەوەیــەك لــەســەر وشــەیــەك

٥-نیشانەیەك لەسەر تیری قومار ٦-سپێتیی شوێنی بازنی دەست ٧-هێڵی ڕەش یان هێڵی بازنەیی لە قولەپێی چوارپێدا.

(اَلمَوقِف): وێــستگە/ ئێستگە/ وەستگە ٢-بار/ دۆخ ٣-هەڵوێست.

(مَوقِف المَرأة المَحَّیة): دەست و چاو و ئەوەی ژن، کە پەچــە و عەبا دەیپۆشــێت دەتوانێت دەریبخات.

(اَلمَوقِفان) (ع ا): دوو دەمارن خولی ئێسقانی دواوەی مــرۆڤ دەدەن ئەگەر کرژ بن مرۆڤ ناتوانێت هەستێت.

(اَلمَوقِفَة): شوێنی وەستان.

(اَلمُوَقَّف)(مفع) مِن الدَّواب): چوارپێیەك کە هەردوو باڵی بەخرپی داخکرابێت.

(ضَرعٌ مُوَقَّفٌ): گوانێك کە شــوێنی بەستنی پێوە دیاربێت.

(رَجُــلٌ مُوَقَّــفٌ): پیاوێــك کەرۆژگــار قاڵی کردبێت.

(رجُلٌ مُوَقَّفٌ علی الحَقّ): پیاوێکە هەمیشە لایەنی ڕاستیی دەگرێت.

(دابَةٌ مُوَقَّفَة): چوارپێیەك کە هێڵی ڕەش بە قولەپێیەوە بێت.

(اَلمیقــاف)(ع ا): وەســتێنەر: بەرزییەکە لە ئامێرێکــی میکانیکیدا کــە مەکینەکەی پێ دەوەستێنرێت.

(اَلمیقاف و المِیقَف): چەوێڵێکە/ چیلکەیەکە

مەنجەڵی پێ تێکهەڵدەدرێت تا هەڵچوونەکەی پێ دابمرکێنرێتەوە.
(أَلمَوقوف)(مفع): ١-وەستێنراو/ لەکارخراو ٢-گیراو/ بەندکراو. (أَلمَوقوف عِندَ الفُقَهاء): لای شەریعەتناسەکان وەقفکردنی موڵك و ماڵ و شتی تر لە ڕێی خودادا.
وقل: (وَقَلَ يَقِلُ وَقْلاً): پێیەکی هەڵبڕی و پێکەی تری لە زەوی توند کرد.
(وَقَلَ وَ تَوَقَّلَ-فِي الجَبَلِ): بەسەر شاخەکەدا سەرکەوت.
(أَلوَقْل) (مص): بەسەر شاخدا سەرکەوتن
(وَقْلَة (ج) أَوقال)(ن): درەختی دارخورمای باوەشین.
(المُقْل): بەری درەختی دارخورمای باوەشێن.
(أَلوَقَل): ١-بەرد ٢-بنی پەلی بڕراو کە بە درەختەکەوە دەمێنێتەوە و بەرزە بۆ چوونەسەر درەختەکە یاریدە دەدات.
(أَلوَقَل وَ الوَقِل و الوَقُل-مِنَ الخَيل): ئەسپی بە بەرزیدا سەرکەوتوو.
(أَلوَقْلَة (ج) وَقُول): ناوکی بەری دارخورمای باوەشێن.
(«رَجُلٌ وَقْلَةُ الرأسِ»): پیاوی سەر زۆربچووك.
(فَرَسٌ تَوْقَلَةٌ): ئەسپێکە بە شاخدا چاك سەردەکەوێت.
وقم: (وَقَمَ-الدابَّةَ يَقِمُ وَقْماً): جڵەوی ولاخەکەی ڕاکێشا تا بوەستێت/ ولاخەکەی جڵەوگیر کرد.
(-القِدْرَ): مەنجەڵەکەی لە کوڵ خست و دەنگی کوڵی بری.
(وَقَمَ وَ وَقَّمَ و أَوقَمَ-الرَجُلَ وَقْماً): پیاوەکەی ڕووشکێن کردو زۆر ناشیرین دەستی بە ڕوویەوە ناو پێداویستییەکەی نەدایەوە.
(وُقِمَ-تِ الأَرضُ): گیای زەویەکە خوراو پێخوستکرا/ زەویەکە پێشێلکرا.
(تَوَقَّمَ-الرَجُلَ): هەرەشەی لە پیاوەکە کرد.
(-الكَلامُ): قسەکەی هەڵگرت و چووە دڵیەوە/ تێیگەیشت.
(-الشيءَ): نیازی شتەکەیکرد.
(-الصَيدَ): نێچیرەکەی کوشت.
(أَلوَقام): ١-قامچی ٢-شمشێر ٣-داردەست ٤-گوریس/پەت.
(أَلمَوقوم) (مفع): ١-دڵشکست/ خەفەتبار/ داخ لەدڵ ٢-دەست بەڕوووەوە نراو/ کەسێکە بۆ شتێك بچێت و نەیدەنێ.
٢-(تَوَقَّمَ-فيه): زۆر هەڵینا و درێژەی دایە.
وقن: (أَوقَنَ و تَوَقَّنَ إيقاناً): باڵندەکەی بەسەر هێلکەکەیەوە لە هێلانەکەدا گرت یان لە هێلانەکەیدا ڕاوی کرد.
(تَوَقَّنَ-الوَعْلُ فِي الجَبَلِ): کەڵەکێوییەکە سەرکەوتە سەر چیاکە/ شاخەکە.
(أَلوُقْنَةُ و الأُقْنَةُ (ج) وُقنات وَ أُقْنات):

هێلانەی باڵندە و شوێنی هێلکەکانی.
(اَلمَوقُونَةُ-مِن الجُواري): کەنیزەکی جیاکراوە لە دەوارێکدا یان لە شوێنێکی جیای ماڵەکەداو پارێزراوبن.
وقــه: (وَقَهَ وَ وَقِهَ وَ أيْقَهَ واسْــتَيقَهَ لِفُلانٍ. يَقِهُ. وَقْهاً): ملکەچ و فەرمانبەری فیسار بوو.
(إتَّقَهَ-لفــلان): گوێڕایەڵی بــوو/ ملکەچیی کرد.
(-عَنهُ) لێیبووەوە.
(ألوافِهُ): سەرپەرشتیاری فرۆشتن.
(اَلوَقْهَــةُ): بەگوێکــردن/ ملکەچبــوون/ بەفرمانیکردن/ بۆ ملکەچبوون.
وقــي: ١-(وقى-فُلاناً. يَقي. وِقايَةً وَ وَقْياً وَ واقِيَةً): پاراستی و لە ئازار دووری خستەوە.
(«وَقاهُ اللهُ الســوءَ وَ مِنَ الســوءِ»): خودا لە خراپە و ناخۆشی پاراستی و ئاگاداریکرد.
(وقى-الأمــرَ. وَقْيــاً وَ وُقْيّــاً): کارەکــەی چاککردەوە/ ڕاستکردەوە.
(وقى وَ وَقِيَ-الفَرَسُ مِنَ الحَفا وَقْياً. يُوْقى وقَىً): چارەوێکە نەیدەوێرا سمەکۆڵەوارەکەی دابنێتــە زەوی و نەیدەتوانی بڕوات یان غار بکات.
(تَقــى يَتقي تُقــىً وَتِقاءً وَ تَقِيَّــةً): خۆی پاراست/ سڵی کردەوە/ پارێزیکرد.
(وَقّى-فُلاناً): فیســاری پاراســت لــە ئازار و گرفتاریی دوورخستەوە.

(إتَّقــى إتِّقــاءً): ١-بــوو بــە خۆپارێــز ٢-لە نافەرمانیی خودا خۆی لاداو خۆی پاراســت/ سڵکەرەوەو خوداناسبوو.
(إتَّقَينا-بِــهِ): خســتمانە پێــش خۆمانەوە خۆمان لــە دوژمن پێپاراســت و ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە.
(إتَّقى وَ تَوَقّى-فُلاناً. إتِّقاءً وَ تَوَقِّياً) ١-خۆی لە فیســار پاراست و ســڵی لێکردەوەو لێیترسا ٢-خۆی لێلادا و لێی دوور کەوتەوە
(«ما أتْقاهُ لِلّهِ»): ئای کە لە خودا دەترسێت‌و خۆی لە نافەرمانیی خودا دەپارێزێت/ ئای چ خوداپەرستێکە.
(فَرَسٌ واقٍ): چارەوێیەکە لە تاو ئازاری سمی سل لە ڕۆیشتن دەکاتەوەو لێیدەترسێت.
(سَرجٌ واقٍ): زینێکی قۆقز.
(اَلواقِيَــةُ (مــص) (ج) واقِيــات وَ أواقٍ): مێی وشــەی (الواقي): ژنــی خۆپارێز. مێی سڵکردوو.
(اَلوَقاء و الوِقاء والوَقايَة والوِقايَة و الوُقايَة) ١-پارێزگاریــی/ خۆپارێزیــی/ خۆپاراســتن ٢-هەرچی ببێتە هۆی پاراســتن وەك ســپێر/ سەنگەر، پەنا، پەناگا، پەرژین.
(رَجُــلٌ وَقّــاء): پیاوێکــی زۆر ســڵکەرەوەو خۆپارێز.
(سَرجٌ وَقِيٌّ): زینێکی قۆقزی نارەحەت.
(اَلتُقــاة (ج) تُقــى): ١-خــودا پەرســتیی‌و

خۆلادان له نافەرمانیی خودا ٢-سڵکردنەوەو خۆپاراستن/ خوداپەرستن.
(التَقـوی): خوداپەرستییو لـە گونـاه خۆپارێزیی/ فەرمانباریی خودا.
(اَلتَّقِـيّ (ج) اَتْقِيَـاء وَ تُقَـواء والمُتَّقـي): خوداپەرست و خۆپارێز له نافەرمانیی خودا/ ملکەچی فەرمانی خودا.
(اَلمُوَقَّی)(مفـع): ئـازا/ دلێـر/ نەبـەرد کە خۆیانی لێ دەپارێزن.
٢-(الواقِي و الواق)(ح): قەلەڕەشکە. دەشڵێن (بازوور)ە (کە باڵندەیەکی سەرزلی سك سپیو سەر سەوزە باڵندەی بچووکتر دەخوات).
(اَلأُوقِيَّـة (ج) أَواقِـيّ وَ أَواقٍ و الوُقِيَّة (ج) وُقِـيّ وَ وَقايا): هۆقە کـە (١٢\١١)ی ڕەتڵێکە/ باتمانیکە.
وك: (وَكْوَكَ-الحَمـامُ): کۆترەکـە گماندی/ کوکوی کرد.
(-فُلانٌ مِن الحَربِ): فیسار له شەڕ هەڵات.
(وَكْـوَكَ وَتْوَكوكَ-الرَجُلُ): وارۆیشـت وەك خۆی تل بکاتەوە.
(اَلوَكْواك): ١-زیرەکردوو/ زۆر ترسـنۆك ٢-لە رۆیشتندا خۆ تلکەرەوە.
وکأ: (تَكِئَ-الرَجُـلُ يَتْكَأُ تَـكْأً): پاڵیدایەوە/ خۆی بەسەردادا/ شانیدادا.
(واكَأَ-علـى يَدَيــهِ. مُـواكاةً وَ وِكاءً): خۆی خسـتە سەردەسـت. هەردوو دەسـتی بەرز کردەوە و کەوتە پارانەوە و نزا و دوعا.
(أَوكَأَ. إِيكاءً): پاڵپشتی بۆ دانا.
(-على الشيءِ): ١-پاڵی بە شتەکەوە دا و پشتی پێبەست و خۆی بەسەردادا.
(اَتْكَأَ إِتْكاءً) ١-وەك پاڵپشـت داینا ٢-کردی بە پاڵپشت تا پاڵی پێوەبدات.
(تَوَكَّأَ-علـى عَصـاهُ): خـۆی بەسـەر داردەسـتەکەیدا داو پشـتی پێبەست/ گیانی بەداردەستەکە بوو.
(إِتَّكَأَ-على السَّريرِ إِتِّكاءً): لەسەر نوێنەکە دانیشت و پاڵیدایەوە یان دانیشـت شـانی یان تەنیشـتی دادایە سەر شتێك یان پاڵی پێوە دایەوە.
(-على عَصاهُ): خۆی بەسەر داردەستەکەیدادا و پشتی پێبەست.
(-القَومُ عِندَهُ): لای ئەو نانیان خوارد.
(اَلتُـكَأَةُ): ١-ئـەوەی پاڵـی پێوەدەدرێـتو خوبەسەردا دەدرێت وەك داردەست و گۆچان و شـتی تر. ٢-پیاوی قـورس و قەبە کە زۆر پاڵدەداتەوە.
(اَلإتِـكاء) (مـص): پاڵدانەوە/ پشـتدانەوە پشـت بـە شـتێك یـان کەسـێك بەسـتنو خۆبەسەردادان.
(-عِند أَهـل العَروض): لای کێشناسـەکانی هۆزان/ شیعر، ئەوەیە: وشە و ناواخن و پیتی زیـاد بخرێتە هەڵبەسـتەکەوە کە پێویسـت نەبێت.

(اَلْمُتَّــكَأُ (ج) مُتَّكَآت): ئەوەی کــە پاڵی پێوە دەدرێــت و پشــتی پێدەبەســترێت/ خــۆی بەسەردادەدرێت.

وکب: ١-(وَكَبَ-يَكِبُ وَكْباً): هەستایە سەرپێ و قنج بووەوە/ قنج ڕاوەستا.

(وَكِبَ وَ وَكَّبَ-التَمْرُ يُوكَبُ. وَكَباً): خورماکە تەواو پێگەیشتو ڕەشداگەڕا.

(اَلْواكِبَة): پەلێکی چوارپێ.

٢-(وَكَبَ-على الأمرِ يَكِبُ. وَكْباً): ســەروەر خەریکی کارەکە بوو/ بەردەوامبوو.

(-وَكْبــاً وَ وُكُوبــاً وَ وَكَباناً): بەشــێنەیی و لەسەرخۆ ڕۆیشت/ پەلەینەکرد.

(وَكَّــبَ- النّاقَــةَ): دەزووی بەســتنی گوانی مێحوشترەکەی توند کرد.

(واكَبَ-علــى الأَمــرِ): بێپشــوو لەســەر ئەنجامدانــی کارەکــە خەریکبوو/ ســەروەر بوو/ لە کارەکەدا بەردەوام بوو.

(المَوكِبُ): پێبەپێی دەســتەڕەوەکە/ کۆمەڵە ڕۆیشتووەکە ڕۆیشت/ لەگەڵیاندا ڕۆیشت.

(أَوكَبَ-إيكابــاً): لەگــەڵ دەســتەڕەوەکەداو پێبەپێی ئەوان ڕۆیشت.

(-علــى الأمــرِ): بــۆ ئەنجامدانــی کارەکە سەروەر خەریکبوو.

(-الطائِرُ): باڵندەکــە ئامادەی فڕین بوو یان بە نیشتنەوەوە باڵی بەیەکدادا.

(اَلْوَكّاب): خەمناك/ هەمیشە (پەژارەداگرتوو/ خەفەتبار).

(ظَبيَةٌ وَكوبٌ): ئاسکێك کە لە ڕەوەکەی جیا نابێتەوە.

(اَلْمَوكِــب (ج) مواكِــب): ١-دەســتەڕەوێك ســوارەبن یان پیادە ٢-گەلە حوشــتر سوار، بۆ نواندن و جوانیی.

٣-(وَكِــبَ وَ وَكَّبَ-الثَــوبُ. يَوكَــبُ وَكَبــاً): جلەکە/ پۆشاکەکە پیسبوو.

٤-(أَوكَبَ-هُ إيكاباً): تووڕەیکرد.

وکت: (وَكَــتَ. يَكِــتُ وَكْتاً): لە ڕۆیشــتندا پێگرانبوو و هەنگاوی کورت کورتینا.

(-تِ الدابَّةُ): وڵاخەکە خێرا پێی هەڵدەبڕی و دایدەنایەوە/ خێرا دەکرد.

(اَلْوَكات): هەنگاوکورت و پێگران و ناشــیرین ڕۆیشتوو.

(اَلْوَكيــت): دووزمانیــی/ بوختانکــردنو قسەچنیی.

٢-(وَكَتَ-الكِتــابَ يَكِــتُ وَكْتــاً): پنتــی بۆ نووسینەکە دانا.

(-في المَشــي): پنتی خستە شــتەکەوە/ پنت پنتیکرد/ خاڵخاڵیکرد.

(وَكَّتَ-البُسْرُ تَوكيتاً): خورما سەوزەکە خاڵی زەردی تێدا پەیدابوو.

(اَلْوَكت (مص): شتێکی کەم.

(اَلْوَكْتَةُ): شوێنکار لە شتێکدا وەك خاڵ کە لە ڕەنگی شتەکە نەبێت کە تیایداکرد.

٣-(وَكَتَ-القَـدَحَ. يَكِـتُ وَكْتـاً): پیاڵەکەی پڕکرد.
(وَكَّتَ-القَرِبَةَ): هیزەکەی یان مەشـکەکەی پڕکرد.
(اَلمَوكُـوت (مفـع)) ١-خەفەتبـار/ دڵ پڕ لە جەخار/ ٢-دەمەراقکردوو.
وكح: (وَكَحَ-هُ بِرِجلِهِ يَكِحُ وكْحَاً): توند پێی پێدانا/ توند خستیە ژێرپێی.
(أوْكَـحَ: إِيكاحاً): هیچی بـە دەرۆزەکەرەکە نەداو لێی توند بوو.
(-فِي الحَفرِ): لە چاڵاو هەڵکەندندا گەیشـتە تاوێر یا شوێنی سەخت
(-العَطِيَّة): بەخشینەکەی بڕی و نەیدا.
(إِسْتَوكَحَ-تِ الفَراخُ إِستيكاحاً): جووچکەکان قەبە و زلە بوون.
(«سَأَلَهُ فاسْـتَوكَحَ»): سـواڵی لێکرد هیچی نەدایە/ چڕوکیی لەگەڵدا کرد.
(اَلواكِح أو الوَكوح): جوچکێکی قەبە و زلە.
(ج) اَلوُكُح (اَلأَوْكَح): بەرد ٢-شوێنی ڕەقەن و سەخت.
٢-(أَوكَح. إِيكاحاً): شەکەتبوو.
(-عَنِ الأَمرِ): وازی لە کارەکە هێنا/ دەسـتی لە کارەکە هەڵگرت.
٣-(اَلأَوْكَح): خاك/ خۆڵ/ گڵ.
وكـد: ١-(وَكَدَ-بِالمَـكانِ يَكِـدُ وُكـوداً): لە شوێنەکەدا نیشتەنیبوو/ جێگیربوو.

(-الشَـيءَ وَكْداً): نیازی شتەکەیبوو شتەکەی ویست و بۆیچوو.
(«وَكَـدَ وَكْدَهُ»): وەك ئەوی کرد/ چاوی لەو کرد/ نیازەکەی ئەوی هەبوو.
(-الأَمرَ): بە کارەکەوە خەریکبووو کردی.
(وَكَدَ وَ وَكَّـدَ و أوكَدَ و أكَّدَ و آكَدَ- العَهْدَ أو السَـرجَ. وَكْداً): پەیمانەکەی بنجبەست کرد یان زینەکەی توند شەتەکدا و قایمیکرد.
(تَوَكَّـدَ و تَأَكَّدَ): ١-مەحکەم و دامەزراو بوو/ قایم و توند بوو/ چەسـپی ٢-سەلمێنرا/ ساغ بووەوە. ٣-لێی دڵنیا بوو.
اَلوَكْد (مص): نیاز/ ئامانج/ خواست.
(الوُكْد): کۆشش/ ڕەنجدان/ تەلاش/ تەقەلا
(«مازالَ ذلك وُكْدي»): هێشـتا هەر ئەوەیە کردەوەکەم/ کارەکەم/ ڕەنجەکەم.
(اَلوِكاد و الإِكَاد (ج) اَلوَكائِد): پەت/ گوریس یـان قایش کـە مانگای لـە کاتی دۆشـیندا پێدەبەسترێتەوە.
(اَلوَكِيد والأَكِيـد): ١-دامەزراو ٢-توند و تۆڵ ٣-چەسپیو/ بنجبەست/ نەگۆڕ.
(اَلأَوكَـد والآكَـد): ١-دامەزراوتـر ٢-توونـدو قایمتر ٣-سەختتر ٤-بنجبەست تر/ چەسپاوتر ٥-دڵنیاکارتر.
(تَأْكِيد): جەختکردن.
(اَلتَواكِيد و التَّأكِيد و المَياكِيد): ئەو قایشەی قەڵبوزی زینەکەی پێ قایمدەکرێت.

(اَلمُتَوَكِّـد): ١-ئامــادەی جێبەجێکردنـی کار ٢-لێدڵنیا.

٢-الوَكْد: مەراق.

اَلمُلحَق

وكـد: (اَلتَّوكيـد): جەخـت/ سـەلماندن بۆ دڵنیاکردن گومان نەهێشتن.

(تَوكيدُ مَبادِئ): سـەلماندن و لێدڵنیاکردنی بیروبڕوا.

(التَعبير عَن شيءٍ لا يَقبَلُ الجَدَل): دەربڕین و جەختکردن بەرامبەر شـتێك بە شێوەیەك کە چەندوچوو هەڵنەگرێت.

(«تَوكيد صداقَة»): پتەوکردنی دۆستایەتی و جەخت لەسەرکردن.

«تَوكيدُ الدِّين»: سەلماندنی وامەکە و جەخت لەسەر کردنی/ پێلێنانی بوونیو ڕاستیی.

(-فِي النَحو): لە ڕێزماندا: جەختکردن. وەکو «صَـرَفَ المـالَ كُلَّـهُ»: سـامانەکەی هەموو بەختکرد. (نون التَوكيد): نونی جەختکردن کـە بـە دواوەی فرمانەکەوە دەنووسـێت بۆ جەختکردن لەسەرئەوەی کە بکەرەکە سوورە لەسەر کردەکەو ڕاڕا نییە وەکو: (لأَضرِبَنَّكم): بەڕاستی لێتان دەدەم.

وكر: ١-(وَكَرَ-الطائِـرُ. يَكِرُ وَكْراً وَ وُكوراً): مەلەکە/ باڵندەکە چووە هێلانەکەیەوە (وَكَّرَ و أَتّكَرَ-الطائِرُ): هێلانەیەکی بۆ خۆی کرد/ بۆ خـۆی گرت. (اَلوَكْر (مـص) (ج) أوكر وَ أَوكار وَ وُكور): (هێلانە/ لانە)ی باڵندە.

(اَلوَكْرَةُ (ج) وُكَر): هێلانەی باڵندە.

٢-(وَكَـرَ و وَكَّرَ و أوكَرَ-الإنـاءَ. يَكِرُ وَكْراً): قاپەکەی پڕکرد.

(تَوَكَّرَ-الصَبيُ): منداڵەکە گەدەی پڕبوو.

(-الطائِرُ): باڵندەکە چیکڵدانەی پڕبوو.

(«شَرِبَ حَتى تَوَكَّرَ»): هێندەی خواردەوە تا گەدەی (هەلاوسا/ هەستا و پڕبوو).

(اَلوَكْرَةُ (ج) وُكَر): جارێك پڕبوون ٢-جارێك باڵندەکـە چـووە هێلانەکەیـەوە. جارێـك هێلانەکەی بۆ خۆی گرت.

٣-(وَكَرَ-الظَبيُ-يَكِـرُ وَكْـراً وَ وُكـوراً): ئاسکەکە/ مامزەکە ڕاپەڕیو بازیدا.

(اَلوَكْـر والوَكَـر): جـۆرە غاردانێکە، جۆرە ڕاکردنێکە.

(اَلوَكَری=الوَكَر): جۆرە غارکردنێکە.

(ناقَةٌ وَكَرى): مێحوشترێکی خێرا/ چابووك/ گورج.

٤-(وَكَـرَ-هُ يَكِـرُ وَكْـراً): مسـتەکۆڵەی بەلووتیدادا.

٥-(الوُكْـرَةُ والوَكَـرَةُ و الوَكـيرُ وَ الوَكيرَةُ): ناندان کاتی لێبوونەوە لە (خانەسـازیدا/ لە دروستکردنی خانەیەکدا).

وكـز: (وَكَـزَ-هُ يَكِزُ وَكْـزاً) ١-پاڵـی پێوەنا ٢-مشتەکۆڵەی پێداکێشا (-هُ بالرمحِ): نیزەی (پێداکرد/ پێداچەقاند). (-الرمحُ في الأرضِ):

نیزەکــەی بە زەویدا چەقاند (-أَنْفَهُ): لووتی شــکاند (أَلوَكّاز) ١-چاکچەقێــن ٢-چاکپاڵنەر ٣-چاك مشتومشێن.
٢-(وَکَزَ-فُــلانٌ. یَکِزُ وَکْزاً): فیســار رایکرد (تَوَكَّزَ لِلأَمرِ): ئامادەی کارەکە بوو.
٣-(وَكَزَ-القربَــةَ. یَکِزُ وَكْزاً): مەشــکەکەی پرکــرد (تَوَكَّزَ-مِــنَ الطَّعــام): تێــری خواردنخوارد/ گەدەی پڕ لە خواردن بوو.
٤-(تَوَكَّزَ-علــی عَصــاهُ): خــۆی بەســەر داردەستەکەیدا دا و پێی ڕۆیشت.
٥-(ناقَــةٌ وَکزی): مێحوشــترێکی کورتەباڵا/ کورتەبنە.
وکس: (وَکَسَ-الشــيءُ یَکِسُ وَكْساً): شتەکە کەمیکرد/ کەمبوو.
(-الشيءَ): شتەکەی کەمکرد/ ناتەواو کرد.
(وُکِسَ-التاجــرُ فِي تِجارَتِــهِ وَ أُوكِــسَ فیها): بازرگانەکە تێشکا و زیانیکرد/ بەر زیان کەوت.
(وَکَسَ وَ أَوکَسَ مالُهُ): داراکەی لەدەست چوو و ڕۆیشتو زیانیکرد.
(وَكَّسَ-الشيءَ): شتەکەی کەمکرد.
(-فُلاناً): فیســاری شــکاند/ سەرزەنشتکرد/ قسەی پێوت.
(ألوَکْــس): ١-کەمکردن ٢-کەمبــوون ٣-(فلك) هەوارگــەی مانــگ کــە تیایــدا دەگیرێــت ٤-چوونی مانگ بۆ بورجێك کە حەزیلێنەکرێت/ شوومبێت.
(«هذه لَیلَةُ الوَکْسِ»): ئەمە ئەو شەوەیە کە مانگ دەکەوێتە بورجە بەدوومەکەوە.
(الوَكْس): کێم و زووخی برین.
(«بَرَأَتِ الشَــجَّةُ علــی وَکْــسٍ»): برینەکە رزگاری بوو لەو کێم و زووخەی تیایدا بوو
(«لا وَكْسَ و لا شَطَطَ»): نەکەمە و نە پترە/ زیادە.
(الأَوكس): زۆر ڕسوا.
(رجُلٌ أَلأَوْكَسُ): پیاوێکی ڕسواو دەروونەنزم/ پوشت. یان چارەڕەش.
وکظ: (وَکَــظَ وَ واکَظَ-هُ یَکِظُ وَكْظاً): پاڵی پێوەنا و لایخست/ لایدا.
(-علــی الأمــرِ): ســەرومڕ لەســەر کارەکە ڕۆیشت.
(تَوَكَّظَ-عَلَیهِ الأَمْــرُ): کارەکەی لێکەچبوو/ لێخواربووەوە.
وکــع: ١-(وَکَــعَ-هُ یَکَــعُ. وَكْعاً): ١-گەســتی ٢-پێوەیــدا ٣-گریانــدی و ئــازاری دڵیــدا ٤-تەرزەشکێنی کرد و سەرزەنشتیکرد.
(-أَنْفَهُ): لووتی شکاند
(-الشــاةَ): بە گوانی مەڕەکەیدا کێشا کاتێك کە دۆشی.
٢-(وَکِعَ. یوكَــعُ. وَكْعاً): ســنگی پێی بەلای پەنجە بچکۆلەیدا خواریی هەبوو/ کەچبوو.
(أَوکَع (م) وَکْعاء): پێکەچ/ پێخوار.
(وَکُعَ-الشــيءُ یَوكُعُ. وَكاعَةً): شتەکە پتەوو

سەخت بوو/ ڕەقبوو.

(وَكيــع): ســەخت و ڕەق/ پتــەو/ تۆكمە و قايم.

(أوكَع-الرَجُــلُ): كارێكــى ســەخت و گرانى هێنايە پێش.

(-الشيءَ): شتەكەى پتەوو تۆكمەو قايمكرد.

(-تِ القَــدَمُ): قاچەكە قەڵەو و ئەســتوورو پتەو بوو.

(-الأمرُ): كارەكە تۆكمەو دامەزراوو مەحكەم بوو.

(-السَقاءَ): كوندەكەى قايمكرد.

(إتَّكَعَ-الشــيءُ): شــتەكە توند بوو قايمبوو/ پتەوبوو.

(إسْتوكَعَ-الرَجُلُ): پياوەكە گەدەى توند بوو.

(-ت مِعْدَتُهُ): گەدەى توند بوو.

(-تِ الفــراخُ): جووچكــەكان هــەراش و قەڵەوبوون.

(الَوَكيــع): ١-تونــد و تــۆڵ و پتــەو و قايم ٢-بەران كە مەڕەكان دوايدەكەون.

(أمْرٌ وَكيعٌ): كارێكى دامەزراوو پتەو.

(المِيْكَــع): ١-توندوتۆڵ/ قايــم/ پتەو. ٢-چاك دامەزراو ٣-جەواڵەكان/ دەفرەكان.

(المِيكَعَةُ (ج) مَيْكَع): گاسنى جووتكردن.

٣-(وَكُعَ. يَوكَعُ وَكاعَةً): بەدبوو/ بەدزمانبوو/ بەدخواز بوو.

(أوْكَعَ-الرَجُلُ): كەمفەڕ بوو كەمخێر بوو.

(«وَكيعٌ لَكيع» وَ وَكوُعٌ لَكوُعٌ): بەد/ بەدفەڕ و بەدزمان/ بەدخواز.

(الأوكَع): ١-بەد ٢-گەوج.

وكــف: ١-(وَكَفَ-الدَمْعُ و نَحْــوُهُ: يَكِفُ وَكْفاً وَ وَكيفاً وَ وُكوُفاً وَ وَكَفَاناً وَ تَوكَفاناً): فرمێسكەكە و شتى وا كەم كەم هاتەخوارێو ڕژا.

(-البَيتُ): خانووەكە دڵۆپەيكرد.

(-تِ العَينُ الدَمْعَ-وَكْفــاً وَ وَكِيفاً): چاوەكە ئەسرينى ڕشت، فرمێسكى ڕشت.

(أوكَفَ-الدَمْعُ أو البَيتُ إيكافاً): فرمێسكەكە/ ئەسرينەكە دڵۆپ دڵۆپ هاتەخوارێ خانووەكە دڵۆپەيكرد/ بنميچەكەى دڵۆپەيكرد.

(إسْتَوكَفَ-الماءَ إسْتِيكَافاً): ئاوەكەى دڵۆپاند و لەبەرى ڕەواند.

(الَواكِف)(فــا): دڵۆپەكــەر/ هەرچــى وەك فرمێســك دڵۆپە بكات بێتــە خوارێ و بڕوات ٢-بارانى بەخوڕ/ لێزمە باران.

(الَوَكَف (ج) أوكاف): ١-نەرمەق/ خوەى.

(سَحابٌ وَكُوفٌ): هەورێك نمە نمە ببارێنێت.

٢-(وَكِفَ-الرَجُلُ. يَوكَفُ وَكَفاً):١-گوناهيكرد/ خراپەى كرد ٢-لەڕاســتى لايدا و ســتەميكرد ٣-لايەنگيريكرد/ خواربوو.

(وَكَّفَ-الحِمارَ): كورتانى لە كەرەكە كرد.

(-الوِكافَ): كورتانى (دروست كرد/ دروو)

(أكَّــفَ وآكَفَ-الحِمارَ): كورتانــى لە كەرەكە كرد.

(أَوكَفَ-هُ إيكافاً): تووشی گوناهیکرد/ خستیه گوناههوه.

(تَواكَفَ): لایدا/ خوار رۆیشت.

(اَلوَكـفُ (مـص)(ج) أَوكاف): ١-خـەوش/ کەموکوریی/ نەنگیی.

(هـذا الأَمرُ وَكْـفٌ عَلَيكَ): ئـەم کارە بۆ تۆ نەنگییـە. ٢-گوندەیـی ٣-بێتوانایی/لاوازیی/ بێهێزیـی ٤-سـەردەرگای خانوو ٥-قورسـایی ٦-توندیی ٧-قەدپاڵی شاخ.

(«إِني أخشـى عَلَيكَ وَكَفَ فُـلانٍ»): من لە لادان و ستەمی فیسار دەترسم بەرامبەرت.

(«لَيسَ عَلَيـكَ فِي هذا الأَمـرِ وَكَفٌ»): لەم کارەدا خراپەو کەموکوریی بۆت نابێت.

(اَلـوِكاف و الإِكاف (ج) وُكُف=اَلبَرْزَعَـة): کورتانی ولاخ.

٣-(واكَفَ-الرَجُـلَ فِي الحَـرْبِ و غيرهـا/ مُواكَفَةً): لە شەڕدا یان لە شتیتردا بەرهەڵستی پیاوەکەی کرد و ڕووبەڕووی وەستایەوە.

(تَوَكَّفَ-لِفُلانٍ): بۆ بینینی لە ڕێیدا وەستا.

٤-(أَوكَـفَ-تِ المَرأَةُ إيكافـاً): ژنەکە نزیکی منداڵبوونی بوو.

(تَوَكَّفَ-الخَبَرَ): چاوەڕوانـی دەرکەوتنی هەواڵەکەبوو.

(-الأَثَرَ): بە دوای شوێنکار و شوێنپێدا عەواڵ بوو ڕەدوویبوو.

٥-(اَلوَكْفُ=اَلنِطْـحُ): ڕایەخێکـە لـە ژێـر ئـەو کەسـەدا دادەخرێت کە بڕیارە سـەری بقرتێنرێت یان سزای بدەن.

وكل: (وَكَلَ-إلَيهِ الأَمرَ: يَكِلُ وكْلاً وَ وُكُولاً): ئەنجامدانی کارەکەی پێ سپارد و ئەویکرد بە بریکاری خۆی/ جێگری خۆی.

(«كِلْنـي إلى كذا»): بمکـە بە بریکاری خۆت بائەوەت بۆ بەجێبهێنم.

(وَكَّلَ-فُلانـاً. تَوْكيلاً): کـردی بە بریکاری خۆی .

(اَلوَكالَة و الوكالَة): بریکاریی.

(واكَلَ-القَـومُ وِكالاً وَ مُواكَلَةً): خوێشـگەل پشتیان بە یەکتری بەست و یەکتریان کرد بە بریکار و جێگری یەك.

(-تِ الدابَّةُ وِكالاً): چوارپێکە باش نەڕۆیشت.

(أَوكَلَ. إيكالاً): بریکاری ڕاگرت و کارەکەی بە جێگر سپارد.

(-بِأَللهِ): خۆی دایە دەسـت خودا و پشتی بە خودا بەست.

(-العَمَلَ علـى فلانٍ): هەمـوو کارەکەی بە فیسار سپارد.و کردی بە بریکاری خۆی.

(تَوَكَّلَ): قایل بوو ببێتە بریکار و بەجێهێنانی کارەکەی گرتە ئەستۆ.

(-لَـهُ بِالنَّجاح): سـەرکەوتن و بەجێهێنانی کارەکەی بۆ مسۆگەر کرد و بەڵێنی ئەومیدایە کە باش بەجێیبهێنێت.

(-بِالأَمـرِ): بەجێهێنانـی کارەکـەی گرتـە

ئەستۆی خۆی.
(-علی اللهِ): پشتی بەخودا بەست و خۆی دایە دەست خودا.
(-فِي الأمرِ): بێتوانایی نواند و پشتی بە خەڵك بەست.
(اِتَّــكَلَ علی اللهِ): پشــتی بەخودا بەســت و کارەکەی بە خودا سپارد.
(-فِي اَمــرِهِ علی فُلان): لە کارەکەدا پشــتی بە فیســار بەســت و کردی بە جێــی بڕوای/ متمانەی پێبەست.
(تَواکَلَ-القَومُ): پشــتیان بە یەکتری بەست و کارەکانیان بەیەك سپارد.
(تَواکَلُوهُ): بەجێیانهێشت/ لێیگەڕان/ خۆیان تێنەگەیاند و یارمەتییان نەدا.
(تَواکَلوا الکَلامَ): لە قسەکردندا هەریەکە پشتی بەویتر بەست قسەیان بۆ یەکتری تەواو کرد.
(«اِسْــتَعَنتُ-القَومَ فَتَواکَلــو»): پەنام بردە بەر خوێشکەل کەچی هەریەکە دامیە دەست ئەویترو یارمەتییان نەدام.
(اَلواكِل)(فا): بریکارگر/ ســپێریار/ نوێنەر هەڵبژێر
(—مِنَ الخَيل): ئەسپێك بۆ غارپێکردنی لێدانی بوێت.
(اَلــوَکْلُ و الوُکَلَــة و التُّکَلَــة و المُــواکِل): پەککەوتەیەکــی بێتوانــا کــە کاری خۆی بە خەڵکی بسپێرێت و پشت بەو ببەستێت.

(اَلوَکِل): ١-کەودەن/ بێمێشــك ٢-زیرەکردوو ٣-بێدەسەڵات/ نەتوانا.
(اَلــوَکال وَ الوِکال): بێتوانایی پەککەوتەیی و کەودەنیی.
(اَلوَکالَــة و الوِکالَة (ج) وَکالات): بریکاریی/ جێگریی/ نوێنەرێتیی و بروپێکردن.
(اَلوَکیــل (ج) وُکَلاء): ١-بریــکار/ جێگــر/ نوێنــەر/ پێســپێردراو ٢-بوێر هــەر کاتێك وشــەکە بۆ خودا بێــت واتــای (بژێویدەری تەواو) دەگەیەنێت.
(اَلتُّکلان): پشت پێبەستن و پێسپاردن.
(اَلمَوْکُول)(مفع): پێسپێردراو/ جڵەو بەدەست.
(«هــذا الأمرُ موکولٌ إلی رأیــكَ»): ئەم کارە لەسەر ڕای تۆ وەستاوە و بەڕای تۆ دەکرێت و بەڕای تۆوە بەندە.
وکم: ١-(وَکَمَ-الأمرُ فُلاناً. یَکِمُ وَکْماً): کارەکە خەفەتی بە فیسار دا.
(-فُلاناً عَن حاجَتِهِ): خراپ دەستی بە ڕووی فیسارەوە نا و تەریقیکردەوە.
(-الرَجُلُ مِنَ الشيءِ کِمَّةً): تۆقی و هاواری بۆ شتەکە لێهەستا/ داخی بۆ خوارد.
(اَلوَکْمَة): جارێك خەفەتخواردن.
(اَلمَوْکُوم): زۆر داخ لەدڵ/ زۆر دڵ پڕ لە جەخار و خەفەتبار/ زۆر سوێ لەدڵ.
٢-وُکِمَ-تِ الأرضُ: زەویەکە پێشێل کراوو لێی لەوەڕان.

٣-(اَلوَكْمَة): بێشــەڵان کە درندە تیایدا لانە دەکات/ درندەی زۆر تێدا دەبێت.
وکــن: ١-(وَكَنَ-الطائــِرُ بَيضَــهُ أَو علــى بَيضِهِ. يَكِنُ وَكْناً وَ وُكُوْناً): باڵندەکە لەسەر هێلکەکانی هەڵنیشــت و خستنیە ژێر خۆی/ کڕکەوت.
(واكِــن (ج) وكُون و هــي واكِنَة (ج) وُكُون وَ واكِنــات): کڕکەوتــوو/ باڵنــدەی لەســەر هێلکەکەی هەڵنیشتوو.
(-الطائِرُ): باڵندەکە چووە هێلانەکەیەوە.
(-الرَجُل وَكناً): پیاوەکە دانیشت.
(-تَوَكَّنَ الرَجُلُ): ١-لە ئەنجومەنەکەدا باش باڵیدایەوە ٢-لــە ئەنجومەنەکەدا جێی خۆی کردەوە و جێگیر بوو ٣-توانی/ بەتوانا بوو.
(اَلواكِن (م) واكِنَة): دانیشتوو.
(-مِنَ الطَير): باڵندەی هەڵنیشتوو یان نیشتوو لە هەر شــوێنێکدا بێت لەسەر دیوار یا دارێك یان درەختێك.
(اَلوَكن (ج) أَوكُــن وَ وُكْن وَ وُكون وَ الوَكْنَةُ و الوكْنَةُ و الوُكْنَــةُ و الوُكُنَةُ (ج) وُكنات وَ وُكُنات وَ وُكَنــات وَ وُكَن): هێلانەی باڵندە/ لانە.
(اَلمَوكِنُ): ئەو شوێنەی هێلکەی باڵندەی تێدا دادەنرێت/ هێلانەی باڵندە.
(اَلمَوكِن و المُوكِنَة): هێلانەی باڵندە.
٢-(وَكَنَ-الرَجُلُ. يَكِنُ وَكْناً): توند ڕۆیشت/ چابووکانە و خێرا ڕۆیشت.
وکــي: (وكى-القَربَــة. يَكِيُ وَكيــاً): دەمی مەشکەکەی بە پەتی مەشکەکە بەست.
(وكَى-الفَــرَسُ المَيــدان جَرياً): ئەســپەکە غارێکــی زۆری لە مەیدانەکەدا کرد و هەموو مەیدانەکەی گرتەوە و خەریککرد.
(واكى مُواكاةً وَ وِكاءً): هەردوو دەستی هەڵبڕی و کەوتە نزا و پارانەوە .
(أَوكى-القَربَــةَ و على ما في القِربَةِ. إيكاءً): دەمی مەشــکەکەی بە پەتی مەشکەبەستەکە بەست و توند کرد.
(-الرَجُلُ): ١-پیاوەکە چرووك بوو («سَــأَلْناهُ فَأَوكا عَلَينا»): ســواڵمان لێکردو چرووکیی لەگەڵدا کردین. ٢-هەڵپەی زۆرکرد/ کۆششــی زۆر کرد.
(–الفَرَسُ الميدانَ جَرياً): ئەســپەکە کەوتە غارغارێنێکــی زۆر و مەیدانەکــەی خەریك کرد.
(إِسْتَوكى-الوِعاءُ): قاپەکە پڕ بوو.
(-البَطنُ): گەدەکە گیرابوو لێی دەرنەدەچوو.
(اَلوِكاء (ج) أَوكِيَة): ١-پەتی بەســتنی دەمی مەشکەو کوندەو شــتی لەو بابەتە ٢-سەرقاپ و دەمەڵبێنــی هەمــوو شــتێك کــە ســەری بنرێتەوە.
(اَلمُوكى) (مفع) کوندەی دەمبەستراو.
ولّ: ١-(وَلْــوَلَ-تِ المــرأةُ وَلْوَلَــةً وَ وَلْوالاً):

ژنەکـە کەوتــە هــاوارو فوغــان، لووراندی
٢-قوروسکایەوەو شین و شەپۆڕیکردو دوعای
خراپیکرد.
(-تِ القَوسُ): کەوانەکە گفەی لێوەهات.
٢-(الولولیشــیا) (ن): ڕووەکێکــە تۆو ڕووت
لاسکەکەی کەمێك لە خاك دەردەچێت و وردە
وردە ئەســتوور دەبێت. لە هەندێك ناوچەی
خوارووی ئەفەریکادا دەڕوێت.
ولــب: ١-(وَلَبَ. یَلِــبُ وُلُوبــاً): خێرا چووە
ناوەوە پەلەیکرد.
(-إلَیكَ الشيءُ): شــتەکەت گەیشتێ ئیتر هی
هەر کەسێك بێت.
(الوالِــب): ئەوەی بەشــتەکەدا چووەو چۆتە
ناویەوە.
٢-(الوالِبَــةُ): تازە دەرچووی گیاو کشــت کە
لەسەر بنچی خۆی دەربێتەوە.
(-مِن القَومِ أو المواشي): وەچەی خوێشکەڵ و
بەرو بەچکەی ئاژەڵ.
ولت: (وَلَتَ وَأولَتَ – فُلاناً حَقَّهُ. یَلِتُ وَلْتاً):
مافی فیساری کەمکردو لێیخوارد/ لێیلادا.
ولث: ١-(وَلَثَ-لَهُ عَهْداً یَلِثُ وَلْثاً): پەیمانێکی
ناتەواوی دایە.
(-فُلانٌ): بە فیساری وت کە کۆیلەیبوو: دوای
مردنم (تۆ ئازاد دەبێت/ ئازادیت).
(اَلوَلْث): پەیمان و بەڵێنی ناتەواوو مسۆگەر
نەبوو.

٢-(وَلَثَ-فُلانــاً بالعَصــا یَلِثُ وَلْثــاً): بەدار
لێیدا.
(-تْنا السَّــماءُ): بەبارانێکی کەم تەڕیکردین/
تەڕبووین.
(اَلوَلْــث) (مــص): ١-کەمەکــە بارانێــك
٢-پاشماوەیەکی کەمی مەی لە بنی جامەکەدا،
نقاپەکەدا ٣-پاشماوەی وەردینەی چاو.
ولــج: (وَلَجَ- البَیتَ و وَلَجَ وَوَلَجَ الشــيءُ في
غَیرِه یَلِجُ وُلُوجــاً. وَلِجَةً): خۆی بەماڵەکەدا
کرد/ چووە خانووەکەوە. شــتەکە بە شتیتردا
چوو.
(وُلِــجَ –الرَجُلُ): پیاوەکە تووشــی دەردێکی
هەناوبوو.
(وَلَّجَ-هُ وَوَلَّجَ-إلَیهِ الأمرَ. فَتَوَلَّجَهُ): کارەکەی
(بەوسپارد/ دایە دەست ئەو. ئەویش کارەکەی
وەرگرت.
(وَلَّج –المــالَ): دارا و ســامانەکەی لە ژیانی
خۆیدا/ بەزیندوێتیــی بەهەندێك فرزەندی
خۆیــدا تا خەڵکــی بیبیســنەوەو داوای هیچ
لەخۆی نەکەن.
(أولَجَ وأتْلَجَ-هُ. إیلاجاً وإتلاجاً): پیایداکرد/
تێیخست/ بردیە ناوەوە/ کردی بەناودا.
(تَوَلَّجَ واتَّلَــجَ –إلَیه وَفیهِ. تَوَلُّجاً وإتِّلاجاً):
چووەناویەوە/ پیایداچوو/ تێیچوو.
(اَلوالِجَة): ١-مارو دڕنــدە. (بۆیە وا ناونراون
چونکە بــەڕۆژ خۆیان دەشــارنەوە و خۆیان

بەكـــون و لانەكانيانـــدا دەكـــەن ٢-(طـــب): دەردێكی ناو هەناو.

(اَلوَلَج): ڕێی ناو لمان.

(ولاج (ج) اَلوُلُـــج): ١-كەنار ٢-كۆلان/ كووچە ٣-ئەوەی هەنگوینی پێدەردەهێنن.

(اَلوَلَجَةُ (ج) أَوْلاج وَ وَلَج وَوَلَجات): ١-شوێنی چوونە ناوەوە/ دەروازە/ دەرگا/ دەركە/ دەروو/ دەرە ٢-پێچی دۆڵ ٣-ئەشكەوت كە ڕێبوارەكان لە بەرباران و شتیتر پەنایبۆدەبەن.

(اَلوُلْجة والوَلُوج): زۆر خۆ بەناوداكردن/ زۆر بە ناودا چوون.

(وَلُـــوجٌ خَـــروجٌ): زۆر خـــۆ بەناوداكردن و دەرهاتـــن/ یان خـــۆش خۆش خـــۆی بەناودا دەكات و دێتە دەرەوە.

(اَلولاَج (ج) وُلُـــج وَوُلُوج): ١-دەرگە/ دەرگا/ دەروازە ٢-دۆڵ/ دەرە وزەویی نەزانراو.

(اَلوَلاَّج): ئەوەیە زۆر بچێتە ناوەوە.

(اَلوَلیجَة): ١-ناوەوە چوو/ ناوەوەیی، ناواخن ٢-سەرپێبوو ٣-پێوەلكاو ٤-كەسوكار و خویشی نزیـــك و ئەوانـــەی جێی متمانەبن ســـەربەو مرۆڤە بن و كەسیشی نەبن.

(هُـــوَ وَلیجَتُهُم): ئـــەو پێـــوە لكاویانە/ خۆ پێوە هەڵواسیانە. بەپیاوێك دەڵێن كە لەگەڵ خوێشگەلێكدا بێت و هیچیشیان نەبێت.

اَلتُّلَج (ح): بەچكە داڵ. لەبنچینەدا وشـــەكە (اَلوُلَج) بووە.

(اَلتَولَـــج): لانەی دڕندە لەبنچینەدا وشـــەكە (اَلوَ ولَج): بووە.

(اَلمَوْلِـــج (ج) مَوالِـــج): شـــوێنی لێوە چوونە ناوەوە/ شوێنی پێوە چوون/ جێی پێداچوون/ دەرگا/ دەروازە. دەركە.

ولح: (وَلَحَ – الدابَّةَ يَلِحُ. وَلْحاً): ولاخەكەی لە توانـــای خۆی پـــتر باركرد كـــە نەتوانێت بیبات.

(اَلوَلیحَـــة (ج) ولائِـــح. والوَلِیـــح): دەفرو لەنگـــەو تای بار ئەوەی كە گەنم و شـــتی لەو بابەتەی تێدەكرێت.

ولخ: ١-(وَلَخَ-هُ. يَلِخُ. وَلْخاً): بە بەری دەستی زللەی (لێدا/ پێداكێشا).

٢-(أَوْلَخَ – العُشبُ): گیاكە درێژ و مەزنبوو.

(إِئتَلَـــخَ – الأَمـــرُ): كارەكـــە بەیەكدا چوو/ ئاڵۆزبوو.

(إِستَولَخَ –تِ الأَرضُ إِســـتیلاخاً): زەویەكە تەربوو.

(اَلوَلَـــخ –مِنَ العُشـــب): گیـــای باڵاكردووی لەیەك ئاڵاو.

(أَرضٌ وَلِخَةٌ = وَرِخَةٌ): زەوییەك كە گیاكەی بەگژیەكدا چووبێت و لەیەك ئاڵابێت.

(أَولیخ): بەرگێك كە لە كەتانبێت.

(اَلوَلیخَةُ): ١-شـــیری خەســـت ٢-قوڕو چڵپاو/ لیتە.

(أَرضٌ وَلیخَةٌ وَمُؤتَلِخَةٌ): زەوییەكە گیاكەی

هەستاوەو بە گژیەکدا چووە.

ولد: (وَلَدَ – تِ الأُنثى يَلِدُ. لِدَةً وَولاداً وولادَةً وإلادَةً وَمَولِداً): مێکە/ مێینەکە سکەکەی دانا/ بەچکەکەیبوو.

(هِيَ والِدٌ وَوالِدَةٌ): مێینەیەکی زاو/ بەچکەبوو/ دایك.

(تِ الارضُ النبات): زەویەکە گیاکەیدەرکرد.

(وَلَّدَ-الوَلَدَ): منداڵەکەی (پەروەردەکرد بەخێویکرد).

(-الشيءَ مِن الشيءِ): شتەکەی لە شتەکەیتر پەیداکرد/ بەرهەمهێنا.

(-الكَلامَ أَوالحَديثَ): قسەیان فەرمایشتی داهێنا.

(-تِ القابِلَةُ المَرأَةَ): مامانەکە یاریدەی سکپڕەکەیدا منداڵەکەی ببێت و سەرپەرشتی منداڵبوونەکەیکرد.

(وَلَّدَ الرَجُلُ غَنَمَهُ): پیاوەکە مەڕەکانی پەروەردە کرد.

(أَوْلَدَ-تِ المَرأَةُ إِيلاداً): ژنەکە کاتی منداڵبوونی هات.

(-تِ الشاةُ): مەڕەکەزا.

(شاةٌ مُولِّدٌ (ج) مَوالِد وَمَواليد): مەڕی زاو/ بەرخبوو.

تَوَلَّدَ-الشيءُ مِن غَيرِهِ): شتەکە لەشتیتر پەیدابوو.

(تَوالَدَ واتَّلَدَ-القَومُ): خوێشکەل وەچەی زۆریان خستەوەو زۆر بوون ٢-زاوو زێیانکرد.

(إِسْتَولَدَ –المَرأَةَ): سکی ژنەکەیپڕکرد.

(-فُلانٌ): فیسار منداڵی ویست/ کوڕی ویست/ خواست.

(أَلوالِد (ج) والِدون): باوك/ باب.

(شاةٌ والِدٌ (ج) وُلْد): مەڕی ناووس.

(أَلوالِدان): داك و باب/ دایك و باوك.

(أَلوالِدَةُ (ج) والِدات): داك/ دایك.

(أَللِدَة) (مص): ١-کاتی (زان/ منداڵبوون)

٢-(أَلتِرب): ئەوەی کەپێکەوە بەسکێك دەبن/ جووتە یان هاوتەمەن. یان پێکەوە پەروەردە کرابن (لەبنچینەدا وشەکە (وِلْد)ە.

(فُلان لِدَتى) ئەو لەگەڵمدا بەسکێك بووین.

(لِدان): جووتەی پێکە لە سکێکدا بوون، دوانە.

(ج) لِدَات وَلِدون): ئەوانەن کە بەسکێك بوون بچووککراوەیان (وُلَيدات ووُلَيدون)ە.

(الوَلَد والوُلْد والوِلْد وَالوَلْد): ١-بەچکە/ وەچە/ منداڵ/ ساوا/ کۆرپە: ٢: هەرچی شتێکیتر هێنابێتیە دی (ئەمە بەنێرومێو جووت و کۆ دەوترێت. وشەکە خۆی نێرە/ کورە. کو دەکرێتەوە دەوترێت: (أَولاد وَوِلْدَة وَإِلْدَة وَوُلْد): کوران.

(لا أَدري أَيُّ وَلَدِ الرَجُلِ هُوَ): نازانم چ جۆرە پیاوێکە/ کەسێکە؟

(الوَلادَة): زۆر بەسك و زا/ شفتە ژێکەر بۆ

ئاژەڵیش زۆر بزێت و بەچکەی زۆر بێت و ژنیش منداڵی زۆر هەبێت، هەروا دەوترێت.

(اَلوَلُود – مِن الشاءِ (ج) وُلْد): مەڕێکی زاو/ مەڕێك کە بزێت ٢-مەڕێك کە بەرخی زۆر بووبێت.

اَلوُلُودِيَّة وَ (اَلوَلُودِيَّة): ١-منداڵیی/ کردەوەی منداڵانە ٢-کەم تێگەیشتن و لە کاروبار نەزانین وەك منداڵان ٣-وشکیی/ رەقرەوشتیی.

(اَلوَلِيـد (ج) وِلْدَة وَولْـدان (م) وَلِيدَة (ج) وَلائِـد): لەدایکبوو/ کۆرپەی تازەبوو/ ساوا ٢-منداڵ ٣-کۆیلە/ بەندە.

(أُمّ الوَليد): ناوی شارراوەی مریشك/ مامر.

(فَعَـلَ ذلـك فِي وَلِيدِيَّتِـهِ): بەمنداڵی و لە منداڵیدا ئەوەیکردووە.

(اَلمَوْلِـد (مص) (ج) مَوالِد): شوێنی و کاتی لەدایکبوون.

(اَلمُوَلِّد) (فا) بەرهەمهێن.

(المُوَلِّدُ الكهربائي): (ف): کارەبا بەرهەمهێن.

(اَلمُوَلَّد) (مفع): هەمووشتێکی بەرهەمهێنراو، داهاتوو/ تازە پەیدابوو.

(اَلمُوَلَّدون مِن الشُّـعراء أوالأُدَباء): هۆزانڤان یان نووسەرە تازە پێگەیشتووەکان.

رَجُـلٌ مُوَلَّـدٌ وكَلامٌ مُوَلَّـدٌ): پیاوێکە تازە عەرەبەو بەرەســەن عەرەب نییە و قسەیەکە تازە داهاتووە.

(اَلمُوَلِّدَة): مامان.

(اَلمُوَلَّدَة): هەموو شتێکی تازە پەیدبوو/ تازە داهاتوو/ تازە بابەت.

(جاءَنـا بِبَيِّنَـةٍ مُوَلَّـدَة): بەڵگەیەکی بۆ هێناوین کە تازەیە و گومانی لێدەکرێت/ پشتی پێنابەسترێت.

(اَلمَولود (ج) مَواليد) (مفع): منداڵی ساوا/ تازە لەدایکبوو/ کۆرپە.

(اَلمِيلاد): کاتی لەدایکبوون.

(عيد الميلاد): جەژنی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا/ جەژنی لەدایکبوون.

ولذ: (وَلَذَ- الرَجُلُ يلِذُ وَلْذاً):١-خێرا رۆیشت/ توند تێیتەقاند ٢-خێرا کەوتە جووڵە.

ولـس: ١-(وَلَـسَ-تِ الإبِـلُ. يَلِسُ. وَلْسـاً وَوَلَسـاناً): حوشترەکە خۆی بەلەسەکرد/ خێرایکرد.

(وَلُوس): حوشتری گورج/ خێرا.

٢-(وَلَسَ-الرَجُـلَ. يَلِـسُ وَلْسـاً): فێڵی لەپیاوەکەکرد/ لەخشتەیبرد/ لاسیداو ناپاکیی لەگەڵداکرد.

(-الحَديـثَ): ئاخاوتنەکەی هێناو بردو مەبەستی بە دەستەوەنەدا/ دەرینەخست.

(والَـسَ-هُ مُوالَسَـةً): لەگەڵیدا کەوتە (فریودان/ لاسدان).

(والَسَ وَأولَسَ بِالحَديثِ): سەری قسەکەی دەرخست و مەبەستی بەدەستەوەنەدا/ روونی نەکردەوە.

(تَوالَسَ-القَومُ عَلَيهِ): خويشـكەل لەژێرەوە يەكيانگـرت و گەلەكۆمەكێيان لێكرد. فێلیان لێكردو ناپاكييان دەربارەكرد.

(-اَلوَلاّس) (ح): گورگ.

(وَلْس): فێل/ گزى/ ساختەكردن/ ناپاكيى.

ولـع: ١-(وَلَعَ -بِحَقِّهِ يَلَـعُ. وَلْعاً): مافەكەى ئەوى (خوارد/ برد/ لەدەستدا).

(-وَلْعـاً وَوَلعانـاً: ١-درۆيكـرد ٢-سـووكە راكردنێكيكرد.

(مـاأدرى ماوَلَعَهُ): نازانم چـى بەنديكردو ريى لێگرت.

(وَلِعَ وَتَوَلَّعَ- بِـهِ يَوْلَعُ وَيَلَعُ. وَلَعاً وَوَلوعاً): دڵبەنـدى حـەزى ئەوبـوو/ خۆشيويسـت و ئالـوودەى ئەوبـوو/ پـەرۆش و گرفتارى ئەوبوو.

(وُلِعَ-بِهِ): دڵى پێوەى لكاو پێوەى گرفتاربوو/ دڵداربوو/ ئالوودەبوو.

وَلَّعَ-هُ بِفُلان: گرفتارو پەرێشـانى ئەويكرد/ هۆگرى ئەويكرد/ پێوەى لكاند.

(-النـارَ) (عاميـە): ئاگرى نايـەوە/ ئاگرى هەڵگيرساند.

(اَولَعَ فُلاناً بِكَـذا. إيلاعاً): ١-هانيداو واى لە فيسـاركرد كە گرفتاربيێـت و حەزى لێبكات و بـۆى بسـووتێت و دڵى پێوە بێـت. هانيدا هۆگربێت/ هانيدا ئالوودەى ئەوە بێت.

(اُولِـعَ - بِـهِ): دڵـى زۆر پێوەبەندبـوو خۆشيويست/ حەزى لێكرد و ئالوودەبوو.

إتَّلَـعَ فُلاناً والِعَةٌ): فيسـارم لىَ ونبوو نازانم چى لێبەسەرهات ئاخۆ مابێت؟ مردبێت؟.

(إبْتَلَعَ فُلان قَلبى): فيسـار دڵى دەركێشـام/ دەرهێنام.

(اَلوالِع (فا) (ج) وَلَعَة (م) والِعَة): درۆزن.

وَلَعٌ والِعٌ): درۆيەكى گەورە.

اَلوَلْع (مص): درۆ، درۆكردن.

(اَلوَلِـعُ): زۆر شـپرزەى حـەزو زۆر هۆگرو ئالوودە، زۆر دڵ پێوە بەند/ سەودا سەر.

اَلوَلْعَة (عند العامَّة): پشكۆيەكى ئاگر.

(اَلوُلَعَة): كەسێكە خۆى بەشتێكەوە خەريك بـكات كە پەيوەنديى بەوەوە نەبێت و كەڵكى بۆ ئەو نەبێت/ خۆتێهەڵقورتێن.

(اَللاّعَـة والوَلُـوع): ١-زۆر هۆگـرو ئالوودە ٢-زۆر پەرێشانى سـۆزى دڵ و خۆشەويستى/ حەزلێكردوويەكى (شپرزە/ سووتاو).

(اَلمُوتَلَعُ القَلْب: وَالمُتَّلَعُ القَلب): دڵكێشراو/ دڵ لێسەنراو/ دڵدەرهێنراو.

٢-(وَلَّعَ - الثَورُ): گاكە لەكەى درێژو سـپى لەشى درێژ بوو.

(-جَسَدَهُ): گەريى لە لەشيدا پەيداكرد.

(اَلوَلِيع الواحِدَةُ وَلِيعَة): هەلآلەى دارخورما كە هێشـتا لە قاوغەكەيدايـەو نەكراوەتەوە وەك رستەى مرواريى زۆر سپى وايە.

(اَلمُوَلَّع) (مفع): ١-كەسـێكە كـە پەڵەپەڵەى

گەڕیی بە لەشـیەوە بێت ٢-هۆگـرو ئالوودە، پەرۆش و شپرزەی دڵ.
(-مـن الدَّواب): چوار پـێ کە گەڵێك پەڵەی جۆراوجـۆری پێـوە بێـت و پەڵـەی سـپی نەبێت.
ولـغ: (وَلَغَ وَوَلِـغَ- الكَلبُ الإنـاءَ وَفي الإناءِ يَلَـغُ ويَلِـغُ وَيَوْلَـغُ وَ يالَـغُ. وَلْغـاً وَ وُلَغاً وَوُلوغـاً وَوَلَغَانـاً): سـەگەکە بەسـەری زمانــی ئاوەکەیخواردەوە یان زمانی خسـتە کۆچەڵەکەوەو زمانی تێدا جووڵاند.
(أَوْلَغَ الكَلْبَ. إيلاغاً): سەگەکەی ئاودا.
(الوَلْغَـةُ): ١-جارێـك سـەگەکە بـە زمـان ئاویخواردەوە ٢-کۆچەڵەی سەگ.
(الوَلُوغ): ئاو خواردنەوەی سەگ.
(المِيلَغ والمِيلَغَة (ج) مَيالِغ): کۆچەڵەی سەگ کە ئاوی لێدەخواتەوە.
(المُسْـتَولِغ – مِنَ الناس): کەسـانێکن کە بە تەنگ خراپە لێدوان و سووککردنیان و تەشەر لێدانیانەوە نەیەن.
ولـف: (وَلَفَ – البَرقُ يَلِفُ وَلْفاً وَوِلافاً وَ إِلافاً وَوَلِيفاً): هەورە بروسکەکان یەك بەدوای یەکدا هاتن و شەوقیاندایەوە/ بەدوای یەکەوە هاتن.
(-القَومُ وَلِيفاً): پێکەوە هاتن.
(والَـفَ-هُ): ١: وِلافاً وَمُوالَفَـةً): هۆگریبوو لەگەڵیـدا ڕاهـات ٢-خۆشیویسـتو بـوو بە هاودەمی.

(تَوالَـفَ – الشَـيئانِ مُوالَفَـةً وَوِلافـاً): دووشـتەکە لەیـەك نزیکبوونـەوەو بۆیەك شیان و گونجان.
(الِولْـف): ١-دۆسـت/ یـار ٢-هـاوڕێ هاودەم (عامية)/ هاوەڵ/ برادەر.
(الولاف) (مص): جۆرە غارێکە/ چوار ناڵەی ولاخ.
(الوَلُـوف): بروسـکەی (یەك لەسـەریەك/ بەدوای یەکدا هاتوو).
(الوَلِيف) (مـص): ١-چوارناڵەکردنی ولاخ ٢-برووسکەی یەك لەدوای یەکی بەشەوق.
ولق: (وَلَقَ- في السَيرِ يَلِقُ وَلْقاً): لە ڕۆیشتندا پەلەیکرد/ پێی هەڵگرت/ خێرا ڕۆیشت.
(-هُ بالرمحِ): سووکە نێزەیەکی پێداکرد.
(-ه بالسَّيفِ): شمشێرێکی (پێداکێشا/ لێدا).
(-الحديـثَ): فەرموودەیەکـی/ ئاخاوتنێکی داهێناو بڵاوکردەوە.
(-عَينَـهُ): کێشـای بـە چاویـداو چـاوی دەرپەڕاند/ دەرپۆقاند.
(-في كَذِبِهِ أوسَـيرِهِ): لەسـەر درۆکردنەکەی ڕۆیشت یان هەر ڕۆیشت/ لەسەر ڕۆیشتنەکەی بەردەوامبوو نەوەستا.
(أُولِـقَ وَأُلِقَ. إيلاقاً أَلْقاً): تووش شـێتیبوو/ تێکچوو/ شێتبوو.
(مَألوق وَمُؤ وْلَقٌ): شێت/ دێوانە/ تێکچوو.
(الأَوْلَق): شێتی/ تێکچوون/ دێوانە بوون یان

تێکچوونێکی کەم نیمچە دێوانەیی.
(اَلوَلَقی): غارکردنێکی شـێتانەو جرپنانەو توندی حوشتر.
(ناقَةٌ وَلَقی): حوشترێکی خێراو جرپنانە.
(اَلوَلِیْقَةُ): خواردنێك کە لە ئاردو شیرو رۆن دەکرێت.
ولـم: (اَولَـمَ. اِیلامــاً): نــان و خواردنــی میوانداریکرد/ زیافەتیکرد.
(اَولَـمَ- فلانٌ): فیســار لەشـیجوانبوو یان خاوەنژیریی‌و رەوشتبوو.
(اَلوَلْم والوَلَم): ١-کۆت ٢-قەیاســەی تەنگەی زین یان کورتان.
(الوَلْمَةُ): کۆکی شتەکەو هەمووی.
اَلوَلِیمَة (ج) وَلائِم): ناندان لە بۆنەو ئاهەنگ و خەڵـك بانگکردنـــدا، یــان نانــی زیافەت/ میوانداریی.
ولــن: (تَوَلَّنَ- الرَجُــلُ): لەکاتی لێقەومان و کۆســت و چورتومدا پیاوەکــە کەوتە هاوارو قیژەو شین و شەپۆر.
وله: (وَلَهَ. یَلِــهُ وَلَهاً): ١-پەژارەو خەفەتێکی وادایگرت خەریبوو شـێتبێت ٢-لەتاو سـوێی خۆشەویستی و دڵ سەراسیمەبوو/ شەیدابوو/ دێوانە بوو.
(والِهُ، آلِهُ وَوَلْهانٌ). وهي والِهُ وَوالِهَةٌ وَوَلْهی): (شەیدا/ ســەرگەردان/ سەراســیمە)ی ئەڤین/ دێوانەی خۆشەویستیی/ گەشکەگرتووی شادیی.

(-الصَبِــيُ إلی اُمِّــهِ): کۆرپەکــە/ منداڵەکە هانــای بــۆ دایکیبردو بــۆی (قروســکایەوە/ کورووزایەوە).
(-تِ الأُمُ إلی وَلَدِهــا): دایکەکــە ســۆزی بــۆ منداڵەکەی جووڵاو دڵی بۆی سووتا.
(-مِنهُ): لێیترسا.
(وَلِهَ یَلَهُ ویَولَهُ وتَوَلَّهُ وَلَهاً): داخ و خەفەتێکی وادایگرت خەریکبوو شێتبێت.
(وَلَّهَ – الرجلَ): پیاوەکە گرفتاری سەراسیمەو شەیداو سەرگەردانیکرد.
(-المَــرأَةَ): منــداڵ و دایکەکــەی لەیەککرد/ جیایکردنەوە.
(وَلَّهَ وَاَولَهَ- الحُزنُ اَو الوَجدُ فُلاناً): پەژارە/ جەخاریان تاســەی خۆشەویســتیی شــەیداو سەرگەردانیکرد/ سەراسیمەیکرد.
(اِتَّلَهَ): ١-کەســەر/ داخ/ پــەژارە خەریکبوو شێتبیکات/ تێکیبدات. ٢-لەتاو ئەڤین و ئاگری دڵ سەرگەردان و سەراسیمەبوو.
(-النَبیذُ فُلاناً): مەی هۆش‌و گۆشــی لەبەر فیسار بری.
(اِسْــتَوْلَهَ. اِسْــتِیلاهاً): ئــاوەزی پەشــۆکاو شپرزەبوو/ تێکچوو.
(اَلمُوْلَه) (ح): جاڵجاڵۆکە.
(ماءٌ. مُوْلَهٌ وَمُوَلَّهٌ): ئاوێك کرایە بیابانەکەو ونبوو.
(اَلمِیلَه): بیابانێکی فراوان و وشــکو بێئاو کە

مرۆڤ سەراسیمەو سەرگەردان دەکات.

(اَلْمِيْلَاه): بای توند.

(إمْرَأَةٌ ميلاهٌ): ژنێکی شـپرزە/ پەرێشـان/ شەیدا/ خەفەتبار و بەگریە بۆ کورەکەی.

ولـي. (ولی – فُلانـاً. يَلي وَلْيـاً): ١-لێیهاتە بەرەوەو نزیکبـووەوە (ئەمە کەم بەکاردێت) ٢-تەواو بەدوایەوە بـوو/ میانەیان لەنێواندا نەبوو.

(جَلَسـتُ ممايَليهِ): نزیك/ یەکسەر لەدوای ئەوەوە دانیشتم.

(وَلـيَ فُلاناً. يَلي. وَلْيـاً): ١-لێی نزیکبووەوە و کەوتە پاڵی ٢-شـوێنیکەوت و یەکسـەر لە پشتیەوە بوو.

(-الشـيءَ وَعَلَيـهِ وِلايَـةً وَوَلايَـةً): بـوو بـە خاوەنـی/ خاوەنداریکـرد/ بـوو بـە سەرپەرشتیاری و بەڕێوەبەری.

(-الرَّجُـلَ وعَلَيهِ): کۆمەکـی پیاوەکەیکرد/ پشتگیریکردو سەریخست.

(-اَلبَلَـدَ): دەسـتی بەسـەر شـارەکەدا یان وڵاتەکەدا گرت.

(-الرَّجُلَ وِلايَةً): پیاوەکەی خۆشویسـت بوو بە دۆستی.

(وُلـيَ – المكان): باران لەدوای باران لەسـەر شوێنەکە باری.

(وَلّـى – فُلانَاً الأَمـرَ. تَولِيَةً): فسـاریکرد بەسەرپەرشتیارو فەرمانداری کارەکە.

(-هُ كذا): وایلێکرد کە لە دوای ئەوەوە بێت.

(-هُ ظَهْرَهُ): خستیە پشت خۆیەوە.

(-الشـيءَ وَعَـنِ الشـيءَ): لەشـتەکە دوورکەوتەوەو خۆی لێلادا.

(-هارِباً): هەڵات.

(-الرُّطَبُ): فەریکە خورماکە کەوتە وشکبوون.

(-عَن زَيدٍ بِوُدِّهِ): لەگەڵ زەیددا گۆڕاو وازی لە دۆستایەتی هێنا/ پشتی تێکرد.

(والى- الرَجُـلَ وَلاءً وَمُوالاةً): دۆسـتایەتی لەگـەڵ پیاوەکـەدا گـرتو پشـتگیریکرد/ لەسەریکردە.

(-الشيءَ): شوێن شتەکە کەوت.

(-الغَنَـمَ): مەڕەکانـی دیاریکـردو لەیـەك جیایکردنەوە.

(-بَـيـنَ الأمرَيـن): دووکارەکـەی بـەرودوا ئەنجامدا.

(أَولى –فُلاناً الأَمرَ إيلاءً): کارەکەی بە فیسار سپاردو کردییە سەرپەرشتیارو بەڕێوەبەری.

(-هُ مَعروفاً): چاکەو پیاوەتیی لەگەڵدا کرد.

(مـاأَوْلاهُ لِلْمَعْرُوفِ): ئـای چ چاکە کارێکە/ کێ دەگاتـە ئـەو لـە چاکـە کردنـدا!! (بۆ سەرلێسوڕمانە).

(أَولاهُ علـى اليَتيـم): کـردی بەوەسـی/ سەرپەرشتیکردنی هەتیوەکەی پێسپارد.

(تَوَلّى – الأَمرَ. تَوَلِّياً): کارەکەی گرتە دەست خۆی و کارەکەی بەجێهێنا.

(-فُلاناً): فیسـاری کرد بە سەرپەرشتیار بە وەسی.

(-عَنـهُ): پشـتی تێکـردو وازی لێهێنـاو بەجێیهێشت.

(-هاربا): هەڵات.

(-الشيءَ): شتەکەی گرتە دەست.

(-الرُطَـبُ): فەریکـە خورماکـە خەریکـی وشکبوونبوو.

(-عَلَـيَّ بِـوُدِّهِ): بەرامبـەرم گـۆڕاو رووی دۆستایەتیی لێوەرگێڕام.

(تَوالَيـا. تَوالِيـاً): بـەرووودوا هاتـن/ یەك بەشوێن یەکدا هاتن.

(توالَتِ الغَنَمُ عَنِ المَعزِ): مەڕەکان لە بزنەکان جیابوونەوە.

إستَولى – عَلَيهِ إستيلاءً): دەستی بەسەردا گرت/ بەسەریدا زاڵبوو و داگیریکرد.

(-على الغايَة): لە پێش هەموانەوە گەیشـتە ئامانجەکە.

(-على الشيءِ): شتەکە کەوتە چنگی/ دەستی بەشتکەدا گرت.

(اَلوالـي (ج) ولاة) (فـا): ١-لێینزیکبـووەوە ٢-بەدوادا هاتوو ٣-سەرپەرشتیار.

(والـي البَلَـد): سـەرداری ولاّت ٢-گـەورەو فەرمانداری شار.

(اَلوَلـي): (مـص): ١-نـزیك ٢-باران لەسـەر باران/ باران بەدوای باراندا.

(دارُهُ ولْـيُ داري): خانووەکـەی نزیـك خانووەکەمە.

(اَلـوَلاء): ١-خۆشەویسـتیی‌و دۆسـتایەتی ٢-نزیك‌و لێوەنزیکیی٣-کەسایەتیی‌خزمایەتیی/ خوێشایەتیی ٤-پشت‌و پەناگیریی/ سەرپێبوون و لایەنگیریی ٥-مولك / دارایی یان خاوەنداریی ٦-میراتێـك کەسـێك بەهـۆی ئـازاد بوونـی کەسـێکەوە یان بەهۆی پەیماننامەیەکەوە کە بۆ ئەوکەسە دانرابێت. بەریبکەوێت.

(جـاؤوا وَلاءَ على وَلاءٍ): یەك بەدوای یەکدا هاتن.

(اَلوَلاءَة): خزمایەتیی کەسایەتیی/ خوێشایەتیی.

(اَلوَلايَـة) (مص) (ج) وَلايـات): ١-ولاّت یان بەشـێکی ولاّت کـە والی/ سەرپەرشـتیارو سەرداریەتی‌و بەڕێوەیدەبات ٢-خزمایەتی.

(هم عَلَيَّ ولايَةٌ واحِدَة): ئەوان کەسن بۆ من یەکدەسـتن لەخۆشی و ناخۆشیدا و لەچاکەو خراپەدا. لەپشتگیریدا، کۆن.

(اَلوِلايَـة): ١-فەرمانڕەوایـی ٢-میرنشـینی بەشـێکی ولاّت کەمیرێـك سـەرداریبێت ٣-خزمایەتیی/ کەسایەتیی.

(هُـم عَلَيَّ وِلايَةٌ واحِدَة): ئـەوان بۆ من لە پشـتگیریی و سەرخستندا یان لە خێرو بێرو خراپەیشدا کۆن و یەکدەستن.

اَلوَلِيّ (ج) أولِيَة: ١-باران بەدوای باراندا هاتن (-(ج) أولياء): ١-خۆشەویسـت ٢-دۆست/ یار،

هاوەڵ ٣-پشـتگیر/ هاریکار ٤-هاوسێ/ دراوسێ ٥-هاوپەیمـان ٦-سـەربەو/ شـوێنکەوتوو ٧-زاوا ٨-هەرکەسێك کرابێت بەسەرپەرشتیارو پارێزگارو پێسپێریاری یەکێك.

(اَللهُ وَلِيُّكَ): خودا پارێزگارو ئاگادارت بێت.

(اَلمُؤمِنُ وَلِيُّ اللهِ): بڕوادار هەمیشە فرمانبارو ملکەچـی خودایەو ئاگاداریـی خودایە ٩-لای موسـوڵمان مرۆڤی خاوەنـبڕواو پیرۆزە وەك (قِدیس) ی لای دیانەکانە.

(وَلِيُّ العَهدِ): جێنشینی شا.

(وَلِيُّ الیَتیم): سـەرموکارو سەرپەرشـتیارو بەخێوکەری هەتیو.

(اَلوَلِیَّـةُ (ج) وَلِیّات وَوَلایا): ١-مێی وشـەی (الوَلِـيّ) ٢-نزیکیـی ٣-کورتـان/ کورتانـی گوێدرێژ.

(دارٌ وَلِیَّةٌ): خانوویەکی نزیك.

(اَلأَولی. مَثناهُ اَلأُ ولَیان (ج) اَلأَولَوْن والأَوالي (م) اَلْوُلْیـا مَثنـاهُ الوُلْیَیـان (ج) الوُلَـی والوُلْیَیَات): شیاوتر/ پێرمواتر ٢-شایستەتر.

(هُـوَ أَولی بِکَذا): ئەو لەپێشـتر و شـیاوتری ئەوەیە یان: پێرمواتری ئەوەیە.

(أَوْلی لك): (ئەمە بۆ هەرەشەیە): بۆتۆ باشترە وابیت و وابکەیت ئەگینا خراپت بەسەردێت. ئاگات لە خۆت بێت. یان دەڵێن وا تاکەی:(الوَیلُ لَـك أَو أَولاكَ اللهُ ماتَکْرَهُـهُ): وەیل جێگەت دەبێت یان خودا خراپت بەسەر بهێنێت.

(لامـي (لَكَ) زیـادە): گرفتاری ناخۆشـیت بکات.

(اَلَمـوْلی (ج) المَوالـي): ١-خـاوەن، ماڵخـۆ/ خاوەنخـۆ ٢-ئاغاو گـەورە ٣-کۆیلە/ بەندە ٤-ئازادکـەری (بەندە/ کۆیلـە). ٥-کۆیلەی ئازاد کراو ٦-چاکـەکارو ئانبدە ٧-چاکە لەگەڵکراوو ئانپێـدراو بەخێوکـراو ٨-دڵـدار حەزکردو/ دڵخـواز/ خۆشەویسـت ٩-دۆسـت / یـار ١٠-هاوپەیمـان ١١-دراوسـێ ١٢-پەنابـەر یـان میوان یان کەسـێك لەگەڵدا دابنیشێت و بژی ١٣-هاوبـەش ١٤-زارۆڵە/ کـوڕ ١٥-مام ١٦-ئامۆزا ١٧-خوشکەزا ١٨-زاوا ١٩-خزم / خوێش (لەهەر پلەیەکدا بێت) ٢٠-گەورەو سەربەگەورە.

(هُوَ یَتَمَوْلی عَلَینا): خۆی بەگەورەمان دەزانێ و / ئاغایەتیمان بەسەرەوە دەکاتو دادەنێ.

(اَلمولـيُّ (م) مَولِیَّـةٌ): منداڵێکی بچووکە کە (وەلی/ سەرپەرشتیار)ی بۆ دابنرێت.

(اَلمَوالِیـا): جۆرە هۆنراوەیەکە/ هۆزانیکە کە دەکرایە گۆرانـی لەکۆتایی هەموو دەنگێکیدا دەوترا (یا مَوالِیا): ئاماژە بوو بۆ ئاغاکانیان. (ڕەشە خەڵکەکە بەم گۆرانییە دەڵێن: (مَوّال (ج) مَواویل).

(اَلمَولَوِيّ): سەرپەرشتیاریی.

المَولَـوِيّ عنـد المسـلمین: الزاهِـد: لای موسـوڵمانەکان بەخواپەرسـتێکی لـە دنیا دوورەوە کەوتوو/ دنیانەویست/ سۆفی.

أَلمَولَوِيَّـــة: كلاو فووچێکـه چوارگۆشـــەیە لە خورییە خۆپارێزو دنیا نەویستەکان دەیکەنە سەریان.

(فیه مَولَوِیَّة): لەسەروەرو ئاغاکان دەچێت.

(المتاولَة (ج) المُتَوالي) (فا) ١-یەك لەدوای یەك هاتوو/ بەردەوا هاتوو ٢-یەکبینە ٣-شیعەکان.

أَلمُتاولَـة: شـیعەیەك (بۆیە وایـان پێدەڵێن چونکـە حەزرەتی عەلی و بـەرەی حەزرەتی عەلییـان کرد بە گـەورەی خۆیـان و بوون بەسەر بەوان.

أَلمُتَوالِیَة الحسابیَّة) (ع -ح) مجموعة أَعداد یفضـل (یزید) کل واحد منهـا علی الذي قبله بمقدار ثابت. یدعی الأَسـاس مثلاً ١، ٤، ٧، ١٠، ١٣ و مجموعها یسـاوی نصف عدد. الحـدود مضروبـاً في مجمـوع الطرفین): کۆمەڵـە ژمارەیەك هەریەکە بەبڕێکی نەگۆڕ لەوەی پێشەوەی زیاترە کە پێیدەڵێن بنچینە وەك ١، ٤، ٧، ١٠، ١٣ کۆی دەکاتە نیوەی ڕادەکان کە لە کۆی ئەمسەرو ئەوسەر بدرێت.

المنتوالیه الهندسیة (ع -ح) مجموعة أَعداد یسـاوی کل واحد منها الذی قبله مضروباً في عـدد ثابت یدعی الأَسـاس مثلا ١، ٣، ٩، ٢٧، ٨١): یـەك لـەدوای یەکـی ئەندازەیـی: کۆمەڵە ژمارەیـەك هەرەیەکەیان یەکسـانە بە ژمارەیەك کـە پەیدابێت لـە لێکدانی لە ژمارەیەکی نەگۆڕ کە پێیدەڵێن بنچینە.

(مجموع المتَوالیه الهندسـیة التی اساسـها (هـ) وحداها الاول والأَخیر (ب ء) یسـاوي $\frac{د هـ - ب}{هـ - ١}$ حیـث هـ (#) فـاذا کان ١- د هــ د أ وَدَنا عددا المحـدود من اللانهایة کانت غایة المجموع $\frac{ب}{١- هـ}$): یەك بە دوای یەکێکـی ئەندازەیی کەبنچینەکەی (ه) و یەکـەم ڕادەو دواڕادەی (ب د) بێت برتییە لـە $\frac{د هـ - ب}{هـ - ١}$ کاتێـك ه ≠ سـفر. ئەگـەر (١- د ه د ا بێـت و ژمـارەی ڕادەکان لە ناکۆتا نزیکبێتەوە ئەوا سەرجەم دەکاتە $\frac{ب}{١- هـ}$.

ولي: (المُوالاة): دۆسـتایەتیی و پشـتگیریی و لایەنگیریی/ سەربەوبوون.

(کان ذلك تعبیراً عَـن موالاتِهِ لَهُ): ئا ئەوە دەربڕینی دۆستبوون و لایەنگرتن و سەربەو بوونیبوو.

(أَلمُوالاةُ في السِّیاسَـــة): لە ڕامیاریدا سـەر بە دەسـەڵاتدارانی میری و پشـتگیریکردنیەتی. پێچەوانەکەی بەرهەڵستکارانیەتی.

(کانـت مُوَالاتُـهُ صـادِرَةً عَـن إِقتِناعِـهِ بتَجَرُّد آلسُـلطة وحِیادِها): لایەنگیریکردنی دەسـەڵاتدار لـەوەوە بـوو بـڕوای وابوو کە دەسەڵاتدار بێنازو بێلایەنبوو ئەویش بڕوای ئابەوە بوو.

---

ومـا: ١-(وَمَأو أَومَأَ وَ وَمَّـأَ بحاجبِهِ أَو بِیَدِهِ أَوغَیرَ ذلك. یَمَأُ وَمْأً. تَوْئِمَةً. ئیماءً): بەبرۆی یان دەستی یان بەهەر شتێکیتر ئاماژەیکرد.

(واماَ- الرَجُـلَ مُوامَاَةً): لەگـەڵ پیاوەکەدا ڕێککەوت و گونجا.
(اَلْوُمَـأُ – إلَيـهِ): ئامـاژە بۆکـراو/ ناوبراو دەرخراو/ باسکراو.
٢-الوامِئَــةُ: لێقەومانی گەورەو پڕکەســەرو سەخت.
ومــح: (اَلوَمْحَةُ): هەتاوبــردن یان جێکاری هەتاو لە لەشدا.
ومد: ١-(وَمِدَ-تِ اللَيْلَةُ يَومَدْ. وَمَداً): شــەو لەگەڵ کپیی بادا زۆر گەرمبوو.
(ليلَةٌ ومِد وَوَمِدَة): شــەوێکی زۆر گەرمی با کپ/ باکەوتوو.
(اَلوَمْدَةُ): سەختی گەرمای شەو.
٢-(وَمِدَ-عَلَيــهِ. يَومَدُ وَمَــداً): لێیگەرمبوو/ لێیتووڕەبوو.
(هُــوَ وَمِــدٌ عَلَيه): ئــەو ڕقی لێهەســتاوە/ لێیتووڕەو گەرمبووە.
ومــز: (وَمَزَ-بِأَنْفِهِ يَمِزُ. وَمْــزاً): لەرقاندا لووتی جووڵاند.
(تَوَمَّزَ): ئامادەی هەستانبوو.
ومس: (وَمَسَ- الشَيءَ بالشَيءِ. يَمِسُ وَمْساً): شتەکەی لە شتەکەیتر خشاند تا ڕووتبێت.
(أَوْمَسَ-تِ المَرأَةُ): ژنەکە بوو بە (ســۆزانی/ قەحبە/ داوێنپیس).
(-العِنَــبُ): ترێکــە نــەرم بــوو و خەریکی گەیینبوو.

(الوَمْسَةُ): خاڵێکی سپی.
(اَلُومِس والُومِسَــةُ (ج) مومِسَات ومَوامِس ومَواميس وَمَيامِــس وَمَياميس): ئافرەتی سۆزانی/ قەحبە.
ومض: (وَمَضَ- البَرقُ يَمِضُ. وَمْضاً ووَميضاً وَوَمَضانــاً): هەورە برووســکەکە کەمەکێك (شەوقیدایەوە/ درەوشــایەوە/ بریسکایەوە/ ورشە ورشیهات).
(وامِض): بروســکەی (درەوشاوە/ ورشەدار/ شەوقدەرەوە).
أَومَضَ- البَرقُ إيماضاً): هەورە بروســکەکە شەوقیدایەوە/ درەوشایەوە.
(-الرَجُلُ): ١-بەهێما سووکە ئاماژەیەکیکرد/ چاوی داگرت/ چاوی هەڵتەکاند ٢-بروســکەی هەورە تریشقەی بینی یان ڕووناکیی ئاگرێکی بەرچاوکەوت ٣-زەردەخەنەیکرت.
(أَومَــضَ-تِ المَــرأَةُ بِعَينيهــا): ژنەکــە چاوەدزەیکرد.
ومع: (الوَمْعَة): دەرپەڕینێکی/ فیچقەی ئاو.
ومغ: (اَلوَمْغَة): تاڵێك قژی درێژ.
ومــق: (وَمِــقَ-هُ. يَمِــقُ. مِقَــةً وَوَمْقــاً): خۆشیویست.
(وامَــقَ-هُ وماقــاً وَمُوامَقَــةً): هەردووکیان یەکتریان خۆشویســت/ چوو بە لایەوە/ خۆی تێهەڵسوو.
(تَوَمَّقَ-هُ): لاواندی و خۆشیویست.

(تَوامَقَ- الرجلان): دوو پیاوەکە دۆستایەتیان گرتو یەکتریان خۆشویست.

(ألوَمِيْق والمَوْمُوق): خۆشەویسـت/ دڵخواز/ دڵدار/ یار.

ومـن: (تَوَمَّنَ – الرَجُـلُ): پیاوەکە منداڵی زۆر خستەوەو زۆربوون.

ومه: (يَومَهُ دَمَهاً): گەرما تاویسەند.

ومي: (وَمّى- بِالشَّيءِ تَومِيَةً): شتەکەیبرد.

(إِسْـتَومى- عَلَيهِ): دەسـتی بەسەرداگرت/ داگیریکرد.

(اَلمَوْمَـاة والمَوْمـاء (ج) المَوامـي): بیابانـی بەرفراوانی وشکوبێئاو.

ونّ: (اَلْـوَنّ): ١-لاوازیـی/ بێتوانایـی ٢-(مو) چەقەنەکە بە پەنجە لێدەدرێت (وشەکە هی بێگانەیە).

(وَنَّ الذُبابُ) (عامیه): مێشـەکە ویزەویزی کرد.

ونب: (وَنَّبَ-هُ): پێدا هەڵشاخا.

ونج: (اَلوَنَج (مو) (فارسية): جۆرە تار یان عوودێکە.

ونح: (وانَحَ – هُ موانَحَةً): لەگەڵیدا گونجاو رێککەوت.

ونـل: (اَلوَنیلَـة (ن): ڤانیـلا رووەکێکە لە ئەمەریکای ناوەراستەوە بڵاوبۆتەوە لە وڵاتە گەرمەکانـدا زۆر دەروێنرێـت لـە هـەردوو کیشـوەرە کۆن و تازەکاندا. بەرەکەی بۆنێکی خۆش و تیـژی هەیە بۆنی لێدەگیرێت کە بۆ حەڵواو دۆندرمەو شتیتر بەکار دەهێنرێت.

ونـم: (وَنَمَ – الذُبابُ يَنِـمُ. وَنْماً وَوَنيماً): مێشەکە گویکرد.

(ألوَنَمَة والوَنيم): گوومێش.

ونـي: ١-(وَنى وَوَنِيَ يَني وَيَوْنى وَنْياً وَوَنِيّاً وَوِناءً وَونْيَةً وَوَنىً): لەشی سست و بێهێزبوو/ لاوازبوو و ماندوو شەکەتبوو. پەکیکەوت.

هُـوَ وانٍ (م) وانِيَة): بێهێزو لاوازو سسـتو پەککەوتەو شەکەت.

(-هُ): وازی لێهێنا.

(-عَن كَذا): وازی لەوە هێنا/ بەجێهێشـتو فەرامۆشیکرد/ پشتگوێیخست.

(-تِ السحابَةُ): هەورەکە باراندی.

(فُـلانٌ لايَنى يَفعَلُ كذا): هێشـتا هەرئەوە دەکات/ خەریکی ئەوەیە.

(وَنّى تَونِيَةً): لەکارەکەدا کەمتەرخەمییکرد/ باش تێهەڵنەچوو.

(أونـى – الرَجُلَ إِينـاءً): پیاوەکـە بێهێزو ماندوویکرد.

(تَوانى فِي حاجَتِهِ. تَوانِياً): بۆ دەستیگربوونی پێداویسـتیەکەی خۆی سـاردوو سسـتکردو کەمتەرخەمییکردو/ بە تەنگەوە نەهات.

(اَلوانـي) (فـا): بەتەنگـەوە نەهاتـوو/ کەمتەرخەم / سست ٢-لەش لاوازو بێهێز.

(نَسيمٌ وانٍ): شنەیەکی/ سرەیەکی کز.

(اَلوَناء): خاووخلیچك.

(إمْـرَاَةٌ وَنـاةٌ وَاَنـاةٌ واَنِيـّةٌ): ژنێکی خاو/ خلیچك و سستەپەلە.

(اَلوَنُوَّة): کەمهۆش/ گێژو وێژ/ گەمژە.

(اَلمینا واَلمِیْنَاء (ج) مَوانٍ وَمَوانِيّ): ئەسکەلە/ بەندەر (هەردوو وشەکە نێرن بۆیە واناونراوە چونکە پاپۆڕتیایدا کەمجوولەیە).

(میناء السـاعَة) ڕووی کاتژمێر کە دوو باڵی تێدایە.

٢-وَنى وَوَنِيَ – الکَمُّ یَني. یَوْنى. وَنیاً وَوَنِیاً وَوِناءً وَوِنْیَةً ووَنىً): قۆڵی لێهەڵماڵی.

٣-(الوَناة والوَنِیّة): مرواری یان دوڕ.

الوَنِيُّ: دوڕ.

وَهٌ. وَهْوَهَ –فِي صَوتِـهِ. وَهْوَهَةً: لەخەفەتدا یان لەترس و لە تاواندا هەر ئاهو ئۆیبوو هەر ئایش و ئایبوو.

(-اَلأَسَـدُ فِي زَئیرِهِ): شێرەکە هەردەینەڕاندو دەیزریکاند.

(اَسدٌ وَهواهٌ): شێرێکی بەنەڕەو زریکە.

(اَلوَهْـوَهُ – مِـن الخَیلِ): ئەسـپی چابوکی قایم و ئازا.

(اَلوَهواهُ – مِن الخَیلِ): ئەسپی گورجوگۆڵی قایم و ئازا.

(رَجُلٌ وَهـواهٌ): پیاوێکـی زیرەکردوو/ زۆر ترسنۆك.

وهـب: ١-(وَهَـبَ – المـالَ فُلانـاً ولِفلانٍ: یَهَبُ. وَهْبـاً وَوَهَباً وَهِبَـةً): دارا یان مال و هەرشتێکیتری بەخۆڕایی بە فیسار بەخشی.

هَبْ: وایدابنێ/ وابزانە لات وەها بێت.

(هَبنی فَعَلْتُ کذا): وایدابنێ من ئەوەمکردووە (لێـرەدا هَـب تەنها بـۆ فرمانـی داخوازیی دەبێت).

(وَهَـبَ وَوَهِبَ- اَلرجُلَ یَهَـبُ. وَهْباً وَوَهَباً وَهِبَـةً): لەبەخشـین و شـت بەخەڵکـدان بەخۆڕاییـی لـە پیاوەکـە لەپێشـتر بـوو/ بەخشندەتر بوو/ دەستوالآ و دڵفراوانتربوو.

(واهَبَ-هُ. مُواهَبَةً): لەو بەخشـندەتر بوو و لە بەخشیندا بۆری ئەویدا.

(اَوهَبَ – الأَمـرَ لِفُلانٍ. إیهاباً): کارەکەی بۆ فیسار (ئامادەکرد/ سازدا).

(-الشَـيءُ لِفُـلانٍ): وایکرد فیسـار بتوانێت شتەکە بە ئاسانی بەرێت.

(-الشَـيءُ لَهُ): شـتەکەی بەزۆریـی و تێرو تەسەلیی خستە بەردەستیەوە تا بەخەڵکیشی بەخشی.

(اَوهَبـتُ لکذا): توانام (بەسـەر ئەوەدابوو/ بەسەر ئەوەدا شکا).

(تَواهَبَ- القَومُ): خوێشکەل شتیان/خەڵاتیان بە یەکتر بەخشی.

(إتَّهَبَ الهِبَةَ. إتِّهاباً): خەڵاتەکەو بەخشینەکەی وەرگرت.

(إسْـتَوهَبَ- اَلهِبَةَ: إسْتِیبهاباً): داوای خەڵات

و بەخشینیکرد.
(-فُلانــاً ومِن فُــلانٍ اَلهِبَةَ): فیســار داوای لەفیســارکرد کــە خەڵاتــی بــکات و شــتی پێببەخشێت.
(اَلهِبَــة: (مــص) (ج) هِبــات): ١-بەخۆڕایی پێبەخشــین/ خەڵاتکردن ٢-شتی بەخشراو و بەخۆڕایی/ خەڵات.
(اَلمَوهُوب): ١-پێبەخشراو/ بەخۆڕایی پێدراو ٢-شتی بەخشراو و بەخۆڕایی/ خەڵات.
(اَلمَوهِب): بەهرەدار/ بەبەهرە/ بەهرەمەند.
(اَلوَهّاب وَالوَهّابَة والوَهُوب): فرەبەخشندە، زۆر (خەڵاتدەر/ خەڵاتکەر).
(اَلموهِبَة): بەخشین، خەڵاتدان.
(اَلمَوهِبَة وَالمَوهَبَة (ج) مواهِب): ١-بەخشش/ خەڵات شــتی پێــدراو بەخشــراو بەخۆڕایی ٢-بەهــرەو زیرەکیی و ســەلیقە لــە هەموو بوارێکدا.
٢-(اَلمَوْهِبَة. والمَوهَبَة (ج): مَواهِب): گۆماوێکی بچووك.
(هُوَ اَشــهی مِن ماءِ مَوهِبَةٍ علی خَمرٍ): ئەو لەو ئاوە خۆشترە کە بەسەر مەیدا دەکرێت.
وهت: ١-وَهَتَ – الشيءَ. يَهِتُ. وَهْتاً): ١-شتەکەی پەستاوت ٢-توند پێی بەشتەکەدا ناو شێلای.
(اَلوَهْتَــةُ (ج) وَهْــتٌ): زەویــی (داچــوو/ داکەوتوو).
٢-(اَوهَتَ- اللَّحْمُ): گۆشتەکە بۆگەنیکرد.

(لَحْمٌ مُوهِتٌ): گۆشــتی (بۆگەن/ بۆنکردوو/ بۆگەنبوو).
وهث: (وَهَثَ – فِي الشيءِ. يَهِثُ. وَهْثاً وَهِثَةً): سەری بەشتەکەوە قاڵبوو/ پێوەی خەریکبوو.
(-الشيءَ): توندپێی بەشتەکەداناو شێلای.
(تَوَهّــثَ-فِي الأمرِ تَوَهُّثــاً): لەکارەکەی زۆر کۆڵییەوەو پێوەی خەریکبوو.
وهج: (وَهَجَ-تِ النارُ اَوالشَمسُ. يَهِجُ. وَهْجاً وَوَهِيجاً وَوَهَجاناً): ئاگرەکە کڵپەیسەند/ گڕی بەرزبووەوە/ تاویسەند، خۆرەکە تاویسەند.
(اَوهَجَ- النارَ): ئاگرەکەی خۆشــکرد/ کڵپەی بەئاگرەکە سەند/ یان ئاگرەکەیکردەوە.
(تَوَهُّــجَ): ١-کڵپەیســەند ئاگرەکــە گــڕی بەرزبــووەوە ٢-شــەوقیدایەوە ٣-گەرمــای خۆرەکە تاویسەند.
(-يَومُنــا): ڕۆژەکەمــان (زۆرتــر گەرمبوو تاویسەند).
(-الجَوهَــرُ): گەوهەرەکــە: درەوشــایەوە/ درەخشا/ شەوقیدایەوە/ بریسکایەوە.
(-تْ رائِحَــةُ الطيــب): بۆنــە خۆشــەکە بڵاوبووەوە/ پەخشبوو.
(اَلوَهيج): ١-کڵپەسەندنی ئاگریان تاوسەندنی زۆری هەتــاو. ٢-تینــی ئاگــرو هەتــاو لــە دوورەوە.
(وَهَجُ الطيب): پەخشبوون و بڵاوبوونەوەی بۆنی خۆش.

(يَومٌ وَهِجٌ): ڕۆژێکی زۆر گەرمو تاوسەندوو.
(ألوَهّــاج): زۆر (شــەوقدار/ بەشــەوق/ ڕووناکیبەخش/ درەوشاوە/ ورشەدار).
(نَجمٌ وَهّاج): ئەســتێرەیەکی (ورشــەدار/ بریسکەدار/ درەخشاوە).
(سراجٌ وَهّاج): چرایەکی شەوقدار/ بەشەوق/ ڕووناکیبەخش/ زۆر ڕۆشن.
(يَومٌ وَهجان): ڕۆژێکی (زۆرگەرم/ تاوسێن).
(ألوَهيــج): (مص): گڕســەندن داگیرســان/ گڕگرتن،تاوسەندن: ٢-پەخشان و بلاوبوونەوەی بۆنی خۆش.
وهــد: (وَهَّــدَ- لَــهُ الفِــراشَ): نوێنەکەی بۆڕاخست و خۆش و ئامادەکرد.
(تَوَهَّدَ- الفراشُ): نوێنەکە ڕاخرا ئامادەبوو/ جێی نووستنەکە بلاوکرایەوە و خۆشکرا/ تەختکرا.
(ألوَهد (ج) أَوْهُد وَ وُهدان): زەویی (نزمان، نەویو).
(مَكانٌ وَهْدٌ): شوێنێکی نزم/ چاڵ.
(ألوَهْــدَةُ (ج) وِهاد وَوَهْــد): ١-زەویی نزم/ نەویو.
٢-(ألهُــوَّة- في الأَرض): چاڵێکــی زۆر قووڵ/ قووڵکە.
وهر:١-(وَهَــرَ وَوَهَــرَ-هُ. يَهِرُ وَهْــراً): وای گرفتارکرد کە چارەسەرو دەرچوونی نەبێت.
(تَوَهَّرَ- اللّيلُ أَوالشِّــتاءُ): بەشــی زۆری شەو یان زستان بەسەرچوو ڕۆیشت.

(-هُ في الكلام): بەقسە شپرزەیکردو قسەکەی بۆتەواو نەکراو حەپەسا.
(لَهَبٌ واهِرٌ): گڕێکی (شــەوقدار/ بەشەوق/ درەوشاوە/ کڵپەسەندوو).
(ألوَهْرُ): شــەوقی تیشکی ڕۆژ کەبەرزەویەکە دەکەوێت جۆرە شپرزەییەکی دەبینرێت وەك هی هەڵم/ بۆخەی بەرهەمتاو.
(ألوَهْرَة): کەوتنە گرفتارییەك تووشبوونێك کە دەرچوونی نەبێت.
(ألوَهْران): ترساو.
فــلان ذو وهره (عاميه): فیســار ســامدارە سەنگین.
٢-(إسْتَوهَرَ وَاسْتَيْهَرَ- بِهِ. إسْتِيهاراً): ئەوەی لەدڵدا چەسپیو پێیزانی.
(وهز: وَهَزَ-هُ. يَهِزُ. وَهْزاً): خستیە ژێرەوە/ پێیلێنا. ٢-پاڵیپێوەناو بەهەموو هێزی دەستی پیایدا کێشا.
_-هُ على كذا): هانی ئەوەیدا.
(-الشيءَ): شتەکەی شکاندو وردوخاشیکرد.
(-القَملَةَ بَينَ أَصابِعِهِ): ئەسپێکەی بەنینۆك (کوشت/ قرچاند).
(وَهَّزَ-هُ): قورسیکرد. باری قورسی لێنا.
(تَوَهَّزَ): پێی توند بەزەویــدا داو پێکرانانە ڕۆیشت.
(-خَلْفَ فُلانٍ): لەپشت فیسارەوە قەڵەمبازیدا/ هەڵبەزییەوە.

(مَرَّ يَتَوَهَّزُ): ڕۆیشت و توندپێی (لەزەویەکە چەقاند/ بە زەویەکەدانا).

(اَلوَهــز) (مص): پیــاوی کورتەبنەی توندو تۆڵ.

(اَلوَهَّــازَة): ڕۆیشــتنی ئافرەتانی بەشــەرمو شکۆ.

(اَلأَوهَز): ڕۆیشتنی جوان و ڕێکوپێك.

(اَلمُوَهِز والمُوَهَّز): زۆر نزم/ نەویو.

وهــس: ۱-(وَهَسَ- الشــيءَ. يَهِسُ وَهْســاً): ۱-شــکاندی و هاڕی/ وردو خاشــیکرد ۲-توند شتەکەی ژێر پێنا.

(-الرَّجُلُ): پیاوەکە توند ڕۆیشت/ گوڕیدایە خۆیو ڕۆیشت.

(-على قَومِهِ): زماندرێژیــی و بێئابڕوویی بەرامبەر خوێشکەڵکرد.

(واهَسَ مُواهَسَةً): توندو خێرا ڕۆیشت.

(تَوَهَّــسَ-تِ الإبــلُ): حوشــترەکان زۆرباش ڕۆیشتن.

(تَوَهَّسَ الأَرضَ فِي مَشيَتِهِ): لەڕۆیشتندا توند پێی بەزەویەکەدا ناو چاڵیکرد.

(تَوَهَّــسَ وتَواهَــسَ): ۱-وەك لەشــکرانێك ڕۆیشت و توند پێی بەزەویدا نا ۲-خێراو توند ڕۆیشت.

(اَلوَهْسَــةُ): ڕێیەکی پێخوست کە زۆر پێیدا برۆن.

(اَلوَهَّاس): ۱-چاك تێکشــکێن و چاك وردکەر ۲-زۆر زماندرێژی بێئابڕوو.

(اَلوَهَّاس) (ح): شێر.

۲-(وَهَــسَ-فِي الأَمرِ يَهِسُ. وَهْســاً): فێڵی لە کارەکەدا کرد.

(واهَــسَ-هُ. مُواهَسَــةً): بەگژیــدا چــوو و دوژمنایەتیی لەگەڵدا کرد.

(اَلوَهْــس) (مص): ۱-خراپــە ۲-بەد زمانیی/ دووزمانی.

وهــص: (وَهَصَ-الشــيءَ الرَخْــوَ. يَهِــصُ. وَهْصــاً): ۱-شــتەخاوەکەی شــکاندو وردکرد ۲-تونــد پێیلێنــاو شــێلای ۳-تونــد فڕێیدا/ هەڵیدا/ تووڕیدا ٤-کێشای بەزەویدا.

(-الرأسَ): سەرەکەی (شکاند/ قرنجاند).

(-اَلحَيوانَ): گونی ئاژەڵەکەی بڕی/ خەساندی.

(اَلوَهْصَــةُ): ۱-جارێــك پێلێنــان و شــێلان ۲-جارێــك توند فڕێدان ۳-جارێك خەســاندن ٤-سەرشکاندن.

(اَلوَهْصَةُ): زەویی نزم/ نەویو.

(اَلوَهَّاص): زۆر بەخشندەو دڵفراوان.

(اَلمَوهِص (ج) مَواهِص): شــوێنی شــێلان و فڕیدان و بە زەویدا کێشان.

(اَلمَوهُوص والمُوَهَّصُ الخَلْق): کەسێکە زگماك لەشــی گرمۆڵــە بێــت. وەك ئێســقانەکانی بەیەکدا چووبێت.

(وَهض: (اَلوَهْضَة): زەویی نزمان.

وهط: (وَهَــطَ-هُ. يَهِطُ وَهْطاً): ۱-شــکاندی

٢-شـێلای/ پێیلێنا ٣-تیغ یان نێزەی پێداکرد ٤-لێیدا.

(-الرَجُـلُ): پیاوەکـە لاوازو بێتوانابـوو/ بێهێزبوو.

(أوهَـطَ-هُ): ١-لاوازو بێهێزیکـرد ٢-تێروپڕ لێیدا ٣-دایبەزەویدا ٤-ئەوەی پێکرد کە حەزی لێنەکات و پێیناخۆش بێت.

(-جَناحَ الطائرِ): باڵی پەلەوەرەکەی شکاند.

(تَوَهَّطَ): ١-شکا ٢-پێشێلکرا ٣-تیغ یان نیزەی پێداکرا ٤-تیری لێدرا.

(تَوَهَّطَ- الفِراش): نوێنەکەی ڕاخست.

(-في الطين): بەقوڕەکەدا چوو/ لە قوڕەکەدا ونبوو.

(اَلْوَهْـط (ص) (ج) أَوْهـاط): ١-لاوازیـی/ چرووسـاویی/ بێهێزیـی ٢-کۆمەڵە خەڵك ٣-ناکۆکی و ناخۆشی و هات و هاوار.

(بينَهُم أوهاط): شـەڕو ناکۆکیـی و هاوارو ناخۆشییان لە نێواندا هەیە.

(اَلوَهْطَةُ (ج) وَهْـط وِوهاط): زەویی نزمو نەویو.

وهف: (وَهَفَ – إلى كذا يَهِفُ. وَهْفاً وَوَهِيفاً): نزیکی ئەوە بووەوە.

(-لَهُ شيءٌ مِنَ الدنيا): شتێکی جیهانیی درایە بەرچاوی/ کەوتەبەر چاوی و بۆی دەرکەوت.

(-النَصرانِـيُّ وَهْفـاً وِوهافَـةً): دیانەکە لە کڵێسەدا خەریکی کارگوزاریبوو/ خزمەتیکرد.

(أَوهَفَ الشيءُ إلى كذا. إيهافاً): شتەکە نزیکی ئەوەبووەوە.

(-لَهُ الشـيءُ): شـتەکە هاتە بەردەمی هاتە پێشیەوەو بە سەریدا ڕوانی.

(اَلواهِف) (فا): ١-نزیکـەوە بوو ٢-کارگوزاری کڵێسەو سەرپەرشتیاری یان مجێوری کڵێسە.

(اَلوِهافَة والوُهْفِيَّة): شـێوەی سەرپەرشـتی کردنی کڵێسەو کارگوزارییکردنی.

٢-(وَهَـفَ- النَبـاتُ يَهِفُ. وَهْفـاً وَوَهيفاً): گیاکە یـان ڕووەکەکە سـەوزبوو و گەڵایکرد گەڵایدەردا.

وهق:١-(وَهَقَ- الدابَّةَ. يَهِقُ وَهْقاً):وڵاخەکەی پەتکرد/ پەتی کردە ملی وڵاخەکە.

(-هُ عَن كذا): جڵەوگیری ئەوەیکردو نەیهێشت بەلای ئەوەدا بچێت/ بەری ئەوەی لێگرت.

(اَلقَلْـبُ عِندَكـم مَوهـوقٌ): دڵ بەئێوەوە بەندە/ لای ئێوە بەندو گیرساوە.

(اوهَقَ – الدابَّـةَ): پەتە قوڵفدارەکەی کردە ملی چوارپێکە/ چوارپێکەی پەتکرد.

(تَوَهَّـق –فلاناً في الكَلامِ): قسـەکەی لێبڕی و چەواشـەیکرد/ سـەری لێتێکـدا نەیزانی چیدەڵێت.

(اَلْوَهق والوَهَق (ج) أَوهاق): پەتێکە سەرێکی قوڵفەیە/ ئەڵقەیە دەکرێتە ملی چوارپێکە بۆ ڕاکێشانی.

٢-(واهَقَ- البَعيرُ البَعيرَ مُواهَقَةً): حوشترەکان

لەرۆیشتندا ملیان درێژکردو کەوتنە پێشبڕکێ لەگەڵ یەکدا.
(تَواهَــقَ – القَومُ فِي الأَمرِ): خوێشــگەل لە کارمکــەدا چونیەکبوون یان تیایــدا کەوتنە پێشبڕکێ.
(-تِ الإبِــلُ): حوشــترەکان لــە رۆیشــتندا ملیان درێژکرد رۆیشتن و کەوتنە پێشبڕکێ لەگەڵیەکدا.
(-السَاقِيان): دوو ئاوکێشەکە پێشبڕکێیانکرد.
٣-(تَوَهَّقَ – الحَصى): چەومکان بەهەتاومکە داخبوون.
وهل: (وَهَلَ – الى الشيءِ يَهِلُ وَيَوهَلُ. وَهْلاً): بۆشــتێك دەچوو شــتێکیتری لە مێشکدا/ لە خەیاڵدا بوو.
(وَهِــلَ – فِي الأَمــرِ وَعَنــهُ. يَوهَــلُ وَهَلاً): لەکارمکەدا هەڵەیکردو لەبیریچووەوە.
(تَوَهَّلَ – هُ): وایلێکرد کە بکەوێتە هەڵەوە/ بەهەڵەیدابردو لەبیریبردەوە.
٢-(وَهِلَ. يوَهَلُ. وَهَلاً): ١-بێهێزو بێورە بوو ٢-هەڵسڵەمییەوە/ داچڵەکی و تۆقی.
(وَهِــلُ): ١-بێــورەو بێهێز ٢-هەڵســڵەمیوو و ترساو/ تۆقیو.
(-إلَيهِ): هانایبۆبرد/ هاواری بۆ کرد/ پەنای بۆ برد.
(وَهَّلَ –هُ): دایچڵەکاندو ترساندی و تۆقاندی.
(إسْــتَوهَلَ): ١-بێورەو بێتواناب‍ــوو/ لاوازبوو ٢-تۆقی و هەڵسڵەمییەوە.

(اَلوَهَل والوَهْلَة): داچڵەکین/ هەڵسڵەمینەوەو ترسان و تۆقین.
(لَقِيتُــهُ أَوَّلَ وَهْلَــةٍ أَو وَهَلَــةٍ أَو واهِلَــةٍ): کەیەکەمجار، یەکەم بینین یەکەم پێگەیشتن کە دیم. یان یەکەم شت کەدیم.
وهم:١-(وَهَمَ-فِي الشَــيءِ. يَهِــمُ. وَهْماً): بۆ ئەوشتە چوو کە مەراقیبوو لەکاتێکدا دڵی بۆ شتێکیتر دەچوو.
(وَهَمَ – الشَــيءَ): شــتەکەی بەدڵــدا هاتو هێنایە بەرچاوی و کەوتە مێشکیەوە/ کەوتە بەرخەیاڵی لە کاتێکدا بۆ شتێکی تر دەگەڕا.
(وَهِــمَ – فِي الحســابِ يَوهَــمُ. وَهَمــاً): لەژمێرەکــەدا هەڵەیکــرد/ بەهەڵەداچــوو/ لێیتێکچوو.
(وَهَّــمَ-هُ): ١-بەهەڵەیــدا بــرد ٢-تووشــی سەوداسەریکردو گومانی لەدڵدا پەیداکرد.
(أَوهَمَ إيهاماً): ١-کەوتە گومانەوە ٢-دڵی بەملاولادا رۆیشت و خولیا بردیەوە ٣-بەهەڵەداچوو.
(-هُ): خســتیە گومانەوە/ دڵی پیسکرد، دڵی بەملاولادا بردو خستیە خەیاڵەوە.
(-فُلاناً بِكَذا): فیســاری بــەوە گومانبارکرد و وایدادانــاو زانی کە ســووچی ئــەوە و ئەو تاوانبارە.
(-كَذا مِنَ الحســابِ): هێندەی لە ژمێرەکەدا داشکاندو دەریکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی هەموو وازلێهێنا.

(أتْهَمَ -هُ بِكَذا): بەوە گومانبارو گوناهبارێکرد وایزانی سووچی ئەوە (ئەمە لە شێوازی وتنی خەڵکە ڕەشۆکەکەیە. ڕاستییەکەی وشەی (إتَّهَمَهُ) دەوترێت گومانبارێکرد.

(تَوَهَّمَ- الأمرَ): کارەکە واهات بەدڵ و مێشکیدا/ واخەیاڵی بۆچوو هاتە بەرچاوی.

(-فيه الخَيرَ): چاکەی (لێچاوەڕێ/ لێبەدی)کرد.

(إتَّهَمَ-هُ بِكَذا): بەوە گومانبارێکردو تاوانەکەی خستە ئەستۆی.

(-هُ في قَولِهِ): گومانی لە ڕاستی قسەکەیبوو/ باوەڕی بە قسەکەی نەکرد.

(-الرَّجُلُ): گومانبارییەکەی بەسەردا سەپا/ تاوانبار کرا/ گوناهبارکرا.

(-الواهِمَة): دەردەگومانی بەهێز.

(الوَهْم (مص) (ج) أوهام): گومانکردن، گومان/ ئەوەی بەدڵدا دێت/ سەودا/ خولیا/ خەیاڵ و بیر. بەو هێزە گومانە دەوترێت کە هەستە هەناوییەکانە کە بەهۆیەوە هەست بە واتاناستەمییەکان دەکرێت کە پەیوەندیی بە شتە دەرکپێکراوەکانەوەیە وەك ئازایەتی و بەخشندەیی لەمرۆڤدا. ئەم هێزەیە کەوا لە مەڕ بکات لە گورگ ڕابکات یان منداڵ و بەچکە سۆزی دایکی لەسەر بێت. ڕەشە خەڵکەکە وشەی (وَهم) بۆ ترس و بایەخ دادەنێن. دەوترێت (: لاوَهْمَ مِن ذلك) گومان لەوەدا نییە/ ئەی چار ناچارە هەر دەبێت ببێت.

(الوَهْمِيّ): گومانیی.

(التُهْمَة واَلتُهمَةُ (ج) تُهَمْ وتُهَمات): ١-گومانبارکردن/ گوناهبارکردن/ تاوانبارکردن تاوان خستنە پاڵ ٢-ئەوەی پێی (گومانبار/ تاوانبار/ گوناهبار) دەکرێت.

(اَلتَّهيم): (گومانبار/ گوناهبار/ تاوانبار) کراو.

(المَوهوم- مِنَ الأشياء): ئەو شتەی کە گومانی بۆ دەچێت و نادیارە بە خەیاڵ و بە دڵدادێت.

٢-(أتْهَمَ): چووە توهامە.

(تِهامَة): خاکی باشووری حیجازو مەککەیە.

٣-(الوَهْم: (ج) أوْهام وَوُهُم وَوُهُوم): ١-شەقامی فراوان/ ڕێگەی فراوان ٢-پیاوی مەزن ٣-حوشتری بەهێزی زلەی ڕەوان.

(اَلوَهْمَة): مێحوشتری کەتە/ قەبەو زل.

الملحق:

وهم: (اَلتَّوَهُّم): ١-خولیای شتێکبوون/ خەیاڵکردنی شتێك کارێك/ وا بەبیردا هاتن ٢-بڕوایەکی هەڵە کە لەسەر بنچینەیەکی ڕاست دانەمەزرابێت.

(إنَّهُ لَضَربٌ مِنَ التَّوَهُّم أن تفكِّر في إقناعِهِ): بەڕاستی جۆرە بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە، سەودایەکە کە تۆ بیر لەوە بکەیتەوە کە پێی بسەلمێنیت کە ئەوە وایە یان وانییە.

(اَلوَهم: فِكرَةٌ خيالِيَّة. غريبَة. شيء وهْمِي لاوجود لــه في الواقع): بيرێكى ســەوداییەو خولیاییەو سەیرە/ شــتێكى گومانلێكراوە لە ژیانى راستیدا شتى وەها نییە.

(تَوَهُّمــات عَقــلٍ مَريــضٍ): بۆچونێكــى گوماناویى (مێشكێكى/ ناوەزێكى) نەخۆش.

وهــن: ١-(وَهَــنَ-ه يَهِنُ. وَهْنــاً): كزیكرد/ بێهێزیكرد/ لاوازیكرد.

(وَهَنَ ووَهُنَ. يوهُنُ وهْناً ووَهَناً): لەكارەكەدا بێدەسەڵاتبوو لە فرمانەكەدا/ لەكاركردنەكەدا بێهێزبوو و لەشى لاوازو بێهێز بوو/ جەستەى سست و شلبوو.

(وَهِــنَ. يَهِنُ وَهنــاً وَوَهَناً. ووَهِــنَ. يوهَنُ وَهَنــاً): ١-بێهێــزو بێتوانــا بــوو ٢-لاوازبوو ٣-بێدەسەڵاتبوو/ پەكیكەوت.

(وَهَّنَ وَأوهَــنَ-ه): بێهێزیكــرد/ لاوازیكرد، بێتوانایكرد.

(تَوَهَّنَ-الطائِــرُ): باڵندەكە هێندە گۆشــتى كەلاكیخوارد قورســبوو نەیتوانــى بفرێت و هەستێت.

(-البَعيرُ): حوشترەكە پاڵكەوت.

(اَلواهِــن) (فــا): لاواز/ بێهێز/ كــز بێتوانا ٢-(ع ا) رەگێكە لە پشــتملەوە درێژ دەبێتەوە تاشان لەژێر دەمارى ملدایە.

(اَلواهِنَة): ١-مێى وشەى (الواهِن) ٢-بێهێزیى/ بێتوانایــى/ لاوازیــى/ بێورەیــى ٣-بــازوو ٤-گرێیەكى پشتمل ٥-ئەو دوو دانە پەراسووەى كە لە دامێندان.

(إنَّهُ لَشَــديدُ الواهِنَتَين): ســنكى زۆر توندو قایمە.

(اَلوَهْن (مص)- مِنَ الرجال أَوالإبل): پیاوى كورتە باڵاى ئەســتوورو قەڵەو یان حوشترى كورت و قەڵەو.

(اَلوَهْن وآلوَهَن): ســستى و بێهێزیى لە كاردا لە فرماندا یان لە لەشدا.

(اَلوَهْنانَــة — مِنَ النســاءِ): ژنانێكى تەمەڵ كــە كارنەكردنیــان و تەمەڵییــان بــە هۆى خۆشگوزەرانیانەوەیە.

(اَلوَهُون): لاواز/ بێهێز.

(اَلمَوْهون (م) مَوهونَة): لاواز/ بێهێز/كز.

٢-(وَهَنَ وَأَوهَنَ-الرَجُلُ. يَهِنُ. وَهْناً): پیاوەكە كەوتە نیوەشەو یان دواى نیوەشەوەوە.

(اَلوَهن —مِنَ اللَّيل): نیوەشەو یان كاتژمێرێك دواى نیوەشەو.

(اَلمَوهِــن- مِنَ اللَّيــل = الوَهْن مِــنَ اللَّيل): نیوەشەو یان كاتژمێرێك دواى نیوەشەو.

وهي: ١-(وَهى وَوهِيَ- الثَوبُ وَهْياً): جلەكە/ پۆشاكەكە: شەقیبرد و درا.

(-الشيءُ): ١-رایەڵى شتەكە/ شیرازەى شتەكە. شلبوو لەیەكترازا ٢-كۆنبوو/ بێهێزبوو.

(-الحائِطُ): ١-دیوارەكــە خەریكى كەوتنبوو ٢-دیوارەكە كەوت.

(-السحابُ): هەورەكە بەگوڕ پەیدابوو.

(-الرَجُلُ): گەوجبوو/ خۆی گەوجكرد.

(أَوهـى -فُلاناً. إيهاءً): ١-فيسـاری (بێتوانا/ بێهێز)كرد/ پەكیخست ٢-كزو لاوازیكرد.

(ضَرَبَهُ فَأَوهى يَدَهُ): لێیداو پەكی دەستیخست یان شكاندی یان وەك شكاوی لێكرد.

(ألواهي (ج) واهُون وَوُهاة (م) واهِيَة) (فا): چرووك، كز، لاواز، بێتین، بێهێز/ سست.

(ألوَهــي (مص) (ج) وُهْــيٌ وَأَوهِيَةٌ): قلێش یان درز/ تلێش لەشتدا.

(ألوَهْيَــةُ): ١-جارێــك تلێش تێبوون ٢-شــل و شــێواو بوون ٣-جارێــك لاوازو بێتینبوون ٤-تلێش، قلێش/ دەلاقە درز لەشتدا.

ألوَهِيَّــةُ: ١-پارچە دورێك (بۆیــە واناونراوە چونكە كونی تێبوو. لەسەختیی دەكەوێت) ٢-ئاژەڵی سەربڕاوی قەڵەو.

(ألأُو هِيَّــةُ): نێــوان لوتكەی شــاخ و دامێنی دۆڵ.

٢-واهِ وَواهَ وَواهَــا وَ واهــاً - لَــهُ وَبِــهِ: ١-(وشەیەك بۆ سەرسوڕمان لەباشی شتەكە): ئای كە (چەند باشــە/ كەچۆنە/ كە باشــە)/ كە بە جێیە ٢-(بــۆداخ بۆ خواردنیش دێت): داخەكەم چۆن لە دەستچوو/ حەیفێكم چۆن تێپەڕی/ بەسەرچوو) یان لەناوچوو.

ویــا: وَيْ: ١-(وشــەیەكی سەرســوڕمانە/ سەرسامبونە)/: وەی، وای، ئای ئای، وەی وەی.

(وَيْ لِزَيــدٍ): ١-ئــای ئای زەیــد چ پیاوێكە!! ٢-(بۆ پێدا هەڵشاخان دێت) و ولەبری وشەی وَیل و بۆشاردنەوەی وشــەكە دەڵێن: (وَيك) «وَيك إِسْتَمِع قَولي») و لە بنچینەدا (وَيْلَكَ) یــە: خودا بتگرێــت، جەهەنەمــت لێپربێت گوێ لە قســەكەم بگرەو بەقســەم بكە ٣-(بۆ هەرەشمیە):

«وَيْ بِــكَ يافُلان»: تۆ فیســاركەس خراپت بەسەر دێت.

ویــب: (وَيْــب): ١-وشــەیەكە وەكــو (وَیل) وایە واتاكەی: خراپی بەســەربێت/ تووشــی بەدبەختــی/ ناهەمواریــی و فەوتــان بێت. دەوترێت.

وَيْبَكَ وَوَيْبٌ لَكَ وَوَيْبٌ لِزَيدٍ وَوَيباً لَهُ وَوَيبِ لَــهُ وَوَيبِــهِ وَوَيبِ غيرِهِ وَوَيــبَ زَيدٍ وَوَيبِ فُلانٌ وفُلانٍ): واتــای ئەمانە هەمووی: خودا (بەدبەخــت/ چارە ڕەش و پەرێشــانی بكات. گرفتاری خراپی بكات)

٢-وتُســتَعْمَلَ (وَيْب) في مَقــام آلتعجب: بۆ سەرلێســوڕمانیش. ســەیربوون بەلاوە بەكار دێت.

(وَيباً لِهذا): ئای ئەمە كەسەیرە!!.

(ألوَيْبَــةُ= البَلِيَّة): چورتوم/ وەی/ گرفتاریی بەڵا/ ئاپۆرە ٢-ئابڕووچوون و ڕســوایی وەك وشەی (الوَيْلَة) یە.

ألوَيبَــة (ج) وَيْبات): پێوانەیەكە/ پێومرێكە

نزیکـەی ٤٠٠-٤٣٢ لیترەیــەو بەپێــی دانانــی تازەیە.

ویــح: (وَیْــحٌ): وشــەیە بــۆ ١-هەڵنــانو سەرســامبوون/ لاســەیر بوون ٢-هەروەهابو میهرەبانــی و بەزەیــی پێداهاتــن و داخبــۆ خــواردن ٣-وتراویشــە: بــۆ واتــای (وەیل): گرفتاریی و ڕۆژە ڕەشــی و فەوتــان هاتووە. وەکو (وَیل): پیسترین شوێنی دۆزەخە.

«وَیْحٌ لِزَیْــدٍ وَوَیحاً لِزَیدٍ وَوَیحَهُ»: گرفتاری ڕۆژی ڕەشــبێت/ جەهەنەمی لێپربێت وەکو بیشــڵێت: (إلزَمهُ اللهُ وَیْحاً): خودا گرفتاری ڕۆژی ڕەشی بکەیت و بفەوتێت.

(اَلــواحُ والواحَــةُ (ج) الواحــات): مێرگ/ میرخــواز/ زەوییەکی ئــاودارو بەپیت و ئاوا لەبیابانێکی لیندا. (وشەکە لەزمانی میسریی کۆنەوە وەرگیراوە).

وَیــخ: وَیْخٌ= (وَیْحٌ): لە واتــاو دەنگیدا وەك (وَیح)ە.

ویس: وَیْسٌ= وَیح (واتاو کاری وەك وشــەی (وَیح) وایە.

(اَلوَیــس): ١-هەژاریــی ٢-ئــەوەی کە مرۆڤ دەیەوێت ٣-ئەوەی کە مرۆڤ نایەوێت.

(اَلوێستاریا) (ن): دارلۆبیا. ڕووەکێکی کەپرییە. گوڵــی گــەورەو شــینی مەیلەو وەنەوشــەیی بەهێشــوو دەگرێت بەســەر دیــوارو پەرژێندا دەدرێت و شۆڕ دەبێتەوەو دایدەپۆشێت.

ویك: (وَیْك): وشەیەکە لێکدراوە لە (وَي) وَ (ك)ی گوێگر. بۆ سەرسوڕمان و بەلاوە سەیر بوون: ئای لەوەت.

ویل (وَیْلَ – فُلانــاً وَ لِفُلانٍ. تَوییلاً): زۆر دوعــای لە فیســارکرد تووشــی بەدبەختیو نەهامەتی و وەیی گرانببێت.

(تَوَیَّلَ): نەفرەتیکرد دۆعــای گرفتارییکرد.

(قــالَ یاوَیلَــي): وتی ئــای لــە نەگبەتییو چارەڕەشیی من.

(تَوایَــلَ – الرجــلان): دوو وپیاوەکــە نزاو دۆعای خراپیان لە یەکتریکرد.

(همــا یَتَوایَلان): ئەو دوانــە/ هەردووکیان بەدبەختیی و دۆزەخیان بۆ یەکتری خواست/ دۆعای خراپیان لەیەکتریکرد.

(اَلوَیْــل): ١-گرفتاربوونــی (وەی/ بەدیــی و خراپیــی و لێقەومــان) ٢-فەوتــان/ مردن/ لەناوچــوون. (بەیەکێك دەوترێت کە توشــی نەهامەتیــی و گرفتاریی بووبێت و شــایانی ئــەو گرفتارییــە بێــت. دەوترێــت. (وَیْلَهُ. وَیْلَــكَ وَوَیلی «وَوَیــلٌ لِزَیدٍ وَوَیــلاً لَهُ»): خودا جەهەنەمیی لێپرکات، تووشــی گاشەو نەگبەتیبێت.

وَیلَك): نەگبەتیی بتگرێت.

(وَیلي): ماڵی وێرانم/ خاك بە دامانم.

(وَیلُ لِزَید): زەید گرفتاری نەهامەتی ببێت.

(وَيلُ لَهُ): تووشی گاشەو نەهامەتی ببێت.

(وَيلٌ ووائِلٌ وَوَئيلٌ وَوَئِلٌ): گرفتاری و ڕۆژە ڕەشــييەكی زۆر./ چورتــوم/ نەهامەتيــی/ بەڵايەكی زۆرو سەخت.

(اَلوَيلَــةُ (ج) وَيــلات): ١-چورتــوم/ وەی/ لێقەومان/ كارەســات ٢-ئابڕووچوونو ڕســوا بوون/ شەرمەزاربوون.

(وَيْلُمِّهِ): وشــەيەكی لێكــدراوە بنچينەكەی (وَيلٌ لِأُمِّــهِ) لە بنچينــەدا دوعالێكردنبووە لەيەكێــك پاشــان واتاكەی گۆڕاوە بۆ ســەير لێهاتــن و بەجواندا نان و بەباشــزانين وەك (قاتَلَــهُ الله) و «لا أَبَ لَكَ»: كــە بەو واتايە و بۆ ســەير لێهاتن و بەباشــزانين دەوترێت بەواتای (بَهبَه) هەی ئافەرين، دايك ڕۆڵەڕۆت بــۆ نەكات، يــان جنێوی خۆشــيی پێدەدەن. دەوترێــت «رَجُلٌ وَيْلُمِّــهِ وَ وِيلِمِّهِ»: ئای چ پياوێكی زۆرزانو مەزنو هوشيارە.

ويم: (اَلوَيْمَة): گوناهبــار/ گومانبار) كردن ٢-بەدزمانيی/ قسەچنيی/ بوختانكردن.

ويــن: (اَلوَيــن) (عبرانيــە): ١-ترێڕەشــكە ٢-خەوش.

(اَلوَينة): مێوژە ڕەشكە.

ويە: وَيْهَ وَوَيْهِ وَوَيْهاً): (وشەيەكە بۆ تاوكردن و هانــدان و تێزكردن و لاخۆشەويســتكردن (لەگــەڵ تــاك و كۆو نێــرو مێدا هــەر ئەوە دەوترێــت): هــا بتبينــم/ ئابزانــم ئادەی/ ئالەمنت نەكەوتبێت. (لەم ڕســتانە زۆرە كە ئەو واتايە بگرێتەوە).




ي: (الياء): ێ: بیست و هەشتهەمین پیتی عەرەبییە.

(ێ) لەژمێرەی کۆی پیتەکاندا (١٠) دەیە.

(ي): ١-دەبێتە راناو بۆ مێ وەك (تَقُومِيْن): هەڵدەسیت.

(قُومِي): هەستە ٢-راناوی قسەکەری تاکە وەك (ضَرَبَنِي): لێیدام.

(كِتابي): کتێبەکەم.

(يا): پیتی بانگکردنی دوورو نزیکە: (هۆ، ئەرێ ئا. دەشێت بانگکراوەکە لاببرێت.

(یا لَیتَنِي كُنتُ مَعَهُم): خۆزگە لەگەڵیاندا بوومایە، بەڵام لەم نموونانەی هاتوودا (یا) بۆ بانگکردنەو لامەکە بۆ سەرسوورمانە وەك:

(أَتاني رَجُلٌ وَيا لَهُ رَجُلاً – أَومِن رَجُلٍ): پیاوێکم هاتە لا ئای چ پیاوێکبوو.

(یالَكَ مِن فارِسٍ): ئای چ سوارێکیت.

يأس: (يَئِسَ – مِنهُ يَيْأَسُ وَيَيْئِسُ. يَأْساً وَيَئَاسَةً): لێیی نائومێد بوو/ هیوابڕی/ دەستی لێشت.

(يـائِـس وَيَـؤُس وَيَـؤُوس (ج) يُـؤُوس): ناهومێد/ نائومێد/ هیوابڕاو/ بێهیوا/ (ئومید/ هیوا) براو.

(مَيْئُوسٌ – مِنهُ): (ئومێد/ هیوا) لێبڕاو دەست لێشۆراو.

(يَئِسَ): زانی/ پێیزانی.

(يَئِسَ-تِ المَرأَةُ يَيْأَسُ. يَأْساً وَيَئَاسَةً): ژنەکە نەزۆکبوو/ هیوابڕاوی منداڵبوونبوو.

(هي يائِسٌ): ئەو ژنە نەزۆکەو بەهیوای منداڵ نییە.

(أَيْأَسَ – هُ إِيئَاساً): تووشی نائومێدییکرد/ هیوابڕی/ نائومێدیکرد/ هەناسەی سارد کرد (ئیدیۆم).

أَيْأَسَ – اللهُ المَرأَةَ: خودا ژنەکەی نەزۆککرد.

(آيَـسَ-هُ. إِيـاسـاً وَمُـؤايَـسَـةً): تووشی نائومێدییکرد/ هیوابڕی/ (هیوا/ ئومێد)

براویكرد.

(إتّأس وَآسْتَيْأَسَ – مِنْهُ إتّئاساً وآسْتِيئاساً): بەتەماینەما/ ئومێدی لێبڕی/ بەهیواینەما.

(اَليَأْس وآليَئاسَة): نائومێدیی/ (ئومێد/ هیوا) بڕوایی/ بێهیوایی/ بێئومێدیی.

الملحق:

یاق: (الیاقَة = القَبَّة): یەخە.

(یاقَةُ ثَوبٍ، قمیصٍ): یەخەی (جلێك/ كراسێك).

یأى: (یَأْیَأَ- القَومَ. یأیَأَةً وَیأْیاءً): خوێشگەلی (بانگكرد/ دەنگدا).

(-الإبــلَ): دەنـگـی لـە حوشـترەكانـكـرد تا ئارامبن.

(أَيْ): وتی: هێی/ هۆو/ هۆش.

أَيْ: دەنگلێكردن و پێدا هەڵشاخانە.

(یَأْیَأْ): هاواركردنی خەڵكە بۆ كۆبوونەوە (وەك بڵێی (ئەی هۆ/ ئەرێ) خەڵكینە.

(اَلیَأْیاء)(مص): خوێندنی مشكگرە/ هەڵمەكە/ تورمتە (باڵندەیە).

(اَلیُؤیُؤ = اَلحَلم) (ج) یَئاییْ: هەڵمەكە/ تورمتە/ مشكگرە: باڵنەیەكی گۆشتخۆرە لەواشە دەچێت و بچووكترە.

یبّ: (یَبَّبَ -اَلمَنزِلَ): هەوارەكەی/ ماڵەكەی كاولكرد/ وێرانكرد.

(خَرُّبوه وَ یَبُّبُوهُ): كاول و وێرانیانكرد.

(اَلیَباب): كاول/ وێران.

(مَنزِلٌ خرابٌ یَبابٌ): ماڵێكی/ هەوارێكی كاول و وێران.

یبد: (اَلأَبیَد) (ن): رووەكێكە چاندنی وەك جۆیە.

یبس: (یَبِسَ وَآتَّبَسَ. یَیبَسُ وَیَیبِسُ. یَبْساً وَیُبْساً): تەڕ بوو وشكبوو یان وشكبووەوە.

(یَبْس وَیَبِس وَ یابِس وَیَبُوس وَ یَبیس وَأَیْبَس): وشك.

(یَبِسَ مابَینَهُما): نێوانیان یان پەیوەندیی نێوانیان وشكایی هات/ لەیەكپچڕان.

(یَبَّسَ – الشيءَ): شتەكەی وشككردەوە.

(أَیْبَسَ – المَكانُ): رووەكی شوێنەكە (تەڕایی لێبڕا/ وشكبوو).

(-آلـقَـومُ): بەخاكێكی وشـك و برنگدا رۆیشتن.

(-العُودُ): لاسكەكە/ چێوەتەرەكە وشكیكرد/ وشكبوو.

(-الشيءَ): شتەكەی وشككردەوە.

(أَیبِسْ یارَجُل): بیبڕەوە كابرا/ بێدەنگبە (قور بەدەمتدا بدە) (ئیدیۆمە).

(إسْتَیبَس – الریقُ): تفەكە لەدەمدا وشكبوو.

(الیابس (ج) یُبَّس) (فا): وشكبوو، وشك.

(رَجُلٌ یابِس): پیاوێكی (وشكی كەمفەڕە/ كەمخێرە/ دەستوشكە).

(حَجَرٌ یابِس): بەردێكی سەخت/ ڕەق.

(اَليَبْس (مص) = اليابِس) (اَليَبس) كۆی وشەی (اليابس)ە.
(رَجُلٌ يَبْسٌ): پیاوێكی كەمفەرە/ كەمبێرە.
(اَليَبَس): ئەوەی كەخۆی هەر وشكەو تەڕیی بەخۆیەوە نەدیوە. یان شوێنێك كە تەڕبێت‌و وشكبێتەوە.
(شـاةٌ يَـبَـسٌ): مەڕێكی وشككردو، وشك‌و بێشیر.
(شيءٌ يَباسٌ): شتێكی وشك.
(اَليُبوسَة): وشكایی/ وشكیی.
(يَبيُس- آلماءِ): ئارەقی لەش.
(اَلأَيْبَسان): دوو ئێسقانی باریكی دەست‌و پێ.
(اَلأَيابِس): ١-كۆی وشەی (اَلأَيْبَس) ٢-شتی رەق كە بڕشتی شمشێری پێ تاقیدەكرێتەوە.
(اَلـيـبَـاس): بایەكە رووەك و گیا وشك دەكاتەوە.
الملحق:
يَبـــس: (اليابِسَـــة): ١-وشـــكانی ٢-زەوی كـــە بەرامبەرەكەی ئاو یان دەریایە.
(اَلحَدّ الفاصِل بَينَ البَحرِ وآليَابِسَة): ئەوەی كە دەریاو وشكانی جیادەكاتەوە كەزموییە.

يتع: (اليَتوع واليَتّوع (ج) يَتُوعَات): هەموو رووەكێك كە برینداری بكەیت شیر دەربدات.
يتم: (يَتَمَ يَيْتِمُ – الصَبيُّ مِن أبيهِ. . يُتْماً وَيَتْماً): منداڵەكە بێباوكبوو/ هەتیو بوو.
(-يَـتِـمَ – آلصَبيُ: يَيْتَمُ يُتْماً وَيَتْماً): منداڵەكە بێباوكبوو/ هەتیو (بوو/ كەوت).
(يَتِمَ–يَيتَمُ. يَتَماً): ١-كەموكورتییكردو سست بوو وشەكەتبوو ٢-خاوبووەوە خاوەخاویكرد/ سستییكرد.
(-مِن هذا الأَمـرِ): لەو كارەدەستی بەربوو، بەرەڵابوو.
(يَتُم – الصَبيُّ مِن أَبيهِ. يَيْتُمُ يُتْماً وَيَتْماً): منداڵەكە هەتییوكەوت/ بێباوكبوو.
(يَتَّمَ – هُ): هەتیویكرد/ بێباوكیكرد.
(أَيْتَمَ- هُ): بێباوكیكرد/ هەتیویكرد.
(أَيـتَـمَ – تِ المَــرأَة): ژنەكە منداڵەكانی بێباوكبوون هەتیو كەوتن/ باوكیان مرد.
(هي مُؤْتِمٌ): ژنی هەتیوبار.
(تَـيَـتَّـمَ-الـصَـبِـيُّ): منداڵەكە بێباوكبوو/ هەتیوكەوت.
(اَليَتْـم) (مص):١-هەتیوبوون/ بێباوكبوون ٢-مەرق.
(اَليُتْـم) (مـص): ١-لەمرۆڤدا بێباوكیی لە زیندەوەرداو ئاژەڵدا بێدایكیی دایكی ساواكە بەچكەكە بمرێت ٢-تەنیا بوون و بێكەسبوون ٣-رەوشی هەتیوو داماوبوونی ٤: سستبوون.
(اَليَتَم (مص)): ١-تاك و تەنیابوون ٢-بارو گـوزەرانـی بـێـبـاوك/ هەتیو ٣-نەبوونیی/ بێدەرامەتیی ٤-سستی و بێهێزیی.
(فِي سَيرِهِ يَتَمٌ): رۆیشتنەكەی (بێتابوشت و

بێهێزو سستە/ هەتیوانەیە).
(صَبِيٌّ يَتمان): منداڵێکی هەتیو/ بێباوك.
(اَليَتيم – مِن كُلّ شيءٍ): هەموو شتێکی
١-تاك/ تەنیا.
(بَلَدٌ يَتيمٌ): شارێکی تاك.
(بَيتٌ يَتيم): خانوویەکی تاك، تەنیا.
(الرَملَة المنفردة): دەنکەلێکی تەنیا ٢-هەموو
شتێکی (تاك و بێوێنە/ ناوێزە).
(اَليَتيم (ج) أيتام وَيَتامى وَيَتيمَة وَمَيْتَمَة
وَيَتائِم): باوکمردوویەك کە باڵق نەبوو بێت و
نەبووبێت بە پیاو.
(-مِـن الـبَـهـائِـم): ئـەو بـەچـکـە ئـاژەڵ و
زیندەوەرەی کە دایکی نەبێت.
(اَليَتيمَة)(ج) يَتامى: ١-چەتیو/ مێی وشەی
(اليَتيم) ٢-دەنکەلێکی تەنیا ٣- (دُرَّةٌ يَتيمَة):
دورێکی زۆر بەنرخ کەوێنەی نەبێت.
(اَلمَيْتَم (ج) مَياتِم): هەتیوخانە.
(اَلحَربُ مَيتَمَةٌ): شەڕ/ جەنگ باوکان دەکوژێت و
منداڵان هەتیودەکات.
يتن: (يَتَّنَ وَأَيْتَنَ – تِ المَـرأَةُ أَو النَاقَةُ
الوَلَدَ. تَيتيناً وَإيتاناً): ژنەکە منداڵەکەی
بەسواوریی بوو واتا لەبری سەری قاچی
لەپێشەوە هات. هەروەها مێحوشترەکەش
بەچکەکەی بەسواریی بوو کە زا قاچی لەبری
سەری لەپێشەوە هات.
(هِـيَ مُـوتِـنٌ و مـوتِـنَـةٌ): ئافرەتێکە یان
مێحوشترێکە منداڵی یان بەچکەی بەسواریی
بوو بێت.
(هُوَ مَوْتُونٌ): بەچکەیەکە بەسواریی لەدایك
بووبێت.
(مُوْتَنٌ): بەسواریی منداڵ و وبەچکەبوون.
بەسواریی منداڵ و بەچکە هاتن.
(اَليَتْن): بەسواریی هاتنی کۆرپەو بەچکە
واتا قاچی لەبری سەری لە پێشەوەلەبووندا/
لەزاندا بێت.
يحر: (اَلمِيْحار): داردەستی شا. یان داردەستێکی
سەرچەماوە.
يَحْم:١-(اليَحْمُور): ١-سوور ٢-(ح): فیلە گێژە/
گەوزەن/ گوێزەن/ ئاور/ شوول. گیاندارێکە لە
ئاسکە کێویی دەچێت کلکی کورتە دووشاخی
هـەیـە هـەریـەکـەسێ پەلکی لـێـدەبـێـتـەوە
رەنگەکەی خۆڵەمێشییە.
٢-(اَليَحْمُوم): رەشێکی زۆر تەڵخ و تاریك.
يخت: (اَليَخت) (هولندية): یەخت پاپۆڕێکی
جوانی رازاوەیە بۆ گەشت و ئاهەنگ بەکاردێت.
هەموو هۆی رابواردن و خۆشیی و حەوانەوەی
تێدایە.
يدع: (يَدَّعَ-الثَوبَ): پۆشاکەکەی بە زەعفەران
رەنگکردو زەرد کرد.
(أَيْـدَعَ- الحَجُّ على نَفسِهِ): حەجی لەسەر
خۆی پێویستکردو دانا کاتێك کەئیحرامی
بەست و خۆی بۆئخۆشکرد.

(اَلأَيْدَع) (ن): ١-زەعفەران ٢-تەختەی داری (بەقەم/ درەختی هەژدیها/ درەختی خوێنی دوو براکە).

يدي: (يَدى- الرَجُلَ يَدي. يَدْياً): کێشای بە دەستی پیاوەکەدا.

(اَلْيادُ): کەسێکە کەبەدەستی یەکێك زەدەداربووبێت.

(مَيدِيٌّ): زەدە وەشێن.

(يَدِيَ-فُلانٌ مِن يَدِهِ يَيدى. يَدياً): بێدەستبوو، دەستی پەکیکەوت دەستی وشکبوو.

(يَدِيَ- الرَجُلُ): پیاوەکە بێدەستبوو/ لاوازبوو/ بێتوانابوو.

(-فُلانٌ مِن فُلانٍ): فیسار دەستی فیساری بۆ درێژکرا چاکەو خێرو بێری لێدەستکەوت.

(إنَّ لِفُلانٍ مالاً يَيدى بِهِ وَيَبوعُ): فلاَنکەس دارایە لەبەخشندەدا دەستی بالآیە/ دەستی والآیە.

(يادى – الرَجُلَ. مُياداةً): پاداشتی پیاوەکەی دایەوە یان دەستی خستە ناو دەستیەوە/ دەستی دایە دەستی.

(أيْدَى – عِندَ فُلانٍ وَإلَيهِ إيداءاً): دەستی فیساریگرت واتا دەستی بەخشینی بۆ درێژکرد/ دەستی پیاوەتی و چاکەی بۆ درێژکرد.

(مُؤدٍ): بەخشندە/ یاریدەدەر/ چاکەکار.

(مُؤدىً إلَيهِ): دەست بۆ درێژکراو/ یاریدەدراو پێبەخشراو.

(اَلْيَدُ) (ع ا): دەست یان بەریدەست یان لەنووکی پەنجەوە تا شان. (مێیەو لامەی لادەبرێت و لەبنچینەدا (يَدْيٌ)ە.

(يَدان): دوو دەست.

(ج) (اَلأَيدي واليُدْيٌ و (جج) اَلأَيادي): بەزۆریی (اَلأَيادي): بەکاردێت واتا چاکەو بەخشندەیی. وەکۆی (ج).

(اَلأَيدى: (الأَيْدِين): دەستەکان.

(لَهُ يَدٌ بَيضاءُ فِي هذا الأَمرِ): دەستێکی بالآی لەم کارەدا هەیە/ کارامەیە.

(بِعْتُهُ يَداً بِيَدٍ): بەدەستیی پێمفرۆشت.

(ذَهَبوا أيادِيَ سبا أو أيدِيَ سَبا): دەستیان لەیەك بەربوو/ پەرش و بلآوبوونەوە.

(اَليَدُ): چاکەو فەرو بێر.

(ج) يُدِيّ وَيَدِيّ ويدِيُّ وأيدٍ): ١-خۆراك/ خواردن ٢-فریاکەوتن ٣-گەنج/ سامان/ دەسترۆیشتن و رێز ٤-تواناو وزەو دەسەلآت.

(مالَكَ عَلَيهِ يَدٌ): دەستت بەسەریدا ناڕوات/ دەسەلآتت بەسەریدا نییە.

(لايَدَينِ لَكَ بِهذا): تواناو دەستت بەسەریدا نییە، لەوزەو توانای تۆدا نییە.

(يَدُ اللهِ مَعَ الجَماعَةِ): خودا دەستی بەدەستی کۆمەڵەوەیە واتا پشتیوانیەتی و دەیپارێزێت.

(اليَدُ لِفُلانٍ وعلى فُلانٍ): فیسارکەس دەستی بالآیە بەسەر فیسارداو دەستی بەسەر فیساردا دەڕوات و ئەو ژێر دەستەیەتی.

(هذا في يَـدی): ئەمە هی خۆمە و ولەژێر دەستی خۆمدایە.

(وَالأَمْرُ بِيَدِ فُلان): کارەکە بەدەست ئەوە/ لەژێر دەستی ئەودایە.

(يَدي رَهينَةٌ بِكَذا): من دەستەبەری (ئەوەم/ ئەو کارەم/ ئەو شتەم).

(اَليَدُ): کۆمەڵ/ یەکدەستیی.

(اَلقَومُ عَلَيهِ يَدٌ واحِدَةٌ): خوێشگەل هەموو دژی یەکدەستن/ بەرامبەری و ستەم لێکردنی یەکدەستن.

(اَليَد): رێگە.

(اَخَـذ بِهِم يَـدَ البَحرِ): بەرێگەی دەریـادا بردنی.

(اَليَد): بەرلێگرتن‌و نەهێشتنی زۆرداریی/ دەستبەستن.

(ضَرَبَ القاضي على يَدِهِ): دادوەر کێشای بە دەستیدا واتا: رێگەی لێگرت‌و نەیهێشت ئەو هەڵسوکەوتەی دەیویست بیکات.

(اليَدُ): پەشیمانیی و سەرشۆڕیی.

(سُقِط فِي يَدَيهِ): لەدەستی ترازاو پەشیمانە

(اَعطى بِيَدِهِ): خۆی بەدەستیەوە داو ملی بۆ شۆڕکرد.

(لَقَيْتُهُ اَوَّلَ ذاتِ يَدَينِ): یەکەم شتبوو کە بەرچاوم کەوت یان پێیگەیشتم.

(يَدُ الطائرِ): باڵی باڵندە.

(يَـدُ الـدَهـرِ): دەستی رۆژگـار یان تەمەن‌و درێژیی رۆژگار.

(يَدُ الفَأسِ): دەسکی تەور.

(يَدُ القَوسِ): دەسکی کەوان.

(اَليَدُ العُليا): دەستی پاك و واڵ و بەخشندە.

(اَليَدُ السفلى): دەستی خوازەڵۆك/ سواڵکەر/ دەرۆزەکەر یان چرووك/ نووقاو.

(يَدُ الجَوزاء) (فك): کۆمەڵە هەسارەیەکن.

(اليَدّ): دەست.

(اليَدِى وَ اليَدَة): دەست.

(اليَدَوي): دەستیی.

(اَلـيَـدِّي): ١-دەسـتـکـارامـە/ دەسـتڕەنـگـین ٢- دەستیی.

(ثَوبٌ يَدِيٌّ): بەرگێکی فراوان/ فشوفۆڵ.

(عَيشٌ يَدِيٌّ): ژیانێکی تێروتەسەل، خۆش.

(اليُدَيَّة): دەستۆك.

(اَلـيَـديـاء): دەسـت شـارەزا/ دەسـتـقـاڵ/ دەستکارامە.

(اَلمُودِي): خێرخواز/ چاکەکار/ بەخشندە. دەستگیرۆییکەر.

(المُـودى إلَيـهِ): خێرپێکراو/ دەستگیراو/ یاریدەدراو.

(اَلمَيدِيُّ): دەست لەبندا براو.

(ظَبيٌ مَيدِيٌّ): ئاسکێکی دەست بەداوەوەبوو.

یرب: (اليَربوع (ج) يَرابيع (ح)): گۆرهەڵکەنە یەکێکە لە قرتێنەکان جۆرە مشکێکی دەستکورتەو قاچ درێژ و کلکێکی درێژی هەیە.

يرج: (اليارِ ج=السوار) (فارسية): بازن.
(الأيارَجة (ج) أيارِج) (طب): دەرمانێكی شێوە هەویرییە بۆ رەوانكردن بەكاردێت (فارسیە).
الملحق:
یرد: (الیَرد): یاردە، یەكەی پێوانەی ئینگلیزییە (٩١٤)ی مەترێكە.

یرع: (یَرِعَ. یَرَعَ. یَرَعاً): زۆر ترسنۆكبوو/ زیرەكردووبوو.
(الیَرَع) (ح): ١-گوێرەكەی مانگاكێویی ٢-شتێكە وەك مێشوولەیە دەمووچاو دەگرێت و دادەپۆشێت/ وردە مێشوولە/ هورە.
(الیَراع): ١-زیرەكردوو ٢-بێبڕشت/ لاوازو بێتوانا ٣-بوو دەڵەی بێمێشك و بێرا ٤-قامیش ٥-قەڵەم/ پێنووس ٦-بلوێر/ شمشاڵ كە شوان لێیدەدات و پێی دەژەنێت ٧-(ح)كارو بەرخ و گوێرەكەو بەچكەی مالاتیتر ٨-(ح) گوڵە ئەستێرە كە بەشەو دەگەرێت و شەوقدەداتەوە ٩-شتێكە وەك مێشوولەیە خۆی بەدەموچاودا دەدات/ وردە مێشوولە/ هوورە.
(الیَراعَة): ١-گەوج ٢-زۆر ترسنۆك/ زیرەكردوو ٣-مێشێك یان قامیشێك ٤-شمشاڵ كەشوان لێیدەدات ٥-قەڵەم/ پێنووس ٦-زەبەنگ ٧-(ح) وشتر مرخ.
یرق: (یُرِقَ): تووشی زەردوویی‌بوو.
(الیَرَقان والیَرْقان) (یونانیة): ١-زەردوویی رووەك ٢-(ح)كرمێكە دەداتە كشتوكاڵ ٣-طب: زەردوویی مرۆڤ دەردێكە مرۆڤ دەیگرێت لەش و چاوی زەرد دەبێت.
(الیَرَقانَة) (ح): مێتولكە/ سووریێكە لەسوورەكانی گەورەبوونی هەندێك مێروو وەك كرمی ئاوریشم و ماسی‌و بەزۆریی لەم سوورەیدا زۆر درو ترسناك دەبێت.
(المَیْرُوق والمَأروق مِنَ الزَرع والناس) (طب): ئەو كشتە و مرۆڤەی تووشی زەردوویی دەبێت.
یَرم: (الیَرمَع (ج) یَرامِع = خَذروف): ١-مزراح: مزراحێن جۆرە یارییەكە بەمزرراح دەكرێت ٢-جۆرە چەوێكی سپییە دەبریسكێتەوە.
یرن١-(الیَرُون): ١-مێشكی فیل ٢-(خوەی/ ئارەقی) وڵاخ.
٢-(یَرنَأ-الشيءَ یَرنَأةً): بەخەنەشتەكەی رەنگكرد.
(الیُرنّاء والیَرَنّأُ والیُرَنّأُ) (ن): دارخەنە.
یسر: ١-(یَسَرَ. یَیْسِرُ یَسْراً وَیَسَراً): ئاسانبوو/ نەرمبوو ٢-شلبوو و ملیدا ٣-توانرا بكرێت.
(-تِ المَرأَةُ): ژنەكە ئاسانەی سووكبوو/ منداڵەكەی بەئاسانی (لێبووەوە/ منداڵەكەیبوو).
(-یَسْراً): قوماریكرد.
(-القَومُ الناقَةَ): گۆشتی حوشترەكەیان لەتو

کوتکردو لەناو خۆیاندا بەشیانکرد.
(یَسُرَ وَیَسِرَ – الأَمرُ یَیْسُرُ ویَیْسَرُ. یُسْراً. یَسَراً): کارەکە (ئاسانبوو/ سووکبوو/ سانابوو).
(یَسِیْرٌ): ئاسان/ سووك/ سانا.
(یَسَّرَ-الشيءَ لِفُلانٍ): شتەکەی بۆ فیسار (سووککرد/ ئاسانکرد)و تیایدا سەریخست (لەچاکەو خراپەدا).
(-الرَّجُلُ): زانی مەڕو حوشترەکانی ئاسانبوو/ بەئاسانیی زان.
(-تِ الغَنَمُ): مەڕەکان بەرخی زۆریان لێکەوتەوەو شیریان زۆربوو.
(یاسَرَ-هُ مُیاسَرَةً): لەگەڵیدا نەرمو هێواشبوو، هەڵیکردو دڵی نەشکاند.
(أَیْسَرَ. إِیْسَاراً): (دەوڵەمەند/ دارا) بوو/ دەستڕۆیشتوو بوو/ بووە بوو.
(مُوسِر (ج) مَیاسِیر): دارا/ دەوڵەمەند/ بووە/ دەستڕۆیشتوو.
(-الرَّجُلَ): نەرمیی لەداخوازییەکەیدا نواندو زۆری لێنەکرد.
(-تِ المَرأَةُ): بەئاسانی منداڵەکەی بوو.
(تَیَسَّرَ-تِ البِلادُ): وڵاتەکە فەڕی زۆربوو و ئاوابوو.
(-الأَمرُ): کارەکە سووكو ئاسانبوو، توانرا بکرێت.
(-النَّهارُ): ڕۆژەکە ساردبوو.
(لِلقِتَالِ): ئامادەی جەنگبوو.

(تَیاسَرَ): لەکارەکەدا ئاسانیی نواندو نەرمبوو.
(تَیاسَرَ وَاتَّسَرَ وَ ایتَسَرَ –القَومُ): گۆشتی قومارەکەیان لەنێوان خۆیاندا بەشکرد.
(تَیاسَرَتِ الأَهواءُ قَلْبَهُ): حەزو ئارەزووەکانی دڵی بەهەمەوولایەکدا بردو پارچە پارچەیکرد.
(إِسْتَیْسَرَ-لَهُ الأَمرُ): کارو ئامانجەکەی بۆ ڕەخساو ئامادەو ئاسانبوو.
(-الأَمرُ): کارەکە ئاسانبوو و بەردەستکەوت و توانرا بکرێت.
(تَیَسَّرَ-الأَمرُ): کارەکە بەردەستکەوتو ئاسانبوو.
(اَلیاسِر (فا) (ج) أَیسار): ١-ئاسان/ سووك ٢-کەسێکە کە گۆشتی قومار دابەشدەکات ٣-قەساب/ ئاژەڵکوژ.
(اَلیُسْر) (ن): داری موورونچە/ فستقی ڕۆمیی: درەختێکە گەڵاکەی هێلکەییە بەرێك دەگرێت دەنکەکەی زۆر ڕەشەو بۆنی خۆشە دەکرێت بەتەزبیح و ملوانکە.
(الیُسْر والیُسُر والیَسَارة): ئاسانیی/ سووکیی ٢-بوون و خۆشیی/ دارایی/ دەوڵەمەندیی ٣-(ضد العُسُر): پێچەوانەی سەختیو نەبوونیی.
(اَلیَسَر (مص) (ج) أَیْسار): ١-ئاسان/ سووك/ ٢-خوێشگەڵی کۆ وە بوو بۆ قومارکردن

٣-سازدراو و ئامادەكراو.
(اَلْيَسَرَةُ (ج) أيسارو يَسَرات): ١-هێڵەكانی بەری دەست كە بەیەكەوە نەنووسابن ٢-نیشانەی داخ كە بە هەردوو ڕانەوە بێت.
(اَلْيَسَرات): پێی (سووك/ گورج).
(اَلْيَسار): ١-ئاسانیی و سووكیی ٢-بوون/ دەستداریی دەوڵەمەندیی/ دارایی.
(اليَسير): ١-ئاسان/ سووك خۆش ٢-هێواش و نەرم.
(اليَسِير واليَسُور (ج) يُسُر): ١-زاڵ/ سەركەوتوو ٢-قوماركەر.
اَلْأيْسَر: زۆر (ئاسان/ سووك) زۆر هێواش و نەرم/ ئاسانتر/ سووكترو هێواشتر/ لەسەرخۆتر.
(اَلْمَيْسِر): ١-هەموو جۆرە قومارێك ٢-یاریكردن بەتیری قومار. (لەسەردەمی خۆیدا لەدوورگەی عەرەبدا دەكرا كوشتارێك دەكرا/ ئاژەڵەكە سەردەبڕرا دەكرا بە (٢٨) یان (١٠) كەرتەوە پاشان یاریی تیربازییان لەسەردەكرد هەركەسێك تیرێكی براوەی بۆ دەرچوایە بەشەكەی خۆی دەبرد ئەوەی تیری دۆڕاوی بۆ دەرچوایە پارەیان لێدەسەند/ دەبوو پارەی گۆشتەكەی بدایە.
(اَلْمَيْسَرَة واَلْمَيْسِرَة واَلْمَيْسُرَة): ١-ئاسانیی سووكیی/ خۆش بەدەستەوە هاتنی كار ٢-دارایی/ دەوڵەمەندیی/ بوومیی.
(اَلْمَيْسُور (ج) مَياسير): ١-ئاسان/ بێكۆسپ/ سانا/ بێگرێ و گۆڵ/ خۆش بە دەستەوە هاتن ٢-شتی مشەو ئاسان بەدەستكەوتن/ پێچەوانەی بەنارەحەتی و گران دەستكەوتن یان گرانبوون و سەختی ئەوكارە.
٢-(يَسَرَ-الرَجُلَ يَيْسِرُ. يَسْراً): كەوتە چەپی پیاوەكە/ لەچەپی پیاوەكەوە هات.
(ياسَرَ-هُ. مُياسَرَةً): لەلای چەپیەوە هات/ لای چەپیكەوت و هات.
(اَلشَيءَ): لەلای چەپەوە شتەكەی وەرگرت.
(ياسَرَ-بالقَوم): بەلای چەپدا خۆێشكەلیبرد.
(تَياسَرَ- الرَجُلُ): لای چەپیگرت/ كەوتە لای چەپەوە، چەپڕەوییكرد لەلای چەپەوە هات.
(-اَلْقَومَ): بەلای چەپدا خوێشكەلیبرد.
(اَلْياسِر (ج) أيسار): ١-لای چەپگرتوو لەهاتن و ڕۆیشتندا ٢-چەپلەر پێچەوانەی ڕاستەو ڕاستەگرتوو.
(رَجُلٌ أعْسَرُ يَسَرٌ): پیاوێكە بەڕاستەو چەپە/ بە دەستی ڕاست و چەپ كاردەكات.
(العَسْراء يَسْراء): ژنەكە/ مێینەكە چەپەیشەو ڕاستەیشە.
(اَلْيَسار والیِسار (ج) يُسُر ويُسْر): چەپ لای چەپ.
(اَلْيَسْرَة): لای چەپ، دەستی چەپ.
(اَلْيُسرى (ج) يُسْرِيات): چەپ/ لای چەپ/ دەستی چەپ/ پێچەوانەی لای ڕاست و دەستی ڕاست.

(اَلأَيْسَر): ١-ئاسانتر سووكتر ٢-لای چەپ.
(اَلمَيسَرَةُ (ج) مَياسِر): لای چەپ/ دەستی چەپ.
٣-(يَسُرَ. يَيسُرُ. يُسراً): كەمبوو/ كەميكرد.
يَسِيرٌ: كەم/ كەمەكێك/ چكێك/ تۆزێك.
(اَليَسير): كەم/ كەمبوون.
اَلملحق
يسر: (اَليَساريّ): چەپڕەو لەرامياريدا.
(حِزبٌ يَسارِي): پارتێكی چەپڕەو/ پارتی چەپیی.
(اليَساري): ئەوكەسەی كەبیر و بڕوای پێشكەوتنخوازانە ئاشكرا بكاتو بانگی بۆ بدات و داوای گۆڕان و وەرگێران بكات لەژیانی كۆمەڵدا. بێ ئەوەی بەتەنگ ئەوەوە بێت كە باری ژیان چۆنبێت.
(كانَ مِن اليَسارِيين المُتَطَرِّفين): ئەو لەچەپڕەوە تیژڕەوەكانبوو.

---

يسم: (اليَاسَمون (ن) = اليَاسَمين= اَلياسِمين): گوڵی ياسەمين گوڵێكی هاوينەيە بۆنی زۆر خۆشە و گەڵا رەنگينەكانی لەبنەوە يەكگرتوونو گەڵاپانن، كراوەن لەوڵاتە گەرمەكاندا و لەوڵاتانی دەريای ناوەڕاستدا باش دەروێت و بۆنی خۆشی لێدەگيرێت.
(اَلياسمين الهندي) (ن): ياسەمەنيی سوور. رووەكی هاوينەيە بۆنخۆشە لەئەمەريكای كەمەرەييەوە هاتووە بۆ جوانيی لەوڵاتانی دەريای ناوەڕاستدا دەروێنرێت.
يسن: (يَسِنَ – الماءُ. يَيسَنُ يَسَناً): ئاوەكە (بۆگەنبوو/ بۆنيكرد).
(اَسِنُ): ئاوی بۆگەنبوو.
يَشْبَ: (اَليَشْب وآليَشَف واليَشْم) (عبرانِيَّة وقيلَ فارسِيَّة): شەوەی سەوز/ بەردێكی گرانبەهايە لەزمرووت دەچێت بەڵام لەو روونترە.
يصب: (اَليَصب واليَصف): وەك ئەوەی پێشووە/ شەوەی سەوزە.
يصر: (اَلأَيصَر (ج) أَياصِر): گيای وشكەوەبوو.
يعر: (يَعَرَ-تِ الشاةُ أَو المعزى. يَيْعَرُ وَيَيْعِرُ): مەڕەكە يان بزنەكە باراندی.
(اليَعر وآليَعْرَة (ج) يعار) (ح): كار كە لەنزيك چاڵی راوی شێر ياگورگەوە دەبەسترێتەوە كەباراندی و درندەكە بۆيهات دەكەوێتە چاڵەكەوەو راودەكرێت.
يعس: (اَليَعْسُوب) (ح): ١-شاهەنگ ٢-هەنگەنێرە ٣-سەرۆكی گەورە.
يعف: (اَليَعْفور (ح)): ئاسك/ مامز.
يغر: (اليَغر (ح) = الغُرَير): چاڵەكە (زيندەوەرێكە لەشی لەنێوان سەگ و پشيلەدايە قاچكورتەو رەنگ خۆڵەمێشيیە).
يفخ: (يَفَخَ-الوَلَدَ. يَيْفَخُ يَفخاً): كێشای بەفريشكی منداڵەكەدا.

(اَليافُوخ أَو آليَأْفوخ (ج) يَوافِيخ) (ع ا): فريشكى ساوا. پێشى سەرى كۆرپەى ساوايە نەرمەو دەجوولێت بۆ شايەكە لەنێوان ئێسقانى پێشى سەردايە زۆرى پێناچێت ئێسقانەكانى يەكدەگرن و مەلاشوومكە رەقدەبێت.

(صَدَعَ القَومُ يافُوخ اللَّيل): بەدرێژايى شەو رۆيشتن.

(مَسَّ يافُوخَهُ السماكِ): لووتى لە ئاسمانە (پلەى بەرزبۆتەوەو فيزى پەيداكردووە).

يَفَعَ: (يَفَعَ وَ أَيفَعَ — الغلامُ. يَيفَعُ. يَفعاً): كورەكە/ مێرد منداڵەكە پێگەيشت و نزيكى باڵقبوون بوو.

(-الجَبَلَ): سەر شاخەكە كەوت.

(تَيَفَّعَ — الغلامُ): مێرد منداڵەكە پێگەشيتو نزيكى باڵقبوون بوو.

(-الرَجُلُ): ١-سەركەوتە سەر بەرزاييەكە ٢-ئاگرى لەسەر بەرزاييەكە كردەوە.

(اَليافِع (ج) يَفَعَة وَيُفعَان) (فا): پێگەيشتوو نزيكى باڵقبوون.

(غُلامٌ يافِع): مێرد منداڵێك كە نزيكى هەرزەكاريى بێت.

(مَجدٌ يافِع): شكۆيەكى باڵا.

(اَليافِعَةُ (ج) يافِعات): مێى وشەى (اليافع): كچى نزيك هەرزەكاريى.

(اَليافِعاتُ مِنَ الأُمورِ): كارى سەختو گران كە لە تابوشتدا نەبێت/ كارى گرنگ و قورس.

(اَليافِعاتُ مِنَ الجبال = الشامخه): كێوى سەختو قووچ/ كێوى هەزار بەهەزار.

(اليَفَع واليَفاع (ج) يُفُوع): ١-گردى بەرز ٢-هەڵەتو بەرزايى.

(غُلامٌ يَفَعٌ): مێرد منداڵێكى پێگەيشتوو/ نزيك باڵقبوونو هەرزەكاريى.

(اليَفَعَةُ): مێرد منداڵێك كە نزيك بە هەرزەكارى بێت.

(غُلامٌ يَفَعَةٌ وَغُلامانِ يَفَعَةٌ وَغِلمانِ يَفَعَةٌ): (هەربەو وشەيە لەگەڵ هەمواندا): نزيك هەرزەكاريى.

(اَلمَيفَعَةُ (ج) مَيافِع): هەڵەت/ بەرزايى زەويى.

يفن: (اَليَفَن (ج) يُفُن): ١-پيرى ئيفتادە ٢-گاى پير ٣-هونەركار، هونەر باز.

يقّ: (يَقَّ. يَيَقُ. يُقُوقَةً): سپيبوو.

(يَقَقَة): ١-پارچە لۆكەيەك ٢-كورۆكە سپييەكەى بنى دارخورما.

(أَبيَضٌ يَقَقٌ وَيِقِقٌ (ج) يَقائِق): زۆر سپى.

يقت: (اَلياقوت: الواحِدَةُ ياقوتَة (ج) يَواقيت): ياقووت/ ياخەنە (يونانيە): بەردێكى گرانبەهاى سەختيى جوانى روونە. رەنگى زۆرە.

يقط: (اَليَقْطين (ن) الواحِدَةُ يَقْطينَة): ئەوەى كە قەدى نييە وەك ئاروو و كوولەكەى خڕ.

يقظ: (يَقَظَ وَيَقُظَ. يَقَظاً. وَيَيْقُظُ. يَقاظَةً):
١-لەخەو هەستا/ بەئاگاهات/ خەبەریبووەوە/
راپەڕی لەخەو هوشیار بـووەوە/ بێداربوو
٢-وریـای كاروبار بوو (هوشیار/ ئاگادار)ی
كاروباربوو/ بۆی بەپارێز بوو.
(يَقِظ ويَقُظ وَيَقْظان (ج) أَيْقاظ وهي
يَقْظَى (ج) يَقَاظَى): وریا/ هوشیار/ بەئاگا/
بێدار/ نەخەوتوو.
(يَقَّظَ- الغُبارَ. تَيْقِيظاً): تۆزەكەی ورووژاندو
هەستاند.
(أَيْقَظَ-فُلاناً. إِيقاظاً): فیساری (بەئاگای هێنا،
هەڵیستاند/ وریایكردەوە هوشیاریكردەوە).
(-الغُبارَ): تۆزەكەی هەستاند.
(تَيَقَّظَ تَيَقُّظاً): وریا بـووەوە، بەئاگاهات،
راپەڕی.
(تَيَقَّظَ لِلأَمرِ): ئاگاداری كارەكەبووەوە/ وریای
كارەكەبوو/ هوشیاربووبوو/ لێیبەئاگابوو.
إِسْتَـيـقَـظَ إِسـتـيـقـاظـاً: بـەئـاگـاهـات/
خـەبـەریـبـووەوە/ هـوشـیـاربـووەوە،
لەخەوراپەڕی/ بێداربووەوە.
(-ه): ١-بەئاگایهێنا/ لەخەو خەبەریكردەوە
٢-راپەڕاند/ وریایكردەوە.
(اَليَقْظَةُ): بێداریی/ بەخەبەریی/ وریایی.
(اَليَقِظ): وریا/ وشیار/ بێدار/ نەخەوتوو/
ئاگا.
(أَبو اليَقْظان) (ح): كەڵەشێر/ كەڵەباب.

(يقن: يَقِنَ-الأَمرُ يَيقَنُ. يَقْناً وَيَقَناً): كارەكە
چەسپی و ئاشكرابوو، روون بووەوە.
يَقِينٌ: چەسپیو/ بنجبەستبوو و ئاشكراو
روون/ دیار.
(يَقِنَ وَأَيقَنَ وَتَيَقَّنَ وَآسْتَيقَنَ الأَمرَ وبِهِ):
كارەكەی لاروون و ئاشكرابوو/ لای چەسپی
پێیزانی و چووە بنجو بناوانی.
(اَليَـقَـن): ١-بێگومانیی/ لاساغبوونەوە،
گومانلانەمان ٢-مرۆڤی خۆشباوەڕ/ ساویلكە.
(اَليَقِن): مرۆڤی خۆشبڕوا/ هەرچی بیسیت
بڕوای پێبكات.
(رَجُلٌ يَقِنٌ بالشَيءِ): پیاوێك كەبەشتەكەوە
(زۆر بەندبێت/ دڵـی زۆر لـەسـەر بێت/
گرفتاری بێت/ ئالوودەی بێت).
(اَليَقْن واليَقَنَةُ وَالمِيقان (م) مِيقانَة):
مرۆڤی خۆشبڕوا/ ساویلكە.
(اَليَقِين): ١-بڕوای تەواو هێنان/ لاچەسپین/
گومان لانەمان/ لاساغبوونەوە ٢-زانستیەك كە
لەئەنجامی لێكۆڵینەوەو بەڵگە پەیدا بووبێت.
(أَنا على يَقِينٍ مِنهُ): من سوور دەزانم و لێی
دڵنیام.
(حَقُّ اليَقِين): راستییەكی تـەواوو روون/
ئاشكراو دیار.
(أَمـرٌ يَـقِـينٌ): كارێكی (چەسپێوو روونو
ئاشكرا/ راستو دروست و تەواو.
يـك: (اَلـيُـكَّـة) (ن): گیایەكە لەكۆمەڵەی

زەنبەقە گەڵاكانی لە شێوەی شمشێردایە نێرکێکی هەیە کە گوڵی بەشێوەی هێشووی پێوە شۆڕدەبێتەوە گوڵەکانی سپی یان پەمەیین و بۆ جوانیی دەروێنرێن.

یلّ: (یَلَّ وَیَلِلَ. یَلَلُ. یَلاً ویَلَلاً): دانەکانی کورتو چەسپو بەناو دەمدا خوار.

(هُوَ أیلُّ وهي یَلاء (ج) یُلّ): دانکورتو چەسپوو بەناودەمدا چووبوو.

یلب: (الیَلَب): ١-پێست، چەرم، ٢-قەڵغان یان زرێی پەمەنی کە لەپێست/ چەرم دروستدەکرا دەوترێت گوایا چەرم بەسەر چەرمدا دەدوروا بەتایبەتی دەکرایە سەر. بەیەکێکیان دەوت: (یَلَبَة).

(الیَلَب):١-پۆڵا ٢-ئاسنی پوخت ٣-هەمووشتێکی مەزن.

یلق:١-(الیَلَق): سپی.

(أبْیَضُ یَلَق وَلَهَق وَیَقَق): زۆر سپی.

(الیَلَقَةُ أو الیَلْقَقُ) (ح): بزنی سپی.

٢-(الیَلْمَقُ (ج) یَلامِق = القَباء) (فارسیة): کەوا.

یلن: (الیَلَنْجَج والألَنْجَج والیَلَنْجُوج والألَنْجوج): چێوێکی بۆنخۆش/ دارێکی عودی بۆنخۆش.

یَم:١-(یُمَّ. یُیَمُّ یَمّاً): فرێدرایە دەریاوە.

(-الساحِلُ): دەریاکە بەسەر رۆخەکەدا هاتو لیتەکەی بەسەردا دا.

(الیَم) (مص): دەریا.

٢-(یَمَّمَ-هُ): نیازی ئەوی بوو/ roowyتێکرد.

(-فُلاناً بِرمْحِهِ): بەنێزەکەیەوە رووی لەو کردو نیازی ئەویبوو.

(-المَریضَ): نەخۆشەکە تەیەمومیکرد/ بۆنوێژ خۆڵی/ تۆزی لە دەستو دەموچاوی هەڵسوو بەنازی دەستنوێژ.

(تَیَمَّمَ-الأمرَ): نیازی ئەنجامدانی ئەوکارەیکرد/ هەوەسی کردنی ئەوکارەیبوو.

(-لِلصَّلاة): بەنیازی دەستنوێژشتن خۆڵی/ تۆزی لەدەست و رووی هەڵسوو.

(الیَمام): (نیاز/ مەبەست/ ویست)ی کەسێك.

(الیَمامَة= قَصد): نیاز.

(إمض یَمامَتی): پێشم بکەوە.

(المُیَمَّم): بەنیازگەیشتوو.

٣-(الیَمّ) (ح): مار.

(الیَم و الیَمَم والیَمام) (ح): کۆترە کێویلە.

(الیَمامَة)(ح): گاکۆتر.

یمن: (یَمَنَ-الرَجُلَ. یَیَمنُ یَمیناً): لەلای راستی پیاوەکەوە هات.

(-لِقَومِهِ وعلی قَومِهِ یُمْناً وَمَیمَنَةً): بوو بەهۆی فەرو پیرۆزیی و خۆشیی بۆ نەتەوەکەی.

(یامِن وَیَمین وَأیْمَن وَمَیمون): مرۆی پیرۆزو فەرهاوردوو بەختیاری و خۆشییهێن.

(یَمَن-بِهِ. یَیمِنُ وَیامِنُ. یَمْناً): بەلای راستدا بردی.

(-اللهُ فُلاناً. يَيمُنُ. يَمْناً ويُمْناً): خودا ئەو کەسەی (پیرۆزکرد و بەفەڕو بیٚریکرد).

(هُوَ مَيمُونٌ): ئەو پیرۆزە، خیٚر و بیٚرهیٚنە.

(أللهُ يامِنٌ وَيَمِين): خودا پیرۆز کارو فەربەخشە.

(يَمِنَ- الرَجُلَ يَيمَنُ يَمْناً): لەلای راستی پیاوەکەوە هات/ لای راستی پیاوەکە کەوت.

(يَمِنَ وَيَمُنَ وَيمِنَ لِقَومِهِ وَعلى قَومِهِ يَيمَنُ وَيامَنُ وَيَيمُنُ يُمْناً وَمَيْمَنَةً): مایەی فەڕو خۆشیبوو بۆنەتەوەکەی بەختاریی و پیرۆزیی بۆ هاوردن.

(يامِنٌ وَيَمينٌ وَأَيْمَنٌ وَمَيمُونٌ): ١-پیرۆز/ مایەی فەڕو بەختیاریی.

(يَمَّنَ):١-بەلای راستدا رۆیشت/ لای راستیگرت ٢-لای راستیگرت یان لەلای راستەوە هات.

(-بِهِ): بەلای راستدا بردی.

(-عَلَيهِ): ١-پیرۆزبایی لیٚکرد ٢-پیرۆزیکرد ٣-فەروبیٚری دایەو تووشکرد.

(يامَنَ. يُيامِنُ مُيامَنَةً): ١-بەلای راستدا رۆیشت/ لای راستی گرت ٢-یەمەنی خواستو ویست یان هاتە یەمەن.

(-بِهِ): بەلای راستدا بردی.

(أيْمَنَ وَتَيامَنَ): ١-بەلای راستدا رۆیشت/ لای راستیگرت ٢-لای یەمەنی گرت یان هاتە یەکەن.

(تَيَّمَنَ): بوو بەیەمەنی.

(-الرَجُلُ):١-مرد ٢-بەدەستی راست یان قاچی راست یان لای راست کەوتە کردارو جووڵە.

(-بِكَذا): بەوشتە گەشبینیکرد (ئەمە پیٚچەوانەی رەشبینیکردە).

(بالميتِ): بەلای راستدا مردووەکەیناشت.

(إستَيمَنَ — الرَجُلَ إستيماناً): پیاوەکەی سویٚندا.

(-بِكَذا): بەوە خۆی پیرۆزکرد خۆی موفەرکاویکرد.

(أليَامِن (م) يامِنَة): ١-بەفەڕو پیرۆزکار ٢-کەسیٚکە مایەی خیٚرو بیٚرە ٣-مرۆڤیٚکی پیرۆزە.

(أليُمْنُ): ١-فەڕ/ بیٚر، بیت ٢-پیرۆزیی موبارەکیی ٣-بەختیاریی/ کامەرانیی/ خۆشیی.

(أليَمَن): ١-لای راست ٢-وڵاتی یەمەن.

(أليَمَني واليَمانِيّ (ج) يَمَنِيُّون وَيَمانُون وَيَمانِيُّون): خەڵکی یەمەن، یەمەنیی.

(أليَمنَةُ): لای راست.

(أليَمَنَةُ واليُمْنَةُ): بەرگیٚکی میلدارەو هی یەمەنە.

(ألايْمَن (م) يَمناء (ج) يُمْن وَأيامِن): لای راست (پیٚچەوانەی لای چەپ)ە.

(ذهب الى أيْمَنِ الإبِلِ): لای راستی حوشترەکەیگرتو رۆیشت.

(نظَرَ أيْمَنَ مِنهُ): تەماشای لای راستیکرد. یان لەلای راستەوە تەماشایکرد.

(اَليُمنى): لاى راست.
((ج) يُمْنَيات): لاراستەكان.
(يُمنَيان): دوو لاى راست.
(اَلتَيْمَن): باشوور.
(اَليمين (ج) اَيْمان): ١-هێز/ توانا ٢-پيت.
(فُلان عندنا باليَمينِ): فيسارلاى ئێمە پيرۆزەو پايەى بەرزە.
(قدمَ على اَيْمَنِ اليَمينِ): هات و بەفەڕەوە هات/ پێ و هاتنى پيرۆزبوو فەرپهاورد.
(اَليَمين (ج) اَيْمُن وَاَيْمان): سوێند (وشەكە مێيە).
(اَيْمُنُ اللّهُ): سوێند بەخودا.
(اَيْمُنُ اللّهُ قَسَمي): سوێندم بەخودا.
(اَيْمُنُ اللهِ وإيْمُنُ اللّهٌ وَ اَيْمَنُ اللهِ وَاَيمِنُ اللّهِ): سوێند بەخودايە.
(اَيْـمُ اللّهِ وإيْـمِ اللّهِ وَاَمِ اللّهٌ (بتَثْليث الميم) والنون): سوێند بەخودا.
(مُ اللّهِ) و (م اللّهٌ) و(مَ اللّهٌ): سوێند بەخودا.
(يَمينُ اللّهٌ لاأفعل): سوێند بەخودا ئەو كارەناكەم.
(اَليَمين (ج) اَيمُنٌ وَ اَيْمان واَيامِن وَاَيامين): لاى راستى مرۆڤ و لاى راستى شت و ئەندامى راستى مرۆڤ وەك دەستى راستو قاچى راست... هتد.
(يُمَيْن يَمائِن ): بچووككراوەى وشەى يَمين)ە: تۆزێك/ كەمەكێك لاى راستەوە.

(اَلمَيْمَنَة (ج) مَيامِن): ١-بەختيارىى/ خۆشى ٢-پيتو فەڕ ٣-لاى راسات/ رووكارى راست.
(اَلمَيَمَّن): پێبەفەڕو خێر/ فەڕو بێر هاوردوو.
(اَلمَيْمُون (ج) مَيامين): ١-خێر و فەڕدار/ پێبەفەڕ ٢-پيرۆز.
(هُوَ مَيْمونُ الطائِرى): هاتنى بەخێرو فەڕە/ پێو هاتنى بەفەڕو پيرۆزە.
(سِرْ على الطائِر المَيْمون): بڕۆ هەرسەركەوتوويت/ بڕۆ خودا دەست بەباڵتەوە بگرێت (ئەمە نزايە/ دۆعايەبۆ يەكێك گوزار/ سەفەر كات).
الملحق:
يمن: (اَليَميني):كەسێكە لەرامياريدا راستەكى بێت/ دژ بە پێشكەوتن بێت.
(حِزبٌ يَميني): پارتێكى/ راستڕەويى راستەكى.
(يَميني): كەسێكە حەز لەگۆڕانو پێشكەوتن نەكاتو مامناوەندىبێت لەكاروبارى رامياريى و كێشە گشتييەكاندا/ پێچەوانەكەى چەپەكييە.
(يَميِنيٌ مُتَطَرِّف): (راستەكييەكى/ راستەڕەوێكى) زيادڕەو.
(اِنْقَسَمَ الرَأْيُ العامٌ بَينَ يَمينيٌ وَيَساريٌ): راى گشتى بەسەر لاى راستەكيى و چەپەكيدا دابەشبوو/ بەلاى راستڕەو و چەپڕەودا دابەشبوو.

---

ينب:١-(اليَنْبُوت)(ن): خڕنووك: رووەكێكى

تەمەندرێژە هەڵکێشانی زۆر گرانە. لاسکەکەی رەقە وەك دارە. دڕکاوییە لەزمویە کشتوکاڵیەکاندا زۆرە.

(اَليَنبوت) (ن): خرنووکی بەراز دەومنێکی دڕکاوییە گەڵاو گوڵەکەی زەردە خواردنی دەبێتە هۆی رشانەوە لەوڵاتەکانی درمیایی ناوەراستو وڵاتە عەرەبییەکاندا دەروێت.

٢-(اَليَنبوع): کانی/ سەرچاوە/ کانیاو.

(ینس (ن)): (اَليانْسُون (يونانية): گیایەکە بۆنخۆش.

ینع: (يَنَع – الثَمَرُ يَيْنَعُ وَيَيْنِعُ. يَنْعاً وَيُنْعاً وَيُنُوعاً): بەری درەختەکە پێگەیشتو کاتی چنینی هاتو خۆش بوو.

(ثَـمَـرٌ يـانِـع): بـەری درەخـتـی خوشبوو و پێگەیشتوو.

((ج) يَنْع وَ يَنيع): زۆر (يَنَعَ – الشيءُ): شتەکە ئاڵوو و سوور هەڵگەرا.

(أَيْنَعَ – الثَمَرُ): بەرەکە، میوەکە پێگەیشتو خۆشبوو کاتی رنینی/ چنینی هات.

(اَليانِع): سوورهەڵگەڕاوی هەموو شتێك.

(اليَنع): مووروی سوور.

(اَليَنَعَة): ١-مـووروی سـوور/ شیلانی سوور ٢-جۆرە یاقووتێکە.

(اَليُنُوع): سووریی خوێن.

یـنـم: (الـيَـنَـم. الـواحِـدَةُ يَـنَـمَـة) (ن): رووەکێکە.

یهت: (أَيْهَتَ- اللَحمُ إيهاتاً): گۆشتەکە بۆگەن بوو.

یـهـر:١-(إسْـتَـيْـهَـرَ): خـۆی (گـەوجـکـرد/ بێئاوەزکرد) ئەقڵی لەدەستدا.

(-في الأَمـرِ): لەکارەکەدا (زیادڕەوییکرد/ شووڵی لێهەڵکێشا/ زۆری لەسەر رۆیشت/ رکەبەرییکرد.

(اَليَهْر وَ اَليَهَر): ١-شوێنی فراوان/ پانتاییەکی بەرفراوان ٢-لەشتدا لەکاردا زۆر بەدەمەوەدان/ درێژە پێدان/ زیادەڕەویی کرد.

(اَليهْيَرُّ): ١-زۆر لەسەر قسەوشت رۆیشتن/ درێژدادڕیی و رکەبەریی ٢-(بەردی سەخت).

(اَليَهْيَرَّى): ئاوی زۆر.

(المُسرِء المُسْتَيهِر) (فا): زۆر درێـژدادڕ و رکەبەر کرد.

٢-(إسْتُيهَرَ- بِالأَمرِ): چووە بنج و بناوانی کارەکەوەو لای ساغبووەوە.

٣-(اَليَهْيَرُّ): ١-تراویلکە ٢-درۆ ٣-(ن) کاڵەکە مارانە ٤-ژەهر.

(اَليَهْيَرَّى): ناڕاست/ نارەوا/ نادروست.

یهف: (اَليَهْفُوف): ١-زۆر ترسنۆك/ زیرەکردوو ٢-گـەوج ٣-زەویـی چـۆڵ و وشـكو بیابان ٤-دڵقایم و ئازا.

یهم: (اَليَهَم): شێتیی/ دێوانەیی/ تێکچوون.

(اَلأَيْـهَـم (م) يَهْماء (ج) يُـهْـم): ١-ئـاوەز (چەواشەبوو/ تێکچوو) شێتۆکە ٢-وشکانی/

دەشتو دەر کەپێچەوانەی دەریایە ٢-چیای بڵند و قووچ/ کێوی گەردنکەش ٤-کەری تەواو ٥-پیاوی جەربەزە کە نەتوانرێت بەری لێبگیرێت ٦- بەردی لووس ٧-وڵاتی، شاری بێنیشانە و نادیار.

(لَيلٌ أَبْهَم): شەوێك كە ئەستێرەی بەدەرەوە نەبێت.

(اَلْيَهماء): ١-مێی وشەی (الأَبهم)ە ٢-بیابانێکی وشكو کەس سەر لەرێگەکانی دەرنەکات ٣-وشكو رەشە ساڵێك کە قاتوقریبێت و دەرووی تێدا نەبێت ٤-مێحوشتری توندوتیژ.

(أَرضٌ يَهماء): زەوییەك کەوشك و برنگ شوێنەوارێکی تێدا نەبێت لەوەرگایەك و رێگاو نیشانەیەکی بۆنەبێت.

(سنونٌ يُهْمٌ): ساڵانێکی بێئاوو بێلەوەرو بێبەرەخت/ وشکەساڵ.

يَهو: (يَهود): جوو/ جوولەکە.

الملحق:

يوب: (اَلْيُوبيل): ١-ئاهەنگێکی گەورەی ئاینیی کۆنی جوولەکە کۆنەکانە کە پەنجا ساڵ جارێك دەگێردرا. بەم بۆنەیەوە قەرزارەکان قەرزەکانیان لەسەر لادەدراو کۆیلەکان ئازاد دەکران ٢-لەلای کاسۆلیکیەکانیش پاپا لێخۆشبوونێکی گشتیی گوناهی لەهەندێك بۆنەدا دەبەخشی و ئاهەنگی گەورە دەگێردرا. ٣-لەژیانی تایبەتی و گشتی. خەڵکیشدا یادکردنەوەی رووداوێکی خۆشە وەك ژنهێنان و پیشە گرتنێك و بۆنەیتر. ئەمەش یان یۆبیلی زیوینە کە (٢٥) ساڵییە یان یۆبیلی زێڕینە کە (٥٠) ساڵییە یان یۆبیلی ئەڵماسییە کە (٧٥) ساڵییە (٧٥) ساڵ جارێکە.ئەوەندە ساڵ جارێکە.

يوح: يُوْح وَيُوْحى: ناوی خۆر/ هەتاو.

"جَعَلَكَ اللهُ أَعْمر مِن نوحٍ و أَنْوَرَ مِن يوحٍ" خودا تەمەنت لەهی نوح درێژترکاتو رووناکیت لەهی خۆر زۆرتر بکات/ تەمەنت لەنوح درێژتر بکاتو لەخۆر رووناکتر بێت.

يود: اَليود: (ك): یۆد: تەنێکی خۆڵەمێشیی مەیلەو رەشە. کریستاڵییە زوو بەهەڵم دەبێتو زوو لە کهولەکاندا دەتوێتەوەو بۆ ئامادەکردنی پاکژە پزیشکییەکان بەکاردێت هەروەها لەگرتنی وێنەی بەر هەتاودا.

الملحق:

يوس: (اَليُوسُفِيُّ أَو يوسف أَفَندي أَو اَلْمَندَرين): لالەنگی: درەختێکی بەرداره لەکۆمەڵەی پرتەقاڵە بەناوی یوسف ئەفەندییەوە ناونراوە کە لەسەردەمی محەممەد عەلی پاشادا لە ئیتالیاوە هێناویەتییە میسر.

اَلملحق

يول: (يُوْلِيو): ناوی مانگی خەرمانانە (تەموز) لەهەندێك وڵاتی عەرەبیدا بەکاردێت.

---

يوم: (يـاوَم-ـهُ. يِواماً وَمُياوَمَةً): بەرۆژانە

گرتیو لەگەڵی ڕێککەوت.
(اَلیَوم (ج) أَیّام و (جج) أَیاوِیم): ڕۆژ ١-کات لەگزنگەوە تا خۆر ئاوا ٢-کات بەگشتی.
(ذخَرتُكَ لهذا الیَوم): بۆ ئەمکاتە تۆم ویست/ بۆ ئەم ڕۆژە.
(اَلیَومُ النَجمِي) (فك): ڕۆژی ئەستێرەیی کەدەکاتە (٢٣) سەعاتو (٥٦) خولەكو (٤) چرکە ئەمە نزیکەی چوار خولەکی لەڕۆژی خۆریی کەمترە ئەمەیش بەتێپەڕبوونی دوو جاری یەك بەدوای یەکدا بەسەر پنتی فێنکی بەهاریی کەلەسەر هێڵی قرچەی نیوەڕودایە پەیدا دەبێت.
(الیوم الشمسي الحَقیقي) (فك): ڕۆژی خۆریی ڕاستەقینە ئەوکاتەیە کە بەتێپەڕبوونی دووجاری یەك بەدوای یەکی خۆردا بەسەر پنتی فێنکی بەهاردا کەلەسەر هێڵی قرچەی نیوەڕۆدایە. لەبەر جیایی ڕۆژەکان تێکڕایان بەم ڕۆژەی ئێستا گرتووەکە هەیە.
(أَیــامُ اللّهِ): ڕۆژانـــی خـــودا (بـەتـالّـیـی و شیرینییەوە/ ئازو سزای خودا)یە.
(أَیامُ العَرَب): ڕۆژانی عەرەب: قەوماوەکانیان و جەنگەکانیان/ بەیەکدا دانەکانیان.

(اِبنُ الأَیام): کوڕی ڕۆژناس کەدەزانیت ڕۆژگار چۆنەو چۆن دەچەرخێت.
(اِبنُ الیَوم): کوڕی ئەو ڕۆژەیە کە تیایدایە و گوێ نادات ە ڕۆژانیتر.
(یَومٌ أَیوَمٌ): دوا ڕۆژی مانگ.
(یَومٌ أَیوَمٌ وَیَومٌ وَ وَ وِمٌ وَ ذو لَیّام وَذو لَیاوِیمَ وَ ذو أَیایِمَ): ڕۆژانێکی دوورو درێژو سەخت لەدرێژیدا.
یون: (الیُونان): وڵاتی یۆنان.
(یونانيّ (ج) یونانِیُّون): یۆنانییەك.
اَلمُلحَق
یون: (اَلیُونسکو): دامەزراوێکی دەوڵەتییە ساڵی (١٩٤٥) سیو چوار دەوڵەت دایانمەزراند ئامانجەکەی پاراستنی ئازادییە. مرۆییەکانو بـــڵاوکـــردنـــەوەی ڕۆشـــنـــبـیری و بـــەرەو پێشەوەبردنی نـاوەکەی لە پیتی یەکەمی کۆمەڵێك وشەی ئینگلیزی پەیدابووە.

---

یوي: (اَلیاوِيّ): پایی/ سەربەیی.
(یین: الیَینَمِیَّة = الخوذَه): کڵاو ئاسن کە جەنگاوەر لەشەڕدا دەیکاتە سەری.
یيی: (یَیّا-الیاءَ. تَیئِیَةً): پیتی یی نووسی.

## المصادر:


١-المنجد الطبعة السادسة والعشرون الأَب لويس معلوف اليسوعى.

٢-الرائـد -في مجلدين- معجم لغوى عصرى تأليف جبران مسـعود - بـيروت دار العلم للملايين الطبعة الثالثة. كانون الثانى ١٩٧٨م.

٣-مختـار الصحاح. تأليف محمد بن ابى بكر عبدالقادر الرازى. الناشـر دار الكتاب العرب. بيروت لبنان ١٩٨١م.

٤-المعجم الوسـيط (١-٢). قام باخراجه ابراهيم مصطفى واحمد حسن الزيات وحامد عبدالقادر ومحمد على النجار (نشره دار الدعوة) (الجزء الأول والثانى).

٥-القاموس العلمى عربي - انكليزى -كوردى. تأليف كمال جلال غريب- كوردستان.- السليمانية الجزء الأول.

٦-القامـوس العلمي عربى. انكليزى كـوردى. الجزء الثانى مطبعة المجمـع العلمى الكردى ١٩٧٩م. والجزء الثالث مطبعة الميناء ١٩٨٣م. تأليف كمال جلال غريب.

٧-القاموس العلمى المصَور عربى انكليزى كوردى كمال جلال غريب مطبعة الاجيال الطبعة الاولى ١٩٧٥.

٨-فەرهەنگی زانستیی (عربی- ئینگلیزیی- کوردیی (کەمالنامە)، کمال جلال غريب-٢٠٠٣).

٩-دەستوورو فەرهەنگی زمانی کوردی - کوردی عەرەبی فارسی. دانەر عەلائەدین سەجادی چاپخانەی مەعاریف بەغدا/ ١٩٦١ م.

١٠-رابەر -فەرهەنگی قوتابخانەیی. عەرەبی کوردی دانەر: گیوموکریانی- هەولێر چاپخانەی کوردستان ساڵی ١٩٥٠م.

١١-الباكورە - قاموس عربى كردى - گيو موكريانى مطبعة الحوادث. بغداد ١٩٨٦.

١٢-فەرهەنگی کوردستان. گیو موکریانی. کوردی - کوردی. دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس. ١٩٩٩م.

١٣-فەرهەنگی مەردۆخ - ئایەتوڵلای کوردستانی کوردی - کوردی - فارسی - عەرەبی بەرگی یەکەم و دووەم تاران ١٩٥٦م.

١٤-الوجيز في اللغة الكردية تأليف: رزگار عەلی عبدالرحمن مطبعة أسعد بغداد ١٩٨٧.

١٥-فرهنگ جديد عربى فارسى. ترجمة منجد الطلاب مترجم محمد بندر ریگی چاپخانه (لوحه- تهران) ١٣٧١ فارسى.

١٦-قاموس - فارسى عربى تأليف الدكتور عبدالمنعم محمد حَسَنَين. رئيس قسم اللغات الشرقيه بكلية الآداب جامعة عين شمس. دار الكتاب اللبنانى- بيروت. الطبعة الاولى ١٩٨٢.

١٧-فەرهەنگی مەهاباد- گیو موکریانی- کوردی - عەرەبی چاپی یەکەم چاپخانەی کوردستان. هەولێر ١٩٦١.

١٨-فەرهەنگی خاڵ. شێخ محەممەدی خاڵ. کوردی - کوردی بەرگی یەکەم ١٩٦٠ چاپخانەی کامەران

بەرگی دووەم ١٩٦٤. بەرگی سێهەم ١٩٧٤. چاپخانەی کامەرانی.
١٩-فەرهەنگی کشتوکاڵ کوردی کوردی. مەعروف قەرەداغی. بەرگی یەکەم و دووەم بەغداد ١٩٧٢.
٢٠-قاموسی زمانی کوردی (پیتی ئەلف و بێ) عەبدولرەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٩ م. بەغدا.
٢١-هەمبانە بۆرینە. کوردی کوردی فارسی هەژار – تەهران ١٣٦٨ و ١٣٦٩ فارسی.
٢٢-ئەستێرە گەشە. کودی – عەرەبی. فاضل نظام الدین. کۆماری عێراق وەزارەتی راگەیاندن دەزگای رۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی. مطبعة الأجيال بغداد ١٩٧٧م.
٢٣-فەرهەنگی شیرین عربی – کوردی. فاضل نظام الدین. سلێمانی. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دووەم بەرگ ٢٠٠١ و ٢٠٠٢ چاپی دووەم.
٢٤-فەرهەنگی عەرەبی – کوردی دانەر عەلی عەبدوڵڵا.
٢٥-فەرهەنگی گیا های داروئی. کوردی فارسی ئینگلیزی عەرەبی تألیف امیر اَمینی. (انتشارات طاق بستان کرمنشاه) (١٣٧٤)
٢٦-فەرهەنگی زانستی مصطفی سلیمان. چاپخانەی رەنج ساڵی ٢٠٠١.
٢٧-بەرکوڵێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی جەمال عەبدول یەکەم چاپ (٢٠٠١م) چاپخانەی قەشەنگ – سلێمانی.
٢٨-شەوکار فەرهەنگی تایبەتمەندی کیمیاییە ئینگلیزی – عەرەبی – کوردی. جمال عەبدول ١٩٩٨.
٢٩-زیوار دەستە فەرهەنگێکی زانستیە. ئینگلیزی عەرەبی کوردی یەکەم چاپ ١٩٩٥ جەمال عەبدول.
٣٠-فەرهەنگی تاهیر صادق (فەرهەنگی هاو واتاکان). کوردی کوردی عەرەبی سلێمانی – کوردستان ١٩٩٨م.
٣١-زاراوە زانستیەکان. دانان و لێکۆڵینەوەی لیژنەی زاراوە زانستیەکان کۆڕی زانیاریی کورد بەغدا ١٩٧٦.
٣٢-لەچاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی عێراق. دەستەی کورد ساڵی ١٩٨٤. (لیژنەی زاراوەی کوردی).
٣٣-فەرهەنگی زاراوە- عەرەبی کوردی تألیف بەدران ئەحمەد (لەچاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کوردستان. ئایار ٢٠٠٢م.
٣٤-زاراوەی زانستی نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانی عەرەبی – کوردی سلێمانی ١٩٦٠.
٣٥-لەبڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی پەروەردەو فێرکردنی پارێزگای سلێمانی زنجیرەی (١) ساڵی ١٩٧١.
٣٦-گۆڤاری یاساپارێزیی ژمارە (٦) ساڵی ٢٠٠١م (٢٧٠١) کوردی. کوردستان هەولێر.
٣٧-گۆڤاری ئابووریی لەژمارە (١-١٥) لە ساڵی (١٩٩٩)ەوە. کۆمیتەی باڵای یەکێتی ژمێریاران و ئابووریناسانی کوردستان – سلێمانی دەریدەکات.
٣٨-خەرمانەی یاسا- سەردار عەزیز خۆشناو.
٣٩-فەرهەنگی جوغرافیای سروشتیی. ئینگلیزیی عەرەبی کوردی دانانی حەمزا تۆفیق تالیب و ئەحمەد عەلی ئەحمەد. وردبوونەوەو تۆژاندنی ئەکرەم قەرەداغی – گۆڤاری زانستی سەردەم.